# فەرهەنگی کوردیی

# هەرمان

## بەرگی دووەم

(پ - ت)

دانانی

**عەلی نانەوازادە**

کوردستان – هەولێر
٢٠٠٥

**ناوی کتێب: فەرهەنگی کوردیی هەرمان (بەرگی دووەم)**

- دانەر: عەلی نانەوازادە
- نەخشەسازی ناوەوە: طـــە حسین
- بەرگ: محمد قادر
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- چاپ: چاپی دووەم ٢٠٠٥
- ژمارەی سپاردن: (٣٢٣)
- تیراژ: (٧٥٠) دانە
- نرخ: (٥٠٠٠) دینار
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێب - ٢٨ - (١٣١)

**ناونیشان**

**دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی موکریانی**

**هەولێر - پشت رۆژنامەی خەبات**

**پۆستی ئەلکترۆنی: asokareem@maktoob.com**

**ژمارەی تەلەفۆن:** 2260311

www.mukiryani.com

زەنگی تەلەفۆنی ژوور
سنوور سنوور
قارە قارە دوور
دەنگێکی ئاشنا دەڕژێنێتە گوێم.

نەشتەری سەلام
بە رەگەکان دا دەگەڕێ
لە چاڵی گەروو
کوڵ دەتەقێتەوە،
دەزینگێتەوە سەد جار سەلام
ـ: سەلام هەرمان!

دوای تۆ
کاروان کاروان
قەتار قەتار
مەلەکان،ماڵەکان، هەورەکان
کۆچیان کرد، رۆیین.

دوای تۆ
تەنیای تەنیا
تەنیا من مامەوە
جەستەیەکی سێ پار
سێ کوچکەی رەش هەڵگەڕاوی
جێماوی هەوار!

**ستۆکهۆڵم ٢٠٠١ /٧/٣١**

هەروەکی لە بەرگی یەکەم دا رامگەیاند بە داخەوە ئەم کارە کارێکی یەک کەسییە؛ خۆش بوو کە وانەبا و کۆمەڵێک پێوەی خەریک بان و بەرهەمێکی بە پێزتر و شیاوتریان پێشکەشی ئێوە کردبا یا لانیکەم دەستێکی یارمەتی بۆ درێژ کرابا و وەختێکی پترم بۆ دیاری کردبا و هەم خۆم و هەم ئێوەم لە گلەیی خلاس کردبا کە بۆچ هەمووی یا چەند ژمارەی یەکڕا نادەمە دەر.

دەمەویست کۆڵێ دەردی دڵ هەڵڕێژم و کولی دڵمی پێ کەم کەم، کە واچووم و وامکرد و وامکوت و وایانکوت؛ کەچی دەم ـ کوت دووپاتە کردنی لەپاتەی ئەو قسانەن کە ساڵانێکن هەڕەشەی هێرشێک دەکەن و هیچ بناگوێچکەیەکی مێژوویان سوور هەڵنەگێڕاوە... کەوایە با وا دەست پێبکەم: بێ هیچ گلەییەک لە تاک و گەلێک.

## هەندێک سەرچاوەی دیکە

### کوردیی

بۆ کوردستان، هەژار، چاپی سێهەم، ١٣٥٨، جەواهیری، تاران (بۆ کوردستان)
چەپکێ گـولّ چەپکێ نێـرگـز، هێـمن، چاپی دووهەم، ١٩٩٩، چاپەمـەنی و ئینتشاراتی رەهرو، مەهاباد (چەپکێ گولّ)
چێشتی مجێور، هەژار، چاپی یەکەم، پاریس ١٩٩٧ (چێشتی مجێور)
دەستەبوخچە، زاراوەی ژنانی موکریان، جەعفەری حوسێنپوور، هێدی، ١٩٩٩، کتێبی هەرزان، سوید (دەستە بوخچە)
فەرهەنگی باڵندە، ئەحمەد بەحری، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و بڵاو کردنەوەی ئاراس، ٢٠٠١، هەولێر (فەرهەنگی باڵندە)
فەرهەنگی پەهلەوی، عەلی نانەوازادە، چاپی یەکەم، ٢٠٠٢، تاران
کانی مرادان، کۆمەڵێک بەند و ئاوازی فۆلکلۆری موکریان، سەلاح پایانیانی، ناوەندی بڵاوکردنەوەی سەلاحەدینی ئەیووبی، ١٣٨١ (کانی مرادان)
گولّ چنینەوە لە خەرمانی « هەنبانە بۆرینە»ی هەژار، عبدالله حسن زادە، چاپی یەکەم، ئاپێک، ستۆکهۆڵم، ١٩٩٥ (گولّ چنینەوە)
گەنجی سەربەمۆر، ئەحمەد بەحری، چاپی یەکەم، ٢٠٠٠، دەزگای چاپ ه پەخشی سەردەم (گەنج)
منظومە کردی شیخ فرخ و خاتون استی، قادرفتاحی قاضی، انتشارات دانشگاه تبریز، ١٣٥١ (شێخ فەرخ)
منظومە کردی لاس و خزال، قادرفتاحی قاضی، انتشارات دانشگاه تبریز، ١٣٧٩ (لاس و خەزاڵ)
منظومە کردی مهر و وفا، قادرفتاحی قاضی، انتشارات دانشگاه تبریز، ١٣٤٥ (مێر و وەفا)

## فارسی

فرهنگ گیل و دیلم، محمود پاینده، انتشارات امیرکبیر، چاپ دوم، ۱۳۷۵
فرهنگ لری، حمید ایزد پناه، موسسه انتشارات آگاه، چاپ دوم، ۱۳۶۳
فرهنگ گویش کرمانی، محمود صرافی، مجتمع فرهنگی سروش، تهران، چاپ اول، ۱۳۷۵

## به زمانی دیکه

KURDISH-ENGLISH DICTIONARY by TOUFIQ WAHBY AND C.J.EDMONDS. OXFORD. 1966 (وەهبی)

## کورتکراوەکان

| | |
|---|---|
| ئا. | ئاناتۆمی |
| ئار | ئارامیی |
| ئاس | ئاسێتیی |
| ئاک. | ئاوەڵکار |
| ئال | ئالمانیی |
| ئام. | ئامراز |
| ئام. ل | ئامرازی لێکدراو |
| ئان. | ئاوەڵناو |
| ئان. فا | ئاوەڵناوی فاعلی |
| ئان. ل | ئاوەڵناوی لێکدراو |
| ئان. مفـ. | ئاوەڵناوی مفعولی |
| باش | باشووریی |
| باک | باکووریی |
| بڕ: | بڕوانە! |
| بیر | بیرجەندیی |
| بەخ | بەختیاریی |
| بەل | بەلووچیی |
| پار | پارتیی |
| پاز | پازەند |
| پاشـ. | پاشگر |
| پەش | پەشتوو |
| پەه | پەهلەویی |
| پێشـ. | پێشگر |
| پێشـ. ل | پێشگری لێکدراو |
| تات | تاتیی |
| تاج | تاجیکیی |
| تال | تالشیی |
| تور | تورکیی |
| تەب | تەبەریی |
| جنا. | جێناو |
| چا. ل | چاوگی لازم |
| چا. م | چاوگی متعدی |
| چا. مخ | چاوگی مرخم |
| حر. | حرف ربط |
| حم. | حاصل مصدر |
| خوار | خوارەزمیی |
| خوت | خوتەنیی |
| ر. | ریشە |
| روس | رووسیی |
| زا | زازایی |
| ژ. | ژمارە |
| سان | سانسکریت |
| سور | سوریانیی |
| سوغ | سوغدیی |
| سۆر | سۆرانیی |
| شر. | شێوە رستە |
| عبر | عیبریی |
| عەر | عەرەبیی |
| فار | فارسیی |
| فەر | فەرانسیی |
| کرم | کرمانیی |
| کنـ. | کنایە |

| | |
|---|---|
| گیا. | گیا |
| گیانـ. | گیاندار |
| گیل | گیلەکیی |
| لات | لاتینی |
| لار | لاریی |
| لۆر | لۆڕیی |
| ماز | مازندەرانیی |
| مجـ. | مەجاز |
| مغو | مەغوولیی |
| منج | مونجیی |
| موک | موکریانیی |
| مۆس. | مۆسیقا |
| نا. | ناو |
| نا. ل | ناوی لێکدراو |
| نا. فا | ناوی فاعلی |
| نا. م | ناوی مەسدەر |
| نا. مفـ. | ناوی مفعولی |
| ناو | ناوەندیی |
| نز. | نیزامی |
| وشد. | وشەدەنگ |
| هس | هەڵیسەنگێنە! |
| هەخ | هەخامەنشیی |
| هەو | هەورامیی |
| هند | هیندیی |
| هیک | هیندیی کۆن |
| ئۆر | ئۆردوو |

| | |
|---|---|
| ئەرم | ئەرمەنیی |
| ئەو | ئەوێستایی |
| یون | یوونانیی |
| یەغ | یەغنووبیی |
| ئەر | ئەردەڵانیی |
| ئەک | ئەکدیی |
| ئیتا | ئیتالیایی |
| ئیس | ئیسپانیایی |
| ئین | ئینگلیسیی |
| ئێک | ئێرانیی کۆن |

## ئیشارەکان

⁙ وێنە و نموونەی وشە لە رستە و شێعر دا.
/ جیا کردنەوەی دوو رستە یان بەند و بەیت لە یەکتر.
// دژمانا یا دژبەری وشە (متضاد)
~ دووپاتە بوونەوەی وشە لە چاوگی لێکدراو دا.
|| ناوی لێکدراو
* چاوگی لێکدراوی وشە یا ناوێکی لێکدراو.

# پ

**پ -** سێهەمین پیتی زمانی کوردیی، ناوی ئەم پیتە پێ - یە و لە نێو وشە دا بە چوار جۆر خۆ دەنوێنێ (پـ . ـپـ . ـپ . پ)(پا، سپاردن، ئەسپ، تەپ)

پێ دەگەڵ هەندێک پیتی دیکە ئاڵوگۆڕیان هەیە. دەگەڵ پیتی **م:** تەپ، تەم - پێشوولە، مێشوولە. دەگەڵ پیتی **و:** خراپ، خراو - چوارپێ، چواروێ.

**پا**$^{1}$ (نا.)[بڕ: پێ1] ١- (ئا.) بەشێک لە ئەندام کە قورسایی لەشی لە سەرە و مرۆڤ یا گیاندار پێی دەڕوا، بەشی ژێرەوەی لەش لە رانەوە هەتا پەنجەکانی پێ، لاق، قاچ. ٢- (ئا.) بەشی ژێرەوەی قاچ لە گوێزینگەوە هەتا پەنجەکانی پێ. ٣- (ئا.) ئەندامی بزووتن و پێ رۆیشتنی گیاندارەکانی دیکە. ٤- یەکەیەکی پێوانە بەرابەر دەگەڵ هەنگاوێک. ٥- بن و ژێری هەر شتێک. ⁂ پای دیوار، پای درەخت. ٦- بەرابەر، هاوشان و یەک بوون. ٧- وەئەستۆ گرتن، لە سەر، لەمل. ⁂ جێبەجێ کردنی ئەو کارە لە پای تۆ. پارەکە لە پای من حیساب بکە! ٨- بەشدار، هاوپا لە کار و ئیش و مەسەلەیەک. ⁂ پای قومار. ٩- پەلەپیتکەی تفەنگ و دەمانچە. **~ بە یەکا هاتن:** لێک هالانی پێ. **~ پیا ساوین:** ١- پێ رێخستن، پێشێل کردن. ٢- (کنـ.) چاوپۆشی لێکردن و لە بیر کردنەوەی کار و کردەوەیەک. || **پای**

**قومار:** کەس یا کەسانێک کە هەمیشە بە یەکەوە قومار دەکەن.

**پا**$^{2}$ (ئان.) سواوی وشەی پاک (بڕ: پاک). ~ **بوون:** بڕ: پاک بوون. ~ **بوونەوە:** بڕ: پاک بوونەوە. ~ **کردن:** بڕ: پاک کردن. ~ **کردنەوە:** بڕ: پاک کردنەوە.

**پا**$^{3}$ (پێشـ.) پێشگری کارە لە زاراوەی زازایی دا. (بڕ: پێ3) :: پادایش (پێدان).

**پابۆس** (نا. فا)[پا1 + بۆس][فار: پابوس] کەسێک کە پێی کەسێکی دیکە راموسێ. :: مەر ئەوسا دڵم خاڵی جە خەم کەم/ جەستەم وە پابۆس پای سپی شەم کەم (وەلی دیوانە ل ٣٩).

**پابەرە** (نا. ل)[پا1 + بەر7 + ئە][ئەر] دەرپێ، ئاواڵکراس، پاوەرە، پاوەرێ.

**پابەست** (نا. مف.)[پا1 + بەست] پابەستراو، ئەسیر، گرفتار، پابەستە، پابەند.

**پابەستە** (نا. مف)[پا1 + بەستە] ١ـ کەسێک کە پێی بەسترابێتەوە. ٢ـ ئەسیر، بەندیی، بەستراو. ٣ـ گیرۆدە، ئەویندار. :: مەنعی ناڵینی وەفایی مەکە مەجنوون سیفەتە/ ئاخر ئەو غەمزەدە پابەستەیی لەیلایەکە (وەفایی ل ١٣١). & پێبەستە. ~ **بوون:** ١ـ ئەسیر بوون، گرفتار بوون. ٢ـ گیرۆدە بوون، ئەویندار بوون. ٣ـ بەسترانەوە بە کەسێک. & پێبەستە بوون.

**پابەن** (نا. ل)[پا1+ بەن1] بڕ: پابەند

**پابەند** (نا. ل)[پا1+ بەند] ١ـ بەندێکی ئاسن یا گوریسێکی درێژە کە لاقی بەرزە ولاغی پی دەبەستنەوە بۆ ئەوەی کە بلەوەڕێ و دوور نەبێتەوە، پێوەند. ٢ـ هۆگر، بەستراو بە شتێک، گرفتار، پێبەند. :: هەموو عالەمتە پابەند و لە دامان/ کەچی دەستی کەست ناگاتە دامان (مەحوی ل ٢٤٢). & پابەن. ~ **بوون:** هۆگر بوون، بە شتێکەوە بەستران، سەر بە شتێک بوون، پێبەند بوون. :: ئەم کوڕەم پابەندی چ نیە. دوژمن پابەندی هیچ یاسایەکی ئینسانی نیە. ~ **کردن:** هۆگر کردن، بەستنەوەی کەسێک بە شتێک، پێبەند کردن.

**پابەندیی** (حم.)[پابەند + ئیی] وابەستەبوون، هۆگریی، پابەند بوون، پێبەندیی.

**پاپ** (نا.)[یون: pappas] سەرۆک و

پێشەوای قەشەکانی مەسیحی کاتۆلیک کە ناوەندەکەی لە واتیکانە، پاپا. (وشەی پاپ بە مـــــانای باب یا باوک ـ ە و پرۆتستانەکان بڕوایان بە پاپ نیە.)

**پاپا**[1] (نا.) ١ـ کەوش یا پێڵاو بە زمانی منداڵان. ٢ـ پێ بە زمانی منداڵان.

**پاپا**[2] (نا.) بڕ: پاپ

**پاپاجانە** (نا. ل)[پاپا1 + جان + ئە] کەوشی منداڵانە، پاپاجانێ، پاپەجانە، پاپەجانی، پاپووچە.

**پاپاجانێ** (نا. ل)[پاپا1 + جان + ئێ][ئەر] بڕ: پاپاجانە

**پاپاخ** (نا.) بڕ: پەپاخ

**پاپاچینە** (نا. ل)[پا1 + پاچینە] ١ـ پەیژە، نەردیوان، پاچینە. ٢ـ شوێن پێ لە دیواری بیر و چاڵاو دا بۆ چوونە خوار و هاتنە سەر.

**پاپاغ** (نا.) بڕ: پەپاخ

**پاپۆڕ** (نا.)[فەر: vapeur] مەکینەی ساز کراو لە چێو یا کانزا کە لە سەر ئاو بۆ سەفەر یا بار کەلکی لێوەردەگرن، کەشتی.

**پاپۆڕەوان** (نا. ل، ئان. ل)[پاپۆڕ + ئە + وان] کەسێک کە سەرۆکی پاپۆڕە و کەشتیکە لێدەخورێ، کەشتیەوان.

**پاپۆش** (نا. ل)[پا1 + پۆش٢/1] [هەو ـ ئەر] ١ـ [بیـــر: پاپووش ـ فـــار: پاپوش ـ پەش: پاپووش، پاپۆخە] کەوش، پێـــڵاو (هس: پاپووچ). ٢ـ [لۆر: پاپوش (شـــالوار)] دەرپێی ژنانە، ئاواڵکراس، پابەرە.

**پاپۆکە** (نا.) بڕ: پاپووکە

**پاپووچ** (نا. ل)[پا1 + پووچ][باک] [هس: پاپۆش] بڕ: پاپووچە

**پاپووچە** (نا. ل)[پاپووچ + ئە] جۆرێک پاڵایە لە خوری یا کاموا دەیچنن یا ئەوە کە لە پەڕۆ دەیدروون و لە ماڵ دا دەیپێی منداڵی دەکـــەن. پاپووچە بۆ گەورەش ساز دەکرێ کە پتر زستانان لە نێـــو مـــاڵ دە پێی دەکـــەن، پاپووچ، پاپاجانێ، پاپاجانە.

**پاپووکە** (نا.)[ناو: پاپووکە، پاپۆکە، پەپکە ـ هەو: پەپکە] ماری لە خۆ هاڵاو، چەمـــبـــەرە. **~ بەستن:** بڕ: پاپووکە خواردن. **~ خواردن:** کۆ بوونەوەی مار لە ســەر خــۆی، پاپووکە دان، پاپووکە خـواردنەوە، ئاخڵـە دان، پەپکە بەستن، پەپکە دان، پەپکە خـــــواردن. **~ خواردنەوە:** بڕ: پاپووکە خواردن. **~**

**دان:** بڕ: پاپووکە خواردن.

**پاپە** (نا.)[هس: پەڵپ] پەڵپ، بیانوو. **~ گرتن:** پەڵپ گرتن. **~ لێگرتن:** پەڵپ پێگرتن. ‫:: دەیانگوت: دایە خراپ قەوماوە/ مەڕەکان بەرهەڵدایە، پاپەی لە خاتوون ئەستی گرتوە ئەم پیاوە (مان ل ١٤٩).

**پاپەتی** (ئان. ل)[پا1 + پەتی1][هەو ـ ئەر] ١ـ بێ پێڵاو، پێپەتی، پێخواس. ٢ـ (مجـ.) هەژار و نەدار. & پێپەتی.

**پاپەجانە** (نا. ل)[پاپە (پاپا) + جان + ئە] بڕ: پاپاجانە

**پاپاجانی** (نا. ل)[پاپا + جان + ئی] [هەو] بڕ: پاپاجانە

**پاپەنجە** (نا. ل)[پا1 + پەنجە] نێردیوان، پەیژە، پاچینە.

**پاپیرۆس** (گیا.)[لات: papyrus لە یوونانی papyros] جۆرێک قامیش لە تیرەی جەگەن. لە میسر خەڵک ناوەکەیان دەخوارد و خۆشیان دەکردە کەندر و جۆرە کاغەز یا مقەوایەکیان لێ ساز دەکرد و لەسەریان دەنووسی. میسریەکان ئەو قامیشەیان ریشاڵ ریشاڵ دەکرد و دوایە وەک تان و پۆ لە سەر یەکیان دادەنا و هێندەیان ڕێدەخشاند هەتا جوان پێکەوە دەنووسان. پاپیرۆس هەتا سەدەی هەشتی زایینی برەوی هەبوە، Cyper-us papyrus ناوی لاتینی ئەم گیایەیە، پیزاڵ، پیزڵ، بەردەی.

**پاپیۆن** (نا.)[فەر: papillon (پەپوولە)] چەشنێک کراواتی چووکە کە گرێکەی شێوەی پەپوولەی دەدا.

**پاپێچ** (نا. ل)[پا1 + پێچ][ئەر] ١ـ بڕ: پووزپێچ. ٢ـ کەرەسەیەکی گرگرانییە، فشفشە.

**پات**[1] (نا.)[ئەو: بیتیا ـ هەخ: دوڤیتیا ـ پەه: بێت. ناو: پات، پاتە] جار، کەڕەت، بار. ‫:: دووپات، چەندپات.

**پات**[2] (نا.)[؟] زارێکی شەترەنجە. کاتێک دوو غەنیم وەک یەک دێنەوە و هیچ کامیان مات نابن.

**پاتاڵ** (نا. ل)[پاتە2 + ئاڵ4] ١ـ پەڕۆی شڕ و بێکەلک، پەڕۆ و پاڵ، پینە و پەڕۆ. ٢ـ (ئان.) پیر، مرۆڤی پیر و لە کار کەوتوو. ‫:: پیر و پاتاڵ. ٣ـ ماڵات، وڵسات. ٤ـ (کنـ.) پیاوی بێکارە و بێکەلک.

**پاتاوە** (نا. ل)[پا1 + تاو3 + ئە][فار: پاتابە ـ کرم: پاتۆوە ـ گیل: پاتۆوە. باک:

پیتاڤ ـ ناو: پاتاوه، پێتاوه] پاڵا، پێڵاو.

**پاتشا** (نا. ل)[پەهـ: پاتشا] بڕ: پادشا

**پاتشازاده** (ئان. ل، نا. ل)[پاتشا + زاده] بڕ: پادشازاده

**پاتشایانه** (ئان. ل، ئاک. ل)[پاتشا + یانه (ئانه2)] بڕ: پادشایانه

**پاتشایەتیی** (حم.)[پاتشا + یەتیی] بڕ: پادشایەتی

**پاتشایی** (حم.)[پاتشا + یی] بڕ: پادشایەتی

**پاتن** (چا. م)[باک] بڕ: پێژتن

**پاتک** (ئا.)[باک] پژمل، پشت مل

**پاتۆخ** (نا. ل)[پا + تۆخ][ئەر] بڕ: پاتووق.

**پاتۆلۆژی** (نا.)[فەر: pathologie] زانستێکه که له سەر هۆ و چلۆنایەتی نەخۆشی دەکۆڵێتەوه و باسی لێدەکا.

**پاتۆڵ** (نا.) بڕ: پانتۆڵ

**پاتووق** (نا. ل)[پا + تووق (تور: توغ= ئاڵا)] شوێنی کۆ بوونەوه و یەکتر دیتنی دۆست و ناسیاو و کۆمەڵێک کەس له شوێنێکی تایبەتی و هەمیشەیی، پاتۆخ.

**پاته**[1] (نا.) بڕ: پات1. ؛؛ دووپاته

**پاته**[2] (نا.)[باک] پینه

**پاته**[3] (نا.)[؟][باک] سەلام، سڵاو.

~ **لێخستن:** سڵاو لێکردن.

**پاتەته** (نا. ل)[پا1 + تەته1] بڕ: پێتاته

**پاتەخت** (نا. ل)[پا1 + تەخت/8] شاری ناوەندی دەستەڵاتداریی وڵاتێک که کاروباری دەوڵەت لەوێوه هەڵدەسووڕێ، پێتەخت، پایتەخت.

**پاتیره** (نا.)[زا] بڕ: فەتیر

**پاتیل** (نا.) بڕ: پاتیله1

**پاتیله**[1] (نا.)[سان: پاتیله] مەنجەڵی گەورەی مسی که له شوێنێک یا له سەر سەکۆ یەک دایدەمەزرێن بۆ ساز کردنی چێشتی زۆر، قازان، پاتیل، پاتێڵ، پاتێڵه.

**پاتیله**[2] (نا.)[باک ـ زا] بڕ: فەتیر

**پاتێڵ** (نا.)[ئەر] بڕ: پاتیله1

**پاتێڵه** (نا.)[ئەر] بڕ: پاتیله1

**پاجا** (نا.)[زا] بڕ: پاجه

**پاجه** (نا.)[باک ـ زا] ١ـ پەنجەره، دەلاقه، پاجا، پاژا. ٢ـ کولانه، رۆچنا.

**تێبینی:** باجا له تورکی دا و باجه له

فــارســی دا بە مــانــای کــولانە هــاتوون. وشـەکـە تورکی نیـە و لە فـارسـیش دا چ ریشــەیەکـیــان بۆ دیاری نەکـردوە. بۆی هەیە کـە وشــەکــە لە [پـا + جـا یـا جێ] پێکهاتبێ.

**پاچ**[1] (ر.) ١ـ رەگـی پاچـین و داپاچـین و هـەڵپـــاچین. ٢ـ (نـا.)[نـاو: پا چ ـ هـەو: پا چ] جـۆرێک قـوڵینگە کـە بۆ هـەڵکەندنی زەوی کەلکی لێوەردەگرن بەڵام یەک دمی هەیە و زەوی دەبڕێ، قـــەزمـــە. ‖ **پاچی هەرمەنی (ئەرمەنی):** (کنـ.) کەسێک کـە لە سـەر مـەبەستێک زۆر پێداگرێ و رەق بێ.

**پاچ**[2] (نا.)[باک ـ زا] بڕ: ماچ

**پاچ**[3] (نـا.)[؟] ١ـ [بـاک ـ زا] جــــاو، کـەتـان. ٢ـ [زا] کـورتەک، پەسـتــەک. ٣ـ [زا] کراسی درێژی ژنان

**پاچاڵ** (نا. ل)[پا1 + چاڵ] بڕ: پێچاڵ

**پاچرا** (نا. ل)[پا1 + چرا] بڕ: پێچرا

**پـاچـرکـێ** (ئـاک. ل)[پــا1 + چـرک (چرکە) + ئێ][ئەر] بڕ: پێدزە

**پاچڤان** (ئان. ل، نا. ل)[پاچڤە + ڤان] [باک] کـەسـێک کـە کـاری وەرگـێـڕانە، دیلمانج، تەرجمان، وەرگێڕ.

**پاچڤە** (نا.)[باک] وەرگێڕانی قسـە و نووســــراوەیەک لە زمــانێکەوە بۆ ســـەر زمانێکی دیکە، تەرجومە، پەچڤە.

**تێبینی:** پێموایە پاچڤە [پا چ + ڤە] لە ئەپا چ ـ ی ئەوێســتــایی و پەهـلـەویـی بە مـانای پاش و پشـت و ئاوەژووی کـوردیی کەوتبێ.

**پاچکاریی** (حم.)[پا چ1 + کــــار + ئیی] کــاری هـەڵکەندنی زەوی. ⁂ یەک دوو سـاعـەتمـان پاچکاری هـەیە و دوایی تەواو دەبین.

**پاچکە** (نـا. ل)[پا1 + چکە][هـەو ـ ئەر] ١ـ (ئا.) بڕ: پاچە. ٢ـ پێچکە و پایە کـــەرەســــەی وەک تەخـت و کــورسـی و سەندەڵی.

**پاچوولکە** (نا. ل)[پا چ1 + ئوولکە] پاچێکی چکۆڵـەیە کـە بۆ هەندێک کـار و بـاری بەنـایی و چاڵاو و بنکۆڵ کـــەلکی لێوەردەگرن، پاچەکۆڵە.

**پاچە** (نـا. ل)[پــا1 + چە1] ١ـ (ئـا.) [پەش: پـاچـە ـ بیـر: پـاچـە ـ فـار: پـاچـە ـ کـــــرم: پـاچـا. بـاک: پـاچـە ـ نـاو: پـاچـە، پاچکە ـ هەو: پاچکە] پێ و قاچکی ئاژەڵ و مـەڕ و مــاڵات کـە سـەروپێی پێ سـاز دەکـــەن، قــاچـک. ٢ـ شـــوێنی بنـەوەی

شـاڵوار و پاتۆڵ کـە دادەگـرترێتـەوە، دەلینگ.

**پـاچەچی** (نـا. ل)[پـاچـە + چـی2] کەسێک کە سەروپێ دەفرۆشێ، سەروپێ فرۆش.

**پاچەکـوو** (نا. ل)[پاچە + کـوو][هەو] بڕ: پێدەشت

**پاچەکـۆڵە** (نا. ل)[پاچ1 + ئە + کـۆڵ (کۆڵین) + ئە] بڕ: پاچوولکە

**پاچین** (چا. م)[؟] ١ـ هـەڵپـاچـین. ٢ـ هـەڵپـەرتاوتنی دار و درەخت، هـەرەس کردن.

**پاچینگەهـ** (نا. ل)[پا1 + چین + گەهـ] [باک] بڕ: پاچینە

**پـاچـینـە** (نـا. ل)[پـا1 + چین + ئـە] [بـاک] نـەردیـوان، پـەیژە، پـاچـینـگـەهـ. (هس: پاپاچینە)

**پاحن** (ئان)[باک] بڕ: پان

**پاحنی** (نا.)[باک] بڕ: پاژنە

**پاخـر** (نا.)[تور: bakır][باک ـ زا] بڕ: مس.

**پاخـوا** (نا. ل)[پا1 + خـوا][ئەر] بڕ: پێخوێ

**پاخـۆشـە** (نا. ل)[پا1 + خـۆش + ئە] شـوێن و ڕێگا و بانێک کە هاتووچۆی بە سـەر دا زۆر بێ و بە پـێ کـوترابێ و پێشێل کرابێ.

**پاخـەسـوو** (نا. ل)[پا1 + خـەسـوو] [ئەر] بڕ: پێخەسوو

**پاخێل** (نا.)[باک] بڕ: پارخێل

**پـادار** (نـا. ل، ئـان. ل)[پـا1 + دار2] هـەر گـیـانـدارێک کـە پێی هـەبێ، خـاوەن پێ. ።፡ پاداران بگرە، بێـپـا ئـی خـۆتە (امثال و حکم ل ٧٩).

**پاداش** (نـا. چا)[پـاز: پـادائیـشـن، پـاداشـن ـ پـەهـ: پـات داشـن، پـات دەهیـشـن، پاداشـن. باک: پاداش ـ ناو: پاداش، پاداشت] سـزا، حـەق، مـز، خـەڵات. **~ دان:** لە بـەر چاو گـرتـنی حـەقی چاکـە و کـردەوەیەکی باش. ።፡ ئەگـەر ئەوسـاڵ دەرسـەکـانت بخـوێنی پاداشـێکی باشت دەدەمێ. **~ دانەوە:** سـزا دانەوە، حـەق دانەوەی کـاری باش و خـراپ. ።፡ کـاری چاک و خـراپ لە لای خـودا بێ پاداشت نامـێنێـتـەوە. ئـاوا پاداشی چاکەم دەدەیەوە؟!

**پاداشت** (نا. چا) بڕ: پاداش

**پاداو** (نا. ل)[پا1 + داو] ١ـ تەپکە و

تەڵەیەک کە داوەکانی لە مووی کلکی ئەسپ و بارگین ساز دەکەن و لە سەر تەختەیەکی قایم دەکەن، دانی لە سەر ڕۆ دەکەن و مەل و باڵندەی پێدەگرن، خەپک، دافک، تەپکە1. ٢ـ [ئەر] نێرەکەوێک کە راوچی بۆ راوی سیاسووتی دەبەن هەتا بخوێنێ و نێرەکەوی دیکە بە دەنگیەوە بێن بیانەوێ ماکەوی لە چنگ دەرێن و لە داو کەون، بەق2. ٣ـ چەرمێکی بە ئاڵقە لە قاچی دەبەستن بۆ بە دار هەڵچوون (هەنبانە بۆرینە ب ١ ل ٩٦).

**پادشا** (نا. ل)[پاد + شا][هەخ: پەتیخشایەثییە ـ پەه: پاتەخشا. فار: پادشاه ـ پەش: پاچا، پادشاه. باک: پادیشاه، پاشا ـ ناو: پاشا، پاتشا، پادشا، پاوشا ـ هەو: پادشا، پاشا ـ زا: پاشا، پادیشا، پادیشاه] ١ـ هەر میرێک کە خاوەنی تەخت و تاج بێ، سوڵتان. ٢ـ دەستەڵاتدار، خاوەن هێز و دەستەڵات. ٣ـ خودا. ‖ **پادشای بێ مەکان:** (کنـ.) خودا. **پادشای پەروەردگار:** (کنـ.) خودا. ⁘ ئەوە خۆی دەسپارد بە پادشای پەروەردگار و بە سوبحانە (سەعید و میرسێوەدین ل ٢١٠). **پادشای جەببار:** (کنـ.) خودا،جەببار (یەک لە سفەتەکانی خودا). ⁘ ئێمە کردەوەی خوداین، هەمووی خوڵقاندووین ئەو پادشای جەببارە (لاس و خەزاڵ ل ٣). **پادشای ڕەببانی:** (کنـ.) خودا. **پادشای غەفوور:** (کنـ.) خودا، غەفوور (یەک لە سفەتەکانی خودا). ⁘ ئەوەش تەمەننا دەکەم لە پادشای غەفوور (لاس و خەزاڵ ل ١٣٨).

**پادشازادە** (ئان. ل، نا. ل)[پادشا + زادە] کوڕی شا، شازادە، پاشازادە، پاتشازادە.

**پادشایانە** (ئان. ل)[پادشا + یانە (ئانە2)] ١ـ هەرچی کە لە شا بوەشێتەوە، شیاوی پادشا. ٢ـ (ئاک. ل) وەکوو پادشا، چەشنی پادشا. ⁘ زەماوەندێکی پادشایانەی ساز کردبوو. & پاشایانە، پاتشایانە.

**پادشایەتی** (حم.)[پادشا + یەتی] [پەه: پاتەخشاییە] کاری پادشا، سەڵتەنەت، حکوومەت، پاشایەتی، پاتشایەتی، پادشایی، پاتشایی. **~ کردن:** حکوومەت کردن.

**پادشایی** (حم.)[پادشا + یی] بڕ: پادشایەتی

**پادگان** (نا.)[فار: پادگان] شوێنێک

کە سپا یا قۆشەنێکی سەرباز تێدا دەژی، سەربازخانە.

**پادەرانە** (نا. ل)[پا1 + دەر + ئانە2] پارەیەک کە کەسی مەشموولی سەربازی لە سەردەمی قاجار دا مانگانە دەیدا بە کەسێک کە لەجیات ئەو خزمەتی دەکرد.

**پادەشت** (نا. ل)[پا1 + دەشت] بڕ: پێدەشت

**پادەم** (نا. ل)[پا1 + دەم2][هەو] ئامێرێکە وەک هەنبانە کە ئاسینگەر و زێڕینگەر بۆ گەشانەوەی کوورە کەلکی لێوەردەگرن و چەند جۆری هەیە. هەندێک بە پێ و هەندێک بە دەست کوتان با دەدەنە دەرەوە. ⁂ ئارۆ راگەم کەفت نە ئاهینگەرێ/ دیم کە نیشتەبێ کان گەوهەرێ/ پادەم مەدەمنا زوڵف عەنبەرێ (مەولەوی ل ٤٤٤).

**پادەو** (نا. ل)[پا1 + دەو][فار: پادو] شاگرد یا کەسێک کە لە دوکان و بازاڕ بە شوێن و کار و باری دا دەنێرن.

**پادیشا** (نا. ل)[زا] بڕ: پادشا

**پادیشاه** (نا. ل)[باک ـ زا] بڕ: پادشا

**پادینگ** (نا. ل)[پا1 + دینگ] ئامرازێکی برینج کوتانە کە بە پێ کار دەکا بۆ جیا کردنەوەی برینج و چەڵتووک لە یەک، دینگ، برنجکوت.

**پار**[1] (ئاک.)[ئەو: پەئورڤە ـ هەخ: پەروڤە ـ سان: پەروت ـ پەه: پار. تات: ئاپارە، ئەپارە ـ فار: پار ـ لۆر: پار ـ بیر: پار. باک: پار ـ ناو: پار ـ هەو: پار ـ زا: پار] ١ـ ساڵی پێش، ساڵی رابوردوو، پارەکە. ٢ـ (ئان.) هەرچی کە پێوەندی بە ساڵی رابوردوو هەبێ، پارەکە. ⁂ کراسی پار، تەقویمی پار. & پارین، پارێن.

**پار**[2] (ئان.)[پەه: پارەک. باک: پار ـ ناو: پار ـ زا: پار][بڕ: پارە] ١ـ بەشێک لە شتێک، بەش، پارچە، پارە، پاژ. ٢ـ کەلاف، ماشەر.

**پار**[3] (نا.)[سۆر] بڕ: پاڵ. ⁂ یار غەزاڵێ غەزاڵێ خۆمم دەخزاندە پارێ/ گوتمێ بێنە ماچت کەم مەمکت سێوە بە دارێ (سێسەد هۆنراوە ل ١٤).

**پارازتن** (چا. م)[ئەر] بڕ: پاراستن

**پارازیت** (نا.)[یون: parasitos] ١ـ مفتەخۆر، گیاندارێک کە لە نێو لەشی گیاندارێکی دیکە دا دەژی و خۆراکی خۆی لە لەشی ئەو وەدەست دەخا. (لە یوونانی کۆن کەسانێکی وەک مجێور

هەبوون کە نانیان بۆ مەعبەدەکان کۆ دەکردەوە و بەو کەسانەیان دەکوت پارازیت) ٢ـ شەپۆلی شێوێنەری ئیزگەی رادیۆ. ٣ـ (کنـ.) تەوس. **~ خستنە سەر:** شێواندنی شەپۆلی رادیویی بە هاویشتنی شەپۆلێکی دیکە وەها کە باش نەبیسرێ و خشەی بێ. **~ هاویشتن:** چوونە نێو قسەی یەکی دیکەوە یا قسە پەڕاندن و لاتاو لێدان بۆ ئەزیەت کردنی قسەکەر.

**پارافین** (نا.)[فەر: paraffine] مادەیەکی چەوری مەیوی سپی و بێ بۆن و تامە کە لە نەفت دەگرترێ و بۆ هەندێک دەوا و دەرمان و کەرەسەی خۆ رازاندنەوە و شەم کەلکی لێوەردەگرن.

**پاراستن** (چا. م)[ئەو: پەئیتی رەئێک ـ پەه: پەهرێختەن. باک: پاراستن، پارازتن، پارستن، پارێزتن ـ ناو: پاراستن، پارازتن ـ هەو: پارێزنای] ١ـ چاوەدێری کردن و ئاگا لێبوون لە کەسێک یا لە شتێک بۆ ئەوەی چی بە سەر نەیە. ٢ـ بواردن، لێ رەد بوون، تێپەڕاندن.

**پاراسوو** (نا.)[باک] بڕ: پەراسوو

**پاراڤ** (ئان. ل)[پار + ئاڤ][باک] بڕ:

**پاراو** (ئان. ل)[پار + ئاو1] ١ـ حاڵی گیاوگۆڵ و دەغڵێک باش ئاوی لێنەبڕێ و هەمیشە تێراو بێ، تێراو. ٢ـ شەق و تازە، تورت و گەش، تەڕ و پاراو، پاراڤ. ٣ـ تیر و تەسەل. ∷ ئەی وەتەن کەنگێ رەوایە مەستی خەو بێ پاسەوان/ گورگی دوژمن کەوتە کۆزی مێگەلی پاراوی تۆ (هێدی ل ٣٠٠). **~ بوون:** ١ـ تێراو بوون. ٢ـ تورت و گەش بوون. **~ کردن:** ١ـ ئاو داشتنی زەراعەت، دێران، تێراو کردن. ٢ـ تورت و گەش کردن.

**تێبینی:** پێموایە وشەی پار لە پاراو دا پێوەندییەکی زۆری بە یەکێک لە تێبینییەکانی بار5 هەیە. هەروەها هاوڕیشەی ئەم وشەیە لە زمانی فارسی دا بە شێوەی پاراب، باراب، پاریاب بە مانای زەوی بەراو و ئاویی یا زەراعەتێک کە بە ئاوی چۆم و جۆبار درابێ، هاتوە.

**پارپار** (گیا.)[پار2 + پار2] بڕ: پرپرە/١.

**پارتی** (نا.)[فەر: partie] ١ـ کۆمەڵە و تەشکیلاتی تاقمێکی هاو بیر و بڕوا کە بۆ وەدی هێنانی ئامانجەکانیان

پێکیدێنن، حیزب. ٢ـ دەستەڵاتدار و دەست رۆیشتنێک کە قانوونی یان غەیری قانوونی بۆ جێبەجێ کردن یان جێبەجێ بوونی کاری کەسێک کەلکی لێوەردەگرترێ. لاینگر و پشتگر لە شوێنێک، پاڵپشت. ∷ مامی حوسێن بۆ دامەزراندن پارتییەکی باشە. پیاو بێ پارتی کارەکانی بۆ ناچێتە پێش. ٣ـ میوانی و ئاهەنگێک بە بەزم و سەما و مۆسیقاوە کە پتر لاو و گەنجەکان دەیگرن. ∷ گەنجی ئێستا حەوتووی دوو سێ شەو پارتیان هەیە. **بوونە ~ کەسێک:** کەلک وەرگرتن لە دەستەڵات و دەست رۆینی خۆ بۆ جێبەجێ کردنی کار یان گرفتی کەسێک. **کردنە ~:** لە دەستەڵاتی کەسێک کەلک وەرگرتن بۆ جێبەجێ کردنی کار و بار. ∷ ئەو کارە خۆم وە دەستم خست باوەڕ کە کەسم نەکردە پارتی خۆم. **~ هەبوون** ناسیاوێکی سایەچەور یا کاربەدەستێک لە شوێنێک هەبوون بۆ جێبەجێ کردنی بێ گیروگرفتی کار و بارێک.

**پارتیبازیی** (حم.)[پارتی/٢ + بازیی] ئاکامی پارتی. **~ کردن:** کەلک وەرگرتن و دە کار کردنی پارتی و دەستەڵات بۆ جێبەجێ کردنی کار و مەسەلەیەک. ∷ زۆرکەس پارتیبازیی دەکەن و دەچنە زانستگا.

**پارتیزان** (نا.)[فەر: partisan] چەکداری سەر بە رێکخراوە و حیزبێک کە دەگەڵ دەوڵەتی خۆیی شەڕ دەکا، پێشمەرگە.

**پارچ** (نا.)[لۆڕ: پارچ ـ فار: پارچ. ناو: پارچ ـ هەو: پارچ] دەفرێکی گڵێنە یا شووشەیی یا کانزای درێژ و قوڵی دەسکدارە کە ئاو و ساردیی بۆ خواردنەوە تێدەکەن و لە سەر سفرەی یا شوێنی دیکەی دادەنێن، تونگە.

**پارچان** (چا. ل)[لە: پەرچ] داکوترانی بزمار و شتی تیژ و خوار بوونەوەی لە پشتەوە. ∷ کوڵمەی دەڵێی بەفرە و دۆشاوی پێدارژاوە/ تیرێکت لە جەرگی داوم لە پشتم پارچاوە (مێر و وەفا ل ٧٣).

**پارچە** (نا. ل)[پار2 + چە1][باک: پارچە، پەرچە ـ ناو: پارچە ـ هەو: پارچە ـ زا: پارچە، پەرچە] ١ـ کوت، لەت، پار2.. ٢ـ یەکەیەکە بۆ خاک و زەوی. ∷ سێ پارچە زەوییم لە شار هەبوو بە هەرزان فرۆشتم. ٣ـ هەر شتێکی چنراو لە لۆکە و پەشم و شتی دیکە، پەرچە،

قوماش.

**پارچەپارچە** (نا. ل)[پارچە/١ + پارچە/١] لەت و پەت، کوت کوت، لەت لەت، ونجڕونجڕ. ~ **بوون:** لەت و پەت بوون، ونجڕونجڕ بوون، کوت کوت بوون. ~ **کردن:** لەت و پەت کردن، ونجڕونجڕ کردن، کوت کوت کردن.

**پارچەفرۆش** (نا. فا)[پارچە/٢ + فرۆش] کەسێک کە دوکانی پارچەفرۆشی هەیە و کوتاڵ بە خەڵک دەفرۆشێ، کوتاڵ فرۆش، بەزاز.

**پارچەفرۆشیی** (حم.)[پارچەفرۆش + ئیی] کاری کوتاڵ فرۆش، بەزازیی، کووتاڵ فرۆشیی.

**پارچەساز** (نا. فا، ئان ل)[پارچە/٢ + ساز] کەسێک کە لە لۆکە، پەشم یا شتی لەم بابەتە پارچە ساز دەکا.

**پارچەسازیی** (حم.)[پارچەساز + ئیی] شوێنێک کە پارچەی لێ ساز دەکەن.

**پارچەم** (نا.) بڕ: پەرچەم. ∷ ئەمن لێی شین دەکەم وردە پارچەمان، ئەتۆش شین کەوە کەزیەی دەناو مەلانێ (سروە ١٧٨ ل ٤٨)

**پارچین** (نا.)[زا] بڕ: پەرژین

**پارخێل** (نا.)[؟] ١ـ [باک ـ زا] داشقە، عارەبە. ٢ـ [باک] عارەبەی بێ چەرخ، خێشک. & پاخێل.

**پاردم** (نا. ل)[پار (پاڵ) + دم2][زا] بڕ: پاڵوو

**پاردوو** (نا. ل)[پار(پاڵ) + دوو3] بڕ: پاڵوو

**پاردە** (نا.)[پەھ: بار] ١ـ دیوارێکی کورت کە بە وشکەبەرد لە دەوری کانی، گراو یا شوێنی دیکە هەڵیدەچنن. ٢ـ سیپە و حەشارگەی ڕاوکەران. ٣ـ [ئەر] خەندەک، خەندەق

**تێبینی:** بار لە پەهلەویی دا بە مانای دیوار هاتوە. دوور نیە کە پاردە لە دوو بەشی پار + بەردە یانی دیواری بەرد پێکهاتبێ و لە دوایی لێک و لووس و سوابێ و بووبێتە پاردە.

**پارزم** (نا.)[زا] بڕ: پازوون

**پارزن** (نا.)[باک] بڕ: پازوون

**پارزنگ** (نا.)[باک] بڕ: پازوون

**پارزوم** (نا.)[زا] بڕ: پازوون

**پارزۆن** (نا.)[زا] بڕ: پازوون

**پارزوون** (نا.)[باک: پارزن، پارزوون، پارزنگ، پارزوونگ ـ زا: پارزم، پارزوم، پەرزم، پەرزوم، پارزۆن] بڕ: پاڵوێنە

**پارزوونگ** (نا.)[باک] بڕ: پازوون

**پارزی** (گیا.)[باک] دارێکی جوانە، توێکڵی ساقەتی بۆر و گەشە، گەڵاکانی پان و شێوەی دڵیان هەیە و لێوارەکانی گرنی گرنییە، گوڵەکانی سپی و بۆنخۆشن و بە دێمکراوی بۆ چارەسەر کردنی کۆخە کەلکی لێوەردەگرن، Tilia sylvestris ناوی لاتینی ئەم دارەیە، ئەخلاموور. (عەر: زیزفون)

**پارس**[1] (نا.)[لە: پارسایيش (پرسین)][زا] ١ـ بڕ: پرس. ٢ـ [باک ـ زا] سواڵ، سەدەقە.

**پارس**[2] (گیان.)[؟][باک] یوزپڵینگ.

**پارستن** (چا. م)[باک] بڕ: پاراستن

**پارسوو** (نا.)[باک] بڕ: پەراسوو

**پارسە** (نا. ل)[پارس + ئە] ١ـ [زا] سواڵ. ٢ـ [ئەر] کار و پیشەی سواڵکەر، سواڵکەریی، گەدایی.

**پارسەک** (نا. ل)[باک ـ زا][پارس + ئەک] کەسێک کە سواڵ دەکا، گەدا، سواڵکەر.

**پارسەنگ** (نا. ل)[پار2 + سەنگ] [لۆر: پارسەنگ ـ فار: پارسنگ ـ پەش: پارسەنگ. باک: پارسەنگ ـ ناو: پارسەنگ ـ هەو: پارسەنگ] بەردێک کە لە کاتی دانانی دەفرێکی بۆش لە سەر تەرازوو بۆ هاوسەنگی دەخرێتە تایەکەی دیکەی تەرازوو. ~ **خستنە پاڵ:** (کن.) بوختان هەڵبەستن و شتی سووک و ناشیرین خستنە پاڵ کەسێکەوە. ~ **گرتنەوە:** پارسەنگ لە سەر تەرازوو دانان بۆ دەرکەوتنی قورسایی دەفری بۆش. ~ **ویستن:** پێویست بە پارسەنگ هەبوون بۆ میزان بوونی تەرازوو. ~ **ویستنی ئەقڵی کەسێک:** (کن.) شێت بوون، کەموکووڕی ئەقڵ هەبوون، گەوج بوون. ؛؛ کێ ئەقڵی پارسەنگی دەوێ/ شت هەر وەگیر ئەو دەکەوێ (هێدی ل ١٧١).

**پارسی** (ئا.)[باک] بڕ: پەراسوو

**پارسیو** (ئا.)[باک] بڕ: پەراسوو

**پارشەو** (نا. ل)[پار2 + شەو] بڕ: پارشێو

**پارشێو** (نا. ل)[پار2 + شێو][ناو: پارشەو، پارشێو ـ هەو: پارشێو] ١ـ نیوەی دووهەمی شەو، دوای نیوە شەو.

٢ـ خـواردن و شـێـوی پـارشـێـوان کـه کـەسـی ڕۆژووگـر بۆی هـەڵدەسـتـێـتـەوە و بـەر لـە بانگ دان دەیخـوا. **~ کـردن:** خواردنی نانی پارشێوانە.

**پارک**1 (نا.)[فـەر:parc] شـوێنێکی شیناوەردی دەسکردە بۆ گەڕان و پیاسە لە نێو شار یا لە دەورووبەری شار.

**تێبـینی:** پارک لە parricus لاتینی کـۆن بە مـانـای بەهەشت وەرگـیـراوە و ئەویش لـە ئەوێسـتـایی پـەئـیـری دەئـێـزە وەریانگرتوە. لە زەمـانـی مـادەکـان باغ و باغـاتی ئاوەدان و خـۆش هەبـوون کـه پـەرژینـیـــان لـە دیوار بـۆ دەکــــردن و یوونـانـیـــیـــەکــان ئـەو باغـــانـەیان وەک بـەهـەشت بـاس کـــــردوە و لە دوایـی بـەو مـانایە چۆتە نێو زمـانـەکانی ئوورووپایی. (هس: پەرژین، پەرێز، پاریز.....)

**پارک**2 (نا.)[ئین: park] ڕاوەستانی مـاشـێن و ترۆمـبێل لە شـوێنێک. **~ کـردن:** ڕاگـرتـنی ترۆمـبـێل لە شـوێنی تایبەتی

**پارکـەر** (نا. ل)[پار٢/2 + کـەر][ئەر] بڕ: پارگیر

**پارکـۆڵە** (گـیـانـ.)[پار1 + کـۆڵە] بێـچـووی دووسـاڵەی گـیـاندارانی کـێوی وەک گورگ و ورچ و بەراز.

**پارکـــینـگ** (نا.)[ئین: parking] شوێنی تایبەتی ڕاگرتنی ماشێنەکان، کە مـەیدانێکی سەرئاوەڵا یا سـەربەسـتـەیە و ماشین بە کۆمەڵ لەوێ ڕایدەگرن.

**پارگـوێر** (گـیــانـ.)[پار1+ گـوێر (گوێرەکە)] بڕ: پانێر

**پارگـوێل** (گـیـانـ.)[پار1 + گـوێل (گوێلک)] بڕ: پانێر

**پارگۆن** (نا.)[باک] بڕ: پارگین

**پارگـــیـــر** (نا. ل)[پار٢/2 + گـیـر] ئامـرازێکی چێـوییـە کـە بریتـیـیـە لە تەخـتـــەیەکی پان کــە سێ دارۆچکەی تێـچـەقێندراوە و کـەڵاف و مـاشـەری لە سەر هەڵدەکەن، پارکەر.

**پارگین** (نا.)[باک: پارگین، پارگـۆن، پـارێـنـکـە ـ نـاو: پـارگـین، پـاروێـنـک، پارۆنیک] جـۆگـە و خـەندەکی چووکی دەورووبەری چادر و ماڵ یا هەرچی دیکە بۆ دەرچوونی ئاو.

**تێبـینی:** ئەم وشـەیە لە فـارسی دا بە شـــێـوەی پـارگین، بـارگین و لـە زمـــانی پەشـتـوو دا بە شـێـوەی پارگـین هـەر بەم مـانایە هـاتوون و عەرەبی کراوەکەی بۆتە

فارقین.

**پارلمان** (نا.)[فـــەر: parlement] کۆڕی نوێنەرانی هەڵبژاردەی خەڵک کە ئەرکی دانانی یاسا و قانوونی وڵات و پێڕاگەیشتن بە چلۆنایەتی کار و باری دەوڵەتیان بە ئەستۆوەیە، پەرلمان.

**پار و پێـــرار** (ئاک. ل)[پار1 + و + پێرار] یەکێک لە ساڵەکانی رابوردوو، پار یان پێرار. ∷ پارو پێرار دوو سێ مەقالەم لە سەر چلۆنایەتی ئاو و هەوای ناوچە نووسی.

**پاروێنک** (نا.) بڕ: پارگین

**پارۆنەک** (گـیـانـ.)[پارۆن (پارێن)+ ئەک][باک] بڕ: پانێر

**پارۆنیک** (نا.) بڕ: پارگین

**پاروو** (نا. ل)[پار2 + ئوو] ١ـ [باک: پاری ـ ناو: پاروو، پارە ـ زا: پاری] ئەندازەیەک لە چێشت و خواردەمەنی کە بە دەست یا کوتە نانێک هەڵدەگرترێ و بۆ جارێک دەخرێتە دەمەوە، تیکە. ∷ بە دوو پاروویان قاپە چێشتەکەی تەواو کرد. ٢ـ بەشێکی چووک لە هەر شتێک، پارچە، کوت. ٣ـ (مـجـ.) شتێک یا کەسێکی بە نرخ و شیاو. ~ **بادان:** کوتێک نان یا پەنجەکانی دەست لە سەر چێشت راگرتن و سووڕاندنی بۆ پڕ بوون و پتەوە بوونی چێشت لە پەنجە دا، پاروو گرتن. ~ **بژاردن (ژمـــاردن):** (کنـ.) لەچەر و نانکوێربوون. ~ **دە رۆن کەوتن:** (کنـ.) حەسانەوە لە باری ئابووریی و مادییەوە بە بۆنەی پشتیوانی کەسێک یاهەر شتێکی دیکە. ∷ هەرکەس ببێتە زاوای حاجی کەریمی پارووی دە رۆنی دەکەوێ. ~ **دە رۆن هاویشتن:** (کنـ.) پێکهێنانی ئیمکاناتی ماددیی یا هەلومەرجی باش بۆ کەس یا کەسانێک. ژیانی کەس یا کەسانێک لە باری بژیو و ئابوورییەوە خۆش کردن، کەسێک تووشی ژیانێکی خۆش و بە ئیروو کردن. ~ **گرتن:** بڕ: پاروو بادان. ~ **گلاندن:** پارووی زل بادان. ~ **لە زاری خــــۆ دەرێنان و دە زاری کەسێکی دیکە نان:** (کنـ.) سەرەڕای دەستەنگی و پێداویستی خۆ یارمەتی کەسێکی خۆشەویست دان. ∷ ... دۆستی وام هەن ئەگەر حەز بکەم پارووی لە زاری خۆیان دەردێنن و لە زاری منی دەنێن (تاریک و روون ل ٤٤). ~**ی (زاری) کەسێک نەبوون:** (کنـ.) ١ـ شتێک یا کەسێکی بە نرخ کە شیاو کە هەموو کەس نەتوانی دەستی پێی

رابگا. ؛؛ ماشینی گران و کچی جوان پارووی زاری من و تۆ نییە، هی دەوڵەمەندانە. ٢ـ هاوشان نەبوون، هاوسەنگ نەبوون. ؛؛ کچی مام رەسوو هێندە بە پۆزە بە کەلکی هێنان نایە، ئەوە پارووی من نیە. ‖ **پارووی شەرمێ :** (کنـ.) کەمێک چێشت و خواردن لە سەر سفرە کە لە بەر کەم بوون کەس دەستی بۆ نابێ و هەروا دەمێنێتەوە. **پارووی کۆجیلانی :** چەشنێک پاروو کە سەرەکەی فرەوانە و بنەکەی وێک هاتوە بۆ خواردنی شتی شلەی وەک ماست هەتا لە بنەوەی نەڕژێ، قاپووچکە.

**پاروو‌بژێر** (ئان. فا)[لە: پاروو بژاردن] کەسێک کە پارووی میوان دەبژێرێ، پاروو‌ژمێر، لەچەر، نانکوێر.

**پاروو‌زاندن** (چا. م)[باک] بڕ: پاڵاوتن

**پاروو‌ژمێر** (ئان. فا)[لە: پاروو ژماردن] بڕ: پاروو‌بژێر

**پاروو‌گلێن** (ئان. فا)[لە: پاروو گلاندن] کەسێک کە پاروو گەورە و زل لە چێشت بادەدا و چاک دەخوا.

**پارهەڵکەر** (نا. ل)[پار٢/2 + هەڵکەر (هەڵکردن)] چەرخ و ئامێرێکی چێوییە بە شکڵی ئوستوانە کە لە شوێنێکی

دەچەقێنن، بە دەست دەسووڕێ و کەڵاف و ماشەری لە سەر هەڵدەکەن.

**پارە** (نا.)[ئەو: پارە ـ پەه: پارەک. باک: پەرە، پارە ـ ناو: پارە ـ هەو: پارە ـ زا: پەرە] ١ـ پووڵ، دراو، زەڕ. ٢ـ (ئان.) لەت، کوت. ٣ـ دڕاو. ٤ـ [سۆر] بڕ: پاروو. ٥ـ نرخ، بایی، قیمەت. ٦ـ سامان، دەوڵەت. ٧ـ معاش، داهات، دەسکەوتی کار. ~ **بردن:** خەرج هەڵگرتن، پارە تێچوون. ~ **بژاردن (ژماردن):** ١ـ ژماردنی پووڵ و پارە، حیساب کردنی رادەی پارە. ٢ـ قەبووڵ کردنی تاوان و سزا دانەوەکەی بە پارە یا کڕینەوە. ؛؛ هەر چی شووشە ئەو کوڕەم شکاندوویەتی پارەکەی دەبژێرم. ~ **بوون:** ١ـ لەت و کوت بوون. ٢ـ دڕان. ~ **بۆ کەسێک خەرج کردن:** خەرجی رابواردن و گوزەرانی هاوڕێ و هاودەم یا کەسێک دان. ~ **پەیدا کردن:** پارە دەرهێنان، پووڵ پەیدا کردن بۆ بژیو و گوزەران. ~ **پێدان:** ١ـ پووڵ دانە کەسێک. ٢ـ کڕین بە پارە. ~ **تێچوون:** خەرج هەڵگرتن، پارە بردن. ؛؛ ماڵەکەت هەتا ساز بوو چەندی پارە تێچوو؟ ~ **دەرهێنان:** کاسبی کردن و پارە دەست کەوتن، پارە پەیدا کردن،

پووڵ دەرهێنان، پووڵ پەیدا کردن. ⁂ من بە دەستی شکاو دەچووم کارم دەکرد و پارەم بۆ مــــاڵ و منداڵ دەردێنا! **~ دیتنەوە:** ١ـ دۆزینەوەی پووڵ. ٢ـ (کنـ.) سانا دەست کەوتنی ماڵ و سامان. ⁂ تۆ پێتوایە من پووڵ و پارە دەبینمەوە، بە کەیفی خۆت تەخشان پەخشانی دەکەی! **~ کردن:** ١ـ نرخ کردن، بە قیمەت بوون، پارە هێنان. ⁂ قســـەکـانی تۆ پارەیەکی ناکا! ٢ـ لەت و کوت کردن. ٣ـ دڕاندن. **~ و پەڕۆ (کـا) پێ وەک یەک بوون:** (کنـ.) نرخ بۆ مــــاڵ و ســـامـــان دانەنان، جوامێر و دڵگەورە بوون، پووڵ و پەڕۆ پێ وەک یەک بوون. **~ وە سەر یەک نان:** پارە کۆ کردنەوە. **~ هێنان:** بڕ: پارە کردن. || **پارەی بەستەزمان:** پارەیەک کــە قـــەدری نەزانرێ و هەروا بدرێتە دەست کەسی دیکە یا تەخشان پەخشان بکردرێ، پووڵی بەستەزمان. ⁂ ئاخـــر رۆڵە پارەی بەســـتـــەزمـــان چی لێکردووی وا ســووک و سانا دە مست ئـەم و ئەوی دەنـێـی! **پـارەی پـێـش (پێشەکی):** رادەیەکی کەم لە پارە کە لە کاتی سەودا و مەعاملەیەک دەدرێ بە خاوەنی هەتا شتەکەی بە کەسی دیکە نەفرۆشێ، پووڵی پێش، بەیعانە. **پارەی چرووک:** (کنـ.) هیچ، بێنرخ، پارەی رەش. ⁂ هەمـــوو ئاکــــارت پارەیەکی چرووک ناکەن! **پارەی حەرام:** ئەو پووڵ و پارەیەیی کە لە کاسبی و رێگای حەرام پەیدا بووبێ. ⁂ پارەی حەرام لە گەرووی ناچێتـە خـواریّ! **پارەی حـەڵاڵ:** پووڵ و پارەیەک کـــە لـە رێگای حــــەڵاڵ دەست کــەوتبێ. **پارەی دریشت:** ئەسکناس و پارەیەک کە نرخیان زۆر بێ. // پارەی ورد، قــەڕەپووڵ. **پارەی رەش:** ١ـ پووڵی وردە،، قـــــەرەپووڵ. ٢ـ (کنـ.) هیچ، بێ بایخ. & پووڵی رەش. **پارەی سپی:** پووڵی ساز کراو لە زێو، پووڵی سپی. ⁂ پارەی سپی بۆ رۆژی رەش [(کنـ.) لە فەرعانە و سەردەمی ئاسایی دا پاشەکەوت کردن بۆ رۆژی تەنگانە.] **پارەی گـیـرفـان:** ئەو پارەیەک کــــە دایک و باوک دەیدەن بە منداڵ بۆ خەرجی رۆژانە یا حەوتانەی. **پارەی ورد:** سکە و پارەی وردە و کــــەم بایی، قەڕەپووڵ. // پارەی دریشت.

**تێبینی:** پارە pāra لە ئەوێستا دا بە مـــــانای قـــــەرز و پارەک pārak لە پەهلەویی دا بە مـــانای پووڵە هەروەتر خودی وشەی پارە دەچێتەوە سەر پار2 بە مانای کوت و بەش.

**پارەپارە** (نا. ل)[پارە/٢ + پارە/٢]

لەت لەت، لەت و کوت. ~ **کردن:** لەت و کوت کردن، لەت و پەت کردن

**پارەپەرست** (ئان. فـــا)[پارە/١ + پەرەست] کەسێک کە تەنیا پارەی لە لا گرینگە و پارە کۆ دەکاتەوە و خەرجی ناکا، ماڵپەرست، پووڵپەرست، قرنیس، لەچەر، مست قووچاو، رژد. ⁘ هیوا دڵی نایە قرانێک بۆ خۆی خەرج کا پارەپەرستێکە مەگەر خودا بزانێ.

**پارەپەرستیی** (حم.)[پارەپەرست + ئیی] کار و هۆگری کەسی پارەپەرست، ماڵپەرستیی، پووڵپەرستیی.

**پارەپیس** (ئان. ل)[پارە/١ + پیس] مرۆڤی لەچەر و رژد، چرووک، مست قووچاو، پارەپەرست.

**پارەدار** (ئان. فـــا)[پارە/١ + دار2] خاوەن پارە، پووڵدار، دەوڵەمەند.// بێپارە، بێپووڵ.

**پارەداریی** (حم.)[پارەدار + ئیی] خاوەن پارە بوون، دەوڵەمەندیی، پووڵداریی.

**پارەسوو** (ئا.)[باک] بڕ: پەراسوو

**پارەکە** (نا. ل)[پار1 + ئەکە] ساڵی رابوردوو، ساڵی پار.

**پاری** (نا.)[پار2 + ئی][باک] بڕ: پاروو

**پاریز** (نا.)[ئەو: پەئیری دەئێزە] بێستانی تایبەتی تەرەکاری، زەوییەک کە میوە و بەری بڕکەیی لێ دادەچێنن، پارێز2.

**تێبینی:** پاریز و پارێزی زاراوەی باکووریی و پەرێزی زاراوەی ناوەندیی هەر دووک لە ریشەی ئەویستاییی ئەم وشە کەوتوون و لە دوایی ماناکەیان هەندێک ئاڵوگۆڕی بە سەر داهاتوە. هەروەها فـــردوس و پارادیس ـ ی زمانەکانی ئەورووپاییش بە مانای بەهەشت هەر لەم وشەیە گیراون.

**پاریزڤان** (نا. ل ـ ئان. ل)[پاریز + ڤان][باک] کەسێک کە چاوەدێری پالیز دەکا، بێستانەوان، پارێزڤان.

**پارین** (ئان. ل)[پار1 + ئین][زا] بڕ: پار1

**پارێز**[1] (نا.)[پەه: پەهرێچ. باک: پارێز. ناو: پارێز ـ هەو: پارێز ـ زا: پارێز] ١ـ دووری و بەرگری لە هەندێک خواردن. ٢ـ دووری لە هەندێک کەس. ٣ـ هێرشی لە نەکاو. ٤ـ بۆسە، کەمین. ٥ـ رەگی چاوگی پاراستن. ٦ـ ئاگاداری،

چاوەدێریی. ٧ـ پەنامـــەکی، وریایی. :: هەنگاوێ لە سەر شینکە بە پارێز دانێ/ ئەو شینکە لە خاکی مەستەچاوێ راواوە (خـەیام ل ٧٠). **بە ~ کـارێک ئەنجـام دان:** سـەرسەری و هەروا کارێک ئەنجام نەدان، بە پەنامەکی کارێک کردن. :: بە پارێز لێی چوومـە پێش و قسـەم دەگـەڵ کرد! **~ بردن:** هێرش بردنی لە نەکاو. :: ســـەنگەری غـــەمـــزە دەبەستن لە کــەمـینگای چاوان / وەکـوو راوچین و دەبەن بـۆ دڵی زارم پـارێز (ئاوات ل ٩٩). **~ بۆ بردن:** شالاو بردن بۆ کەسێک یا بۆ نێچیر، هێـرش بۆ بردن لە نەکاو. :: پۆلێک مـراوی نیشـتـبوون کـە پارێزم بۆ بردن هـەمـوو هـەڵفـڕین! **~ چوون:** لە بۆسە دا بوون، لە کەمین دا بوون، چوونە پارێز. **~ دان:** خـۆ بە دەسـتــەوە دان، رێ دان، ئیـــزن دان. **~ کــــردن:** ١ـ نەخـواردنی هـەندێک خـواردەمــەنی کـە زەرەری بۆ لـەش و ســلامـــەتی هـەبێ. ٢ـ دوور بوونـەوە لە هـەنـدێک کـــەس کـــە هامــوشــۆیان جـێی مــەترسی و زەرەر بێ. **~ لێســـتـــاندن:** بەر لێگرتن. :: پارێزم لێستاند هـەروەک غـەزاری/ لۆی چوومـە خوارێ لۆ بن کـەنداری (سێسەد هۆنراوە ل ٧٨). **~ ئەنگاوتن:** شـالاو بۆ بردن، پارێز بردن. :: دەورەیان داوە لە چوار تەڕەفـــان، رێگای نیـــە هەڵێ/ بەلان ئەمن خـۆم سـەرڕاو بووم، پارێزێکم دەنگاوت (پـایـزە ل ٢٦). **چوونە ~:** لە کـەمین دا بـوون، پارێز چوون. :: چوومـە پارێزی کە موژگان و برۆم دی لە کەمین/ تیـری من بوو بە کـەمـان، پشـتی کـەمـانم بووە تیر (حاجی قادر ل ٦٤).

**پارێز**$^{2}$ (نا.)[باک] بڕ: پاریز

**پارێزتن** (چا. م)[باک] بڕ: پاراستن

**پارێزڤـــان** (نا. ل ـ ئان. ل)[پارێز2 + ڤان][باک] بڕ: پاریزڤان

**پارێزکـــار** (ئان. فـــا)[پارێز1/ە + کار1/١١] ١ـ کەسێک کە خۆ لە خراپە و شـــتی حـــەرام دەپارێزێ. ٢ـ ئاگـــادار، پارێزەر. & پارێزگار.

**پارێزکـاریی** (حم.)[پارێزکـار + ئیی] ١ـ خۆ لە شتی خراپ و حەرام پاراستن. ٢ـ ئاگاداری، پارێزەریی، پارێزگاریی.

**پارێزگار** (ئان. فا)[پارێز1/ە + گار] بڕ: پارێزکار

**پارێزگـاریی** (حم.)[پارێزگـار + ئی] بڕ: پارێزکاریی

**پارێزگـا** (نا. ل)[پارێز1/ە + گـا] ١ـ

شـوێنی بۆسـە و حـەشـارگـەی راوچی و چەکدار، پارێزگە. ٢ـ ئوستان.

**پارێزگە** (نا. ل)[پارێز1/ە + گە] بڕ: پارێزگا.

**پارێـزەر** (ئان. فـــا)[پـارێـز1/٦ + ئەر][پەھ: پەھرێختـار] ١ـ کـەسێک کـە ئاگـای لـە کـەسـێکی دیکەیە و لە ھەر شـتێکی خـراپ و بـە زیانی دەپارێزێ. ٢ـ پارێزکار، پارێزگار. ٣ـ (نا. ل) وەکیل

**پارێزەریی** (حم.)[پارێزەر + ئیی] بڕ: پارێزکاریی

**پارێن** (نا. ل)[پار + ئێن] ١ـ (گـیانـ.) بڕ: پانێر. ٢ـ (ئان. ل)[زا] بڕ: پار1

**پارێنکە** (نا. ل)[باک] بڕ: پارگین

**پارێنە** (گـیـانـ.)[پار + ئێنە][ھەو ـ ئەر] بڕ: پانێر.

**پاڕان** (چا. ل) بڕ: پاڕانەوە. ⁂ پیـاو کـە بێـدەسـتـەڵات بوو چی پێناکـرێ، پیـــشـــەی ھەر واوەیلا و داد و پاڕانـە لە دەرگـای حــەیی دانا (لاس و خــەزاڵ ل ٤٣). کـەوتوویەتەوە سـەر رۆژی زەلالەتی و پاڕانە و لالانە (لاس و خەزاڵ ل ١٢٤).

**پـاڕانـەوە** (چـا. ل)[نـاو: پـاڕانــەوە، پاڕیانەوە، وەپاڕان، پاڕان] ١ـ تکا و رجا لە لای کـەسێک بۆ ئـەنجـام دانی کـارێک کە بە سانایی ئەنجامی نەدا، لالانەوە. ٢ـ دوعـا و تکا لـە بارەگـای خـودا لەو پەڕی نیـاز دا. ⁂ ھەلە پاڕانەوە ئەمڕۆ، زبان و دڵ لـە کــــــارایـە/ زبـان ئـاوەر کـــــە بەسـتـەزمانە سبـحـەینێ کـە قووچا دەم (مەحوی ل ٢٢٧).

**پاڕۆ** (نا.)[پـەش: پاروو ـ فـــار: پـارو ـ بیـر: پاروو. باک: پاڕۆ ـ نـاو: پاڕۆ ـ ھەو: پاڕۆ] بێـڵـی چێـوی کـە بۆ دەغڵ و دان و رادانی بەفـر کـەلکی لێـوەردەگـرن، بێڵ، بێرک.

**پاڕۆکڵە** (نا. ل)[پا + ڕۆ + کڵە][ئەر] ئاشـێک کـە بە بۆنەی پـێ گـرتن و وەڕێ کەوتنی منداڵ سازی دەکەن.

**پاڕیانەوە** (چا. ل)[ئەر] بڕ: پاڕانەوە

**پازار** (نا. ل)[پا + زار] ١ـ بـەردێکی شـینە، پاشـمـاوەی فـوسـیـلی جـۆرێک ئامۆنیتە کە زوو بۆ کەم کردنەوەی ئێش و ژان دەکاریان دەکـرد، پازاری شین. ⁂ ھەشـتـــا نۆکــەری خــەنجــەریـان دەسک پـازارە ئـەبـەر ئـەوبـەر راوەســــتــــــاوە/ ھەمـووی تورمـەپۆشـە، کـەوڵی قـاقـومی غـەزی بە سـەر شـانـی داداوە (سـەعـید و مــیــرســێــوەدین ل ٢٣٧). ٢ـ بـەرد یان

مـــادەیەکی ڕەقی خـڕە کـە لە گـەدە و ریخۆڵەی هەندێک گیانداری کاوێژکەر دا پەیدا دەبێ و زوو پێـیـانوابوو کـە دژی ســـەم و ژارە (مـــەردووخ ب ١ ل ٢٥٠)، ژاربەر. ٣ـ بـەردێکە بـە زۆر ڕەنگـان بـۆ خشڵ دەبێ (هەنبانە بۆرینە ب ١ ل ٩٨). جـۆرە مـووروویەکـە ئەکـرێ بە تەزبێح (خـاڵ ب ١ ل ١٩٦). ⁘ سـەری منت بێ بە قوربانی باڵتۆیەکی سەمبووری قاقمی دوگمـە پازارە (مـێـر و وەفـا ل ٧٥). || **پازاری شـین:** بـڕ: پـازار/١. ⁘ دەسکی خـەنجـەری پازاری شـینە و دەسـتی داویشتە سەر گوێیە خەنجەرێ (سەعید و میرسێوەدین ل ٢٢٨).

**تێبینی:** ئەم وشەیە پێکهاتوو لە [پا + زار]ە، پا لە پـەئیـتی paiti پەهلەویی بە مـانای دژ و هەروەتر زار هەمـان ژار یا سەمە، بە گشتی یانی دژی ژار و سەم، ژاربەر.

**پازدە** (ژ.)[ئەو: پەنچـەدەسـە ـ پەه: پەنچـدەه. باک: پانزدەه ـ ناو: پازدە، پـانـزە، پـانـزدە ـ هـەو: پـانـگـزە ـ زا: پانجێس] پێنج و دە، ژمارەی ١٥.

**پـازدەمـین** (ئـان.)[پـازدەیـەم + ئـین] ئەوەی کە لە پلە و ریزی پازدە دابێ، پازدەهەمین.

**پازدەهەم** (ژ.)[پازدە + هەم] هەرچی کە لە پلە و ریزی پازدە دابێ، پازدەیەم.

**پازدەهەمین** (ئان.)[پازدەهەم + ئین] بڕ: پازدەمین

**پـازدەیـەم** (ژ.)[پـازدە + یـەم] بـڕ: پازدەهەم

**پازگە** (نا. ل)[پاز (پاس1) + گە] بڕ: پاسگە

**پازناو** (نا. ل)[پاز (پواز) + ناو2] دارێکە وەکوو تێڵا و نوێڵ، ئەخرێتە ژێر پێی ئاش و پێی ئاشی پێ بەرز و نزم ئەکرێت بۆ ورد و درشتی ئارد بە پێی خـواست. پێ ئاش تا بەرز بێ ئاردی زبرە و تا نزم بێت و دابخرێت ئاردی وردە (کشت و کاڵ ب ١ ل ٥٦). پازناوک دارێکە وەک بێڵەکان ئەکرێ بە نوێڵ و بەرداشی پێ هەڵئەگرێ (خاڵ ب ١ ل ١٩٦). & پازناوک، پوازناو.

**پازناوک** (نا. ل)[پاز (پواز) + ناوک] بڕ: پازناو

**پاژ**[1] (ئاک.) بڕ: پاش1 . ⁘ پاژنوێژ

**پاژ**[2] (ژ.)[زا] بڕ: پێنج

**پاژ**[3] (نا.)[بڕ: پار2] ١ـ بەش، کوت،

پار. ٢ـ بەرگێک لە کتێبی چەند بەرگی، بەرگ، جزوو، جزم. ⁙ کتێبەکەم لە سێ پاژان دا چاپ کردوە.

**پاژا** (نا.)[زا] بڕ: پاجە

**پاژدۆ** (نا. ل)[پاژ1 + دۆ] بڕ: پاشدۆ

**پاژماڵە** (نا. ل)[پاژ1 + ماڵ + ە] بڕ: پاشماڵە

**پاژنوێژ** (ئاک. ل)[پاژ1 + نوێژ] بڕ: پاشنوێژ

**پاژنۆ** (ئا.) بڕ: پاژنە

**پاژنە** (ئا.)[هیک: پەرشنی ـ ئەو: پاشنە ـ پەه: پاشنەک. تات: پاشێنیە ـ فار: پاشنە ـ لۆر: پاشنی. باک: پانی، پاژنی، پەهنی، پاحنی، پەحنی ـ ناو: پانێ، پانی، پانیە، پاژنە، پاژنۆ ـ باش: پاژنە ـ هەو: پاژنە ـ زا: پاشنا، پاسنا، پالسنا] ١ـ (ئا.) بەشی دوایی پێ. ٢ـ ئەو بەشە لە کەوش یا گۆرەوی کە دەکەوێتە سەر پاژنەی پێ. ٣ـ کونێک یا قوڵکەیەک کە دەرگا بۆ کردنەوە و داخستن لە سەری دەگەڕێ، بن ڕێسمانە، پاژنە دەرگا.

**پاژنە بڵند** (ئان. ل، نا. ل) [پاژنە + بڵند] کەوشی ژنانە یا پیاوانە کە پاژنەکەی بڵند بێ، پانیەبڵیند. // پاژنە کورت.

**پاژنە دەرگا** (نا. ل)[پاژنە + دەرگا] بڕ: پاژنە/٣

**پاژنە کورت** (ئان. ل، نا. ل)[پاژنە + کورت] کەوشێک کە پاژنەکەی ئاسایی بێ. // پاژنە بڵند

**پاژنەکێش** (نا. ل)[پاژنە + کێش (کێشان)] کوتە فلزێکی ساف و لووس و هەندێک قوڵە بۆ دەپێ کردنی ئەو کەوشانەی کە با سانایی دە پێ ناکرێن. لەپێشدا پەنجەی پێ دە کەوش دەنێن و دوایی پاژنەکێش وا دادەنێن کە پاژنەی پا لە سەری بخزێ و بچێتە نێو کەوشەوە، پاژنەهەڵکێش، پانەکێش.

**پاژنەهەڵکێش** (نا. ل)[پاژنە + هەڵکێش (هەڵکێشان)] بڕ: پاژنەکێش

**پاژنی** (ئا.)[باک] بڕ: پاژنە

**پاژەرەژ** (گیا.)[پا1 + ژەرەژ][هەو] گۆپکە و چرۆی دارگوێز کە تازە گەڵا بکات و دەم بداتەوە (کشت و کاڵ ب ١ ل ٥٦).

**پاس**[1] (نا.)[ئەو: پەثرە ـ هەخ: پاچە ـ پەه: پاس] ئاگاداریی، کێشک،

چاوەدێریی. **~ دان:** کــێــشک دان، ئاگاداریی لە شوێنێک کردن بە کێشک دان، پاس گرتن. **~ گرتن:** پاس دان، کێشک گرتن.

**پاس**[2] (نا.) بڕ: پاسپۆرت

**پاس**[3] (نا.)[فەر: passe] ڕەد کردن و دانی تۆپ بە کەسێکی دیکە لە فوتباڵ و والیباڵ و یاریەکانی دیکە دا.

**پاساپۆرت** (نا.) بڕ: پاسپۆرت

**پاسار** (نا.)[باک: پاسار ـ ناو: پاسار، پاســارە ـ هەو: پاســار] لێــواری بان، گــوێســوانە. ؛؛ فــەرقی کــۆســاران لە پاساران دەفەرمووی وەک چیە؟/ وەک عــەزیزیی باز و وەک بێ حــورمــەتیی پاسارییە (نالی ل ٥٨١).

**پاسارە** (نا.) بڕ: پاسار

**پاساریی** (گیانـ.)[پاسار + ئیی] مەلێکی چووکە، مێیەکە ڕەنگی پەڕ و باڵی بۆرە و نێرەکەی تۆختــرە، دان و جانەوەری ورد دەخۆن، لە کەلێنی دیوار و گوێسوانە هێلانەی دەکەن و لە زۆربەی وڵاتانی دنیــا دەژین. Fringilla domestica و Passer domestica ناوی لاتینی ئەم مــەلەن، مــەلیــچک، مەلووچک، چێشکە، چۆلەکە، چوێلەکە، چڤــیک، چڤــینک، چوویک، مــیــرچک، میرچکە، مریچکە، بەیتک.

**پاساژ** (نا.)[فەر: passage] کۆمەڵە دوکــانێکی دەباڵ یەک دا کــە بازارێکی چووک لە یەک جێگا پێک دێن و دەتوانێ چەند قات لە سەر یەک بێ.

**پاسپۆرت** (نا.)[فـەر: passeport] بەڵگە و پێناسی هاتووچۆ لە وڵاتێک بۆ وڵاتانی دیکە، پاساپۆرت، پەساپۆرت، پاس، تەسکەرە.

**پاستۆریزە** (نا.)[فەر: pasteuriser] ١ـ گەرم کردنەوەی شیر یا ئاوەکی دیکە بە پێی شێوەی پاستۆر بۆ فەوتاندنی میکرۆبەکانی. ٢ـ [pasteurise] ئەو ئاوەکییەی کە بە شێوەی پاستۆر میکرۆبەکانی فەوتاوە.

**تێبینی:** شیر یا ئاوەکی، ماوەی نیو سەعاتێک بە تینی ٦٠ هەتا ٦٦ دەرەجە گەرم دەکەن و لە دوایی دەستبەجێ هەتا ١٠ دەرەجەی سارد دەکەنەوە و بەم جۆرە میکرۆبەکانی دەمرن.

**پاسدار** (نا. فا)[پاس1 + دەر (دان)] بڕ: پاسدەر

**پاسداریی** (حم.)[پاسدار + ئیی] ئاگاداریی، چاوەدێریی، پاسدەریی،

پاسگریی. ∷ پاوان بوو نێوانی رانی هەردوو/ پاسداریی لە پاکژیی لە سەر بوو (مەم و زین ل ٣١٣).

**پاسدەر** (نا. فا)[پاس1 + دەر (دان)] ١ـ کەسێک کە کێشک دەدا، کێشکچی، پاسەوان. ٢ـ چاوەدێر، ئاگادار. ٣ـ گیاندارێک کە چاوەدێری ماڵ یا شوێنێک دەکا. ∷ چم وت؟ سەگی پاسدەری ئەمەگدار/ بەدفەڕ دەبەری مرن هەزار جار ... (مەم و زین ل ٢٩٢).

**پاسدەریی** (حم.)[پاسدەر + ئیی] بڕ: پاسداریی

**پاسگا** (نا. ل)[پاس1 + گا] ١ـ شوێنی پاس دان. ٢ـ شوێن و مەقەری پاسەوان. & پاسگە

**پاسگر** (نا. فا)[پاس1 + گر (گرتن)] کەسێک کە چاوەدێریی شوێنێک دەکا، کێشکچی، حەرەس، پاسدەر.

**پاسگریی** (حم.)[پاسگر + ئیی] بڕ: پاسداریی

**پاسگە** (نا. ل)[پاس1 + گە] ١ـ چاڵێکە لە نێوەڕاستی بێستان دا کە بێستانەوان بە شەو دەچێتە نێوی بۆ ئاگاداریی لە بێستان و بەری بێگانە گرتن، پازگە. ٢ـ بڕ: پاسگا.

**پاسنا** (ئا.)[زا] بڕ: پاژنە

**پاسە** (ئاک.)[؟][هەو] وەها، ئاوا.

**پاسەبان** (نا. ل)[فار: پاسبان] بڕ: پاسەوان

**پاسەبانیی** (حم.)[پاسەبان + ئیی] بڕ: پاسەوانیی

**پاسەوان** (نا. ل)[پاس1 + ئە + وان] [پەه: پاسپان] ١ـ کەسێک کە لە شارەوانی کار دەکا و هێمنایەتی شاری بە دەستەوەیە، پاسەبان. ٢ـ کێشکچی، حەرەس.

**پاسەوانیی** (حم.)[پاسەوان + ئیی] کار و پیشەی پاسەوان، کێشکچییەتی، پاسەبانیی.

**پاش**$^{1}$ (ئاک.)[هیک: پەچچە ـ ئێک: پەسچە ـ ئەو: پەسچە، پەسکات، پەسنێ ـ هەخ: پەسا، پەساڤە ـ پەه: پەس. باک: پاش ـ ناو: پاش، پاژ] ١ـ دوا، دما. ∷ دوو منداڵی لە پاش بە جێ ماوە. ٢ـ دواوە، پشت سەر. ∷ روانیە پاش خۆی. جەماعەتێک لە پاشی دەڕۆیشتن. ٣ـ ماوە، لە ماوەی. ∷ پاش دوو رووژان هات. ٤ـ دوای ئەوەکە، ئەودەم. ∷ پاش ئەوە کە کارەکانی جێبەجێ کرد هاتەوە. ٥ـ (مجـ.) قوون، قنگ. ~ **خستن:** وە

درەنگ خستنی کار و بارێک، وەپاش خستن، وە پاش دان، پاش دان. **~ دان:** بڕ: پاش خستن. **~ کەوتن:** دوا کەوتن لە هەر شتێکی دا لە چاو کەسانی دیکە، وەپاش کەوتن. // پێشکەوتن. **لە ~ بوون:** ١ـ لە نۆرە دا لە پشت سەری کەسێک بوون. ⁂ کاکە جێگاکەم بگرەوە هەر ئێستا دێمەوە من لە پاش تۆم. ٢ـ لە دوا بوون لە باری زانستەوە، دواکەوتوو بوون: لە دەرسەکانم زۆر لە پاشم. **لە ~ بە جێ مان:** ئەو کەس و شتانەی کە دوای مەرگی کەسێک دەمێننەوە. ⁂ دوو منداڵ وماڵێکی زۆری لە پاش بە جێ ماوە. **لە ~ەوە بوون:** (کنـ.) لە قوون بوون، لە دواوە زان. ⁂ ئەو فەرق و جیاوازییە چیە ئێوە دایدەنێن بۆ دەنا ئێمە لە پاشەوە بووین. **وە ~ خستن:** بڕ: پاش خستن. **وە ~ دان:** بڕ: پاش خستن. **وە ~ کەوتن:** بڕ: پاشکەوتن

**پاش**[2] (ر.)[فار: پاش] لە چاوگی پاشیدن (پاشیدەن) ـ ی فارسی دەکەوێ بە مانای پڕژێن ⁂ ئاوپاش.

**پاشا** (نا. ل)[بڕ: پادشا] ١ـ شا، پادشا. ٢ـ نازناوی پیاوی گەورە و ماقووڵی تورک لە سەردەمی عوسمانییەکان. ‖ **پاشای بێ مەکان:** (کنـ.) خودا. ⁂ ئامۆزا خەجێ گیان چی دەگەڵ ناکرێ/ کاری پاشای بێ مەکانە (گەنج ل ٣٣٤).

**پاشاپاشایێن** (نا. ل)[پاشا + پاشا + ئێن] بڕ: میرمیرێن

**پاشاخوڕ** (نا. ل)[پاش1 + ئاخوڕ] تفاقی ماوەی نێو ئاخوڕ کە بۆی گرتوە و وڵاغی ئیدی نایخوا و فڕێ دەدرێ، پاشەخوڕ، پەساخوڕ، قەسەڵ، چەوەڵ.

**پاشاراو** (نا. ل)[پاش1 + ئاراو] کەفاوێک کە دوای جارێک جل شووشتن دەمێنێتەوە، پەساو، جڵقاو. (بڕ: ئاراو)

**پاشارۆ** (نا. ل)[پاش1 + ئا + رۆ؟] بڕ: پاشەرۆک

**پاشازادە** (ئان. ل، نا. ل)[پاشا + زادە] بڕ: پادشازادە

**پاشاگەردانی** (نا. ل)[پاشا + گەردان + ئی] ئاژاوە و شێواویی وڵات و ناوچە بە هۆی نەمانی گەورە و سەرۆک، پاشاگەردانێ.

**پاشاگەردانێ** (نا. ل)[پاشا + گەردان + ئێ] بڕ: پاشاگەردانی

**پاشان** (ئاک. ل)[پاش1 + ئان] دوایە،

له دوایی. // پێشان :: خاتوون ئاگرەکەی داگیرساند و پاشان مەنجەڵێکی گەورەی له سەر دانا.

**پاشایانه** (ئان. ل، ئاک. ل)[پاشا + یانه (ئانه2)] بڕ: پادشایانه

**پاشایەتی** (حم.)[پاشا + یەتی] بڕ: پادشایەتی

**پاشباره** (نا. ل)[پاش1 + بار+ ئه] یەکێک له ئامرازەکانی نیر و ئاموور که بریتییه له پارچه دارێکی کەمێک ئەستووره که له دەنده کوتراوه و دەستەمستەی له سەره و جووتێر دەستی له سەر دادەگرێ.

**پاشبەن** (نا. ل)[پاش1 + بەن][ئەر] بڕ: پاشبەند

**پاشبەند** (نا. ل)[پاش1 + بەند] گوریس یا هەر شتێکی دیکەی لەم بابەته که پێ و پاشووی یەکسم و حەیوانی بەرزەی پێ ببەستنەوه، پاشبەن، پاشوەن، پێوەند. // پێشبەند.

**پاشپانی** (ئا.)[پاش1 + پانی] قووڵایی لای خوارەوەی بەلەک و پۆز که دەکەوێته پشت گوێزینگی پێ، پێچکه1/١.

**پاشپەرده** (نا. ل)[پاش1 + پەرده] [باک] دیوی خەوتنی بووک و زاوا، پەرده، پەردوو.

**پاشت** (ئاک.)[بڕ: پشت1][زا] دوا، پشت.

**پاشتریش** (ئان. ل)[پاشت + ریش] [زا] بڕ: پشتڕێژ

**پاشتەرک** (نا. ل)[پاش1 + تەرک1] ١ـ بەشی دواوەی زین و کورتان که دەکەوێته نزیک کلکی چوارپێ، پاشتەرکی، پاشەخورج، پاشکۆ. ٢ـ بەشی دوایی دووچەرخه له پشت زین که بار یا شتی دیکەی لێدەبەستنەوه و کەسیش دەتوانێ له سەری دانیشێ. ٣ـ بارێک که له پاشتەرک دادەندرێ، پاشتەرکی، پاشەخورج . :: لێیدەکرد خورجێکی ده دەوڵەمەندانه/ پاشتەرکێکی دادەگرت به وەزن سووک و هەر به قیمەت گرانه (گەنج ل ٣١٢).

**پاشتەرکی** (نا. ل)[پاش1 + تەرکی] ١ـ بڕ: پاشتەرک. ٢ـ بارێک که له پاشتەرک دادەندرێ. & پاشەخورج

**پاشتی** (نا.)[زا] بڕ: پشت1

**پاشتێلانه** (نا. ل)[پاش + تێل + ئانه] میوانداریيەکی تێکراییيه له ماڵی

زاوا ئەکـــــــرێ لـە پـاش سێ ڕۆژ لـە گـواسـتنـەوەی بووکـەکـە (خـاڵ ب ١ ل ١٩٨). [هس: بەرتێلانە]

**پاشخان** (نا. ل)[پاش1 + خان1] ١- دیوی نۆکـەر لە مـاڵی ئاغـا و ئەرباب دا. ٢- دیوێکی چـووکـــە بـە ســــەر ژووری گـەورەوە بۆ کـەلوپـەل پێـداویسـتی مـاڵ، خەڵوەتی، وچخانە

**پاشخوان** (نا. ل)[پاش1 + خوان1] ئەوەند خـواردەمەنی کە دوای خـواردن لە سەر خوان و سـفرە دەمێنێتـەوە، بەرماو، پاشماوە، پاشخوانە.

**پاشخوانە** (نا. ل)[پاش1 + خوان1 + ئە] بڕ: پاشخوان

**پاش خـــێــــشـک** (نا. ل)[پاش1 + خـێـشـک] داری پاشـــەوەی خـێـشـک، نێودەڵە (بڕ: خێشک)

**پـاشـــــــدار** (نـا. ل)[پاش1 + دار2] تاقـمـێک کـە ئاگاداری پشتی لـەشکر و قۆشەنن.

**پاشدارە** (نا. ل)[پاش1 + دار1 + ئە] یەکێک لە ئامرازەکانی عارەبەی کەڵی کە بریتـــیـــیـــە لە دارێک کـــەوتۆتە لای خوارەوەی بانە سێ سووچەکەی.

**پاشدز** (نا. ل)[پاش1 + دز] هـاوکاری دز، دزێک کـــە پاسـی دزی هـاوکــــاری دەگرێ هەتا کـەسیـان بە سـەردانەیێ یا لە هـاتنـی کـــەســێک خـــەبەرداری بـکا، پاشدزە، پاشکەوان.

**پاشدزە** (نا. ل)[پاش1 + دز + ئە] بڕ: پاشدز

**پاشـدۆ** (نا. ل)[پاش1 + دۆ] شـیـری دوای مـژتنی بەرخ. (بێـری جـارێک مـەڕ دەدۆشێ و دوایی بەرخـیـان کـە تێـبـەردا دیسـان مەڕەکە دەدۆشێتـەوە و هەندێکی دیکە شیری لێوەردەگرێ)، پاژدۆ.

**تێبینی:** دۆ لە ڕەگی دۆشین کەوتوە و بە مـانای دۆی خـواردنەوە نیـە هـەر چەند دۆی خواردنەوەش هەر لـە دۆشین کەوتوە (بڕ: دۆشین و دۆ2)

**پاشــقل** (نا. ل)[پاش1 + قل (کل2)] بڕ: پاشقول.

**پاشقول** (نا. ل)[پاش1 + قول (کل2)] ١- کاری گێڕانەوەی بەشێک لە شتێک بۆ خـۆ، پاشـقل. (هس: پـاشکل). ٢- کـاری پـــێ وە بـــەر پـــێ دان. **~ دان:** ١- هەڵگرتن و گێڕانـەوە لە شتێک. ٢- پێ وە بـەر پێ دان لـە شـــەڕ و زۆرەبـانی دا بـۆ خستنی غەنیم.

**پاشکل** (نا. ل)[پاش1 + کل؟][زا] شەپ، شوق، لەقە.

**پاشکۆ** (نا. ل)[پاش1 + کۆ] ١ـ بەشی دواوەی زین و کورتان کە دەکەوێتە نزیک کلکی چوارویێ، پاشتەرک، پاشەخورج. ٢ـ نووسراوە یا کتێبێک کە بە دوای دەرچوونی کتێبێک دا بۆ تەواو کردن و کامل کردنی دێتە دەرێ، زەمیمە. (بڕ: تێبینی: بەرکۆ).

**پاشکەوان** (نا. ل)[پاش1 + کەوان] بڕ: پاشدز

**پاشکەوتوو** (ئان. مف)[لە: پاش کەوتن] دوا کەوتن لە هەر کار و مەسەلەیەک لە چاو کەسێک یان گەلێک هەر لەو کارە دا، پاشکەوتە، دواکەوتوو. // پێشکەوتوو.

**پاشکەوتوویی** (حم.)[پاشکەوتوو + یی] وەدوا کەوتن، لە پاش مان لە هەموو بارێکەوە، دواکەوتوویی، پاشکەوتەیی

**پاشکەوتە** (ئان.مف)[پاش1 + کەوتە] بڕ: پاشکەوتوو

**پاشکەوتوویی** (حم.)[پاشکەوتە + یی] بڕ: پاشکەوتوویی

**پاشگر** (نا. ل)[پاش1 + گر] زارێکی ڕێزمانە و بریتیە لە چەند پیتێکی کورت کە بە دوای هەندێک وشە یا چاوگەوە دەلکێ و ئاڵوگۆڕ لە ماناکەیان دا پێکدێنێ وەک (وان، ئەوە، گا، کە، ...) // پێشگر.

**پاشگەز** (ئان. ل)[پاش1 + گەز] بڕ: پەشیمان. ~ **بوونەوە:** پەشیمان بوونەوە لە کار و کردەوەیەک. ~ **کردنەوە:** پەشیمان کردنەوەی کەسێک لە کار یا کردەوەیەک.

**پاشمارە** (نا. ل)[پاش1 + مار2 + ئە] بڕ: پاشماڵە

**پاشماڵە** (نا. ل)[پاش1 + ماڵ1 + ئە] ١ـ بنەماڵەیەک کە لە ماڵی دەوڵەمەند دا چاوە خانوویەکی پێدراوە و تێکڕا خزمەتی ئەو ماڵە دەکەن، پاشمارە، ژێرماڵە، بەرماڵە، پاژماڵە. ٢ـ بنەماڵەیەک کە بۆ خزمەت دەگەڵ خێڵ دەبردرێتە هەوار و خزمەتی ئەو ماڵەی دەکەن کە دەگەڵی چوون.

**پاشمامان** (نا. ل)[پاش1 + مامان] ژنێک کە لە کاتی زاندنی منداڵ یاریدەدەری مامانە.

**پاشماوە** (ئان. مف)[پاش1 + ماوە] ئەندازەیەک لە چێشت کە لە پاش

کەسێک دوای تێر بوونی دەمێنێتەوە، بەرما، بەرماوە، پاشماو، پاشمەنە، بەرماو، پاشخوان، پەسمەنە.

**پاشملە** (نا. ل)[پاش1 + مل + ئە] قسەی پشت سەر، پشتەملە، غەیبەت. **~ قسە کردن:** لە پشت سەر قسە کردن، پاشملە کوتن. **~ کوتن:** لە پشت سەر قسە کردن، باسی کەسێک کردن کە خۆی لەوێ نەبێ، غەیبەت کردن.

**پاشمەرگە** (ئان. ل)[پاش1 + مەرگ + ئە] منداڵێک کە دوای مردنی باوکی دەبێ.

**پاشمەنە** (ئان. مف)[پاش1 + مەنە (فار: ماندە = ماوە)][ئەر] بڕ: پاشماوە.

**پاشنا** (ئا.)[زا] بڕ: پاژنە

**پاشنوێژ** (ئاک. ل)[پاش1 + نوێژ] دوای نوێژی نیوەڕۆیە، دوای نیوەڕۆ، پاش نیوەڕۆ.

**پاش نیوەڕۆ** (ئاک. ل)[پاش1 + نیوەڕۆ] کاتی دوای نیوەڕۆ، پاشنوێژ، پاژنوێژ.

**پاشوەن** (نا. ل)[پاش1 + وەن1][ئەر] بڕ: پاشبەند

**پاشۆر**[1] (نا. ل)[پا1/١ + شۆر] ئاوی گەرم یا خوێاوکی گەرم کە پێی نەخۆشی پێدەشۆن، پاشۆرە. **~ کردن:** شووشتنی پێی نەخۆش بە ئاوی گەرم و دەرمانوەی بۆ هاتنە خواری یاو، پاشۆرە کردن.

**پاشۆر**[2] (نا. ل)[پاش1 + ئۆر][سۆر] بڕ: پاشەڵ. ∷ کەزێی شامۆکێم کەتە پاشۆرێ/ شامێ هەردەگرم لۆ ئەستەمبۆرێ (فۆلکلۆر ل ٣١).

**پاشۆرە** (نا. ل)[پا1/١ + شۆر + ئە] بڕ: پاشۆر1

**پاشۆڵ** (نا. ل)[پاش1 + ئۆڵ] بڕ: پاشەڵ

**پاشوو** (نا. ل)[پاش1 + ئوو] دوو پێی ئەو گیاندارانەی کە لە سەر دەست و پێیان دەڕۆن، پاشی. // پێشوو، پێشی.

**پاشوو بڵند** (ئان. ل)[پاشوو + بڵند] ئەو گیاندارەی کە پێیەکانی لە دەستەکانی درێژترن، پاشوو بڵیند، پاشی بڵند.

**پاشوو بڵیند** (ئان. ل)[پاشوو + بڵیند] بڕ: پاشووبڵند

**پاش و پێش** (ئاک. ل)[پاش1 + و +

پێش] ١ـ جێگۆڕکێی پاش دەگەڵ پێش. ٢ـ (کنـ.) دەزگـای جنسـی پاش و پێـشی مـــرۆڤ بە تـایبــەت ژن. ~ **بوون:** بە پێـچـەوانـە بوونی شـوێنـی پاش دەگـەڵ پێش، یانی پاش کـەوتبـێـتـە پێـشـەوە. ~ **بوونە یەک:** (کنـ.) لە ژێر زەخــتـی کـــوێرەوەریی و گــرفـــتـــێکی قـــورس دابوون. ~ **کـــردن:** گـــۆڕینـەوەی دوو شوێنی پاش و پێش دەگەڵ یەکتر. ~ **کردنە یەک:** (کنـ.) بە زۆر و زەخت گایین، تەجاوز پێکردن بە پاش و بە پێش.

**پاشــــەبەرە** (ئان. ل)[پاش$1$ + ئە + بــەر$1$ + ئــە] ١ـ دوایــین بــەری بــاغ و بێستان. // نۆبەرە. ٢ـ ئاخرین منداڵی بنەماڵەیەکی چەند منداڵە. لە زۆر ماڵ دا پاشـەبەرە پتر لە منداڵەکانی دیکە رووی دەدرێتێ و خـۆشـەویسـتـتـرە، دواچۆڕ، ئـاخــــرمـناڵ، ئـاخـــــرچۆڕ. // بـەرەزا، نۆبەرە.

**پاشــەخـــورج** (نا. ل)[پاش$1$ + ئە + خورج][ئەر] بڕ: پاشتەرکی

**پاشەخوڕ** (نا. ل)[پاش$1$ + ئاخوڕ] بڕ: پاشاخوڕ

**پاشـــــەرۆک** (نا. ل)[پاش$1$ + ئە + رۆک] هەندێک بەری بێـسـتـان یا بـاغی چندراو کـە بێـسـتـانەوان یا بـاغـەوان وازیان لێهێناوە و خەڵکی نەدار یا منداڵ دەچن و لێی دەکەنەوە، پاشارۆ، شارۆ.

**پاشــــەرۆژ** (ئاک. ل)[پاش$1$ + ئە + رۆژ] ئەو رۆژانەی کـە لە بەرن، داهـاتوو. ៖ پیـــاو دەبێ بۆ پاشــەرۆژ پـووڵێکی پاشەکـەوت بکا. ئێسـتـا هەرچیت دەوێ داوای بـکـە پـاشـــــــەڕۆژێ نـەڵێـی بـۆی نەکڕیم!

**پاشەکشە** (نا. ل)[پاش$1$ + ئە + کش (کشانەوە) + ئە] ١ـ بەرەو دواوەی هێز و کـەس. ٢ـ پاشـەگـەز، پەشـیـمـان. ~ **کـردن:** ١ـ گـەڕانـەوە بۆ دواوەی هێـز یا کەس لە بەر کزیی یا هەر مـەبەسـتـێکی دیکە. ៖ دوژمن پاشـەکشەی کرد و رای کـرد. ٢ـ پەشـیـمـان بوونەوە، پاشـەگـەز کــــردن. ៖ ئـەمن لـە قـــســـــەی خــــۆم پاشەکشەی ناکەم.

**پاشــەکــەفت** (نا. ل)[پاش$1$ + ئە + کەفت][ئەر] بڕ: پاشەکەوت

**پاشــەکــەوت** (نا. ل)[پاش$1$ + ئە + کەوت] ١ـ رادەیەک لە پووڵ، خواردەمەنی و هـەر چێکی دیـکە کــــــە بۆ دواڕۆژ و تەنگانە وەلا دەندرێ هەتـا کـاتی خـۆی کەلکی لێوەرگرن، پاشەکەفت. ٢ـ کەس و

کەسانێکی نزیک کە دوای مەرگی کەسێک میراتیان پێدەبڕێ، میراتبەر، میراتگر، وەرەسە. ⁝⁝ میرفەتاح مرد. وەرەسە و پاشەکەوتی میرفەتاح ئەگەر گەیشتنێ ... (لاس و خەزاڵ ل ١٥). **~ کردن:** وەلانان و راگرتنی هەر شتێک بۆ دوارۆژ.

**پاشەگەز** (ئان. ل)[پاش1 + ئە + گەز] بڕ: پەشیمان. **~ بوونەوە:** بڕ: پەشیمان بوونەوە. **~ کردنەوە:** بڕ: پەشیمان کردنەوە.

**پاشەڵ** (نا. ل)[پاش1 + ئەڵ] ١ـ پاشەوەی لەش. // پێشەڵ. ٢ـ پاشەوەی جلی درێژ کە دەکەوێتە سەر قونگ. & پاشۆڵ، پاشۆر.

**پاشەڵ گواویی** (ئان. ل)[پاشەڵ + گواویی] ١ـ قوون گواویی. ٢ـ ژنی پیس و پۆخڵی.

**پاشەڵەوانە** (نا. ل)[پاشەڵ + ئە + وان + ئە] بڕ: پاشەوانە

**پاشەوانە** (نا. ل)[پاش1 + ئە + وان + ئە] دووبارەیێکە ئەنرێت بە دوای پلوورەی هەنگەوە بۆ ئەوەی شانی تێدا هەڵبەستێ و هەنگوینی تێدا بکات (کشت و کاڵ ب ١ ل ٥٧)، پاشەڵەوانە.

**پاشەوپاش** (ئاک. ل)[پاش1 + ئەو + پاش1] بەرەو دواوە وەها کە روو هەر لە پێشەوە بێ. **~ کشانەوە:** بەرەو دواوە کشانەوە وەها کە روو هەر لە پێشەوە بێ و جووڵانەوەکە بە پێچەوانەی بەرەو پێشەوە بێ. ⁝⁝ کە چاوی بە سەگە هارەکە کەوت پاشەوپاش کشاوە و خۆی دە ماڵێ هاویشتەوە. ماشێنەکەی پاشەوپاش کێشاوە.

**پاشی** (نا. ل)[پاش1 + ئی] بڕ: پاشوو.

**پاشی بڵند** (ئان. ل)[پاشی + بڵند] بڕ: پاشووبڵند. ⁝⁝ کلک و یاڵ بە ژەنگارە، پاشی بڵندە، پێشی نەوییە/ پەسندە بۆ رکێفی هەموو پادشایەک دەبێ، خاڵ خاڵە، گوڵ گوڵییە (سەعید و میرسێوەدین ل ١٩٨)

**پاشینیان** (نا. ل)[پاشین + ئی + ئان] ئەو کەسانەی کە لە داهاتوو دا دەبن، بەرەی داهاتوو، داهاتوان. // پێشینیان.

**پاشێل** (نا. ل)[پا1 + شێل][هەو ـ ئەر] بڕ: پێشێل

**پاشێنە** (نا. ل)[پاش1 + ئێنە][زا] رۆژی دوای هەینی، شەنبە.

**پاعن** (ئان.)[زا] بڕ: پان

**پاق** (ئا.)[باک] لاق، قاچ، چێق، پێ

**پاقر** (نا.)[تور: bakır][باک] ١ـ بڕ: مس. ٢ـ ژەنگی مس.

**پاقژ** (ئان.)[باک] بڕ: پاک

**پاقش** (ئان.)[باک] بڕ: پاک

**پاقلانچکە** (گیا.)[هس: پاقلینچکانە] گیایەکی بەهارییە گەلایەکی درێژی بڕگەبڕگەی هەیە، بەرێکی وردی سوور ئەگرێ و زۆر ڕەوانە (خاڵ ب ١ ل ٢٠٠).

**پاقلاوە** (نا.) بڕ: باقلاوە

**پاقلە** (گیا.) بڕ: باقلە

**پاقلینچکانە** (گیا.)[پا + قلینچک + ئانە][ئەر] بڕ: پرپرە/١

**پاک** (ئان.)[هیک: پاڤەکە ـ پەهـ: پاڤ، پاک. فار: پاک ـ بیر: پاک ـ پەش: پاک. باک: پاقژ، پاقش، پاک، پاکژ ـ ناو: پاک ـ هەو: پاک ـ زا: پاک، پانک، پوونک] ١ـ شت و شمەکی خاوێن، بێگەرد// پیس. ٢ـ مرۆڤی ئیماندار و بەشەرم و حەیا و بێ فڕ و فێڵ. ∷ دڵپاک، چاوپاک، دەستپاک، ڕووپاک. ٣ـ (ئاک.) هەموو، تێگرا، گشت، بە خڕیی. ∷ دز ئەوەی هەمان بوو دەستی دایە و پاکی برد. ٤ـ بێحیساب. ٥ـ داوێنپاک. ٦ـ ژنی لەش خاوێن کە دە حەیزەوە نەچووبێ یا دە حەیز دانەبێ. ~ **بوون:** ١ـ خاوێن بوون. ٢ـ بێ فڕ و فێڵ بوون، ڕاست و دروست بوون. ∷ ئەو شاگرد دوکانە هێندە پاک نیە و گرێ و گۆڵی زۆرە. ٣ـ داوێنپاک بوون. & پا بوون. ~ **بوونەوە:** ١ـ خاوێن بوونەوە. ٢ـ فەوتان، لە بەین چوون. ∷ شوکور ئەسپێ لە وڵات پا بوونەوە و ئاسەواریان نەما. & پا بوونەوە. ~ **کردن:** ١ـ توێکڵ لێوە کردنی میوە و خواردەمەنی بە توێکڵ. ٢ـ خاوێن کردنەوەی دانەوێڵە لە ورکەبەرد و چەت ٣ـ بژار کردنی باخچە و دەغڵ لە گیابژار ٤ـ لێکردنەوەی لاسک و شتی زیادە و بێکەلکی سەوزی خواردن. ٥ـ کووژاندنەوەی قەرز و نەمانی حیساب، بێ حیساب بوون. ∷ ئەو پارەیە بدەوە و قەرزەکەت پاک کە! & پاکردن. ~ **کردنەوە:** ١ـ خاوێن کردنەوە، سترین، سڕینەوە. ٢ـ لە بەین بردن، فەوتاندن، کوشتن. ∷ خودایە ئەو زاڵمە پاک کەوە. ٣ـ کووژاندنەوەی قەرز و قۆڵە. ∷ ئەوەش دووسەد تمەنەکەت و حیسابەکەمان پاک

کەوە. & پا کردنەوە، پا کرنەوە.

**پاکــــار** (نا. ل)[پا1 + کـــار] ١ـ خزمەتکار، نۆکەر. ٢ـ کەسێک کە لە ژێر دەستی کوێخا کار دەکا.

**پاکــاریی** (حم.)[پاکــار + ئیی] ١ـ نۆکەریی، خزمەتکاریی. ٢ـ کار و پیشەی پاکاری بەردەستی کوێخا.

**پاکانە** (ئاک. ل)[پاک + ئانە2] کاری خەتا و تاوان لە سەر خۆ لابردن. ~ **بۆ کـردن:** بە قـسـە و پاڕانەوە یا سـوێند خواردن خـەتا لە سـەر کەسـێک لابردن. :: ئەتۆ هێندە پاکـانەی بۆ کـوڕەکـەت مەکە لێم روونە ئەم شـووشـەیە هەر ئەو شکاندوویەتی. ~ **کـردن:** خـۆ پاک و بێ خـەتا نیـشـان دان بە بەڵگە و قـسـە هێنانەوە.

**پاکبین** (نا. فا، ئان. ل)[پاک + بین2] کەسێک کە نەزەری پاکە و هەموو ئاکار و کردەوەیەک بە باش دەبینێ.

**پاکبینیی** (حم.)[پاکبین + ئیی] کار و ئاکاری کەسی پاکبین.

**پاکـتـاو** (ئان. مف)[پاک + تاو1/٣] کاری تواندنەوە و فەوتاندنی بە کۆمەڵ و گشتی نەتەوە و رەگەز و خەڵکێک. ~ **کردن:** فەوتاندن و تواندنەوەی کۆمەڵ و خـەڵکێکی جـیـا لـە لایەن کـۆمـەڵ و جەماعەتێکی دەستەڵاتدارتر.

**پاکراو** (ئان. مف.)[پا2 + کراو (لە: پا کردن)] دانەوێڵە، سەوزی و میوە و شتی لەم بابەتە کە زیدەکەی جیا کرابێتەوە یا لێکرابێتەوە، پاککراو.

**پاکــــڕەوان** (ئان. ل)[پاک + رەوان] کەسێک کە دڵ و دەروونی پاکە، دڵپاک، رووحپاک، رەوانپاک.

**پاکـڕەوانیی** (حم.)[پاکـڕوان + ئیی] دڵپاک و رووحپاک بوون.

**پاکـڕەوشت** (ئان. ل)[پاک + رەوشت] حاڵی کەسێک کە رەوشت و کرداری پاک بێ و خۆ لە خراپە بپارێزێ، ئاکارباش.

**پاکـڕەوشـتـیی** (حم.)[پاکـڕەوشت + ئیی] کار و ئاکاری کەسی پاکڕەوشت.

**پاکژ** (ئان.)[پاک] بڕ: پاک

**پاککرار** (ئان. مـف.)[لـە: پاک کـردن] بڕ: پاکراو

**پاک لە پاک** (شڕ.)[پاک + لە + پاک] بێ حـیـسـاب، هـیـچ لە هیچ، پاکـمـان لە پاک. ~ **بوون:** بێحیساب بوون و هیچ لە هیچ بوون لە مـەسـەلە و کـایـە و حـیـسـاب و مـەعـامـلەیەک. ~ **کـردن:**

بێحساب کردنی مەسەلە و کار و حیسابێک، هیچ لە هیچ کردن.

**پاکڵ** (نا. ل)[پا1+ کڵ][ئەر] پایەی پرد، کڵ، پاکڵە.

**پاکڵە** (نا. ل)[پاکڵ + ئە][ئەر] بڕ: پاکڵ

**پاکمان لە پاک** (شر.)[پاک + مان + لە + پاک] بڕ: پاک لە پاک

**پاکنووس** (نا. ل)[پاک + نووس] نامە و نووسراوەیەک کە ڕێکوپێک بێ و هەڵە و ڕەشایی تێدا نەبێ. ~ **کردن:** نووسینەوەی نامە و نووسراوەیەک بەبێ هەڵە لە رووی پێشنووس.

**پاک و پیس** (ئان. ل)[پاک + و + پیس] چاک و خراپ، ڕند و کرێت، پاک و ناپاک. ~ **کردن:** جیا کردنەوەی چاک و خراپ لە یەک، پاک و ناپاک لێک هەڵاواردن. ~ **لێکدان:** چاک و خراپ وەک یەک چاو لێکردن، تێکەڵ کردنی پاک و ناپاک.

**پاکوت** (نا. ل)[پا1 + کوت1][ئەر] بڕ: پێشێل

**پاکوڕە** (گیانـ.)[پا1 + کوڕ؟ + ئە] بڕ: پێکوڕە

**پاکۆ** (نا. ل)[پا1 + کۆ2] ١ـ ئەوەندە گیا کە لە دەسکەنە دا دەبن پێی دەنێن. ٢ـ باوەشە گیای نەبەستراو. ٣ـ گیای دوراوی نەبەستراو. ~ **دان:** ١ـ ڕنینەوەی گیا بە دەست. ٢ـ دروونەوەی گیا بێ ئەوەی بکرێتە دەسکەسواڵە. ⁂ دەمێکە داسی ئەجەل تیژ ئەکا وەکوو وەرزێڕ/ خەریکی عالەمە پاکۆی ئەدا بە ڕیزە هەموو (بێخود ل ٧٣).

**پاکۆترە** (گیا.)[پا1 + کۆتر + ئە] گیایەکە لە پاقلانچکە ئەچێ و ئەخورێ (خاڵ ب ١ ل ٢٠١).

**پاکەت** (نا.)[فەر: paquet] ١ـ کاغەزێکی دووتوێیە کە سێ لای بەستراوە و لایەکی ئاوەڵایە و نامەی نووسراو یا شتێکی لەم وێنەیە تێدەنێن. ٢ـ کاغەزی ئەستوور کە سەری ئاواڵەیە و میوە و شتی وردەی دیکەی تێدەکەن. ٣ـ بەستە، قوتووی چووکی بەستراو. ⁂ پاکەتێک جگەرە.

**پاکیی** (حم.)[پاک + ئیی]١ـ خاوێنیی // پیسیی، چەپەڵیی. ٢ـ داوێنپاکیی.

**پاگا** (نا. ل)[پا1 + گە][ئەر] بڕ: پاگە

**پاگرە** (نا. ل)[پا1 + گر (گرتن) + ئە] بڕ: پێخڕە

**پاگــه** (نا. ل)[پا1 + گــه][باک] ١ـ ئاخــوڕ. ٢ـ تەویلەی ئەسپ و بەرزەولاغ. & پاگەهـ. ٣ـ [ئەر] شوێنی پەڕینەوەی لە چۆم و رووبار، بوار، پاگـا. ٤ـ داری ژێر ڕێسمەی دەرگا.

**پاگەند** (نا.)[باک] بڕ: یاقووت

**پاگــەهـ** (نا. ل)[پا1 + گە][باک] بڕ: پاگە

**پاگیره** (نا. ل)[پا1 + گیر + ئە][ئەر] دوو کوتە تەختەی بە قەرا پێ کە جۆلا لە کاتی کار کردن دا پێی لە سەر دادەنێ و هەڵدەگرێ، پائەوشار، پێتاتە، پێتەتە.

**پال** (نا.)[باک] بڕ: پاڵ

**پالاخ**[1] (گـیـانـ.)[پا (پار1) + ولاخ][باک] بڕ: پالاغ

**پەلاخ**[2] (گیا.)[زا] بڕ: پەلاش

**پالاڤتن** (چا. م)[باک] بڕ: پالاوتن

**پالامار** (نا.)[باک] بڕ: پەلامار

**پالان** (نا.)[باک] بڕ: پالان

**پالاندن** (چا. م)[باک] بڕ: پالاوتن

**پالدم** (نا. ل)[پال(پاڵ) + دم2][باک ـ زا] بڕ: پاڵوو

**پـالـدووم** (نـا. ل)[پـال(پـاڵ) + دووم (دم2)][باک] بڕ: پاڵوو

**پالسنا** (نا.)[زا] بڕ: پاژنە

**پالمه** (نا.) بڕ: پاڵمە

**پالووته** (نا.)[؟][باک] هەرەوەز، زبارە

**پــالــه** (نـا.)[بـڕ: پـاڵـە] ١ـ [بـاک] درێنەوان، رەنجـــبـــەر، پاڵە. ٢ـ [زا] کرێکار، کارگەر.

**پالەڤان** (ئان.)[باک] بڕ: پاڵەوان

**پالەقـه** (نا. ل)[پا1 + لەقـە][ئەر] بڕ: پێلاقە

**پالیته** (گیا.)[باک] بڕ: بەڕوو

**پالیمۆک** (گیا.)[باک] بڕ: سیرمۆکە

**پـالـێـت** (نـا.)[فـــــەر: palette] تەختـەیەکی بەیزییـە تایبـەتی نەقـاش و کـاری نەقـاشی کـە رەنگی پێویسـتی لە ســەر رۆ دەکــەن یا ســازی دەکــەن و دەیگرنەوە.

**پاڵ** (نا.)[پەه: پەهلووک. تات: پەلێڤ ـ فــار: پـهلـو. بـاک: پال ـ نـاو: پاڵ، پـار. بـاش: پاڵ ـ هـەو: پاڵ] ١ـ کـــاردانـەوەی هێـزێک بەرەو پێش، باو، بۆق. ٢ـ جـووت بوونی پشت لە شـوێنێک. ٣ـ زۆر نزیک و نووسـاو بە کـەسـێک یا شـتـێکەوە. ٤ـ

تەنیشت، پاڵوو، لا. ٥ـ هەمێز، باڵ2. :: ئەو کوڕە لەوەتی ژنی هێناوە لە پاڵی نایەتە دەر. ٦ـ کەلەکە، پاڵوو. ٧ـ قەدی شاخ و گرد. ~ **پێوە دان:** پاڵ دانەوە، پشت یا بەشێکی لەش بە کەسێک یا شتێکەوە نان. ~ **پێوەنان:** ١ـ وەلانانی کەسێک بە تەوژمەوە. ٢ـ باو پێوە نان بە کەسێک کە سواری جۆلانە بوە. ٣ـ بە قەو شتێک بەرەو پێش یا لایەک بردن. :: پاڵێک بەو داشقیەوە نی با لە قوڕ بێتە دەر. پاڵی پێوە نێ با بچێتە ژووڕێ. ٤ـ (مجـ.) هان دان، دنە دان. ~ **خستن:** درێژ راکێشان، لە سەر لا تەنیشت درێژ کردن، وە پاڵ خستن. ~ **دانەوە:** ١ـ پشت بە پشتی یا شتێکی دیکەوە نان، پاڵ کەوتن، پاڵ پێوە دان. ٢ـ (کنـ.) حەسانەوە بە ئەرخەیانی و بێخەمی. :: پیاو دوو میلیۆنی هەبێ هەتا ئاخری عومری پاڵ دەداتەوە. & پاڵەوە دان، پاڵ لێدانەوە. ~ **کەفتن:** بڕ: پاڵ کەوتن. ~ **کەوتن:** ١ـ درێژ بوون لە سەر لا تەنیشت، پاڵ کەفتن. ٢ـ بڕ: پاڵ دانەوە. ~ **لێدانەوە:** بڕ: پاڵ دانەوە. ~**ەوە دان:** بڕ: پاڵ دانەوە. :: سنگمی بۆ بکەم بە سەنیری قوو، وەختی پاڵەوەدانە/ بەڵکوو بحەسێتەوە لەو سەفەری گەورە و گرانی تەرکە و تورکمانە (شۆڕ مەحموود ل ٥٨). **خۆ خزاندنە ~ کەسێکەوە:** دە پاڵ کەسێک خزان، چوونە نێو جێگای کەسێکەوە و دەگەڵی درێژ بوون. **دە (لە) ~خزان:** چوونە نێو جێگای کەسێکەوە، خزانە پاڵ کەسێکەوە. :: بەیانییان منداڵەم لە سەرمان خۆم دە پاڵ من دەخزێنێ و دەخەوێ. **دە (لە) ~خزاندن:** کەسێک دە باڵ کەسێکی دیکە نان و خەواندن. **دە (لە) ~ نان:** دە نێو نان، تێنان. :: کاغەزەکانی منیش دە پاڵ کاغەزەکانی خۆت بنێ. **رە ~ خستن:** ١ـ وە دوا خستن، نیسبەت دان. ٢ـ رەگەڵ خستن، رەپاڵ دان. **رە ~ دان:** ١ـ بەر خستن، تێگرا رادان و رامالین، بردنە پێش بە تێگرایی شتێک. ٢ـ پێوە خستن، رەگەڵ خستن، رەپاڵ خستن. **رە ~ نان:** ١ـ تێنان، دە نێو نان. ٢ـ دەر کردنی بە زۆر و بە سووکایەتی. **هاتنە ~:** دە پاڵ خزان، لێ نزیک بوونەوە. :: بە شەو ژان و پەژارەم دێنە پاڵێ/ بە رۆژ ئۆقرەم نیە ساتێک لە ماڵێ (تاریک و روون ل ١١٤). **وە ~خستن:** پاڵ خستن، درێژ راکێشان. **وە ~دان:** کار و مەسەلەیەک خستنە سەر ئەستۆی

کەسێک. :: کۆڵێک درۆ و دەلەسەی ناڕاستیان وە پاڵ داوم.

**تێبینی:** پاڵ لە پێرێسو peresu ـ ی ئەوێستایی بە مانای پەراسوو و لا و تەنیشت ـ ی کوردیی کەوتوە بە لەبەر چاو گرتنی ئاڵوگۆڕیی دوو پیتی « ر » و « ل » دەگەڵ یەکتر. ماناکانی دیکە لە دوایی پەیدا بوون.

**پالا**[1] (نا. ل)[پا1 + لا (ئالاو)][هەو ـ ئەر] بڕ: پێڵاو. :: من بیم خڕیدار کالای بالاکەت/ من بیم وە سەرگەر گەرد پالاکەت (مەولەوی ل ٣٨٦).

**پالا**[2] (ر.)[لە: پالاوتن] لە چاوگی پالاوتن دەکەوێ، بە ناوەوە دەلکێ و مانای پاڵوێنەر دەدا، پاڵێو. :: پڵاوپالا.

**پالاخ** (گیان.)[پا (پار1) + ولاخ] بڕ: پالاغ

**پالادڕانە** (نا. ل)[پالا + دڕ + ئانە] پووڵ و پارەیەک کە لەبری ڕێگا بڕین دەدەن بە هەندێک کەسی وەک حەکیم و شاتر و شوان و پیادە، کاڵەدڕانە، پالامز، پامز.

**پالافتن** (چا. م) بڕ: پالاوتن

**پالافتە** (نا. مف)[لە: پالافتن] بڕ: پاڵێوراو

**پالاغ** (گیان.)[پا(پار1) + ولاغ][باک: پالاخ، پەلاخ ـ ناو: پالاغ، پالاخ، پەڵخ] ١ـ بێچووی گامێش. ٢ـ (مج.) پیاوی ئەحمەق و نەزان و بێ ئەدەب.

**پالامز** (نا. ل)[پالا + مز1] بڕ: پالادڕانە

**پالان** (نا.)[پەش: پالان، پالانە ـ بەل: پالام ـ فار: پالان ـ لۆر: پالۆ ـ گیل: پالۆن. باک: پالان ـ ناو: پالان] بەرگێکی نێواخنکراو لە کا، کە لە سەر پشتی کەر و بارگین و حەیوانی بارەبەر دادەنێن هەتا پشتی بریندار نەبێ، کورتان، کۆپان، کۆپانە. **~ کردن:** پالان لە سەر پشتی بارەبەر دانان. || **پالانی قەجەری:** جۆرە پالانێک چووکتر و ڕێکوپێکتر کە وەک زین کەلکی لێوەردەگرن، کۆپانی قەجەری.

**تێبینی:** دوکتور مەحەممەدی موعین وشەی پالانی بردۆتەوە سەر چاوگی پالاوتن (بڕ: برهان قاطع ب ١ ل٣٥٧). پێموایە دوکتور بە هەڵە بۆی چوە. پالان لە پەهلووک ـ ی پەهلەویی بە مانای پاڵ ـ ی کوردیی کەوتوە، پالانچە و پالانتە و پالانە لە کوردیی دا بە مانای

مــاســوولکەی تیــغــەرەی پشت یا ئەو تیسکە خوریەیە کە لە سەر پشتی بەران بۆ جوانی دەیهێڵنەوە و ئەوەش رایەکە بە قـەوەتتـر دەکـەن کـە پالان شـتێکە کـە پێوەندی بە پاڵ یا تەنیشتەوە هەیە و چ پێوەندی بە پالاوتنەوە نیە.

**پالانتە** (نا. ل)[پالان + تە (چە1)] بڕ: پالانچە

**پالانچـــە** (نا. ل)[پالان + چە1] ١ـ ماسولکە گۆشـتی دوو بەری تیـغـەرەی پشت. ٢ـ هەندێک خـــوری کـــە دوای برینەوە لە سـەر پشتی بەران بـۆ جوانی دەیهـێـڵنەوە، پالانە، پشـتـەک. ٣ـ بەرد و قـسـڵـێک کـە لێـواری جـۆگـەی پێ دادەبەستن. & پالانتە

**پالاندروو** (نا. فـا، ئان. ل)[پالان + دروو] کـەسـێک کـە پالان سـاز دەکـا و دەیفرۆشێ.

**پالاندرووی‌ی** (حم.)[پالاندروو + یی] کار و پێشەی پالاندروو.

**پالانلار** (ئان. ل)[پالان + لار](کنـ.) ژنی بە مێـرد کە جوابی کـەسی دیکەش دەداتەوە و بە دزی دەدا، ژنی بدەر.

**پالانە** (نا. ل)[پاڵ + ئانە] هـەندێک تووک و خـوری کـە بۆ جـوانی لە ســەر پشـتی بزن و مـەڕ و بەران دەیهـێـڵنەوە، پالانچە

**پالانی** (نا. ل)[پالان + ئی] ١ـ ئەسپی باریی کە لـە جیات زین پالانی لێدەنێن، بارگین. ٢ـ کەرێک کە کاتی پالان کردنی گەیشتوە. ٣ـ ئەسپێکی شۆخ و جوان کە زوو لە هەندێک ناوچەی کـوردسـتـان لە شـیـنگێـڕیی دا دەیانڕازاندەوە و جل و بەرگی مـردووکـەیان پێـدادەدا و خـەڵکی خـاوەن مـردووش شـینیـان بـۆ دەگـێـڕا، ئەســپی کـۆتەڵ. ‹‹ گـوێ درێژێ بار و کورتان بەرز و **پالانی** بەزێن/ چوست و وریاتر لـە گـوێ کـورتانی پالانی و گـێـژ (نالی ل ٢٢٧).

**پالاوتن** (چا. م)[پاز: پالیـــیـــدەن، پالائیـدەن ـ پەه: پالاییـیـتـەن، پالووتەن. فـــــار: پـالودن ـ بـەل: پـالایـەگ. باک: پـالانـدن، پـالاڤـتن، پـارووزانـدن ـ نـاو: پالاوتن، پالافتن، پالێـــوران، پالوانن ـ هەو: پەرزنای] خـاوێن کـردنەوە و سـاف کردنی تراو و ئاوەکی کە شـتی زێدەیان تێدایە. بەم شـێوەیە کە پـەڕۆیەکی تەنک کـــە کـــونی زۆر وردی هـەیـە بـە نـاوی پالوێنکە لە ســەر دەفـرێک رادەگـرن و ئاوەکی یا تەڕاوەکـەی بە سـەر دادەکەن، تەڕاوی سـافکراو دەچێتە نێو دەفرەکەوە

و خـلـتـه و شـتی زێده له پاڵوێنكه دا دەمێنێتەوە، پاڵفته كردن.

**پاڵاوته** (نا. مـفـ.)[له: پـاڵاوتن] بـڕ: پاڵێوراو

**پاڵ پاڵه** (نا. ل)[پاڵ + پـاڵ + ئه] بڕ: هەنگڵەشەلە.

**پاڵپـشت** (نا. ل)[پـاڵ + پشـت] ١ـ پشتی، پاڵەوپشت. ٢ـ پشتگیر، لایەنگر.

**پاڵتاو** (نا.) بڕ: پاڵتۆ

**پاڵتـۆ** (نـا.)[فـەر: paletot] بالاپۆشـێكی ئەسـتـوور و درێژە كـه زستانان له سەرەوەی هەموو جلەكان ده بەری دەكەن و سەرما دەگێڕێتەوە. باڵته، باڵتۆ، پاڵتاو، پاڵته.

**پاڵته** (نا.) بڕ: پاڵتۆ

**پاڵتـەک** (نا.)[؟] دەردێكه ئەدات له قـوڕگی ڕەشـەوڵاغ ئەی ئاوسـێنێ، هەڵی ئەدڕن هـەندێ گـەنمی تێ ئەكـەن چاك ئەبێـتـەوە (كـشت و كـاڵ ب ١ ل ٥٨)، پەڵتەك.

**پاڵدامێن** (نا. ل)[پاڵ + دامـێن] بڕ: پاڵداوێن.

**پاڵداوێن** (نا. ل)[پاڵ + دواێن] ١ـ پشتەوەی داوێن، پاڵدێم. ٢ـ داوێنی شاخ و گرد، پاڵداینه. & پاڵدامێن.

**پاڵداینه** (نا. ل)[پاڵ + داینه][ئەر] ١ـ پاڵدێم، پاڵداوێن. ٢ـ دوائێنی كێو، بنار.

**پاڵدم** (نـا. ل)[پـاڵ + دم (دوو3)] بڕ: پاڵدێم

**پاڵدوو** (نـا. ل)[پـاڵ + دوو3] بـڕ: پاڵوو1

**پاڵده** (نا. ل)[پاڵ + ده (دوو3)] بڕ: پاڵوو1

**پاڵدێم** (نـا. ل)[پـاڵ + دێم (دوو3)] پشـتـەوەی داوێن، تەشكی داوێن، پاڵدم، پاڵداوێن، پاڵدامـێن. || **پاڵدێم بە گـوو:** (كنـ.) ژنی پیس و پۆخڵی و پیسكێر.

**تێبـینی:** وشـەكـانی پاڵدێم و پاڵدم هاوڕیشـەكـانی پاڵوو ـ ن و مـاناكـانیـان گـۆڕاوە. هـەروەها دێم یا دم بە مـانای كلك ـ ه و له ڕیشـەی [ئەو: دومـه ـ پەه: دووم] كەوتوه.

**پاڵفته** (نا. مف.)[له: پالافتن][ئەر] بڕ: پاڵێوراو. ~ **كردن:** پالاوتن

**پاڵم** (نـا. ل)[پـاڵ + م (دم = دوو3] [هەو] بڕ: پاڵوو

**پاڵمته** (گیا.)[هس: پاڵمه] گیایەكی بەهارییە و تامی وەكوو هاڵەكۆكە (كشت

و کاڵ ب ١ ل ٥٩).

**پاڵمە** (گیا.)[ناو: پاڵمە، پالە ـ هەو: پالە] جۆرێک ئەسپنگ کە گەڵاکانی لە ئەسپنگی ئاسایی پانترە.

**پاڵنگ** (گیانـ.)[هەو] بڕ: پڵینگ

**پاڵوانن** (چا. م)[ئەر] بڕ: پالاوتن

**پاڵوان**[1] (ئان.)[ئەر] بڕ: پاڵەوان

**پاڵوان**[2] (نا. مفـ.)[ئەر] بڕ: پاڵوێن

**پاڵوانە**[1] (نا. ل)[پاڵوان2 + ئە][ئەر] بڕ: پاڵوێنە

**پاڵوانە**[2] (گیانـ.) بڕ: پاڵەوانە2

**پاڵوێن** (نا. مفـ.)[لە: پالاوتن]

**پاڵوێنکە** (نا. ل)[پاڵوێن + ک + ئە] بڕ: پاڵوێنە

**پاڵوێنگە** (نا. ل)[پاڵوێن + گــــە] شــوێنێکی گــەورە کــە نەوتـی خــاوی بۆ دەچـێ و لـەوێ نـەوتـی لـێ دەپاڵێـــــون، شوێنی پالاوتنی نەوت.

**پاڵوێنە** (نا. ل)[پاڵوێن + ئە][ناو: پاڵوێنە، پاڵوانە، پاڵێوکـە، پاڵوێنکە] ١ـ پارچـەیەکی ســپـی و خــاوێن و شــاش و تەنک کــە بۆ پالاوتنی شــیــر کــەلکی لێـــوەردەگـــرن، راوک، پارزم، پارزوم، پەرزم، پەرزوم، پارزۆن، پارزن، پارزوون، پارزنگ، پارزوونگ ٢ـ فیلتێر.

**پاڵۆپشت** (نا. ل)[پاڵ + ئۆ + پشت] بڕ: پاڵەوپشت.

**پاڵوو**[1] (نـا. ل)[پاڵ + ئـوو (دوو3)] [بـاک: پـالـدووم، پـالـدم ـ نـاو: پـاڵـوو، پاڵدوو، پاڵدە، پـاردوو ـ هـەو: پاڵم ـ زا: پاردم، پالدم] کەژوو یا قـایشـێک کـە بە بن کلکی حـەیوانـی بارەبەر دا دێ و زین یا پالان رادەگرێ، رانەکی، قووش.

**تێبینی:** پاڵوو لە پێش دا پاڵدوو بوە و پیــتی داڵ ســواوە و بـۆتە پاڵوو ـ دوو بە مانای کلکە.

**پاڵوو**[2] (نـا.)[پەهـ: پـەهـلـووک][هـەو ـ ئەر] ١ـ کەلەکە، قەبرغە. ٢ـ تەنیشت، لا، پاڵ. ٣ـ (دارێکە ئەدرێتە بەر (نێ)ی ئاش بۆ نەجـوولانـی (کشت و کاڵ ب ١ ل ٥٩) (هس: پاڵووگیر)

**پاڵوودە** (نا.)[پەهـ: پالووتەک] جۆرێک خواردەمـەنییـە کە لـە نیشـاسـتـە سـازی دەکــەن و بـە شـــەکــراو یـا شــیـلـە و ئاو دەیخۆن، پەلوول.

سـاز کردنەکەی بەم جـۆرەیە: لە پێشدا ئاو و نیـشـاسـتـە لە سـەر ئاگـر دادەنێن هـەتا دەکوڵێ و نیشاستەکە خۆ دەگرێ،

دوایی لە دەفرێکی تایبەتی ( بنەکەی وەک بێژینگ کون کون کراو و هەندێک قووڵە) دەکەن و بە ئامرازێک کە پڕ بە دەفرەکەیە پاڵی پێوەدەنێن. لە ژێر ئەم دەفرە سەهۆڵاو داندراوە و نیشاستەی گەرمی درێژ و بارێک دەچێتە نێوی و سارد دەبێتەوە. شەکراوی بۆ ساز دەکەن و پاڵوودەکەی تێدەکەن و دەیخۆن.

**تێبینی:** پاڵوودەی لە ریشەی پالاوتن کەوتوە یانی شتی پاڵێوراو.

**پاڵووگیر** (نا. ل)[پاڵوو2 + گیر] دارێکە ئەدرێتە بەر (نێ)ی ئاش کاتێک بە لایەکا لاسەنگ بێ (خاڵ ب ١ ل ٢٠٣).

**پاڵە**[1] (نا.)[سور: پالە][باک: پالە ـ ناو: پاڵە ـ زا: پالە] ١ـ کەسێک کە گەنم و جۆ دەدوێتەوە، دروێنەوان، رەنجبەر. (بڕ: سەرپاڵە، نێوپاڵە، قوون پاڵە). ٢ـ وەرزێرێکی کە بەشێک لە پێنج بەشی وەبەر دەکەوێ، سەپان. ٣ـ ئەندازەیەک لە پەڵە دەغڵ و دانەوێڵە کە سەپانێک لە رۆژێک دا دەیدرۆێتەوە.

**پاڵە**[2] (نا.) ١ـ شار. ٢ـ دەربار

**تێبینی:** هەر ئەوجۆرە کە ناوی ماد ـ هۆزی گەورەی باکوور و باکووری رۆژاوای ئێران ـ لە دوایی بە شێوەی ماه (پەهلەویی ماد) بە هەندێک لە شارەکان وەک: ماه نەهاوەند، ماه بەسرە، ماه کووفە و ماهیدەشت کوتراوە، ناوی پەهل، پەهلەو، پەهلە بە هەندێک لەو شار و ناوچانەی کە پێوەندیان دەگەڵ هۆزی ناوبراو هەبوە کوتراوە وەک پەهلەشاهیسدان کە ئەرشکی مەزن، دامەزرێنەری پادشایەتی ئەشکانی لەوێ حکومەتی بە دەستەوە گرت و لە دوایی پاڵە (پەهلەو) بە مانای شار بە کار بردراوە. (موعین ب ١ ل ٨٤٦)

**پاڵەپەست** (نا. چا)[پاڵ + ئە + پەست2 (پەستاوتن)] بڕ: پاڵەپەستۆ.
**~ دان:** بڕ: پاڵەپەستۆ دان

**پاڵەپەستۆ** (نا. چا)[پاڵ + ئە + پەستۆ (پەستاوتن)] ١ـ پاڵی توند بۆ وەپێش دان یا جێ کردنەوە. ٢ـ پاڵی توند بۆ پەستاوتن و ئاخنین. & پاڵەپەست، پاڵەوپەستۆ. **~ دان:** ١ـ پاڵ پێوەنانی بە قەوەت بە کەسێکەوە کە لە نێو حەشامەت دا گیری کردوە بۆ دەرباز بوونی. ٢ـ بە زۆر پەستاوتن، تێ ئاخنین. & پاڵەوپەستۆ دان، پاڵەپەست دان.

**پاڵەکی** (نا. ل)[پاڵ + ئەک + ئی] جۆرێ کەژاوە کە سەرەکەی ئاوەڵەیە و لە سەر پشتی وشتری دادەمەزرێن.

**پاڵەنگ** (نا. ل)[ئەر] رەشـــمـــە، هەوسار، مەهار.

**تێبینی:**هاوتا و هاومانای ئەم وشەیە لە فـارسی دا بە شـێـوەی پالاهنگ (پالاهەنگ) و پالهنگ (پالـهـەنگ) هاتوە. وشەکە دەبێ لە دوو بەشی پاڵ + هەنگ پێکهاتبێ. پاڵ بە مانای پەنا و تەنیشتە و هـەنـگ دەبـێ لـە ثـەنـگ thang ـ ی ئەوێستایی بەمانای شۆڕ و هەڵواسراو کەوتبێ و بە گشتی یانی لە لاتەنیشت هەڵواسراو. هەروەتر خاڵ پاڵەهەنگ ـ ی بە مانای کۆت و زنجیری پێی بەندیی نووسیوە کە هەر لەم ریشەیەیە.

**پاڵەهەنگ** (نا. ل)[بڕ: پاڵەنگ] کۆت و زنجیری گەورەی پێی زیندانی.

**پاڵەوان** (ئان. ل)[باک: پالەڤـان، پەهلەوان ـ ناو: پاڵەوان، پاڵوان ـ هەو: پاڵەوان ـ زا: پاهلیوان] ١ـ مرۆڤی بوێر و بەهێز، پیاوی ئازا و بە خـۆوە. ٢ـ قارەمانی سەرەکی چیرۆک و حەکایەت، قارەمان. ٣ـ (مجـ.) پیاوی کەڵەگەت و بەخۆوە. ٤ـ زۆرانباز.

**تێبینی:** زمانەوانانی فارس ریشەی پەهلەوانیـان بردۆتەوە سـەر پەهلەو یا پـاڵـەو + ئـان. پـاڵـەو ـ یـان بـە نـاوی پارتەکان کە قەومێکی کۆن بوون داناوە و چونکە زۆر بوێر و نەترس بوون ئەو ناوە پەڕیوەتە ســـەر ناوی هەمـــوو کەسێکی بوێر و نەترس. (برهان قاطع ب ١ ل ٤٣٠). لە باری مێژووییەوە نازانم ئەم وشـە کـەی دەکـار کـراوە بەڵام بە لێکدانەوەی شکڵ و بیچمی وشەیەکی تەواو کـوردیی دەدا و پێمـوایە دەبێ لە [پاڵ + ئە + وان] پێکهاتبێ و هاومانا و هاوشکڵی پشتیوان [پشت + ئی + وان] بێ، یانی کەسێک کە لاگر و پشتگری خەڵکە و ئەوە پتر خووی پاڵەوانان بوە کە پشتگری خەڵک بن. بۆ سەلماندنی ئەو مەبەستە هێشتا لە کوردیی دا پاڵەوانە بە هاومانا و هاوتای پشـتـیـوانەیە و ئەویش دیوارێکە کـــە لە بەر دیواری شکست هەڵیدەچنن.

هەروەتر چاوگی پال pāl لە زمـانـی سـانسکریت دا بە مـانای پاراستن و ئاگاداری لێکردن هاتوە و پالە pāla بە مانای پارێزەر هاتوە.

**پاڵەوان پەمبـە** (ئان. ل)[پاڵەوان + پەمبە] کەسێک کە بە رواڵەت پاڵەوان و

نەترسە بەڵام لە راستی دا ترسەنۆک و خوێڕییە، پاڵەوانی درۆیین.

**پاڵەوانە** 1 (نا. ل)[پاڵەوان + ئە] ١ـ دیوارێک کە لە بەر دیوار شکست هەڵیدەچنن بۆ ئەوەی نەکەوێ، پشتیوانە. ٢ـ کۆڵەکەیەک کە وەبەر دیواری شکستی دەدەن بۆ ئەوەی کە نەڕووخێ. ٣ـ یەکێک لە بەرەکانی دارمازوو.

**پاڵەوانە** 2 (گیانـ.) پەلەوەرێکی رەشی بچووکی باڵ درێژە. لە سەرەتای بەهار دا پەیدا ئەبێت تا نیوەی هاوین. هەمیشە بە ئاسمانەوەیە کە کەوت ناتوانێ هەڵسێت و بفڕێ. خواردنی بە هەواوە مێشوولەیە لە ئێواران دا ئەچێتە کونی دیوار و گوێسەبانەوە بۆ ئەوەی لە بەیانی دا کە هاتە دەرەوە خۆی فڕێ دا تا بتوانێ بفڕێ. (کشت و کاڵ ب١ ل ٥٩)، Apus apus ناوی لاتینی ئەم باڵندەیە، پاڵوانە، تەیرەن ئەبابیلە، تەڕنەبابیلە، تەڕنەئەبابیلە، چەورۆکە، چەورووکە.

**تێبینی:** پاڵەوانە بە مانای ئەبابیل فەرهەنگی کشت و کاڵ نووسیویەتی و لە فەرهەنگی خاڵ دا بە پاڵوانە نووسراوە. لە فەرهەنگی موعین دا پالوانە و پالوایە و بالوانە بە مانای ئەبابیل و پەڕەسێلکە هاتوە. (بڕ: موعین ب ١ ل ٦٧٨)

**پاڵەوانەتی** (حم.)[پاڵەوان + ئەتی] پاڵەوان بوون، بوێریی قارەمانیی، پاڵەوانیی. ~ **کردن:** ئەنجام دانی کاری قورس و سەخت کە مرۆڤی ئاسایی پێیان نەکرێ.

**پاڵەوانیی** (حم.)[پاڵەوان + ئیی] بڕ: پاڵەوانەتیی

**پاڵەوپشت** (نا. ل)[پاڵ + ئە + و + پشت] باڵنج یا هەر شتێک کە وەبەر پشتی بدەن و پاڵی لێدەنەوە، پاڵۆپشت، پاڵپشت، پشتی. ؛؛ هێند ماندوو بوو هەر پاڵی وە پاڵەوپشت دا و خەوی لێکەوت.

**پاڵەوپەستۆ** (نا. چا)[پاڵ + ئە + و + پەستۆ (پەستاوتن)] بڕ: پاڵەپەستۆ. ~ **دان:** بڕ: پاڵەپەستۆ دان

**پاڵەیی** (حم.)[پاڵە + ئیی] کار و پیشەی پاڵە، رەنجبەریی.

**پاڵێن** 1 (ئاک.)[؟] ١ـ دوای نیوەڕۆ، سەر لە ئێوارە کاتی مەڕدۆشین، پاڵێنان. ؛؛ شەنگەبێری گراوی خۆم وێنووسی جەماڵ و جوانی/ ئێستاش پاڵێنێ وەک جاران لە شوان و مێگەڵ دەڕوانی؟

(تاریک و روون ل ١٦٨). ٢ـ بردنەوەی مەڕ بۆ لەوەڕ دوای دۆشینی ئێواران هەتا وەختی ماڵ نووستنان.

**پاڵێن**[2] (نا.)[لە: پالاوتن][ئەر] مەلاقەی گەورەی کون کون، ئاوپاڵ.

**پاڵێنان** (ئاک. ل)[پاڵێن1 + ئان] سەر لە ئێوارە، پاڵێن.

**پاڵێو** (ر.)[لە: پالاوتن] لە چاوگی پالاوتن دەکەوێ، بە ناوەوە دەلکێ و مانای پاڵوێنەر دەدا، پالا. ∴ چاپاڵێو، شیرپاڵێو، برنج پاڵێو.

**پاڵێوران** (چا. م) بڕ: پالاوتن

**پاڵێوراو** (نا. مفـ.)[لە: پالاوتن] هەر ئاوەکی و شتێکی لە پاڵوێنکە دراو و بێ خڵت و خاڵ، پالافتە، پالاوتە.

**پاڵێوکە** (نا. ل)[پاڵێو + ک + ئە] بڕ: پاڵوێنە

**پاماسە** (نا. ل)[پا1 + ماس (ماسین) + ئە][ئەر] بڕ: پێخڕە

**پاماسێ** (نا. ل)[پا1 + ماس (ماسین) + ئێ][ئەر] بڕ: پێخڕە

**پاماڵ** (ئان. مفـ.)[پا1 + ماڵ3][پەش: پامال، پایمال ـ فار: پامال، پایمال ـ بیر: پامـال] بڕ: پێشێل. **~ بوون:** بڕ: پێشێل بوون. **~ کردن:** بڕ: پێشێل کردن.

**پاماڵکراو** (نا. مفـ.)[لە: پاماڵ کردن] بڕ: پێشێلکراو

**پامالە** (نا. ل)[پا1 + ماڵ3 + ئە] ئامرازێکی جووتێرانە کە بریتییە لە تەختەیەکی گەورە کە بە سەر زەوی دا دەیکێشن هەتا سندە و گڵمەتی زەوی کێڵدراو ورد بکا و تۆمەکەش بکەوێتە ژێر خاکەوە، ماڵوو، ماڵە.

**پاماو** (نا. ل)[؟] لووس کردنی سواغی گەچ بە پەڕۆی تەڕ (خاڵ ب ١ ل ٢٠٤).

**پامز** (نا. ل)[پا1+ مز1] بڕ: پالادڕانە

**پامووورە** (نا. ل)[پا1 + مووورە (مووروو1)] پاوانەی سازکراو لە مووروو، پێموورە. (بڕ: پاوانە)

**پامەڕە** (نا. ل)[پا1 + مەڕ2 + ئە] بڕ: پێمەڕە

**پامەلە** (نا. ل)[پا1 + مەلە] جۆرێک مەلەیە کە مەلەوان لە سەر جێی خۆی بە پێ لێدان خۆ رادەگرێ، مەلەپایە، مەلەپێیە، پێمەلە.

**پامێزە** (نا. ل)[پا1 + مێز3 + ئە] ١ـ

گووی هەنگ کە لە سەر کانی ئەیکات پاش ئاو خواردنەوە، سەرێکی ئەستوور و سەرێکی باریکە، هەنگدۆز کاتێ ئەو گووە ئەبینێ روو ئەکاتە سەری باریکی گووەکە و ئەڕوات تا شاری هەنگەکە ئەدۆزێتەوە بۆ ئەوەی هەنگوینەکەی دەرکات (کشت و کاڵ ب ١ ل ٥٩). ٢ـ شاوەتی ویشکەوەبووی نێو لینگی تەگە. ٣ـ خوری و مووی دەست و پێی ئاژەڵ.

**پان**[1] (ئـان.)[ئـەو: پەثـەنـە ـ پـەه: پەهەن، پەهن. باک: پان، پاحن، پەهن، پەعن، پەحن ـ ناو: پان ـ هەو: پان ـ زا: پاهن، پاعن] ١ـ هەراو، بەرین، تەسک. ٢ـ پێشێل، پێخوست. ~ **بوونەوە:** ١ـ فلیقانەوە، پێشێل بوون. ⁘ چاو ئەو مێرووله بەستەزمانانە چۆن لەبەر پێیان پان بوونەوە. ٢ـ تخێڵ بوون، بە بڵاوی دانیشتن، تەنبەڵانە درێژ بوون و جووڵە نەکردن. ⁘ دوو رۆژە لە ماڵێ پان بۆتەوە و دەست لە رەش و سپی نادا. ٣ـ تەسک و بڵاو کردنی هەویر و شتی مەیو. ⁘ ٤ـ هەراو بوون، بەرین بوون. ⁘ ئەلێرەوە چۆم پان دەبێتەوە. هەندێکی دیکە لێخورە جادە پان دەبێتەوە. ٥ـ راخران. ⁘ کچم دابڕۆ بزانە جێگاکان پان بوونەوە؟ ~ **کردنەوە:** ١ـ راخستنی جیگا و بان و سفرە و هەر شتێکی کە بەر بەرین بێ. ⁘ جێگاکان پان کەوە با بخەوین. بچۆ ئەو کەوڵەی لە دەرێ پان کەوە! ٢ـ فلیقاندنەوە، پێشێل کردن، پێ رێخستن. ⁘ هەتا سەری مار پان نەکەیەوە نامرێ. پێیەکی لە هەزار پێیە نا و پانی کردەوە. ٣ـ دانیشتن بە بڵاوی و جێگایەکی زۆر گرتن، تخێل بوون، دانیشتنی تەنبەڵانە و بێ ئەدەبانە. ⁘ ئەوە بۆ وا خۆت پان کردۆتەوە زەلام ! ٤ـ قەڵەو کردن، پڕ و قەبە بوون. ⁘ ئاغا هێندەی ماڵی مفت خواردوە قوون و پشتی لێ پان کردوە. ٥ـ تەسک کردن و بڵاو کردنەوەی هەویر و شتی مەیو. ⁘ لە پێشدا دەبێ هەویرەکە پان کەیەوە دوایە بە تەندووریەوە بدەی! ٦ـ هەڵخستن، لە بەر تاو دانانی هەر شتێک بۆ ویشک کردن و ویشک بوونەوە. ⁘ مێرێ تەماتەکانی لە بەر تاو پان کردبۆوە.

**پان**[2] (گیا.)[هیند: pan] پنچکێکە لە رەگەزی بی کە لە هیند و مالزی و هەندێک شوێنی دیکە شین دەبێ، گەڵای ویشکی ئەم دارە بۆنێکی خۆشی لێدێ و بۆ دەرمانی هەندێک نەخۆشی کەلکی لێوەردەگرن و رەنگی تفیش سوور دەکا، piper betel ناوی لاتینی ئەم

دارۆچکەیە، شاحوسێنی. (عەر: تملول)

**پان**[3] (پاشگـ.)[فــەر: pan لە یون: pantos (گشت، هەموو)] پاشگرێکە بە ناوانەی کە ئاخـرەکـەیان بە " ئیـسم " کـۆتایی دێ و ئـامـانج و مـەبەسـتێکی تێگرایی نەتەوەیی، ئایینی یان ناوچەیی پێک دەبەستێتەوە. ؛؛ پان تورکیسم، پان ئێرانیسم، پان عەرەبیسم.

**پاناو** (نا. ل)[پان1 + ئاو] گــۆڕایی سەری کێو و چیا، پانتاو.

**پاناوک** (نا. ل)[پان1 + ئاو1 + ک] ١ـ گۆمیلکەی ئاو لە دەشت دا، پاناوکە. ٢ـ گـۆڕایی سـەری کـێـو و چیـا، پاناو، تەختان، پانتاو.

**پاناوکــە** (نا. ل)[پاناوک + ئە] بڕ: پاناوک

**پانـایی** (حم.)[پان1 + ئایی] رادەی هەراویی و پانی شــتــێک یا شــوێنێک، پاناهی، پانتـــایی، بەرینایی. ؛؛ چی خـۆشـتـرە لەوەی تەبیـعـەت جـوان بێ/ ماوەی سرنج پانایی گشت ئاسمان بێ (گۆران ل ١٩٤).

**پاناهی** (حم.)[پان1 + ئاهی][باک] بڕ: پانایی

**پانبــــەپان** (نا. ل)[پان1 + بە/ە + پان1] بڕ: پانەوپان

**پانپـانۆکـە** (نا. ل)[پان1 + پان1 + ئۆک + ئە] کاری خۆ راحەت کردنی دوو ژن بە یەکدی، پانپـانۆکێ، قـوزقـوزانێ، کوزەتەقـانێ. ~ **کردن:** نزیکی دوو ژن دەگەڵ یەک و خۆ رەیەک خشاندن و خۆ رەحەت کردن لە یەکتر.

**پانپــانۆکێ** (نا. ل)[پان1 + پان1 + ئۆک + ئێ] بڕ: پانپانۆکە

**پانتــاو** (نا. ل)[پان1 + ت + ئاو] ١ـ بڕ: پاناو. ٢ـ تەخـتـایی سـەر خـەرمـان (کشت و کاڵ ب ١ ل ٦٠).

**پانتاویی** (حم.)[پانتاو + ئی] شوێنی تەخت و پان، پانایی شوێنێک.

**پانتاویی** (حم.)[پانتاو + ئیی] رادەی پانـی و هەراویی شــتــێک یا شــوێنـێک، پانایی.

**پانتــۆڵ** (نا.)[ئیــتــا: pantalon] شــاڵواری کــوردیی تایبـــەتی پیــاوان، دەلینگی تەنگ و هەر چی بەرەو ســەرتر دەچێ فـشــتــر دەبێـتـەوە و پزووکـەی دێخـوونی تێهـەڵدەکێشن و هەر بەویش دەیبەستنەوە، پاتۆڵ، رانک، دەمەرقۆپان.

**پانتۆمیم** (نا.)[فەر: pantomime] جـۆرە نمـایشـێکە کـە دەورگـێـڕ بـەبێ دەربڕینی قسـە و تەنیـا بە ئیشـارە و جووڵاندنەوەی ئەندامەکانی مەبەستێک روون داکاتەوە.

**پانج** (ژ.)[زا] بڕ: پێنج

**پانجاس** (ژ.)[زا] بڕ: پەنجا

**پانجێس** (ژ.)[زا] بڕ: پازدە

**پاندا** (گـیـانـ.)[ئین: panda] گیاندارێکی ئارام و بێ ئازارە وەک ورچ، کـەوڵی سـپی و پڕ پەشـمـە و لە کوێستانەکانی چین و تەبەت دەژی.

**پاندۆڵ** (نا.)[فـەر: pendule] مـیلەیەکی هەندێک قـورس کـە بە بنی هەندێک سـەعـاتی دیواری گەورەوەیە و دێت و دەچێ و مـیلەکـانی سـەعـات دەگەڕێنێ، ئاونگ.

**پانز** (ژ.)[زا] بڕ: پێنج

**پانزدە** (ژ.) بڕ: پازدە

**پانزدەهـ** (ژ.)[باک] بڕ: پازدە

**پانزە** (ژ.) بڕ: پازدە

**پانژ** (ژ.)[زا] بڕ: پێنج

**پانسمان** (نا.)[فەر: pansement] کـاری خاوێن کردنەوە و بەستنی برین.

**~کردن:** خـاوێن کردنەوە و مـەرهەم لە سەر برین دانان و بەستن.

**پانسیۆن** (نا.)[فەر: pansion] ماڵ و شـوێنێک بـۆ ژیـان و خـواردن بـە پارەیەکی دیارییکراوی مانگانە.

**پانک**[1] (نا. ل)[پان1 + ک] شـوێنێکە لە لای سـەرەوەی چادر و رەشمـاڵ دا کە دەکەوێتە لای دەرەوە، وەک گوێسوانە بۆ ئەوەی ئـاوی باران نەڕژێتـە دەورووبەری خێوەت.

**پانک**[2] (ئان.)[زا] بڕ: پاک

**پانکراس** (نا.)[فـەر: pancreas] لوویەکی گەورەی هێشوویی سوورە کە لە کن گـەدەیە و کـاری سـاز کـردنی شیرەیەکە کە یارمەتی هەزمی خۆراک لە سـەرەتای ریخـۆڵە دەدا و هـەروەتر ئینسـۆلین ـ یش سـاز دەکـا. (عـەر: لوزالمعدە)

**پانکە**[1] (نا. ل)[پان1 + کـە] ١ـ بەرێکی دارمـازوویە کـە وەک دووگـمـە پانە. ٢ـ جۆرێک ماسی، پانە ٣ـ (ئان. ل) بڕ: پانکەڵە

**پانکە**[2] (نا.)[؟] جۆرێک باوەشێنە کە بە بەرق کـار دەکـا (هەم لە مـیچ

هەڵداوەسرێ و هەم جۆرێکی لە سەر زەوی دادەندرێ) و بە خـولانـەوە و سووڕانی پەڕەکانی وڵات فێنک دەکا، هەروەها جۆرێکی چووکـەی لە کەبابخانەکان لە جیات باوەشێن کەلکی لێوەردەگرن.

**پانکەڵە** (ئان. ل)[پان1 + ک + ئەڵە] ١ـ حاڵی کەسێکی پان و کورتەباڵا، پانکە1 /٣. ٢ـ شتێک کە کەمێک پان بێ.

**پانگزە** (ژ.)[هەو] بڕ: پازدە

**پان وبەرین** (ئان. ل)[پان1 + و + بەرین] حاڵی هەر شتێک یا شوێنێکی زۆر پان، هەراو. ⁂ دەشتی پان و بەرین. **~ بوون:** زۆر پان و هەراو بوون.

**پان وپلیش** (ئان. ل)[پان1 + و + پلیش] حاڵی شتێکی لە بەر پێیان پان و فلچ بووبێتەوە و بە تەواوی تێکچووبێ. **~ بوونەوە:** لە بەر پێ پان بوونەوە و فەوتان.

**پان وپۆڕ** (ئان. ل)[پان1 + و + پۆڕ] فش، هەراو، زۆر پان و بەرین. **~ بوون:** زۆر پان و بەرین بوون. ⁂ کابرایەکی کەڵەگەت و پان و پۆڕە.

**پان و فلچ** (نا. ل)[پان1 + و + فلچ] پێشێل، پێخوست و بە تەواوی فەوتاو لە بەر پێ. **~ بوونەوە:** لە بەر پێدا پان بوونەوە و پێشێل بوونی هەر شتێک. **~ کردنەوە:** پێشێل کردن و پان کردنەوەی شتێک بە پێ، جیق و فیق دەرێنان (بۆ گیاندار).

**پانۆکە** (نا. ل)[پان1 + ئۆک + ئە] دەزگای شەرمی ژن، قوز. ⁂ باڵلۆرەی دەبێژم/ پانۆکەت بە درێژم (کانی مرادان ل ١٧١). (هس: پانپانۆکە)

**پانە** (گیانـ.)[پان1 + ئە] جۆرێک ماسی پانە کە زۆر گەورە نابێ و پەڕەکانی بەرزگی هەندێک سوورن، پانکە.

**پانەپەڕ** (نا. ل)[پان1 + ئە + پەڕ] گەورەترین پەڕی باڵی مەل و باڵندە، شاپەڕ، شاباڵ.

**پانەوپان** (نا. ل)[پان1 + ئەو + پان1] ١ـ بە لای پانی دا. ⁂ سفرەکە پانەوپان راخە! ٢ـ (کنـ.) بە راشکاویی، بە ئاشکرایی. ⁂ پانەوپان هەموو قسەی دڵی خۆم پێکوت. & پانبەپان

**پانی** (ئا.) بڕ: پاژنە

**پانیە** (ئا.) بڕ: پاژنە

**پانیەدرێژە** (گیانـ.)[پانیـە + درێژ + ئە] مەلێکە: ١٧.٥ سانتیمێترە. کلک و لاقی لە ـ هاورەگەزەکانی ـ دیکەی درێژترە. پشتی قاوەییە و خەتی پانی ئامالّ رەشی پێداکشاون. سینگی زەردی کالّە و پڕە لە خەت و خالّی وردی بلاّو. لە جێگای برۆ و لە سەر لاجانگی خەتی مەیلەوسپی پێداهاتوە. لاق و هەروەها نینۆکی پشتەوەی درێژە (هۆی ناو نان). لە مێرگ و چیمەنی شەدار، گۆل و مەرەزەجاڕان دەبینرێ (فەرهەنگی بالّندە ل ١٠) Anthus novaeseelandiae ناوی لاتینی ئەم مەلەیە.

**پانیی** (حم.)[پان1 + ئیی] بڕ: پانایی

**پانێـر** (گیانـ.)[پا (پار1) + نێر] ١ـ [لۆر: پارینە. باک: پارۆنەک ـ ناو: پارێن، پارێنە ـ هەو: پارێنە] گوێرەکەی دوو سالّەی نێر، گوێلپار، پارگوێر، پارگوێک. ٢ـ (مجـ.) مرۆڤی بێ ئاقلّ و بێ ئەدەب.

**تێبینی:** هەر چەند پانێر بە دوو بەشی پار و نێر نووسراوە بەلاّم بۆی هەیە کە شێوەی شێواوی پارێن بووبێ وەک: سەنیر و سەرین، خیز و زیخ، کشپەلّ و پشکەلّ.

**پاوان** (نا. ل)[پا (لە: پایین) + وان] لەوەرگە و مێرگ و مەزرای قەدەغە کراو و تایبەت دراو بە خۆ و بە مەڕ و مالاّتی خۆ، پاوە، پاوەند. ٢ـ (مجـ.) قەدەغە. **~ بوون:** قەدەغە بوون. **~ کردن:** قەدەغە کردن.

**پاوانە** (نا. ل)[پا1 + وانە] ١ـ لیزگە مووروویەک کە ژنان سازی دەکەن و لە قولەپێی دەکەن. ٢ـ خشلّێکی زێوە ژن لە قولە پێی دەکەن. & پاموورە، پێموورە، خڕخالّ، پاوەن، پاوەنە.

**پا و پووز** (نا. ل)[پا1 + و + پووز] لە ئەژنۆ بەرەوخوارەوە، داو و دەلینگ.

**پا و پل** (نا. ل)[پا1 + و + پل] لە ئەژنۆوە بەرەو ژێر، قاچ و قول. ٢ـ (کنـ.) هێز و گوڕ، توانایی.

**پاوشا** (نا.)[ئەر] بڕ: پادشا

**پاوشک** (ئان. ل)[پا1 + وشک][ئەر] کەسێک کە پێوقەدەمی خێر نەبێ، پێوقەدەم رەش.

**پاوە** (نا. ل)[پا (لە: پایین) + وە (وان)] بڕ: پاوان

**پاوەرە** (نا. ل)[پا1 + وەر + ئە][هەو] بڕ: پابەرە

**پاوەرێ** (نا. ل)[پا1 + وەر + ئێ]

[هەو] بڕ: پابەرە

**پاوەمـــــانگ** (ئان. ل)[پا1 + وە + مانگ] ژنی زگ پڕ کە دواین مانگییەتی و زانی نزیکە بۆتەوە.

**پـاوەن** (نـا. ل)[پـا1 + وەن1][ئـەر] شــریت یا زنجــیــرێک کــە پێی ولاغی بەرزەی پێــدەبەســتنەوە هەتا لە کــاتی لەوەڕ دوور نەکـەوتێـەوە، پابەند، پێوەند، پاوەند، پاوەنە. ٢ـ بڕ: پاوانە

**پـاوەنـد**[1] (نـا. ل)[پـا1 + وەنـد] بـڕ: پاوەن

**پاوەند**[2] (نا. ل)[پا (لە: پایین) + وەن (وان) + د] بڕ: پاوان

**پـاوەنـە** (نـا. ل)[پـا1 + وەن1 + ئـە][ئەر] ١ـ بڕ: پاوەن. ٢ـ بڕ: پاوانە

**پاوەوە** (نا. ل)[پا1 + وەوە][هەو] بڕ: پێخەسوو

**پـاوەوی** (نـا. ل)[پـا1 + وەوی][ئـەر] بڕ: پێخەسوو

**پاوەیـوە** (نـا. ل)[پا1 + وەیوە][هـەو] بڕ: پێخەسوو

**پاهلیوان** (ئان.)[زا] بڕ: پاڵەوان

**پاهن** (ئان.)[زا] بڕ: پان

**پائەوشـــار** (نا. ل)[پا1 + ئەوشـــار] [ئەر] بڕ: پاگیرە

**پایان** (نا. ل)[پا1 + ی + ئان] ئاخـر، دوایی، ئاکام. (هس: پایین1)

**پایتـــەخت** (نا. ل)[پای + تەخت] بڕ: پاتەخت

**پایز** (نـا.)[پاز: پـادێز ـ پەه: پـاتێـــز، پاتێـژ. تات: پائیـز ـ فـار: پاییـز ـ گـیل: پەئیـز. باک: پاییـز، پایز، پـەهیـز ـ ناو: پـایز، پاییـــز ـ هەو: پـایز ـ زا: پـائیـــژ، پاییـز] ١ـ وەرزی سـێـهـەمی سـاڵ دوای هـاوین و پێش زســـتــــان، (رەزبەر ـ گــەڵاڕێزان ـ ســەرمــاوەز). ٢ـ (مــجـ.) سەردەمی پیری. ⁂ پیرییە پایزی وەرزی ژیانە/ وردە هـەنگاوی بەرەو گــۆڕ نانـە (بۆ کوردستان ل ٢٦٤). || **پایزی پیریی:** (کنـ.) سەردەمی پیریی، پایزی عومر. ⁂ شـــەوی بەهـاری جـــوانی خـــەوێ بـوو پڕ تەشویر/ لە فەجری پایزی پیریی بەیانی دا تەعـبـیـر (نالی ل ٢٠٤) بەهـارێ بوو جەوانی، بوو بە سوخرەی پایزی پیریی/ بە سەر چوو باغ و باقی مـاوەوەی مشتێ چڵ و چێـوە (مـــەحـــوی ل ٢٩١). **پایزی زێڕین (زێڕین):** (کنـ.) سـەرەتـای پایز کـە گەڵاکـان رەنگاوڕەنگن و هێشـتـا زەرد و

ویشک نەبوون. **پایزی عــومــر:** (کنـ.) سەردەمی پیریی.

**پایزە** (نا. ل)[پایز + ئە] ١ـ چاندنی دەغڵ و دان لـە پـایـز دا. ٢ـ هـەر بـەر و مـیـوەیەک لە پایز دا پێبگا. ٣ـ جـۆرێک ترێی دەنک زلە کـە لە پایز دا دەگـا. ٤ـ شـێـعـرێک کـە بە پایز هەڵکوترابێ. ٥ـ یەکێک لە مەقامـەکانی فۆلکلۆری کوردیی کە پتر لە سەر راو و ئەویـنداری دەدوێ.

**پایزەبرا** (نا. ل)[پایز + ئە + برا] ١ـ دۆست و ئـاواڵێک کــە تەنیــا لـە کــاتی فەرعانە و حاسڵات دا سەر بدا. ٢ـ ئاغا یا هەر کەسێکی دیکە کە لە کاتی گەنم سوور کردنەوە، بەشێک لـە گەنم دەبا. ٣ـ (کنـ.) ملۆزم، ئافەت.

**پایزەرێز** (ئان. ل)[پایـز + ئـە + رێز (رژان)] گـیـا و بەر و حـاسـڵاتێک کـە شــەخــتــە لێــیــدابێ، ســەرمــابردوو، شەختەلێدراو.

**پـایـزەهـەوار** (نـا. ل)[پـایـز + ئـە + هـەوار] ئاخـــر و ئۆخـــری هەوار کـــە دەکــەوێتــە پایز و وردەوردە هـەوار چۆڵ دەکـەن و دەگـەرێنەوە. ⁂ دەڵێم کـورینە هەر کـەسـانێکی نازداری منی نـەدیوە/ ئـەگــــــــەر دەهــات و رادەبـرد لـە بـۆ پایزەهەواری/ ئەوە حاجی دەگێڕانەوە لە رێی حیجـازێ/ سـۆفی بەرماڵ بە شـانی دەگێڕانەوە لە نوێژێ (پایزە ل ٦٢).

**پـایـزیـی** (ئـان. ل)[پـایـز + ئـی] ١ـ هەرچی کە پێوەندی بە پایزەوە هەبێ. ⁂ مــیــوەی پایزیی، گــوڵی پایزیی، جلی پایزیی. ٢ـ جـۆرێک هەرمێ. ٣ـ جـۆرێک هەنجیر.

**پایە** (نـا.)[پەهـ: پـادەک، پـایـەک] ١ـ بنـەڕەتی خـانـوو و شــوێنی ســازکـراو، بناغـە، بنچـینە. ٢ـ بنـەڕەت و ئەسـاسـی هەرشـتێک. ٣ـ ئەسـتوونی ساز کراو لە سـمـیت و بێـتـۆن. ٤ـ پێـچکەی مـیـز و کـورسـی یا هـەر ئـامـرازێک کـە پێـچکەی هەبێ. ٥ـ (مـجـ.) پلە و مــقــام لە نێــو کـۆمـەڵ دا. ٦ـ (مـجـ.) بنـاغـە و قـەوەی زانــســت و دەرس. ٧ـ ئـەو ئـەنــدازە لـە لەشی مـرۆڤ کـە لە نێـو ئاو دا دەتوانی پێی بروا، باڵا. ~ **برین:** ئاوی زۆر کە باڵای مرۆڤ دادەپۆشێ، کـەوتنە بن ئاو. ⁂ ئەو چۆمـــــە قـــــووڵە ناتوانی لێی بپەڕێیەوە پایەت دەبڕێ.

**پایەبڵند** (ئان. ل)[پایە + بڵند] بڕ: پایەبەرز

**پایەبڵندیی** (حم.)[پایەبڵند + ئیی]

بڕ: پایەبەرزیی

**پـایـەبـەرز** (ئـان. ل)[پـایـە + بـەرز] کەسێک کە پلە و پایەی کۆمـەڵایەتی لە سـەرە، پایەبڵند. **~ بوون:** پلەی بەرز هەبوون و خـاوەن کـەسـایـەتی بوو لە کـۆمـەڵگا دا. **~ کـردن:** پلە و پایەی کەسێک بردنە سەر، بەرز کردنەوەی پلە و رادەی کەسێک.

**پایەبەرزیی** (حم.)[پایەبەرز + ئیی] پلەی بەرزی کـۆمـەڵایەتی هەبوون، پایەبەرز بوون، پایەبڵندیی.

**پایەدار** (نا. فـا)[پایە + دار2] ١ـ خاوەن پلە و پایە. ٢ـ بەرقەرار، هەرمان. **~ بوون:** بەرقـەرار بوون، هەمـیـشـە مانەوە. ؛؛ کورد و ئازەربایجانی هەردوو داوایان رەوایە/ هەر بژین و پایەدار بێ یەکیەتی ئەم دوو برایە (تاریک و روون ل ٦٤).

**پایەنداز** (نا. ل)[فـار: پای انداز] ١ـ فەرشی ژێر پێ، فەرش و مافوورەیەک کە لە پێشخانە و بەر دەرگا رایدەخەن. ٢ـ فـەرش، یا مۆکێت کە بۆ پێشـوازیی لە کەس و کەسانی رێزدار رایدەخەن هەتا بە سەری دا برۆن. ؛؛ فرسەتەن ئەرواح بشۆ وە پێشواز/ پەردەی بینایی تۆ پەی پایەنداز (مەولەوی ل ٣٦).

**پاییز** (نا.) بڕ: پایز

**پاییـــزیی** (ئان. ل)[پایز + ئی] ١ـ هەرچی کە پێوەندی بە پایزەوە هەبێ. ٢ـ [باک] هـەر بەر و دەغڵێک لە پاییـز دا پێبگا، پایزە.

**پایین1** (ئاک. ل)[پا1 + ئین] ١ـ لای خـوارەوەی پێ، پێین. ٢ـ لای خـوارەوە، ژێر.

**پایین2** (چا. ل)[ئەو: پا. گـیل: پاسـەن، پاسـتـەن ـ فـار: پاییدن] چاوەدێریی کـردن، چاو لە شـتـێک یا کەسێک کردن و ئاگا لێبوونی.

**پت1** (وشد.) ١ـ بڕ: پتە/١. ٢ـ (ئان.) رەنگی سوور و گەشی خوێن. ؛؛ کوڵمی وەک پتی خـوێن سـوور ببـۆوە. (تەنیـا بۆ خوێن دەکوترێ). ٤ـ لێدانی رەگی خوێن، نەبز.

**پت2** (نا.)[هس: بچووک، پچ] ١ـ [زا] منداڵ، زارۆک. ٢ـ ئەندازەیەک بە قـەرا سـەری ئەنگوست. ؛؛ پتـێکم دەرمـان دەیـە. ٣ـ [بـاک] چـووک، ئـەنـدازەیـەکـی کەم، پچ.

**پتـــر** (ئان.)[پڕ + تر] لە رادە زیاد،

زۆرتر، بتر، بێتر.

**پتــــە** (وشـــد.)[پت + ئە] ١ـ بە دوو قامکی شادە و گەورە لە شتێکی چووک دان و بۆ دەرپەڕاندن یا پرووکاندنی، پت، پڵتۆک، پەلەپیتک، پەلەپیتکە، پیلکە. ٢ـ دەنگی لێدانی ئاگری چووکی وەک شەم و پڵیتەی نێو چرا و ...، پرتە. ٣ـ بۆڵە، پرتە و بۆڵە. ٤ـ زاراوەیەکی یاری مێشێن کە مانای جارێک هاویشتنی مەڕمەڕ بە قامکەکان (قامکی شادە و باڵابەرزە) دەدا. ⁂ خالید لە مێشێنێ بە دوو پتان هەموو پووڵەکەی لێبردینەوە. **بە ~ خـۆ تەکـاندن:** ١ـ لێکردنەوەی قـوڕ و تەکاندنی تۆز و خاک لە سەر جل بە پتە. ٢ـ (کنـ.) بە پۆز و ئیفادە بوون. **لە ~ دەرچوون:** ١ـ دەرپەڕینی هەڵمـــات لە دەست بێ ئامادە بوون. ٢ـ (کنـ.) لە ژێر دەست چوونە دەری کار و مەسەلەیەک بێ ئامادە بوون. ⁂ بە تەمای منداڵ ساز کردن نەبووین لە پتەمان دەرچوو!

**پتـەپت** (وشد.)[پتـە + پت] ١ـ [کرم: پێت پێت ـ ناو: پتـەپت، پرتـەپرت] دەنگی لێدانی پەیتاپەیتای ئاگری چووکەی وەک شـەم و پڵـیـتـە. ٢ـ یەک لە دوای یەک بـۆڵاندن. & پرتەپرت. **~ کـــردن:** ١ـ بەرز بوونەوەی یەک لە دوای یەکی دەنگی پرتە لە ئاگـری چووکـە. ٢ـ بـۆڵاندن. & پرتەپرت کردن.

**پتەو** (ئان.)[پەهـ: پەتۆک، پەتووک] ١ـ حاڵی هەر شتێک کە ئەستووراییی و بارستی هەبێ و لە نێو دا پڕ و قایم بێ، بتەو. ٢ـ مرۆی بە هێز و پڕ و بە خۆوە.

**پتیلە** (نا.) بڕ: پڵیتە

**پچ** (ئاک)[هس: پت][باک] رادەیەکی کەم، پت. ⁂ پچەک (کەمێک)

**پچ پچ** (وشـــد.)[پچ + پچ][زا] بڕ: پچەپچ

**پچڕان** (چا. ل)[لە: پچڕین] ١ـ دڕان و پسانی و لەبەر یەک چوونی هەودا و هەر شتێکی پێکەوە نووساو، پرچیان. ٢ـ (مـجـ.) لە بەر یەک چوون و شـەکـەت بوونی یەکجار زۆر. ⁂ پچڕام هێندەم کار کرد.

**پچڕاندن** (چا. م)[لە: پچڕان] ١ـ لەبەر یەک بردن و دڕاندن و پساندنی شتێکی پێکەوە نووساو، پرچانن. ٢ـ پڕ پێدادان بە شتێک و بە زۆر وەرگرتنی لە دەست کەسێکی دیکە. ٣ـ (مجـ.) شەکەت کردن و زۆر کار بە کەسێک کردن. ٤ـ زۆریی بۆ هێنان و لەبەر یەک ترازاندنی شتێک.

**پچـڕین** (چا. م)[؟] ١ـ پڕ بە شـتـێک دادان و بە زۆر لە دەست دەرکێشـان. ٢ـ لێک هـەڵوەشـان و لێک ترازانی شـتـێکی پێکەوە نووساو.

**پچکۆلانە** (ئان. ل)[پچ + ک + ئۆل + ئانە] بڕ: پچکۆڵە

**پچکۆڵانە** (ئان. ل)[پچ + ک + ئۆڵ + ئانە] بڕ: پچکۆڵە

**پچکۆلە** (ئان. ل)[پچ + ک + ئۆلە] بڕ: پچکۆڵە

**پچکۆڵە** (ئان. ل)[پچ + ک + ئۆڵە] ١ـ منداڵ، کـەم تـەمـەن. ٢ـ چکۆڵە، بچکۆڵە، چووک. & پچکۆڵانە، پچکۆلانە، پچکۆلە.

**پچـــــووک** (ئان. ل)[پچ + ئووک] ١ـ بچـووک، چووک. ٢ـ کـەم تەمـەن، منداڵ. ٣ـ هـەرچێک لـە باری ئەندازەوە گـــەورە نەبێ. ٤ـ (مجـ.) نۆکەر، غوڵام.

**پچـووکـیی** (حم.)[پچـووک + ئیی] ١ـ چووک بوون. ٢ـ منداڵەتیی، سـاوایەتیی. ٣ـ نۆکەریی، خزمەتکاریی.

**پچە** (وشد.)[ئەر] چپە، چفە، سرتە.

**پچە پچ** (وشد.)[پچە + پچ][باک: پس پس، پستـە پست ـ ناو: پچەپچ، چپەچپ، چفـەچف ـ زا: پست پست، پچ پچ ـ هـەو: چفـەچف] دەنگی قسـە کـردنی دووکـەس بە سـەبرا وەهـا کە بە زەحمـەت ببیسرێ، چپە، سرتە، سرتەسرت.

**پخ** (وشد.)[لۆر: پێخ ـ کرم: پێخ. باک: پخ، پخک ـ ناو: پخ ـ زا: پخ] دەنگێک کـە کوتوپڕ و بە توندیی لە زار دەریدەبڕن بۆ ترسـاندن (پتـر بۆ گـاڵتـەیە و بە تایبـەت منداڵ وەک گەمە بەکاری دێنن).

**پختۆک** (نا.)[باک] بڕ: تەمۆخ

**پخک** (وشد.)[باک] بڕ: پخ

**پدوو** (ئا.) بڕ: پووک1

**پدی** (ئا.)[باک] بڕ: پووک1

**پر**[1] (نا.)[باک] بڕ: پرد

**پر**[2] (ئان.)[باک ـ زا] بڕ: پڕ

**پرپار** (گـــیـــا.)[پر + پار][باک] بڕ: پرپرە

**پرپرە** (نا. ل)[پر + پر + ئە] ١ـ (گیا.) گیـایەکی خۆڕسکە، ساقـەتی سوورە و لە سـەر زەوی پان دەبێـتـەوە، گـەڵای ورد و ئەسـتـوورە و گوڵەکـانی سپی یا زەردە و تۆوەکـــەی رەش و وردە کـــە بۆ دەرمـــان کـــەلکی لێـوەردەگـرن و بۆ خـــواردن و چێـشـتـیش دەست دەدا. Portulaca oleracea ناوی عـیلمی ئەم گـیـایەیە،

پارپار، پرپار، پمـپـار، پەڵپین، پەڵپـینە، پەلپـینە، پرپینـە، پرپێنە، پاقلینـچکانە، (عـەر: رجلة، بقلة حـمـقـاء). ٢ـ پـەرەنگی گوارە. ٣ـ پووڵەکەی ئۆیە.

**پرپینە** (گیا.)[پر + پینە] بڕ: پرپرە

**پرپێنە** (گـیـا.)[پر + پێنە][باک] بڕ: پرپرە

**پرت** (نـا.)[بڕ: پـۆرت] کـــوتێکی زۆر ورد، پارچەیەکی چووک.

**پـرتـک** (نـا. ل)[پـرت (پـۆرت) + ک] بەشـێکی زۆر ورد لە شـتـێک، زۆر ورد، پرتکە، پۆرت.

**پرتکە** (نا. ل)[پرتک + ئە] بڕ: پرتک

**پرتە** (وشـد.) ١ـ دەنگی لێدانی ئاگری چووکی وەک شـەم و پلـیـتـەی نێـو چرا، پتە. ٣ـ بۆڵە، پتە، پرتە و بۆڵە.

**پرتەپرت** (وشـــد.)[پرتـە + پرت] ١ـ دەنگی بەرەو کـــووژانـەوە و لێــــدانـی پەیتاپەیتای ئاگری چووکەی وەک شـەم و پلـیتـە. ٢ـ بۆڵەی پەیتاپەیتـا. & پتـەپت. **~ کردن:** بڕ: پتەپت کردن.

**پرتەقـاڵ** (گـیـا.) ١ـ دارێکی هـەندێک گـەورەی و جـوانە بـەرێکی خـڕی توێکڵ نارنجـی ئاوداری هـەیە، نـاوکی بەرەکـەی قـاش قاش و زەردە کـە هـەروا دەخـورێ و ئاوەکـەشـی دەگـرترێ. ئەم دارە لە هـەمـوو شـوێنێکی نیـوەگـەرم دەڕوێ و بەر دەدا، Citrus aurantium ناوی لاتیـنی ئـەم دارەیە. ٢ـ بـەری ئەم دارە. || **پرتـەقـــاڵی خـوێنی:** جـۆرێک پرتـەقاڵە لە نێـوەکـەی سـوور یا رەگی سـووری تێـدایە و چونکە شێوەی خوێن دەدا بەم ناوە کراوە.

**تێـبـــینی:** درەخـتـی ئـەم مـیـوەیـە لە ســـــەدەی شــــانـزدەهـەم لـە لایـەن پرتـەغـالیـەکـانەوە لە چـین بۆ ئـەورووپا بردراوە و لە سـەردەمـی سـەفـەوییـەکـان نەمـامـەکەی هـاتۆتە ئێـران و میـوەکەشـی هـەر بـە ناوی پرتـەغـالیـەکـان کـراوە و هـاتۆتە نێو زمانی کوردییەوە.

**پرتەقاڵی** (ئان. ل)[پرتەقاڵ + ی] لە رەنگی پرتەقاڵ، زەردی ئاماڵ سوور.

**پرتە و بۆڵە** (وشد.)[پرتە + و + بۆڵە] ورتـەی نـاڕزایـەتـی، بۆڵـە. **~ کـــردن:** ناڕزایـەتی دەربـڕین لە مـــەســـەلەیـەک بە بۆڵە.

**پرچ** (نا.)[لۆر: پێـرچ. باک: پرچ ـ ناو: پـرچ ـ هـەو: پـرچ ـ زا: پـرچ] ١ـ مــــووی درێژی سـەر، قژ. ٢ـ تووکی هـەندێک بەر وەک ســـەرداریی، کـاکـۆڵ. ٣ـ کـاکـۆڵ و

قـژی گـیـاندار. ‎:: ئەوە ریش و شـەدەی کـاکـە سـەیدەوانم لێـدەبۆوە بە پرچی نێـریێ بەلەکـووره (گـەنج ل ٢٩٢). ~ **برین:** هەڵپەچین و تاشینی تووکی سەری ئافرەتێک کە کارێکی بێناموسی کردبێ بە نیـشـانەی سـووک کـردن و ئابرِوو بردنی و ناسـاندنی بە خـەڵک. ~ **بە برین چوون:** هـەڵپـاچران و تاشـرانی تووکی سـەری ئافـرەت لەبەر داوێن پیـسـی. ئەم راوێژە زۆرتر وەک تـووک و جنێـو لە زاری دایکەوە بە کـچـەکـەی دەکـوترێ. ‎:: دەک رۆڵە پرچت بە برین چی ئەوە تۆ بۆ هێنده بێشـەرمی. ~ **سپی بوون:** (کنـ.) پیـر بوون، گەیشـتنە تەمـەنی پیـری و خـاوەن ئەزمـوون بوون. ~**ی سـپی هۆندنەوە:** (کنـ.) مـێـرد نەکردنی کچ یا مێرد نەکردنەوەی ژنێک کە مێردەکەی مردبێ یا چاوەروانـی حەز و گـراوی و خۆشـەویسـتـەکەی خـۆی لە مـاڵ دانیـشـێ. ~ **کێـشـان:** گـرتن و راکـێـشـانی تووکی سـەری ئافـرەت. || **پرچی ئایشـە و فـاتمان:** کـۆڵکەزێرینە، پەلکەزێرینە

**تێـبـینی:** ژابا ریشـەی ئەم وشـەی بردۆتـەوە سـەر پەرچـەم ـ ی تورکی (بڕ: ژابا ل ٧٦).

**پرچانن** (چا. م)[ئەر] بڕ: پچراندن

**پرچکن** (ئان. ل)[پرچ + ک + ن][باک ـ زا] بڕ: پرچن

**پـرچـن** (ئـان. ل)[پـرچ + ن][بـاک: پرچکن ـ ناو: پرچن، پرچنە ـ هەو: پرچن ـ زا: پرچن، پرچکن] کەسێک کە تووکی سەری زۆر و پڕ و درێژ بێ، پرچکن.

**پرچنە** (ئان. ل)[پرچن + ئە] بڕ: پرچن

**پرچە** (وشـد.)[ئـەر] دەنگی پـچـڕان و قرتان، قرتە.

**پرچیان** (چا. ل)[ئەر] بڕ: پچڕان

**پرخـاندن** (چا. م)[لە: پرخـە][باک: پرخاندن ـ ناو: پرخاندن] کەسی خەوتوو کە پرخەی لە گەروو دێ، کەسێک کە لە خەو دا پرخەی دێ، پرخە کردن.

**پرخن** (ئان. ل)[پرخ + ن] کەسێک کە لە خەو دا پرخەی بێ.

**پرخ و هۆڕ** (وشـد.)[پـرخ + و + هۆڕ] دەنگی پرخەی زۆر و بڵند و ناخۆش.

**پرخە** (وشد.)[باک: پرخە ـ ناو: پرخە ـ هەو: پرخە] دەنگێک کە لە کاتی نوستن لە گـەرووی هەندێک کـەس دێتـە دەر، پرخـەپرخ. ~ **کـردن:** بڕ: پرخـاندن. ~ **هـاتـن:** بـەرز بـوونـەوەی دەنـگـی

پرخە.

**پرخەپرخ** (وشد.)[پرخە + پرخ][لۆر: پێـــرخ پەرخ. باک: پرخـــەپرخ ـ ناو: پرخەپرخ ـ هەو: پرخەپرخ] پرخەی یەک لە دوای یەک، پرخەی پەیتاپەیتا. **~ کردن:** پرخاندن. **~ هاتن:** پرخاندنی پەیتاپەیتا.

**پرد** (نا.)[ئەو: پێرێتو، پێرەتو ـ پەه: پەهر، پوهل، پول. گیل: پورد ـ فار: پل ـ لۆر: پیل ـ پەش: پەر. باک: پر ـ ناو: پرد، پێڵ ـ هەو: پردی ـ زا: پرد] ١ـ ئامـرازی پەڕینەوە بەسەر جۆگە، رووبار یا دۆڵ و دەرە. ئەو ئامرازە دەتوانێ کۆتەرە دارێک بێ کە هاویشتبێیانەتە سەر جۆگە یا بینـایەک بێ لە ئاسـن و دار و بەرد لە سەر چۆم ساز بووبێ و خەڵک و ماشێن بە سەری دا هات و چۆ بکەن. ٢ـ (کنـ.) لە ژێر پـێ نانی کـــەســـێک بۆ هـەر مەبەستێک. **بوونە ~:** فیدا بوون لە ژێر پێی کەسێک دا بۆ مەبەستێک وەها کە بە سەر ئەو کەسە دا بۆ پێشەوە بازد بدا یا بە ســـەری دا تێـــپـــەڕێ. ⁂ خوداگیری من بێ رۆژ بازاڕی قیامەتێ/ ببێ بە پردم و بۆ خـــۆمی بە ســـەر دا رابرێ (گـەنج ل ٩٤). **~ هەڵبـەستن:** پرد ســـاز کـــردن. **کـــردنە ~:** بۆ پێشکەوتی خۆ کەسێک لە ژێر پێ نان. || **پردی پشت ســـەر:** (کنـ.) رێگای گـەڕانـەوە بۆ دواوە. ***پردی پشت ســـەر رووخـــاندن (تێکدان):** (کنـ.) رێگای گەڕانـەوە و پەشیـمـان بوونەوە لە کار و مەسەلەیەک نەهێشتنەوە. **پردی سیراٮ:** بڕ: پردی قیامەت. ⁂ مەیگێڕ بە سەرت پردی سـیـراتیش کـەڵەکـە/ سـەیرانی بەهەشت ســـەیری دوو چاوی بەڵەکـــە (خـەییـام ل ٦٤). **پردی قـیـامـەت:** ئەو پردەی کە لە رۆژی قیامەت بە سەری دا دەڕۆن و گـــۆیا لە مـــوو باریکتـــرە و لە ئەڵماس تیژترە، پردی سیراٮ. ***پردی قیامەت پسان:** (کنـ.) مەسەلەیەکی زۆر گرینگ قەومان. ⁂ دەستم لە تای زولفت دا بەم بالایە نەمـــزانی/ بۆچ دەمکوژی خـۆ قـوربان پردی قـیـامـەت نەپسـاوە (وفـایی ل ١٥٢). **پردی نـامـەرد:** (کنـ.) رێگا و چارەی تەنگانەی بەڵام بە هۆی نامـەرد. ⁂ ئاو بتـبـا، لە پردی نامـەرد مـــەپەڕێوە (پەند). پردی نامــــەرد زوو دەڕووخێ (امثال و حکم ل ٨١).

**تێبینی:** پرد لە ریشەی پەر ـ ی par ئەوێســـتـــایی و پەڕین و پەڕینەوە ـ ی کوردیی کەوتوە.

**پردوو** (نا.)[ئەر] بڕ: پەردوو/٢.

**پردووخیان** (چا. ل)[ئەر] بڕ: پڕووزان

**پردەباز** (نا. ل)[پرد + ئە + باز2] چەند بەردێک لە جۆگە و چۆمی کەم ئاو کە سەریان بە دەرەوەیە و خەڵک بە سەریان دا باز دەدەن و دەپەڕێنەوە، بەردەباز، بەردەواز، پێباز، پێواز.

**پردەڵە** (نا. ل)[پرد + ئەڵە] ١ـ پردی بچووک. ٢ـ چەن دارێکە لە سەر (خەردار)ی ئاش رایەڵ ئەکرێن و بەرداشیان لە سەر دائەنرێ. (خاڵ ب ١ ل ٢١٠). ٣ـ دارێکی درێژە لە سەر دوو سنگ دائەکوترێ لە نێوانی (سۆڵە) و (نەوەرد) دا بۆ ئەوەی رایەڵی جۆڵای رابگرێت، جۆڵایێکەی لار و خوار نەبێت (کشت و کاڵ ب ١ ل ٦١). [رایەڵ بە نێوان ددانەکانی شێ دا دەڕوا، لە هەر چوار گورد دەگوزەرێ و دەچێتە سەر پردەڵە، لەوێشرا دەڕواتە ژێر مۆلەقە و هەڵدەکشێتەوە بۆ بەری میچ. ئەم سەر و ژێر پێکردنە دەبێتە هۆی سفت بوونی رایەڵ و جۆلانە نەکردنی بە هەواوە (گۆڤاری هاوار ژمارەی هەشت ل ٢٩)]

**پردەوان** (نا. ل)[پرد + ئە + وان] کەسێک کە ئاگاداری پردە. ⁘ ئەو چۆل و بیابانە کابرایەکی لێبوو، لێیان پرسی: چکارەی؟ کوتی پردەوانم، ئی وا هەیە شتێکم دەداتێ و ئی وا هەیە نامداتێ، ئاگام لەو پردە دەبێ. (شۆڕ مەحموود ل ٧٨).

**پردەوانیی** (حم.)[پردەوان + ئیی] کار و پیشەی کەسی پردەوان.

**پردی** (نا.)[هەو] بڕ: پرد

**پرزانگ** (نا. ل)[پرز (پز) + ئان (دان) + گ] بڕ: پزدان/١

**پرزک** (نا.)[باک] بڕ: بزرک

**پرزۆڵ** (نا. ل)[پرزە + ئۆڵ] پارچە و کوتی بچووک کە شتێک جیا بووبێتەوە، پرزۆڵە. || **پرزۆڵ پرزۆڵ**: لەت و کوت، ورد و خاش، زۆر ورد. **~ بوون**: پارچەپارچە بوون، وردوخاش بوون. **~ کردن**: وردورد کردن، وردوخاش کردن، لەت و پەت کردن.

**پرزۆڵە** (نا. ل)[پرزۆڵ + ئە] بڕ: پرزۆڵ.

**پرزە** (نا.)[؟] ١ـ بەش، ماف. ٢ـ هێز، تاقەت، توانایی. ٣ـ پووشی باریک و تیژی گیا. **~ بران**: بەش خوران، بێبەش بوون. **~ برین**: ماف خواردن، بێ بەش کردن. ٢ـ بێ تاقەت کردن، هێز

برین. ⁂ ئەیانکوت کـــورد راپەڕیوە/ پرزەی حوکماتی بریوە (بۆ کوردستان ل ١٥٩). ~ **چنین:** هێـز لێبـڕین، پرزە لێبـڕین. ⁂ رۆژ دێ مانگ هەڵدەوێژنێ/ مـانگ پرزەی ساڵێ دەچنێ (هێـدی ل ٣٢٠). ~ **لێبـڕین:** بەش لێـخـواردن، ماف خواردن. ٢ـ هێز لێبڕین. ⁂ منیش زۆرداری پرزەی لێـــبـــڕیوم/ منیش بەدکـاری بواری لێ تەنیـوم (تاریک و روون ل ١١٤).

**پرس** (نا.)[لە: پرسـین][باک: پرس ـ نـاو: پـرس ـ هـەو: پـەرس ـ زا: پـارس، پەرس] ١ـ پرســیـار، ســوال. ٢ـ (ر.) ریشــەی چاوگی پرسین. ٣ـ (نا. فـا) لە وشەی لێکدراوە دا بە مانای پرسیارکەر دێ. ٤ـ مەسـەلە. ~ **پێکردن:** مشـوور لێخواستن، پرسین. ~ **کردن:** پرسین، پرسـیـار کـردن. ~ **هەڵێنان:** وڵامی مەسەلە و گرێ و گرفتێک دانەوە، ڕێی چارە نیشان دان.

**پرسا** (ئان. ل)[پرس + ئا] ١ـ کەسێک کە پرسیار دەکا، پرسکەر. ٢ـ کەسێک کە لە مەسەلە و شت زۆر دەکۆڵێتەوە و زۆر دەپرسێ، وردکـۆڵ، کـونجکاو. ⁂ پرسا بە و زانا بە (پەند)

**پرسانە** (نا. ل)[پرس + ئانە] کەرەسە و شـــمـــەک و پێـــداویســـتی پرســـە و ســـەرەخـــۆشی کـــە تازیەداران دەگـەڵ خۆیان دەیبەن و دەیدەن بە خاوەن تازیە، زاریانە.

**پرســـایی** (حم.)[پرســـا + یی] ورد لێکۆڵینەوە، کـــاری کـــەسی پرســـا، وردکۆڵیی، کونجکاویی.

**پرسـکەر** (ئان. ل)[پرس + کـــــەر] کەسێک کە پرسیار مەسەلە یا کەسێک بکا.

**پرسنامـە** (نا. ل)[پرس + نامـە] پەڕە کاغەزێکە کە لە یانە و هەندێک شوێنی دیکە بۆ خۆ ناساندنی کەسێک پرسیاری لێ نووسراوە و دەبێ وڵام درێتەوە.

**پرسە** (نا. ل)[پرس + ئە][لۆر: پۆرس ـ کـــــرم: پـۆرسێ] کـــــۆڕی تازیە و سەرەخۆشی کە بۆ خزم و کەسی مردوو دایدەنێن و خەڵک دێن و سـەرەخۆشیـان لێـــدەکـــەن. ~ **دانان:** پێک هێنانی سەرەخۆشی، سەرەخۆشی دانان.

**پرسـەگـورگـانە** (نا. ل)[پرس + ئە + گورگ + ئانە] پرسـیار کردن و مشـوور خواستنێکی رواڵەتی لە رووی تەعاروف و ناچاریی لە کـــەســـێک و بە قـــســـە

نەکردنی، پرسەکورگانێ.

**پرسەگورگانێ** (نا. ل)[پرس + ئە + گورگ + ئانێ] بڕ: پرسەگورگانە

**پرسیار** (نا. ل)[پرس + یار] بڕ: پرس. ~ **کردن:** پرسین، پرس کردن. ~ **لێکردن:** پرسین لە کەسێک، پرس کردن.

**پرسین** (چا. م)[هیک: پرەچ - ئێک: پرس، فرەس - ئەو: پەرێس، پێرێسە - پەه: پورسییتەن. فار: پرسیدن - گیل: پورسێن. باک: پرسین - ناو: پرسین - هەو: پەرسای - زا: پەرسایش، پارسایش] ١- مەبەستێک هێنانە گۆڕ بۆ وڵام، پرسیار کردن. ٢- لە ناو و نیشانی شوێنێک گەڕان. ٣- جۆیای حاڵی کەسێک بوون، بە سەر کردنەوە. ٤- مشوور لێ خواستن.

**پرسینەوە** (چا. م)[لە: پرسین] ١- وەرگرتنەوەی دەرس یا دەوری پێ کوتراو. ። سبەی مامۆستا رێزمانمان لێدەپرسێتەوە دەبێ حازری بکەین. ٢- لێپرسینەوە لە رۆژی ئاخرەت و پەسلان دا. ٣- لێپرسینەوەی حیساب و پارە دەگەڵ کەسێک. ٤- لێپرسینەوە لە کار و مەسەلەیەکی پێکوتراو یا راسپێردراو.

**پرشنگ** (نا.)[؟] ١- شۆق و تیشکی ئەو شتانەی کە دەدرەوشێنەوە، پرشە. ። پرشنگی خۆر، پرشنگی چرا. ٢- پریشکی ئاگر، ئاورینگ. ~ **دانەوە:** تیشک دانەوە ئەو شتانەی کە دەدرەوشێنەوە.

**پرشنگدار** (ئان. فا)[پرشنگ + دار2] هەرچی کە پرشنگ بداتەوە. ። بە رواڵەت چەند پرشنگدار و شیک بوو/ پێچەوانەی ئەوە دڵی تاریک بوو (گۆران ل ٤٨).

**پرشە** (نا.)[لە: پرژیان][ئەر] ١- بڕ: پریشک. ٢- بڕ: پرشنگ. ٣- ورشە، گرشە.

**پرشەپرش** (نا. ل)[پرشە + پرش] پرشەی پەیتاپەیتا، ورشەورش.

**پرگ** (نا.)[هس: پۆرگ] ١- برش، برشوو، کەڕوو، پیرک. ٢- پەڵەی زەوی یا دەغڵ و دان. ٣- گەلەی حەیوان و ئاژەڵ (کشت و کاڵ ب ١ ل ٦١)، کەرکە. ٤- [باک] پۆرگ، بڵق. ~ **هەڵێنان:** برش هەڵێنان، کەڕوو هێنان ። ترخێنە تا بمێنێتەوە، پرگ هەڵ ئەهێنێ (پەند ل ١٥٢).

**پرگە** (نا. ل)[پرگ + ئە] ١- (گیانـ.)

گەرای کولله و کرم و مێروو. ٢ـ خاکێک کــه بـه ســـەر بـەفــری دادەکـــەن هەتا بتوێتەوە (مەردووخ ب ١ ل ٢٨٣)، پەرگە.

**پرمێشک** (گیا.) بڕ: پەرمێشک

**پرواندن** (چا. م)[؟] ١ـ هـەڵوەرانـدن و تکاندنی شتی رەق بە نینۆک و پەنجە. ⁘ قـوڕی ســەر شـاڵوارەکـەت بپـروێنە! ٢ـ لێکردنەوە و وەرانـدنـی گـــوڵ و توێکڵـی دانەوێڵە بە دەست. & پروانن.

**پروانن** (چا. م) بڕ: پرواندن

**پرۆپاگەندە** (نا.)[فەر: propagande] راگەیانـدە و تەبلیغ بۆ لایەنگریی لە بڕوا، کەس یا مەسەلەیەک، تەبلیغات.

**پرۆتۆپلاسم** (نا.)[فەر: protoplasme لە یون: protos+ plasma] مـــادەیەکــە وەک سـپێنـەی هێلکە لە نێـو خـانەکـانی گـیـانداران و گـیـایەکـان دا کـە لە دوو بەشی سیتۆپلاسم و ناوک پێکهاتوە.

**پرۆتۆن** (نـا.)[فـــەر: proton لە یـون: protos (یەکـەم)] بـەشـی ناوەندیـی ئەتۆم کـە پێکەوە دەگـەڵ نۆترۆن ناوکی ئـەتۆم پێکدێنن

**پرۆژۆکـتـۆر** (نا.)[ئین: projecttor لە لات: projectus] ئامـرازێکـی بەرقـیـە بۆ پێک هێنانـی رووناکی زۆر بە تـایبــەت لە ســتـۆدیـۆ و شـوێنـی کـەم نـوور بۆ فـیـلم هەڵگرتنەوە.

**پرۆژە** (نا.)[فـەر: projet لە لات: pro-jectus] نەقـشــە و پلانێکی داڕێژراو بۆ کار لە سەر کردن.

**پرۆســتـــات** (نا.)[فـــەر: prostate] جـووتێـک لووی چووکن بە قـەرا بادام کە لە ســـەرەتای رێگای مــیــزی ســیـــرەت هەڵکەوتوون و تایبـەتی گیـانداری نێرینە و پیـاوە و دەڵاوێکی سپی و لیچقی هەیە کـە یەکـێک لە پێکێنەرەکـانی شـاوەتە و دەگەڵ سپەرم دێتە دەرێ.

**پرۆگرام** (نا.)[یون: programma] بڕ: بەرنامە.

**پرووسک**[1] (نا.)[ئەر] بڕ: پریشک/٢

**پرووسک**[2] (نا.)[؟] ئەم وشەیە دەگەڵ وشەی ئێسک دێ و مانای ئێسکی لەشی گیانداری مردوو دەدا.

**پرووسکە** (نا.)[ئەر] بڕ: پریشک/٢

**پرووش**[1] (ئان.)[؟] ١ـ چاوی کـــــەم حــوکم و کــەم ســۆمـــا. ٢ـ چاوی نیــوە قووچاو کە لە شتێک خورد بێتەوە.

**پرووش**[2] (نـا.)[؟] تلّــتـــە ترێ دوای

سـرکـە لێگرتن کـە هەرمـێ کـرووزی و گرکە و شـتی دیکەی تێدەخـەن بۆ ترش بوون. (هس: ئارمووش2)

**پرووشـــــە** (نا. ل)[پـرووش + ئـە] بەفرێکی زۆر کەم و بلاو کە بە حاڵ ولات سـپی دەکا، برۆێشـە، برۆشـە، پرووکـە، تووکـە. ~ **کـردن:** بارینی پرووشـە، داکردنی پرووشە.

**پرووشـەپرووش** (نا. ل)[پرووشـە + پرووش] وردورد هـاتنە خـواری بەفـر لە ئاسـمـانەوە، پرووشـە، پرووکـەپرووک، تووکـــەتووک. ~ **کـــردن:** بـارینی پرووشـــــە، داکـــــردنی پرووشـــــــە، پرووکەپرووک کردن.

**پرووکە** (نا.)[ئەر] ١ـ برِ: پرووشە. ٢ـ نووکە، فینگە.

**پرووکــەپرووک** (نا. ل)[پرووکـــە + پرووک][ئەر] ١ـ برِ: پرووشـەپرووش. ٢ـ لەبەر خــۆ گــریان، نـووکــەنووک. ~ **کـردن:** ١ـ بارینی پرووشـــە، داکـــردنی پرووشە. ٢ـ نووکەنووک کردن.

**پریاسکە** (نا.) برِ: پرێسکە

**پریسک** (نا.)[ئەر] برِ: پریشک/٢

**پریکە** (وشـد.)[هـەو] دەنگی پێکەنین، تریقـــە، تریکە. ⁂ چریکەی ســـرِنا و پریکەی خـــەندە/ پەشـــێـــویی زوڵفـــان ریشەی دڵ کەندە (مەولەوی ل ٣٩٢).

**پـرێـسـکـە** (نـا.)[نـاو: پـرێـسـکـە، پـریـاسـکـە، پـیـــــــــارزگ] پـارچـە و دەسرۆکەیەک کە بۆ تێشـوو و بار تێوە پێـچانی چووک کەلکی لێوەردەگـرن. || **پرێسکەی دڵ:** دڵی بـە غـــەم، دڵێک کـــە غـــــەمی تێـــــدا بێ. * **پرێسکەی دڵ کـــردنەوە:** دەردی دڵ هـەڵرِشـتن، باسـی غەمی خۆ لە لای کەسێک کردن.

**تێبـــینی:** پێـرێسکا pərəskā لە ئەوێستا دا بە مـانای نرخ و بایخ هـاتوە. بارتۆلۆمە (ل ٨٩٦) هاوتا پەهلەوییەکەی بە بەریشن هێناوەتەوە کە خۆی لە رەگی بردن کەوتوە و بە مـانای بردن، یارمـەتی و نـرخ و بـایـەخ هـاتـوە. بەو پێـــــودانـە پرێسکە دەبێتە بارێکی بە نرخ. هەروەها هـاوریشـــە و هـاومـــانـای ئـەم وشـــەیـە لـە فـــارسـی دا پـیـــرزە (پـەیەرزە) و پـدرزە (پەدەرزە)یە.

**پرێزە** (نا.)[باک] برِ: پەرێز

**پـرِ**[1] (ئـان.)[هـیـک: پـوورنـە ـ ئـەو: پێـــرێنـە، پـەئورو، پـۆئـورو، پەرو ـ هـەخ: پەرو ـ پـەه: پور، پورر. گـیل: پور ـ فـار:

پـر ـ لۆر: پـۆر. باک: پـر ـ نـاو: پـر ـ هـەو: پەڕ ـ زا: پر، پڕ] ١ـ دەفر یا شـتێکی نێو بۆش کـە هـەتا سـەر شـتـێکی دیکەی تێکراوە، لێـوڕێژ، لیـپـاولیپ، تژی، تژە، تـەژی، کـــــەیـل. // بـەتاڵ، بـۆش ⁂ جـەواڵەکە هـێند پڕە چی دیکە نابا. پڕی قـاپێکم ئاو بۆ بێنە. ٢ـ بە تـاقـەت، بە هێز. ٣ـ زۆر، فرە. // کەم. ⁂ پڕ ڕەنگ. ٤ـ (مـجـ.) زانا، زۆرزان. ٥ـ حـاڵی هەر شـتـێکی کـە زۆر لە یەک نزیک بن. // تەنک. ⁂ گـەنمـەکـەت پڕ داچاندوە. ئەو گۆرەوییە زۆر پڕ چندراوە. ٦ـ پێشگرە بە مـانای زۆر. ⁂ پڕکـار، پڕ هونـەر، پڕوێژ، پڕخـــۆر. ٧ـ ئـەندازەیـەکی تـەواو. ⁂ ئەو کـراسـە پڕ بە بەرتە. کـەوشـەکـە پڕ بە پێمە. **~ بوون:** ١ـ دەفر یا بۆشاییەک کە شتی تێکرابێ و گەیشتبێتـە حاڵی لێـــوڕێژ بوون وەها کـــەچی دیکەی جێ نەبێتـەوە. ⁂ جـەواڵ پڕ بوون، حـەوز پڕ بوون. ٢ـ زۆر هـەبوونی شــتــێک، زۆر بوون. ⁂ ئەو دەشتـە پڕە لە کارگ. شـار پڕ لـە دوکـان و بازاڕە. ٣ـ تێگەیشــتنی زۆر، زۆر زانـا بـوون. ⁂ کـــــابرایەکی یەکجارڕ پڕ و تێگەیشتوویە. ٤ـ تژی بوون لـە بـاری مــــەعنەوییـــــەوە وەک ئێش، نارەحـەتی و زوڵم، خـۆشی، جـوانی و ... ⁂ دڵ پڕ بـوون. مـێـشک پڕ بوون. **~ بوونەوە:** ١ـ دەفر یا شوێنێک کە پێشتر بەتاڵ و بوە و ئێـستـا لە سـەر جـێی کراوەتەوە. ٢ـ جێ گرتنەوە، گرتنەوە. ⁂ جێی بـەتاڵی هێمن وەک شـاعیر بە کەس پڕ نـابێـتــەوە. ٣ـ تێـر بوون، چاو تێـر بوون. **~ کـردن:** تێکردن لە دەفـرێک هەتا نزیک لێـوڕێژ بوون. ٢ـ قـسـە دە گوێی کەسێک ئاخنین و شێر کردن بۆ کـارێک ئـەنجـام دان. ⁂ ئەوەندە چوونە بن حـەمـەدی هەتا پڕیان کرد و لە مـاڵ و حـــاڵیـــان کـــرد. **~ کــردنەوە:** ١ـ تێکردنەوەی دەفرێک کە جارێک یا چەند جـــــار بـەتاڵ بۆتـەوە. ٢ـ وەک خـــــۆ لێکردنـەوەی شـــوێنی هـەڵکەندراو. ⁂ قـــوڵەکـــەیان پڕ کـــردەوە. **جـێی کەسێک ~ کردنەوە:** جێی کەسێک گرتنەوە، وەک کەسێک بوون. ⁂ هەرچی کـوری دنیـایە خـۆشم دەوێ بـەڵام کـەس جـێی کوڕەکـەم پڕ ناکـاتەوە. **یەک ~ کردن و یەک قڕ کردن:** (کنـ.) زوڵم کردن و یەکسـان چاو لێنەکردن، گرینگایەتی دان بە یەکێک و سەرنج نەدان بە ئەویتر.

**پڕ**[2] (نا.) لە ڕەگی فـڕاندن دەکـەوێ و بە تەنیا نایە و دەگەڵ ئەو چاوگانە مانا دەدا. **~ پیا کردن:** بڕ: پڕ پێدا کردن.

~ **پێدادان:** شتێک یا کەسێک توند گرتن و بۆ لای خۆ کێشان، پڕ پێدا کردن، پڕ دان. ~ **پێدا کردن:** ١ـ بڕ: پڕ پێدادان.٢ـ لە نەکاو خۆ بە کەسێک دادان و دەباوەش گرتنی. & پڕ پیا کردن. ~ **دان:** بڕ: پڕ پێدادان. ⁂ کیسەبڕێک پڕی دایە کیفی ژنێک و هەڵات.

**پڕاپڕ** (ئاک. ل)[پڕ1 + ئا 14 + پڕ1] بڕ: پڕاوپڕ

**پڕاوپڕ** (ئاک. ل)[پڕ1 + ئاو2 + پڕ1] پڕ هەتا سەر، لیپاولیپ، سەرپڕ، پڕپڕ، پڕاپڕ، پڕبەپڕ. ~ **بوون:** پڕ بوون هەتا سەر و گەیشتنە حالی لێورێژ بوون. ⁂ ژینی کورتم دی پڕاوپڕ بوو لە شانازی و شەرەف/ عومری زۆرم دی کە دوایی هات بە ریسوایی و نەدەم (نالەی جودایی ل ٣٨).

**پڕبار** (ئان. ل)[پڕ1 + بار] ١ـ دار و درەختێک بەری زۆر هێنابێ، پڕبەر. ٢ـ مرۆی پڕ و زۆرزان.

**پڕبەپڕ** (ئاک. ل)[پڕ1 + بە + پڕ1] بڕ: پڕاوپڕ

**پڕبەپێست** (ئاک. ل)[پڕ1 + بە + پێست] کێپ، قالب، ئەندازە. ~ **بوون:** ١ـ جل و بەرگی قالب و ئەندازەی لەش. ٢ـ پێک خواردنەوە و بۆ بوونی هەر شتێکی دیکە بۆ شتێکی دیکە بێ کەموکووڕیی. ⁂ ئەو سزایە پڕبەپێستی ئەو تاوانەیە.

**پڕبەدڵ** (ئاک. ل)[پڕ1 + بە + دڵ] پێخۆش بوونی زۆر و لە رادە بەدەر، لە قووڵایی دڵەوە. ⁂ پڕبەدڵ پێمخۆشە ئاواڵەکانی منداڵییم ببینمەوە. پڕبەدڵ خۆشم دەوێ.

**پڕبەر** (ئان. ل)[پڕ1 + بەر1] دارێک کە بەری زۆر بێ، پڕبار.

**پڕبێژ** (نا. فا)[پڕ1 + بێژ1] کەسێک کە زۆر قسە بکا، زۆربڵە، چەنەوەڕ، چەنەباز.

**پڕپڕ** (ئاک. ل)[پڕ1 + پڕ1] ١ـ زۆرپڕ، پڕاوپڕ. ٢ـ زۆر زۆر، گەلێک. ⁂ تۆ لەوبەری رێیە من لەوبەری رێیە/ پڕپڕ لە ریشت بڕیم تا دەگاتە سەر رێیە (کانی مرادان ل ١٧٤).

**پڕپۆڵە** (نا.)[ناو: پڕپۆڵە ـ هەو: پڕپۆڵە] ١ـ ئاردی تێکەڵ کراو دەگەڵ ئاوێکی کەم وەها کە گڕمۆڵەگڕمۆڵە بێ و دەیدەن بە جووجکەی تازە لە هێلکە دەرهاتوو. ٢ـ چێشتی گزمووڵە هەویر و

کووزەڵە.

**پڕتاو** (ئان. ل)[پڕ1 + تاو] ١ـ لینگ دانی ئەسپ، هەڵینگ، غار. ⁘ شۆڕمەحموود لە پێش دا پێی لە سەر راستەی رکێفی دادەناوە/ بە بێناریَ دا دەڕۆیی، جارجار بە نەرمە و جارجار دەیخستە پڕتاوە (شۆڕمەحموود ل ٧٤). ٢ـ توند، هەشتاو. ⁘ بە پڕتاو بۆ لای چوو.

**پڕچەنە** (ئان. ل)[پڕ1 + چەنە][ئەر] زۆروێژ، زۆربڵێ، چەنەدرێژ. ~ **بوون:** زۆربڵێ بوون، زۆروێژ بوون.

**پڕچەنەیی** (حم.)[پڕچەنە + یی] کار و کردەوەی زۆربڵێ، زۆروێژیی، چەنەدرێژیی. ~ **کردن:** زۆربڵێیی کردن، زۆر لە سەر کوتن، چەنەدرێژیی کردن.

**پڕچین** (ئان. ل)[پڕ1 + چین] حاڵی هەر شتێک کە چینی زۆر بێ، چین لە سەر چین.

**پڕدڵ** (ئان. ل)[پڕ1 + دڵ] بوێر، دلێر، نەترس، بەجەرگ. ~ **بوون:** نەترسان، بەجەرگ بوون.

**پڕروو** (ئان. ل)[پڕ + روو] کەسی بێشەرم و روو لە پێشەوە، روودار. // کەمڕوو. ~ **بوون:** بێشەرم بوون، روو لە پێشەوە بوون. ~ **کردن:** بێشەرم بارهێنان.

**پڕروویی** (حم.)[پڕروو + یی] کاری کەسی پڕروو، بێشەرمی. ~ **کردن:** بێشەرمی کردن

**پڕرەنگ** (ئان. ل)[پڕ + رەنگ] هەرچی کە رەنگی زۆر بێ، تۆخ.

**پڕژ** (نا.)[باک: پژ ـ ناو: پرژ، پرش، پەرش، پەرش، پەخش] شتی بە کۆمەڵی لێک بڵاو، ئاخمە، بڵاو، پرژ و بڵاو.

**تێبینی:** پرژ و هاوتاکانی لە ریشەی بەش کەوتوون. (بڕ: بەش1)

**پڕژان** (چا. ل)[لە: پرژ][ناو: پرژان، پژیان] ١ـ لێک بڵاو بوونەوەی و رژانی شتی ورد و بە کۆمەڵ لە یەک. ٢ـ بڵاو بوونەوەی ئاو بە دڵۆپ و بە تێکڕایی. **پڕژانە سەر:** وەخت کردن، کات هەبوون. ⁘ لەبەر کاروباری دەرەوە ناپرژێمە سەر ئەوەی لە ماڵێ نان بخۆم.

**پڕژاندن** (چا. م)[لە: پرژان] ١ـ بڵاو کردنەوەی شتی وردە بە سەر زەوی و دەوروبەر دا. ⁘ تۆو پرژاندن. ٢ـ بڵاو کردنەوەی ئاو و ئاوەکی بە کۆمەڵە دڵۆپ.

**پرژوبڵاو** (ئان. ل)[پرژ + و + بڵاو] حاڵی هەر شتێکی وردی بە کۆمەڵ لێک بڵاو، پرش و بڵاو، پەرش و بڵاو، پژبەلاڤ، پەرش و بڵاو، پەرت و بڵاو. **~ بوون:** لێک پرژان و بڵاو بوونەوەی بە کۆمەڵی شتێک، پەرش و بڵاو بوون، پەرت و بڵاو بوون. **~ کردن:** بڵاو کردنەوەی بە کۆمەڵی شتێک لە یەکتر، پەرش و بڵاو کردن، پەرت و بڵاو کردن.

**پرژە** (نا.)[لە: پرژان] پریشکی ئاو، پژە، پرشە.

**پرسۆز** (ئان. ل)[پر1 + سۆز] زۆر بە سۆز.

**پرش** (نا.) بڕ: پرژ

**پرش و بڵاو** (ئان. ل)[پرش + و + بڵاو] بڕ: پرژوبڵاو

**پرکار** (ئان. ل)[پر1 + کار] کەسێک کە کاری زۆرە و زۆر کار دەکا. // کەمکار. **~ بوون:** ١ـ کار زۆر هەبوون. ٢ـ کار زۆر کردن.

**پرکاریی** (حم.)[پرکار + ئیی] ئاکامی پرکار بوون. // کەمکاریی.

**پرگۆشت** (ئان. ل)[پر1 + گۆشت] ١ـ گیانداری قەڵەو و گۆشتن. ٢ـ میوەی ئاودار و گۆشتن.

**پرماندن** (چا. م)[لە: پرمە] پرمە کردنی ئەسپ، دەنگ لە لووت هێنانە دەری یەکسم، پیراندن، پیرانن.

**پرموهوور** (وشد.)[پرم + و + هوور] پرمە و گریان بە دەنگی بەرزەوە، پرمەپرمی زۆر.

**پرمە** (وشد.) ١ـ دەنگی لووتی یەکسم، کورمە، پیرە. ٢ـ دەنگی گریانی لە نەکاو. & پڵمە. || **پرمەی گریان:** گریانی لە نەکاو وەها کە دەنگ لە زار دەرپەڕێ. * **لە پرمەی گریانێ دان:** لە پڕ دەست بە گریان کردن.

**پرمەپرم** (وشد.)[پرمە + پرم] دەنگی پەیتاپەیتای لووتی ئەسپ، پرمەی یەک لە دوای یەک، کورمەکورم، پیرەپیر، پڵمەپڵم.

**پرمێشک** (ئان. ل)[پر1 + مێشک] کەسێک کە مێشکی پڕ بێ، تێگەیشتوو، زانا

**پرنۆڵ** (نا. ل)[؟] کوتێک پارچەی شڕ، تیتۆڵ، بزگوڕ.

**پڕ و پووچ** (نا. ل)[پڕ + و + پووچ] ١ـ

قسه و كردەوەی بێ بنەڕەت و باتڵ و بێ مــانا، هیچ و پووچ. ٢ـ بیر و باوەڕی نازانستیی و دوور لە ئەقڵ، خورافە. ⁂ کەم کیژی کورد هەیە بڕوای بە پڕ و پووچ نەبووبێ و پەنای بۆ پڕ و پیرێژنان نەبردبێ (دمدم ل ٩).

**پڕ و پیــــرێژن** (نا. ل)[پڕ + و + پیرێژن] ئەو ژنانەی کە پیرن. ⁂ ئەنگۆ بەقا مەکەن بەوان پڕ و پیرێژنی دە زەمانەی/ چەندی لە من بە دۆلاب و بە فڕ و فێڵن (پایزە ل ٤٤).

**پڕووز** (نا.)[ناو: پڕووز ـ هەو: پڕووز] چلۆنایەتی هەڵقرچان و سووتانی تووک و موو و خوری و شتی لەم بابەتە، کڕووز.

**تێبــینی:** پڕووز [پ + رووز (رۆژ)] هاوڕیشەیە دەگەڵ ئەفرۆچ afroč و ئەفرۆز afroz ـ ی پەهلەویی و فروز (فرووز) و افروز (ئەفرووز) ـ ی فارسی بە مانای شۆق و ڕووناک و درەوشاوە.

**پڕووزان** (چا. ل)[لە: پڕووز][ناو: پڕووزان، پڕووزیان، پردووخیان] سووتانی تووک و موو.

**پڕووزانــدن** (چا. م)[لە: پڕووز] سووتاندنی تووک و موو و خوری، هەڵپڕووزاندن، پڕووزانن.

**پڕووزانن** (چا. م)[ئەر] بڕ: پڕووزاندن

**پڕووزیان** (چا. م)[ئەر] بڕ: پڕووزان

**پڕووشک** (نا.)[سۆر] بڕ: پڕیشک

**پڕووکــان** (چا. ل) تێکچوونی باری ئاسایی مرۆڤ و پەڕینی ڕەنگی ڕووی لە ترسان، پەشۆکان، بزڕکان، هەڵپڕووکان.

**پڕووکــاو** (نا. مف)[لە: پڕووکــان] ترساو و ڕەنگ پەڕاو، بزڕکاو.

**پڕیشک** (نا.) ١ـ ئاو یا ئاوەکییەک کە بە پێ تێنان یا هەڵتەکاندنی شتی تەڕ دەپڕژێ، پڕووشک، پژە، پڕژە، پرشە. ٢ـ پڕیشکی ئاگر کە لە کاتی سووتانی دار و ئێزینگ یا کوتانی ئاسن دەپەڕێ، پزووسک، پزووسکە، پزیسکە، پرووسک، پرووسکە، پریسک، ئاورینگ. ٣ـ وردەی پەڕاوی شتێک. ⁂ پڕیشکی بەرد، پڕیشکی دار. ٤ـ تیشک، بریقە. & پڕیشکە. **~ پڕژاندن:** ١ـ پڕژاندنی دڵۆپی ئاو. ٢ـ ئاورینگ دان. **~ دان:** ئاورینگ دان، پڕیشک پڕژاندن. **~ کردن:** پڕژاندنی ئاو بە پێ دە ئاو نان یا هەڵتەکاندنی شتی تەڕ. **~ هاویشتن:** ١ـ ئاورینگ دان، ئاورینگ پڕژاندن. ٢ـ

تیشک هاویشتن، بریسکانەوە. ٭٭ چاوت بە من بمێنێ بە ئەستێرەکەی رۆژێ ئەگەر تازە هەڵدێ پریشکان داوێ/ بەژنت بە من بمێنێ بە چووزەی پیرەلاولاوێ (لاس و خەزاڵ ل ٧٠).

**تێبینی:** پریشک و هاوتاکانی لە ریشەی بەش کەوتوون. (بڕ: بەش1)

**پریشکە** (نا. ل)[پریشک + ئە] بڕ: پریشک

**پز** (نا.) ١ـ بێچووی گیاندار لە نێو زگ دا، ئاولەمە، پیزە. ٢ـ دەزگای شەرمی ژنانە، قوز، کوس.

**تێبینی:** پوثرە puthra لە ئەوێستا دا و پوس pus لە پەهلەویی دا جگە لە مانای کوڕ و پس بە مانای بێچوو و ئاولەمەی نێو زگ هاتوە و دەگەڵ پز و پیزە بە مانای ئاولەمە یەکن و یەک ریشەیان هەیە. هەروەها پیزدا pizda لە زمانی رووسی دا بە مانای قوز هاتوە و دەگەڵ پز یەک ریشەیان هەیە. (بڕ: پس3)

**پزان** (نا. ل)[پز + ئان (دان)] بڕ: پزدان/١

**پزانگ** (نا. ل)[پز + ئان (دان) + گ] بڕ: پزدان/١

**پزدان** (نا. ل)[پز + دان][پەه: پوسدان] ١ـ شوێنی ئاولەمە یا پز لە نێو زگی دایک یا مێینەی ئەو گیاندارانەی کە دەزێن. ئەو ئەندامە لە نێو لەگەنی ژنان دایە و بە لوولەیەک دا تۆی نێرینە دەڕژێتە تێوی و ئاولەمە لەوێ دا دەگوورێ و وردە وردە دەگەڵ هەڵدانی ئاولەمە گەورە دەبێ و دوای بوونی منداڵ وەک خۆی لێدێتەوە، پزگ، پزان، پزانگ، پرزانگ، پزدانک، پزوو، پزگە، پزلی، کاردانک، پیزەدان، بەچەدان، مناڵدان، منداڵدان. ٢ـ کیسەیەکی چووکەی پلاستیکی رەنگاوڕەنگە، لە کارخانە ساز دەکردرێ، بای تێدەکەن و منداڵ کایەی پێدەکەن و بۆ رازاندنەوە و جەژن و ئاهەنگیش کەلکی لێوەردەگرن، فوودانە. ٣ـ [باک] ئاواڵ منداڵ، پلار.

**پزدانک** (نا. ل)[پز + دان + ک][باک] بڕ: پزدان/١

**پزرک** (نا.)[باک] بڕ: بزرک

**پزرووک** (نا.)[باک] بڕ: بزرک

**پززە** (نا. ل)[پز + زە] بڕ: پزوو/٢

**پزک** (نا.)[باک] بڕ: بزرک

**پزگ** (نا. ل)[پز + گ2] بڕ: پزوو/ ٢ و ٣و٥

**پزگە** (نا. ل)[پز + گە1] بڕ: پزوو

**پزڵی** (نا. ل)[پز + ڵی] بڕ: پزدان/١

**پزۆر** (نا. ل)[پز + ئۆر؟][باک] ورگ و ناوزگ و هەناوی حەیوان.

**پزوو** (نا. ل)[پز + ئوو][باک: پزی - ناو: پزوو، پزگ، پزگە - هەو: پزی، پسێ] ١- ماسوولکە و گۆشتی دەوری کونی قوون، پزی، پیزیی. ٢- شوێنێک کە دەرپێ و پاتۆڵ کە کێش یا دۆخینی تێهەڵدەکێشرێ، پزگ، پزی. ٣- نەخۆشییەکە وەکوو هەڵامەت تووشی هەموو حەیوانات دێت بۆ مەڕ و بزن پێی ئەڵێن (پزوو) بۆ مایین و ئەسپ، ئێستر، گوێدرێژ (مەقاو)، بۆ رەشەئولاغ (تەبەق) بۆ سەگ (سەگەناز) ی پێ ئەڵێن (کشت و کاڵ ب ١ ل ٦١)، پزگ، پززە، پزە، فزە، فززە. ٤- بڕ: پزدان/١. ٥- دەم و زارکی هەر شتێکی بەنی تێهەڵکێشرابێ، پزگ.

**پزووسک** (نا.)[ئەر] بڕ: پرپیشک/٢

**پزووسکە** (نا.)[ئەر] بڕ: پرپیشک/٢

**پزە** (نا. ل)[پز + ئە]بڕ: پزوو/٣

**پزی** (نا. ل)[پز + ئی][باک - هەو] بڕ: پزوو/١ و ٢

**پزیسک** (نا.) بڕ: پرپیشک/٢

**پزیسکە** (نا.)[هەو] بڕ: پرپیشک/٢

**پزیشک** (نا. ل) بڕ: بژیشک

**پزیشکە** (گیا.) بڕ: پەرمێشک

**پزینک** (نا. ل)[پز + ئینک] بڕ: بزمک

**پژ** (نا.) ١-[بڕ: بژ1] ١- پرزەی باریک و درێژ و تیژی گوڵی گەنم و جۆ و چەڵتووک و گیای دیکەی لەم شێوەیە.، داسوو، بژ. ٢- یاڵ، بژ. ٣- هەژگ و ویشکەڵی دار و درەخت، پژاڵ، بژاڵ. ٤- پرژ، بڵاو.

**پژاڵ** (نا. ل)[پژ + ئاڵ4] ١- ویشکەڵی دار و درەخت، پژ، بژاڵ. ٢- پووش و پەڵاشی سەر دارەڕا، پردوو، سەرمیچ، لیشامە، لیشمە، هەڵاش. ٣- پووش و پەڵاش.

**پژان** (چا. ل)[لە: پژ] ١- بڵاو بوون، پرژان. ٢- بەربوونی خوێنی لووت. ٣- کچێنی هەڵگیران.

**پژاندن**[1] (چا. م)[لە: پژان] ١- بڵاو کردن، پرژاندن. ٢- تۆو پرژاندن، وەشاندن. ٣- دە خوێن هێنانی لووت. ٤- هەڵگرتنی بنی کچ.

**پژاندن**[2] (چا. م)[باک] بڕ: پێژتن

**پژبەلاڤ** (ئان. ل)[پژ + بەلاڤ][باک]

بڕ: پرژوبڵاو

**پژبێن** (نا. ل)[پژ(پشت) + بێن (بەن)] بڕ: پشتێند

**پژبێند** (نا. ل)[پژ(پشت) + بێند] [سۆر] بڕ: پشتێند

**پژتێن** (نا. ل)[پژت (پشت) + ئێن (بەن)] بڕ: پشتێند

**پژک** (نا. ل)[پژ (پاژ، بەش) + ک] دارۆکە یا چیلکەیەک کە دە کونی مەشکە و خیگە و ... روا دەکەن هەتا ئاوەکی نێوەوەی لێنەڕژێ، پشک.

**پژکۆژ** (نا.)[باک] بڕ: بشکۆژ

**پژم و هۆڕ** (وشد.)[پژم + و + هۆڕ] پشمەی زۆر توند و بە دەنگی بەرز، پشم و هۆڕ.

**پژمە** (وشد.)[پەه: شنۆسەک. لۆر: پێشمە. باک: پژمە ـ ناو: پژمە، پشمە ـ هەو: پژمە ـ زا: پسک] هاتنە دەری بای نێو لووت بە حاڵەتێک کە سەر دەچێتە سەر و لە دوایی بە توندی دێتە خوار و دەنگێک لە گەروو و کەپۆ هەڵدەستێ و با و خرت و خاڵی زێدەی لووت دێتە دەر.

**پژمەپژم** (وشد.)[پژمە + پژم] پژمەی یەک لە دووی یەک، چەند پشمە لە سەر یەک، پشمەپشم.

**پژمین** (چا. ل)[باک: پژمین ـ ناو: پشمین، پژمین ـ هەو: پژمای ـ زا: پشکاییش] دەرکردنی پژمە و بای نێو لووت.

**پژوێن** (نا. ل)[پژ (پشت) + وێن (بەن)] بڕ: پشتێند

**پژوون** (نا. ل)[پژ + ئوو + ن][باک] گیای ورد کراو بۆ ئاژەڵ، گزرە.

**پژە** (نا.) بڕ: پرژە.

**پژیان** (چا. ل)[ئەر] بڕ: پرژان

**پس**[1] (ئان.) بڕ: پسک. ~ **بوون:** بڕ: پسک بوون.

**پس**[2] (ر.) ١ـ رەگی چاوگی پسان و پساندن. ٢ـ لەت، کوت. ‖ **پس پس:** بەن و داوێک کە لە چەند شوێنەوە پسرابێ، کوت کوت، لەت لەت. ~ **کردن:** کوت کوت کردنی بەن و داو. ፨ ئەو بەنەت بۆ وا پس پس کردوە

**پس**[3] (نا.)[ئەو: پوثرە ـ هەخ: پوترە ـ سان: پوترە ـ پەه: پوس، پوسەر. باک: پس] ١ـ کوڕ، منداڵی نێرینە. ٢ـ بێچووی گیانلەبەر.

**تێبینی:** لە کوردیی ئێستا دا ئەم

وشــەیە بـە تەنیـایـی نەمـاوە و تەنیـا لە هەندێک وشـــە دا مـــاوەتەوە. ⁂ ئاوس، پسـانک، پسـمـام، پزدان و ... (جگە لە وشەی پز و پیزە کە بە تەنیا ماون)

**پس**4 (وشـد.)[ئەر] لە جێ دانیشـتنی مریشک، فس. **~ دان:** فس پێدان بە مریشک، فس دان، داپسیان.

**پساغا** (نا. ل)[پس3 + ئاغا] کوڕی ئەرباب، کـوڕە ئاغا. ⁂ هەر کۆنە بەگ و پساغایەکی راستەوە بێ قسە لە قسەی من دا بکا، دەری ناهێنێ. (میرزا ل ٨٥)

**پسان** (چا. ل)[بڕ: پساندن] ١ـ لە بەر یەک چوون و کـوت بوونی رێســراوە. ٢ـ تۆپینـی حـــەیوان لـە بـەر مـــاندووی و هەڵاتنی زۆر. ٣ـ (مــجـ.) هیــلاک بوون، مـاندوو بوونی لـە رادە بەدەر. ⁂ پســام هێندەم کار کرد.

**پسـاندن** (چا. م)[ئەو: ڤی سـەئێـد ـ هەخ: ڤـیـسـد ـ پەه: ڤـیـســەســتـەن، ڤیسیستەن، ڤیساندەن] ١ـ لە بەر یەک بردن و کـوت کـردنی رێســراوی درێژ و بەن و داو. ٢ـ (مجـ.) تۆپاندن و کوشتنی وڵاغ و حەیوان بە کاری زۆر لێکێشـان و مـاندوو کردنیـان. ⁂ هێندەت ئەو ئەسـپە تاو داوە بەسـتـە زمـانەت پسـاندوە. ٣ـ (مجـ.) ماندووی کـردنی لە رادە بە دەر، هیـلاک کردن. ⁂ هێندەم کـار لێکێـشـا پساندم.

**پسانک** (نا.)[بڕ: پس3][ئەو: پوثرە] بێچوو، توڵە.

**تێبینی:** لە ئەوێستا دا پوثرە هەم بە مانای کوڕ هاتوە هەم بە مانای بێچووی گیانداران جا چ مێ بێ یان نێر.

**پســانەوە** (چا. ل)[پسـان + ئەوە] ١ـ دیســـان لێک هـەڵپــچـڕانی ریسی لێک بەستراوە. ٢ـ کۆتایی پێ هاتن، بڕانەوە. ⁂ ئەو هەمـوو سرت و خورتەتان لـە چیە، هـەر نەپساوە. ٣ـ سـەر هەڵدانەوەی برین، کرانـەوەی دەمی برین. ⁂ هەرچی بیـری یار دەکـــەم برینـم دەکــولێنەوە/ برینـم سـارێژ ببوون لە غەمان دەپسێنەوە (لالە بە دەستان ل ١٦٧).

**پس برا** (نا. ل)[پس3 + برا][باک] برازای کوڕ، کوڕی برا.

**پسپان** (نا.)[؟][باک] کوتە پارچە یان چەرم کـە لە سـەر شـوێنی دڕاوی جل یا کەوشی دەدروونەوە، پینە.

**پس پس** (وشـد.) ١ـ بـڕ: پش پش. ٢ـ [باک] بڕ: پچەپچ

**پسپۆڕ** (ئان.)[؟] ١ـ شوانی زیرەک و زانا کە هەر بە سەر مەڕ و بزنەکان دەناسێتەوە. ٢ـ مرۆی زیرەک و پیتۆڵ. ٣ـ مرۆڤی زۆرزانا کە لە باری عیلمی و زانستەوە پلەی زۆر لە سەرە. ~ **بوون:** ١ـ شارەزا بوونی شوان. ٢ـ زانستی زۆر هەبوون.

**پسپۆڕیی** (حم.)[پسپۆڕ + ئیی] ١ـ لێهاتوویی و کارامەیی شوان. ٢ـ زۆرزانیی، چازانیی.

**پست** (وشد.) سرتە، خورتە، پستە.

**پستان** (ئا.)[هیک: ستەنە ـ ئەو: فشتانە ـ پەه: پێستان، پیستان. تات: پێستان ـ فار: پستان. زا: پستان، پستن] ١ـ دوو ئەندامی هاوتای سەر سینگ کە هی ژنان لە هی پیاوان گەورەترە و منداڵی پێ شیر دەدەن، مەم، مەمە، مەمک. ٢ـ کراسی درێژی ژنانە، فستان.

**پست پست** (وشد.)[پست + پست] [زا] بڕ: پچەپچ

**پستن** (ئا.)[زا] بڕ: پستان

**پستە**[1] (گیا.)[ئار: فستقا لە یون: pistakion] بەری دارێکی خۆڕسک و دەستنێژە هەر بەم ناوە، بە گەیشتوویی توێکڵێکی رەقی هەیە، ناوکەکەی کەسک و بە تام و چەورە. پستە بە فەرێکیی و بە بۆدراویی دەخورێ و هەروەها لە شیرینیسازیی دا کەلکی لێوەردەگرن، Pistacia vera ناوی لاتینی ئەم دارەیە، بستە، فستق. || **پستەی خەندان:** پستەی بۆدراوی تەواو دەم کراوە کە لە پستەکانی دیکە باشتر و گرانترە.

**پستە**[2] (وشد.) سرتە، خورتە، چپە.

**پستە بادام** (گیا.)[پستە1 + بادام] جۆرێک بادامی توێکڵ ناسکە، دەگەڵ چەرەس دەکردرێ و توێکڵەکەی بە دەست دەشکێ. بادامی کاغەزی.

**پستەپست** (وشد.)[پستە2 + پست] [باک] بڕ: پچەپچ

**پستەیی** (ئان. ل)[پستە + ئی] ١ـ هەرچی کە پێوەندیی بە پستەوە هەبێ یا پستەی تێدابێ. :: شیرنی پستەیی. ٢ـ جۆرە رەنگێکی سەوز لە رەنگی ناوکی پستە

**پسخاڵ** (نا. ل)[پس3 + خاڵ][باک] کوڕەخاڵ، کوڕی خاڵ.

**پسخالتی** (نا. ل)[پس3 + خالتی] [باک] کوڕەپوور، کوڕی پوور لە دایکەوە.

**پسک**[1] (ئان.)[؟][ناو: پس، پسک] حاڵی کەسێک کە هەندێک پیتی بە جوانی بۆ دەرنابڕدرێ و بە سەر زمانی قسان دەکا. **~ بوون:** کەسێک کە بە سەری زمانی قسان دەکا و هەندێک پیتی بە جوانی بۆ دەرنابڕدرێ، پس بوون.

**پسک**[2] (وشد.)[زا] بڕ: پژمە

**پسکور** (نا. ل)[پس3 + کوڕ][باک] پەیوەندی نێوان باپیر دەگەڵ نەوەی نێری لە کوڕەوە، کوڕی کوڕ.

**پسکە**[1] (ئا.)[زا] بڕ: سی3

**پسکە**[2] (نا.)[زا] بڕ: پشکەڵ

**پسکە**[3] (نا.)[ئەر] ١ـ باڵەفڕکەی بێچووی مەل لە کاتی وەرگرتنی دان و خۆراک لە دندووکی دایکی. ٢ـ ماتە، پێدزە.

**پسکەپسک** (نا. ل)[پسکە3 + پسک] ١ـ باڵەفڕەکەی پەیتاپەیتای بێچووی مەل. ٢ـ پێدزە، ماتەماتە.

**پسکیی** (حم.)[پسک1 + ئیی] ئاکامی پسک بوون.

**پسکیان** (چا. ل)[لە: پسکە3][ئەر] ١ـ باڵەفڕکە کردنی بێچووی مەل بۆ دان وەرگرتن. ٢ـ بە ماتەمات رۆیشتن، پارێز بردن.

**پسڵ** (گیا.)[؟] لووشەیەکە کە ئەکرێتە ناو چێشتی دۆکوڵیوەوە (خاڵ ب ١ ل ٢١٦).

**پسمار** (نا.)[هەو] بڕ: بزمار

**پسمارێ** (نا.)[هەو] بڕ: بزمارە

**پسمام** (نا. ل)[پس3 + مام][باک] کوڕی مام، ئامۆزای نێرینە.

**پسمیر** (نا. ل)[پس3 + میر][باک] کوڕی میر

**تێبینی:** پسمیر لە نێو کوردە ئێزیدیکان دا برەوی هەیە. میر سەرۆکی ئاینی ئێزیدیکانن و پسمیریش لەو تایفەیەن کە وەک جێگری میر وان و تەنیا ئەوانن کە دەتوانن لە بنەماڵەی میر ژن بخوازن.

**پسنگ** (نا.)[زا] بڕ: پشیلە

**پسۆک** (ئان. ل)[پس2 + ئۆک] حاڵی بەن و هەودا و داوێک کە زۆر قایم نەبێ و بپسێ.

**پسیان** (چا. ل)[لە: پس4][ئەر] فس خواردن، دانواندنی مریشک بۆ کەڵەباب، داپسیان.

**تێبینی:** فەرهەنگی خاڵ و فەرهەنگی هەنبانەبۆرینە هەردووکیان ئەم وشەیان لە فەرهەنگی مەردوخ وەرگرتوە بەڵام بە هەڵە بە مانای پسان ـ یان داناوە.

**پسیک** (نا.)[باک ـ زا] بڕ: پشیلە

**پسینگ** (نا.)[باک ـ زا] بڕ: پشیلە

**پسێ** (نا.)[هەو] بڕ: پزوو

**پش**[1] (ئا.)[باک] بڕ: سی3

**پش**[2] (وشـد.) وشـەی بانگ کـردنی پشیلە، پشی.

**پش**[3] (نا.) سـواوی وشـەی پشت لە هەندێک وشەی لێکدراو دا.

**پشافتن** (چا. م)[باک] بڕ: پشاوتن

**پشاڤتن** (چا. م)[باک] بڕ: پشاوتن

**پشـاوتن** (چا. م)[باک: بشـاڤتن، پشـافتن، پشـاڤتن ـ ناو: پشـاوتن] هەڵپشاوتن، گلۆفین، هەڵگلۆفین.

**پـش پـش** (وشـــد.)[پـش 2 + پش2][پەش: پیش پیش. باک: پش پش، پس پس ـ ناو: پش پش، پشی پشی، پس پس ـ زا: پش پش] بانگی پشیلە کردن.

**پشت**[1] (نا.)[هیک: پەرشـتی ـ ئەو: پەرشـتی ـ پەه: پوشت. گـیل: پوشت ـ فـار: پشت ـ لۆر: پۆشت ـ بیـر: پۆشت. باک: پشت ـ ناو: پشت ـ هەو: پەشت، پەشـتی ـ زا: پێـشت، پاشت، پاشـتی، پەشتی، پۆشتە، پۆشتی] ١ـ (ئا.) بەشی دواوەی مـرۆڤ لە سـەر شـانییەوە هەتا کەمـەری، مـازی. ٢ـ (ئا.) سـەر شـانی گیاندار لە نزیک ملییەوە هەتا کەفەڵ و سـەر پێی. ⁂ زینی لە سـەر پشـتی ئەسـپی دانا. جووجکە لە سـەر پشـتی دایکیان هەڵنیشتبوون. ٣ـ بەشی پێوە لکاوی دواوەی هەرشـتێک. ⁂ بە پشت پێمەڕەکە پانیان کەوە، پشتی پاکەتەکە بنووسە. ٤ـ رووی کـول و دواوەی تیغ و شیر. ⁂ پشتی کێرد دەست نابڕێ. ٥ ـ باب و باپیران لە باوکەوە، بەرە، نەسل. ⁂ دایەمـرۆت پیـرێژنێکی دنیـادیدەی کۆنسـاڵ بوو... شەش پشتی بنەماڵەی ئێمەی دیبوو (تاریک و روون ل ٥). ٦ـ دوا، ئەو بەری هەر شتێک. ⁂ کتێبەکە لە پشت دەسـتـەنوێنەکـانە. پشت دیوارەکەمان کەلاوەیە. ٧ـ ئەو بەشـە لە جل و بەرگی مـرۆڤ کـە دەکەوێتە سـەر پشت. ٨ـ لاگر، یارمەتی دەر، داژگر. ٩ـ لای سـەرەوە، سـەر، بان. ⁂ پشت بان، پـشـت هـەیـوان. ١٠ـ (ئـاک.) پـاش، دوایی.⁂ پشـتی تە تێم. ١١ـ کـەمـەر،

نێوقەد. ❊ هاتم لە لای سەردەشتێ، مەمکت سێوی بەهەشتێ/ کراسی تەنک لە بەر کە، کەمبەرەی زێڕ لە پشتێ (سێسەد هۆنراوە ل ١٢). ١٢ـ کۆڵ. ١٣ـ (مجـ.) قوون، کونگ. ١٤ـ کراوە، ئاوەڵا. ❊ دەرگا حەساری لە سەر پشتە. ~ **بەر دان:** دەست لە یارمەتی دان و پشتگیری کەسێک هەڵگرتن، واز هێنان لە داژداری // پشت گرتن. ~ **بە کەسێک گەرم بوون:** (کنـ.) نەترسان لە ئەنجامی کارێک لەبەر ئاشنایەتی و پشت بەستن بە کەسێکی خاوەن دەستەڵات و باڵادەست. **پێوە ئێشان:** (کنـ.) بە کارێکەوە ماندوو بوون، زەحمەت کێشان. ~ **پێبەستن:** هێوادار بوون بۆ پشتگیری لە لایەن کەس یا کەسانێکەوە، خۆ بە کەسی دیکە سپاردن بۆ یارمەتی دان، پشت دانە پشت کەسێک. ~ **پێ (ئە)سپاردن:** پشت پێبەستن بە کەسێک، هیوادار بوون بە پشتگری کەسێک، پاڵ وێدان. ~ **تێبوون:** جۆرێک دانیشتنی بێ ئەدەبانەیە وەها کە پشت لە کەسی گەورەتر کرابێ. ~ **تێکردن:** ١ـ روو وەرگێران لە کەسێک بە نیشانەی تووڕەیی یا نارازی بوون. ٢ـ واز لێهێنان و بەجێ هێشتنی کار یا خەبات و گەڕانەوە. ~ **دان:** ١ـ کۆڵ دان، بەزین، تاقەت نەهێنان لە ئاست هێزێکی لە خۆ سەرتر. ٢ـ خۆ وەدەستەوە دانی مێینە یا ژن بە نێرینە، مل دان، رازی بوون. ~ **دانە ~ کەسێک:** ١ـ پشت بە پشتی کەسێکەوە نان. ٢ـ پشت وە پشت دان، پشت پێ سپاردن، پشت پێبەستن. ~ **دانەوە:** ١ـ پاڵ دانەوە. ٢ـ پاڵ دانەوە بە ئەرخەیانی، بێخەم بوون، پشت لێدانەوە. ❊ هەتا من هەم پشت بدەوە و لە هیچ غەم مەخۆ! ٣ـ تێوەژاندن و هەڵدانەوەی ئاگری نێو تەندوور پاش دامرکانی بۆ ئەوەی گەرم بێتەوە. ~ **دە (لە) ئاوەدانی کردن:** ١ـ لە ئاوایی و ئاوەدانی دەرکەوتن و روو دە چیا و چۆڵایی کردن. ٢ـ تەرکی دونیا و ئاوەدانی کردن و بە تەنیا ژیان، دوور بوونەوە لە خەڵک. ~ **راست کردنەوە:** ١ـ پشت هەڵێنانەوە لە بن بارێکی قورس. ٢ـ (کنـ.) لە ژێر ئەرک و کارێکی قورس خەلاسی بوون. ~ **رەق بوون:** (کنـ.) دوای ماوەیەک بێکاری کاری پێشوو پێنەکران، تاقەتی کاری پێشوو نەمان. ❊ لە دوکانداریی تازە پشتم رەق بوە و پێمناکردێ. ~ **شکان:** (کنـ.) ١ـ

تووشی کۆستێکی گەورە بوون، مردنی کەسێکی نزیک کە جێی پشت پێ بەستن و هیوا بوو. ٢ـ لە هێز و تاقەت کەوتن، تێشکان، تێداچوون لە باری مادی و مەعنەوییەوە. **~ شکاندن:** (کنـ.) ١ـ کۆستێکی گەورە تووشی کەسێک کردن. ٢ـ نابووت کردنی کەسێک لە باری ماددیی و مەعنەوییەوە، تێشکاندن. **~ قایم بوون:** کەسێکی دەستەلاتدار یا دەسرۆیو لە پشت بوون، خاترجەم بوون لە پشت گیران. **~ گرتن:** ١ـ لای پشتەوە لە کەسێک گرتن لە کاتی شەڕ و جەنگ دا. ٢ـ لایەنگری لە کەسێک کردن، یارمەتی دان و داژ داریی کردن. **~ لە زگ نەرمتر کردن:** (کنـ.) چاک تێهەڵدان لە کەسێک. **~ لێدانەوە:** (کنـ.) پاڵ دانەوە بە ئەرخەیانی، بێخەم بوون، پشت دانەوە. **~ لێکردنەوە:** (کنـ.) دڵنیا بوون لە لەسەرپێ وەستانی کەسێک کە پشتی بۆ مەسەلەیەک گیرابوو. ∷ پشت لەو منداڵانەت بکەوە، ماشەڵڵا هەموویان بوونە پیاو و پێویستیان بە تۆ نەماوە. **~ نەکردنەوە:** نەترسان و وەستان، پشت تێنەکردن و رانەکردن لە دوژمنی و کەسی لەم بابەتە. ∷ رۆژی هەرا شەڕ و پشت لە هەزار سوار ناکاتەوە. **~وە ~ دان:** (کنـ.) یەک گرتن و لە یەکتر دڵنیا بوون بۆ ئەنجام دانی کارێک، پشتی یەکتر گرتن، پشت بە یەکتر بەستن. **~ هەڵکردن:** تووڕە بوون، قەڵس بوون، روو وەرگێڕان. **~ی خەو شکاندن:** (کنـ.) زۆر خەوتن، پتر لە رادەی پێویست نوستن. **~ی کەسێک لە عەرز (زەوی) دان:** ١ـ بەزاندنی غەنیم یا کەسێک کە زۆرەبانی و کوشتی دا. ٢ـ(کنـ.) تێشکاندنی کەسێک لە باری ماددیی و مەعنەوییەوە. **~ی یەک (یەکتر) گرتن:** (کنـ.) یەک گرتن و یارمەتی یەکتر دان. **خۆ خستنە سەر ~ :** (کنـ.) گوێ نەدان، وڵام نەدانەوە، تەفرە دان. ∷ خۆی لێخستوومە سەر پشت و جوابم نەداتەوە. **دستی کەس (کەسانێک) لە ~وە را بەستن:** (کنـ.)سەرووتر و کارامەتر بوون لە کەسانی دیکە بە باری چاکە یا خراپە دا، دەست لە تەختە بەستن. ∷ حەمە فێڵەزانێکە مەگەر خودا بزانێ، دەستی شەیتانی لە پشتەوەڕا بەستووە. **لە ~ نان:** لە سەر کۆڵ دانان، لە کۆڵ کردن. **لە سەر ~ بوون:** ئاوەڵە بوون، کرانەوەی تەواوی دەرگا و پەنجەرە. || **پشتی چاو:** (کنـ.)

برۆ. ⁂ کەس ناوێرێ پێی بڵێ پشتی چاوت برۆیە زوو قەڵس دەبێ. **پشتی دەست:** ئەو لایەی دەست لە مرۆڤ دا کە بەرچاوە، لای سەرەوەی دەست. // بەری دەست. * **پشتی دەستی خۆ داغ کردن:** ١ـ (کنـ.) خۆ تەمێ کردن بۆ ئەنجام نەدانی دووبارەی کارێک یان یارمەتی نەدانەوە بە کەسێک، تۆبە کردن. ⁂ تازە من پشتی دەستی خۆم داغ دەکەم و ئیدی قەت دوکانداریی ناکەم. **پشتی شێر:** (کنـ.) جێگەی سەخت و ئەستەم. ⁂ بریا ژن لە پشتی شێری با (مەسەل). **پشتی کێو:** (کنـ.) جێگەی سەخت و ئەستەم و دوورەدەست، پشت کێو. ⁂ ئەوەی تۆ دەتەوێ لە پشتی کێویش بێ بۆت دەست دەخەم.

**پشت**[2] (وشـد.)[کرم: پیشت ـ فار: پیشت. ناو: پشت، پشتە ـ زا: پشت] وشەی دەنگ دانی پشیلە، خت، ختە.

**پشتاپشت** (ئاک. ل)[پشت1 + ئا14 + پشت1] برِ: پشتاوپشت

**پشتاش** (نا. ل)[پشت + ئاش1] تۆزی ئارد و دانەوێڵە لە ئاش دا کە لە سەر و پشتی ئاشەوان و خەڵک دەنیشێ، تۆزاش.

**پشتان** (نا.)[؟] برِ: پەشتان. ⁂ خلْخالی قەدم وەک خەمی زولفەینی سەراپات/ پشتانی قەدت بێت و فیدای بازنی بازووت (نالی ل ١٥٣).

**پشتاو** (نا.) برِ: پشتوو

**پشتاوپشت** (ئاک. ل، نا. ل)[پشت1 + ئاو2 + پشت1] ١ـ داب و نەریت و کولتوور لە باب و باپیرانەوە بۆ منداڵەکانیان، بەرە دوای بەرە، بەرەبەرە، پشتاپشت، پشت بە پشت. ⁂ بەیتەکانی کوردیی پشتاوپشت گەیشتونەتە دەست ئێمە. ٢ـ رۆیشتن و هەنگاو هەڵگرتن بە پێچەوانەی باری ئاسایی، رۆیشتن بەرەوە دواوە بێ ئەوەی لەش بگەرێتەوە، پاشەوپاش. ⁂ کچە لە ترسی باوکی پشتاوپشت خۆی دە ژوورێ کوتا. ٣ـ بەرەو دواوە بردنی مەکینە و ئامرازی لێخورین.

**پشتبان** (نا. ل)[پشت1 + بان] برِ: بان1 /١

**پشتبەپشت** (ئاک. ل، نا. ل)[پشت1 + بە + پشت1] برِ: پشتاوپشت/١

**پشتبێن** (نا. ل)[پشت1 + بەن] برِ: پشتێند

**پـشــت پـەردە** (ئـان. ل)[پــشـت1 + پەردە] هەرچی کە بە شـاراوەیی بمێنێ و نەدرکێندرێ، راستی و بنەڕەتی رووداو و مەسـەلەیەک کە خەڵک لێی ئاگادار نیە. **لە ~ بوون**: شـــاراوە بـوون. **لە ~ مانەوە**: شاراوە مانی کار و مەسەلەیەک.

**پشتخورێن** (نا. ل)[پشت1 + خورێن] ئامرازێکە وەک شانە کە پشتی ئەسپ و یەســتــری پێ دەخــورێن و خـــاوێن دەکەنەوە، قەشۆ، رنەک.

**پشـتـدار** (ئان. فـا)[پشت + دار2] ١ـ کەسێک کە پشتیوان و داژداری هەبێ. ٢ـ پارچە یان شـتـێک کـە بەر و پشــتی هەبێ و ئەستوور و قایم بێ.

**پشـــتــرەق** (ئان. ل)[پشت1 + رەق] کـەسـێک کـە کـار و ئـیشی زەحـمـەت و قـورسی پێنەکـردرێ. **~ بوون**: کـاری بەدەنی و زەحمەت پێنەکران.

**پشـــتـرێژ** (ئان. ل)[پشت1 + رێژ2] [ناو: پشـتـرێش، پشـتـرێژ، پشـتـەرێشـە، پشـتـەرێژ، پشـتـەرێژە ـ زا: پاشـتـرێش] برینی پشتی چوارەێ لەبەر سواریی زۆر یـان بـار و زین و کـــورتـانـی خـــراپ، ناوکەرێژ، ناوکەرێژە، ناوکەرێش.

**پشـــتـرێش** (ئان. ل)[پشت1 + رێش] بڕ: پشترێژ

**پشـتـسـارد** (ئان. ل)[پشت1 + سارد] نائومـێـد، دڵسـارد. // پـشـتـگەرم. **~ بوونەوە**: هیـوا لێبـڕان و دەست هەڵگرتن لە کـــارێک یا کـــەســـێک، دڵســـارد بوونەوە. **~ کردنەوە**: کەسێک لە کار یا کەس یا مـەسـەلەیەک دڵسـارد کردن بۆ ئەوە کە دەستی لێ هەڵگرێ.

**پشت سەر** (نا. ل)[پشت1 + سەر] ١ـ (ئا.) بەشـی دواوەی کـەللە. ٢ـ (ئاک. ل) لای دواوە، پشـــتـــەوە. ؛؛ کـابرایـەک لە پشت ســەرم دانیـشـتـبـوو هـەر قـسـەی قـۆڕی دەکـرد. ٣ـ قـسـەی پشت ســەر، غـەیبـەت، پاشـملە. & پشـتـەسـەر. **(لە) ~ قسـە کردن**: بڕ: پاشـملە کـوتن. **(لە) ~ی کەسێک نوێژ کردن**: بڕوا و متمـانەی تەواو بە کەسـێک هەبوون، پاک و ئەمین بوون. ؛؛ کاک ئاسۆی جیرانمان هێندە پیـاوێکی رێکوپێکە بۆوەی دەبێ لە پشت سەری نوێژ بکەی.

**پشـــتـکۆڵ** (نا. ل)[پشت1 + کـۆڵ] دارێـکی درێــژ کـــــە لـە ژوورەوە وە بـەر دەرگـــای دەدەن بۆ قـــایم بوون، پشـکۆڵ، پشتەک.

**پشـــتـکۆم** (ئان. ل)[پشت1 + کـۆم]

کەسێک کە پشتی کۆمە، پشتچەماو، پشتکووڕ، کۆم، قۆز، خووز. ~ **بوون:** کووڕ بوون، پشتکووڕ بوون.

**پشتکۆمیی** (حم.)[پشتکۆم + ئیی] چلۆنایەتی کووڕ، کووڕ بوون، کووڕیی، پتشکووڕیی، کۆمیی.

**پشتکووڕ** (ئان. ل)[پشت1 + کووڕ] بڕ: پشتکۆم. ~ **بوون:** بڕ: پشتکۆم بوون.

**پشتکووڕیی** (حم.)[پشتکووڕ + ئیی] بڕ: پشتکۆمیی.

**پشت کێو** (ئاک. ل)[پشت1 + کێو] (کنـ.) جێگەی دوور و ئەستەم، پشتی کێو. || **پشت کێوی قاف:** (کنـ.) جێگەیەکی دوورەدەست کە کەس دەستی پێیڕاناگا. ⁘ پیاو ئەگەر مەیلی لێبێ و شتێکی بوێ لە پشت کێوی قافیش بێ وە دەستی دەخا.

**پشتگر** (ئان. فا)[پشت 1+ گر] کەسێک کە لایەن و پشتی کەسێک بۆ یارمەتی و لە کاتی پێویست دا بگرێ.

**پشتگریی** (حم.)[پشتگر + ئیی] پشت گرتن، یارمەتی دان.

**پشتگوێ** (ئا.)[پشت1 + گوێ] ١ـ پشتەوەی گوێ. ٢ـ مووی لای مل. & پشتگوێچکە. ~ **خستن:** (کنـ.) ئەنجام نەدان یا درەنگ ئەنجام دانی کارێک، گوێ پێ نەدان و وەدرەنگی خستنی کار و مەسەلەیەک، پشتگوێچکە خستن. ~ **کردن:** ١ـ سەر چاک کردن. ٢ـ هەڵگرتنی مووی لای ملی ژن. **وە ~ دان:** پشتگوێ خستن، پێ گرینگ نەبوون و ئەنجام نەدانی کار و ئەمرێک.

**پشتگوێچکە** (ئا.)[پشت1 + گوێچکە] بڕ: پشتگوێ. ~ **خستن:** (کنـ.) بڕ: پشتگوێ خستن.

**پشتگەرم** (ئان. ل)[پشت1 + گەرم] هیوادار، دڵنیا، بە ورە. // پشتسارد. ~ **بوون:** دڵنیا بوون لە ئەنجام دان و بەڕێوە بردنی کار و مەسەلەیەک. ~ **کردن:** دڵنیا کردن و ورە دان بە کەسێک بۆ بەڕێوە بردنی کارێک.

**پشتگەرمیی** (حم.)[پشتگەرم + ئیی] هیواداریی، دڵنیایی، پشتگەرم بوون.

**پشتماڵ** (نا. ل)[پشت1 + ماڵ][ئەر] دیوی چووک بە سەر وەتاغی گەورەوە بۆ کەل و پەلی زێدەی بەردەست، خەڵوەتی، پەستوو.

**پشتماڵە** (نا. ل)[پشت1 + ماڵ + ئە]

دراوسێ و هاوسایەک کە لە پشتەوەی ماڵ و خانووی کەسێک بن.

**پشت و پەنا** (ئان. ل)[پشت1 + و + پەنا] پشتیوان، پشتگر، ئاگادار، داشدار، یارمەتیدەر، پشت و پەناه. ⁘ جگە لە تۆ لەم دونیایە دا کەسم نیە، پشت و پەنام هەر تۆی.

**پشت و پەناه** (ئان. ل)[پشت1 + و + پەناه] بڕ: پشت و پەنا. ⁘ ئەوە مانگ لە من دەنگووتەوە بە یەکە/ پشت و پەناهم وەبەر تۆ ئەی فەلەکە (شێخ فەرخ ل ٢٣).

**پشتوێن** (نا. ل)[پشت1 + وێن (بێن1)] بڕ: پشتێند

**پشتوو** (نا.) ١ـ جۆرێک دەمانچەی لوولە درێژ کە پێنج گوللەی دەخوا، پشتاو. ⁘ کارگەی پشتوویان سالێک بوو دامەزراندبوو، وەستای پشتوو کوردێکی پیری حەفتا هەشتا ساڵەی خەڵکی سلێمانی بوو (دمدم ل ٢٧٣). ٢ـ توورەکەی بارووتی راوچی.

**تێبینی:** وێدەچێ شێواوی وشەی پیستوول pistolet بە مانای دەمانچە یان pistoie کە شارێکە لە ئیتالیا و ئەم جۆرە چەکەیان لەوێ ساز دەکرد، بێ. [لۆر: پیشتۆ. فار: پیشتو، پیشتاب]

**پشتە** (نا. ل)[پشت1 + ئە] ١ـ ئەو بارەی لە سەر پشتی دەنێن، کۆڵ. ٢ـ پشتی جگ، پک. // چک. ٣ـ مەودای هەموو کارگەی جۆلایی لە بووزووی نەتەنراو (گوڵ چنینەوە ل ٢٦).

**پشتە** (وشد.) وشەی دەنگ دانی پشیلە، پشت2.

**پشتەپا** (نا. ل)[پشت1 + ئە + پا] ١ـ لای پاشەوەی پێ. ٢ـ شەپ، شەق. & پشتەپێ. **~ لێدان:** ١ـ بە شەق تێهەڵدان، شەپ لێدان. ٢ـ لاق وە بەر لاقی کەسێک دان بۆ کەوتن یا خستن.

**پشتەپێ** (نا. ل)[پشت1 + ئە + پا] بڕ: پشتەپا.

**پشتەرێژ** (ئان. ل)[پشت + ئە + رێژ2] بڕ: پشترێژ

**پشتەرێژە** (ئان. ل)[پشت1 + ئە + رێژ2 + ئە] بڕ: پشترێژ

**پشتەرێش** (ئان. ل)[پشت1 + ئە + رێش] بڕ: پشترێژ

**پشتەرێشە** (ئان. ل)[پشت1 + ئە + رێش + ئە] بڕ: پشترێژ

**پشتەستوور** (ئان. ل)[پشت1 + ئەستوور] کەسێک کە لە لایەن کەس یا کەسانێکەوە بۆ پشت گرتن دڵنیایە، کەسێک کە پشتی قایمە.

**پشتەسەر** (نا. ل)[پشت1 + ئە + سەر] ١ـ (ئا.) بەشی دواوەی کەللە، پشت سەر. ٢ـ خشڵێکی پلپڵەداری زێڕ یا زێو کە ژنان لە دەوری سەریان دەدەن و بە پشت سەریان دا بەری دەدەنەوە، پشتەسەرە. ؛؛ پێچکەی پشتەسەر لە سەر زوڵفی رەش/ با بجریوێنێ وەک ئەستێرەی گەش (گۆران ل ١٥٣).٣ـ (ئاک. ل) لای دواوە، پشتەوە، پشت سەر. ٤ـ قسەی پشت سەر، غەیبەت، پاشملە. **چاو لە ~ی خۆ نەکردنەوە:** (کنـ.) بۆ هەمیشە رۆیشتن و نەگەڕانەوە. **(لە) ~ قسە کردن:** بڕ: پاشملە کوتن. **(لە) ~ی کەسێک نوێژ کردن:** بڕوا و متمانەی تەواو بە کەسێک هەبوون، پاک و ئەمین بوون. ؛؛ کاک ئاسۆی جیرانمان هێندە پیاوێکی رێکوپێکە بۆوەی دەبێ لە پشت سەری نوێژ بکەی.

**پشتەسەرە** (نا. ل)[پشت1 + ئە + سەر + ئە] بڕ: پشتەسەر/٢.

**پشتەک** (نا. ل)[پشت1 + ئەک] ١ـ هەندێک خوری کە دوای بڕینەوە لە سەر پشتی بەران بۆ جوانی دەیهێڵنەوە، پاڵانە، پاڵانچە. ٢ـ دیوارێکە کە لە بەر دیواری شکست هەڵیدەچنن بۆ ئەوەی بەری رووخانی بگرێ هەتا چاکی دەکەنەوە، بەرهەڵێخ، پشتیوانە. ٣ـ دارێک کە وەبەر دیوار یا درەختی دەدەن هەتا دانەکەوێ. ٤ـ دارێک کە وە پشت دەرگای دەدەن، پشتکۆڵ، پشکۆڵ.

**پشتەکەوا** (نا. ل)[پشت1 + ئە + کەوا]

**پشتەمازە** (ئا.)[پشت1 + ئە + ماز1 + ئە] ١ـ کۆمەڵە ئێسکێک کە پشتی گیانداران پێک دێنێ و لە مرۆڤ دا لە ٣٣ مۆرە یا مۆرتخە پێکهاتوە و نوخاع دە نێو خۆی دا دەپارێزێ، تێغەرەی پشت، مۆغەرەی پشت. ٢ـ ماسوولکە و گۆشتێک کە لە دوو لای ئەم ئێسکانە هەڵکەوتوە، راستە.

**پشتەماسی** (ئان. ل)[پشت1 + ئە + ماسی] ١ـ سەربانی کۆم وەک پشتی ماسی، خەرپشتە. ٢ـ جۆرێک دروومانە، تەختە جاجم و بەرماڵی پێ لێک دەدروون.

**پشتەماڵ** (نا. ل)[پشت1 + ئە + ماڵ] ١ـ هەرچی کـە بە پشـتی ئـەسپ و وڵاغی دادەن. ؛؛ وڵاغـــەکـــەیان کـــردەوە ئێـختـەرمـە، پشـتـەمـاڵێکیـان پێـدادا. (سـەعـید و مـیرسـێـوەدین ل ٢٤٨). ٢ـ [باک: پێشمال، پێشتەمال، پەشتەمال ـ ناو: پشـتــەمــاڵ، پـەشـتــەمــاڵ ـ زا: پێـشـتـەمـاله] فـۆتـەی حـەمـام کـە بە بەریانەوە دەگرن، فۆتە. ٣ـ خاوڵی دەست سڕین، خـاوڵی دەسـتـان. ‖ **پشـتـەماڵی حەمام:** ١ـ فۆتە. ٢ـ (کنـ.) ژنێک کە هەر ڕۆژەی دەگەڵ کەسێکە. * **وەک ~ی حــەمـــام هــەر ڕۆژە (ســاتــە) بە بـەری کــەســێکەوە (یەکـێکەوە) بوون:** (کنـ.) کەسێک کە جێی بەقا و متمـانە نەبێ بە تایبەت ژن، وەک فۆتـەی حەمام هەر ڕۆژە بە بەر یەکێکەوە بوون.

**پشتەملە** (نا. ل)[پشت1 + ئە + مل + ئـە] ١ـ بێـگـاریـی و کـــــاری بـە زۆر، پشتەملێ. ؛؛ بە پشتەملە کارم پێدەکەن دەنا خــۆم مــەیلم لێی نیــە. ٢ـ [هـەو] قسەی پشتە سەر، غەیبەت، پاشملە.

**پشـتـەملێ** (نا. ل)[پشت1 + ئە + مل + ئێ] بڕ: پشتەملە

**پشــتــەمــەلە** (نا. ل)[پشت1 + ئە + مــەلە] جــۆرێک مــەلـەیە کـە مــەلەوان دەکــــەوێتــــە ســــەر پشت و دەست دەوەشێنێ، مەلەپشتە.

**پشـتـەیوان** (نا. ل)[پشت1 + هـەیوان] ژوورێک کە کەوتبێتە پشت هـەیوان.

**پشـتی** (نا. ل، ئان. ل)[پشت1 + ئی] ١ـ شـتـێکـە وەک باڵنج بەڵام گـەورەتر، نێـوەکـەی داخـن و لە کـاتـی دانیــشتن وەبەر پشـتی دەدەن و پـاڵی لێـدەدەنەوە، پاڵەوپشت. ٢ـ [هـەو] بڕ: باڵنج. ٣ـ هـەر بـارێک لـە پشـت بنرێ، کـــۆڵ. ٤ـ [بـاک] پاش، دوا. ؛؛ پشتی تە تێم.

**پشـتـیر** (نا.)[؟] هۆدەی ئاژەڵ، گەوڕ، تەویلە، پشتێر.

**پشــــتــــیــــوان** (ئـان. ل)[پشــتـی + وان][پەهـ: پوشـتـیپـان] ١ـ یارمـەتیدەر و پاریدەدەر، پشتگر. ٢ـ (نا.) دارێک کە لە پشت دەرگا وەبەر پشـتکۆڵی دەدەن هـەتا بـاش قـــایم بـێ. ~ **بوون:** لاگــــر و پاریدەدەری کـەسـێک بوون بۆ ئـەنجـام دانی کارێک.

**پشتیوانە** (نا. ل)[پشـتیوان + ئە] ١ـ دیـوارێکە کــــە لـە بـەر دیـواری شکسـت هەڵیــدەچنن بۆ ئەوەی بـەری رووخـــانی بگرێ هـەتا چاکی دەکـەنەوە، بەرهەڵێخ،

تیرەک، شەمعەک. ٢ـ هەرکام لە دوازدە تەختە و چێوی عارەبەی کەڵی کە بانی عارەبەکەی پێک دێنن. ٣ـ ماڵ و سامان بۆ ئەنجام دانی کار و سەودا و مەسەلەیەک. ٤ـ رادەیەک زێڕ و جەواهیر و شتی بە نرخی وڵاتێک کە لە بانک رادەگیرێ، بۆ لە چاپ دانی ئەسکناس و پارە.

**پشتیوانیی** (حم.)[پشتیوان + ئیی] یارمەتی، کۆمەک، یاریدە، پشتگریی، لاگریی. ~ **کردن:** لاگریی لە کەسێک کردن، پشتی کەسێک گرتن و یارمەتی دانی، پشتیوانیی لێکردن. ~ **لێکردن:** بڕ: پشتیوانیی کردن.

**پشتێر** (نا.) بڕ: پشتیر

**پشتێن** (نا. ل)[پشت1 + ئێن (بێن2)] بڕ: پشتێند

**پشتێند** (نا. ل)[پشت1 + بەند] بەشێکە لە جل و بەرگی کوردیی، ژنانە و پیاوانە. پارچە و قوماشێکی درێژ و چەند میترییە، لە نێو قەدی دەهاڵێن، پشتێن، پشت بێن، پژتێن، پژبێن، پژبێند پژوێن، پشتوێن، بیبن، مێبین، شاڵ. ~ **بەستن:** لە کەمەر هاڵاندنی پشتێند. **دەبەر ~ چەقاندن:** شتێکی درێژی وەک دارسەبیلە، خەنجەر و ... دەبەر پشتێند نان. **دەبەر ~ نان:** خستنە نێو پشتێندەوە. ∷ دەستی دەبەر پشتێندی نابوو و وەستابوو. کاغەزەکەی گورج دەبەر پشتێندی نا. **لە ~ بەرە ژێر مردن:** (کنـ.) زۆر ترسان و پەشۆکان بە مەسەلە و کردارێک وەها کە نیوەی لەشی خوارەوەی مرۆڤ سڕ بێ. || **پشتێندی گرێچن:** جۆرە بەستنێکی پشتێندە کە ئاڵقەئاڵقە دەچنە باڵ یەکەوە.

**پشتێندە** (نا. ل)[پشتێند + ئە] بڕ: پشتێنە

**پشتێنە** (نا. ل)[پشتێن + ئە] ١ـ دارێکە بە ناو (بەرزەگەوە) دا ڕەت ئەکرێ بۆ ئەمەی نەجووڵێ. (خاڵ ب ١ ل ٢١٨). ٢ـ تەوق و چەرمێکە ئەخرێتە (نێ)ی ئاش (کشت و کاڵ ب ١ ل ٦٣). ٣ـ تەوقێکی ئاسنە ناوەکەی بە تووڵەبی یا تووڵی ژاڵە پڕ ئەکرێت بۆ کرەی چەڵتووک (کشت و کاڵ ب ١ ل ٦٣). ٤ـ پشتێنێکە بەسترابێتە ناو قەدی هێندێ شت بۆ قایمی (خاڵ ب ١ ل ٢١٨). ٥ـ جۆرێ زۆرەوانیە کە دەست دە کەمبەری یەکتر دەگرن (هەنبانەبۆرینە ب ١ ل ١٠٩). & پشتێندە.

**پشقل** (نا.) بڕ: پشکەڵ

**پشقول** (نا.)[باک] بڕ: پشکەڵ

**پشک**[1] (نا. ل)[پش (بەش) + ک] ١ـ [کرم: پێش ـ فار: پشک ـ لۆر: پێشک. باک: پەشک ـ ناو: پشک] بەش و بەختێک کە بە کوتە کاغەز یا شتێکی دیکە لەم جۆرە دیاری دەکرێ، پەشک. ٢ـ بەش، کوت، پار. ٣ـ کوتێکی چووکە لە گۆشت، پل. ٤ـ [لۆر: پێشک ـ ناو: پشک، پژک] کوتە دار یا چیلکەیەک کە کونی مەشکە و خیگە و هیزەی پێدەگرن، پژک. ٥ـ دڵۆپ، تنۆک، پەشک. ٦ـ پرِیشک. ~ **خستن:** دابەش کردنی پشک بۆ دەرکەوتنی شانس، پشک هاویشتن. (پشک زۆرتر لە نێوان دوو یا چەند کەسی شەریک دەخسترێ لە کاتی دابەش کردنی ئەو شتەی کە بە شەریکایەتی کڕدراوە). ؛؛ پشکی دەخەین بزانین کێ ئەمڕۆ چێشت ساز کا. ~ **هاویشتن:** بڕ: پشک خستن.

**پشک**[2] (ئا.)[باک] بڕ: سی3

**پشک**[3] (نا.)[؟] ئاوێکی سپییە کاتی هەوەس بزووتن بە جێگای شەرمی ژن دا دێتە خوار (گوڵ چنینەوە ل ٢٦).

**پشکل** (نا.)[باک] بڕ: پشکەڵ

**پشکڵ** (نا.) بڕ: پشکەڵ

**پشکنین** (چا. م)[پەه: شکافتەن. باک: بشکاڤتن ـ ناو: پشکنین ـ هەو: وشکنای] ١ـ هەڵوەژاردنی شوێنێک و گەڕانی هەموو شتێک. ٢ـ دۆزینی سەر و لەش بۆ دیتنەوەی ئەسپێ. ٣ـ دەست لە جل و لەشی کەسێک دان بۆ دیتنەوەی شتێکی شک لێکراو. ٤ـ گەڕان و سەفەری زۆر بۆ دۆزینەوەی مەبەستێک. ؛؛ دونیام زۆر پشکینوە بەڵام لە کچی رووس جوانترم نەدیوە. ٥ـ لێک هەڵوەشاندنەوەی خوری و لۆکە.

**پشکوان** (چا. ل) بڕ: پشکووتن. ؛؛ نەمزانی شکۆفەی گوڵە و وەختی گوڵ پشکوانە/ ئێرە بۆ من میوانییە یان حەفس و حەفسخانە (لاس و خەزاڵ ل ٢٥).

**پشکول** (نا.)[باک] بڕ: پشکەڵ

**پشکۆ** (نا.)[لە: پشکووتن] ١ـ پۆلووی گەشاوەی ئاگر و رەژی، سکڵ، سکەڵ، پەرەنگ. ٢ـ [باک] تین و هاڵاوێک کە لە ئاخر مانگی زستان لە پێشدا لە هەوا و لە دوایی لە ئاو و پاشان لە زەوی پەیدا دەبێ، پلنگ (عەر: جمرة)

**پشکۆژ** (نا.)[لە: پشکووتن] ١ـ غونچە

٢ـ شكۆفه. ٣ـ دوگمه، قۆپچه

**پشکووتن** (چا. ل)[پەهـ: شکۆفتەن. باک: بشکاڤتن ـ ناو: پشکووتن، پشکوان] ١ـ کرانەوەی غونچە. ٢ـ کرانەوەی چاوی منداڵی تازە زاو. ٣ـ لێک بڵاو بوونی قسڵ دوای ئاو پێداکردن. ٤ـ هەڵتۆقینی گەنمەشامی لە سەر ئاگر.

**پشکۆڵ**[1] (نا. ل)[پش3 + کۆڵ] بڕ: پشتکۆڵ

**پشکۆڵ**[2] (نا.) بڕ: پشکەڵ

**پشکووڕ** (ئان. ل)[پش3 + کووڕ] بڕ: کووڕ

**پشکە** (نا. ل)[پش (پووش) + کە]١ـ لاسک و لقی باریکی دار کە پتر بۆ سووتاندن و ئاوردوو خڕی دەکەنەوە، چیلکە. ٢ـ لاسکی گیای وشک. & پوشکە.

**پشکەبەقوونە** (گیان.)[پشکە + بە + قوون + ئە] حەشەرەیەکە، چوار باڵی ناسکی درێژی هەیە، لەشی درێژ و باریک و سەری گەورەترە، لە کاتی هەڵفرین زۆر شێوەی فڕۆکە دەدا، پتر لە دەم چەم و رووباران دەژی و لە سەر زەل و قامیش و گیای نێو ئاو دەنیشێ و لە نێو ئاو دا گەرای دادەنێ، منداڵەکانی لە ئاو دا دەبن و لە دوایی دێنە دەر و دەفڕن، Myrmeleon formicarius ناوی لاتینی ئەم گیاندارەیە، پووشبەقوونە، پووشبەقنگە، پووشکەبەقوونە، پووشکەبەق، زەلەقوونک، تەیارۆکە، تەیارۆک، مۆزگرە.

**تێبینی:** ناوی ئەم حەشەرەیە لە بەر کلکی درێژیەتی کە دەڵێی پشکەیە و دە قوونیان رۆکردوە.

**پشکەڵ** (نا.)[لۆر: پێشکێل ـ فار: پشکل، پشگل ـ تات: مێشکەلە. باک: بشکول، بشقول، پشقول، پشکول، پشقل، پشکل ـ ناو: پشکۆڵ، پشکەڵ، کشپەڵ، پشقل، پشکڵ، قشپل ـ هەو: پشکەڵی ـ زا: پسکە] پیسایی هەندێک گیاندار و ئاژەڵی گیاخۆری وەک بزن و ئاسک و کەروێشک کە خڕ و چووکە.

**پشکەڵی** (نا.)[هەو] بڕ: پشکەڵ

**پشکیل** (نا. ل)[پشک + ئیل] ئەنگوستیلەیەکی بێ نقێم کە لە یاری کاڵەمستێنە دا بە کاری دێنن.

**پشکیلان** (نا. ل)[پشکیل + ئان] گەمەی کەڵەمستێن، بازیەکی شەونشینیە کە ئەنگوستیلە لە باخەڵی

یەکێک دا دەشارنەوە دەستەیتر دەبێ بیدۆزنەوە (هەنبانەبۆرینە ب ١ ل ١١٠)، کاڵەمستێ، کاڵەمستانە، کاڵەمستێنە، کاڵەمشتێ.

**پشم و هۆڕ** (وشد.)[پشم + و + هۆڕ] بڕ: پژم و هۆڕ.

**پشمە** (وشد.) بڕ: پژمە

**پشمەپشم** (وشد.)[پشمە + پشم] بڕ: پژمەپژم

**پشمین** (چا. ل) بڕ: پژمین

**پشــــوو** (نا. ل)[پش1 + ئوو][ناو: پشوو، پشی] ١ـ هەوایەک کە لە دەم دێتە دەرەوە، دەم. ٢ـ وچان. ٣ـ تەحــتــیلی. **~ بڕان:** پشـوو نەهاتنە دەر، خـەفـە بوون. **~ پێهەڵچنین:** ١ـ خەفە کردن، بەری پشوو دانی کەسێک گرتن. ٢ـ زۆر ئـەزیەت کــردنی کــەســێک، زەخت بۆ هـێـنـان. **~ دان:** ١ـ وچان گـــرتـن و حەسانەوە، پشوو گرتن. ٢ـ نەفەس دان، دانە دەری هەوا لە دەم. **~ گـرتن:** بڕ: پشوو دان. **~ لە سەر خۆ بوون:** ئارام و لە سـەرەخـۆ بوون، تووڕە نەبوون. **~ لێبڕین:** بەری پشوودانی کەسێک گرتن، خـەفـە کـردن، پشـوو پێـهـەڵچنین. **~ هاتنەوە بەر:** ئاسوودە بوون، حەسانەوە.

**تێبینی:** پێـویسـتـە ئێشـارەیەکی چووکــە بە جــیــاوازی نێـوان پشــوو و هەناسـە بکردرێ. لە زۆر شوێن دیومـە و بیــســتــوومــە کــە دوو وشــەی پشــوو و هەنـاســـە بە یەک دادەنێن. (بۆ وێنە بڕ: هەنبانە بۆرینە ب ١ ل ١١٠ یا خاڵ ب ١ ل ٢١٩) لە راســـتـی دا ئەم دوو وشـــە دژمـانـای یـەکـتـرن هـەر وەک دوو وشـەی پاش و پێش، سـەر و خـوار یـان سـەدان وێنەی دیکە کە ناکرێ پاش بە پێش مانا بکرێتەوە و هەڵەیەکی زۆر زەقە. هەناسـە هەوایەکە کە هەڵدەمژرێ و دەچێتە نێـو سـیـیـەکانەوە (هەناسـە هەڵدەکێـشرێ) کەچی پشـوو پێچەوانەی ئەوە هەوایەکە کە دێتەوە دەر (پشوو دەدرێ).

**پشــووبڕ** (ئان. ل)[لە: پشـــوو بڕان] حـاڵی کـەسـێـک کـە باش پشـــوو نەدا، پشـــووســـوار. **~ بوون:** باش پشـــوو نەدان، پشوو وەستان، پشووسوار بوون.

**پشوودرێژ** (ئان. ل)[پشوو + درێژ] ١ـ لە ســــەرەخـــۆ، ئارام، هـێـــدی. ٢ـ درێژخـایەن. **~ بوون:** ١ـ لە سـەرەخۆ بوون. ٢ـ درێژخایەن بوون، زۆر کێشان.

**پشــووســوار** (ئان. ل)[پشــوو + ســوار] ١ـ حاڵی کەسێک کە باش پشوو نادا. ٢ـ

تووڕە، قەڵس. **~ بوون:** ١ـ باش پشوو نەدان و لە حاڵی خەفە بوون دا. ٢ـ زۆر تووڕە بوون.

**پشووسواریی** (حم.)[پشووسوار+ ئیی] پشوو باش نەهاتنە دەر لەبەر نەخۆشی، پیریی یا ماندوویەتی.

**پشی**[1] (نا.) ١ـ (گیانـ.) بڕ: پشیلە. ٢ـ (وشد.) وشەی بانگ کردنی پشیلە.

**پشی**[2] (نا. ل)[پش1 + ئی] ١ـ بڕ: پشوو. ٢ـ (ئا.)[زا] بڕ: سی3

**پشی**[3] (نا.)[؟][هەو] کولیچە، نێوساجی. ⁘ لەوێ بەو گەرما و قرچەی نیوەڕۆ/ دانیشە، حەڵوا و پشیی بووک بخۆ (گۆران ل ١٥٢).

**پشی پشی** (نا.)[پشی1 + پشی1] بانگی پشیلە کردن، پش پش. **~ پێکردن:** کەسێک ناز کردن و قسەی نەرم و لووس کردن بۆ جێبەجێ کردنی کار و مەبەستێک، ماستاو کردن، کیسە کێشان.

**پشیک** (گیانـ.)[پشی1 + ک][باک] بڕ: پشیلە

**پشیلۆکە** (گیا.)[پشیلە + ئۆکە] بڕ: پەپوولەپایزە.

**پشیلە** (گیانـ.)[پشی1 + لە][پەش: پیشۆ، پیشی ـ لۆر: پشو ـ گیل: پیچا. ئین: pussy. باک: پشیک، پسیک، پسینگ ـ ناو: پشی، پشیلە ـ زا: پسنگ، پسینگ، پەسینگ، پسیک] ١ـ گیاندارێکی چووکی گۆشتخۆرە، لمبۆز کورت و سمێڵ درێژە، تووکی لەشی نەرم و جنجرووک و چەنگی تیژە، پتر بە شەو گیانداری چووکەی وەک مشک راو دەکا، کێوی و کەوی هەیە، مرۆڤ بۆ راوی مشک رایگرتوە و بە نێرەکەی دەڵێن گورپە. Felis domesticus ناوی لاتینی ئەم گیاندارەیە، کتک، کت، کتە. ٢ـ (مجـ.) سپڵە، بێ سفەت. ٣ـ (مجـ.) کەسێک کە باوەش و خۆ تێهەڵسوون و نازی پێخۆشە. **~ دە دەرپێ هاویشتن:** (کنـ.) بێ ئابڕوو کردن و رسوا کردنی کەسێک. || **پشیلەی پادشا (پاشا):** (کنـ.) بڕ: پشیلەی ماڵە میران. ⁘ وەک پشیلەی پاشا، راست چوومەوە ماڵی حوسێن (چێشتی مجێور ل ٢٠٨). **پشیلەی دەشتیی:** جۆرێک پشیلەی کێوییە کە لە دەشت و کەویر دەژی، Felis ornata ناوی لاتینی ئەم پشیلەیە. **پشیلەی رەجەبە شێتی:** (کنـ.) کەسێک کە زەرەر و زیان لە خەڵک بدا یا

ببێتە هۆی زەرەر و زیان. **پشیلەی ماڵە میران:** (کنـ.) پشیلەی خۆشەویست، پشیلەیەی ماڵ کە جوانیان ئاگا لێبێ، پشیلەی پادشا، پشیلەی پاشا. **پشیلەی کێویی:** جۆری کێویی پشیلەیە، کلکی ئەستووره، رەنگی بۆره و خەتی زەرد پێدا کشاوە، لە ناوچەی کوێستانی دەژی، Felis catus ناوی لاتینی ئەم گیاندارەیە.

**پشیلەپایزە** (گیا.)[پشیلە + پایز + ئە] بڕ: پەپوولەپایزە

**پشیلەسوورە** (نا. ل)[پشیلە + سوور + ئە] جۆرە یارییەکە یەکێک تێ ئەکەوێ، وە ئەوەی تێکەوتوە ئەیگرنە ناو خۆیان، ئەویش تەقەلا ئەدا کە لە ناو لنگیانەوە دەرچێ، ئەمانیش نایەڵن و ئەڵێن: (پشیلەسوورە کوێڕا چوو، عەرزی دڕیی و پیایا چوو) ئەنجا لە ناو لنگی هەر کامێکیانەوە دەرچوو ئەو کەسە تێ ئەکەوێ (خاڵ ب ١ ل ٢٢٠)، پشیلەسوورێ.

**پشیلەسوورێ** (نا. ل)[پشیلە + سوور + ئێ] بڕ: پشیلەسوورە.

**پشیلەشۆر** (ئاک. ل)[پشیلە + شۆر] شوشتنی سەرچڵی جل یا لەش. **~ کردن:** دە ئاو هەڵکێشان و بە ناتەواویی شوشتنی جل یا مرۆڤ.

**پشێویی** (حم.)[لە: شێوان] ئاڵۆزیی، شێواویی، ئاژاوە، پشێوێنی. **~ نانەوە:** ئاژاوە نانەوە، شێواندن.

**پشێوێنی** (حم.) بڕ: پشێویی

**پف** (وشـد.)[ئەرم: پوک ـ فار: پف ـ کرم: پۆف ـ لۆر: پۆف. باک: پف ـ ناو: فوو، پف] ١ـ بایەک کە لە دەم دەری دەکەن بۆ ئاور گەشاندنەوە یا کووژاندنەوەی شەم و کاری دیکە. ٢ـ وشەی دەربڕینی بێزاری لە بۆنی ناخۆش. ⁘ پف لەو بۆگەنە قڕ بووم. ٣ـ (ئان.) هەڵمساوی نێو بۆش و ناپتەو. **~ دان:** فوو تێکردن و هەڵمساندن. فوو دان. **~ کردن:** فوو کردن، فوولێکردن. **~ لە بووڵەمڕ کردن:** (کنـ) کاری بێهوودە کردن، ئاسنی سارد کوتان. **~ هەڵدان:** فوو تێکردن و هەڵمساندنی شتێک، پف دان.

**پفک** (نا. ل)[پف + ک] ١ـ ئامرازێکە بۆ راوی گیانداری بچووکی وەک چۆلەکە کە بریتییە لە قامیش یا دارێکی نێو بۆش کە زیپکە بەردی لە سەر دادەنێن و بە هێزی فوو و دەم دەیهاوێن، تفک. ٢ـ

[باک] ئامـــرازی دەمـــینی کـــورەی ئاسنگەری، پادەم.

**پفکە** (نا. ل)[پف + کـە][ســۆر] بڕ: بلۆق

**تێبینی:** لە فـەرهـەنگی لۆرییش دا پفلک (پۆفێلەک) هەر بەومانایە هاتوە.

**پفڵدان** (نا. ل)[پف + ڵ + دان] بڕ: مسوڵدان

**پفە** (نا.) چێشت بە زمانی منداڵان. ﹕﹕ پفەی دەخۆی رۆڵە گیان!

**پک** (نا.)[؟] لای پشـــتـــەوەی جگ، پشتە. // چک.

**پل**[1] (نا.)[هس: پەل1] کـــوتـێک کـۆشت، پشک، چنچک. || **پل پل:** لەت لەت، کوت کوت. ~ **کردن:** لەت و کوت کردنی گوشت وەها کە هەر کام بە قەرا پلێک بن.

**پل**[2] (نا.)[باک] بڕ: پەڵە

**پل**[3] (نا.)[بڕ: پەل1] ١ـ دەست، پەل. ٢ـ [ئەر] قـــامک، ئەنگوست. ٣ـ [ئەر ـ هەو] چەقـەنە. ٣ـ [ئەر] تاو، خـــوڵ، با، سوڕ. ~ **تەقاندن (تەقانن):** چەقەنە لێـــــدان. ~ **دان:** تاو دان، با دان، سووڕاندن.

**پــلاتـــین** (نــا.)[لات: platinum] فلـزێکی رەنـگ زێوینـە، لـە کـــــان دا دەدۆزرێتـــەوە، لە ١٧٥٠ دەرەجـــە دا دەتوێتەوە، ئەسیدەکان شوێنی لە سەر دانانێن و تەنیا لە تیژاوی سوڵتانی دا دەتوێتەوە، جنسی لە زێڕی زەرد باشترە و پێنج بەرابەر لە زێڕ بەبایەخترە، زێڕی سپی

**پلار**[1] (نا.) بڕ: پللار

**پلار**[2] (نا.)[؟][زا] بڕ: ئاواڵ منداڵ

**پلاژ** (نا.)[فــــەر: plage] بینا و شوێنی ساز کراو لە پەنا دەریا بۆ مەلە و سەیران و رابواردن.

**پلاستیک** (نا.)[یون: plastike] ١ـ ماددەیەک کە لاستیک و شتی دیکە پێکی دێنن و کـەرەســەی لێ ســاز دەکـەن. ٢ـ (ئان.) ماددەیەک کە بە سانایی شێوەی بگۆڕێ.

**پلاســـــما** (نا.)[یون: plasma] ئاوەکییەک کە شەش لە دەی خوێن پێک دێنێ (لە مرۆڤ دا) و گلووبوولی سوور و سپی تێدا مەلەوەرن، خوێناو.

**پلان** (نا.)[فــەر: plan] بەرنامـە بۆ کار و مەسەلەیەک، گەڵاڵە.

**پلپلۆک** (گیانـ.)[زا] بڕ: پەپووله

**پلپله** (نا. ل)[پل1 + پل1 + ئه] کوتی چووکی زێڕ یا زێو کـه به خـشـڵـێکەوه بەند کرابێ یان له دەورەی شتێک درابێ، پڵپڵه.

**پلک** (نا.)[بڕ: پوور] خـوشـکی باوک، پوور

**تێـبـینی:** پلک سـواو و ئاڵوگـۆڕ پێکراوی وشەی پووره. وشـەکه له پێشدا پوورک بوه کـه چووک کـراوی پووره و له دوایی **ئوو** سواوه و **ر** بۆته **ل**.

**پللار** (نا.)[؟] ١ـ داردەست یا کـوتـه دارێک کـــه بـۆ هـاویـشـتن کــەلکی لێـوەردەگـرن، برک، برکـه، کـوڵەبرک. ٢ـ (مـجـ.) تەوس، تانه، لۆمـه. & پلار. ~ **تێگرتن:** ١ـ کوته دار ده میوەی دار گرتن بۆ کـەوتنیـان. ٢ـ کوتـه دار به کـەسـێک دادان. ٣ـ قسـەیەکی به تـوێکڵ و مـانا به کـەسـێک کـوتن بۆ تـەوس و سـەرکـۆنه & برک تێگرتن. ~ **هاویشتن:** ١ـ کـوته دارێک به کـەسـێک یا شـتـێک دادان. ٢ـ (کنـ.) سەرکۆنه لێدان، تەوس تێگرتن. || **پللاری کـوێری:** ١ـ پلاری بێ ئامـانج و نیـشـانـه. ٢ـ (مجـ.) کـار و ئیـشـێکی له سـەر شـانـس و بەخت ئەنجـام دان. ؛؛ پللاری کوێرییه یا دەیگرێ یا نایگرێ. & تیری کوێری

**پلنگ** 1 (نا.)[باک] بڕ: پشکۆ/٢

**پلنگ** 2 (گیانـ.)[باک] بڕ: پڵێنگ

**پلۆخ** (نا.)[؟][باک] سکڵ، بزووت.

**پلوور** 1 (نـا.)[ئەر] ١ـ بـڕ: بـلـوێر. ٢ـ بڕ: پلووسک

**پلوور** 2 (گیانـ.)[؟][باک] بڕ: سمۆره

**پلوورژەن** (ئـان. فـا)[پلـوور1 + ژەن] [ئەر] بڕ: بلوێرژەن

**پلووره** (نا.)[هس: پووره][باک: پلووره ـ نـاو: پلـووره] ١ـ شـــوێنی شـــانـه هەڵبـەسـتنی هـەنگ، خـەڵێف، شـەڵخـه، پێتاگ. ٢ـ [هەو] بڕ: پلووسک

**پلووسک** (نا.)[باک: پلـووسک ـ نـاو: پلووسک، پلوور ـ هەو: پلووره] ئامێرێکی چێـویـی یا کـانزایی نێـو بۆشـه کـه له لێـواری بـان دەگـیـرێ هەتا ئاوی بارانی پێدا بێته خـوار و هەندێک جار لوولەیەکه کـه ئاوی باران له سـەربانـەوه هەتا نزیک زەوی دەهـێـنـێ، لـووس، لووســـاوک، سووڵاوکه، چرک، چرۆنەک، چرتک.

**پله** (نا.)[پەه: پەررەک] ١ـ هەرکـام له دار یا میله چووکەکانی نەردیوان کـه بۆ

چوونە سەر پێی لە سەر دادەنێن، پێپیلکە، پێپلکە، پلیکە. ٢ـ هەر کام لە سەکۆکانی پلەکان، پلیکە. ٣ـ دەرەجە، ئەندازە، رادە. ٤ـ پایە، مەقام، پلە و پایە.

**پلەبەرز** (ئان. ل)[پلە + بەرز] کەسێک کە پلە و پایە و کەسایەتیی کۆمەڵایەتی لە سەرە، پایەبڵند، پایەبەرز. **~ بوون:** پلەی بەرز هەبوون و خاوەن کەسایەتی بوو لە کۆمەڵگا دا، پایەبەرز بوون. **~ کردن:** پلە و پایەی کەسێک بردنە سەر، بەرز کردنەوەی پلە و رادەی کەسێک،پایەبەرز کردن.

**پلەبەرزیی** (حم.)[پلەبەرز + ئیی] پلەی بەرزی کۆمەڵایەتی هەبوون، پایەبەرزیی، پایەبڵندیی.

**پلەکان** (نا.) بڕ: پلیکان

**پلیسرک** (گیان.)[باک ـ باش] بڕ: پەڕەسلێرکە

**پلیسرگ** (گیان.)[ئەر] بڕ: پەڕەسلێرکە

**پلیسیری** (گیان.)[هەو] بڕ: پەڕەسلێرکە

**پلیکان** (نا.)[پەه: پەررەکان. فار: پلکان ـ گیل: پەلتەکۆن، پێلەکان. باک: پێلەکان، پێلووک ـ ناو: پلیکان، پلەکان] هەرکام لە کۆمەڵە سەکۆیەک کە بۆ چوونە سەر و بەرزایی بە شوێن یەک دا داندراون.

**پلیکە** (نا.) پلەی نەردیوان و پلەکان.

**پڵ** (نا.)[بڕ: پەڵە] خاڵ و پەڵەی سەر لەش و پێست.

**پڵاو** (نا.)[تات: پێلا ـ فار: پلو ـ بیر: پەلۆو ـ کرم: پۆلۆو ـ گیل: پەلە، پەلا. باک: پیلاڤ ـ ناو: پڵاو ـ هەو: پڵاو ـ زا: پیلاو] برنجی کوڵاو، پاڵێوراو و دێم کراو و رۆن بە سەر داکراو. (پڵاو لە پەیوەندی دەگەڵ ناوەرۆک یا خۆرشتەکەی چەند جۆری هەیە وەک: سەبزی پڵاو، پڵاوگۆشت، پڵاوخۆریشت، شویت پڵاو، نیسک پڵاو، ... ). **~ خواردن:** (کنـ.) شایی بوون، بەزم و ئاهەنگ و خۆشی هەبوون لە ماڵێک. **~ دان:** (کنـ.) میوانی گەورە دان، شایی کردن، ئاهەنگ گێڕان. ؛؛ کەی ژنێکی دێنی پڵاوێکمان بدەیەی؟ ژنیش ناهێنی پڵاوەکەمان هەر بدەیە.

**پڵاوپاڵا** (نا. ل)[پڵاو + پاڵا2][ئەر] بڕ: پڵاوپاڵێو

**پلاوپاڵێو** (نا. ل)[پلاو + پاڵێو] سوزمە و سەلەی پالاوتنی برینج، برینج پاڵێو، پلاوپالا.

**پلاوخۆران** (نا. ل)[پلاو + خۆر2 + ئان1/٤] رۆژی خۆشیی و شایی.

**پڵپڵە** (نا. ل)[پڵ + پڵ + ئە] بڕ: پلپلە

**پڵتۆخ** (ئان.)[؟] ١- پیس و پۆخڵی، پیسکێر، کارپیس. ٢- شل و شەوێق، خۆنەگرتوو، پڵپ.

**پڵتۆک** (نا.) ١- بڕ: پتە. ٢- بڕ: پەلەپیتکە

**پڵتە** (وشد.) دەنگی هەوا لە دەرپەڕین و دەرکێشانی سەر و زارکی بوتری و شتی لەم بابەتە. ~ **لێهێنان:** ساز کردنی دەنگی پڵتە بە دەرکێشان یا دەرپەڕاندنی زارکی بوتری و شتی لەم بابەتە. ~ **هاتن:** پەیدا بوونی دەنگی پڵتە لە دەرکێشان و دەرپەڕینی زارکی بوتری.

**پڵمە** (وشد.) بڕ: پڕمە

**پڵمەپڵم** (وشد.)[پڵمە + پڵم] بڕ: پڕمەپڕم

**پڵنگ** (گیان.) بڕ: پڵینگ

**پڵۆخ** (نا.) بڕ: پڵیش

**پڵۆخاندنەوە** (چا. م)[لە: پڵۆخ] بڕ: پڵیشاندنەوە

**پڵۆخانەوە** (چا. ل)[لە: پڵۆخ] بڕ: پڵیشانەوە

**پڵۆخاو** (ئان. فا)[لە: پڵۆخانەوە] بڕ: پڵیشاو

**پڵیتە** (نا.)[ئار: پلیتە] ١- تەنراوێکی لۆکەیی باریک و پانە کە بۆ چرا و ئامرازێک کە بە نەفت ئیش دەکەن هەڵدەکێشرێ هەتا نەفت هەڵمژێ و بایسێ. ٢- پەڕۆیەکی لوول دراو کە زوو بۆ پاک کردنەوەی نێو برین و کێم کەلکیان لێوەردەگرت. ٣- چڵکی گرمۆڵە و هەستاوی لەش دوای کیسە لێدان. ٤- ریشاڵی دەرکەوتووی تەنراو. & فتیلە، فتێڵە، پتیلە. ~ **بادان:** ١- بادانی لۆکە و شتی لەم بابەتە بۆ ساز کردنی پڵیتە. ٢- (کنـ.) چڵک هەستاندن لە لەش بە دەست یا کیسە.

**پڵیتەکێش** (نا. ل)[پڵیتە + کێش] دارێکی چووکی لەلەکراو کە بۆ پڵیتە تێهەڵکێشان کەلکیان لێوەردەگرت.

**پڵیخ** (نا.) بڕ: پڵیش

**پڵیخاندنەوە** (چا. م)[لە: پڵیخ] بڕ: پڵیشاندنەوە

**پڵێخانەوە** (چا. ل)[لە: پڵێخ] بڕ: پڵێشانەوە

**پڵێخاو** (ئان. فا)[لە: پڵێخانەوە] بڕ: پڵێشاو

**پڵێش** (نا.) فلچ، پڵێخ، پڵۆخ.

**تێبینی:** پڵێش دەگەڵ وشەی پرژ هاوڕیشەیە بە لەبەر چاو گرتنی ئاڵوگۆڕیی دوو پیتی **ل** و **ر** دەگەڵ یەکتر.

**پڵێشاندنەوە** (چا. م)[لە: پڵێش] پان و فلچ کردنەوە، لە ژێر پێ یا بە قورسایی دیکە پان کردنەوە، پڵێخاندنەوە، پڵۆخاندنەوە.

**پڵێشانەوە** (چا. ل)[لە: پڵێش] پان بوونەوەی شتێک لەبەر قورسایی زۆر، پان و فلچ بوونەوە، پڵێخانەوە، پڵۆخانەوە.

**پڵێشاو** (ئان. فا)[لە: پڵێشانەوە] حاڵی شتێک کە پان و فلچ بووبێتەوە، پلۆخاو، پڵێخاو

**پڵێنگ** (گیان.)[سان: پرداکو ـ پەه: پەلەنگ. باک: پلنگ ـ ناو: پڵێنگ، پڵنگ ـ هەو: پاڵنگ] گیاندارێکی درندەی گۆشتخۆری گەورەیە، پێست ئەستوور و سپییە و خاڵی رەشی لە سەرە و لە ئاسیا و ئافریقا دەژی و چەند جۆری هەیە، زوو لە کوردستان هەبوە بەڵام ئێستاکە ئاسەواری بڕاوە.

**پڵێنگیی** (ئان. ل)[پڵێنگ + ئیی] شێوە رەنگی پنۆک پنۆکی وەک لەشی پڵێنگ.

**پمپار** (گیا.)[؟][باک] بڕ: پرپرە

**پن** (نا.)[؟] ١ـ خاڵ، پەڵە، پنۆک، پنک. ٢ـ (گیان.) جانەوەرێکی چووکی سوورکەلە کە بە ئاژەڵەوە دەنووسێ، قرنوو، زچ.

**پنتک** (نا. ل)[پن + تک] هەندێکی کەم، کەمێک، نەختێک.

**پنتی** (ئان.)[تور: pinti] ١ـ کەسێک کە زۆر گوێ نەداتە پاک و خاوێنیی، پیسکێر. ٢ـ تەمبەڵ و بێکارە

**پنج** (نا.)[بڕ: بنج] ١ـ رەگ و ریشەی گیا، بنج. ٢ـ بنەگیا، پنجاڕ. ٣ـ رەگەز، رەچەڵەک. ⁂ زێباری ... ئەوانە لە پنج و رەگەزی سەعیدن ... (سەعید و میرسێوەدین ل ٢٧٨). ٤ـ مادەیەک کە لە تێکەڵاوی زەردینەی هێلکە یا پیو و قسڵ و لۆکە یا موو ساز دەکردرێ بۆ پینە کردن و گرتنی درز و قەڵشی دەفری گڵێنە و کونی حەوز و شتی لەم بابەتە،

پیدارِوو، پنچ، پەنج. ~ **کردن:** ١ـ پینە کـردن بە پـنج. ٢ـ (کنـ.) چارەسـەریی کـارێک کـردن، حـەل کـردن، جـێـبـەجێ کـردن. & پنـچ کـردن. ~ **لێنان:** پینە لێدان لە دەفر و گرتنی کون بە پنج.

**پنجارِ** (گیا.)[پنج + جارِ] ١ـ بنەگیا، پنچک. ٢ـ [باک ـ زا] ئەو گیایانەی کە بۆ خواردن دەبن.

**پنج و مۆر** (نا. ل)[پنج + و + مۆر] ١ـ پنج، پیدارِوو. ٢ـ (کنـ.) شـات و شـووتی بـە درۆ. ٣ـ یاسـا و زاکـوونی ئیـزن پـێـنـەدانی بـە کـچ بـۆ دەرەوە. ፨ وەرەز بووم لەو ژیان و پنج و مـۆرە/ بە ئازادیی بـژیم تـاوێکی زۆرە (نالەی جـوودایی ل ٦٣). ~ **کـردن:** ١ـ گـرتنی درزی و قـەڵش بە پـنـج و پیـدارِوو. ٢ـ (کنـ.) بەستنەوەی کچ و ئافرەت لە ماڵ و ئیزنی چوونە دەر پێنەدان. ~ **لە خـۆ نان:** (کنـ.) خـۆ بـە گـرینگ و زۆر نواندن و نیشان دان لە لای خەڵک.

**پنچ** (نا.) بڕ: پنج/٣. ~ **کردن:** بڕ: پنج کردن

**پنچک** (گیا.)[پنچ (پنج) + چک] دار و درەختی چووکە کە زۆر لە زەوی بەرز نابنەوە، بنچک، دەوەن.

**پند** (ئا.)[؟][باک] قوون، کونگ.

**پندر** (نا.)[؟] ١ـ چرچ بوونی پێست بە هۆی ئاو، پیـرەڵۆک، پنر، پنگر. ٢ـ کـزر، چـرچ، نـیـــوەویـشـک. ~ **بوونـەوە:** پیرەڵۆک بوون، پنگر بوونەوە.

**پنر** (نا.) بڕ: پندر

**پنک** (نا. ل)[پن + ک] نوقـتـە، خـاڵ، پنۆک.

**پنـک پنـک** (ئان. ل)[پنـک + پنـک] خاڵدار، پنۆک پنۆک.

**پنگ** (گـیـا.)[بەخ: پوودینە ـ کـرم: پوودێنا ـ دەر: پـوودینە ـ فـار: پونە ـ لۆر: پینـە ـ گـیـل: پوتینەک، پوتەنەک. باک: پوونـگ ـ ناو: پنـگ، پنگە، پونگ، پونگە ـ بـاش: پـوونـە ـ هـەو: پووینـە، پـوونـە ـ زا: پونە، پونگ] ١ـ گـیـایـەکی خـۆرِسکی بۆن خـــۆشـــە وەک نـەعـنـا، زۆر هـەڵـنـادا، گـەڵاکـانی بە شکڵی بـەیزی و گـرنی گـرنـیـیـە، زۆرتـر لە جـێی شـێ دار و بە تایبـەت لە دەم جـۆگـە دەرِوێ، بە کـاڵی دەخـوریێ و دەگـەڵ هـەنـدێک چـێـشـت و خـواردنـیش لێ دەندرێ. بـۆ ئـەعـسـاب و زگ چوون و هـەزمی خواردەمەنی باشە و بۆ دەرمـان و سـابوون سـاز کـردنیش کـەلکی لێـوەردەگـرن، Mentha pu-

legium ناوی عیلمی ئەم گیایەیە. ٢ـ (کنـ.) کەم، هیچ، بێ بایەخ. ⁂ بۆ دەنا پنگم نامبەنە شایی. **بە ~ دانان:** بە کەم گرتن و بە هیچ دانانی کەسێک. ⁂ پیاوی خوێڕی وا بە پنگیشی دانانێم.

**پنگر** 1 (نا.) بڕ: پەنگر

**پنگر** 2 (نا.) بڕ: پندر. **~ بوونەوە:** بڕ: پندر بوونەوە.

**پنگرکێش** (نا. ل)[پنگر1+ کێش] ئاسنێکی هەندێک درێژە وەک ئەستێوڵک کە سەری خوار کراوەتەوە و دەسکێکی چێوی هەیە بۆ راکێشان و دەردانی پۆلووی ئاگر و خۆڵەمێش لە سۆبە.

**پنگل** (نا.)[باک] بڕ: پەنگر

**پنگە** (گیا.) بڕ: پنگ

**پنۆ** (نا.) بڕ: پەڵە

**پنۆک** (نا. ل)[پن + ئۆک] خاڵی پان و چووکی سەر لەش و پێستی مرۆڤ یا گیاندار، پنۆ پەڵە.

**پنۆک پنۆک** (ئان. ل)[پنۆک + پنۆک] پەڵە پەڵە، خاڵدار، پنک پنک.

**پنە** (نا.)[باک: پنە ـ ناو: پنە ـ هەو: پنێ] تەختەیەکی پانی چوارگۆشی لێک و لووسە لە نانەواخانە یا ئەو شوێنانەی کار بە هەویر دەکەن، ئەنگوتکی لە سەر پان دەکەنەوە، پێشخوان/٢، دەرخوون، خوان.

**تێبینی:** من پێموایە ئەم وشە هەر لە پان کەوتوە، بەڵام بۆچی نەبۆتە پانە یا پانکە نازانم.

**پنی** (نا.)[باک] ١ـ بڕ: پەڵە. ٢ـ بڕ: پینە

**پنیکەر** (ئان. ل)[پنی + کەر3][باک] بڕ: پینەچی

**پنێ** (نا.)[هەو] بڕ: پنە

**پواز** (نا.)[ناو: پواز ـ هەو: پواز] سنگێکی چووکە لە دار یا ئاسن کە لە کاتی قەڵەشاندنی دار دە نێوی دەنێن هەتا یەک نەگرێتەوە، هۆرە. **دار بە ~ی خۆ قەڵەشین:** (کنـ.) تێشکان و فەوتان بە دەست کەسی نزیکەوە.

**تێبینی:** پغاز (پەغاز) و براز (بەراز) لە فەرهەنگەکانی فارسیش دا هەر بەم مانایە هاتوون.

**پوازناو** (نا. ل)[پواز + ناو2] بڕ: پازناو

**پوان** (چا. ل)[ئەو: پەڤ] تێکچوون و لێک هەڵوەشانەوەی تان و پۆی شتێک

لەبەر تێپەڕینی زەمان، پەڕپووت بوون، رزان، رزین.

**پوار** (نا.)[لە: پوان] زۆر رزیو، پۆ.

**پوارتک** (نا. ل)[پوار + تک] دەروون و رزیوی دار و دروختی هلۆڵ.

**پواو** (نا. مف)[لە: پوان] هەرچی کە رزیبێ، رزیو، پەڕپووت.

**پوچ**[1] (ئان.)[زا] بڕ: پووچ1

**پوچ**[2] (نا.)[؟][زا] گـــۆرەوی، پووچ، پوچک، پونج.

**پـوچـک** (نـا. ل)[پـوچ2 + ک][زا] گۆروا، گۆرەوی، پووچ، پوچ.

**پوخت** (نا. چا)[فار: پخت (پۆخت) لە: پختن (پۆخـتـەن)] ١ـ تێگەیشـتـوو، بە ئەزموون. ٢ـ ژن یا پیاوی بە ئەزموون و پێگەیشـتـوو. ٣ـ رێکوپێک و خـاوێن. ٤ـ تەواو، لەبار، بێ کـــەمـــوکـــووڕیی، پوخـتـە. **~ بوون**: ١ـ تێگەیشـتن و بە ئەزمـــوون بـوون. ٢ـ رێکوپێک و خـــاوێن بوون. ٣ـ بێ کەموکووڕیی بوون، پوختە بوون، کامل بوون. ⁂ ئەم پارچە شێعرە لە چاو سەنعەتی شیعرییەوە زۆر پوخت نیە (چەپکێ گوڵ ل ٥٤). **~ کردن**: ١ـ پێگەیانـدن، باش پەروەردە کـــــردن و بارهێنان. ٢ـ رێکوپێک ئەنجـــام دانی کارێک.

**پوخت و پاراو** (ئان. ل)[پوخت + و + پاراو] ژنی پاک و رێکوپێک و مـــاڵدار. **~ بوون**: رێکوپێک و ماڵدار بوون.

**پوخـتـە** (نا. مـف.)[فـار: پخـتـە] ١ـ گـەیشـتـوو، گـەییـو، پێگەیشـتـوو، بە ئەزمـــوون. ⁂ ئەو زولفـــە دووتـایە چ تەلیـسـمـێکە چ دامـە/ سـووتاوە ئەوی پوختـەیە بەو عەنبەرە خـامـە (وەفـایی ل ١٣٥). ٢ـ تـــەواو، لـــەبـــار، بـــێ کەموکووڕیی. **~ بوون**: ١ـ پێگـەیشتن و کـــــامل بوون. ٢ـ پڕ و تـەواو بـوون، رێکوپێک و بێ کـەمـوکـووڕیی بوون. ⁂ شـێـعـرەکـانم پـوخـتـە نەبوون، لاسـای شـاعـیـرە کـۆنەکـانم کـردبـۆوە (تاریک و روون ل ١٥). **~ کـــردن**: پـێگـەیانـدن، کـــامـل کـــردن. ٢ـ ســـاز کـــردن بـێ کـەمـوکـووڕیی، تەواو و رێکوپێک کـردن. ⁂ بریـا کلـێک بـام لە کن ســوبحــانی/ پوختـەیان کردبام لـە کن لوقمـانی (گـەنج ل ٦). || **پوخـتـەی قـسـە**: سـەرجـەم و خولاسـەی قسـە و رووداو و کارەسـاتێک. ⁂ پوخـتـەی قسـەکانتم پێبـڵێ با بزانم دەڵێی چی.

**پوش** (نا.)[بڕ: پووش][زا] گەڵا

**پوشکە** (نا.)[پوش + کە] بڕ: پشکە

**پونج** (نا.)[زا] بڕ: پوچ2

**پونگ** (گیا.) بڕ: پنگ

**پونگە** (گیا.) بڕ: پنگ

**پونە** (گیا.)[زا] بڕ: پنگ

**پویل** (نا.)[باش] بڕ: پووڵ

**پۆ**1 (نا.)[تەب: پێ ـ ماز: پی ـ فار: پوود ـ کرم: پو، پوە. ناو: پۆ ـ هەو: پۆ] ١ـ تاڵی هەر تەنراوەیەک کە بە لای پانایی دا هاتبێتەوە. // تان، رایەڵ. ٢ـ لکی باریکی دار، لک و پۆ. ٣ـ پەڕ، پەڕ و پۆ.

**پۆ**2 (نا.)[لە: پوان] رزیو، پەڕپووت، پوار.

**پۆپ** (نا.)[بڕ: پۆڕ2] ١ـ پۆپەی کەڵەباب. ٢ـ تووکی سەر، پۆڕ.

**پۆپکە** (نا. ل)[پۆپ + کە] ١ـ دوندی کێو، ترۆپک، پۆپە. ٢ـ پلە گۆشتی قیت و سووری سەری کەڵەباب، پۆپە، پۆپیتە، پۆپنە. ٣ـ هەندێک تووکی زێدە و قیت لە سەر مریشک یا پەلەوەری دیکە، پۆپنە. ٤ـ سەری سیرەتی پیاو، زۆپکە.

**پۆپن** (ئان. ل)[پۆپ + ن] مەلی کاکۆڵدار، پۆپنەکی، پۆپنە.

**پۆپنە** (نا. ل)[پۆپ + ن + ە] ١ـ پلە گۆشتی سووری سەر کەڵەباب و قەلەموونە و باڵندەی دیکە، پۆپە، پۆپیتە، پۆپکە. ٢ـ هەندێک تووکی زێدە و قیت لە سەر مریشک یا پەلەوەری دیکە، کاکۆڵی مەل، پۆپکە. ٣ـ مەلی کاکۆڵدار، پۆپن، پۆپنەکی. || **پۆپنە بە گوو:** (کنـ.) پیاوی خوێڕی و هیچ و پووچ.

**پۆپنە کەڵەشێرە** (گیا.)[پۆپنە + کەڵەشێر + ە] بڕ: پۆپەکەڵەشێرە

**پۆپنەکی** (ئان. ل)[پۆپنە + ک + ئی] مەلی سەربەقیتکە و کاکۆڵدار، پۆپن. ⁙ چورەپۆپنەکی

**پۆپە** (نا. ل)[پۆپ + ە] بڕ: پۆپکە

**پۆپەرەشە** (نا. ل)[پۆپە + رەشە] دەردێکە ئەگا بە کەڵەشێر و مریشک، پۆپنەی رەش هەڵئەگێرێ و ئەیکوژێ (خاڵ ب ١ ل ٢٢٤).

**پۆپەژمین** (نا. ل)[پۆ 1+ پەژم (پەشم) + ئین] بڕ: پۆپەشمین

**پۆپەشمین** (نا. ل)[پۆ1+ پەشمین] پێخەفێکی تەنک کە لە خوری سازی

دەکەن، پۆپەژمین.

**پۆپەکـەڵەشـێـرە** (گـیـا.)[پـۆپە + کـەڵەشـێر + ئە] گـیـایەکی یەکسـاڵەیە، هەتا نیو گەز هەڵدەدا، گوڵێکی سوور کە شـێوەی پۆپەی کـەڵەباب دەدا، دەکا هەر بـۆیـە ئـەم نـاوەی لـێـنـراوە. Am-aranthus ناوی لاتینی ئەم گـیـایەیە، پۆپنەکەڵەشێرە، تاج خرووس.

**پۆپیـتـە** (نا. ل)[پـۆپ + ئیـتـە] بڕ: پۆپکە/٢.

**پۆت** (نا.)[ئەو: پـووئیـتی، پەهـ: پووت، پـووتەک. تـەب: پیت ـ کـرم: پـووت، پیت (پـووک). نـاو: پـۆت، پووت، پـۆتـە، پـۆتـین] ١ـ رزیو، پـۆ. ٢ـ خـۆڵـی زۆر ورد، خـۆڵە پـۆتـە. ∷ دەنگـۆ لـەبـۆم بڵـێـنـەوە بـە سـوێسنـێ، هـەلاڵـێ، بەیبـوونـێ/ دەبڵا سەری خۆ بێنێتە دەرێ لە خۆڵێ لە پۆتێ (پایزە ل ٥٩). ٣ـ پووچ، پـووچەڵ، پـووک. ٤ـ چرچ، لۆچ.

**تێبـینی:** پۆت و هاوتاکانی لە چاوگی پەڤ pav ـ ی ئـەوێسـتـایی و پـوان و پۆرتکان ـ ی کـوردیی بە مـانـای رزان کەوتوون.

**پـۆتـراک** (نـا. ل)[نـاو: پـۆتـراک، پـۆتەراک، پۆتلاک، پـۆتـەلاک] سـەر و گوێلاکی مرۆڤ، سەروسەکوت.

**پۆتک** (نا.)[باک] پەڕۆ

**پۆتلاک** (نا. ل) بڕ: پۆتراک

**پۆتە** (نا. ل)[پۆت + ئە] بڕ: پۆت

**پۆتەراک** (نا. ل) بڕ: پۆتراک

**پۆتەلاک** (نا. ل) بڕ: پۆتراک

**پۆتین**[1] (نا. ل)[پۆت + ئین] بڕ: پۆت

**پۆتین**[2] (نا.)[فەر: bottine] جۆرێک کەوشی چەرمە، لاسکی هەتا سەرەوەی گوێزینگ دێ و قایمە.

**پۆخ**[1] (نا.)[؟] گـۆپکەی دار و درەخت بەر لە پشکووتن، چرۆ، پۆخک. ٢ـ [ئەر] بنـی برین، ریشـەی کـوان، پـۆرتـخ، پۆرتخە.

**پۆخ**[2] (نا.)[تور: پۆخ] پیسایی مرۆڤ، گـوو. **~ دەر کـەوتن:** (کنـ.) ئاشکرا بوونی کارێکی نالەبار، گەند هاتنە دەر.

**پـۆخـک** (نـا. ل)[پـۆخ1 + ک][باک] غونچە، چرۆ، گۆپکە.

**پۆخڵ** (ئان. ل)[پۆخ2 + ڵ] مـرۆڤی پیس و چڵکن، پیسکێر، پۆخڵی، پەڵۆخ.

**پۆخـڵـە** (نا. ل)[پۆخ1 + ڵە] بڕ: پۆرتخە

**پۆخـڵـەوات** (ئان. ل)[پۆخڵ + ئە + وات] ١ـ شتی پیس و بێ کەلک. ٢ـ کاری بێنرخ و قۆڕ.

**پۆخڵی** (ئان. ل)[پۆخ2 + ڵی] چڵکن و پیس، پیسکێر، پۆخڵ.

**پۆخین** (نا. ل)[پۆخ1 + ئین] ئاردی گەنمی بۆدراو، قاوت.

**پۆڕ**[1] (نا.)[باک] بڕ: پۆڕ1

**پۆڕ**[2] (نا.)[باک ـ زا] بڕ: پۆڕ2

**پۆڕا** (نا.)[سۆر] بڕ: پۆڵا

**پۆرت** (نا.)[لە: پۆرتکان] بەشێکی زۆر کەم لە شتێک، پرتک، پرتکە.

**پۆرتخ** (نا.)[ئەر] بڕ: پۆرتخە

**پۆرتخـە** (نا. ل)[پۆرتخ + ئە] بن و ریشەی برین و کوان، پۆخ، پۆخڵە، پۆرتخ

**پۆرترە** (نا.)[فەر: portrait] وێنە و نەققاشی روخساری مرۆڤ.

**پۆرتـک** (نا. ل)[پۆرت؟ + ک][ئەر] کڵاو و دەسماڵی ژنان.

**پۆرتکان** (چا. ل)[ئەو: پەڤ] رزین و تێکچوون و لێک هەڵوەشانەوەی تان و پۆی شتێک لەبەر تێپەڕینی زەمان، پەڕپووت بوون، رزان، رزین، پوان.

**پورتکاو** (ئان.)[لە: پۆرتکان] رزیو، پواو، پەڕپووت.

**پۆرخـز** (ئان.) ١ـ زل، زەلام، قەبە. ٢ـ خـوێڕیی و بێکارە، هیچ و پووچ. ٣ـ گیانداری لاساری مانگر.

**تێبینی:** هاوڕیشەی ئەم وشەیە لە فەرهەنگەکانی زمانی فارسی دا بە شێوەی پرخش (پەرەخش) فرخج (فەرەخج) بە مانای ناحەز و کرێت و چەپەڵ هاتوە.

**پۆرگ** (نا.)[هس: پرگ] ١ـ هەوا کە بە شکڵی گۆیەک لە کەفی سابوون پەیدا دەبێ، پەقک. ٢ـ نیوەگۆیەک کە بە هۆی باران لە سەر ئاو پەیدا دەبێ، بڵق. ٣ـ گۆیەک کە لە مرۆڤ بە فوو لە بنێشتی نێو زاری یا بە تف سازی دەکا و دەیتەقێنێ. ٤ـ چڵمی هەڵتۆقیوی سەر تفنک. ٥ـ نێرکی دوومەڵ و کوان. ٦ـ بەرگی خونچەی گوڵی نەپشکووتوو (خاڵ ب ١ ل ٢٢٥). ٧ـ قەباغی چەڵتووک و پەرشت (کشت و کاڵ ب ١ ل ٦٥). ‖ **پۆرگی چاو:** پێڵوو. ⁘ ئەبرۆت کەمەندی لە من کێشاوە وەکوو تیژەپەڕی رەشەداڵی/ سێ ڕێز لە پشتی پۆرگی

چاوت خـوار و جـووت بوون، پیـرۆزەییـە خاڵی (لاس و خەزاڵ ل ١٢٣).

**پۆڕ**[1] (گـیـانـ.)[پەھ: پۆر. بـاک: پۆر ـ ناو: پۆڕ ـ هـەو: پۆڕ] باڵندەیەکە لە کـەو گەورەتر و قەڵەوتر، پەڕەکانی خاڵی رەش و سپی تێدایە و گۆشتی زۆر خۆشە. (لە فۆلکلۆر و ئەدەبیاتی کلاسیکی کوردیی دا رویشتنی بە کەشم و نەشمی ژن بە رەوتی پۆڕ دەشوبهێنن)، Francolinus ناوی لاتینی ئەم مەلەیە، زێوەکەو، پۆڕی بەڵەک. || **پۆڕی بەڵەک:** پۆڕ. ⁘ کـوتـی کیژێ ئەتۆ پۆڕی بەڵەکی ئەمن شەهێنم/ هەچەند دەکەم دڵم نایە بێم ئەگەر بتـژاکێنم (لاس و خەزاڵ ل ٨٦). پۆڕی بەڵەک قـەراری ئەوەیە: باڵێک دەفـرێ و دواباڵ لەنگەری باڵی رادەگرێ (شـێخ فەرخ ل ١٤٢).

**پۆڕ**[2] (نا.)[لۆر: پوپ (پۆپەی کەڵەباب و کاکۆڵ). باک: پۆر ـ ناو: پـۆپ، پۆڕ ـ زا: پۆر، پۆڕ] تووکی سەر، مووی سەر. ⁘ کەر بە جل و جۆڕ/ ژن بە سەر و پۆڕ (فۆلکلۆر ل ٩٥).

**پۆڕ**[3] (ئان.)[هس: پر] ١ـ دەگەڵ وشەی پان دێ و مانای بەرین و هەراو دەدا. ⁘ پـان و پـۆڕ. ٢ـ [ئەر] چـڕ، چڕوپڕ.

**پـۆز**[1] (ئا.)[پەھ: پـووز، پـووزەک، پۆزەک. پەش: پۆزە ـ فار: پوزە ـ کرم: پوزە. باک: پۆز ـ ناو: پۆز، پۆزە، لمبۆز، قەپۆز ـ زا: پۆزە] ١ـ کەپۆ، لووت، قەپۆز. ٢ـ دەم و لەوس. ٣ـ لمبۆزی حەیوان، پۆزە، لمۆز، قەپۆز. ٤ـ زەنبوورەی ئاش، پووزکە.

**پۆز**[2] (نا.)[فەر: pose] ١ـ سەر و سەکوت و بیچمی رواڵەت. ٢ـ فیز، دەعێ، بەرزەلووت. . **بە ~ بوون:** بە دەعێ بوون، بە فیز بوون. ⁘ ماوەیەکە بە پۆز بووی و سەرمان لێنادەی! **~ دان:** قیافە گرتن بە کەسێک یا شتێکەوە، پۆز لێدان. **~ لە سەر لێدان:** خۆ لە کەسێک زیادتر زانین و خۆ گرتن، لووت لە حەوا کردن و بە لای کەسێک دا تێپەڕین. **~ لێدان:** قیافە گرتن بە کەسێک یا بە شتێکەوە، پۆز دان.

**پۆزمک** (نا. ل)[پۆز1 + مک][باک] ١ـ بڕ: بزمک. ٢ـ [زا] لووتەوانە، خەزێم.

**پۆزە** (ئا.)[بڕ: پۆز1] ١ـ دم و لووتی حەیوان، پۆز، لمبۆز. ٢ـ [زا] کەپۆ، لووت.

**پۆزەبەن** (نا. ل)[پۆزە + بەن] زاربێنی بێچووی ئاژەڵ، دمبێن.

**پۆزەخووگە** (گیا.)[پۆزە + خووگ + ئە] یەکێک لە بەرەکانی دارمازوو (کشت و کاڵ ب ١ ل ٦٦). جۆرێکە لە بەری دارمازوو وەک لمۆزی بەراز وایە (خاڵ ب ١ ل ٢٢٥).

**پۆزەوانە** (نا. ل)[پۆزە + وانە] ئاڵقەیەک کە لە لووتی حەیوانی دەکەن.

**پۆس** (نا.)[هەو ـ ئەر] بڕ: پۆست

**پۆست**[1] (نا.)[باک ـ هەو ـ ئەر][ بڕ: پێست] ١ـ پێست. ٢ـ توێکڵ. ٣ـ چەرم. ٤ـ کەوڵ. **~ کردن:** ١ـ کەوڵ کردن ٢ـ توێکڵ کردن، توێکڵ لێکردنەوە. **~ کەندن:** کەوڵ کردن. **~ کرتنەوە:** بڕ: کەوڵ کردن.

**پۆست**[2] (نا.)[لهستانی: poczta لە لات: positus] ١ـ جۆرێک کەرەسەی پەیوەندی گشتییە کە دەوڵەت هەڵیدەسوورێنێ، یانەیەکە کە بەستە یا نامەکانی نووسراو و تەمر لێدراوی خەڵک بۆ ئادرێسێکی کە لە پشت پاکەت نووسراوە دەگەیەنێ، پۆستە. ٢ـ سندووقێکە سەر بە یانەی پۆست کە لە شەقام و شوێنی دیکەی شار دادەندرێ و خەڵک خۆی تەمر لە نامەکەی دەدا و لەو سندووقانەی داوێ، سندووقی پۆست. ٣ـ بنکەی پاسەوان و نیگەهبان، پاسگا. ٤ـ نیگەهبانیی، کێشک، پاس. ٥ـ مەنزڵ و قۆناغ. ٦ـ پلە و دەستەڵات و بەرپرسیی لە یانە و دەزگاکان. **~ کردن:** ١ـ بەڕێ کردنی نامە بە پۆست دا. ٢ـ (کنـ.) لە خۆ دوور خستنەوەی کەسێک، خۆ لە دەست کەسێک یا شتێک رزگار کردن، دە قۆچەقانی نان. || **پۆستی زەوینی:** بار و پۆستێک کە بە رێگای زەوی دا بە بەڕێ بکردرێ و هەرزانترە لە پۆستی هەوایی. **پۆستی هەوایی:** بار و بەستە و نامەیەک کە بە فرۆکە بەڕێ بکردرێ. **پۆستی ئەلەکترۆنی:** نامە و پۆست بە ئینترنیەت.

**پۆستچی** (نا. ل، ئان. ل)[پۆست2 + چی] کەسێک کە نامە و بەستەی پۆست کراو بۆ ناو و نیشانی سەر پاکەت دەبا، نامەبەر، پۆستەچی.

**پۆستخانە** (نا. ل)[پۆست2 + خانە] یانەی پۆست، ئەو شوێنەی کە خەڵک بەستە یا نامەکەی لێ پۆست دەکا، پۆستەخانە.

**پۆستە**[1] (نا.)[ئەو: پەستە][زا] بڕ: پێست

**پۆستە**[2] (نا.) بڕ: پۆست2

**پۆستەچی** (ئان. ل، نا. ل)[پۆستە2 + ئە + چی] بڕ: پۆستچی

**پۆستەخانە** (نا. ل)[پۆستە2 + خانە] بڕ: پۆستخانە

**پۆسک** (نا.)[هس: پزوو] ١ـ کونی خوارەوەی دۆلاش. ٢ـ (مجـ.) قوون، کونگ.

**پۆسکە** (نا. ل)[پۆسک + ئە] ١ـ گلۆوێنەی تەندوور. ٢ـ کونی خەڵێف کە مێش هەنگوێن هاتوچۆی پێدا دەکەن.

**پۆسین** (نا. ل)[پۆس + ئین][ئەر] جلی ساز کراو لە کەوڵی حەیوان، کەوڵ، کەوڵپۆس.

**پۆش** 1 (پاشگـ.) لە رەگی پۆشین دەکەوێ و لە وشەی لێکدراو دا: ١ـ مانای پۆشەر دەدا. ‡ رەشپۆش، کەواپۆش. ٢ـ مانای داپۆشەر دەدا. ‡ سەرپۆش، رووپۆش. ٣ـ مانای شاراوە دەدا. ‡ خەتاپۆش، عەیبپۆش.

**پۆش** 2 (ئان.)[باک: پۆش ـ ناو: پۆش، پۆشە] بزنی رەشی گوێ سپی.

**تێبینی:** پۆش دەگەڵ وشەی بەش و قەشان یەک ریشەیان هەیە (بڕ: بەش) تۆفیق وەهبی و فەرهەنگی کشت و کاڵ و فەرهەنگی ئیزۆلی بە بزنی رەشی گوێ سپییان نووسیوە و لە هەنبانە بۆرینە دا بە بزنی سپی گوێ رەش و لە گوڵ چنینەوە دا بە بزنی گوێ پنۆک پنۆک رەش و سپی تێکەڵ، نووسراون. هەروەتر لە راوێژی بیرجەندیی دا پەدیس بە مانای بزن یا گیسکی گوێ پنۆک پنۆکی سپی لەم ریشەیە.

**پۆشاک** (نا. ل)[پۆش1 + ئاک] هەرشتێک بۆ پۆشین و دەبەر کردن دەست بدا، جل و بەرگ، لیباس، پۆشەن.

**پۆشاکخانە** (نا. ل)[پۆشاک + خانە] شوێنێک کە پۆشاک و جلی لێدادەنێن، ژووری پۆشاک. ‡ هەمزەچاوەش بەرنە پۆشاکخانەی، دەستێ بەرگی نوێی لەبەر کەن (دمدم ل ٦٣).

**پۆشتە** 1 (ئان. ل)[لە: پۆشین1] ١ـ کەسێک کە جل و بەرگی باش و سازی دەبەر دایە. ٢ـ کەسی بە ئیروو و ساز و بەکەیف. & کۆک و پۆشتە، پۆشتە و پەرداخ. **~ کردنەوە:** ١ـ جلی کۆن فڕێ دان و خۆ نوێ کردنەوە بە جلی تازە. ٢ـ ساز و بە کەیف کردنی کەسێک لە باری مادیەوە.

**پۆشتە** 2 (نا.)[زا] بڕ: پشت1

**پۆشته و پەرداخ** (ئان. ل)[پۆشته1 + و + پەرداخ] پۆشته، کۆک و پۆشته.

**پۆشتی** (نا.)[زا] بڕ: پشت1

**پۆشـــران** (چا. ل)[لە: پـۆشـین] دەبـەر کران.

**پۆشـــــمـــــان** (ئان.)[باک ـ زا] بـڕ: پەشیمان

**پۆشە** (ئان.) بڕ: پۆش2. ⁘ هەم بوو، نەم بوو، چەند قـۆشـــە/ دام بە بزنێکی پۆشـە/ گۆتمە یارێ بیدۆشە (فۆلکلۆر ل ١١٨).

**پۆشـــەن** (نا. ل)[پـۆش1 + ئەن] بـڕ: پۆشاک

**پۆشەنی** (ئان. ل)[پۆشـەن + ئی] هـەر شتێک کە شیاوی پۆشین بێ.

**پۆشی**[1] (نا. ل)[پـۆش (پووش) + ئی] [باک] بڕ: پووشوو

**پـۆشـی**[2] (نـا. ل)[پـۆش1 + ئـی] بـڕ: پۆشـین2. ⁘ لە دوور دیارە پۆشـییـەکەی سـۆرە/ یان یاری خـۆمـە یان زەینم کـۆرە (فۆلکلۆر ل ١٠١).

**پۆشیمان** (ئان.)[باک] بڕ: پەشیمان

**پۆشین**[1] (چا. م)[پەه: پۆشـیتـەن] ١ـ دەبـەرکـــردنی جـل و بەرگ. ٢ـ پـارچە یـا هـەر شـتێک بە سـەر شـتێکی دیکە دادان، داپۆشـین. ٣ـ شـــاردنـەوە، قـــایم کـــردن، داپۆشـین. ⁘ ئـەم ســــیــــارۆزیـی منـە پۆشـیـوییـە عـەیبی کـەسـان/ ئـاشکارە ســەتری ئەحــواڵی گــونەهکارانە شــەو (مەحوی ل ٢٥٧).

**پـــۆشــین**[2] (نــا. ل)[پــۆش1 + ئـین] سەرپۆشێکی رەشی ژنانە کە بە خشڵ و پـووڵەکـــەی دەیرازێننـەوە و لـە ســـەری دەبەسـتن، پۆشـی، پووشـین. ⁘ هـەوەڵ لە داخت، دووهـەم لە قینت/ خـۆم دەخنکێنم بە لکی پۆشینت (کانی مرادان ل ١٢٥).

**پۆشین پێچ** (نا. ل)[پـۆشـین2 + پێچ] خشڵی سەرپێچ و پۆشـین، پووشـین پێچ.

**پۆغـە** (گـیـانـ.)[هس: بۆغـە] نەوەنی نەخـــەســاو (کـشت و کـاڵ ب ١ ل ٦٦) گوێرەکەی نەخەساو (خاڵ ب ١ ل ٢٢٦).

**پۆک** (ئا.)[باک] بڕ: پووک1

**پۆکـە** (وشـد.) دەنگی نـزمـی گـریان، پووکـە، نـووکـە. **~ کـردن:** گـریـان بە نزمی، نووکە کردن.

**پۆکـەپۆک** (وشـد.)[پووکـە + پووک] دەنگی پەیتــاپـەیتــای گـریـان بە نـزمی، نووکـەنووک،، پـووکـەپووک. **~ کـردن:**

گریان بە نزمی و بەردەوام، نووکەنووک کردن.

**پۆکەر** (نا.) بڕ: پۆکێر

**پۆکێــر** (نا.)[ئین: poker] جۆرێک قومار بە پەڕ، پۆکەر.

**پۆل**[1] (نا.)[ناو: پۆل ـ هەو: پۆل] ١ـ کۆمەڵ و دەستە. ‌‌:: پۆلێک کچ، پۆلەدارێک، پۆلێک شیلان. ٢ـ دەستەیەک باڵندە پێکەوە. :: پۆلێک قورینگ. ٣ـ کۆمەڵێک خوێندەوار لە کلاسێک دا، کلاس. ٤ـ ساڵی دەرسی. :: پۆلی سێهەم،. ٥ـ بەشێک لە چەند ساڵی دابەش کراوی خوێندن. :: پۆلی سەرەتایی، پۆلی ناوەندیی. ٦ـ پشکۆ، پۆلوو. ~ **بەستن:** ١ـ لێک کۆ بوونەوە بە کۆمەڵ و دەستە، ئاپوورە دان. :: داعبای کێویی پۆلیان دەبەست، تەگبیریان دەکرد (گەنج ل ٢٨١). ٢ـ لێک کۆ بوونەوەی دەستەیەک باڵندە و تێگرا فڕینیان بۆ کۆچ یا بۆ شوێنێکی دیکە. :: باز و پۆڕ پۆلیان بەستووە/ سەرسەوزێکیان پێشڕەوە (کانی مرادان ل ٨٩). || **پۆل بە پۆل:** چەند پۆل پێکەوە، دەستەدەستە، پۆل پۆل. :: لە قریوەی شوان و بێریان، لە دەنگی مەڕ و ماڵی/ پۆل بە پۆل دێنە خواریّ، بێری برایم جەلالّی (کانی مرادان ل ٩٢). **پۆل پۆل:** دەستە دەستە، کۆمەڵ کۆمەڵ، چەند پۆل پێکەوە، پۆل بە پۆل. :: پۆل پۆل ژن و پیاو لە دووی کەر و بار/ سلاوێک ئەکەن مل ئەنێن بۆ شار (گۆران ل ١٣٨).

**تێبینی:** پۆل لە ریشەی پێرێنا ـ ی ئەوێستایی و پڕ ـ ی کوردیی کەوتوە بە مانای زۆر.

**پۆل**[2] (ئا.)[باک ـ زا] بڕ: پیل1

**پۆل**[3] (نا.)[باک] ١ـ بڕ: پووڵ. ٢ـ بڕ: پوول

**پۆلا** (نا.)[باک ـ زا] بڕ: پۆڵا

**پۆلات** (نا.)[باک ـ زا] بڕ: پۆڵا

**پۆلاد** (نا.)[زا] بڕ: پۆڵا

**پۆلان** (نا. ل)[پۆل + ئان][باک: پۆلان ـ ناو: پۆلان] سێهەم مانگی زستان، ڕەشەمە.

**پۆلک** (نا.)[باک] بڕ: پۆڵکە

**پۆلوو** (نا. ل)[پۆل + ئوو] پشکۆی گەشاوەی ئاگر و ڕەژی، سکڵ، سکەڵ، پەرەنگ.

**پـۆلـیــس** (نـا.)[ئـال: polizei] ١ـ یانەیەک کـە ئەرکی پاراسـتنی گـیـان و مـاڵی خـەڵکی نێو شـاری بە دەسـتـەوەیە، پۆلیسـخـانە. ٢ـ هـەر کـام لەو کـەسـانەی کە لە یانەی پۆلیس کار دەکەن.

**پۆلیسخـانە** (نا. ل)[پۆلیس + خـانە] یانەی پۆلیس.

**پۆلا** (نا.)[پەه: پولاود، پولاد، پۆلاپەت، پـۆلاوت، پـۆلات، پـوولاد، فـــوولاد. بـاک: پۆلا، پۆلات ـ ناو: پـۆلا، پۆرا ـ هەو: پۆلا ـ زا: پــۆلا، پــۆلاد، پــۆلات] ١ـ ئـاسـنـــی لێکدراوە دەگەڵ کەربۆن (نزیک ٢٪)، زۆر سـەختـە و ١٣٠٠ هەتا ١٤٠٠ دەرەجـە دا دەتوێتـەوە و بۆ شـەمـشـیـر و خـەنجـەر و فـەنەر و سـاز کردنی هـەندێک کـەرسـەی دی کـــەلکی لـێ وەردەگـــرن، پـۆلاد. ٢ـ (کنـ.) ئەلف) پیاوی بە خۆوە وبە تاقەت . ب) سەخت و پتەو بۆ هـەر شتێک.

**پۆلاخـۆر** (ئان. فـا)[پـۆلا + خــۆر2] (کنـ.) پیــاوی ئـازا و نەترس کــە گــوێ نەداتە مەترسی، شەمشیرکرۆژ.

**پۆلانیـا** (نا. مـف)[پـۆلا + نیـا(نیـان)] تیـــژ کـــردنەوە و نـوێ کـــردنەوەی دمـی گـــاسـن ، تەور یـا شـــتـی دیکە لـە لای ئاسنگەر. ئاسنگەر کوتە پۆلا یا ئاسنێک لە سـەر دمی کولی دادەنێ، لـە کـوورە دا سـووری دەکـاتـەوە و دەیکوتێـتــەوە هەتا نوێی دەکاتەوە، سەرنیا.

**پـۆلایـین** (ئـان. ل)[پـۆلا + یـین] هـەر شتێکی چێکراو لە پۆلا.

**پۆلکە** (گیا.)[باک: پۆلک ـ ناو: پۆڵکە] گـیـا و بەری گـیـایەکـە هەر بـەم ناوە. گـیـایەکی خـۆڕسکە لە نێـو شـیناوەرد و شـێوەردان هەڵدەدا، گەڵای وردە، گـوڵی سـپی و زەرد و شین دەکا، بەرەکەی وەک کـەلووی باقلەیە، وەک مـاش خـڕە بەڵام گـــەورەتـرە و بـە قـــەرا نـۆک دەبـێ، بـە فــەریکی ئەم کـەلوویانە لێــدەکـەنەوە و دەیکوڵێنن و دەیخـــۆن و تامـــێکی زۆر خـۆشی هەیە. نـاوی لاتینی ئەم گـیــایە Lathyrus sativus ە و عـــــەرەب و فــارسـیـش خلر (خـۆللەر) ی پێـدەڵێن، خلێرە.

**پۆڵکەخـاتوونە** (گـیـا.)[پۆڵکە + خـاتوون + ئە] جـۆرێک پـۆڵکەی خـۆڕسک کە بەرەکەی دەخورێ.

**پۆڵکەگایانە** (گیـا.)[پۆڵکە + گـا + یانە] جـۆرێک پۆڵکەی خۆڕسکی گەڵاپانە و دەخورێ.

**پۆڵکەمـارانە** (گیا.)[پـۆڵکە + مـار +

ئانه] جۆرێک پۆڵکەی خڕسک کە بەرەکەی ناخورێ.

**پۆمپ** (نا.)[فەر: pompe] مەکینەیەکی بەرقی بۆ هەڵکێشان و راگوێزتنی ئاو یا ئاوەکی دیکە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنی دیکە.

**پۆنگ** (نا.) بڕ: پەنگ1. ~ **خواردنەوە:** بڕ: پەنگ خواردنەوە.

**پۆنگاو** (نا. ل)[پۆنگ + ئاو] بڕ: پەنگاو

**پۆنیس** (نا.)[فەر: punaise] جۆرێک بزماری چووکەیە کە لە کانزا دروستی دەکەن، سەری پانە و نووکێکی چووکی وەک دەرزی پێوەیە و بۆ شت بە دیوار و تابلۆوە نووساندن کەلکی لێوەردەگرن و بە هێزی قامک دەو شوێنەوە رادەچێ.

**پۆنژ** (ژ.)[زا] بڕ: پێنج

**پۆنج** (ژ.)[زا] بڕ: پێنج

**پۆیلانە** (نا. ل)[پۆیلە + ئانە] دیارییەک بۆ تازە بووک یان ژنی تازەزاوی دەبەن، پۆیلە.

**پۆیلە** (نا.)[؟] ١ـ لزگەمووروو و زەنگیانەی سەری ژنان. ٢ـ بڕ: پۆیلانە.

**پووت**1 (نا.)[روس: پوود] ١ـ کێشەیەکە بەرابەر دەگەڵ شازدە کیلۆ کە لە رووسیە بەرابەر دەگەڵ شازدە کیلۆ و سی و هەشت گرەم ١٦.٣٨. ٢ـ (کنـ.) فیز، دەعێ، تەواو و بێ کەموکووڕیی بە باری مەنفی دا. ~ **بوون:** (کنـ.) بەفیز بوون، بەدەعێ بوون.

**پووت**2 (نا.)[باک] بڕ: بوت

**پووت**3 (نا.)[؟] ئەستێرەیەکە کە دەگەڵ مانگ دەردەکەوێ و لێی نزیکە و هەر چی مانگ گەورەتر دەبێ لێی دەکشێتەوە، ئەستێرەی پووت، ئەستێرەی مانگێ. ⁂ چاوت ئەستێرەی پووتە/ دەگەر مانگێ را جووتە (سێسەد هۆنراوە ل ٩٤).

**پووت**4 (ئان.)[بڕ: پۆت] ١ـ نێوبۆش، بەتاڵ، پووچ. ٢ـ قانگ، پووک. ⁂ تووری پووت. ٣ـ مرۆڤی بێ نمووت، پووتەکە، هیچ و پووچ، رووت و قووت. ⁂ قۆچ عوسمان پیاوێک بوو رووت و پووت و لەوی دە بێکارە (مان ل ٢١٣). ٤ـ گزرە. ٥ـ رزیو، پۆت.

**پووتەک** (ئان. ل)[پووت4 + ک] ١ـ مرۆڤی هیچ و پووچ و بێ نموود، پووت، پووتەکە. ٢ـ [ئەر] خۆرە، خۆرکە.

**پووتەکە** (ئان. ل)[پووت4 + کە] بڕ:

**پووتەڵ** (ئان. ل)[پووت4 + ئەڵ] بڕ: پووچەڵ

**پووچ**[1] (ئان.)[پەش: پووچ ـ فـــار: پـووچ. بـاک: پـووچ ـ نـاو: پـووچ ـ هـەو: پووچ ـ زا: پووچ، پوچ] ١ـ مـیـوە و بەری بێ کـاکـڵی وەک گـوێز و بـادام ، پووک، پووت. ٢ـ شـانس و بەختێک کە چی تێدا نەبێ. ٣ـ هەر شـتـێکی بێ کـەلک و بێ مانا. ⁘ ئەو ژیانە پووچە. ٤ـ قسـەی قۆڕ و خــــۆڕایی. ٥ـ باتڵ. ٦ـ بەتاڵ. ~ **بوون:** ١ـ بێ کـاکڵ بوونی بەری هـەندێک دار. ٢ـ شـانس و بەختێک کە چت لێ بۆ دەر نەکـەوێ. ٣ـ بە کـەلک نەهاتن، بێ مـانـا بوون. ٤ـ باتڵ بوونی نوێژ، ڕۆژوو، ... ⁘ لە نوێژ دا ئەگەر چاو بگێڕی نوێژ پووچ دەبێ. ٥ـ بەتاڵ بوون. ~ **کـوتن (گـوتن):** قـسـەی قـوڕ و بێـمـانا کـردن، غەڵەت کردن، هیچ و پووچ کوتن.

**پووچ**[2] (نا.)[زا] گۆرەوی، گـۆروا. بڕ: پوچ2.

**پووچەک** (ئان. ل)[پووچ1 + ئەک] بڕ: پووچەڵ.

**پووچەکـە** (ئان. ل)[پووچ1 + ئەکـە] هـیچ و پـووچ، خــــوێڕی، پووچـەڵ/٢. ⁘

**پووچەڵ** (ئان. ل)[پـووچ1 + ئـەڵ] ١ـ دانەوێڵــەی پووچ و نێـو بەتاڵ، پووچەک. ٢ـ (کـنــ.) هـیــچ و پــووچ، بــێ بـایـخ. پـووچـەکــــــە. ٣ـ (کنــ.) خــــــراپ. & پووتەڵ. ~ **بوونەوە:** هـەڵوەشـــانـەوەی کـار، کـار لێ تێکچـوون. ~ **کـردنەوە:** تێک دانـی کــار، هەڵوەشــاندنـەوە. **لێ ~ بوونـەوە:** لێ هـەڵـوەشـــــــانەوە و تێکچــوونی کـار و مــەســەلەیەک. **لێ ~ کــردنەوە:** لێ هـەڵوەشــاندنەوە و تێکدانی کار و هەوڵی کەسێک.

**پـوور** (نـا.)[بـڕ: پـس] ١ـ پـەیـوەنـدی نێــوان منداڵەکــانی کـابرایەک دەگــەڵ خوشکەکانی خۆی، خوشکی باوک، یای. ٢ـ پەیوەندی نێــوان منداڵەکــانی ژنێک دەگـەڵ خـوشـکەکـانی خـۆی، خـوشـکی دایک. & پوورکە، میم، میمک، میمی. ٣ـ [فار: پور][کلاسیک] کوڕ. ⁘ نەسیحەت بێ بـرا گــەر ڕۆڵە بوو مــەڕوانە بۆ ئـابا/ گـــەواهـی عـــەدلی ئـەم دەعـــوایە پووری پووری مەروانە (مەحوی ل ٢٧٨).

**تێبینی:** پوور لە ریشـەی ئەوێسـتـایی پوثرە puthra و پەهلەویی پوهر puhr و کـوردیی پس کـەوتوە بە مــانای کــوڕ

(برای خوشک)، بەڵام لە زمانی کوردیی دا مـــانـاکـــەی بۆتە خـــوشکی برا یا خـوشکی خـوشک بۆ منداڵەکـانی ئەو کەسانە.

**پوورایشۆکە** (گیانـ.)[پوور + ئایشێ (ناوی ژن) + ئۆک + ئە] بڕ: پیرایشۆکە

**پـــوورزا** (نـــا. ل)[پـــوور + زا] ١ـ پەیوەندی نێـوان منداڵەکانی کابرایەک دەگـــەڵ منداڵەکـــانی خـــوشکی. ٢ـ پەیوەندی نێوان منداڵەکانی ژنێک دەگەڵ منداڵەکانی خوشکی.

**پـوورزازا** (نـا. ل)[پـوورزا + زا] ١ـ پەیوەندی کـەسـێک دەگـەڵ منداڵەکـانی پووری چ خـــوشکی باوک چ خـــوشکی دایک. ٢ـ پەیوەندی نێوان ئەو منداڵانەی کـــە دایک یا باوکـــیـــان دەگـــەڵ یەک پوورزان.

**پوورت** (نا.)[باک] بڕ: پەڕ1

**پوورکـە** (نا. ل)[پوور + ک + ئە] بڕ: پوور

**پوورە** 1 (نا. ل)[پوور + ئە] ١ـ کۆمەڵ، دەســـتــە، هەنگ، ئاپوورە. ٢ـ کـوڵەڵێک مێش هەنگوین پێکەوە، شەڵخەی مـێش هـەنگوین. **~ دان:** کـــۆ بـوونـەوەی کۆمـەڵێک مێش هەنگوین لە شوێنێک بۆ ساز کردنی شەڵخەیەک، شەڵخە دان.

**تێبینی:** پوور لە ریشـەی ئـەوێسـتـایی پەرو paru و پڕ ـ ی کوردیی بە مانای زۆر، فـــرە کـــەوتـۆتـەوە (بڕ: پڕ)[هـس: ئاپوورە]

**پوورە** 2 (نا)[؟] خـڵت و خـاڵی تریاک، شـتی زێدەی نێـو تریاک کـە لە تریاک جوێ دەبێتەوە و دەسـووتێ و ناتوێتـەوە. **~ خستن:** تریاکێک کە دەغەڵی تێدا کرابێ و خڵت و خاڵی هەبێ.

**پووز** (ئا.)[لۆر: پیـز. نـاو: پووز ـ هەو: پووز] مـــاســـوولکەی پشت لوولاک لە رەفـیـسکەوە هەتا پێـچکەی پێ، چیپ، چاق، لەتەر، بەلەک1.

**پـووزپـێـــچ** (نـا. ل)[پـووز + پـێـچ] پارچەیەکی درێژ و تەنکە، بە قـەرا چوار قـامک پانە و کـە لە کـاتی رێ برین بۆ گورج و گۆڵی لە بەلەکی دەهاڵێنن، دۆلاغ، ساقپـێچ، بەلەکپـێچ، پووزلغ، پووزەوان، پووزەوانە، پووزەوانێ، پاپێچ.

**پـووزلـغ** (نـا. ل)[پـووز + لـغ] بـڕ: پووزپێچ

**پـووزەوان** (نـا. ل)[پـووز + ئـە + وان] [ئەر] بڕ: پووزپێچ

**پووزەوانە** (نا. ل)[پووز + ئە + وانە] بڕ: پووزپێچ

**پووزەوانێ** (نا. ل)[پووز + ئە + وان + ئێ][هەو] بڕ: پووزپێچ

**پووش** (نا.)[ناو: پووش ـ هەو: پووش ـ زا: پووش، پوش] ١ـ گیای ویشک کە لێک بڵاو بۆتە، وردە گیای وشک. ٢ـ [زا] گەڵا. ٣ـ (کنـ.) بێنرخ، هیچ. ٤ـ (مجـ.) لاواز، کز، ڕەقەڵە، زەرد هەڵگەڕاو. ⁂ زەعیفیی منی کردە پووش، ئێستەکەش/ لە من هەر دەکەن ئەم غەزالانە ڕەم (مەحوی ل ٢٣٧). **بە ~ێک نەکڕین:** (کنـ.) پێ بێنرخ بوونی شتێک، نەویستنی شتێک تەنانەت بە چووکترین نرخ، پووشێک پێنەدان، بە پووشێک نەویستن. ⁂ دەست و چاو ئێستە ئەوەند تێر و پڕن/ سەد هەژار ڕەنگە بە پووشێک نەکڕن (بۆ کوردستان ل ١٤٥). **بە ~ێک نەویستن :** (کنـ.) تەنانەت بە خۆڕاییش نەویستن، پێ هیچ نەبوونی شتێک، بە پووشێک نەکڕین. ⁂ کێ بە سەربەرزی ژیابێ تاوێ/ ژینی قالاوی بە پووشێک ناوی (بۆ کوردستان ل ٢٦٦). **~ بە سەر کردن:** (کنـ.) داپۆشین و بێدەنگی لێکردن لە قسە و مەسەلەیەک، دیزە بە دەرخۆنە کردن. ⁂ پووڵێکم دانێ، خوا وەتحەسێنێ، ڕێگای خۆیان داگرت و شتەکەیان پووش بە سەر کرد، وەک چ نەقەومابێ (میرزا ل ١٠٧). **~ دانە دەست:** (کنـ.) زەرە بە کەسێک گەیاندن، زەرەر لێدان، نابووت کردن. **~ی کەسێک هەڵاویتن (هەڵاویشتن):** (کنـ.) واز لێهێنان و فەرامۆش کردنی کەسێک. ⁂ نازانم لاس بە زیندەگانی ماوە ... یان مردووە یان دڵی گۆڕاوە و پووشی منی هەڵاویتووە (لاس و خەزاڵ ل ١٣٩). **~ێک پێنەدان:** (کنـ.) بایەخ و نرخ دانەنان بۆ شتێک تەنانەت ئەگەر زۆر هەرزانیش بیفرۆشن، بە پووشێک نەکڕین، بە پووشێک نەویستن. **~ێک نەهێنان:** (کنـ.) زۆر بێنرخ بوونی شتێک یا کەسێک، هیچ نەهێنان. || **پووشی بەر ڕۆژ:** (کنـ.) پیاوی سووک و بێنرخ.

**پووشانە** (نا. ل)[پووش + ئانە] باج و سەرانەیەک کە ئاغا لە ئاژەڵداری دەستێنی لە جێات حەقی لەوەڕ.

**پووشبەقوونە** (گیانـ.)[پووش + بە + قوون + ئە] بڕ: پشکەبەقوونە

**پووشبەقنگە** (گیانـ.)[پووش + بە + قنگ + ئە] بڕ: پشکەبەقوونە

**پووشپەڕ** (نا. ل)[پووش/١ + پەڕ2[
١ـ کات و جەنگەی گیا دروونەوە ئەدەم کە گیا وردەوردە ویشک دەبن. ⁘ وەختی راو نییە، هاوینە، پووشپەڕە، گوڵ نەماوە لە سەری ئاستەڕێ/ مەچۆ دەرێ، ئەوە تازە بێری پۆل پۆل دێنەوە خوارێ لە نێو مەڕێ (لاس و خەزاڵ ل ١٦٢). ٢ـ یەکەم مانگی وەرزی هاوین. (پووشپەڕ، گەلاوێژ، خەرمانان).

**پووشکە** (نا. ل)[پووش + کە] پووش، پووش و پەڵاش

**پووشکەبەق** (گیانـ.)[پووشکە + بەق] [باک] بڕ: پشکەبەقوونە

**پووشکەبەقوونە** (گیانـ.)[پووشکە + بە + قوون + ئە] بڕ: پشکەبەقوونە

**پووشڵە** (نا. ل)[پووش + ڵە] چیلکەی سەربەلۆکە، بۆ عیمالەی مناڵ بە کار دێ (هەنبانە ب ١ ل ١١٥).

**پووشوو** (نا. ل)[پووش + ئوو] ١ـ پووش و پەڵاشی ویشک و سووک کە لەبەر زوو ئاور گرتن دەبن ئاوری دەنێن. ٢ـ [باک: پووشوو، پیشۆ، پۆشی ـ ناو: پووشوو، پووشی] شتێکی نەرم و وشک و پفڵەیە کە لە داربەڕوو یا دارگوێز یان کارگ دەستیان دەخست و زوو بۆ ساز کردنی ئاگر بە بەرد و ئەستی کەلکیان لێوەردەگرت، پیفوو، پیفی، پیفک، قاو.

« پووشوو دوو جۆرن. جۆرێکیان قارچکە لە ناو دارگوێز و داربەڕوو دا پەیدا ئەبێ وەکوو « ئەسفنج » نەرمە. جۆرێکیتریان گەڵای گیای کەمەمکۆڵە، ئەکوترێ شتێکی لێ پەیدا ئەبێ وەکوو لۆکەکۆن لە ئاوی کاڵەک هەڵ ئەکێشرێ بە هۆی لێدانی بەرد و چەخماخەوە ئاگری پێ ئەکرێتەوە، جاران شخارتە نەبوو بەوجۆرە ئاگر ئەکرایەوە (کشت و کاڵ ب ١ ل ٦٦). » **وەک ئەستێ و ~ بوون:** (کنـ.) دژی یەکتر بوون، دەگەڵ یەک هەڵنەکردن و نەحاوانەوە.

**پووشە** (نا.)[فار: پوشە] کەرەسەیەکی دوو لاپەڕەیی رەق کە پەڕەکاغەز و نووسراوەی تێدەنێن.

**پووشەڵان** (نا. ل)[پووش + ئە + ڵان] شوێنێک کە گیای وشک و پووش و پەڵاشی زۆر لێبێ.

**پووش و پەڵاش** (نا. ل)[پووش + و + پەڵاش] وشکە گیای لێک بڵاو بۆوە.

**پووشی** (نا. ل)[پووش + ئی] ١ـ پووش و پەڵاش. ٢ـ پووشوو، پیفوو.

**پووشین**[1] (نا. ل)[پووش (پۆش) +

ئـین] ١ـ بـڕ: پـۆشـین2. ⁝⁝ بـە لـەرزە و زەلـزەلـەی ئـەو پـڵـــــپـــــلانـەی دەوری پووشـینت/ بینای هـەسـتم هـەمـوو زێر و زەبەر نـاکـەی ئـەڕۆی ئۆغـر (گـۆران ل ٦٣). ٢ـ خـشـڵـێکی زێڕی ژنانە، کـە لە پێش سەری دەدەن، پێشەسەر.

**پووشین**$^2$ (ئان. ل)[پووش + ئین] هەر شتێک کە لە پووش ساز بووبێ.

**پووشین پێچ** (نا. ل)[پووشین1+ پێچ] خشڵی پووشین، پۆشین پێچ.

**پووشـــــینە** (نا. ل)[پـووش + ئینـە] سەلەی ساز کراو لە پووش.

**پووک**$^1$ (ئا.)[باک: پـۆک، پدوو، پدی، پی ـ ناو: پووک، پدوو] ئـەو گۆشـتـەی کە ددان لە سەری چەقیوە.

**پووک**$^2$ (ئان. نا.)[هس: پـۆت][گـیل: پووک ـ فـار: پووک ـ کـرم: پـووت ـ تات: پـۆفک، پـێـفک ـ لۆر: پیک. ناو: پـووک ـ هەو: پووک] ١ـ حاڵی هەر شـتێکی لە بەر گەیینی زۆر یا رزین نێوەکەی هڵـۆڵ بێ. ٢ـ هەندێک میوە و بەری نێو بەتاڵی وەک گـوێز، فندق و بادام، پووچ، پـووچەڵ. ٣ـ نێــو بەتـاڵ، بۆش. ٤ـ چەپۆک. ٥ـ [باک ـ زا] کرێوە.

**پووکـــانەوە** (چا. ل)[لە: پووک2/٣] کـەم بوونـەوەی هـەوای نێـو هـەمـبـانە و کیسەی باکراو، پووچانەوە.

**پووکاو** (ئان. ل)[پووک2/٣ + ئاو] ١ـ پووچاو، چرچ. ٢ـ داری رزیو.

**پووکـــاوڵ** (نا. ل)[پووک2/٤ + ئاوڵ] چەمۆڵە

**پووکـــاوڵە** (نا. ل)[پووکـــاوڵ + ئە] چەمبۆڵە، چەمۆڵە.

**پووکــــە**$^1$ (نا. ل)[پـووک2 + ئە] ١ـ بەری قـامـیش کـە وەک لۆکـە دەچێ. ٢ـ (نز.) فیشەک و گوللەی تەقێندراو.

**پووکـە**$^2$ (وشـد.)[ئەر] دەنگی نـزمی گریان، پۆکە، نووکە. ~ **کردن:** گریان بە نزمی، نووکە کردن.

**پووکەپووک** (وشد.)[پووکە2 + پووک] دەنگی پەیتـاپـەیتـای گـریان بە نـزمی، نووکەنووک. ~ **کردن:** گریان بە نزمی و بەردەوام، نووکەنووک کردن.

**پـوول** (نـا.)[بـڕ: پـووڵ] ١ـ پـووڵ. ٢ـ پووڵەکە. ٣ـ پارچە کاغەزێکی نەخشـدار و بایەخـدار، کـە لـە جـیـات پارەی بەرێ کـردنی نامـە و هێنان و بردنی پۆست لە سەر پاکەت دەدرێ، تەمر1. & پۆل ~ **پێوەنان:** بڕ: تەمر کردن.

**پوولەک** (نا. ل)[پوول + ئەک] بڕ: پووڵەکە

**پووڵەکڕێژ** (ئان. ل)[پوولەک + ڕێژ] بڕ: پووڵەکڕێژ. ∷ سوخمەت بۆ دەکەم هەر پوولەکڕێژ بێ/ بۆ خۆم بۆی دەبڕم نە کورت نە درێژ بێ (سێسەد هۆنراوە ل ١٢).

**پووڵ** (نا.)[پەه: پوول] ١ـ کوتێک زێڕ یا زێو یا مەعدەنی دیکەیە کە لە لایەن دەوڵەتەکانەوە بە نیشانەی تایبەتی خۆیانەوە بڵاوی دەکەنەوە بۆ کار و باری کڕین و فرۆش، پارە، دراو، پویل، پۆل، زەڕ. ٢ـ پارەیەکی کۆن کە ڕمێنی نەماوە و بەرابەر بوە دەگەڵ یەک لە چلی قران. ٣ـ (مجـ.) کەم و بێ نرخ (لە: پووڵ/٢). ∷ بە پارێک نامەوێ دەرمان لە نەشئەی چاوییە عیللەت/ بە پووڵێک ناکڕم عەنبەر لەگەڵ زولفی ئەوە سەودا (نالی ل ٨٧) لە سایەی ماچی لێوی ئەو شکا بازاڕی قەنناد/ بە پووڵێ ناکڕێ کەس ئێستە باری شەهد و هەنگوینت (ئەحمەد موختار ل ٦٧). ٤ـ سامان. ٥ـ دەسمز، مەعاش، داهاتی کار. **~و پەین (کا) پێ (لا) وەک یەک بوون:** (کنـ.) چاو لە مالی دونیا نەبوون، نرخ بۆ پارە دانەنان. **~ دە پێستە پالاغ ئاخنین:** (کنـ.) پارە زۆر هەبوون. **شەپ شەپێن بە ~کردن:** (کنـ.) پووڵ و پارە لا گرینگ نەبوو و دەست بڵاو بوون. || **پووڵی بەستەزمان:** بڕ: پارەی بەستەزمان. **پووڵی پێش:** بڕ: پارەی پێش. **پووڵی چرووک:** (کنـ.) هیچ، بێنرخ، پارەی ڕەش، پارەی چرووک. ∷ تیشکی دڵی ڕەش وە ڕوون دەگێڕێ/ پووڵێکی چرووک دەکاتە زێڕێ (مەم و زین ل ٢٥٢). **پووڵی ڕەش:** ١ـ پووڵی وردە، قەرەپووڵ. ٢ـ (کنـ.) هیچ، بێ بایخ. & پارەی ڕەش. ∷ ژاندرمە لە کوردستان بوونە پووڵێکی ڕەش کەس گوێ نادەنە قسەیان. **پووڵی ڕەواج:** پووڵ و پارەیەک کە دە نێو خەڵک دا برەوی هەیە و خەرج دەکرێ. // پووڵی ناڕەواج. **پووڵی زەرد:** پووڵی ساز کراو لە زێڕ. **پووڵی سپی:** پووڵی ساز کراو لە زێو، پارەی سپی. **پووڵی کاغەزیی:** دراوێکە لە جیات کانی لە کاغەز ساز کراوە و هەمان کاری پووڵ دەکا. **پووڵی ناڕەواج:** ١ـ پووڵ و پارەیەک کە دە نێو خەڵک دا برەوی نیە و ناچێ خەرج ناکرێ. ٢ـ (کنـ.) شتێک یا کەسێک کە کەس داخوازی نەبێ. **پووڵی نەغد:** پووڵ و پارەیەک کە حازر بە دەستەوە بێ و بە

جنس و مـــڵک و مـــاڵ نـەدرابێ ، پـووڵی ئیـــشک. **پووڵی ورده:** بڕ: پووڵی ڕەش. **پووڵی ئیـــشک (ویشک، وشک):** پووڵی نەغد. ؛؛ پووڵی ئیشکی زۆرە.

**تێـــبـــینی:** پووڵ لە Obolos ی یوونـانی کـەوتوه و هاتۆتە نێـو زمـانی پەهلەویی و کـوردییــەوە و عــەرەبیش کردوویانەتە فلووس.

**پووڵپـــەرست** (ئان. فـــا)[پـووڵ + پەرست] ١ـ کەسێک کە پارەی زۆر خۆش بوێ، پارەپەرست. ٢ـ کـەسـێک کـە دڵی نـایە پـووڵ خـــەرج بکـا، ڕژد، لەچـەر. & پووڵەکی

**پووڵپەرستیی** (حم.)[پوولپەرست + ئیـی] کـــار و ئـاکـــاری پووڵ پـەرست، پارەپەرستیی.

**پووڵدار** (ئان. فـــا)[پـووڵ + دار2] کـەسـێک کـە پارەی زۆرە، دەوڵەمـــەند، پارەدار.

**پـووڵداریی** (حم.)[پـووڵدار + ئـیی] پارە زۆر هەبوون، دەوڵەمەندیی.

**پـووڵـەک** (نـا. ل)[پـووڵ + ئـەک] بـڕ: پووڵەکە

**پووڵەکـڕێژ** (ئان. ل)[پووڵەک + ڕێژ] جل و بەرگێک کە بە پووڵەکە ڕازابێتەوە، پووڵەکەدار، پووڵەکڕێژ.

**پووڵەکــە** (نا. ل)[پـووڵ + ئەکــە] ١ـ شـــتـــێکی ڕەقی وردە ئەندامی زۆربـەی ماسیەکانی داپۆشیوە، پووڵەک، پووڵ. ٢ـ شـتـێکی دەسکردە، هەر وەک پووڵەکـەی ماسـی، نێوەڕاستەکەی یا سووچێک کون کراوە و ژنـان بۆ جـوانی لـە جل و بەرگی دەدروون یا بۆ ئۆیە کەلکی لێوەردەگرن. & پـووڵـەک، پـووڵـەک. ٣ـ زێـڕ و زێـو و کـــانزای ورد کـــە بۆ جـــوانی هـەندێک کـــەرەســـە کـــەلکی لێـــوەردەگـــرن. ؛؛ هەڵمدەکێشاوە ئەوە کێردێکی ئـەڵماسـی دە بیـسـت و دوو پووڵەکــە زێڕ (گـەنج ل ٢٩١). ٤ـ پارچە چەرمێکی بچووکی سێ سـووچە ئەدرێ لە ڕاست و چەپی کـەوش (خاڵ ب ١ ل ٢٢٩).

**پووڵەکـــەدار** (ئان. ل)[پووڵەکـــە + دار2] جل و دەسـمـاڵ یا هـەر شـتێک کە پـووڵەکـــەی لێنرابێ، پووڵەکـــڕێژ. ؛؛ دەسماڵ پووڵەکەدارن/ شەدە و گێل گێلە لارن (تـاریک و ڕوون ل ١٠٩) یـاخــــوا ئـەســــپـــــەڕەش هـەروا چـوارنـاڵ بـی/ ســـەرزین، نەرمـــەزین، پـووڵەکـــەدار بی (کانی مرادان ل ٧٢).

**پووڵەکی** (ئان. ل)[پووڵ + ئەکی] ١ـ کەسێک کە پووڵی خۆش دەوێ. ٢ـ کەسێک کە بە پارە هەر کارێک دەکا . ٣ـ کەسێک کە فێرە پووڵ وەرگرتن بوە.

**پوونک** (ئان.)[زا] بڕ: پاک

**پوونگ** (گیا.)[باک] بڕ: پنگ

**پوونە** (گیا.)[باش ـ هەو] بڕ: پنگ

**پووینە** (گیا.)[هەو] بڕ: پنگ

**پهین** (نا.)[باک] بڕ: پین

**پەپاخ** (نا.)[تور: papak] کڵاوێکی گەورەیە کە لە کەوڵی مەر سازی دەکەن و تورکەکان دە سەری دەکەن، پاپاغ، پەپاغ، پاپاخ. ؛؛ بانگی دیکەم وەبەر ئیمام حەسەن و حوسەینی غەریب، مەرقەدیان لە مەشهەد و کەربەلایێ؛ ئەجەم و پەپاخ رەشیان دەچنە زیارەتێ. (مان ل ١٢)

**پەپاغ** (نا.) بڕ: پەپاخ

**پەپکە** (نا.) ١ـ بڕ: پاپووکە. ٢ـ کوتە هەویرێکی خڕ بە قەرا مشتی دەست کە بۆ نانێک ئامادە دەکرێ, ئەنگوتک, ئەنگوتک، گونتک، گونک، گوندک. ٣ـ خۆیان، خەرمانی گێرەنەکراو. **~ بەستن:** بڕ: پاپووکە خواردن. **~ خواردن:** بڕ: پاپووکە خواردن. **~ دان:** بڕ: پاپووکە خواردن.

**پەپکەمەلیچکانە** (گیا.)[پەپکە + مەلیچک + ئانە][ئەر] پەنیرۆکە

**پەپۆکە** (نا. ل)[پەپ + ئۆکە][هس: پەپکە] کولێرەی بچووک کە بۆ منداڵ ساز دەکرێ.

**پەپۆلە** (نا. ل)[پەپ + ئۆلە][هس: پەپکە] سەرە ئەنگوتکە هەویرێک کە دەمێنێتەوە و دەیکەن بە نیوە نانێک.

**پەپوو**[1] (گیان.) ١ـ [ناو: پەپوو، پەپووسلێمانکە، پەپووسلێمانکە، پەپووسلێمانە، پەپووسلێمانی، پەپووسێمانە، پەپوەسلێمانە ـ هەو: پەپووسلێمانە]مەلێکی بۆری بە خاڵی رەش و زەرد و سپییە، لە کوتر چووکترە، کاکۆڵێکی لە پەڕ هەیە و بە خۆش خەبەری دادەنێن. لە چیرۆک دا مەلی پەیکبەری حەزرەتی سولەیمان بوە و ناوەکەی لە دەنگی خۆی کەوتوە، Up-upa epops ناوی لاتینی ئەم گیاندارەیە. ٢ـ کوند، بایەقوش، پەپووکەرە. ٣ـ [باک: پەپووک ـ ناو: پەپوو ـ زا: پەپووگ، پەپووک، پەپوونگ] مەلێکی جوانە، باڵ و کلکی درێژن، پێیەکانی

کورتن و جرِوجانەوەر دەخوا. رەنگی پەڕەکانی بۆرە و بن زگی ئاچغترە. ئەم مەلە هەستی دایکایەتی زۆر کەمە و ناوبانگی هەیە کە هێلکەی خۆی لە هێلانەی مەلی دیکە دادەنێ، Cuculus canorus ناوی لاتینی ئەم مەلەیە، کووکوو، کۆترەپەپوو. ~ **لێخوێندن**: (کنـ.) ١ـ شوێنی چۆڵ کە ئاوەدانی لێنەبێ. ٢ـ هەر شوێنێکی چۆڵ کە کەس نەچووبێ یا نەچێ. ∷ سینەماکە هێند بەتاڵ بوو پەپوو لێی دەخوێند.

**پەپوو**² (نا.) تەواو، خەلاس بە زمانی منداڵان.

**پەپوو سلێمانکە** (گیانـ.)[پەپوو1 + سلێمان + کە] بڕ: پەپوو1/١

**پەپوو سڵێمانکە** (گیانـ.)[پەپوو1 + سلێمان + کە] بڕ: پەپوو1/١

**پەپوو سڵێمانە** (گیانـ.)[پەپوو1 + سڵێمان + ئە] بڕ: پەپوو1/١

**پەپوو سڵێمانی** (گیانـ.)[پەپوو1 + سڵێمان + ئی] بڕ: پەپوو1/١

**پەپوو سێمانە** (گیانـ.)[پەپوو1 + سێمان + ئە] بڕ: پەپوو1/١

**پەپووقژە** (گیانـ.)[پەپوو1 + قژ + ئە] باڵندەیەکە وەک پەپووسڵێمانکە بەڵام ئەم بێ کڵاوە (خاڵ ب ١ ل ٢٣٠).

**پەپووک** (گیانـ.)[باک ـ زا] بڕ: پەپوو1/٣

**پەپووکەرە** (گیانـ.)[پەپوو1 + کەر (کردن) + ئە] بڕ: پەپوو1/٢

**پەپووگ** (گیانـ.)[زا] بڕ: پەپوو1/٣

**پەپوونگ** (گیانـ.)[زا] بڕ: پەپوو1/٣

**پەپوولە** (گیانـ.)[باک: پەپوولە ـ ناو: پەپوولە ـ هەو: پەپوولە] ١ـ حەشەرەیەکە بە باڵی ناسک و رەنگاورەنگ، چووک و گەورەی هەیە و جۆری زۆرە، شیرەی گوڵان دەمژێ. هەروەها جۆرێکی بە شەو دەفڕن و خۆ بە شۆق و رووناکی چرا و شەم دادەدەن، منمنیک، باپەرک، پەری، پەرپەرۆک، پەرپەرک، پەرپەریک، پیرک، پەلپەلک، پلپلۆک، پەروانە. ٢ـ نەخۆشییەکە لە نێو بزن و مەڕ دا (مەردووخ ب ١ ل ٢٦٧). ٣ـ (کنـ.) مرۆڤی پاک و بێ ئازار. ~ **هەڵێنان**: ١ـ جۆرە نەخۆشییەکە لە تینوێتی یا لە گەرمای زۆرەوە دووچاری ئاژەڵ ئەبێ (خاڵ ب ١ ل ٢٣٠). ٢ـ دانەوێڵەیەک کە گەرای جۆرە پەپوولەیەکی وردی تێکەوتبێ. ‖ **پەپوولەی بەهەشتێ**: (کنـ.)

مرۆڤی پاک و بێ ئازار.

**پەپوولەپایزە** (گیا.)[پەپووله + پایز + ئە] بەری دوایی گیایەکی خۆڕسکە و لە دەشت و نێــو شــیـناوەرد شین دەبێ، گوڵەکەی زەردە و لە داویی هەر ئەو گوڵە وەک تۆپێکی تووکنی لێدێ و پایزان لە گیایەکـە ی جیا دەبێتـەوە و با دەیبا، باوەلـێ، باویـلـێ، بـایـیـلـکـە، باویلکـە، پشــیلـەپایزە، پشــیلۆکــە، گــەورەگلە، شەلەمینکەرە.

**پەپوەسلێمانە** (گیانـ.) بڕ: پەپوو1/١

**پەپە** (نا.)[هس: پەپۆکـە] کـولێـرە لە زمان منداڵەوە.

**پـەت** (نـا.)[نـاو: پـەت، پـەتـک ـ هـەو: پەتە] ١ـ گـوریس، شریت، پەتک، خـاپ. ٢ـ کوتێک لە ڕێسراوی وەک گوریس. ٣ـ تەنافی دە مل خستنی سێدارە. ٤ـ کوت، لـەت. ‫:: لـەت و پـەت. **~ کـــــردن:** ١ـ گوریس لە ملی گـیاندار کردن بۆ ئەوەی هەڵنەیە. ٢ـ بەسـتنەوە کەسێک بە شریت و گــوریس. **~ لە ســەر دامــاڵین:** ١ـ لێکردنەوەی پەت لە سـەر و ملی گیاندار. ٢ـ (کنــ.) لـە کـــۆڵ بـوونـەوە و بەردانـی کـەسـێک. **لە سـەر ~ و سینگی خـۆ دانیــشتن:** (کنــ.) بە پێـی رادە و تواناییی خـۆ کـارێک کـردن، پێ لە بـەرەی خـۆ درێژتر نەکردن.

**پەتا** (نا.)[هس: پەتیارە][باک: پەتا ـ ناو: پەتا، فەتا ـ هەو: پەتا] ١ـ هەڵامەت، پەســیــو. ٢ـ ئاهـۆ، درم. ٣ـ مــەڵهــەم و بەهاراتی کوڵاو کە گەرماوگەرم لە سـەر شـوێنی هەڵمساو و ئازار پێگەیشـتووی لەشـی دادەنێن بۆ ئارام بوونـەوە ئێش و ژان، پەتپەتی.

**پەتپــەتی** (نا. ل)[پەت + پـەت + ئی] [ئەر] بڕ: پەتا/٣. ٢ـ بڕ: پـەتپــــەتێن. **~ پێکردن:** (کنـ.) بڕ: پـەتپـــــەتێن پێکردن.

**پەتپـەتێن** (نا. ل)[پەت + پەت + ئێن] بڕ: پـەتپــــەتێن پێکـردن. **~ پێکردن:** (کنـ.) تـەفــرە دان و حـــەواله پـێکردن، ئەزیەت کردن و هێنان و بردنی کـەسێک، پەتپەتی پێکردن.

**پەتاتە** (گیا.) ١ـ گیایەکی دەستچێنە، گەڵاکانی گڕنی گڕنین، گوڵەکەی سپی یا مـۆرە، بـەرەکـەی بنکە و دەخــورێ و بۆ نشـــاســـتـــە و ئەلکۆڵیش کــــەلکی لێـــــوەردەگـــــرن، Solanum tu-berosum ناوی لاتینی ئەم گیایەیە. ٢ـ بنی ئـەم گـیـایە، پڕ و پتـەوە، تونێکڵـێکی

ناسكی هەیە، ناوكەكەی بە كوڵاویی، برژاویی و سووركراوەیی دەخۆرێ و خواردنی بە تەنیای مرۆڤ تێر دەكا. یارەڵماسی، پەرەڵماسی، سێف زەمینی، سێوك. || **پەتاتەی شیرین:** گیایەكی دەستچێنە، گەڵاكانی بە كورك داپۆشراوە و گوڵەكانی مۆر، ئەرخەوانی یا سپین. رەگەزەكەی لە ئامریكای ناوەندییە و بنەكەی هەر وەك پەتاتەی ئاسایی لە خۆراك و سەنعەت دا كەلكی لێوەردەگرن، Ipomaea batatas ناوی لاتینی ئەم گیایەیە. **پەتاتەی هیندیی:** گیایەكە لە تیرەی نێرگزەكان، بنەكەی زۆر ئەستوورە و لە هەندێك وڵات لەبری پەتاتەی ئاسایی دەیخۆن، Dio-scorea batatas ناوی لاتینی ئەم گیایەیە.

**تێبینی:** پەتاتە لە ساڵی ١٥٣٧ ی زایینی لە ئامریكای باشووریی دۆزراوە و ئیسپانیەكان دەگەڵ خۆیان بردیانە ئەورووپا و لەوێوە خۆی و ناوەكەی بە دنیا دا بڵاو بۆوە.

**پەتباز** (ئان. فا)[پەت + باز] كەسێك كە بە سەر گوریسێك دا دەڕوا كە لە شوێنێكی بەرز راكێشراوە و بە دارلەنگەر لەنگەری خۆی لە سەر رادەگرێ، تەنافباز، دارباز.

**پەتبازیی** (حم.)[پەتباز + ئیی] كار و پیشەی پەتباز، تەنافبازیی، داربازیی.

**پەتپساو** (ئان. مفـ.)[پەت + پساو (پسان)] ١ـ گیاندار و حەیوانێك كە پەتی پساوە و رایكردوە، بەرەڵڵا. ٢ـ كەسێك كە هەست بە بەرپرسی نەكا، بێ قەید و بەند، بەرەڵڵا.

**پەتپساویی** (حم.)[پەتپساو + ئیی] كار و كردەوەی پەتپساو، هەست بە بەرپرسایەتی نەكردن، بەرەڵڵایەتی

**پەترۆ** (نا.)[ناو: پەترۆ، پەترۆكە، پەترۆخە ـ هەو: پەترۆ] ١ـ توێژی ناسكی سەر برین، قرتماغە. ٢ـ گۆشتی تازە كە لە كاتی چاك بوونەوەی برین پەیدا دەبێ، گۆشتەزوون.

**پەترۆخە** (نا.) بڕ: پەترۆ

**پەترۆك** (نا. ل)[هس: پەرتووك] پارچەیەكی بچووك لە نان یا شتی تەنكی دیكە، پەرتووك.

**تێبینی:** لە راوێژی كرمانی دا پۆتوروك بە مانای زۆر كەم و زەڕەیەك هاتوە و لە راوێژیی بیرجەندیی دا پورۆوك بە مانای هەندێك لە شتێك

هاتوه.

**پەترۆکە** (نا.) بڕ: پەترۆ

**پەتک** (نا. ل)[پەت + ک] بڕ: پەت

**پەتڵە** (نا.)[؟][هەو ـ ئەر] ١ـ ساوار. ٢ـ خواردنێک کە لە ساوار سازی دەکەن، پیرخەنی، پیرخەنیلە.

**پەتوو** (نا. ل)[پەت + ئوو][باک: پەتوو، پەتی ـ ناو: پەتوو ـ هەو: پەتوو] پێخەفەکی کارخانەیە وەک لێفە، لە لۆکە یا خوری ساز دەکردرێ، بۆ لە بن خۆ راخستن و لە سەر دانیشتن و بۆ بە خۆ دادان و پێی خەوتن کەلکی لێوەردەگرن، بەتانی، ئەبیاڵ.

**پەتە** (نا. ل)[پەت + ئە] ١ـ کوتە ئاسنێک یا شتێکی دیاریکراوی چووکی دیکە کە لە هەندێک شوێن لە جیات پارە بە کار دەبردرێ. بۆ وێنە قاوەچی هەندێک پەتە دەدا بە دوکانداران و لە جیاتی پارە وەردەگرێ و هەر کات چایان خواردەوە پەتەی بۆ لە کەشەف داوێن. ٢ـ جەواز، بلێت، پسووڵە. ٣ـ [هەو] بڕ: پەت. **~ کەوتنە سەر ئاو:** (کنـ.) دەست روو بوون، ئاشکرا بوونی راز و نهێنی. **~ی کەسێک خستنە سەر ئاو:** (کنـ.) دەستی کەسێک روو کردن، لە قاو دانی رازی کەسێک.

**پەتەڕیی** (ئان.)[بڕ: پەتیارە][ئەر] شێت، گەوج، ئاقڵ سووک.

**پەتی**[1] (ئان.)[ناو: پەتی ـ باش: پەتی ـ هەو: پەتی] ١ـ رووت. ٢ـ پێخواس. ٣ـ رەسەن، خەست، تێکەڵ نەکراو. ⁂ کەلاوەی کردووە ئەستێری خەم بۆ نێو کەلاوەی دڵ/ هەموو شینگا زەلن، خاکی پەتی تێدا پەیا ناکەم (حەقیقی ل ١٨٨). کوردیی پەتی.

**تێبینی:** لە زمانی فارسیش دا پەتی بە مانای: ١ـ رووت ٢ـ بەتاڵ، خاڵی، سادە و ساکار هاتوە.

**پەتی**[2] (نا. ل)[پەت + ئی][باک] بڕ: پەتوو

**پەتیارە** (نا. ئان.)[ئەو: پەئیتیارە ـ پەهـ: پەتیارەک، پیتیارەک. ناو: پەتیارە، پەتەڕیی] شێتی زنجیری، شێتێک کە دەست دەوەشێنێ و جێی مەترسییە. ⁂ لەبەر دەرگاهی عیشقا یەکسەرە هەرکەس سەری دانا/ ئەگەر پەتیارەیەک بوو، بوو لە سەد عەللامە داناتر (مەحوی ل ١٢٦) دەنگیان دا: چ کارەی؟ چ کەسی؟ شێتی پەتیارەی عەوام/ بێ عاقڵی دێوانەی عاقڵ خام (سەعید و

میرسێوەدین ل ٢٣٤).

**تێبینی:** پەئیتیارە لە دوو بەشی [paiti + āra] پێکهاتوە. پەئیتی بە مانای دژ ـ ە و ئەر ar بە مانای بزووتن و جووڵانەوەیە کە لە کوردیی دا بە شێوەی را، هەڕا و خێرا و غار ماوە. وشەکە بە گشتی یانی دژی کردەوە و جووڵانەوە یا کردەوەی نائاسایی.

**پەتێخ** (گیا.)[عەر: بطیخ][باک] کاڵەک، گندۆرە.

**پەچ** (نا.) بڕ: پەرچ

**پەچڤە** (نا.)[باک] بڕ: پاچڤە

**پەچە**1 (نا. ل)[پەچ (پێچ) + ئە][باک: پەچە ـ ناو: پەچە ـ هەو: پەچە] پارچەیەکی تەنراوی رەش کە ژن لە کاتی چوونە دەر رووی پێدادەپۆشن، رووبەندی ژنان، پێچە.

**پەچە**2 (نا.)[؟] جێگا خەواندن و پشوو دانی ئاژەڵ.

**پەچەتە** (نا.)[هس: پەچە1] پارچەیەکی چوارگۆشەی سپی کە لە کاتی نان خواردن بە سەر کۆشی دادەدەن بۆ پیس نەبوونی جلوبەرگ.

**پەح** (ئام.) وشەیەک کە لە کاتی سەرسوڕمان و ناباوەڕیی دەردەبڕدرێ، پەحا، پەححا، پێح، تەح. ::: پەح لەو درۆ زلە! پەح کە سەیرە!

**پەحا** (ئام.) بڕ: پەح

**پەححا** (ئام.) بڕ: پەح

**پەحن** (ئان.)[باک] بڕ: پان

**پەحنی** (نا.)[باک] بڕ: پاژنە

**پەخ** (ئان.)[؟] حاڵی ئامرازێکی برین کە دەمەکەی پان بووبێتەوە و کەلکی برینی نەمابێ. **~ بوون:** تەخت بوون و پان بوونەوەی دەمی ئامرازی بڕین. **~ کردن:** پان کردن و لە کەلک خستنی ئامرازی بڕین.

**پەخش** (نا.) پرژ، بڵاو. **~ بوون:** بڵاو بوون. **~ بوونەوە:** بڵاو بوونەوە. **~ کردن:** بڵاو کردن. **~ کردنەوە:** بڵاو کردنەوە.

**تێبینی:** پەخش هاوڕیشە و هاومانایە دەگەڵ پرژ و هەردووکیشیان هاوڕیشەن دەگەڵ بەش1

**پەخشان** (نا.)[لە: پەخش] ١ـ پرژ، بڵاو. ٢ـ نووسراوە ئەدەبی کە شێعر نەبێ، نەسر. **~ بوون:** بڵاو بوون، پەخشین، پرژان. **~ کردن:** بڵاو کردن،

پەخشاندن، پرژاندن.

**پەخشـاندن** (چا. م)[لە: پەخش] بڵاو کردن، پەخش کردن.

**پەخشـاو** (نا. مفـ.)[لـە: پەخـشین] پرژاو، بڵاوبۆوە، پەرێشـان. ⁂ داخـۆ ئەمە ئەگریجەیە پەخشاوە بە سەر دا/ یا سـونبـولە کـردوویە سـەبا زولفی بە شانە (مەحوی ل ٢٨٠).

**پەخش و پەرێشان** (نا. ل)[پەخش + و + پەرێشان] پرژ و بڵاو، پەرش و بڵاو، پـەخـش. **~ بـوون:** بـڵاو بـوون، پەخـشین، پرژان. ⁂ ئاو لە سـەر پەلکی دە سـێوەڕێ دا دەبۆوە بە پەخش و پەرێشانە (گەنج ل ٨٧). **~ کردن:** بڵاو کردن، پەخشاندن، پرژاندن.

**پەخشە** (گیانـ.)[پەه: پەخشەک. لۆر: پەشـخـە (مـێش) ـ فـار: پشـە ـ کـرم: پێشێ. باک: پێشوو، پێشی، پێشیک، پێشیلک ـ ناو: پەخشە ـ باش: پەخشە ـ هەو: پەشە] حەشەرەیەکی چووکە، جۆری زۆرە، دوو باڵی هەیە. مێشوولەی ئاسایی درێژ و باریکە، لووتێکی درێژی هەیە بۆ هەڵمژینی خوێن و شـوێنی مژینەکەی لە سەر لەشی مرۆڤ خرووی دێنێ، Culex pipieux ناوی لاتینی ئەم جانەوەرەیە، تۆفانە، مخـمـخک، مـخک، مـرمـرک، مـەلەشـە، مـەرەشـە، مەرشە، مێشوولە، مەشوولێ.

**پەخـشین** (چا. م)[لە: پەخش] پەخش بوون، بڵاو بوون.

**پەخمە** (ئان.)[فـار: پخـمـە ـ گـیل: پەخمە] حاڵی مرۆڤی ساویلکە و نەفام، گێل.

**پەر** (ئان.)[؟] مەڕێکی سپی کە سەر و گەردنی رەش بێ.

**پەراسـوو** (ئا.)[هـیک: پەرسـو ـ ئەو: پێرێسو ـ سان: پارچڤە. باک: پارسوو، پاراسوو، پارەسوو، پەرانسوو، پارسی، پارسیو ـ ناو: پەراسوو، پەراسی ـ هەو: پەراسوو] هەر کـام لەو ئێسکە کەوانیانەی کە لە تیغەرەی پشتەوە خوار بوونەوە و سیەکانیان دە نێو خۆ گرتوە. لە لەشی مـرۆڤ دا رادەیان دوازدە جووتە، پەڕەکە.

**پەراسـووبەند** (ئا.)[پەراسوو + بەند] شوێنی سیپەلاک لە سینگ دا، قەفەسە، قەفسینگ، دەفەی سینگ.

**پەراسووە** (نا. ل)[پەراسوو + ئە] ئەو قامیشانەی کە لە زنج دا وەک رایەڵ دایدەمەزرێنن.

**پەراسی** (ئا.)[سۆر] بڕ: پەراسوو

**پەراکەندە** (نا. مفـ.)[پەھ: پەرگەندەک. پەش: پەراگـەندە ـ فـار: پراکندە. باک: پەراکەندە ـ ناو: پەراکەندە، پەراگەندە ـ هەو: پەرگـەندە ـ زا: پەرگـەندە] ١ـ بڵاو، پەخش، پەرێشـان ** لە کـۆ ئەسـرین دەبارێنم لەبۆ کـوردی پەراکـەندە/ لە گەرمێن غەرقی ئارەق بووم و چاوم هەر لە سامرەندە (ناڵەی جودایی ل ٢٦). ٢ـ حـەیوانی لە مـێگەل دوور کـەوتوو، ئاوەکی. ~ **بوون:** بڵاو بوون، پەخش بوون، پەرێشـان بوون. ~**کردن:** بڵاو کردن، پەخش و پەرێشان کردن.

**پەراگەندە** (نا. مفعـ.) بڕ: پەراکەندە

**پەرانسوو** (ئا.)[باک] بڕ: پەراسوو

**پەراوێز** (نا.)[پەر + ئاوێز][فـار: فـراویز، پروز. باک: پەراوێز، پەرواز ـ نـاو: پـەراوێـز ـ هـەو: پـەراوێـز] ١ـ پارچەیەکی باریک کـە لـە دیوی ژوورەوە لـە قـەراغی کـەواوی دەدروون. ٢ـ دەوراندەوری کتێب، جل یا هەرشتێکی دیکە. ٣ـ لێکدانەوە، تێبـینی یا شـی کردنەوەیەک کەسێک لە دەوری کتێب و نووسـراوەی دیکە. || **پەراوێزی ئاسمان:** ئاسۆ.

**تێبینی:** پەر لە ئەوێستـایی پەئیـرە paira یە، بە مـانـای دەوروبـەرە و بـە گـشـتی یانی دەوروبـەر ئاوێزان، لە دەوروبەر هەڵواسراو. هەروەتر پەرڤاز ـ ی زازایی بە مـانـای لاولاوە (قـەراغی دەرگـا) هەر لەم ریشـەیە و مـانایەکی دیکەی بە خۆیەوە گرتوە.

**پەرپەرک** (گیانـ.)[زا] بڕ: پەپوولە

**پەرپەرۆک** (گیانـ.)[باک] بڕ: پەپوولە

**پەرپەریک** (گیانـ.)[باک] بڕ: پەپوولە

**پەرپینە** (گـیـا.)[پەر + پینە] بڕ: پرپرە/ ١

**پەرت** (ئان.)[فار: پەرت ـ پەش: پرەت، پـرت. بـاک: پـەرت ـ نـاو: پـەرت ـ هـەو: پەرت] ١ـ شـوێنی دوورەدەست و لاڕێ. ٢ـ فڕێ، تووڕ. ٣ـ گێژ، تێنەگەیشتوو، لە راسـتی دوور. ٤ـ قـسـەی لێک دوور و بێمـانا. ٥ـ پرژ، پەرش، بڵاو. ~ **بوون:** ١ـ دوورەدەسـت بـوون و لاڕێ بـوونـی شوێنێک. ٢ـ تێنەگەیشتن و حاڵی نەبوون لە قسە و مەسەلەیەک. ~ **بەستن:** فڕێ دران، داکـەوتن. ~ **کـردن:** فـڕێ دان، تووڕ دان، هاویشتن.

**پـەرت وبـڵاو** (ئـان. ل)[پـەرت + و + بـڵاو] بـڕ: پـرژوبـڵاو. ~**و بـوون:** بـڕ:

پرژوبڵاو بوون. **~ کردن:** بڕ: پرژوبڵاو کردن.

**پەرت و پەلا** (ئان. ل)[پەرت + و + پەلا] ١ـ قسەی بێ سەر و بەرە، قسەیەک کە چی بە سەر چییەوە نەبێ. ٢ـ قسەی بێ سەروبەرەی نەخۆش، وڕێنە.

**پەرتووک** (نا. ل)[پەڕ + تووک1] کەمێک نان، پەنجەیەک نان، پەترۆک. ٢ـ کتێب، پەڕاو.

**پەرتەوازە** (ئان. ل)[پەرتە + واز + ئە] بڕ: پەڕەوازە. **~ بوون:** بڕ: پەڕەوازە بوون.

**پەرجان** (نا.)[باک] بڕ: پەرژین.

**پەرچ** (نا.)[لۆر: پەرچ ـ فار: پرچ ـ بیر: پەرچ. باک: پەرچ ـ ناو: پەرچ، پەچ ـ هەو: پەرچ] ١ـ بزمار و داکوتراوی خوار کراوە لە پشتەوە را. ٢ـ بزماری تایبەتی کە بۆ لێک بەستنەوەی دوو شت کەلکی لێوەردەگرن. ٣ـ سەرپەلی هەڵپەرتاوی درەخت. ٤ـ لەمپەر، کۆسپ. ٥ـ [باک] هەڵمساو. **~ دانەوە:** ١ـ خوار کردنەوەی نووکی بزمار و شتی داکوتراو. ٢ـ وڵامی قسە دانەوە. ٣ـ پێشبڕکە دانەوە. **~ کردن:** دوو شت بە پەرچ/٢ لێک قایم کردن، پەرچاندن.

**~ هاتنە بەر:** تووشی لەمپەر و تەگەرە بوون، کۆسپ هاتنە بەر.

**پەرچاندن** (چا. ل)[لە: پەرچ] لێک قایم کردنی دووشت بە بزمار یا شتی تیژی دیکە و خوار کردنەوەی سەرەکەی لە پشتەوە، پەرچ کردن، پەرچانن.

**پەرچانن** (چا، ل)[ئەر] بڕ: پەرچاندن

**پەرچانەوە** (چا. ل)[لە: پەرچ] داکوتران بزمار و شتی تیژ و خوار بوونەوەی لە بنەوە، پارچانەوە.

**پەرچڤین** (چا. ل)[باک] بڕ: پەرچڤین

**پەرچڤین** (چا. ل)[لە: پەرچ][باک: پەرچڤین، پەرچفین] هەڵمسان، ئەستوور بوون، با کردن.

**پەرچقاندن** (چا. م)[لە: پەرچە] لەت و کوت کردن، پارچە پارچە کردن، ورد و خاش کردن.

**پەرچقین** (چا. ل)[لە: پەرچە][باک] لەت و کوت بوون، ورد و خاش بوون، پارچە پارچە بوون.

**پەرچووکە** (نا. ل)[پەرچ + ئووکە] مووی سەر نێوچاوانی ژنان، پەرچەم.

**پەرچە** (نا. ل)[پەر (پار2)+ چە1] [باک ـ زا] بڕ: پارچە

**پەرچەم** (نا.)[تور: برجم] ١ـ موو و کاکۆڵی سەر نێو چاوانی ژنان، پەرچووکە. ؛؛ هەزار هێندە پەرێشان و سیاچارە بژیم هێشتا/ لە نێو دڵدا هەمە ئاواتی خاڵ و پەرچەمێکی تر (ناڵەی جودایی ل ٥٢) دڵ ئەگەر مەفتوونی دانەی خاڵەکەی سەر گۆنەتە/ خۆم ئەسیری پەرچەمی داوی بەڵاتم رۆحەکەم (بێخود ل ٥٦). ٢ـ موویی ناوچەوان کە بە قەیچی خشت کرابێ (خاڵ ب ١ ل ٢٣٣). ٣ـ ئاڵا، بەیداغ. ٤ـ میلەی باریک و درێژووکەی نێو گوڵ کە لە هەر گوڵێک دا ئەندازەکەی فەرق دەکا. & پارچەم

**پەرچین** (نا.)[باک ـ هەو ـ زا] بڕ: پەرژین

**پەرخ** (گیان.) بڕ: پەڵخ

**پەرداخ**[1] (نا.)[؟] دەفری ئاو و ئاوەکی تێدا خواردنەوە، لیوان، پەرداغ.

**پەرداخ**[2] (نا. چا)[فار: پرداخت] ١ـ لێک و لووس، تیفتیفە، جەلا. ٢ـ (ئان.) رازاوە، جوان. & پەرداخت. ٣ـ (نا.) کوتە کاغەزێکی تایبەتی کە لایەکی گڕنی گڕنیە و ئاسنەواڵە و دار و شتی دیکەی پێ لێک و لووس دەکەن. ~ **کردن:** لێک و لووس کردن، پەرداخت کردن.

**پەرداخت** (نا. چا) بڕ: پەرداخ2.
~ **کردن:** بڕ: پەرداخ کردن.

**پەرداغ** (نا.) بڕ: پەرداخ1

**پەردوو** (نا.)[بڕ: پەردە] ١ـ دیووی بووک و زاوا لە یەکەم شەوی پێکەوە خەوتنیان، پەردە/١، پاشپەردە، بووکینان. ٢ـ زەل و قامیشێک کە دوای دارەڕا لە سەری دادەنرێ و گڵەبانی لە سەر دەکردرێ، پردوو، سەرمیچ، لیشامە، لیشمە، هەڵاش. ٣ـ وردە چێوێکی تەنک و پان و چووکە کە لە نێوان دارەڕاکانی میچی دەدن و سواغی میچی لە سەر دەکەن. **بای ~ لێدان:** لە پەردوو دا هیچ پێنەکران لە بەر سام رێنیشتن و دڵەکوتە. سەرسام بوونی زاوا لە پەردوو دا کە تەنانەت دڵ تۆقین و پەردووگیر بوون و مەرگیشی بە دواوەیە.

**تێبینی:** پەردوو و پەردە هەر یەک وشەن. دوو پیتی **ئە** و **ئوو** ئاڵ و گۆڕیان دەگەڵ یەکتر هەیە وەک مردوو و مردە، بردوو و بردە، کوللە، کوللوو.

**پەردووگیر** (ئان. فا)[پەردوو/١ + گیر] سەرسامی زاوا لە پەردوو دا، پەردەگیر. ~ **بوون:** مردنی زاوا یا نەخۆش کەوتنی لە شەوی پەردوو دا،

پەردەگیر بوون.

**پەردە** (نا.)[پەھ: پەرتەک. پەش: پەردە ـ فـار: پردە. باک: پەردە ـ ناو: پەردە ـ زا: پـەردە] ١ـ دیـوی رازاوەی بـووک و زاوا لە یەکەمین شـەوی پێکەوە بوونیان، پەردوو/١، پاشـپـەردە. ٢ـ پارچە و قـوماشـێک کـە لە بەر پەنجەرە یا بەر دەرکە هـەڵیداوەسن. ٣ـ (مجـ.) نهـێنی، شـاراوە، نائاشـکرا. ٤ـ بەرگـر، بەرهەڵست. ٥ـ توێ، توێژ. ٦ـ ریخـۆڵە، بەن یا هەر چییـەکی لە سـەر دەسکی سازی مۆسیقا دەدرێ بۆ دەست لە سەر راگرتن و ناسینەوەی شـوێنی نۆتەکە. ٧ـ بەشـێک لە شـانۆ و نمایش. ٧ـ پارچە یا هەر شتێکی دیکە کە لە سینەما و کاری نمایش کـەلکی لێوەردەگـرن. **~ دران:** (کنـ.) ئاشـکرا بوونی شـتێکی نهـێنی. **~ دراندن:** (کنـ.) ئاشکرا کـردنی راز و نهـێنییـەک، پەردە لا سـەر دان. **~ لە سـەر لادان:** (کنـ.) ئاشکرا کـردنی نهـێنی و دەرخـستنی راسـتی مـەسـەلەیەک. **لە ~ دابوون:** نائاشکرا بوون، روون نـەبوونەوە، شـاراوە بوون. ‖ **پەردە پەردە:** توێژ توێژ، توێ توێ. **پەردەی بێدەنگی:** بێدەنگی. * **پەردەی بێدەنگی درین(دادرین):** وە دەنگ هاتن و بێدەنگی شکاندن. **پەردەی چاو:** کۆمەڵێک توێژ کە گـۆی چاویان داپۆشـیـوە. **پەردەی حـەیا:** (کنـ.) حـەیا، ئابڕوو، پەردەی شـەرم. * **پەردەی حـەیا درین:** (کنـ.) بێـشـەرمی کردن، بێ ئابڕوویی کردن، شەرم نەمان، پەردەی شـەرم درین. ⁘ تووله رێواسـی سـەری هەڵدا دڕی پەردەی حـەیا/ ناسک و تورت و سـپی وەک قـۆڵـی یاری نازەنین (هێـدی ل ١٧٥). **پەردەی سـەبووریی:** تاقـەت، سـەبووری، سـەبر گـرتن. * **پەردەی سـەبووریی دران:** (کنـ.) تاقـەت و سـەبر نەمان، سێبووری تەواو بوون. ⁘ پـەردەی سـەبوورییـم دڕیا، رۆڵـەڕۆ/ ریشـەی جـەرگـەکـەم بڕیا، رۆڵـەڕۆ (مـەولەوی ل ١٠٠). **پەردەی سـینەمـا:** پارچەیەکی سپی گەورە کـە لە سینەما هەڵیداوەسن و فیلمی لە سـەر نیـشـان دەدەن. **پەردەی شەرم:** (کنـ.) بڕ: پەردەی حـەیا. * **پەردەی شەرم درین:** (کنـ.) بڕ: پەردەی حـەیا درین. **پەردەی شـەرم و حـەیا:** (کنـ.) شـەرم، حـەیا، ئابڕوو، پەردەی حـەیا. * **پەردەی شـەرم و حـەیا درین:** (کنـ.) شـەرم شکان، بێـشـەرمی کـردن، پەردەی حـەیا درین. ⁘ لەبەر ئەوەی بەشـەرێکم زەبوونی دڵ، هەڵبەت/ حەقم بوو پەردەیی شـەرم و حەیام دڕی،

لام برد (گـۆران ل ٧٣). **پەردەی غـەیب:** دونیـای دیکە کە لە ئێمـە دیار نیـە و لێی ئاگادار نین، عـالەمی غەیب. ؛؛ ئەسرار پەردەی غـەیب مـەحـرەم پەیک/ سـایەی خودایی، سـلام علیک (مەولەوی ل ٣٥٨). **پەردەی گـوێ:** پەردەیەک کـە لە نێـو گـوێ دایە و دەنگ دەلەرزێنێتەوە، تەپڵی گۆش، تەپڵی گوێ. **پەردەی هەناو:** پەردەیەک کە منداڵ هەتا ئەودەمـەی کە دە زگی دایکی دایە تێـیـدا دەژی و دوای زان دەگــەڵی دێتە دەر، منداڵدان.

**پەردەپڵاو** (نا. ل)[پـەردە + پـڵاو] ١ـ جۆرێک پڵاوە بە کشمیش و بادامـەوە کە لە نێو برینجـەکە دا توێ توێ گۆشتیـان دانابێ. ٢ـ جۆرە پڵاوێکە پڕ لە کشمیش و بادام و کـفـتــەی ورد لە ناو دەفـرێکی تایبــەتی دا، دائەچێنرێ و پەردەیـەکی لە هـەویر بۆ ئەکرێ (خاڵ ب ١ ل ٢٣٣).

**پەردەپۆش** (نا. فــا)[پەردە + پـۆش] کەسێک کە راز نادرکێنێ، رازدار. **~ بوون:** راز راگــرتن ، ســرِ نەدرکــاندن، رازدار بوون. ؛؛ نەبوە، نابینی لە شــەو مـــەحـــرەمـــتـــرێ تا رۆژی حـــەشـــر/ پەردەپـۆشـــە، هـەمـــدەمـــە، هـەمـــدەردی عوششـاقانە شـەو (مەحوی ل ٢٥٨).

**پەردەپۆشــــیی** (حـم.)[پەردەپـۆش + ئیی] کـار و کـردەوەی کـەسی پەردەپۆش، شاردنەوەی نهێنی، رازداریی.

**پەردەدار** (نـا. فـــا)[پـەردە + دار] ١ـ کەسێک کە لە دەربـاری پادشاکان ئەرکی هەڵکێشـان و داکـێـشـانی پەرەکـانی بە ئەسـتـۆوە بوو. ٢ـ کـەسـێک کە ئاگاداری حـــەرم و شــــوێنـەکـــانی پیـــرۆزە. ٣ـ دەرکەوان.

**پەردەداریی** (حـم.)[پەردەدار + ئـیی] کـار و پیشـــەی کـەسی پەردەدار. ؛؛ چە حـەد بەرشـیـیـەن یەند نزاریم/ نـەمـەندەن تـاقـــەت رای پـەردەداریم (مـــەولـەوی ل ٤٧٨).

**پەردەک** (نا. ل)[پەردە + ک] مـەسـەلە یا قـسـەیەک کە ماناکەی روون و ئاشکرا نەبێ، قسـەی ژێر پەردە کە پێویسـتی بە لێکدانەوە هـەیە، مەتەڵ، مەتەڵۆکە.

**پەردەگیر** (ئان. فا)[پەردە + گیر] بڕ: پەردووگـیـر. **~ بوون:** بڕ: پەردووگـیـر بـوون. ؛؛ یـەک لـە نـەکـــــاو دێ، دەڵێ عـەبدولعـەزیز نەتزانی/ مـەلکەوانت مـرد، نێوچیـروانت پەردەگیـر بوو ... (گەنج ل ٢٢٧).

**پەرزم** (نا.)[زا] بڕ: پازوون

**پەرزوم** (نا.)[زا] بڕ: پازوون

**پەرژیان** (چا. ل)[ئەر] پێڕاگەیشتن، پرژانە سەر.

**پەرژین** (نا. ل)[پەه: پەرچیین. بیر: پەرچین ـ فار: پرچین ـ لۆر: پەرچی ـ گیل: پەرچین. باک: پەرچین، پەرجان، پەرژین ـ ناو: پەرژین، پەرگین ـ هەو: پەرچین ـ زا: پەرچین، پارچین] بەرهەڵستێکە لە دڕک و داڵ کە بە دەوری باغ و بێستان و شوێنێک دا دەیکێشن هەتا کەسی غەیر و گیاندار نەچنە نێوی.

**تێبینی:** پەرژین و هاوتاکانی لە دوو بەشی [پەر + ژین یا چین] پێکهاتوون. پەر لە ئەوێستایی پەئیرە paira بە مانای دەوروبەرە و چین بە مانای چنین پێکهاتوە و بە گشتی یانی دەورووبەر چنراو.

**پەرس**[1] (نا.)[هەو ـ زا] بڕ: پرس

**پەرس**[2] (نا. فا) بڕ: پەرست

**پەرست** (نا. فا)[لە: پەرستن] بە دوای وشە دا دێ و مانای پەرستنی ئەو شتە دەدا، پەرەست، پەرس. ⁂ جوانپەرست، تاوپەرست، خوداپەرست، بادەپەرست.

**پەرستار** (ئان. فا)[لە: پەرستن][پەه: پەرەستار] ١ـ ژنێک کە لە نەخۆشخانە ئیش دەکا و بە نەخۆشان رادەگا. ٢ـ ئاگاداری بێ ئەنوا و بێ دەستەڵات و نەخۆش. ⁂ ئەوەندە دەردەدار و بێ پەرستارم کە پێموایە/ لە سەر کێکی ئەمەن هەڵناکرێ تازە شەمێکی تر (ناڵەی جودایی ل ٥١).

**پەرستاریی** (حم.)[پەرستار + ئیی] ١ـ کار و پیشەی پەرستار. ٢ـ خزمەت، ئاگاداریی. **~ کردن:** پێڕاگەیشتن، تیمار کردن، خزمەت کردن بۆ چاک بوونەوەی نەخۆش و کەسی پێویست بە ئاگاداریی. **~ لێکردن:** خزمەتی کەسێک کردن، ئاگاداریی و پێڕاگەیشتن لە کەسێک.

**پەرستن** (چا. م)[ئێک: پەریشتا ـ پاز: پەرەستیدەن ـ پەه: پەرەستەن، پەریستیتەن. باک: پەرەستن، پەرستن ـ ناو: پەرستن] ١ـ عیبادەت کردنی خودا و هێزێکی سەرووتر. ٢ـ زۆر خۆش ویستن و بڕوا پێ هەبوونی لە رادە بە دەر بە کەس یا شتێک.

**پەرستگا** (نا. ل)[پەرست + گا] شوێنی پیرۆز بۆ پەرستن، شوێنی تاعەت و عیبادەت، مەعبەد، پەرسگە، پەرسگا.

**پەرسگا** (نا. ل)[پەرس + گا] بڕ: پەرستگا

**پەرسگە** (نا. ل)[پەرس + گا][ئەر] بڕ: پەرستگا

**پەرسیار** (ئان. فا)[پەرس + یار] کەسێک کە شتێک یا کەسێک دەپەرستێ.

**پەرسیلکە** (گیانـ.)[هەو] بڕ: پەڕەسلێرکە.

**پەرش** (نا.) بڕ: پرژ

**پەرش و بڵاو** (ئان. ل)[پەرش + و + بڵاو] بڕ: پرژوبڵاو. ~ **بوون:** بڕ: پرژوبڵاو بوون. ~ **کردن:** بڕ: پرژوبڵاو کردن.

**پەرڤاز** (نا.)[بڕ: پەراوێز][زا] کوتێک ئاسن کە دەچنە نێو یەکەوە و دەرگا و پەنجەرەی لە سەر دەگەڕێ، لاولاوەی دەرک و پەنجەرە.

**پەرک** (نا.) بڕ: پەرگ

**پەرکولۆڵ** (ئان. ل)[پەر + کوڵۆڵ] مەرێک کە سەر و گەردنی رەش بێ و سەر لووتی سپی بێ.

**پەرکەم** (نا.)[؟] نەخۆشییەکی عەسەبی و مێشکییە، نەخۆش گەشکەی دەگرێ و بێهۆش دەکەوێ، گەشکە، ئاتی، فێ، خوو، خی.

**پەرگ** (نا.)[؟] هەودای بادراوی دەزوو یا بەن کە کەڵاشی پێدەچنن، پەرک، پەرگە.

**پەرگار** (نا.)[یون: periɣa] ئامرازێکە لە دوو میلە کە سەرێکیان پێکەوە لکاو بەڵام توانای جووڵانەوەیان هەیە، بۆ کێشانەوەی جەغز و بازن کە سەرێکی لە سەر جێی خۆی دەچەقێ و سەرەکەی دیکە نووکی میدادی تێدەنێن و بە دەورێک سووڕاندنی جەغزێک دەکێشرێتەوە، پەرگار، پەڕگاڵ، جەغزینگ.

**پەرگە** 1 (نا.) بڕ: پەرگ

**پەرگە** 2 (نا.)[؟] گڵ و پەینێک کە بەهاران بە سەر بەفری سەر زەڕعاتی وەردەکەن هەتا زووتر بتوێتەوە، پرگە. ~ **هاویشتن:** پەین و خاک بە سەر زەوی داکردن بۆ زووتر توانەوەی.

**پەرگەما** (نا. ل)[پەرگ + ئە + ما؟] ریزە چنراوەی تەختی کەڵاش کە پەرگ لە سەر ئەوەوە دەست پێدەکا، تەختی کەنارەی کەڵاش.

**پەرگەندە** (نا. مفـ.)[زا] بڕ: پەراکەندە

**پەرگین** (نا.)[سـۆر] بڕ: پەرژین. ‹‹ کاکە سەرم چەند دێشێ، دەردێ لە درم بە برینە/ چوومە مارێ لەیلایێ دەرکەیان بە پەرگینە (سێسەد هۆنراوە ل ٨٠).لە کێم دیت و لە کێم دیت/ لە بن پەرگینێ رەزێ (فۆلکلۆر ل ٦٢).

**پەرلمان** (نا.) بڕ: پارلمان

**پەرمێشک** (گیا.)[؟] ١ـ گیایەکی خۆڕسکی گوڵ سپی یا ئەرخەوانییە، بەرەکەی دروویەکی خڕی وردی قولاپدارە کە بە سانایی بە جل و لەشی تووکنی گیاندارەوە دەنووسێ، Tti-folium arvens ناوی لاتینی ئەم گیایەیە. ٢ـ بەری ئەم گیایە کە دروویەکی تۆپنی وردی قولاپدارە. & نووسەکە، نووسەنەکە، هەرواڵە، پەنەرشکە، پەنیرشک، پەرەنشک، پەرەنێشک، پرمێشک، پەنەرێشکە، پەزشکە، پزیشکە. (عەر: حرشون)

**پەروا** (نا.)[فار: پروا] ترس، هەراس، باک، خۆف. **~ نەبوون:** نەترسان، بێباک بوون. ‹‹ بڕوانە سووتنم. وەرە بڕوا کە من نەمام/ پەروانەم ئیترم نیە پەروا کە من نەمام (مەحوی ل ٢١٣). **~ نەمان:** ترس نەمان، خۆف نەمان، ترس شکان. ‹‹ لە رووی تۆ دا نەما پەروای شەهیدانی نەبوو چاوت/ لە رۆژی حەشرێ ناترسێ، عەجەب تورکێکی بێباکە (وەفایی ل ١٢٨).

**پەروار** (ئان.)[پەه: پەرڤار. بیر: پەلڤار ـ فار: پروار ـ لۆر: پەرڤار. باک: پەروار ـ ناو: پەروار][لە: پەروەراندن] ١ـ مەڕ و ماڵاتی دابەستراو بۆ قەڵەو بوون. ٢ـ قەڵەو. **~ کردن:** دابەستنەوە، قەڵەو کردن.

**پەرواریی** (ئان. ل)[پەروار + ئی] مەڕ و ماڵاتی دابەستە و قەڵەو.

**پەرواز[1]** (نا.)[باک] بڕ: پەراوێز

**پەرواز[2]** (نا.)[فار: پرواز][کلاسیک] باڵ لێدان و فڕینی مەل لە ئاسمان، فڕین.

**تێبینی:** پەرواز ـ ی فارسی هاوریشەیە دەگەڵ پەڕەوازە ـ ی کوردیی هەرچەند ماناکان هەندێک لێک ترازاون. (بڕ: پەڕەوازە)

**پەروانە** (گیان.)[بڕ: پەپوولە][پەه: پەرڤانەک] ١ـ پەپوولە. ٢ـ [کلاسیک] جۆرێک پەپوولەی شەوفڕە کە بە دەوری چرا و رووناکی دا دەخولێتەوە و خۆ بە رووناکی دادەدا و دەسووتێ و لە ئەدەبی

کاسیک دا پتر بۆ ئاشقی سووتاوی بە کــار دێن. ∷ تا دڵ نەســووتێ دەم بە دەم، فانی نەبێ سـەر تا قەدەم/ پەروانە قەت ناگاتە شەم، هذا طريق العاشقين (وەفـــایی ل ٩٩) من و پەروانە دەمـــان کردە گرەو/ کێ لە سووتان بە گڕە، من یا ئەو (بۆ کوردستان ل ١١٢). ٣ـ پەڕەی مەکینە و ماشێن و فڕۆکە. ٤ـ ئیزن، ئیـجـازەی رۆیشتن لە شـوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە.

**پەروەراندن** (چا. م)[پەه: پەرڤەرتەن، پەرڤەرییتەن] ١ـ پێگەیاندن، رەعەمەل هێنان، بەرهەم هێنان. ٢ـ بە خێو کردن، پێگەیاندنی منداڵ. ٣ـ فێـر کـردن، بار هێنان. & پەروەردە کردن

**پەروەردگار** (ئان. فا)[پەه: پەرڤەرتار] [لە: پەروەرانـدن] ١ـ بەرهـەم هێنـەر، رەعەمەل هێنەر، مامۆستا. ٢ـ پادشا، شا. ٣ـ خودا. ∷ شوکر بۆ پەروەردگاری سـوبحـانی/ تۆ ئاگـات هەیە لە دەردی نیـــیـــانی (شـــێخ فــــەرخ ل ٦٥). ‖ **پەروەردگاری عالەم (عالەمین):** پێکێنەری دونیا، خودای ئەرز و ئاسمان.

**پەروەردە** (نا. مـف.)[لە: پەروەراندن] ١ـ پێگەیو، رەعەمەل هاتوو. ∷ بۆ رۆژی نیـــســـاری قـەدەمت ئەشکی وەفـــایی/ مرواریيە پەروەردە لە نێو کانی یەمەن دا (وەفایی ل ١١). ٢ـ بەخێو کراو. ٣ـ بار هـاتـوو. **~ بـوون**: ١ـ پێگەیشتن، رەعەمەل هاتن، هەڵدان، گەورە بوون. ٢ـ بەخـێـو بوون. ٣ـ فـێـر بوون، بە بەر گەیشتن، راهاتن، بار هاتن. **~ کردن:** بڕ: پەروەراندن.

**پەروین** (نا.)[فـار: پروین][کلاسیک] بڕ: پێروو

**پـەرۆز** (نـا. ل)[پـە + رۆز][زا] بـڕ: نیوەڕۆ

**پـەرۆژ** (نـا. ل)[پـە + رۆژ][زا] بـڕ: نیوەڕۆ

**پـەرۆژی** (نـا. ل)[پـە رۆژ + ئـی][زا] چێشتی نیوەڕۆ، نەهار، فراوین.

**پەرۆش** (نا.)[بڕ: پەرێشـــــان] دڵ نیگەران، نیگەران، خـەم، پەرێشـانی و سـەخڵـەتی دڵ. **بە ~ بوون:** نیگەران بوون، خاترجەم نەبوون لە بابەت کەسێک یا شتێکەوە. **~ بوون:** نیگەران بوون، خاترجەم نەبوون، پەرێشان بوون. **~ی کــەســێک هەبوون:** دڵ نیگەران بـوون، پەرێشان بوون لە بابەت کەسێکەوە.

**پـەرە**[1] (نـا.)[؟] رەواج، بـرەو، پـلـە،

بەرەو زیادیی. ~ **بەستن:** بڕ: پەرە گرتن. ~ **پێدان:** لێ زیاد کردن، بەربڵاو کردن و گەورەتر کردنەوەی کار و مەسەلەیەک. ~ **سەندن:** بڕ: پەرە گرتن. ~ **گرتن:** بەربڵاوتر بوون، وە رەواج و رەمێن کەوتن، لێ زیاد بوون، پەرە سەندن، پەرە بەستن.

**پەرە**[2] (نا.)[باک ـ زا] بڕ: پارە

**پەرە**[3] (نا.)[سۆر] بڕ: پەڵە

**پەرەست** (نا. فا)[لە: پەرەستن][باک] بڕ: پەرست

**پەرەستن** (چا. م)[باک] بڕ: پەرستن

**پەرەسێلک** (گیان.)[باک] بڕ: پەڕە سلێرکە.

**پەرەنشک** (گیا.) بڕ: پەرمێشک

**پەرەنگ**[1] (نا.) ١ـ شتی وردە کە گوارە نراوە، لەرزانە. ؛؛ لاس دەیکوت: کیژێ بەوجوورە بێ ئیلتیفاتم مەدوێنە/ ... وردە پەرەنگ لە گواران بە جەولانە بێنە (لاس و خەزاڵ ل ١٦٣). ٢ـ هەر شتێکی وردی زێدە کە بە شتێکی هەڵاوەسراوە لکابێ.

**تێبینی:** بە رای من پەرەنگ لە دوو بەشی [پەر + ئەنگ] پێکهاتوە. پەر لە ئەوێستایی پەئیرە paira بە مانای دەوروبەرە و ئەنگ لە ریشەی ڤەئێگ vaeg ـ ی ئەوێستایی بە مانای هەڵاواسین کە لە زمانی ئاڵمانی و سوێدیش دا بە شێوەی هێنگ häng هەر بەو مانایە ماوە. بەو پێیە پەرەنگ دەبێتە ئەو شتەی کە لە دەوروبەر و کەنار هەڵواسراوە. (هس: ئاونگ1)

**پەرەنگ**[2] (نا.)[بڕ: پەنگر] سکڵ، پۆلوو، پەنگر

**پەرەنگدار** (ئان. فا)[پەرەنگ1 + دار] هەرچێک کە پەرەنگی هەبێ، بە پەرەنگ. ؛؛ گوارەی پەرەنگدار، رەشمەی پەرەنگدار.

**پەرەنگۆڵ** (نا. ل)[پەرەنگ1 + ئۆڵ] پەرەنگی وردەی گوارە، لەرزانە، پەرەنگۆڵە. ؛؛ ئەوساڵەکە حەوت ساڵە سێ ماچم دەستقەرزن لە سەر بەژنێ باریک/.../ ئەوە یەکیانت هەڵدەکێشم بۆ بن پەرەنگۆڵی دە گوارێ (گەنج ل ٢٢٣).

**پەرەنگۆڵە** (نا. ل)[پەرەنگۆڵ + ئە] بڕ: پەرەنگۆڵ. ؛؛ ئەمن ئەو ساڵەکانە، حەوت دانە ساڵە/ لە دوای قەفی سمێڵی شۆڕەسوارێ عەبداڵم/ هەر بیکەمەوە پەرەنگۆڵەی دە گوارێ (کانی مەرادان ل

١٨٧).

**پەرەنێشک** (گیا.) بڕ: پەرمێشک

**پەرەی** (ئاک.)[زا] بڕ: پێڕێ

**پەری** (نا.)[ئەو: پەئیـــریکا ـ پەه: پەرییک، پەرییگ. باک: پەری، پێـــری ـ نـاو: پـەری ـ زا: پەری، پـێـــــــری] ١ـ بوونەوەرێکی خــەیاڵیــیـــە، ژنێکی زۆر جوانی باڵدارە کە توانـای فڕینی هەیە و کاری چاکی لێدەوەشێتەوە. // دێو. ⁂ دێم و ناترسم لە پـــەرژینی بـــە زی/ هەر پەری سـەرکەوت و دێوەزمـە بەزی (نـاڵەی جـــــــودایی ل ٢٤). ٢ـ [باک] پەپوولە. ٣ـ (مجـ.) ژنی جوان و چەلەنگ. ٤ـ ناوە بۆ ئافـرەت. ⁓ **دەست لێـدان:** (کنـ.) شـێت بوون، ئەقڵ نەمــان، پەری دەست لێـوەشـاندن، پەری دەست لە دڵ دان. ⁂ حەقە کە وەکوو وەفایی شێت و شـەیدای سـەحرایی/ مـەلەکـان خـۆیان نیـشان دام، پەرییـان دەسـتیـان لێداوم (وەفـایی ل ٧١). ⁓ **دەست لە دڵ دان:** (کنــ.) بڕ: پـەری دەسـت لێـــــدان. ⁂ دەیگوت: پاش شــۆڕمـــەحــمـــوود ئەمن پەریان دەسـتیـان لە دڵم داوە/ چپکەم، چم لێـقـەومـاوە، بۆ عـەقڵم پەشـۆکـاوە (شـۆڕمـەحـمـوود ل ٨١). ئەتۆ شـێـتی شـەیدای یان پەریان دەسـتیــان لە دڵت داوە (لاس و خـــــەزاڵ ل ١٠٠). ⁓ **دەست لێوەشاندن:** (کنـ.) بڕ: پەری دەست لێـدان. **زەدەی دەســتی ⁓ بوون:** شـێت بوون، پـەری دەست لێـدان، پـەری دەست لێـوەشــاندن. ⁂ لۆمـەیی نالیـی دێوانە مــەکـەن ئەی عـوقـەلا/ ئەمـە مـوددێکە زەدەی لەتمەیی دەسـتی پـەرییـە (نـالی ل ٥٨٧). || **پەری ئازادیی:** سەمبوولێک بۆ ئـازادی و رزگــاریی. ⁂ تـا بە دەســـتی پەری ئازادی لـە سـەر گـۆڕی شـەهیـد/ گـوڵە شللێـرە لە گـشت لایەکی نەڕوێن دەگـــریم (تاریک و روون ل ١٦٤). **پەری دەریایی:** گــیـانـدارێکی خـــەیاڵی نێـــو چیــرۆکـانە، نیـوەی ســەرەوەی لەشی ژنێکی زۆر جـوان و نیـوەی خـوارەوەی وەک مـاسی وایە و لە نێو ئاو دا دەژی و جار جارە لە سەر رەوەزە بەردی نێو ئاو دادەنیـشێ و گـۆرانی دەڵێی و مـەلوانان هەڵدەخەڵەتێنێ.

**تێبینی:** پەری لە ئەوێستا دا بە هاوتا و هاوکـاری دێو و جندۆکـە داندراوە و لە بەر دەستی ئەهریمەن دایە هەتا خەڵکی ئیماندار بە جوانیی خۆی هەڵخەڵەتێنێ.

**پەریبڕ** (ئان. فـا)[پەری + بڕ (بڕین)] منداڵێکی کوڕ کە لە کاتی زان دا پارچە

گـۆشـتـی زێدەی سـەر سـیـرەتـی نەبێ و پێویستی بە خەتەنە کردن نەبێ.

**پەری روخـــســـار** (ئان. ل)[پەری + روخـــســـار] کــەســێک کــە ســیـمـــا و روخسارێکی زۆر جوانی هەیە، روخسار و سـیـمـای وەک پەری، پەریڕوو. ⁂ تۆ دڵت دێوانە کردم، ئێستەکەش/ نانوێنی روو، پەری روخـســار هەی (مـەحـوی ل ٣٢٢).

**پەریڕوو** (ئـان. ل)[پـەری + روو] ژنـی جـوانی وەک پەری، پـەری روخـســار. ⁂ خەیاڵم وایە خەڵقە من کە تەرکی عەشقی دولبەر کەم/ ئیتر میهری پەریڕوویان بە یەکجاری لە دڵ دەرکەم (ئەحمەد موختار ل ٨٣).

**پەریوەشان** (گیا.) بڕ: پەرسیاوەش

**پەریزاد** (نـا. ل)[پـەری + زاد] ١ـ ژنـی زۆر جوان و شێوە پەری وەک ئەوەی کە لـە پـەری زا بـێ، پـەریـزادە. ⁂ ئـەی پـەریزادی مــەهـابـادی ئەتۆ ون بووی لە من/ تۆم هەبێ کـوانێ پەریزادە و پەری چینم دەوێ؟(هێمن). ٢ـ ناوە بۆ مێینە.

**پـەریـزادە** (نـا. ل)[پـەری + زادە] بـڕ: پەریزاد.

**پەریشـاڕوخ** (گیـانـ.)[پەری + شـا + روخ] مـەلێکی چووکـی حـەڵاڵ گۆشـتـە بە رەنگـی زەردی زێڕن و ســپـی بـە خـــەتی قـاوەیی. نێـرەکـەی پـتـر پشـتـی رەش و باقی پڕەکانی زەردی لیمۆیی و زێڕینە و مێیەکەی ئەبڵەقی زەرد و رەشـە (فرهنگ پرندگــان ل ٤٥)، oriolus oriolus caucasicus Sar نـاوی لاتـیـنـی ئـەم مـەلەیە، زەردی شـامـی، هەنجـیـرەوەرە، هەنجیرەخۆرە، هەنجیرخۆرە.

**پەریشـــان** (ئان. فـا)[بـاک ـ زا] بڕ: پەرێشان

**پەریشـانیی** (حم.)[پەریشـان + ئیی] بڕ: پەرێشانیی

**پەری شێوە** (ئان. ل)[پەری + شێوە] ژن و کـچـێکی جـوان کـە لە جـوانی دا شـێـوەی پـەری بدا. ⁂ دەڵێ هـەرکـەس ببینێ یار و ئەغیـاری بە ئەتراف/ خـودا چین ئەم هەمـوو دێوە لە دەوری ئەم پەری شـێـوە (مـەحـوی ل ٢٩٠) وتم فـیـدایی جـەمـاڵت بم ئەی پـەری شـێـوە/ ئەوا توایەوە هەسـتـیم بە سـۆزشی گـریەت (گۆران ل ١٩).

**پەرێز** (نا.) زەوییـەک کـە دەغلەکـەی درواوە و تەنیـا بەشێکی لاسکیـان بە جێ

مـــاوه، جێ دەغـــڵی درواو، پرێزە. ⁂ مـانگەشـەو خـۆشـە مـانگ لە پـەرێزێ/ دۆســتی جــوانت بێ پڕ بە ئامــێــزێ (فۆلکلۆر)

**تێبینی:** پەرێز لە ریشەی ئەوێستایی پەئیری دەئێزە pairi daeza بە مانای باغ یا بێـسـتـان کـەوتوە و من پێـمـوایە پەرێز دەبێ پێـشـتـر مـانایەکی دیکەی هەبووبێ و ئیـمرۆکە ئەم مـانایەی لێ بە جێ ماوە. لە زاراوەی باکووریی دا پارێز بە مـانای بێستـان ئەو مـانایەی هێشتـا راگرتوە.

**پەرێش** (ئان. فا) بڕ: پەرێشان

**پەرێشـــان** (ئان. فـــا)[پەه: پـەریش. باک: پەریشان، پـەرۆش ـ ناو: پەرێشـان، پـەرێش، پـەرۆش ـ هەو: پـەرێشـــان ـ زا: پەریشـان] ١ـ بـڵاو، پەخش. ٢ـ بێـهـۆش، بێـحـاڵ، گـێـژ. ٣ـ دڵ بە خـەم، نیگەران، پەرێشـحـاڵ، پەرۆش. ~ **بوون:** ١ـ بڵاو بوون، پەخش و لێک بڵاو بوون. ٢ـ گێژ و بێـــحـــاڵ بـوون. ٣ـ دڵ بـە خـــەم بـوون، نیگەران بـوون، پەرۆش بـوون. ⁂ ئەمـــا ئاغـــام زۆری پـەرتە ئەو خـــەیاڵە/ فکرت زۆر پەرێشــان و گــەواڵ گــەواڵە (لاس و خەزاڵ ل ٤). ~ **کردن:** ١ـ بڵاو کـردن، پەخش کـردن. ٢ـ گێـژ و بێـحـاڵ کـردنی کەسێک. ٣ـ دڵ بە خـەم کـردن، نیگەران کردنی کەسێک، پەرۆش کردن.

**پەرێشـانحـاڵ** (ئان. ل)[پەرێشـان + حـاڵ] حـاڵ پەرێشـان، شـێـواو، نیگەران، پەرێشــحــاڵ، دڵ پـەرێشــان. ~ **بوون:** پەرێشـان بوون، نیگەران بوون، شـێـوان، پەرێشحـاڵ بوون.

**پەرێشحاڵیی** (حم.)[پەرێشـانحاڵ + ئیی] پەرێشـــانیی، نیگەرانیی، دڵ بە خەمیی، پەرێشحاڵیی

**پەرێشـانیی** (حم.)[پەرێشـان + ئیی] ١ـ لێک بڵاویی. ٢ـ گێژیی، شێـواویی. ٣ـ نیگەرانیی، پـەرێشـــانحـــاڵیی، دڵ بـە خەمیی. & پەریشانیی

**پەرێشحاڵ** (ئان. ل)[پەرێش + حاڵ] حـــاڵ پەرێشـــان، شــێــواو، نیگەران، پەرێشـان. ~ **بوون:** بڕ: پەرێشـانحـاڵ بوون. ⁂ شـەوێ خـەونی دی؛ دە خـەونی دا زۆر پەریشـحاڵ و پەرێشـان بوو (گەنج ل ٢٨٥).

**پەرێشـحـاڵیی** (حم.)[پەرێشـحـاڵ + ئیی] پەرێشــــانیی، نیگەرانیی، دڵ بە خەمیی.

**پەڕ**[1] (نا.)[هیک: پەرنە ـ ئەو: پەرێنە ـ

پەھ: پەر، پەرر، پەررەک. باک: پەرک، پەڕ، پوورت ـ ناو: پەڕ ـ هەو: پەڕ ـ زا: پەڕ] ١ـ ئەو تووکەی کە لەشی مەل و باڵندەی داپۆشیوە و سێ جۆرن: شاپەڕ کە لە سەر کلک و باڵییەتی، پەڕ کە لەشی داپۆشیوە، کورک کە تووکێکی وردە و لە ژێرەوەی پەڕەکانە. ٢ـ سەفحەی دەفتەر و کتێب، وەرەقی کاغەز. ٣ـ وەرەقی کایە و قومار. ٤ـ (مجـ.) باڵ. ٥ـ کوتێک لە گوڵ، پەلک، پەڕە. ؛؛ پەڕی گوڵ. || **پەڕی گوڵ:** ١ـ بەشێک لە تەواوەتی گوڵێک، پەلک. ٢ـ (مجـ.) کچ و ژنی زۆر جوان و ناسک. & پەڕەی گوڵ

**پەڕ**[2] (ر.) لە ریشەی پەڕین دەکەوێ و ئەو مانایانە دەدا. ١ـ ئاوا، ون. ؛؛ تاوپەڕ، رۆژپەڕ، زەردەپەڕ. ٢ـ جیا، پەڕیو. ؛؛ پووشپەڕ. ٣ـ دوور. ٤ـ قەراغ، کەنار، دەور. ٥ـ ئاخر، دووماهی. ~ **بوون:** دوور کەوتن.

**پەڕ**[3] (ئان.)[هەو] بڕ: پڕ1

**پەڕانپەڕ** (ئاک. ل)[پەڕ2 + ئان4 + پەڕ2] دەورانەدەور. ~ **گرتن:** دەوراندەور گرتن، دەوری کەسێک یا شتێک گرتن، گەمارۆ دان. ~ **گیران:** دەوراندەور گیران، گەمارۆ دران.

**پەڕاندن** (چا. م)[لە: پەڕین] ١ـ شکاندن و بڕینی هەر چێک بە قەو وەها کە دەرپەڕێ. ؛؛ سەر پەڕاندن، دەست پەڕاندن. ٢ـ بەجێ هێشتن، تێپەڕاندن، بواردن. ؛؛ خەتێکی ئەو نامەیەت پەڕاند و نەتخوێندەوە. ٣ـ لە پشت سەر نان، پەڕینەوە. ؛؛ نیوە شەو سنوورمان پەڕاند. ٤ـ هاویشتنە سەری نێریی گیاندار بۆ جووت بوون دەگەڵ مێیەکەی.

**پەڕاندنەوە** (چا. ل)[پەڕاندن + ئەوە] ١ـ کەسێک لە ئاو، شەقام و لە هەر پانایییەک بردنە لای دیکەی. ٢ـ (مجـ.) رزگار کردنی کەسێک لە بەڵا، مەترسی و هەر شتێکی دیکە.

**پەڕانەوە** (چا. ل)[پەڕان + ئەوە] ١ـ تێپەڕاندنی پانایی رێگا، شەقام و رووبار و شتی لەم بابەتە. ؛؛ منداڵەکان لە شەقام پەڕانەوە. ٢ـ (مجـ.) تێپەڕین و رەد کردنی بەڵا و مەترسی و هەر شتێکی لەم بابەتە. & پەڕینەوە.

**پەڕاو** (نا. ل)[پەڕ + ئاو؟] ١ـ بەستەیەک کاغەزی تایبەتی جگەرە پێچانەوە. ٢ـ کتێب، پەرتووک.

**پەڕاو** (نا. مف.)[لە: پەڕین] ١ـ زایە

بوون، تێکچوونی باری ئاسایی. ⁘ ڕەنگ پەڕاو. ٢ـ چوونە هەوای و بوونە هەڵمی ئاوەکی نێو شتێک لە ماوەیەکی درێژ خایەن دا. ٣ـ نەمانی بۆن عەتر یا شتێکی دیکە.

**پەڕبەپەڕ** (نا. ل)[پەڕ2 + بە + پەڕ2]
بڕ: پەڕپەڕ

**پەڕبەستە** (ئان. ل)[پەڕ1 + بەستە] مەلێک کە باڵی بەستراوە، باڵ بەستە.

**پەڕبەسەر** (ئان. ل)[پەڕ1/١ + بە + سەر] شاز، ناوبەدەرەوە، ناسراو، بەناوبانگ. ⁘ کوتی ئەتۆ نەچووبووی کابرایەک بێنی بۆ گوڵندام کە دەنێو ئەوانە دا پەڕبەسەر بێ؟ (بارام و گوڵندام ل ٧١). دەبڕۆ خەریک بە لە کار و ئەوە پێک هات کار و بارە/ تێگرا پیرۆزباییان لێکرد پەڕبەسەر و میر و بەگلەر و ئیختیاردارە (سەعید و میرسێوەدین ل ١١٥).

**پەڕبەڵەکە** (گیانـ.)[پەڕ1 + بەڵەک + ئە] مەلێکی ڕاوکەرە (چەند جۆری هەیە). مارمێلکە، مشک، باڵندەی بچووک و جڕوجانەوەر دەخوا. دندووکی چووک و بەهێزە. قاچی بە قەوەت و چنگی تیژە. لە شوێنی بەرز هەڵدەنیشێ و بەرەو نێچیر لوور دەبێتەوە. تیژفڕە و بە تەنیا دەژی و لە سەر دار هێلانەی دەکا، laniidae ناوی لاتینی ئەم تۆرەمەیە، باڵبەڵەکە، سەقری مێشخۆر، قجی، قجی بەڵەک، قجی چاوڕەش، چۆلەکەگرە.

**پەڕپووت**[1] (ئان. ل)[پەڕ2 + پووت4] شتی کۆن و لەبەر یەک هەڵوەشاوە، پواو، ڕزیو. ~ **بوون:** پوان، ڕزین.

**پەڕپووت**[2] (گیانـ.)[پەڕ1/١ + پووت] جۆرێک مراوی. ⁘ هاتەوە تەیرەکەی گەرمێنێ، بەو تەیرەم دەڵێن پەڕپووتە/ تیژ باڵی خۆی لێدەداوە نیشت لە مەزراکەی تەمووتە (کانی مرادان ل ٨٩).

**پەڕپەڕ** (نا. ل)[پەڕ2 + پەڕ2] ١ـ دڕاو، لەت و کوت، دڕبەدڕ. ٢ـ لێک هەڵوەشاو، وەریو. ~ **بوون:** ١ـ دڕان، لەت و کوت بوون، دڕبەدڕ بوون. ٢ـ هەڵوەرین. ~ **کران:** ١ـ دڕان، لەت و کوت کران. ٢ـ هەڵوەران. ⁘ دەبێ چەند بەرد لە هێلانەم گرابێ/ گوڵی سوورم چلۆن پەڕپەڕ کرابێ (تاریک و ڕوون ل ١١٢). ~ **کردن:** ١ـ دڕاندن، دڕبەدڕ کردن. ٢ـ هەڵوەراندن، هەڵوەشاندن

**پەڕپەڕۆچکە** (نا. ل)[پەڕ2/٥ +

پەڕ2/ە + ڕۆچ + کە] بەرزترین شوێنی ئاسمان، تەشق، تەشک، پەڕپەڕۆچکەی ئاسمان. || **پەڕپەڕۆچکەی ئاسمان:** بڕ: پەڕپەڕۆچکە.

**پەڕسیاوەحش** (گیا.) بڕ: پەڕسیاوەش

**پەڕسیاوەش** (گیا.)[ئەو: پەرێنۆ سیاڤەرشانەهێ. لۆر: پەرێ سیۆڤەش - فار: پرسیاوشان. ناو: پەریوەشان، پەڕسیاوەش، پەڕسیاوەحش، پەلی سیاوشان - هەو: پەلوسیاوەحشی] گیایەکی ساقەت باریک و ناسکە، گەڵای وردە، لە شوێنی شێدار و بە سێبەر دەڕوێ، لە دێم کراوەی ئەم گیا بۆ هەندێک نەخۆشی و ناسازی وەک هەڵامەت و یاو کەلکی لێوەردەگرن. Adiantum capillus Veneris ناوی لاتینی ئەم گیایەیە.

**پەڕش 1** (نا.) بڕ: بڕوێش

**پەڕش 2** (نا.) بڕ: پڕژ

**پەڕش وبڵاو** (ئان. ل)[پەڕش2 + و + بڵاو] بڕ: پڕژوبڵاو. **~ بوون:** بڕ: پڕژوبڵاو بوون. **~ کردن:** بڕ: پڕژوبڵاو کردن.

**پەڕشت** (نا.) بڕ: بڕوێش

**پەڕشە** (نا.) بڕ: بڕوێش

**پەڕک** (نا. ل)[پەڕ + ک][باک] بڕ: پەڕ1

**پەڕکوور** (گیان.)[پەڕ1 + کوور] جۆرێک هەڵۆیە کە لە هەڵۆکانی دیکە بەهێزتر و تیژتر و بەرزەفڕترە.

٧٥ تا ٨٣ سانیتیمێرە، کلکی پان و چوار سووچە. شاپەڕی پێشەوەی باڵی بڵاو و قیتە. پەڕ و باڵی تەواو بۆری توندە؛ سەر و پاش مل و شاپەڕی وردی باڵی تەڵا ڕەنگە. بە بارێی لە سەر ئەستوورایی باڵی تووکی سپی دەبینرێ. کلکیشی سپییە و خەتی پانی ئاماڵ ڕەشی لە سەر کلکی دایە. بە چوونە سەری تەمەن ئەو سپیایە لە کەمی دەدا. بە هۆی گۆڕانی ڕەنگی پەڕ و باڵی ئەو باڵندەیە بە بارێ لە گەڵ هەڵۆکانی تر بە چەتوونی لێک جوێ دەکرێتەوە. لە کوێستانی کەم گیا و ئیشک و ڕووتەن، ڕەوەزی قەراغ بەحران و دەشتان دەژی. لە سەر لێواری هەڵدێران و جارجاریش سەر داران هێلانەی دەکا. (فەرهەنگی باڵندە ل ١٧٨). Aquila chrysaetos ناوی لاتینی ئەم مەلەیە، پەلکوور. (فەر: Aigle royal)

**پەڕگار** (نا.) بڕ: پەرگار

**پەڕگاڵ** (نا.) بڕ: پەرگار

**پەڕگــــەندە** (نـا. مـــف.)[هـەو] بـڕ: پەراکەندە. ⁘ قەیس ئاسا نە خێڵ شای شــەم مــەندە من/ وێڵ و دەربەدەر فــام پەڕگەندە من (وەلی دێوانە ل ٧١)

**پەڕوبـاڵ** (نـا. ل)[پـەڕ$1$ + و + باڵ$1$] بڕ: پەڕوپۆ. ⁘ دڵەی بـێ هۆش و گـۆشم مـوددەتێکە هـەر دەناڵێنێ/ خودا روحمێ بکەی بـەو مـورغی حـەپسی بێ پـەڕوباڵم (وەفایی ل ٦١).

**پـەڕوپـۆ** (نـا. ل)[پـەڕ$1$ + و + پۆ] ١ـ بـاڵ و پەڕ. ٢ـ (مـــجـ.) هـێـــز و گـــوڕ، تـوانـایی. & پـەڕ و بـاڵ، پـەل و پـۆ. **~ لێنان:** لـێ زیاد کـــردن و گـــەورەتر کـردنەوەی قـســە و رووداو و شـتـی لەم بـابـەتـە، پـەڕوبـاڵ لـێـنـان. ⁘ خــــۆی داسـتـانـێکی کورت بـوو، من پەڕوپۆم لێنا و کـردمــە رۆمـانـێک. **~ هەڵـوەرین:** ١ـ هـەڵـوەریـنـی تـووک و پـەڕ. ٢ـ (کـنـ.) بێدەستەڵات بوون، گوڕ و تین نەمان. ⁘ بە سـۆز و داخــەوە دەیـگوت فــەقـیـرم/ پەڕوپۆم هەڵوەری، بێوادە پیرم (تاریک و روون ل ١١٢). **لە ~ کــــــەوتـن:** لـە دەســـتـــەڵات کـــەوتن، نـابووت بـوون، تێداچوون.

**پەڕۆ** (نا.)[لوڕ: پەڕو. ناو: پەڕۆ ـ هەو: پەڕۆ] ١ـ پارچـە و قـومـاشـی کـۆن، چات. ٢ـ پارچەی کـەم نـرخ و بێکەلک. **~ لە کـەسـێک دادڕین:** (کنـ.) فـێـر بوون و رەچاو کـردنی کردەوە و ئاکاری کەسێک وەک سـەرمـەشـق، بزگـوڕ لە کـەسـێک دادڕین. ⁘ ئەی ئەو کەسە کـە مـەستی غــورووری بە هـاتی کـار/ بـەو دەســتی زۆرە بدرە پـەڕۆیـەک لـە کــــاری چار (مـەحـوی ل ١٢١). || **پەڕۆی شین:** (کنـ.) نەنگ، ســەرشــۆڕیی، بـێ ئابڕوویی. ⁘ بەڵام بـۆ من دەبێـتـەوە پـەڕۆیەکی شین هەتا دونیا خرا دەبێ/ دەڵێن خەزاڵ هەر ئەو نەجـیمـە نەبوو شـوانێکیان لـە سـەر دەکوشـتـییە (لاس و خـەزاڵ سروە ٨٨ ل ١٤). بێهوودە بوو گفت و پەندی تاژدین/ نەیتوانی لە میر وەکا پەڕۆی شین (مەم و زین ل ٢٩٢).

**تێبینی:** پەڕۆ هەمان وشـەی پارە ـ یە کە هەندێک شێوەی گۆڕاوە.

**پەڕۆ و پاڵ** (نـا. ل)[پەڕۆ + و + پـاڵ] کـــۆگـــایەک پارچـە و پەڕۆی بێنـرخ و بێکەلک.

**پەڕە** (نا. ل)[پـەڕ + ئە][پـەه: پەررەک]

١ـ چەن تەختەیەک وەک کەوچک کە لە تۆپی ئاش دەبەسترێ، هەتا ئاو بە تەوژمی خۆی بیانسووڕێنی و تۆپەکە وەگەڕ بخا. ٢ـ هەر شتێکی زێدەی دەوری چەرخ و تۆپ لە ئامراز و مەکینەی دیکە دا. ٣ـ داوێن، کەنار. ∷ پەڕەی بیاوان. ٤ـ کوتێک لە گوڵ، پەلک، پەڕ. ٥ـ شی کردنەوە و لێک جوێ کردنەوەی هوڕەی لۆکە و خوری بە کەوان، کاری هەللاج. ٦ـ [زا] لا، لایەن، تەرەف. **بە ~ کردن:** لێک هەڵوەشاندنەوەی لۆکە و خوری بە کەوان || **پەڕەی گوڵ:** بڕ: پەڕی گوڵ.

**پەڕەچیغ** (نا. ل)[پەڕ + ئە + چیغ] [سۆر] بڕ: بادەوە1

**پەڕەسللێرکە** (گیانـ.) بڕ: پەڕەسلێرکە

**پەڕەسللێرە** (گیانـ.) بڕ: پەڕەسلێرکە

**پەڕەسلێرکە** (گیانـ.)[پەه: پەرەستووک. باک: پەرەسێلک، پەرەسێلکە، پیلستەنگ، پلیسرک ـ ناو: پەڕەسلێرە، پەڕەسللێرە، پەڕەسلێرکە، پەڕەسێلکە، پلیسرگ، پەڕەسلێنکە ـ باش: پلیسرک ـ هەو: پەرسیلکە، پلیسیری] مەلێکە لە زۆربەی وڵاتان هەیە، کلکی درێژ و دوو هاچەیە، دندووکی هەندێک پان و سێ سوویە، تیژ باڵە و لە حەوا لە کاتی فڕین مێشوولە و جڕ و جانەوەری وردی دیکە دەخوا، هێلانەی لە نێو ئاوایی و لە کەلێن دیوار و گوێسوانان دەکا و گەرمێن و کوێستانێ دەکا. Hirundo ناوی لاتینی ئەم باڵندەیە، قەرنەقووچک، دووڤ مەقەسک، حاجحاجک، حەجحەجک، حەجحەجۆک، حەجیرەشک. || **پەڕەسلێرکەی خیزەڵان:** ١٢ سانتیمێترە. پشتی قاوەیی کاڵە. بەرزگی سپییە و خەتی قاوەیی بە سینگی دا کشاوە. مێش و مەگەز و دانەوێڵەی سەر ئاو دەخوا. لە شوێنی ئاوەڵا، لە کەناری چۆم و ئاوگران بە گەل دەژین. لە کونی کەندالی رووبار و رەوەزان هێلانەی ساز دەکا (فەرهەنگی باڵندە ل ١٩)، Riparia riparia ناوی لاتینی ئەم مەلەیە، چاڤژەنگ، کووشک.

**پەڕەسلێرە** (گیانـ.) بڕ: پەڕەسلێرکە

**پەڕەسلێنکە** (گیانـ.) بڕ: پەڕەسلێرکە

**پەڕەسێلکە** (گیانـ.) بڕ: پەڕەسلێرکە

**پەڕەک** (ئان. ل)[پەڕ (پەڕین) + ئەک] پیاوێک کە زۆر دەپەڕێتە سەر مێینە، گانکەری چاک.

**پەڕەکە** (ئا.)[پەڕە + کە][ئەر] ١ـ بڕ: پەراسوو. ٢ـ پەڕە، دەندە.

**پەڕەوازە** (ئان. ل)[پەڕە + واز + ئە] ١ـ حاڵی مەلێک کە تازە باڵی گرتبێ و لە دایک و باوکی جوێ بووبێتەوە. ٢ـ (مجـ.) منداڵی مرۆڤ کە پێگەیشتبێ و توانای بەڕێوە بردنی خۆی هەبێ. & پەرتەوازە. ~ **بوون:** ١ـ جووچکەکەی مەلێک کە تازە باڵی گرتبێ و لە دایک و بابی جوێ بووبێتەوە. ٢ـ (مجـ.) منداڵێک کە توانایی بەڕێوەبردنی خۆی هەیە و لە ماڵ جوێ بۆتەوە. & پەرتەوازە بوون. ⁂ منداڵەکانم هەموو پێگەیشتوون و هەریەک بۆ شوێنێک پەڕەوازە بوون و رۆیشتوون.

**تێبینی:** پەڕە لە ئەوێستایی پەئیرە pairi بە مانای دەوروبەر و واز لە ڤەز vaz بە مانای هەڵفڕین کەوتوە و بە گشتی یانی بۆ دەوروبەر فڕین.

**پەڕین** (چا. ل)[ئەو: پەر ـ پەه: پەرییتەن، پەررییتەن. باک: ؟ ـ ناو: پەڕین ـ هەو: پڕای] ١ـ ئاوا بوونی مانگ و هەتاو. ٢ـ بزرکان و تێکچوونی رەنگی روو، پارچە یا هەر رەنگێکی دیکە. ٣ـ بازدان. ٤ـ سوار بوونی نێر بۆ سەر مێ لە گیانداران دا. ٥ـ پرتە و تەکانی پێڵووی چاو. ٦ـ شکان و لێبوونەوەی کوتێک لە شتێک بە توندی. ⁂ نووکی میدادەکەم پەڕی. ٧ـ جیا بوونەوەی گوڵی گەنم و جۆ لە کاتی درێنە ئەگەر زۆر گەیشتبێ و ویشک بووبێ. ٨ـ بوونە هەڵمی ئاوەکی لە ماوەیەکی درێژ خایەن دا. ⁂ ئالکۆڵی ناو شووشەکە پەڕیوە و چی تێدا نەماوە. ٩ـ نەمانی بۆنی شتێک. ١٠ـ تێکچوونی باری ئاسایی، دوور کەوتنەوە لە باری ئاسایی. ⁂ خەوەکەم پەڕی. رەنگی پەڕیوە، هۆشم دەپەڕێ.

**پەڕینەوە** (چا. ل)[پەڕین + ئەوە] بڕ: پەڕانەوە

**پەڕیوە** (ئان. مفـ.)[لە: پەڕین] تاراو و دوورکەوتوو لە شوێنی ژیان. ~ **بوون:** تاران و دوور کەوتنەوە لە شوێنی هەمیشەیی و گیرسانەوە لە شوێنێکی دیکە، ئاوارە بوون، هەڵوەدا بوون. ~ **کردن:** دوور خستنە و ئاوارە کردنی کەس و کەسانێک لە شوێنی ژیانی خۆیان.

**پەز**1 (گیانـ.)[هیک: پەسەڤ ـ ئێب: پەسو ـ ئەو: پەسو، پەسەڤ ـ پەه:

پەسێ. باک: پەز، پێز ـ ناو: پەز ـ باش: پەز، پەس ـ هەو: پەسی، پەسە، پەس ـ زا: پەس] گیاندارێکە لە کۆنەوە کەوی کراوە، گیاخۆرە، لەشی بە خوری داپۆشراوە، لە جیات کلک دووگی هەیە. مرۆڤ بە ران رایدەگرێ و لە شیر، خوری و گۆشتەکەی کەلک وەردەگرێ. مەڕ، مێ، مەی.

**پەز**[2] (ر.)[فار: پز لە چاوگی پۆختەن (پختن)] بە ناوەوە دەلکێ و مانای سازکەر و پێژەر دەدا، پێژ. ⁙ ئاشپەز، چاپەز.

**پەزاو** (نا. ل)[پەز (پەس3) + ئاو] ئاو دانی سەوزایی و شەتڵ بۆ جاری دووهەم.

**پەزشکە** (گیا.)[ئەر] بڕ: پەرمێشک

**پەزکووڤی** (گیانـ.)[پەز1 + کووڤ + ئی][باک] بڕ: پەزەکێوی.

**پەزمژۆک** (گیانـ.)[پەز1 + مژ + ئۆک][باک] بڕ: بزنمژ

**پەزمەندە** (ئان. مفـ.)[پەز(پەس3) + مەندە (فار: ماندە = ماوە)] بڕ: پەسمەندە

**پەزەکێفی** (گیانـ.)[پەز1 + ئە + کێف + ئی][ئەر] بڕ: پەزەکێویی.

**پەزەکێویی** (گیانـ.)[پەز1 + ئە + کێو + ئیی] جۆری کێویی و دەستەمۆ نەکراوی مەڕ، مەڕەکێویی، مەڕەسوور، پەزەکێفی، پەزکووڤی، پەس کۆفی، مەیە هەردیە.

**پەزەوان** (نا. ل، ئان. ل)[پەز1 + ئە + وان] ئاگاداری پەز و مێگەل، شوان.

**پەزەوانیی** (حم.)[پەزەوان + ئیی] ئاکار و پیشەی پەزەوان، شوانیی.

**پەزەوەنگ** (ئان.)[باک] بڕ: پێزەوەنگ

**پەزیرایی** (حم.)[پەزیر + ئایی] خزمەت و پێڕاگەیشتنی میوان. ~ **کردن:** خزمەتی میوان کردن و پێڕاگەیشتن. ⁙ مەلانەبی یەگجار زۆری پەزیرایی و بە خێرهاتن کرد (لاس و خەزاڵ ل ٢٣).

**پەزێر** (نا. مفـ.) پەسەند، بە دڵ، مەقبوول. ~ **بوون:** بە دڵ بوون، پەسەند کردن. ⁙ چومکە ئەلحەقی بۆ من پەزێرە/ مێردی حیسابی، گەلێک جوانمێرە (سەعید و میرسێوەدین ل ٦٠).

**تێبینی:** پەزێر لە چاوگی پەهلەویی

پەتگریفتەن یا پەتیيرەفتەن بە مانای قەبووڵ کردن و وەرگرتن کەوتوە و لە فارسی دا پذیرفتن هەر بەو مانایەیە و لە کوردیی دا چاوگەکەی نەماوە. هەروەتر وشەی پیر بە مانای پێشواز لەم چاوگەیە (بڕ: پیر2)

**پەژارە** (نا.)[پەهـ: پەژم. لۆر: پژارە. ناو: پەژارە] ١ـ غەم، خەفەت، کوڵی دڵ. ٢ـ نیگەرانیی. ٣ـ فکر و خەیاڵ.

**پەژارەدار** (ئان. فا)[پەژارە + دار2] ١ـ خەمبار، خەفەتبار، دڵ بە خەم. ٢ـ بەفکر و خەیاڵ. ٣ـ نیگەران.

**پەژراندن** (چا. م)[پەهـ: پەتیيرەفتەن] [باک] قەبووڵ کردن

**پەژم** (نا.)[هەو] بڕ: پەشم

**پەژموردە** (نا.)[فار: پژمردە] [کلاسیک] سیس، ژاکاو. ⁘ کە سینەی ڕێشمی بەو تێغی نازە ئەنجن ئەنجن کرد/ وتی پەژموردەیە ئەم لالەزارە، ئاوی تێدەگرم (مەحوی ل ٢١٩).

**پەژیوان** (ئان.) بڕ: پەشیمان

**پەژیوانیی** (حم.)[پەژیوان + ئیی] بڕ: پەشیمانیی

**پەژێو** (ئان.)[ئەر] بڕ: پەشێو

**پەس**[1] (گیانـ.)[بڕ: پەز]١ـ [هەو] مەر، پەز. ٢ـ [زا] ران، مێگەل.

**پەس**[2] (ئان.) بڕ: پەست1

**پەس**[3] (ئاک.)[ئەو: پەسچە ـ هەخ: پەسا ـ پەهـ: پەس. ناو: پەس ـ باش: پەس] پاش، دوا. ⁘ لاس لە پەسی چادرەوە زۆر چاکی چاو بە کچان کەوت، ئاوپڕژێنی دڵی کرا (لاس و خەزاڵ ل ٧٩). ~ **دان:** دوا دان، وەدواوە دان. ~ **کەفتن:** دوا کەوتن، وە دوا کەوتن لە یاری و قومار.

**پەسا** (نا.)[؟][ئەر] ئەندازەیەک قوڕ بۆ ڕۆژە سواغێک، پاخوا، پێخوێ. ~ **کردن:** خووساندن و ئامادە کردنی قوڕ و گڵ بۆ سواغ.

**پەساپۆرت** (نا.) بڕ: پاسپۆرت

**پەساپەسا** (ئاک. ل)[پەسا + پەسا] بڕ: پەیتاپەیتا

**پەساخوڕ** (نا. ل)[پەس3 + ئاخوڕ] [ئەر] بڕ: پاشاخوڕ

**پەسار** (نا. ل)[پەس3 + ئار4] ١ـ لای سێبەری شاخ و کێو، نزار، نسار. ٢ـ حەشارگە و شوێنی خۆ شاردنەوەی ڕاوچی. ٣ـ شوێن و پەنایەک کە با و

باران نەیگرێتەوە.

**پەســـاو** (نا. ل)[پەس3 + ئاو1][ئەر] بڕ: پاشاراو

**پەسپەسکەرە** (گیانـ.)[پەس + پەس + کەر + ئە] بڕ: پەسپەسەکۆڵە/٢.

**پەسپەسەکۆڵە** (گیانـ.)[پەس + پەس + ئە + کـــۆڵ + ئە][ئەر] ١ـ جـــۆرێک جاڵجاڵۆکەی نێو ماڵان. ٢ـ جانەوەرێکە لە رەگەزی جاڵجاڵۆکە، لەشی بە قەرا جاڵجاڵۆکەیە بەڵام پێیەکانی چووکترن. ژاری نیـــە و بێ ئازارە و گیـــانداری چووکـــەی وەک مـــێش دەخـــوا، Hyp- tiotes paradoxus ناوی لاتینی ئەم جانەوەرەیە، مێشەگرە، مێشەگیرە، بژبژە، پەسپەسکەرە، پەسپەسەکەرە، پیس پیسۆک. ٣ـ جانەوەرێکە لە رەگەزی جاڵجاڵۆکە بەڵام گەورەتر، کوڵکن و زەردە، بە هێز و بە تاقەتە و توند دەڕوا، جـــڕ و جـــانەوەری چووک راو دەکـــا و مـــرۆڤـــیش دەگـــەزێ. Aranea ta- rentula ناوی لاتینی ئەم جانەوەرەیە، هەڵەپەزە، هۆڵەپەزە، بژبژە، کـــەرەجنە. (عەر: خدرنق).

**تێبینی:** پەس لەم وشەیە دا و پیس لە پیس پیسۆک دا و پەز لە هەڵەپەزە دا لە پەزدو pazdu ـ ی ئەوێستایی بە مانای ئەسپێی گەنم و پەزدوو ـ ی پەهلەویی بە مانای ریخ گلێنە کەوتوون.

**پەسپەسەکەرە** (گیانـ.)[پەس + پەس + ئە + کەر + ئە] بڕ: پەسپەسەکۆڵە/٢

**پەست**[1] (ئان.)[پەه: پەست] ١ـ نەوی، نزم. ٢ـ مـــرۆڤی رەزیل و چەپەڵ، هیچ و پووچ. ٣ـ [باک] کـــز، کـــەم. ٤ـ وەڕەز، جـاڕز. & پەس2. ~ **بوون:** ١ـ رەزیل بوون، هیچ و پووچ بوون. ٢ـ وەڕەز بوون، جاڕز بوون.. ~**کردن:** جاڕز کردن، وەڕەز کردن، زوێر کردن.

**پەست**[2] (ر.) رەگی چاوگی پەستان و پەستاوتن.

**پەستاپەستا** (ئاک. ل)[پەستا + پەستا] بڕ: پەیتاپەیتا

**پەســـتـــان** (چا. م)[بڕ: پەســـتـــاوتن] داگرتن، بە هێز ئاخنین، پەستن.

**پەستاندن** (چا. م) بڕ: پەستاوتن

**پەستاندنەوە** (چا. م) بڕ: پەستاوتن

**پەستانەوە** (چا. م) بڕ: پەستاوتن

**پەستاوتن** (چا. م)[پەه: پەزدییتەن (لێـــدان)] ١ـ داگـــرتن و کـــوتانەوەی بە قەوی شتێک کە فەزایەکی زۆری گرتبێ.

٢ـ بە زەخت و زۆریی کەس یا کەسانێک دە جێگەیەکی تەنگ کردن یا ئاخنین. ∷ دە ژوورێکی تەنگیان پەستاوتم و دەرکەیان لێداخستم! & پەستاندن، پەستانەوە، پەستاندنەوە، پەستنەوە.

**پەستراو** (نا. مف.)[لە: پەستاوتن] شتی داگرتراو و ئاخنراو.

**پەستریێرار** (نا. ل، ئاک. ل)[پەستر + پێرێ] بڕ: بەسرپێرار

**پەستریێرێ** (نا. ل، ئاک. ل)[پەستر + پێرێ] بڕ: بەسرپێرێ

**پەستن** (چا. م) بڕ: پەستان

**پەستنەوە** (چا. م) بڕ: پەستاوتن

**پەستوو** $^{1}$ (نا. ل)[پەست1 + ئوو] دیوی چووکە بە سەر وەتاغی گەورەوە کە کەل و پەلی زێدەی بەردەستانی لێدادەنێن، خەڵوەتی، پشتماڵ.

**پەستوو** $^{2}$ (نا.) کوویەی چووکی کاشی، کوویەڵە.

**تێبینی:** هاوڕیشە و هاومانای ئەم وشەیە لە فەرهەنگەکانی فارسی دا بە شێوەی [پشتوو (پەشتوو)، بستوو (بەستوو)] هاتوە.

**پەستە** (نا. ل)[پەست (پێست) + ئە] بڕ: پەستەک

**پەستەک** (نا. ل)[پەست (پێست) + ئەک] جلێکی پیاوانەیە، لە لباد ساز دەکرێ، قۆڵی نیە و لە سەر کەوا دەبەری دەکەن کە دوو جۆری هەیە. جۆری سادە و جۆرێکی کلکدار کە لە سەر شانەکەی دوو کلکی زێدە بۆ جوانی لێدەنێن، پەستە، چۆغک.

**پەستیی** (حم.)[پەست1 + ئیی] ١ـ نزمیی، نەویایەتیی. ٢ـ رەزیلیی، هیچ و پووچیی. ٣ـ وەڕەزیی، جاڕزیی.

**پەستێن** (ر.)[لە: پەستاوتن] ١ـ ریشەی پەستاوتن. ٢ـ بە ناوەوە دەلکێ و ناوی فاعیلی ساز دەکا. ∷ بەفرپەستێن، پەنیرپەستێن.

**پەسرپێرار** (نا. ل، ئاک. ل)[پەسر + پێرار] بڕ: بەسرپێرار

**پەسرپێرەکە** (نا. ل، ئاک. ل)[پەسر + پێرەکە][باش] بڕ: بەسرپێرێ

**پەسرپێرێ** (نا. ل، ئاک. ل)[پەسر + پێرێ] بڕ: بەسرپێرێ

**پەس کۆفی** (گیانـ.)[پەس1 + کۆف + ئی][زا] بڕ: پەزەکێوی.

**پەسڵان** (نا. ل)[پەس3 + ڵان] رۆژی

قیامەت، ڕۆژی کۆتایی دونیا.

**پەســمــەندە** (ئان. مـفـ.)[پەس3 + مەندە (فار: ماندە = ماوە)] ١ـ پاشماوە، بـەرمــــاو. ٢ـ پـاشـکـەوت بـۆ دوارۆژ. & پەزمەندە

**پەسمەنە** (ئان. مف.)[پەس3 + مەنە (فار: ماندە = ماوە)][ئەر] بڕ: پاشماوە.

**پەسن** (نا.)[پەه: پەسەند] ١ـ تاریف. ٢ـ (ئـــان.) لـــەبـــەر دڵان، بـــەر دڵ، پەسند. **~ دان:** بڕ: پەسن کردن. **~ کـــــردن:** تـاریف کـــــردن، پەسـن دان، پێهەڵکوتن.

**تێبینی:** پەسن و پەسند لە چاوگەی پەسـەندییـتـەن ـ ی پەهلەویی بە مـانای پەسند کــردن و قـــەبووڵ کــردن و لـە چاوگـەی سـەدی sad ئەوێسـتـایی بە مانای دانیشتن کەوتوە.

**پەسند** (ئان.)[بڕ: پەسن] قـــەبووڵ، هەڵبــژاردەی لە ســـەر دڵان، پەســـەند، پەســەن. **~ بوون:** لە ســەر دڵان بوون، لە بەر دڵان بـوون، قـــەبووڵ بـوون. **~ کردن:** بە دڵ بوون و هەڵبـژاردنی شـتێک یا کەسێک.

**پەسندەر** (ئان. فــا)[لە: پەسـن دان] کـەسـێک کـە تاریف و پەسنی کـەسـێک دەکا، تاریفکەر.

**پەسە** (گیانـ.)[هەو] بڕ: پەز

**پەســەرپێـــرارەکــە** (نا. ل، ئاک. ل) [پەسەر + پێرارەکە][ئەر] بڕ: بەسرپێرار

**پەسەرپێرەکە** (نا. ل، ئاک. ل)[پەسەر + پێرەکە][ئەر] بڕ: بەسرپێرێ

**پەســەک** (نا. ل)[پەس (پێـــست) + ئەک][ئەر] بڕ: پەستەک

**پەسەن** (ئان.)[ئەر] بڕ: پەسند

**پەسەند** (ئان.) بڕ: پەسند

**پەسی** (گیانـ.)[هەو] بڕ: پەز

**پەسیرە** (گیا.)[پە (بەر) + سیرە] بڕ: بەرسیلە

**پەسیڤ** (نا.)[باک] بڕ: پەسیو2

**پەسیلە** (گیا.)[پە (بەر) + سیلە] بڕ: بەرسیلە

**پەسینگ** (نا.)[زا] بڕ: پشیلە

**پەسیو**[1] (نا.)[هس: پەس3] شـوێنی نادیار، سووچ، قوژبن، کەلێن، پەسێو.

**پەســیـو**[2] (نا.)[؟][سـۆر] هـەڵامـەت، پەسیڤ.

**پەسێو** (نا.) بڕ: پەسیو1

**پەشت** (نا.)[هەو] بڕ: پشت1

**پەشتان** (نا.)[؟] ١ـ دەستەملان، هاوئامێز، ئاولانە، ئاملانە، پشتان. ‡‡ ئەی تۆ کام نەدیت چە عەرووس نۆ/ تا عەرووس خاک پەشتان بی وە تۆ (مەولەوی ل ٩٧). ٢ـ ئالوودە، تێکەڵاو، خەڵتان. ‡‡ ئەگەر سیوای تۆ کەسم هام فەرد بۆ/ سەرتاپام پەشتان ئالوودەی دەرد بۆ (وەلی دێوانە ل ٦٤). **~ بوون:** دەستەملان بوون، دە باوش یەک دا بوون، پشتان بوون. ‡‡ خوا کەی بێت کە من پەشتانی باڵا و قامەتی تۆ بم/ چ وەختێ پڕ بە چنگ بگرم دوو لیمۆی نەوڕەسی کاڵت (ئەحمەد موختار ل ٦٥).

**پەشتەمال** (نا. ل)[پەشت + ئە + مال] [باک] پشتەماڵ/٢.

**پەشتەماڵ** (نا. ل)[پەشت + ئە + ماڵ] فۆتەی حەمام، پشتەماڵ/٢.

**پەشتی** (نا.)[هەو ـ زا] بڕ: پشت1

**پەشک** (نا. ل)[پش (بەش) + ک] [باک] ١ـ بەش و بەختێک کە بە کوتە کاغەز یا شتێکی دیکە لەم جۆرە دیاری دەکرێ، پشک. ٢ـ بەش، کوت، پار. ٣ـ دڵۆپ، تنۆک. ٤ـ پڕیشک.

**پەشلاندن** (چا. ل)[لە: پەشلین] رووخاندن، خراپ کردن.

**پەشلین** (چا. ل)[؟][باک] رووخان، خراپ بوون.

**پەشم** (نا.)[ئەو: پەشنە ـ پەه: پەشم. باک: پەشم ـ ناو: پەشم ـ هەو: پەژم ـ زا: پەشم، پەشمی] ١ـ خوری و مووی سەر لەشی بزن و مەڕ. ٢ـ هەر پارچە و قوماشێک کە لە موو و خوری بێ. ٣ـ (مجـ.) ردێن، ریش. ٤ـ (کنـ.) هیچ و پووچ، بێنرخ. ‡‡ سەودازەدەکەی زولفت، ئەزهاری لە کن پەشمە/ دوور لەو گوڵە بێ خارە، گوڵزاری لە کن پەشمە (نالی ل ٤٧٤). ٥ـ (کنـ.) تووکە بەر، بەرگەدە. || **پەشمی شووشە:** ریشاڵی شووشە کە بۆ نێواخنی پێخەف و داپۆشینی لوولە و کاروباری دیکە کەلکی لێوەردەگرن. (ئین: glass wool). **پەشمی گون:** ١ـ تووکی گەڵ و بەرگەدە. ٢ـ (کنـ.) هیچ، زۆر بێنرخ. ‡‡ قسەی منت بە پەشمی گونیشت نیە!

**پەشمەک** (نا. ل)[پەشم + ئەک] ١ـ شیرنییەک کە لە شەکر و رۆن دروست دەکرێ. تاڵ تاڵی درێژە و وەک لۆکە دەچێ. ٢ـ شۆربای پەنیر، پەنیراو.

**پەشمی** (نا.)[زا] بڕ: پەشم

**پەشمین** (ئان. ل)[پەشم + ئین] بڕ: پەشمینە.

**پەشمینە** (ئان. ل)[پەشم + ئینە] [باک: پەشمین ـ ناو: پەشمین، پەشمینە ـ زا: پەشمێن، پەشمێنە] پارچە و قوماش یا هەر شتێک کە لە پەشم ساز کرابێ. ꞉꞉ لەچکەی پەشمینە، پشتێندی پەشمینە.

**پەشمێن** (ئان. ل)[پەشم + ئێن][زا] بڕ: پەشمینە.

**پەشمێنە** (ئان. ل)[پەشم + ئێنە][زا] بڕ: پەشمینە.

**پەشۆکان** (چا. ل)[ناو: پەشۆکان، پەشۆکیان ـ هەو: پەشۆکیای] شێوان و ئاڵۆز بوونی بیر و مێشک، سەر لێشێوان.

**پەشۆکاندن** (چا. م)[پەشۆکان + دن] ئاڵۆز کردن و تێک دانی بیر و مێشکی کەسێک، شێواندن.

**پەشۆکاو** (ئان. فا)[لە: پەشۆکان] ئاڵۆز، شێواو، سەر لێشێواو

**پەشۆکاویی** (حم.)[پەشۆکاو + ئیی] سەرلێشێواویی، ئاڵۆزیی، شێواویی.

**پەشۆکیان** (چا. ل) بڕ: پەشۆکان

**پەشە** (گیانـ.)[هەو] بڕ: پەخشە

**پەشەبەن** (نا. ل)[پەشە + بەن][ئەر] بڕ: پەشەبەند

**پەشەبەند** (نا. ل)[پەشە + بەند] پارچەیەکی تۆڕی ناسکە کە هاوینان لە سەر نوێن و بانی هەڵدەبەستن هەتا مێشوولە نەتوانێ ڕێی تێکەوێ و پێوەبدا، پەشەبەن، کەتان و کەوان، کوللە، کولی، تەپۆ.

**پەشیمان** (ئان.)[پەه: پەشێمان، پەسێمان، پێشامان. تات: پەشمون ـ فار: پشیمان ـ پەش: پشێمان. باک: پۆشمان، پۆشیمان ـ ناو: پەشیمان، پەژیوان ـ هەو: پەشیمان ـ زا: پۆشمان] حاڵی کەسێک کە لە کار و کردەوەیەک کە کردوویەتی پاشگەز دەبێتەوە و نایەوێ ئیتر بیکا، پاشگەز، پاشەگەز. **~ بوونەوە:** پاشگەز بوونەوە لە کار و کردەوەیەک. **~ کردنەوە:** پاشگەز کردنی کەسێک لە کار یا کردەوەیەک.

**پەشیمانیی** (حم.)[پەشیمان + ئیی] ئاکامی پەشیمان بوونەوە، پەژیوانیی. **~ بە دواوە (لە دوو) بوون:** کار و کردەوەیەک کە ئاکامی پەشیمان بوونەوە

بێ. ∷ بۆ هەر کارێکی واباشتر پیاو پرس بە گەورەتر بکا، کاری خۆکردە پەشیمانیی بە دواوەیە. ~ **چێژتن:** پەشیمان بوونەوە لە ئەنجامی کارێک، تووشی پەشیمانیی بوون. ~ **هێنان:** تووشی پەشیمانی بوون، پەشیمان بوونەوە. ∷ یەخە دادڕین، پەشیمانیی دێنێ (پەند ل ٥٠٣).

**پەشێو** (ئان.)[لە: شێوان][ناو: پەشێو، پەژێو ـ هەو: پەشێو] ١ـ کەسێک کە بیر و هۆشی تێکەڵ بوە، بیرئاڵۆز، پەرێشان. شێواو. ٢ـ پرچ و زولفی لێک بڵاو، پەرێشان. ∷ مەکەن لۆمەی پەشێویی دڵ کە ئەمشەو/ پەشێواوە لەبەر پەرچەم **پەشێوان** (نالی ل ٣٢٢) ناڕێژی چاو، سوور ناکەی لێو/ شانە ناکەی بسکی پەشێو (تاریک و روون ل ١٤٣). ٣ـ ناوە بۆ نێرینە. ~ **بوون:** شێوان، تێکچوون. ~ **کردن:** شێواندن، تێکدانی حاڵ و حاڵەتی کەسێک.

**پەشێوان** (چا. ل)[لە: پەشێو] شێوان، تێکچوون، بیر بڵاو بوون، ئاڵۆز بوون.

**پەشێواو** (نا. مف.)[لە: پەشێوان] شێواو، ئاڵۆز، پەشێو.

**پەشێویی** (حم.)[پەشێو + ئیی] ١ـ شێواویی، ئاڵۆزیی. ٢ـ شێواویی وڵات، ئاژاوە.

**پەعن** (ئان.)[باک] بڕ: پان

**پەقاندن** (چا. م)[باک] بڕ: تەقاندن

**پەقرەج** (نا.)[تور: bakraç] بڕ: سەتڵ

**پەقک** (نا. ل)[پەق (تەق) + ک][باک] بڕ: پۆرگ

**پەقین** (چا. ل)[باک] بڕ: تەقین

**پەک**[1] (نا.)[؟] ١ـ هێز، تاقەت، توان. ٢ـ کەلک. ٣ـ نیاز، پێویستیی. ~ **پێ نەکەوتن:** بێنیاز بوون، موحتاج نەبوون بە شتێک یا بە کەسێک. ~ **خستن:** ١ـ لە کەلک خستن، لە کار خستن. ٢ـ مەحتەل کردن، چاوەڕوان ڕاگرتن. ~ **کەفتن:** بڕ: پەک کەوتن. ~ **کەوتن:** ١ـ بێ هێز و بێ تاقەت بوون. ∷ بە پیری پیاو پەکی دەکەوێ. ٢ـ بێ کەلک بوون، لە کەلک کەوتن. ∷ ئەم رادیۆیە تازە پەکی کەوتوە و دەبێ فڕێی بدرێ. ٣ـ نیاز پێهەبوون، پێویست بوون. ∷ لەو شارەی بۆ دوو تمەن پەکت بکەوێ کەس ناداتێ. & پەک کەفتن.

**پەک**[2] (ئام.) وشەی دەربڕین لە کاتی سەرسوڕمان، تەک، پەکوو. ⁘ پەک لەو قسەیە!

**پەککوو** (ئام.) داگـرتنێکی پتـری وشەی پەکوو ـ یە. (بڕ: پەکوو.)

**پەککەوتوو** (ئان. مــف.)[لە: پەک کەوتن] ١ـ پیر و کەلەلا، داماو، لە کار کەوتوو. ٢ـ بێ کەلک، لە کەلک کەوتوو. & پەککەوتە.

**پەککەوتە** (ئان. مــف.)[لە: پەک کەوتن] بڕ: پەککەوتوو. ⁘ گەر دەناڵێنم ئەمن، پەک کـەوتە نیم/ تێـدەکـۆشـم بۆ وەسڵ تاکـوو دەژیم (ناڵەی جـودایی ل ٢٢).

**پەکوو** (ئام.) ١ـ وشەی دەربڕینی خەم و خـەفـەت، تەقـوو، مـخـابن، حـەیف ⁘ پـەکـــوو لـەو کـــوورە جـــوانـە چ زوو جـوانەمـەرگ بوو. ٢ـ وشـەی دەربڕینی سـەرسـوڕمـان و زۆر پێ سـەیر بوونی شتێک یا مەسەلەیەک. ⁘ پەکوو لەو درۆ زلەی. & پەککوو، تەککوو

**پەکەر** (ئان.)[لۆر: پەکـەر. فـار: پکر. نـاو: پەکـــەر ـ هەو: پەکـــەر] بێـــواز، بێدەمـاغ، بێتاقـەت، جاڕز، وەڕەز. **~ بوون:** بێـــواز بوون، لە ســـەر حـــاڵ و حـەوسـەلە نەبوون. **~ کردن:** کەسێک بێواز و بێحاڵ کردن.

**پەگـر** (نا.)[؟][ئەر] ریخ و پیـسـایی ئاژەڵ لـە تەویلە دا کـە لە سـەر یەک کـۆ بۆتـەوە و بڕیویانە و وەک سـووتەمـەنی کەلکی لێوەردەگرن، کەمرە، گەمرە.

**پەل**[1] (نا.) ١ـ دەسـتـە، تاقم. ٢ـ لقی دار. ⁘ وەک سـیـامـەندی لە چۆل و بەندەنێ/ جـەرگی لەت کـردم پەلی دارە بەنێ (ناڵەی جودایی ل ٢١). ٣ـ کوتێکی چووکە لە گیا و گوڵ کە لێدەکەنەوە و بۆ ریشـە داکوتان و زیاد کـردن. ⁘ پەلێک شـەمـدانیم لـە مـاڵە دایکم هێناوە. ٤ـ کـوت، لەت، پل. ⁘ پەلێک نان. ٥ـ گـەڵا. ٦ـ دەست. ⁘ دەست و پـەل. ٧ـ باڵ. ⁘ پەلـەوەر. **~ بزاوتن:** دەست بـزاوتن، دەست کـردنەوە، جـووڵە کـردن. **~ داکـوتان:** خـۆ گـرتن و ریشـە داکـوتانی گـیـا. **~ کـوتان:** ١ـ دەست کـوتان و دەست لە ولات دان لە تـاریکی دا کـاتێک کە چاو نابینی، دەست گێڕانی کوێر. ٢ـ (کنـ.) حـەول دان و تێکۆشـان لـە کـاتی ناچاری و تەنگانە بۆ دەست بە شوێنێک یا شـتـێک راگـەیشتن. **~ گـرتن:** ١ـ دەست گـرتن. ٢ـ (کنـ.) یارمـەتی دان، یاردیدە دان. || **پەل پەل:** لەت لەت، کـوت

کـوت. * **پەل پەل کـردن:** لەت و کـوت کردن، لەت و پەت کردن.

**تێبینی:** پەل دەگەڵ پەڕ1 هاوڕیشەیە و ئاڵوگۆڕیی بە سەر پیتەکانی « ل » و «ڕ» دا هاتوە کە وێنەی کە کوردیی دا یەکجار زۆرە.

**پەل**[2] (ئان.)[؟] حاڵی هەر شتێک کە لە چاو هاوچەشنی خۆی قووڵایی نەبێ، تەخت و ساف. ⁘ دەوری پەل. ~ **بوون:** تەخت و ساف بوون، قووڵ نەبوون. ~ **کـردن:** سوان و لەبەین بردنی قوڵایی شتێک. ⁘ جگەکەم پەل کردوە.

**پەل**[3] (نا.)[؟] دەگەڵ وشەی کەل دێ و مانای کەرەسە و ئەسباب دەدا. ⁘ کەل و پەل

**پەل**[4] (نا.)[؟] قووڵایی نێوان دوو شاخ، دۆڵ، دەرە.

**پەلاپیتکە** (نا. ل)[پەل + ئا + پیت + کە] بڕ: پەلەپیتکە

**پەلاخ**[1] (گیانـ.)[پە (پار1) + ولاّخ] [باک] بڕ: پالاّغ

**پەلاخ**[2] (گیا.)[باک] بڕ: پەلاّش

**پەلار** (نا.) بڕ: پللار

**پەلامار** (نا.)[؟] شالاّو، هێرش، هەڵمەت، پەلەمار، پالامار. ~ **بردن:** هێرش بردن، خۆ پێدادان، پەلامار دان. ~ **دان:** بڕ: پەلامار بردن

**پەلاماردەر** (ئان. فا)[لە: پەلامار دان] کەسێک کە شالاّو دەباتە سەر کەس یا کەسانێک بۆ مەبەستی شەڕ و کوشتن.

**پەل بەستە** (ئان. مـفـ.)[پەل1/٣ + بەستە] ١ـ دەست بەستراو، دەست بەستە. ٢ـ گرفتار، ئەسیر.

**پەلپ** (نا.)[باک] بڕ: پەڵپ

**پەلپەلک** (گیانـ.)[زا] بڕ: پەپوولە

**پەلپینە** (گیا.)[باک] بڕ: پرپرە/ ١

**پەلک**[1] (نا. ل)[پەل1 + ک] ١ـ پرچی هۆنراوە، کەزی، پەلکە. ٢ـ کوتێکی چووک. ⁘ پەلکە نانێکم دە ماڵ دا نەماوە. ٣ـ گەلاّ، پەل، پەلکە. ٤ـ پەڕی گوڵ، پەلکە. || **پەلکی گوڵ:** پەڕی گوڵ.

**پەلک**[2] (ئا.) بڕ: پێڵوو. || **پەلکی چاو:** بڕ: پێڵوو. ⁘ چەند خۆشە لە کاتی گیانەلاوم/ پەنجەی مەمی لێک نێ پەلکی چاوم (مەم و زین ل ٣٢٧).

**پەلک**[3] (گیا.)[باک] بڕ: پەڵک

**پەلکوور** (گیانـ.) بڕ: پەڕکوور

**پەلکە** (نا. ل)[پەلک1 + ئە] ١ـ گەڵا، پەل، پەلک. ٢ـ پەڕی گوڵ، پەلک. ⁂ پێموایە نێوەڕاست مانگی هاوینێیە و گەلاوێژ کەوتووە/ هەڵاڵ و بەیبوون و گیاخاو پەلکەیان وەراندووە (لاس و خەزاڵ ل ١٣٨). ٣ـ پرچی هۆنراوە، کەزی، پەلک. ⁂ دڵم قەبووڵ ناکا دابنیشم بە هەناسەساردیی و بە ناپیاوییە/ ئەگەر سەرزەنیشتم بکا پیرێژنێکی پەلکەسپییە (لاس و خەزاڵ ل ١٦٩).

**پەلکەرەنگینە** (نا. ل)[پەلک1 + ئە + رەنگین + ئە] بڕ: پەلکەزێڕینە.

**پەلکەزێڕینە** (نا. ل)[پەلک1 + ئە + زێڕین + ئە] کەوانێکی رەنگاورەنگە کە دوای بارینی باران و وەدەر کەوتنی هەتاو لە ئاسۆ پەیدا دەبێ، پەلکەرەنگینە، کۆڵکەزێڕینە، کەسک و سۆر، ئەستوونە زێڕینە.

**پەللار** (نا.) بڕ: پللار

**پەل و پۆ** (نا. ل)[پەل1/٧ + و + پۆ] بڕ: پەڕ و پۆ. ⁂ مەلی سەر بنچک، پەل و پۆ رەنگین خۆ من هەڵۆ نیم/ لێم مەفڕن جووت جووت، مەترسن ئاخر پێتان بڵێم چیم (گۆران ل ١٦٩).

**پەلوول** (نا.)[هس: پەڵوو][باک] بڕ: پاڵوودە

**پەلە** (ئاک.) لەز، تاڵووکە، هەشتاو، **~ کردن:** وە درەنگی کەوتن و هەڵسووڕانی توند بۆ گەیشتن و پێڕاگەیشتن، تاڵووکە کردن. **~ هەبوون:** بە توندیی هەڵسووڕان بۆ پێڕاگەیشتن بە کار و ئیشێک، بەپەلە بوون. **وە ~ خستن:** هاندانی کەسێک بۆ هەڵسووڕان و جووڵانەوە بە توندی بۆ پێڕاگەیشتن بە کار و بارێک. **وە ~ کەوتن:** وە درەنگی کەوتن و هەڵسووڕان بە توندی.

**تێبینی:** پەلە لە چاوگی پەڕین کەوتوە بە لەبەر چاو گرتنی ئاڵوگۆڕیی دوو پیتی « ل » و « ر » دەگەڵ یەکتر.

**پەلەپچڕ** (ئاک. ل)[پەل + ئە + پچڕ (پچڕین)] پەل کوتان بۆ رزگاریی و خۆ دەرباز کردن، پەلەقاژە، پەلەپچڕکێ، پەلەپچڕێ، پەلەپچوڕکێ، پەلەپرووزکێ، پەلەپرووزە، پەلەپرووزێ، پەلەپرووسکە، پەلەپرووسکێ.

**پەلەپچڕکێ** (ئاک. ل)[پەل + ئە + پچڕ (پچڕین) + ک + ئێ] بڕ: پەلەپچڕ

**پەلەپچوڕکێ** (ئاک. ل)[پەل + ئە +

پچوڕ (پچڕین) + ک + ئێ] بڕ: پەلەپچڕ

**پەلەپچــوڕکێ** (ئاک. ل)[پەل + ئە + پچڕ (پچڕین) + ک + ئێ] بڕ: پەلەپچڕ

**پەلەپڕووزکێ** (ئاک. ل)[پەل + ئە + پـــڕووز (پـــڕووزان) + ک + ئـــێ] بـــڕ: پەلەپچڕ

**پـەلـەپـڕووزە** (ئـاک. ل)[پـەل + ئـە + پڕووز (پڕووزان) + ئە] بڕ: پەلەپچڕ

**پـەلـەپـڕووزێ** (ئـاک. ل)[پـەل + ئـە + پڕووز (پڕووزان) + ئێ] بڕ: پەلەپچڕ

**پەلەپڕووسـکە** (ئاک. ل)[پەل + ئە + پڕووس (پڕووز) + ک + ئە] بڕ: پەلەپچڕ

**پەلەپڕووسـکێ** (ئاک. ل)[پـەل + ئە + پڕووس (پڕووز) + ک + ئێ] بڕ: پەلەپچڕ

**پەلەپووش** (نا. ل)[پەل + ئە + پووش] ١ـ پووشێکی سووک و چووک کە با سانا دەیبا، چڵی پـووش. ٢ـ (کنـ.) سووک، بێ وەزن.

**پـەلـەپـەل** (ئـاک. ل)[پـەلـە + پـەل] پەلەیـەکی زۆر و پتـر لە رادەی ئاسـایی. **~ کـــردن:** زۆرتـر پـەلە کـــردن. ⁂ پەلەپـەلێ مـەکـە هـەر ئێسـتـا دەڕۆین. **وە ~ خستن:** پەیتـاپەیتـا راگەیـاندن بە کـەسـێک کـە درەنگە و دەبێ پەلەی بکا.

⁂ بۆ وە پـەلەپـەلم دەخـــەی هـێـــشـــتـــا سـاعـەتێکی مـاوە قـەتار بڕوا. **وە ~ کـەوتن:** لێ درەنگ بوون و پـەلەیەکی پتـر کردن.

**پەلەپیتک** (نا. ل)[پەل + ئە + پیت + ک] بڕ: پتە

**پەلەپیتکە** (نا. ل)[پەل + ئە + پیت + کە] ١ـ ئامرازێکی چووکە لە چەکی وەک تفەنگ و دەمانچە کە بە داگرتنی گوللە دەتەقێ، پڵـتـۆک، پیلکە. ٢ـ بڕ: پتـە & پەلاپیـتکە. **~ ترازاندن:** تەقـە کـردن، تەقـانـدنی گـوللە بە پـەلەپیـتکە لێـدان. **~ لێـــتـــرازاندن:** تەقـــە لێکردن. ⁂ سـێـــرەت دەگـــرت لە کـــەڵی گـــچـکە/ پەلەپیـــتکەت لێـــدەترازاند، دەتدا لە کەلەکەی (گەنج ل ٣١٦).

**پەلەزێ** (گیا.)[باک] بڕ: گەزیزە

**پەلەزێسک** (گیا.)[باک] بڕ: گەزیزە

**پەلەسیسە** (نا. ل)[پەل + ئە + سیس + ئە] جـۆرە نـەخـۆشـییـەکە ئەدا لە مـێو هێندێ پەلی سـیس ئـەکـا (خـاڵ ب ١ ل ٢٤٣).

**پەلەفــرتکێ** (ئان. ل)[پەل1 + ئە + فرت + ک + ئێ] بڕ: پەلەقاژە

**پەلەفرتە** (ئان. ل)[پەل1 + ئە + فرت + ئە] بڕ: پەلەقاژە

**پەلەفرتێ** (ئان. ل)[پەل1 + ئە + فرت + ئێ] بڕ: پەلەقاژە

**پەلەقــاژە** (ئان. ل)[پەل1/٦ + ئە + قــاژە؟] ١ـ حـــاڵی دەست و پەل و پێ راوەشاندنی کەس یا گیانلەبەری گیراو بۆ رزگـــار بوون. ٢ـ حـــاڵی پێکوتانی گیاندار لە کاتی سەر بڕین دا. ٣ـ (کنـ.) هـەوڵ و کـــۆشش بۆ رزگــــاریی. & پەلەفـــرتکێ. پەلەفـــرتە، پەلەفـــرتێ، پەلەقـاژێ. **~ کـردن:** ١ـ دەست و پێ راوەشـــاندن لە کـاتی دەردەست بوون و گیران بۆ رزگار بوون. ٢ـ (کنـ.) حەول دان بۆ رزگـــاری. **وە ~ کــەوتن:** ١ـ دەست و پێ کوتان لە کاتی گیران دا. ٢ـ دەست و پێ کـوتان لە کـاتی ســەر بڕین دا. ٣ـ (کنـ.) وە هەوڵ کەوتن.

**پەلەقاژێ** (ئان. ل)[پەل1 + ئە + قاژ + ئێ] بڕ: پەلەقاژە

**پەلەکــوتێ** (ئان. ل)[پەل1/٦ + ئە + کوت + ئێ] ١ـ حاڵەتی دەست کـوتان لە تاریکی دا ٢ـ (کنـ.) حەول، کۆشش.

**پەلەمار** (نا.)[باک] بڕ: پەلامار

**پەلەوەر** (نا. ل)[پەل1/٧ + ئە + وەر] [پەهـ: پـەرڤــەر] ئەو گــیــاندارانـەی کــە دەفڕن، مەل، باڵدار، باڵندە

**پەلەوێسک** (گیا.)[باک] بڕ: گەزیزە

**پەلوسـیـاوەحشی** (گیـا.)[پەل + و + سیاوەحش] بڕ: پەڕسیاوەش

**پەلی سیـاوشـان** (گیـا.)[پەل + ئی + سیاوش + ئان] بڕ: پەڕسیاوەش

**پـەلاس** (نـا.)[؟][نـاو: پـەلاس ـ هـەو: پەلاس] ١ـ جـۆرێک بـەڕەی کـەم بـایەخ و خـراپ. ‪:::‬ فـەرشـی پەلاسـە، دۆشــەکی خاکە، سەرینی بەرد/ بێ تووک و رووت و قـووت و فـەقـیـر و قـەلەندەرە (نالی ل ٤٢٠). ٢ـ پارچەی رەشــمــاڵ، کـوێن. ٣ـ جلی زبر و زووری کەم بایەخ کە دەرۆیش و پیــــاوی هەژار دەبەری دەکــــەن. ‪:::‬ خوێشـان پەرێشـان پەلاس نە گەردەن/ تو خـــوا بازەشـــان چـون تۆشـــا مـــەردەن (مـــەولەوی ل ٣٥٦) ئەمـــجـــارە پەلاسی شـــەرم و دین پارە دەکـــەم/ ئەم دەردی هەژارییەم بە مەی چارە دەکەم (خەیام ل ٢٢). ٤ـ (مجـ.) بێنرخ، بێبایەخ. **بە ~ بوون:** (کنـ.) بێنرخ بوون، بێبایەخ بوون، بوون بە هیچ.

**پەلاش** (نا.)[باک: پەلاخ ـ ناو: پەلاش ـ زا: پالاخ] پووش و پەلاش، ویشکەگیا،

پووش.

**پەڵپ** (نا.)[لۆر: پەلم، پەلپ. باک: پەلپ ـ ناو: پەڵپ ـ هەو: پەڵپێ] ١ـ بیانوو، پاپە. ٢ـ گڕوو، گڕنە. **~ پێگرتن:** ١ـ بیانوو پێگرتن، بیانوو لێدیتنەوە. ٢ـ گڕوو پێگرتن. & پەڵپ لێگرتن **~ گرتن:** ١ـ بیانوو گرتن. ٢ـ گڕوو گرتن. **~ لێبەستن:** بیانوو پێگرتن، پەڵپ پێگرتن. ⁂ پەڵپی لێبەستووم هەتا ئەو کێوەی بۆ نەگوێزمەوە مێردم پێناکا (بۆ کوردستان ل ١٥). **~ لێگرتن:** بڕ: پەڵپ پێگرتن. ⁂ فەرخ پەڵپی لێگرت، کوتی دەبێ بە بازاڕیم دا بەری (شێخ فەرخ ل ٢٧).

**پەڵپین** (گیا.) بڕ: پرپرە/١

**پەڵپینە** (گیا.) بڕ: پرپرە/١

**پەڵپێ** (نا.)[هەو] بڕ: پەڵپ

**پەڵتەک** (نا.) بڕ: پاڵتەک

**پەڵخ** (گیان.)[هس: فەرخ] ١ـ بێچووی بەراز، بزەڵە، کوودەڵە، بازەڵە. ٢ـ بێچووی گامێش، پەڵخەگامێش، پالاغ. & پەرخ.

**پەڵخورد** (نا. ل)[پەڵ + خورد1] ١ـ دانەوێڵەی نیوە هاڕاو. ٢ـ خەرمانێکە لە ژێر گێرە دا قرچەشکێن کرابێ (کشت و کاڵ ب ١ ل ٧١). ٣ـ لەوەڕی ناو ورگی حەیوان کە هێشتا هەزم نەبوە، پەڵخوڕ. (هەنبانەبۆرینە ب ١ ل ١٢٣). **~ بوون:** ١ـ نیوە هاڕانی دانەوێڵە. ٢ـ نیوە ورد بوونی گژ و گیا. **~ کردن:** ١ـ نیوە هاڕینی دانەوێڵە. ٢ـ نیوە ورد کردنی گژ و گیا.

**پەڵخوڕ** (نا. ل)[پەڵ + خوڕ (خورد1)] بڕ: پەڵخورد/٣.

**پەڵخەگامێش** (گیان.)[پەڵخ + ئە + گامێش] ١ـ بێچووی گامێش، پالاغ. ٢ـ (کنـ.) مرۆڤی تەوەزەلی زلی نەوسن، تەنبەڵ.

**پەڵخی** (گیان.)[پەڵخ + ئی] جۆرێک کۆتر بەڵام گەورەتر کە لە مێشە و لێرەواران دا دەژی.

٤٠ سانتیمێترە، گەردنی شەڕابییە. هەر لاملەی خاڵێکی سپی لێیە؛ دەورەیان کەسک و ئەرغەوانییە. کاتی فڕین خەتی سپی باڵی وەدیار دەکەوێ. بە باڕی نیشانەکانی سەر گەردنی نییە. ئەو باڵندانە بە پۆل دەگەڕێن. لە هەموو شوێنێ تەنانەت لە شارەکانیش دا دەبینرێ. لە سەر دار، پەرژین تەنانەت

هێلانەی بەتاڵی باڵندەکانی تر هێلانەی چێ دەکا (فەرهەنگی باڵندە ل ١٢٨)، Columba palumbus ناوی لاتینی ئەم مەلەیە، کۆترەپەڵخی، کۆترەگایە، کۆترەگاییلکە، کۆترەگایانە، گاکۆتر.

**پەڵک** (گیا.)[باک: پەلک ـ ناو: پەڵک] دارێکی خۆڕسکە لە تیرەی بی و لە بنەماڵەی سپیدار، گەڵای پانە و هەندێک جار لە دەم شەقامان دەینێژن. Pop-ulus euphr arica ناوی لاتینی ئەم دارەیە. (فار: ترنگوت)

**پەڵۆخ** (ئان.) بڕ: پۆخڵ

**پەڵۆژی** (گیا.)[هەو] بڕ: پەڵۆشە

**پەڵۆش** (گیا.) بڕ: پەڵۆشە

**پەڵۆشە** (گیا.)[نا: پەڵۆش، پەڵۆشە ـ هەو: پەڵۆژی] ١ـ بنکە گیایەکی ئەستوور و درێژە و قژقژاوییە، دەرئەهێنرێ و ئەکرێ بە چاوگی ئاگر (خاڵ ب ١ ل ٢٤٢). ٢ـ گوێنی، گەوەن. ٣ـ بنەتاڵوو (هەنبانەبۆرینە ب ١ ل ١٢٣). & پەڵۆش.

**پەڵوو** (نا.) ١ـ [لۆر: پلیلە. ناو: پەڵوو، پەڵووڵە] ئارد و ئاوی تێکەڵاو کە دەیدەن بە جووجکە، پەڵووڵە. ٢ـ چێشتێکە لە ئاو و ئارد کە دەیکۆڵێنن و رۆنی لێدەدەن. ٣ـ (مج.) چێشت یا خواردەمەنییەکی ناخۆش. ٤ـ پەڵووڵەیەکی بێ چەورییە ئەکرێ بۆ کار و بەرخ (خاڵ ب ١ ل ٢٤٢).

**پەڵووک** (گیا.) بڕ: ئاڵەکۆک

**پەڵووڵە** (نا. ل)[پەڵوو + ڵە] ١ـ خواردنێکە لە ئارد و روون. ئاردی گەنم لە رۆن دا سوور دەکەنەوە هەتا رەنگی قاوەیی دەبێ، لە دوایی شەکراو یا دۆشاوی تێکەڵاو دەکەن و لێکی دەدەن، ئەم خواردنە زۆرتر بۆ ژنی زەیستان ساز دەکرێ هەتا ئاهێکی بێتەوە بەر و برینەکانی وێک بێتەوە، ئارد و رۆن، ئارخاڤک، میوانی. ٢ـ بڕ: پەڵوو/١

**پەڵە** (نا.)[هس: پەڕە][ناو: پەڵە، پەرە ـ هەو: پەڵە] ١ـ شوێنی چووکی پیس کراوی سەر جل و بەرگ، لەکە، پل، پنی. ٢ـ خاڵی پان و چووکی سەر لەش و پێستی مرۆڤ یا گیاندار، پنۆ، پنۆک، پڵ.٣ـ پارچە زەوییەک. ٤ـ پارچە دەغڵێکی داچێندراو. ٥ـ بارانێکی پڕ ئاوی نێوەڕاستی پایز کە دەغڵ و دان و گیای پێ سەوز دەبێ، بارانی پەڵە. ~ **دان:** ئەو ئەندازە بارینەی کە زەوی بخووسێنێ و بە ئاسانی جووتی تێدا بکرێ و گاسن لە بەر ویشکی کرەی لێ

نەیە، بارینی بە ئەندازەی پێـــویســـتی جووتێر. || **پەڵەی بچووک:** یەکەم جارە لە باینی باران دا. **پەڵەی گـــەورە:** بارانی دووهەم جارە پاش بارانی پەڵە (کشت و کاڵ ب ١ ل ٧١).

**پەڵەپەڵە** (ئان. ل)[پەڵە + پەڵە] حاڵی پێست یا هەر شتێکی پەڵەی زۆر لە سەر بێ، خاڵ خاڵ، پنۆک پنۆک.

**پەمبو** (گیا.)[باک] بڕ: پەمۆ

**پەمبۆ** (گیا.) بڕ: پەمۆ

**پەمبوو** (گیا.)[باک] بڕ: پەمۆ

**پەمبە** (گیا.) بڕ: پەمۆ

**پەمبـەیی** (ئان. ل)[پەمبـە + ئی] بڕ: پەمەیی

**پەمگ** (گیا.) بڕ: پەمۆ

**پەمـوانە** (گـیا.)[پەمـو (پەمـۆ) + ئانە (دانە)] بڕ: پەمۆدانە. ⁝⁝ مزگێنی هێلکە پەموانەیە (پەند ل ٤٢٢).

**پەمــۆ** (گــیــا.)[پەهـ: پـەمــبــەک. باک: پەمبو، پـەمبوو، پەمبۆ، پەنبو ـ ناو: پەمە، پەمۆ، پەمبۆ، پەمـوو، پەمبە، پەمگ ـ هەو: پەمـە ـ زا: پەمـە] بەری گیایەکی ساقـەت ئەستوور و کورتە، لقەکانی ناسک و گەڵا پانە، گـوڵی سـپی و ســوور دەدا کـە لە دوایی دەبنە قـۆزاخـە. سـەرەتای پاییـز قـۆزاخـەکـان دەم دەکـەنەوە و لۆکـەی لێ دێنە دەر. لاکۆکەر یا لۆکەچن لۆکەکان بە دەست لێدەکەنەوە یا ئەوەکە بە مەکینەی تایبـەتـی هەڵیـدەگرنەوە و بـۆ پارچە سـاز کـردن و دە دۆشـــەگ ئاخنین و گـەلێک کاری دیکە کەلکی لێوەردەگرن. Gos-sypium ناوی لاتینی ئەم گـیـایـەیە، لۆکە.

**پەمـۆدانە** (گیا.)[پەمـۆ + دانە] تۆمی پەمـۆ، دەنکی لۆکە، پـەمـوانە، پەمـوودانە، پەمــەتـۆمـە. ⁝⁝ ئەســپــەندەر دانـە دانە/ چاوی بـەد و بێگانـە/ هـەڵـتـــۆقـێ وەک پەمۆدانە (دەستە بوخچە ل ٢٥).

**پەموو** (گیا.) بڕ: پەمۆ

**پەمـوودانە** (گیا.)[پەمـوو + دانە] بڕ: پەمۆدانە.

**پەمە** (گیا.) بڕ: پەمۆ

**پەمـەتۆمـە** (گـیـا.)[پەمـە + تۆم + ئە] [هەو] بڕ: پەمۆدانە

**پەمـــەیی** (ئـان. ل)[پەمـــە + ئـی] ١ـ ڕەنگی سـووری کـاڵ، ڕەنگی ئاڵی ڕوون، ڕەنگی ڕوخسـار، ٢ـ هەرچی کە لە لۆکە ساز کرابی. & پەمبەیی.

**پەن** (نا.) بڕ: پەند

**پەنا** (نا.)[پەه: پەناه. ناو: پەنا، پەناه، پەنها ـ هەو: پەنا] ١ـ پشتیوان، پشتگر، ئامان. ⁘ پشت و پەنام هەر تۆی! ٢ـ سووچ، قوژبن. ٣ـ لا، تەنیشت، کن. ⁘ وەرە پەنای من دانیشە. ٤ـ (ئان.) ئاگادار. ⁘ پەنامان هەر خودایە. **~ بردنە بەر:** چوونە ژێر پەنای کەسێک یا شوێنێک، پەنا گرتن. ⁘ واباشە پەنا بەرینە بەر مەیخانە/ حەفتا و دوو میللەت بەمەچی شەڕیانە (خەییام ل ٧٧). **~ بۆ ... بردن:** لە ترس و مەترسی بۆ لای کەسێک چوون بۆ وەخۆ گرتن و پشت گرتن. ⁘ خۆ لەو دونیایە کەسم نیە مەگەر پەنا بۆ خودا بەرم. خراپم لیمقەوماوبوو ناچار پەنام بۆ مامەکانم برد هەتا یارمەتیم بدەن. **~ دان:** وەخۆ گرتنی کەسی راکردوو لە مەترسی و پشت گرتنی. **~ گرتن:** ١ـ لە پشت کەسێک یا سووچێک خۆ حەشار دان. ⁘ لە مەکری ئەم عەجووزە و سیحری دێوی نەفس ئەمن مەحوی/ پەنا دەگرم بە زاتی ئەقدەسی بێچوونی نادیوە (مەحوی ل ٢٩٠). ٢ـ خشت بوونی مانگ و هەڵاتنی بە جۆرێک کە بکەوێتە دوای ئاوا بوونی رۆژ (خاڵ ب ١ ل ٢٤٤). **~ هێنان:** هاتن بۆ پەنا دان، روو دە کەسی پەنادەر کردن. **خۆ دانە ~ کەسێک:** پەنا بردنە بەر کەسێک بۆ پشت گرتن، پەنا بۆ کەسێک بردن. || **پەنای بێدەنگ:** یارییەکە کۆمەڵێک بە گردیی دائەنیشن، وەستاکەیان لە یەکێکیان ئەدا ئەویش لەوەی تەنیشتی خۆی ئەدا هەر بەوجۆرە تا ئەگاتەوە لای وەستاکە (خاڵ ب ١ ل ٢٤٤) گەمەیەکە، قڕوقپ، فەنای بێدەنگ (هەنبانەبۆرینە ب ١ ل ١٢٤).

**پەنابات** (نا.) بڕ: پەناباد

**پەناباد** (نا.) دراوێکی زەرد بوو کە هەتا سەردەمی پەهلەوی لە ئێران برەوی هەبوو و نیوەی قرانێک بوو، دە شایی، پەنابات، پەنات، پەناد.

**تێبینی:** پەناد دراوێکی زێو بوو کە لە سەردەمی قاجارەکان لێدراوە و گۆیا لە پەناه ئاباد لێدراوە و ئەم ناوەی بە سەر دا براوە.

**پەنابەر** (نا. فا)[پەنا + بەر] ١ـ کەسی هەڵاتوو لە مەترسی کە پەنای بردۆتە بەر کەسی پەنادەر. ٢ـ راکردوو لە وڵات کە پەنای بردۆتە وڵاتێکی دیکە.

**پەنابەریی** (حم.)[پەنابەر + ئیی]

حاڵەت و چلۆنایەتی پەنابەر.

**پەناپەسیو** (نا. ل)[پەنا + پەسیو] شوێن و قوژبنێک کە لەبەر چاو نەبێ، شوێنی نادیار، پەنا و پەسیو.

**پەنات** (نا.) بڕ: پەناباد

**پەناد** (نا.) بڕ: پەناباد

**پەنادار** (ئان. فا)[پەنا + دار2] ١- کەسێک کە پەنا دەداتە کەسی دیکە، پەنادەر. ⁂ لایەک دەربەدەرم من لە کەس و کار/ پەنام بۆ هێنای ببە پەنادار (سەعید و میرسێوەدین ل ٢٠). ٢- (مجـ.) خودا

**پەنادەر** (ئان. فا)[پەنا + دەر (دان)] کەسێک کە پەنا دەداتە پەنابەر، پەنادار.

**پەناگا** (نا. ل)[پەنا + گا3] شوێنێک کە لە کاتی مەترسی پەنای بۆ دەبن، شوێنی پەنا گرتن، داڵدە

**پەنام** (ئان.) داپۆشراو، نهێنی، نەدیار، پەنهان.

**تێبینی:** لە ئەوێستا دا پەئیتی دانە بە مانای جلی ژێر زرێ هاتوە جگە لەوە هەم لە ئەوێستا و هەم لە پەهلەویی دا پەدام، پەندام، پەنوم بە مانای دەمامک و دەم بەندێک هاتوە کە ئاتروان لە کاتی خوێندنەوەی دوعا لە بەر ئاگر دەمی پێ دەبەست هەتا هەناسەی وە ئاگر نەکەوێ. دوو وشەی پەنام و دەمامک لە کوردیی دا لەم سەردەمەوە ماون و ئاشکراشە کە لە بەر گۆڕینی دین ئەم وشانەش مانایان هەندێک گۆڕدراون هەر چەند ناوەرۆکیان هێشتۆتەوە. هەروەتر لە راوێژیی بیرجەندیی دا پێینۆم بە مانای شاراوە و پەنهان هاتوە.

**پەنامان** (نا. ل)[پەنام + ئان] هەرشت و هەرچێکی نادیار و غەیبی، نادیاران.

**پەنامگا** (نا. ل)[پەنام + گا] جێگەی خۆ شاردنەوە، حەشارگا.

**پەنامەکی** (ئاک. ل)[پەنام + ئەکی] ١- بە نهێنی و شاراوەیی. ٢- بە سرنج و مەترسییەوە. (احتیاط) ⁂ بە پەنامەکی ماشێنی لێخورە.

**پەنا و پەسیو** (نا. ل)[پەنا + و + پەسیو] قوژبن و شوێنی نادیار، پەناپەسیو، کەلێن و کولێن.

**پەناه** (نا.) بڕ: پەنا

**پەنبو** (گیا.)[باک] بڕ: پەمۆ

**پەنج**[1] (ژ.) ١- بڕ: پێنج. ٢- (ئا.)[باک

ـ زا] بڕ: پەنجە. || **پەنجەی تار:** ناوی پێنج ڕۆژی ئاخری ساڵ، پێنجەی تار، پێنج ڕۆژەی تار. [پێشتر هەر مانگ سی ڕۆژ بوە و ساڵ دەبوو بە ٣٦٠ ڕۆژ. لە بەر دروست هاتنەوەی ساڵ پێنج ڕۆژیان پێوە دەنا کە ناوی پێنج ڕۆژەی تار یا پەنجەی تار بوە.] ∷ وەی من دیارەن پەنجەی تارمەن/ سەروەخت هامن نەووەهارمەن (مەولەوی ل ٤٧٦).

**پەنج²** (نا.) بڕ: پنج/٤

**پەنجا** (ژ.)[ئەو: پەنچاسەتە ـ پەه: پەنجاه. باک: پێنجی، پێنجە ـ ناو: پەنجا ـ هەو: پەنجا ـ زا: پانجاس] پێنج جار دە، ژمارەی ٥٠.

**پەنجاهووم** (ژ.)[پەنجا + هووم] بڕ: پەنجاهەمین

**پەنجاهوومین** (ژ.)[پەنجاهووم + ئین] بڕ: پەنجاهەمین

**پەنجاهەم** (ژ.)[پەنجا + هەم] بڕ: پەنجاهەمین

**پەنجاهەمین** (ژ.)[پەنجاهەم + ئین] ئەوەی کە ریز و پلەی پەنجا دا بێ، پەنجاهەم، پەنجاهووم، پەنجاهوومین، پەنجایەم، پەنجایەمین. ∷ پەنجاهەمین ماڵ، پەنجاهەمین کەس.

**پەنجایەم** (ژ.)[پەنجا + یەم] بڕ: پەنجاهەمین

**پەنجایەمین** (ژ.)[پەنجایەم + ئین] بڕ: پەنجاهەمین

**پەنجایی** (نا. ل)[پەنجا + ئی] پارەی پەنجا فلسی عێراق، مەنگەڵە.

**پەنجرا** (نا.)[زا] بڕ: پەنجەرە

**پەنجۆڵە** (نا. ل)[پەنجە + ئۆڵە] چووک کراوی پەنجەیە، پەنجەی چووک. ∷ ئەو کەسەی پەنجۆڵە بکوشێ جاروبار/ ئەو کەسەی دەستی بگاتە گەردنی یار (ناڵەی جودایی ل ١٤)

**پەنجووم** (ژ.)[پەنج + ئووم] بڕ: پەنجەم

**پەنجوومی** (ژ.)[پەنجووم + ئی] بڕ: پەنجەم

**پەنجوومین** (ژ.)[پەنجووم + ئین] بڕ: پەنجەم

**پەنجە** (نا. ل)[پەنج + ئە][پەه: پەنجەگ، پەنجەک، پەنچەک. باک: پەنج، پەنجە ـ ناو: پەنجە ـ هەو: پەنجە ـ زا: پەنج، پەنجە] ١ـ بەشی ژوورەوەی دەست لەو جێیەوە کە قامکەکانی لێ جیا دەبێتەوە. ٢ـ قامک، ئەنگوست. ٣ـ

بەشی ژوورەوەی پێ لەو جێیەوە کە قامکەکانی لێ جیا دەبێتەوە. ¤ بە سەر پەنجانێوە دەکرد جووتێک کەوشی دە نوقرەبەند/ .../ ئەوە بە سەری پەنجانی لە بەردی دە مەرمەڕی دەدانە (گەنج ل ٩١). ٤ـ چنگی گیاندار. ٥ـ کوتێک بە قەرای پەنجەی دەست. ¤ پەنجەیەکم نان بۆ لێکەوە. ٦ـ نووکی کەوش ئەو شوێنەی کە پەنجەی پێ دەگرێتەوە. ¤ کەوشەکەم تەنگە پەنجەم دەکوشێ! ٧ـ شوێنی قامک لە دەستەوانە دا. ٨ـ ئەندازەیەک بە قەرا پەنجە بۆ پێوان. ¤ داوێنی کراسەکەت پەنجەیەک کورت کەوە! ٩ـ بەشی سەرەوەی ساز و ئامێری مۆسیقای وەک تار کە دەست دەکەوێتە سەری. ١٠ـ هەر جار ساز لێدان بە دەست. ¤ پەنجەیەکی تار لێدا! **~ خستنە سەر:** دەست نیشان کردن، دیاری کردنی مەبەست و مەسەلەیەک، قامک لە سەر دانان. ¤ پەنجەی خستە سەر دانەدانەی هەڵەکانم و وریای کردمەوە! **~ لە ~ی یەک دان:** دەست لێدانەوە دەگەڵ یەکتر، دەست دە نێو دەست نان. ¤ دەگەڵ ئەحمەدخان پەنجەیان لە پەنجەی یەکتری دا، لاس بەخێرهاتنی شەهلیاری کرد (لاس و خەزاڵ ل ٣٠). **~ی خۆ کرۆشتن:** (کنـ.) زۆر رق هەڵستان و هیچ پێنەکران. **~ی خۆ گەستن:** (کنـ.) پەشیمان بوونەوە لە ئەنجام دانی کارێک. **لەسەر ~ رۆیشتن:** شێوەیەک رۆیشتن کە تەنیا پەنجەکانی پێ لە سەر زەوی داندرێ. **لەسەر ~ و نینۆکی خۆ بوون:** (کنـ.) لە سەر پێی خۆ وەستان. ‖ **پەنجەی پێ:** قامکەکانی پێ. **پەنجەی خانم:** (گیا.) گیایەکە وەک چرپی کە بە دار و دیواری دەوروبەریەوە هەڵدەڕووسکێ، چەند جۆری هەیە کە هەموویان گوڵەکانیان خۆشبۆن، پتر گوڵەکانی سپی یا زەردن، لە بەهار دا گوڵ دەکەن. بە هەر شێوەیەک کە باغەوان بیەوێ شکڵ دەگرن و بە قەڵەمە و توێ و خەواندن زیاد دەکرێ، Li-nocera ناوی لاتینی ئەم گیایەیە. (عەر: زهرالعسل ـ فار: پیچ امین الدولە). **پەنجەی رۆژ:** (کنـ.) ١ـ تیشکی هەتاو، گزینگ. ٢ـ روو، روخسار. ¤ کە دەستی برد و هێنا بە دولبەری بە تادا/.../ عەیان بوو پەنجەی رۆژ بە خەتتی ئیستیوا دا (وەفایی ل ١٩٣). **پەنجەی قەزا:** بڕ: پەنجەی قەزا و قەدەر. **پەنجەی قەزا و قەدەر:** (کنـ.) دەستی

ئەجەل، پەنجەی قەزا، ئەجەل. ؛؛ یان وە دەستی خۆم دەخەم فەتح و نوسرەت و تەڕەقییە/ یان موقەدەری هەق دەستی ئیلاهیم دێتە سەرێ، پەنجەی قەزا و قەدەر عیلاجی نیە (لاس و خەزاڵ ل ١٦٩). **پەنجەی مریەم:** (گیا.) گیایەکی گوڵ جوانە، گوڵەکانی بە رەنگی ئەرخەوانی، سووری تۆخ و سپین کە سەریان بەرەو زەوی لار دەکەنەوە. لە ریشەی ئەم گیایە دا مادەیەک بە ناوی سیکلامێن هەیە کە بۆ رەوانی زگ کەلکی لێوەردەگرن. Cyclamen eu-ropaeum ناوی لاتینی ئەم گیایەیە، چنگی مریەم. (عەر: بخورالاکراد ـ فار: بخور مریم). **پەنجەی نەرم:** دەست و پەنجەیەکی لێهاتوو و چوست لە کاری هونەریی دا.

**پەنجەباز** (ئان. فا)[پەنجە + باز4] شەڕانی، شەڕخواز، چنگباز.

**پەنجەبازیی** (حم.)[پەنجەباز + ئیی] زۆرەبانی، چنگبازیی.

**پەنجەبۆکس** (نا. ل)[پەنجە + بۆکس] چەکێکی ساردە، لە کانزا ساز دەکرێ، چوار کونی هەیە کە دە قامکەکانی دەستی دەکەن و دەست دەقووچێنن و دەیکەنە مست، سەرەکانی هەندێک دەرپەڕیوە و لەشی مرۆڤ بریندار دەکا.

**پەنجەتووتە** (ئا.)[پەنجە + تووتە] چووکترین ئەنگووستی دەست، قامکە چکۆڵە، تووتە.

**پەنجەر** (نا.) بڕ: پەنجەرە

**پەنجەرا** (نا.)[زا] بڕ: پەنجەرە

**پەنجەرە** (نا.)[باک: پەنجەرە ـ ناو: پەنجەرە، پەنجەر ـ هەو: پەنجەرە ـ زا: پەنجەرا، پەنجەرا، پەنزەرە] ١ـ چوارچێوەیەکی ساز کراو لە تەختە، ئاسن یا ئالۆمینیۆمە، نێوەکەی بەتاڵە و شووشەی تێدەگرترێ و بۆ رووناک بوونی ژوور یا هاتنی هەوا لە دیوار دەگرترێ، شباک، بەرکاز، دوودەری، ئاقشقە. ٢ـ چەن کونێکە ئەکرێتە تۆپی ئاشەوە بۆ ئەمەی کە زبانەی (پەررە)ی پیابکرێ (خاڵ ب ١ ل ٢٤٤). ‖ **پەنجەرەی سێ دەری:** جۆرە پەنجەرەیەک کە سێ لا یا سێ دەری هەبێ. ؛؛ بەرەو قوبڵە شوعرەی منیان بکێشایە/ پەنجەرەی سێ دەریان لە پێشی من لێبدایە (لاس و خوزاڵ ل ٦٦).

**پەنجەم** (ژ.)[پەنج + ئەم][پەه: پەنچۆم، پەنجۆم] ئەوەی کە لە ریزی

پەنج دایە، پێنجەم، پێنجووم، پەنجووم، پەنجوومی، پێنجوومی، پێنجەمین، پەنجەمین، پەنجوومین، پێنجوومین.

**پەنجەمی** (ژ.)[پەنجەم + ئی] بڕ: پەنجەم

**پەنجەمین** (ژ.)[پەنجەم + ئین] بڕ: پەنجەم

**پەنجەوانە** (نا. ل)[پەنجە + وان+ ئە] بڕ: ئەنگوستیلە

**پەنچەر** (نا.)[ئین: puncture] ١ـ کونی تیوبی ترۆمبێل و چەرخ و شتی لەم بابەتە. ٢ـ (کنـ.) بێواز، بێحاڵ، بێتاقەت. ~ **بوون:** ١ـ کون بوون و بەتاڵ بوونی هەوای نێو تیوب. ٢ـ (کنـ.) بێواز بوون، بێتاقەت بوون. ~ **کردن:** ١ـ کون کردنی تیوبی ترۆمبێل و چەرخ و کەرەسەی لەم بابەتە و بەتاڵ بوونی هەوای دەروونیان. ٢ـ (کنـ.) بێتاقەت کردن، بێواز کردن.

**پەنچەرچی** (نا. ل)[پەنچەر + چی] ١ـ کەسێک کە پەنچەریی تیوب و چەرخ چاک دەکا. ٢ـ دوکان و شوێنی چاک کردنەوەی پەنچەریی.

**پەنچەریی** (حم.)[پەنچەر + ئیی] چلۆنایەتی و وەزعی تیوب و چەرخ کە پەنچەر بوە. ∷ دەبێ لە پێشدا پەنچەریی ماشێنەکە چاکەم و دوایە وەڕێ کەوین! ~ **گرتن:** چاک کردنەوەی پەنچەریی.

**پەند** (نا.)[ئەو: پەنتی ـ هەخ: پەتهی ـ پەهـ: پەند. باک: پەند ـ ناو: پەن، پەند، پەنگ] ١ـ ئامۆژگاریی، نەسیحەت، ڕێی ڕاست. ٢ـ (مجـ.) تەمێ. ٣ـ (مجـ.) سووکایەتی، ئەتک، بێ ئابڕوویەتی، گۆڵمەز. **بە ~ بوون:** تووشی بەڵا و سووکایەتییەک هاتن و بوونە پەند بۆ خەڵک. ~ **بە سەر هاتن:** تووشی سووکایەتی و ناخۆشیی بوون، گۆڵمەز بە سەر هاتن. ~ **بە سەر هێنان:** ١ـ ڕابواردن بە کەسێک وەها کە خەڵک باسی بکاتەوە. ٢ـ ئەتک پێکردن، پەند دان، پەند پێکردن، بێ ئابڕوو کردن، گۆڵمەز بە سەر هێنان. ~ **پێدان:** ١ـ تەمێ کردن، بەڵا هێنانە سەر کەسێک. ٢ـ گاڵتە پێکردن، گەمە بە کەسێک کردن. ~ **پێکردن:** پەند بە سەر هێنان، ئەتک پێکردن، سووکایەتی پێکردن. ∷ ئەتۆ هەموو ڕۆژێ سواعبەتم پێدەکەی، پێم دەکەیەوە پەنێ (لاس و خەزاڵ ل ٩٠) سمێڵ وەنەوشەی، بەژن کەللەقەند/ گەر منت نەویست بۆ پێت

کـردم پـەند (کـانـی مـرادان ل ٥١). **~ دان:** ١ـ ڕێی ڕاست بـە کـەسـێک نیـشـان دان بە قسـە، نەسیـحەت کردن. ٢ـ تەمێ کـردن. ٣ـ بڕ: پـەند بە سـەر هێنان. **~ لە گوێ گرتن:** ئامـۆژگاری و نەسیـحـەتی کەسێک ڕەچاو گرتن و بە قسـە کردن. ‖ **پەندی پێشینیان:** کۆمەڵە قسـە و پەندێک کـە پشـتـاوپشت و زاربـەزار لە کـۆنەوە گـەیشـتـۆتـە بەرەی نوێ. **پەندی ڕۆژگـار:** سووکایەتییـەک کە خەڵک باسـی بکاتەوە، پەنـدی عــالەم. * **بوونە پەندی ڕۆژگـــار:** ئەتک و سـووکایـەتییـەک کـە هـەموو کـەس ئاماژەی پێبکا و بیزانـێ، بێ ئابڕوو بوون لە لای خـــەڵک، بـوونە پـەندی عـــالەم. * **کردنە پەندی ڕۆژگار:** بەڵا بە سەر کەسێک هێنان و سـووک کـردنی ئەو کـەسـە وەها کـە هـەمـوو کـەس بیبـیـسـێـتـەوە، کـردنە پەندی عـالەم. ⁘ گـوتـی: دەنگی لەشـکر دەن بۆ سـەر ئایشێ خـان، سەری بتاشن و بیکەنـە پەندی ڕۆژگـــار (ســـەعــیــد و مـیرسـێوەدین ـ سـروە ٧٥ ل ٣١). **پەندی سیـا:** بەڵای گـەورە و گـران. * **بە پەندی ســیــا هەڵێنان:** تووشـی بەڵای گـەورە و گـــران بـوون. ⁘ جـــارێکی دیکە ئـەو کوڕەی لەبەر دەرگاکەمان ببینم بە پەندی ســـیـــای هەڵدێنم. **پەندی عـــالەم:** سـووکایەتی گشـتی و جێ باسـی خـەڵک، پەنـدی ڕۆژگـار. * **بوونە پەندی عــالەم:** ئەتک و سـووکایـەتییـەک کـە هـەموو کـەس ئاماژەی پێبکا و بیزانێ، بێ ئابڕوو بوون لە لای خـــەڵک. ⁘ لە ســـەر تـۆ بوومـــە پەنـدی عـالـەمێ، وتم و وتـی: مـەحـوی/ بەسـی بێ موشـریکی، بەس، یا لە دنیا یا لە مـن لادە (مـەحـوی ل ٢٦٩) * **کـردنە پەندی عـــالەم:** ئابڕوو بردن و ئەتک بـە کـەسـێک کـردن وەها کـە هـەمـوو کـەس باسی بکا.

**تێبینی:** پەند لە بنەڕەت دا بە مـانای ڕێگایە.

**پەندگۆ** (ئان. فا)[پەند + گۆ] کەسێک کە ئامۆژگاری دەدا. ⁘ وایان دی ئەوانی پەندگۆ بوون/ بێهوودەیە لەم هەژارە کۆ بوون (مەم و زین ل ٢٩٥).

**پەنزەرە** (نا.)[زا] بڕ: پەنجەرە

**پەنگ**[1] (نا.)[باک: پەنگ ـ ناو: پەنگ، پۆنگ] گـیـر، وەسـتـاو بۆ ئاو و ئاوەکی. **~ خـــواردنەوە:** بـەرگـــیـــران و کـــۆ بوونـەوەی ئاو لـە شــــــوێنێک، پـۆنگ خواردنەوە.

**پەنگ**[2] (نا.)[؟][باک] کەڵاف، ماشەر

**پەنگ**[3] (نا.) بڕ: پەند

**پەنگاف** (نا. ل)[پەنگ1 + ئاف][باک] بڕ: پەنگاو

**پەنگاو** (نا. ل)[پەنگ1 + ئاو] ١- ئاوی لە شوێنێک ویستاو، پەنگاف، پۆنگاو. ٢- شوێنی مەندی چۆم، مەنداو. // تەنکاو. ~ **خواردنەوە:** وێستان و کۆ بوونەوەی ئاو لە شوێنێک، پەنگ خواردنەوە.

**پەنگر** (نا.)[باک: پەنگر، پنگل ـ ناو: پەنگر، پنگر، پەنگل، پەرەنگ] پۆلووی رەژی و ئاگر، پشکۆ، سکڵ.

**پەنگرکێش** (نا. ل)[پەنگر + کێش] پۆلووگر، مقاش، ماشە، پەنگل کێش

**پەنگل** (نا.) بڕ: پەنگر

**پەنگل کێش** (نا. ل)[پەنگل + کێش] بڕ: پەنگرکێش

**پەنمان** (چا. ل) بڕ: پەنەمان

**پەنماو** (نا. مف.)[لە: پەنمان] بڕ: پەنەماو

**پەنمین** (چا. ل) بڕ: پەنەمان

**پەنمیو** (نا. مف.)[لە: پەنمین] بڕ: پەنەماو

**پەنها** (نا.) بڕ: پەنا. ፡፡ شاری داوودییێ بەشی خۆمت دەدەمێ و گەردنت دەکەم ئازایە/ رۆڵە، حەزێ دەکەی جا رۆنیشە، بۆ من ببە بە پەنهایە (مان ل ١٤٢).

**پەنهان** (ئان، ئاک.)[پەهـ: پە ـ نیهان. باک: پەنهان ـ ناو: پەنهان ـ هەو: پەنهان] ١- شاراوە، نیان، پێوار. ٢- ون، بزر. ፡፡ پەنهانەن سیمای سیمین وارەکەت/ شێوەی کۆتەڵەن یادەگارەکەت (مەولەوی ل ٨٠). ~ **بوون:** ١- ون بوون، لەبەر چاو نەمان، ئاوا بوون. ٢- شارانەوە، شاردنەوە. ፡፡ ئەو وەختی کە خوداوەندی میری مەزن، سەحرای مەحشەرە و دەگرێ گۆشەی دیوانە/ هەرکەس بە خێر و شەڕی خۆی نامەی دەدرێتێ و کاری وی دەبێتەوە پەنهانە (لاس و خەزاڵ ل ٢٤) زولفت ئەفشان کرد و پەنهان بووی و دونیات کردە تەم/ خۆت وەدەرنا عالەمت سووتاند و ئاورت کردەوە (وەفایی ل ١٥٦). ~ **کردن:** شاردنەوە، نیان کردن. ፡፡ ئەمن جووتێک شەمامە و شەمامە رەنگینم لە بن کراسی مەحمەڵ دارایی دانا/ قسمەتی کەس نیە بۆ تۆم راگرتووە بە ئامانەتی و کردوومە بە پەنهانە (لاس و خەزاڵ ل ٦٨). **خۆ ~ کردن:** خۆ شاردنەوە. ፡፡

ئێرانی ئەگەر لێیان قەوما، بۆ گەرمێنێ دێن، بۆ فـەقیـری و بۆ هەژاری و خـۆیان دەکـــەنەوە پـەنـهـــانـە (ســـەعـــیـــد و میرسێوەدین ل ١٠٨).

**پەنهانیی** (ئاک. ل)[پەنهان + ئیی] بە نهێنی، بە دزیی، شاراوەیی.

**پەنە** (پێـــشـ.)[هـەو] برِ: پێ3. ⁘ پەنەسپەردەی (پێسپاردن)، پەنەکریای (پێکران) پەنەخوای (پێکەنین).

**پەنەرشکە** (گیا.) برِ: پەرمێشک

**پەنەرێشکە** (گیا.) برِ: پەرمێشک

**پەنەمان** (چا. ل)[ناو: پەنمان، پەنمین، پەنەمین، پەنەمان، پەنەمیان] ١ـ با کردن و هەڵمسانی شوێنێکی لەش بە نەخۆشی یا کـــەوتن و ئازار پێگەیشتن و هـەر هـۆیەکی دیکە. ٢ـ ئەســـتـــوور بوون و هەڵـمـســانی شـوێن و جـێگایەک. & هەڵـمـســان، هـەڵامـســـان، ئاوســـان، ئاوسیان.

**پەنەماو** (نا. مف.)[لە: پەنەمان] ئەو شـــوێنەی لەش کــە ئەســـتـــوور بوە، هەڵـمـســاو، ئامـاســیـاگ، پەنەمـیگ، پەنەمیو، پەنمیو، پەنماو.

**پەنەمیان** (چا. ل)[ئەر] برِ: پەنەمان

**پەنەمـیگ** (نا. مـف.)[لە: پەنـەمین] [ئەر] برِ: پەنەماو

**پەنەمین** (چا. ل) برِ: پەنەمان

**پەنەمـیـو** (نا. مـفـ.)[لە: پەنـەمین] برِ: پەنەماو

**پەنیر** (نا.)[پەه: پەنییر. پەش: پەنیر ـ فار: پنیر ـ سـەنگسـەریی: پەندیر ـ گیل: پەنیـر. باک: پـەنیر، پـەنێـر ـ ناو: پەنیـر، پەنێر ـ زا: پەنیر، پێندر] پێخۆرێک کە لە شیری مانگا یا مەڕ ساز دەکردرێ. شیر کــەمــێک گــەرم دەکــەنەوە و لـە دوایی هەوێنی لێدەدەن و دوای چەند سـەعاتان دەمـەیێ کـە پێی دەڵێن دەڵەمـە، مـادەی مـــەیو لـە توورەکـــەیەک دەکـــەن هەتا ئاوەکەی بچۆڕێتەوە و رەق بێ یا ئەوەکە دەســـتـــبـــەجێ دەڵەمـــە بە دەست رێک دەکوشن و دەیکەنە سـەلک سـەلک. ~ **ئاخنینەوە:** ورد کـردنی پەنیـری سـەلک و لە پێستـە و کووپە کـردن و داگرتنی. ‖ **پەنیری پێستەی:** پەنیری سـەلکی کوتراو یا رەندە کــراو کـــە لە پێـــســـتـــە دا دەیاخننەوە. **پەنیـری سـەلک:** دەڵەمـەی سـەلک سـەلک کـراو. **پەنیـری کـووپەی:** پەنیری سـەلکی کوتراو یا رەندە کراو کە لە کـووپە دا دەیاخـننەوە. **پەنیـری مـەیرە:**

پەنیــرێکی وردکــراو و ئاخنراو کــە لە پەنیـری دیکە هەندێک چەورترە، پەنیـری مەیلە. **پەنیری مەیلە:** بڕ: پەنیری مەیرە.

**پەنیراو** (نا. ل)[پەنیر + ئاو] شۆربای پەنیـر کـە لە پیـواز و ئاو و پەنیـر سـاز دەکردرێ، پەشمەک، پیرەزاڵ.

**پەنیرشک** (گیا.) بڕ: پەرمێشک

**پەنیـرفرۆش** (نا. ل)[پەنیـر + فرۆش] کەسێک کە لە دوکان دا پەنیر دەفرۆشێ.

**پەنیـرفرۆشـیی** (حم.)[پەنیرفرۆش + ئیی] ١ـ کـار و پیشـەی پەنیـرفرۆش. ٢ـ (نا. ل) دوکان و جێ کاری پەنیرفرۆش.

**پەنیرۆک** (گیا.)[پەنیر + ئۆک][باک] بڕ: پەنیرۆکە/١ و ٢

**پەنیـرۆکـە** (گـیا.)[پەنـیر + ئۆکـە] ١ـ شـیرەی مـەییـو و توند بووی دەغڵ و دانە و نیــشــانـەی نـزیک بوون لـە گـەیشــتنی، پەنیـرۆک، پەنیـرە. ٢ـ [پـەش: پەنیـرەک، پەندیرەک ـ فـار: پنیرک. باک: پەنیرۆک ـ ناو: پەنیرۆکە، پەنیرە، پەنێرە] گیایەکی خۆڕسکە، گەڵاکانی پان و گڕنی گرنییە، گــولێکی ســوور یـا مـۆری هـەیە و نیــو مـیـتـرێک هـەڵدەدا، جـۆرێکی دیکە زۆر هەڵنادا و گـولێکی سـپی دەکـا کـە لە دوایی دەبێـە بەرێکی چووک و خڕی شین و دەخـورێ، Mauve ناوی عـیلـمی ئەم گـیـایەیە، نانی حـاجی لەگلەگی، نانی لەگلەگی، نـانە حـاجـیلە، نان چووچک، تووزک، تۆڵکە، پەپکە مـــەلیـــچکانە. **~کردن:** مـەیینی شیلەی دەغڵ و دان، پەنیرە کردن.

**پەنیــرە** (گــیــا.)[پـەنیــر + ئە] بڕ: پـەنیـــرۆکـــە/١ و ٢. **~ کــردن:** بڕ: پەنیرۆکە کردن.

**پەنێر** (نا.)[باک ـ ئەر] بڕ: پەنیر

**پەنێـرە** (گـیـا.)[پـەنێر + ئە][ئەر] بڕ: پەنیرۆکە/٢

**پەهلەوان** (ئان.)[باک] بڕ: پاڵەوان

**پەهن** (ئان.)[باک] بڕ: پان

**پەهنی** (نا.)[باک] بڕ: پاژنە

**پەهیز** (نا.)[باک] بڕ: پایز

**پەهین** (نا.)[باک] لەقە، شەپ. بڕ: پین

**پەی** 1 (نا.)[نـاو: پەی، پـێ ـ هەو: پـەی ـ زا: ئاپەی] ١ـ شـــوێن، دوا، دوو. ٢ـ لـە دوای، پاش. ٣ـ لـەبەر، بـۆ خـاتری. **~ پێـبـردن:** مـەسـەلەیەک بۆ دەرکـەوتن، زانـین. **~ کـردن:** ١ـ شـــوێن کـــەوتن، وەدوا کـــەوتـن. ٢ـ لەت کـــردن، بـڕین، پەڕاندنی پـێ مرۆڤ یا حـەیوان بە تیغ و

شـەمـشـیـر. ‌⁙ دڵ پەی دەکـا نیگاهـی سەهـمی موژەی سیـاهـی/ رەمزی هـەموو بەڵایە، غـەمزەی هـەموو موسیبـە (نالی ل ٣٩٧). ~ **هەڵگرتن:** شـــوێـنی دز و راکردوو هـەڵگرتن، شوێن هـەڵگرتن.

**پەی**$^{2}$ (نـا.)[لـە: پـێ1] ١ـ بـنـەڕەت، پـایـە. ٢ـ رادەی قـــــــــوڵایـی چـەم و رووبار. ~ **دان:** چۆم و رووبـارێک کـــە مـــرۆڤ بـێ ئەوەی نـوقم بـێ بتـــوانـێ بـە پێیان لێی بپەڕێتەوە. ⁙ ئەو چۆمە قووڵە پێموانەبێ پەی بدا.

**پەی**$^{3}$ (نا.)[پـەه: پەی] ١ـ (ئـا.) رەگی سەخت و رەق لـە لەشـی مرۆڤ و گیاندار دا کە جـووڵانەوە و بزووتنـی ئەندامـەکان بـەڕێوە دەبا. ٢ـ رەگ، ریشـــە. ⁙ دەری بێـنن بە زۆری نوێڵی شـــادی/ درەخـــتی غـەم لـە بنچـینـە و رەگ و پەی (بێـخـود ل ١٢٧).

**پەیا**$^{1}$ (ئان.) بڕ: پەیدا

**پەیا**$^{2}$ (ئان.)[باک ـ زا] بڕ: پیادە

**پەیا**$^{3}$ (نا.)[باک] بڕ: پیاو

**پـەیـاپـەی** (ئـاک. ل)[پـەی1 + ئـا + پەی1] بە دوای یەک دا، لـە پشت سـەری یەک، دەمـادەم، پـەیتـاپەیتـا، پـەیدەرپەی، پەی پەی. ⁙ ئەتۆ ئەی رووحەکەم ساقی، ئەتۆ ئەی عـومـرەکـەم مـوتریـب/ پـەیاپـەی لێدە چەنگ و نەی، دەمـادەم بێنە پەیمانە (وەفـــایی ل ١٤١). دەروون جـــە دووریی مـەگریا بە تاو/ جـە چەم مەتکیا پـەیاپـەی هووناو (بێسارانی ل ٢١).

**پـەیـاغ** (نـا.)[هـس: تـەیـاخ] دارێکـی رەخت و هـەندێک درێژە کـــە بـۆ دەسکـی پاچ و پێـمـەرە و شـەڕ و کـاروباری دیکە کەلکی لێوەردەگرن.

**پەیاک** (نا.)[بڕ: پیـادە][باک] پیادەی شەترەنج.

**پەیام** (نا.)[ئەو: پەئیـتـیگامـە ـ پاز: پێغام ـ پەه: پێتام، پەیتام. باک: پەیام ـ ناو: پەیام، پـەیـغـــام، پـەیـخـــام ـ هـەو: پەیغـام] قسـە یـا نووسـراوەیەک کـە بۆ کەسێک دەنێـردرێ و هەواڵێکی تێـدایە، هـەواڵ، خـەبەر. ~ **بردن:** بردنی هـەواڵ بە نووسـراوە یا قسـە بۆ کـەسێک. ~ **دان:** هەواڵ دان، خـــەبـەر بە کـــەســـێک راگـــەیاندن. ~ **گـــەیشتن:** هاتن و گـــەیشـــتنی پـەیامی پەیامنێـــر، پـەیام هـاتـن. ~ **ناردن:** نـاردنـی هـــەواڵ و خەبەر بۆ کەسێک. ~ **هاتن:** گەیشتنی پەیامی پەیامنێر، پـەیام گـەیشتن. ~

**هێنان:** هاوردنی پەیامی پەیامنێر بۆ کەسێکی دیکە.

**پەیامبەر** (ئان. فا)[پەیام + بەر7] بڕ: پێغەمبەر

**پەیامنێر** (ئان. فا)[لە: پەیام ناردن] کەسێک کە لە لایەن ئاژانس و هەواڵدەریەکانەوە ئەرکی کۆ کردنەوەی هەواڵی پێدراوە، هەواڵنێر، هەواڵدەر.

**پەیامنێریی** (حم.)[پەیامنێر + ئی] کار و پیشەی کەسی پەیامنێر.

**پەیام هێنەر** (ئان. فا)[لە: پەیام هێنان] کەسێک کە ئەرکی گەیاندنی هەواڵی پێ دراوە و پەیام دەگەیەنێتە خاوەن پەیام.

**پەی پەی** (ئاک. ل)[پەی1+ پەی1] بڕ: پەیاپەی. ‹‹ پرشنگێ نوورش پەی پەی مەشانا/ من دەرسات نە رووش لافتام وانا (بێسارانی ل ٢٨).

**پەیت** (ئان.)[هس: پەیک] توند و تۆڵ، چوست. ‹‹ پەیکی دیدەم پەیت و چوستە و دەرفەتێکیش نایەنێ/ چەندی بێ هەست و بە پەردە و نەرم و ناپەیدا دەچێ (هێدی ل ٤٠٧). ~ **بوون:** چوست و چالاک بوون، گورج و گۆڵ بوون. **لە چاو شەلان ~ بوون:** (کنـ.) هەڵسەنگاندن و بەراورد کردنی زیرەکی و لێهاتوویی خۆ دەگەڵ لە خۆ خرابتر. وێنەی خراپ و نزم دۆزینەوە بۆ سەلماندنی لێهاتوویی خۆ.

**پەیتاپەیتا** (ئاک. ل)[پەیتا + پەیتا] کار و کردەوەیەک بێ پسانەوە، پەستاپەستا، پەساپەسا، هەیتاهەیتا. ‹‹ پەیتا پەیتا قسان دەکا. دەمێکە پەیتاپەیتا سەفەر دەکەم.

**پەیتووکە** (گیانـ.)[پەیت + ئووکە] [هس: بەیتک]١ـ باڵندەیەکی وریای چوست و چالاکە (خاڵ ب ١ ل ٢٤٦) چۆلەکە بەرگاییلکە ، کلک هەڵسەنگێنە (کشت و کاڵ ب ١ ل ٧٢) جۆرێ چۆلەکەی بچووکی تیژباڵ (هەنبانەبۆرینە ب ١ ل ١٢٦). ٢ـ (کنـ.) کەسی زۆر بزۆز و نائارام.

**پەیجۆ** (ئان. فا)[پەی + جۆ (فار: جو لە: جستن)] ١ـ شوێن پێ هەڵگر، شوێنگێڕ. ٢ـ کەسێک کە لە شتێک بگەڕێ و شوێن شتێک یا مەسەلەیەک بکەوێ، تۆژێنەر. & پەیجۆر، پەیدۆز. ~ **ی کەسێک یا شتێک بوون:** بە شوێن کەسێک یا شتێکەوە بوون، لە کەسێک یا شتێک گەڕان، پەیجۆری

کەسێک یا شتێک بوون.

**پەیجۆر** (ئان. فا)[پەی + جۆر] بڕ: پەیجۆ. ~ **ی کەسێک یا شتێک بوون:** بڕ: پەیجۆی کەسێک یا شتێک بوون. ؛؛ نازانم چ بوو ئیدی خۆی تێنەگەیاندم، هیچ پەیجۆری من نەبوو ئاخر ماوم یا مردووم.

**پەیجۆریی** (حم.)[پەیجۆر + ئیی] ١ـ کاری پەیجۆ، شوێنگێڕیی. ٢ـ تۆژینەوە، لێکۆڵینەوە & پەیجۆیی، پەیدۆزیی. ~ **کردن:** ١ـ شوێن پێی کەسێک گرتن. ٢ـ گەڕان، لێگەڕان، لێکۆڵینەوە. & پەیجۆیی کردن، پەیدۆزیی کردن.

**پەیجۆیی** (حم.)[پەیجۆ + ئیی] بڕ: پەیجۆریی ~ **کردن:** بڕ: پەیجۆریی کردن.

**پەیجە** (نا. ل)[پەی (پێ) + جە] بڕ: پەیژە

**پەیخام** (نا.) بڕ: پەیام

**پەیخامبەر** (ئان. فا)[پەیخام + بەر7] بڕ: پێغەمبەر

**پەیخەمبەر** (ئان. فا)[پەیخەم (پەیخام) + بەر7] بڕ: پێغەمبەر

**پەیدا** (ئان.)[ئێب: پەتیاکە ـ پەه: پەتیاک، پەئیتاک. پەش: پەیدا ـ فار: پیدا ـ لۆر: پییا. ناو: پەیدا، پەیا ـ باش: پەیدا ـ هەو: پەیدا ـ زا: پەیدا، پێدا] دیار، ئاشکرا، خویا. ~ **بوون:** وەدیار کەوتن، ئاشکرا بوون، دەرکەوتن. ؛؛ دەدرەوشێ لە نێو زولفی رەشت ئارەقی گەردن/ خۆ هەر شەوە پەیدا بوو ستارەی سەحەریی تۆ (وەفایی ل ١١١).
~ **بوونەوە:** دیسان وە دیار کەوتنەوە، دیسان هاتنەوە. ~ **کردن:** دیتنەوە، وەگیر خستن.

**پەیدۆز** (ئان. فا)[پەی + دۆز] بڕ: پەیجۆ

**پەیدۆزیی** (حم.)[پەیدۆز + ئیی] بڕ: پەیجۆیی. ~ **کردن:** بڕ: پەیجۆریی کردن.

**پەیدەرپەی** (ئاک. ل)[پەی1+ دەر + پەی1] بڕ: پەیاپەی. ؛؛ دڵ لە سەر خۆ چوونی پەدەرپەی دەلیلی یارە هات/ عەقڵ و هۆش ئەی دڵ بکە حازر، لە پێشە کارە هات (مەحوی ل ٥٦).

**پەیڕەو** (نا. ل، ئان. فا)[پەی1 + ڕەو] ١ـ دواکەوتنی کەسێک، درێژەپێدەری ڕێگا و بۆچوونی کەسێک، لاگر، مرید. ٢ـ بەرنامە، دەستووری کار. ~ **بوون:**

ڕەچاوکەری ڕێگا و بیری کەسێک بوون.

**پەیڕەویی** (حم.)[پەیڕەو + ئیی] ڕەچاوکەری بیر و ڕێگای کەسێک. **~ کردن:** ڕەچاو کردن و لەبەر چاو گرتنی بیر و بۆچوونی کەسێک.

**پەیژە** (نا. ل)[پەی (پێ) + ژە] جۆرێک پلیکانە کە لە دار و چێو ساز دەکردرێ بۆ چوونە سەربان و بەرزایی دیکە، پێژە، پەینجە، پەیجە، نەردیوان، نێردیوان.

**پەیژەک** (نا. ل)[پەیژە + ک] پەیژەی چووک، نەردیوانی چووک

**پەیغام** (نا.) بڕ: پەیام

**پەیغامبەر** (ئان. فا)[پەیغام + بەر7] بڕ: پێغەمبەر

**پەیغەمبەر** (ئان. فا)[پەیغەم (پەیغام) + بەر7] بڕ: پێغەمبەر

**پەیغەمەر** (ئان. فا)[پەیغەم (پەیغام) + ئەر (بەر7)] بڕ: پێغەمبەر

**پەیڤ** (نا.)[باک] قسە، وتە، کەلام، شەرت، پەیمان.

**تێبینی:** پەیڤ دەگەڵ پەیمان یەک ریشە و سەرچاوەیان هەیە و ئاڵوگۆڕیی دوو پیتی " ڤ " و " م " یان بە سەر داهاتوە کە لە زاراوەی باکووریی دا وێنەی زۆرە (جەماعەت ـ جڤات. چەم ـ چاڤ)

**پەیڤین**[1] (چا. م)[لە: پەیڤ][باک] قسە کردن، ئاخاوتن

**پەیڤین**[2] (چا. م)[باک] بڕ: پێوان

**پەیک** (نا.)[ئەو: پەدیکە] کەسێک کە ئەرکی هەواڵ بردنی پێ دەسپێردرێ، نامەبەر، پەیامبەر، قاسد. ⁂ قوربانی تۆزی ڕێگەتم ئەی بادی خۆش مروور/ ئەی پەیکی شارەزا بە هەموو شاری شارەزوور (نالی ١٧٤) بکیانە پەیکێ وە پاڕانەوە/ پەی کێ؟ پەی مەجنوون بیارانەوە (مەولەوی ل ٨٤).

**پەیکار** (نا.)[ئەو: پەئیتیکارە ـ پەه: پەتکار] شەڕ، جەنگ. ⁂ من دەردم پەیکار ناز دڵگیرەن/ دەوای زامانم زامداریی تیرەن (مەولەوی ل ٧٧).

**پەیکان** (نا.)[پەه: پەئیکان] ١ـ کوتە ئاسنێکی تیژی لێک و لووس کراو کە لە سەری تیر و نەیزە و ڕمبی دەدەن. ٢ـ (کنـ.) مژۆڵی یار و گراوی.

**تێبینی:** پەیکان لە ڕەگی پێکان بە مانای لێدانی نیشانە کەوتوە.

**پەیکوڵ** (گیا.) بڕ: پێکوڵ

**پەیکەر** (نا.) ١ـ بڕ: پەیکەرە. ⁂ هەی کەرێکم بوو، چ پەیکەر؟ تەیکەری هەوراز و لێژ (نالی ل ٢٢٤). ٢ـ لەش، قالب، بەدەن.

**پەیکەرە** (نا.)[هەخ: پەتیکەرە ـ پەه: پەهیکار] مرۆیەکی دەسکرد و ساز کراو لە بەرد، گیچ و کەرەسەی دیکە، کۆتەڵ، مجەسەمە، پەیکەر.

**پەیکەرەتاش** (ئان. فا)[پەیکەرە + تاش] کەسێک کە پەیکەرە لە بەرد یا شتی دیکە دەتاشێ.

**پەیکەرەتاشیی** (حم.)[پەیکەرەتاش + ئیی] کار و پیشەی کەسی پەیکەرەتاش

**پەیکەرەساز** (ئان. فا)[پەیکەرە + ساز] کەسێک کە لە بەرد یا کەرەسەی دیکە پەیکەرەی ساز دەکا، مجەسەمەساز.

**پەیکەرەسازیی** (حم.)[پەیکەرەساز + ئیی] کار و هونەری کەسی پیکەرەساز، هونەری پیکەرە ساز کردن، مجەسەمەسازیی.

**پەیمان** (نا.)[پەه: پەتمان. باک: پەیمان ـ ناو: پەیمان ـ هەو: پەیمان] بەڵێنی، مەرج، شەرت. **~ بەستن:** مەرج و بەڵێنی دووکەس و بەڕێوە بردنی، قەول و قەرار پێکەوە دانان. پەیمان دانان. **~ دانان:** بڕ: پەیمان بەستن. **~ شکاندن:** لە ژێر پێ نانی پەیمان و بەڵێنی. **~ نوێ کردنەوە:** سەرلەنوێ راگەیاندن و دەربڕین بۆ درێژە دان بە پەیمان و بەڵێنێک کە پێشتر بەستراوە. || **پەیمانی ئاشتی:** بەڵێننامەیەک کە دوو یا چەند دەوڵەتی لایەنی شەڕ پێکی دێن و هەل و مەرجی ئاشتی تێدا دەگونجێن.

**پەیمانشکێن** (ئان. فا)[لە: پەیمان شکاندن] کەسێک کە پەیمان و قەولی دراو لە ژێر پێ دەنێ، کەسێک کە پەیمانەکەی بەڕێوە نابا.

**پەیمانشکێنیی** (حم.)[پەیمانشکێن + ئیی] کاری کەسی پەیمانشکێن. ⁂ لە ناو کوردا نەبوو پەیمان شکاندن/ لە کوێ فێر بووی گوڵم پەیمانشکێنی (تاریک و روون ل ١٢٩).

**پەیمانکار** (ئان. ل)[پەیمان + کار] کەسێک کە ئەنجام دانی کارێک لە بەرابەر پارەیەکی دیاریکراو جێبەجێ دەکا، قۆنتراچی.

**پەیماننامە** (نا. ل)[پەیمان + نامە] نووسراوەیەک کە بەڵێن و پەیمان و

شـــەرتی بەڵێوەچوونی تێـدا نووســـراوە، بەڵێننامە.

**پەیمانە** (نا. ل)[پـەیمـان + ئـە] ١ـ بڕ: پێـوانە. ٢ـ جـام و پیـاڵەی مـەی تێـدا خـــواردنەوە. ⁂ هـەتا نـەبیــە خــاکی مـەیخـانـە/ مـەڵێ سـاقی بێنە پەیمانە (وەفایی ل ١٧٣).

**پەیاوتش** (چا. م)[زا] بڕ: پێوان

**پەین** (نا.)[فــار: پهن ـ گــیل: پـەئین، پـەهــین. بـاک: پـەیـن ـ نـاو: پـەیـن ـ هـەو: پەین] ١ـ گـووی مـاڵاتی وەک گا و مـانگا کــە بۆ کــوود و ســـووتان کـــەلکی لێـوەردەگـرن. ٢ـ (مـجـ.) تامـی شــتی ناخـۆش، خـواردنـی ناخـۆش. ⁂ ئەوە چ بوو دەرخواردت دام هـەر دەڵێی پەینە!

**پەینجە** (نا. ل)[پەی (پێ) + ن + جە] بڕ: پەیژە

**پەینچی** (ئان. فا)[پەین/١ + چی] بڕ: توونچی

**پەیوەست** (نـا. مــفـ.)[ئەو: پـەئیـــتی بەند] ١ـ پێوەلکاو، پێوە بەستراو. ⁂ لە قوبـبـەی سـینە سـووتاوم دڵـم بەو نارە پڕ نارە/ برۆی **پەیوەستە** خستوومی منی وا خـەسـتـە پەیوەسـتـە (وەفـایی ل ١١٦). ٢ـ (ئاک. ئان.) هـەمـیــشــە، دایم، بێـوچان، پەیوەســتــە. ⁂ پەیوەست مـەکـێـشــاش هەناسـانێ سـەرد/ هـەر سـەنگ و ئاهـەن، پەیش مـەبی وە گـەرد (بێسـارانی ل ١٧).
**~ بوون:** پێـوەلکان، پێـوەبەسـتـران.
**~ کردن:** پێوە لکاندن، پێوە بەستن.

**پەیوەستە** (نا. مفعـ.)[بڕ: پەیوەست] ١ـ پێوەلکاو، پێوە بەستراو. ٢ـ هەمیشە، دایم. ⁂ وەفـایی دوور لـە تۆ پەیوەســتــە حـاڵی شـینە، گـریانـە/ لەبەر چاوت بە سـەد جێ وەک نیـشــانەی دڵ بریندارم (وەفایی ل ٥٩)

**پەیوەند** (نـا.)[پـەه: پـەتـڤــــەنـد] ١ـ پێوەند. ٢ـ کاری پێوەلکانی پەلی گیا و درەخــتــێک لە درەخــتــێکی دیکە بۆ ئیـســلاح کـردنی رەگـەز و بـەر هێنانی باشـــتـر، مـوتربـە، تووز. ٣ـ کـاری لێک بەســتنەوە و پێــوە لکانـی دوو ئەندام.
**~ کردن:** پێوەلکاندنی گیا و ئەندام لە یەکتر، موتربە کردن، تووز کردن

**پەیوەندیی** (حم.)[پەیوەند + ئیی] بڕ: پێوەندیی

**پەیە** (ئان)[زا] بڕ: پیادە

**پی**[1] (نا.) بڕ: پیو.

**پی**[2] (نا.)[زا] بڕ: پێرد

**پی**[3] (ئا.)[باک] بڕ: پووک1

**پی**[4] (ئا.)[باک] بڕ: پیل1

**پیا**[1] (پێشـ.) ١ـ بڕ: پێدا1. ٢ـ بڕ: تێ1

**پیا**[2] (نا.)[هەو] بڕ: پیاو

**پیابردن** (چا. م)[پیا1 + بردن] شتێک دە نێو شتێک نان، تێنان

**پیاتسان** (چا. ل)[پیا1 + تسان] بڕ: پێدافسین

**پیاتسین** (چا. ل)[پیا1 + تسین] بڕ: پێدافسین

**پیاچزان** (چا. ل)[پیا1 + چزان] چزانی شوێنێک لە لەش و ئەندام بە شتێکی داغ، چزان.

**پیاچزاندن** (چا. م)[پیا1 + چزاندن] چزاندن، داغ کردن.

**پیاچوون** (چا. م)[پیا1 + چوون] چوونی شتێک بۆ نێو شتێکی دیکە، چوونە ناو، تێچوون.

**پیاچوونەوە** (چا. ل)[پیا1 + چوونەوە] بڕ: پێداچوونەوە

**پیاچەقاندن** (چا. م)[پیا1 + چەقاندن] تێچەقاندنی شتێک لە شتێکی دیکە، تێهەڵچەقاندن.

**پیاچەقین** (چا. ل)[پیا1 + چەقین] چەقین، تێهەڵچەقین.

**پیادان** (چا. م)[پیا1 + دان] بڕ: پێدادان

**پیادە** (نا.، ئان.)[هەخ: پەداتەکە ـ پەه: پییاتەک. فار: پیادە ـ بیر: پێیادە. باک: پەیا ـ ناو: پیادە، پیاوە، پیاو ـ هەو: پیادە ـ زا: پەیا، پەیە، پیادە] ١ـ کەسێک کە بە پێی خۆی ڕێگا دەبڕێ. // سوار. ٢ـ (نا.) ناوی شازدە مۆرەی شەترەنج، سەرباز، پەیاک. ٣ـ (نز.) تاقمێک لە لەشکر و قوشەن کە ئەسپیان پێ نیە و بە پێیان دەڕۆن و شەڕ دەکەن. ٤ـ (کنـ.) تێنەگەیشتوو، نەفام، گەوج. ~ **بوون:** ١ـ هاتنە خوار لە بارەبەر یا مەکینەی سوار بوون، دابەزین، پیاوە بوون. ٢ـ (کنـ.) تێنەگەیشتن، نەفام بوون. ~ **چوون:** بە پێیان ڕۆیشتن و ڕێگا برین. ~ **کردن:** دابەزاندن، هێنانە خوار.

**پیادەڕۆ** (نا. ل)[پیادە + ڕۆ4] ڕێگایەک لە دوو لای شەقام کە بۆ پیادە و خەڵک تەرخان کراوە و ماشێن و مەکینەی دیکە حەقی پێدا چوونیان نیە.

**پیــادەیی** (حم.)[پیــادە + ئیی] بە پێیان، سوار نەبوون. // سواریی. ⁂ نە بە پیادەیی دەیگەمێ نە بە سواریی.

**پیارزگ** (نا.)[ئەر] بڕ: پرێسکە

**پیــاز** (گـیـا.)[پەه: پیـیــاز، پەداچ، پەدیاچ. لۆر: پییـاز ـ فـار: پیـاز ـ بیـر: پێـیاز. باک: پیڤـاز ـ ناو: پیـاز، پیـواز ـ هەو: پیــاز ـ زا: پیــاز، پیــانز، پیــۆنز، پیــووز] ١ـ گـیــایەکـە باریک و شـینە، نووکی تیـژ ونێـو بۆشـە، گـوڵی سـپی و چـەتریـیــە، بـە رووتی دەگــەڵ ســەوزی دەیخـۆن، Allium cepa ناوی عـیلمی ئەم گیـایەیە. ٢ـ بنکی ئەو گیایە کە دەگا (سەلکە پیـواز)، هەڵیدەقەنـن و توێکڵێکی قـاوەیی و مـەیلەوە سـووری هـەیە، جـۆری توێکڵ سـپـیـشـی هـەیە، نێـوەکـەی توێ توێیـە، بە رووتی دەگەڵ چێشت دەیخـۆن و لە ناو چێـشـتـیش دەکرێ و سـووریش دەکرێتەوە، هـەندێک جـاریش لە نێو پۆلوو ئـاور دا دەپـیــــشـــــێـنن. ٣ـ بـنـکـی ئـەو گیایانەی کە وەک پیواز دەچن. **~ پاک کـردن:** (کنـ.) بـە درۆ گریان، فـرمـێـسک هەڵوەراندنی بە قــەســتی، پیــواز پاک کردن. ‖ **پیـازی موو:** ریشـە و بنی تووک و موو کە گرمۆڵەیەکی سپی چووکە.

**پیــــازاو** (نا. ل)[پیــــاز/٢ + ئاو1] چێشـتێکی هەژارانەیە وەک شـۆرابا کـە بە ئاوی رووتیی یـا ئاوی گۆشت و پیـواز و رۆن سـاز دەکـردرێ، تێـیـدەکـوشن و دەیخۆن، ئەشکەنە، کاروانـاشـی.

**پیــــازداغ** (نا. ل)[پیــــاز/٢ + داغ] پیـوازی ورد کـراو و سـوور کـراوە کـە بە ســــەر ئاشـی دادەکــــەن یا بـۆ هـەندێک چێشـتی دیکە سـازی دەکـەن، پیـوازداغ، رۆن و پیواز.

**پیــازۆک** (گـیـا.)[پیـاز + ئۆک] بڕ: پیازەخووگانە

**پیـازۆکـە** (گیـا.)[پیـاز + ئۆکـە] بڕ: پیازەخووگانە

**پیازەخووگانە** (گیا.)[پیاز/٣ + ئە + خـووگ + ئانە2] گـیـایەکی خـۆڕسکی سـاقــەت ناسکی گــەڵا پانـە، بنکێکی گـەورەی وەک پیـواز هـەیـە، گـوڵی سـپی دەکـا. لە گـەڵا و بنکەکـەی بـۆ دەرمـان کـەلک وەردەگـرن و گـۆیا بـەراز حـەزی لێـدەکـا. Urginea maritima ناوی لاتینی ئەم گـیـایەیە، پیـوازە خـووگـانە، پیازە مشکانە، پیوازە کێوییلە، پیازۆکە، پیازۆک، هاز. (عەر: بصل الخنزیر ـ فار: پیاز عنصل)

**پیازەمارانە** (گیا.)[پیاز/٣ + ئە + مار1 + ئانە2] گیایەکە لە تیرەی سۆسنەکان، بنەکەی سەلکێکی گەورە و ئەستوورە، گوڵەکانی هێشووی چووک و سپی ئاماڵ شین. لە پیازەکەی بۆ دەرمان کەلک وەردەگرن، Scilla maritima ناوی لاتینی ئەم گیایەیە. (عەر: بصل الحیه ـ فار: اشقیل)

**پیازەمشکانە** (گیا.)[پیاز/٣ + ئە + مشک1 + ئانە2] بڕ: پیازەخووگانە

**پیازیی** (ئان. ل)[پیاز/٢ + ئی] رەنگی قاوەیی وەک توێکڵی پیاز.

**پیاساوین** (چا. ل)[پیا1 + ساوین] ١ـ تێهەڵسوون. ٢ـ سوونەوەی شتێک بە شتێکی دیکە، رێخستن. & پیاسوون

**پیاسوون** (چا. ل)[پیا1 + سوون] بڕ: پیاساوین

**پیاسە** (نا.)[تور: piyasa لە ئیتا: piasa] گەشت، سەیران بە پێیان. **~ کردن:** گەڕان، خولانەوە بە پێیان، قەدەم لێدان.

**پیاکردن** (چا. م)[پیا1 + کردن] ١ـ تێنان. ٢ـ بڕ: پێداکردن

**پیاگ** (نا.)[باش ـ ئەر] بڕ: پیاو

**پیاگەتی** (حم.)[پیاگ + ئەتی] بڕ: پیاوەتی

**پیاگەیشتن** (چا. ل)[پیا1 + گەیشتن] فریا کەوتن، پێڕاگەیشتن.

**پیاڵە** (نا.)[پەهـ: پەیگال لە یون: piale] ١ـ جامی شەراب و مەی تێدا خواردنەوە، پیاڵەی شەڕاب، پیاڵەی مەی. ٢ـ ئەندازەیەک بۆ خواردنەوەی مەی و بادە. ⁘ بە دوو پیاڵە مەست دەبێ. ٣ـ قاپی چووک، دەفری قووڵی چووک بۆ ماست و مرەبا و شتی کەم تێکردن. ٤ـ دەفرێکی چووکی پەل یا قووڵە کە ئیستکان و فینجانی لە سەر دەنێن، ناڵبەکی، ژێرپیاڵە. ٥ـ دەفری چا و قاوە تێدا خواردنەوە، فینجان، پیان. ٦ـ (ئا.) ئەو قوڵکەی چاوی تێدا جێگرە، چاوخانە، پیاڵەی دیدە، پیاڵەی چاو. **~ لە ~ دان:** بە سەلامەتی خواردنەوە و پیاڵە لە پیاڵە دان لە کاتی مەی خواردنەوە. ⁘ لەودەمەی دا پیاڵە دەدرێن لە پیاڵە/ لەودەمەی دا لێوتان بە بادە ئاڵە .. (تاریک و روون ل ٢٠٦). **~ لێدان:** (مجـ.) مەی خواردنەوە. ⁘ دوو پیاڵەی لێداوە و سەرخۆش بوە. || **پیاڵەی چاو:** بڕ: پیاڵە/٦. **پیاڵەی دیدە:** بڕ: پیاڵە/٦. ⁘

پیاڵەی دیدە لەبرێژە دڵا تۆش/ بجۆشە سازی ناڵەی هەم ببێ کۆک (مەحوی ل ١٩٠). **پیاڵەی شەراب:** ئەو پیاڵەیەی کە مەی و شەرابی تێدا دەخۆنەوە، پیاڵەی مەی، جامی مەی. **پیاڵەی مەی:** بڕ: پیاڵەی شەراب. ∷ لە شێخ و واعیز و سۆفی لەمەولا من کەنار ئەگرم/ پیاڵەی مەی بە یادی دیدەیی مەستی نیگار ئەگرم (ئەحمەد موختار ل ٨١).

**پیاڵەفرۆش** (ئان. فا)[پیاڵە/٢ + فرۆش] کەسێک کە لە مەیخانە مەی و بادە بە پیاڵە و پەیک دەفرۆشێ و مشتری هەر لەوێ دەیخواتەوە.

**پیاڵەفرۆشیی** (حم.)[پیاڵەفرۆش + ئیی] ١ـ کار و پیشەی پیاڵەفرۆش، ئارەقفرۆشیی. ٢ـ (نا. ل) دوکان و شوێنی کاری پیاڵەفرۆش.

**پیاڵەگێڕ** (ئان. فا)[پیاڵە/٢ + گێڕ (گێڕان)] کەسێک کە پیاڵە و جامی مەی دەگێڕێ و دەیدا بە مەیخۆرەکان، ساقی، بادەگێڕ. ∷ ئەی پیاڵەگێڕی مەجلیسی تۆ تووسی نەوزەری/ کەیخوسرەوی زەمانی و جەمشیدی کیشوەری (بێخود ل ١٥٣).

**پیاڵەگێڕیی** (حم.)[پیاڵەگێڕ + ئیی] کار و پیشەی پیاڵەگێڕ، بادەگێڕیی، مەیگێڕیی.

**پیان** (نا.)[باک] دەفری ئاو و چا تێدا خواردنەوە، جام، پیاڵە.

**پیانز** (نا.)[زا] بڕ: پیاز

**پیانۆ** (مۆس.)[ئیتا: piano] ئامێرێکی گەورەی مۆسیقایە، ریزێک دوگمەی هەیە و هەر کام بە سیمێکەوە پەیوەندیان هەیە، بە داگرتنی دوگمەکان سیمەکان وە دەنگ دێن و چونکە هاوکات دەکرێ چەند دوگمە داگرن لە ئۆرکێستر دا گرینگایەتی تایبەتی خۆی هەیە. پیانۆ لە ساڵی ١٧٠٩ی زایینی بە دەست کابرایەکی خەڵکی ئیتالیا ساز کراوە.

**پیانۆژەن** (ئان. فا)[پیانۆ + ژەن] کەسێک کە پیانۆ لێدەدا، پیانیست.

**پیانۆژەنیی** (حم.)[پیانۆژەن + ئیی] کاری پیانۆژەن

**پیانۆساز** (ئان. فا)[پیانۆ + ساز] ١ـ کەسێک کە پیانۆ ساز دەکا. ٢ـ کەسێک کە پیانۆ چاک دەکاتەوە.

**پیانۆسازیی** (حم.)[پیانۆساز + ئیی] ١ـ کاری پیانۆساز. ٢ـ (نا. ل) شوێنی پیانۆ ساز کردن یا چاک کردنەوە.

**پیانیست** (نا.)[فەر: pianiste] بڕ: پیانۆژەن

**پیاو**[1] (نا.)[لۆڕ: پیا. باک: پەیا ـ ناو: پیاو، پیاگ ـ باش: پیاگ ـ هەو: پیا] ١ـ نێرینەی مرۆڤ کە تەمەنی لاوەتی تێپەڕاندبێ. ٢ـ مرۆڤ، ئینسان. ∷ پیاو نابێ گوێ بداتە قسەی هەرکەس. پیاو دەبێ هەستان و رۆنیشتن بزانێ. ٣ـ مێرد، شوو. ∷ پوور مەنیج پیاوەکەی چۆتە سەفەر. ٤ـ رند، جوامێر، مەرد.∷ وەک پیاوان بە درۆ مەکە! ٥ـ کەسێکی نێرینە کە لە ژێر دەستی دەستەلاتدارێک دابێ، نۆکەر، کاردار. ٦ـ ئەهل، لاگر، هۆگر.∷ پیاوی راو، پیاوی شەڕێ، پیاوی ژن هێنان نیم. ٧ـ چەکداری سادە. **بوونە ~:** گەیشتن بە تەمەنی پیاوەتی کە پتر بوو هاندانی منداڵ بە کاری دەبەن.∷ کوڕەکەمان ماشەڵڵا بۆتە پیاو ئیدی میز بە خۆی داناکا. **بوونە ~ی کەسێک:** بوون بە خزمەتکار و ژێردەستی کەسێک. **بە ~ دانان:** کەسێک بە جوامێر و مەرد حیساب کردن، بە پیاو زانین. ∷ بە پیاوت دادەنێم بۆیە داوای قەرزت لێدەکەم. **بە ~ زانین:** بڕ: بە پیاو دانان. **~ بوون:** ١ـ مەرد و رند بوون، جوامێر بوو. ٢ـ ئینسان بوون، ئینسانیەت هەبوون. ∷ پیاو نی دەنا تەماحت لە ماڵی سەغیر نەدەکرد. ٣ـ ئەهل بوون، ویستن. ∷ ئەو منداڵانەم هیچیان پیاوی کار کردن نەبوون بۆیە وەبەر خوێندنم نان. **~ لە سەرگرتن:** دەرکەوتن و ئاشکرا بوونی پێوەندی نهێنی ژنێک دەگەڵ پیاوێکی بێگانە، دیتن یا گرتنی پیاوێکی نامەحرەم دەباڵ ژن یا کچێک دا. **~ کوشتن:** قەتڵ کردن، جەنایەت کردن. ∷ لە سەر هیچ پیاو دەکووژێ. **~ ویستن:** توانایی لە رادەبەدەر بۆ ئەنجام دانی کارێک. ∷ پیاوم دەوێ ئەوڕۆکە بتوانێ دە منداڵان بەڕێوە بەرێ! **کردنە ~:** پێگەیاندنی کەسێک لە باری ماددیی و کەسایەتی، یارمەتی دان بە کەسێک کە وەک مرۆڤ بژی. ∷ ئەو کاک کەریمەی کە ئێستا دەیبینی نانی نەبوو بیخوا ئەمن هێنامە لای خۆم و کردمە پیاو. **کردنە ~ی خۆ:** کەسێک کردنە نۆکەر و ژێردەست و بەکرێگیراوی خۆ. **کەس پێ ~ نەبوون:** (کنـ.) کەس بە گرینگ و مرۆڤ دانەنان، بە سووک سەیری خەڵک کردن، کەس بە پیاو دانەنان. **کەس بە ~ دانەنان:** (کنـ.) بڕ: کەس پێ پیاو نەبوون. **مووی ~ان لێنەهاتن:**

(كنـ.) جـوامـێـر نەبوون، پیـاو نـەبوون، پیـــاوەتی نـەبوون. ⁂ هەمـــوو قـســـە و بەڵێنـەكـــانت درۆیـە، تۆ نـە پیـــاوی و نـە مـووی پیـاوانت لێـهاتوە. مـووی پیـاوانم لێنەهـاتبێ ئەگـەر تۆڵەت لێنـەكەمـەوە! ‖ **پیـــاوی پیـــاو:** زۆر پیـــاو، زۆر مـــەرد و جـوامـێر. ⁂ ئەلحـەق پیـاوێكی بە وەجی، شكاندنی پیاوی پیاو هیچی تێدا بەسـتە نیـە (لاس و خـەزاڵ ل ٣١). **پیـاوی خـودا (خــوا):** ١ـ ئەو كـەسـانـەی كـە كــاری ئـایـنـی بـەڕێـوە دەبـەن. ٢ـ كـــــــەسـی دوورەپەرێز و پیـرۆز كە چاوی لە مـاڵی دونیـــا نیـــە، ئـازاری بۆ كـــەس نیـــە و خـەریكی ژیان و نوێژ و تاعـەتی خـۆیەتی، مرۆڤی بێ ئازار و راست و پاك. **پیـاوی حكوومــەتێ (دەوڵەتێ):** كـەسـێك كـە پێـوەندی بە دەوڵەت و حكوومـەتەوە بێ و بۆ وان كـار بكا، پیـاوی دەوڵەتێ. **پیـاوی درۆ:** درۆزن، ئـەهـلــی درۆ. ⁂ مـنـیـش دەڵێم... هیــچـیـــان پیــاوی درۆیە نین (چـەپكێ گـــوڵ ل ٥٦). **پیـــاوی دەرك و دیوانان:** كـەسێك كە هاتوچۆ و پێوەندی دەگـەڵ دەسـتـەڵاتداران و حكوومـەت و ئیـدارەكانی دەوڵەتی هـەبێ. **پیـاوی نێـو پیـاوان:** لە پیـاوەتـی دا سـەرتـر و پیـاوتر بوون، پیـاوتر لە پیـاوان، جـوامـێـرتر و مەردتر لە پیاوەكانی دی.

**پیـــاو**$^2$ (نا.، ئان.) برِ: پیـــادە. **~ بوون:** پیادە بوون، دابەزین. ⁂ مەنگوڕی دە مێوەجـاغێ/ پیاو بوون لە سـابڵاغێ/ تەدارەك بۆ مەراغێ (مان ل ٢٨٤).

**پیـــاوانە** (ئان. ل)[پیـــاو + ئانـە] ١ـ كەرەسە و شوێن و هـەرچێكی كە تایبەتی بە پیاو بێ. ⁂ كەوشی پیـاونە، كـراسی پیـاوانە، حـەمـامی پیـاوانە. ٢ـ (ئاك. ل) ئاكار و كرداری وەك پیـاو، جوامـێرانە، رندانە. ⁂ پیاوانە لە بەرابەری راوەسـتـا و حەقەكەی خۆی لێوەرگرت.

**پیـاوچاك** (ئان. ل)[پیاو1/٢+ چاك] مــرۆڤی راست و پاك و دروست، مــرۆی ئیماندار، پیاوخاس. // پیاو خراپ

**پیـاوخـاس** (ئان. ل)[پیاو1 + خـاس] برِ: پیاوچاك

**پیـــاوخـــراپ** (ئان. ل)[پیـــاو1/٢ + خراپ] مرۆڤی ناپاك و ناراست، پیاوی بێ ئیمان، پیاو خراو. // پیاو چاك. **بە ~ دەرچوون:** برِ: پیـــاوخـــراپ بـوون. **~ بوون:** كـــارێكی باش لـە حـــەقی كەسێك دا كـردن بـەڵام بە پێچـەوانە بە خراپ و ناڕاست دەرچوون، بە پیاوخراپ دەرچوون. **~ كردن:** بە خـراپ چاكەی

کەسێک وڵام دانەوە و باس کردن. **خۆ ~ کردن:** بەدناو کردنی خۆ لەبەر ئەنجام دانی کار و مەسەلەیەک بۆ کەسێک.

**پیاوخراپیی** (حم.)[پیاوخراپ + ئیی] کردەوە و ئیشی پیاوخراپ.

**پیاوخراو** (ئان. ل)[پیاو1 + خراو] [ئەر] بڕ: پیاوخراپ

**پیاوخۆر** (نا. فا)[پیاو1/٢ + خۆر] ١ـ کەسێک یا دڕندەیەک کە گۆشتی مرۆ بخوا. ٢ـ (کنـ.) کەسی بە سام کە خەڵک لێی بترسن.

**پیاوفرۆش** (نا. فا)[پیاو1/٢ + فرۆش] کەسێک کە مرۆڤ یا دۆستی خۆی بە پارە بفرۆشی و راپۆرتی لێ بدا، شۆفار، جاش.

**پیاوفرۆشیی** (حم.)[پیاوفرۆش + ئیی] کار و ئیشی کەسی پیاوفرۆش، شۆفاریی، جاشێتی.

**پیاوکوژ** (نا. فا)[لە: پیاو کوشتن] کەسێک کە مرۆڤ دەکووژێ، قاتڵ، ئینسانکووژ، جەنایەتکار.

**پیاوکوژیی** (حم.)[پیاوکوژ + ئیی] کار و پیشەی کەسی پیاوکوژ، پیاو کوشتن، ئینسانکوژیی، قاتڵ بوون.

**پیاوماقووڵ** (ئان. ل)[پیاو1 + ماقووڵ] پیاوێک کە قسە و ئاکاری ئاقڵانە و رێز و حورمەتی لە لای خەڵک هەیە، پیاوی تێگەیشتووی بەرێز.

**پیاوە** (ئان.) بڕ: پیادە. **~ بوون:** بڕ: پیادە بوون. ⁖ کاکە مەم دەڵێ: جووتیار ئەمە لە کوێ ببین پیاوە؟ (مان ل ٥٠). میوانی وەکوو تۆ لە دەرکی کەس نەبوە پیاوە (لاس و خەزاڵ ل ٢٣).

**پیاوەتی** (حم.)[پیاو + ئەتی] ١ـ ئەو کارەی کە لە پیاو دەوەشێتەوە، جوامێریی. ⁖ ئەوە پیاوەتی نیە تۆ دەگەڵ ئێمە دەیکەی. ٢ـ غیرەت، ئازایەتی. ٣ـ توانایی جنسی پیاو. & پیاگەتی. **~ بە ئاوی (لە سەر ئاوی) حەمام کردن:** (کنـ.) پیاوەتی بە ماڵی خۆ نەکردن و شتی خەڵک یا شتی خۆڕایی بەخشین، ماڵی خۆ نەبەخشین. **~ پێکران:** توانای پیاوەتی و جوامێریی هەبوون. ⁖ کابرای دەستبەتاڵ کوا پیاوەتی پێدەکرێ! **~ دە (لە) گەڵ کەسێک کردن:** چاکە کردن دە گەڵ کەسێک کردن، پیاوانە دەگەڵ کەسێک جووڵانەوە. **~ کردن:** کاری پیاوانە

کردن، جوامێریی و مەردایەتی کردن. :: پیاوەتی بکە و ئەو کتێبەم پێ بفرۆشە! ~ **لێوەشانەوە:** کاری پیاوانە کردن، جوامێریی و مەردایەتیی کردن. :: پیاوەتی لە ناپیاو ناوەشێتەوە. **لە ~ بە دوور بوون:** کار و ئەمرێک کە ئەنجام دانی جوامێرانە و شیاوی مرۆڤ نیە. :: دەستی لێقەماو نەگرتن لە پیاوەتی بە دوورە. **لە ~ خستن:** ١ـ دەستەڵات و جوامێری لە پیاوێک وەرگرتن. ٢ـ توانایی جنسی بە پیاوێکەوە نەهێشتن. **لە ~ خۆ کارێک کردن (ئەنجام دان):** کار و ئەمرێک بەڕێوە بردن لەبەر جوامێریی و دڵاوایی کە پێویست بە ئەنجام دانی لە بەر هەر هۆیەک نەبێ. :: لە پیاوەتی خۆتە ئەو بارەت بۆ هەڵگرت من بام بۆم هەڵنەدەگرت. **لە ~ کەوتن:** ١ـ توانایی و دەستەڵاتی پیاوەتی کردن و جوامێری نەمان. ٢ـ توانایی جنسی نەمان، گان پێنەکران.

**پیاوەکە** (شر.)[پیاو + ئەکە] وشەی بانگ کردنی مێرد و شوو لە لایەن ژنەکەیەوە. // ئافرەت، ژنەکێ. :: پیاوەکە لە بیرت نەچێ سبەی ئارد بنێریەوە!

**پیاویژگە** (شر.)[پیاو + ئیژگە] ١ـ وشەی بانگ کردنی خۆشەویستانەی مێرد لە لایەن خێزانەوە. ٢ـ پیاوی چکۆڵانە.

**پیاهاتن** (چا. ل)[پیا1 + هاتن] بڕ: پێداهاتن

**پیاهاتنەوە** (چا. ل)[پیا1 + هاتنەوە] بڕ: پێداچوونەوە

**پیاهەڵپەساردن** (چا. ل)[پیا1 + هەڵپەساردن] بڕ: پێهەڵپەساردن

**پیاهەڵچوون** (چا. ل)[پیا1 + هەڵچوون] بڕ: پێهەڵچوون

**پیاهەڵگەڕان** (چا. ل)[پیا1 + هەڵگەڕان] بڕ: پێهەڵگەڕان

**پیاهەڵمیزان** (چا. ل)[پیا1 + هەڵمیزان] بڕ: پێهەڵمیزتن

**پیاهەڵمیزتن** (چا. ل)[پیا1 + هەڵمیزتن] بڕ: پێهەڵمیزتن

**پیاهەڵمیزین** (چا. ل)[پیا1 + هەڵمیزتن] بڕ: پێهەڵمیزتن

**پیاهەڵواسین** (چا. ل)[پیا1 + هەڵواسین] بڕ: پێهەڵواسین

**پیبک** (نا.)[باک] بڕ: بیبیلە

**پیپ**[1] (نا.)[فەر: pipe] ئامرازێکی

تەماكوو كێشانە، وەك سەبیلە دەچێ بەڵام دەسكی زۆر كورتترە، تووتنی دە نێو سەرەكەی دەكەن و دایدەگیرسێنن.

**پیپ**2 (نا.)[ئین: ؟] دەفرێكی خڕی چێویی گەورە، بۆشكەی چێویی.

**پیپك** (ئا.)[باك] بڕ: بیبیلە

**پیپنۆك** (گیا.)[باك] بڕ: خاشخاشك

**پیت**1 (نا.)[ئەو: پیتو ـ پەه: پیت. ناو: پیت، فیت] بەرەكەت، بەروبوو، قازانج، داهات. **بە ~ بوون:** بە بەرەكەت بوون، خێر و قازانج هەبوون. **~ دانەوە:** قازانج هەبوون و خێر دانەوە.

**تێبینی:** پیت لە بنەڕەت دا بە مانای خۆراك و خۆریشت بوە و هەردووك وشەی ئەوێستایی و پەهلەویی بەم مانایەن. هەروەها لە رووسی دا پیت بە مانای خواردنەوە و لە سویدی دا fet (فێت) بە مانای چەوریی هاتوە.

**پیت**2 (نا.)[؟] هەر كام لە تاكەكانی ئەلفوبێ كە وشە لەوان پێكهاتوە، تیپ.

**پیت**3 (ئا.)[؟] قامكی چووكەی دەست، پەنجەتووتە، تووتە

**پیت**4 (نا.)[؟] تەنەكەی نەفت و رۆن و شتی لەم بابەتە، چەلەنگ.

**پیتاڤ** (نا. ل)[پی (پێ1) + تاڤ2] [باك] بڕ: پێڵاو

**پیتاك** (نا.)[هس: پیت1] ١ـ باج و خەراجی دەوڵەت و دەستەڵاتدار. ⁂ ئەوساڵ حەوت ساڵە یاغییە/ خەرج و پیتاك بۆ من نییە (مان ل ٢٢٥). ٢ـ یارمەتی ماڵیی خەڵك، دەستەوایی، باربوو، باروبوو. ٣ـ [ئەر] كەرەسەی نێو ماڵ.

**پیتچن** (نا. ل ـ ئان. ل)[پیت2 + چن (چنین)] كرێكارێك كە لە چاپخانە ئیش دەكا و كاری ریز كردن و چنینی پیتەكانی كتێب یا رۆژنامەی بە دەستەوەیە.

**پیتزا** (نا.)[ئیتا: pizza] خواردنێكی فەرەنگییە و بە پێی ئەو شتانەی كە بە سەری دادەكەن جۆری زۆرە.

ئەنگوتكی هەویر پان دەكەنەوە و ئاوی خەستی تەماتە، قیمە، كارگ و شتی لەم بابەتەی لە سەر دادەنێن، پەنیری رەندەكراوی تایبەتی پێدادەكەن و لە فێڕی دەنێن هەتا دەگا.

**پیتە** (نا.)[هس: پیك] پووش و كای هەرزن و چەڵتووك، بەڵم.

**پیتەبڕە** (گیانـ.)[پیتـە + بڕ (بڕین) + ئە] کـرمـێکە کـە لە دەغڵ دەدا و لاسکی شـینی دەغـەڵ دەخـوا و ویشکی دەکـا، پیکەبڕە.

**پیچ** (ئان.)[بڕ: بیـژ] ١ـ [باک] بیژوو، بیـژی، حـەرامـزادە. ٢ـ [ئەر] ناڕاست، زۆڵ

**پیچک** (گیا.)[؟] گیایەکی یەک لقی سێ کـووزی یەک ریشـەیە ئەکـرێ بە کـەلانە (خـاڵ ب ١ ل ٢٦٤). گـیـایەکی کـوێستـانییـە وەکـوو پیـاز ئەکـرێت بە کەلانە زۆر خـۆشـە (کشت و کاڵ ب ١ ل ٧٤).

**پیـــــداڕوو** (نا. ل)[پی1 + داڕوو] تێکەڵاوێک لە پیـو و قـسڵ و لۆکـە و سـپـێنەی هێلکە، کـە بۆ گـرتنی درز و قـەڵش و پینەی گـونجی شکاوی ئاو کەلکی لێوەردەگرن، پیوداڕوو، پنچ، پنچ، پەنچ.

**تێـبـینی:** لە هـەنبـانـەبۆرینـە دا ئەم وشـەیە بە هەڵە پێـداڕو نووسـراوە (هەنبانە بۆرینە ب ١ ل ١٣٠).

**پیر** [1] (ئان.، نا.)[ئەو: پەرۆ ـ پەهـ: پیر. باک: پیر ـ ناو: پیر ـ هەو: پیر ـ زا: پیر] ١ـ ژن یا پیـاوێک کـە تەمـەنی زۆر چۆتە سـەر، تەمـەنی دوای گـەڕاوەیی، بەسـاڵاچوو. ٢ـ گیـانداری بە تەمـەن. ٣ـ دار و درەخـتی بە تـەمـەن. :: داری پیرەدار بە دار نابـێ/ یاری دوورەشار بە یار نابێ (پەند). ٤ـ گژ و گیای ناشلک و چیڕ. ٥ـ بێگیانی کۆنینە و تەمەندار. :: پیرەکوێستان، پیرەشەماڵ، پیرەپاییز. ٦ـ شـێخ و پیـاوچاک. ٧ـ مـەرقـەدی پیاوچاکان. ٨ـ مامۆستا، ڕێپێشاندەر، سـەرۆک، ڕێبـەر. :: دەروێشـیـەکـەمـان کیسـەیەکی بێ بن بوو/ مـەیگێڕی جوان ڕێبـەر و پیـری من بوو (خـەیام ل ٣٤). **~ بوون:** ١ـ چوونە سەری تەمەن و گـەیشـتنە سـەردەمی پیـریی. ٢ـ گیاندارێک کە تەمەنی چووبێتە سەر. ٣ـ گـژ و گـیـاییـەک کـە لـە شلک و ناسک نەمابێ.. :: ئێستا ئیدی پنگ پیر بوون و بۆ خـواردن نـابن. ٤ـ تەمـەندار بوون، کـۆنینە بـوونی هـەر شـتێک. **~ کردن:** (کنـ.) کـەسێک لە بەر خـەم و خـەفـەت و ناڕەحـەتی زووتر لە کاتی خۆی گەیاندنە تەمـەنی پیـریی. :: من پیـر نیم خـەم و خەفەت پیریان کردم. ‖ **بە پیر:** (سوێند) سوێند خواردن بە پیر و پیاوچاکان. :: بە پیر بە پێغـەمبـەر ئەو کارە کاری من نیە و بوختانم پێدەکەن! **پیری ئاخرشەڕ:**

کەسێک کە کۆتایی ژیانی بە خێر و خۆشی تەواو نابێ و لە پیریی دا ئەرکەکانی دینی بە جێ ناهێنێ و دەست دەکا بە خراپە. ⁂ ئەو قورمساغە دەڵێن پیری موغانە، پێی بڵێن/ پیری ئاخرشەڕ دەری مەیخانە تاکەی دادەخەی (مەحوی ل ٣٥٨). **پیری تەریقەت:** مورشد، شێخ. ⁂ بە پێچی خواروخێچ ئیما دەکا پیری تەریقەت: بێ/ حەقیقەت پیرە زاهید پیرە، گومکردوو تەریق ئەمما (مەحوی ل ٣١). **پیری خانەقا:** شێخ، شێخی خانەقا. **پیری خەرابات:** ١ـ پیرێک کە لە مەیخانە مەی دەفرۆشێ. ٢ـ (سۆف) پیر و ڕێبەرێک کە مورید بۆ تەرکی داب و نەریت هان دەدا و بەرەو هەژاریی و سۆفیگەریی هانیان دەدا. ⁂ من ڕەند و قەلەندەرسیفەت و مەست و خەرابم/ تۆ پیری خەراباتی ئەگەر مەزهەبی وات بێ (وەفایی ل ١٧٧). **پیری دڵ:** سەرۆک و ڕێپێشاندەری هەست، دڵ. ⁂ بنووسە، پیری دڵم ئەمری کرد، ئیتاعەم کرد/ لە ئیبتداوە کە بەیتێ موناسبی دیوان (مەحوی ل ٣٤٨) چییە پیری دڵ ئیمشەو وەک عەرەقخۆر/ لە کونجی تەکیە بۆ مەیخانە ئەگری (بێخود ل ١٠٩). **پیری فەرتووت:** زۆر پیر. **پیری سەدساڵە:** کەسێک کە زۆر پیر بێ، پیری فەرتووت، پیری هەزارساڵە. **پیری عەقڵ:** ١ـ ئەقڵ، ئەقڵی گشتی. ٢ـ پیاوی زانا و فرەزان. ⁂ کە ساڵی ڕیحلەتی ئەم مورشیدەم پرسی لە پیری عەقڵ/ بە حەرفی جەوهەری ئەم ئایەتەی کردم ئیشارانی (بێخود ل ١٠٧). **پیری کەنعان:** (کنـ.)١ـ حەزرەتی یاقووب، پیری کەنعانی. ٢ـ کەسی گەلێک چاوەڕوانی دیتنی خۆشەویستێکی دوورکەوتوو. ⁂ دەمێ بوو چاوەڕێی مژدەی قودوومی ئێوە بوو بێخود/ خودا کردی نەسیمی پیرهەن بۆ پیری کەنعان هات (بێخود ل ١٥). **پیری کەنعانی:** بڕ: پیری کەنعان. ⁂ لە سیرڕی نووری چاوانی عەجەب بێ نوور و حیکمەت بوو/ بڵێ بۆچ پیری کەنعانی دەگریا، نووری عەیناکەم (وەفایی ل ٧٨). **پیری کەنفتار:** پیری فێڵەزان و دڕ و هار، پیری ئیفتار. ⁂ ڕاوستاوەتەوە پیرێکی کەنفتارە/ ئەوە پیر هەرای لێدەکردەوە هەی عەرەب و عەرەبەسوارە (سەعید و میرسێوەدین ـ سروە ٧٣ ل ٢٠). **پیری موغان:** ١ـ سەرۆک و گەورەی دینی زەردەشتی. ٢ـ پێشەوا و راهبی دەیر. ٣ـ پیر و ردێن سپی

مەیخانە، مەیفرۆش. ∷ قەسەمی گوێمی بە چاوی بەچە دا پیـری مـوغـان/ کـە لەمـەولا نەبیـێ وەعـز و قسـەی مـەولانا (مـەحـوی ل ٣٤) زەدەی رووتم، بە چاوی تۆ شیفام بێ لێوەکەت نابێ/ بە حەققی ئابرووی پیری موغان ساقی مەیی نابێ (وەفـایی ل ١٧٢). **پیـری مـەیخـانە:** ١ـ پیـری مـەیفـرۆش. ٢ـ پیـری تەریقـەت، شـێخ. & پیـری مـەیکەدە ∷ بە بۆنەی پیـری مـەیخـانە منیش پیـر بووم و لێکەوتم/ کـەچی هـەر جـوانەمـەرگـیم پێـدەمـێنێ وەک دڵی لاوم (ئاوات ل ٨٩) ئەلا ئەی سـاقـیی مـەسـتـان بە حـەقـقی پیـری مـەیخـانە/ بە گـەردش بێنە جامیمەی بە یادی چاوی جانانە (وەفایی ل ١٤١). **پیـری مـەیکەدە:** بڕ: پیـری مـەیخـانە. ∷ سـۆفی گـۆشـەی خـانەقـا بووم، ئێستـە پیـری مەیکەدەم/ زاهیدی خـەڵوەنشین بـووم، ئێـسـتـە مـەست و مـەیزەدەم (ناڵەی جودایی ل ٣٧). **پیری هەزارسـاڵە:** زۆر پیـر، پیـری فـەرتووت، پیری سەدساڵە. ∷ چاوڕەشێکم دی لەو ماڵە/ دەکووژێ پیری هەزارساڵە (کانی مرادان ل ١٥٥). **پیری ئیفتار:** بڕ: پیری کەنفتار. ∷ ئەی پیری ئیفتار، ئەتۆ چ عەکسێکت پێشانی ئەو پادشایەی ئێمە دا کە وا دڵی مەحزوون بوو (سەعید و میرسێوەدین ـ سروە ٧٣ ل ٢٠)

**پیر** [2] (نا.)[پەهـ: پەتییرەک] پێشواز، پێرگین، بۆلا. ئەم وشـە بە تـەنیـا دەکـار ناکـرێ و دەگـەڵ ئەم چاوگـانە دێ. **بە ~ەوە چوون:** ١ـ بۆ لای کەسێک چوون بۆ بە خێر هاتن کردن، پێشوازیی کردن، بەرەو پیـر چوون، بـە پیـرەوە رۆیـین، بە پیـرەوە رۆیشتن، بەرەو پیـر رۆیشتن، بەرەو پیر رۆیین. ∷ بە پیر ئەو مـاهەوە چووم و بـە سـەر چووم/ پەری بوو، ئەو نەبوو، شـەو بوو، بە سـەر چووم (مەحوی ل ٢٢٤). ٢ـ پێشوازیی کردن لە هەر کار و مـەسـەلەیەک. ∷ خـەڵکێکی زۆر بە پیر پێشـانگای نەقـاشی لاوەکـانی شـارەوە چوون. **بە ~ەوە رۆیشتن:** بڕ: بە پیرەوە چوون. **بە ~ەوە رۆیین:** بڕ: بە پیـرەوە چوون. ∷ بە پیری مەرگەوە فەرسـەخ بە فەرسـەخ رۆیون مـەردان/ ئەوی باکی لە مردن بێ دیارە بڵح و نامەردە (مەحوی ل ٢٧٠). **بە ~ەوە هاتن:** پێـشـوازیی لێکرانی کـەسێک لە لایەن کـەسـانێکی دیکەوە، بەرەو پیـر هـاتن. **بەرەو ~ چوون:** بڕ: بە پیـرەوە چوون. **بەرەو ~ رۆیشتن:** بڕ: بە پیرەوە چوون. **بەرەو ~ رۆیین:** بڕ: بە پیـرەوە چوون. **بەرەو ~**

**فڕین:** بە هەڵەدا و بە ڕاکردن بەرەو پیری کەسێک چوون لە خۆشیان و لە خۆشەویستییان. ‫:‬: هەر لە دوورەوە کە چاوی بە براکەی کەوت لە خۆشیان بەرەو پیری فڕی و خۆی پێدادا.

**بەرەو ~ هاتن:** بڕ: بە پیرەوە هاتن.

**تێبینی:** پیر لە patīrak پەتییرەک ـ ی پەهلەویی هەر بە هەمان مانا کەوتوە. پەتییرەک لە چاوگی پەتییرەفتەن -pat īraftan بە مانای بەرەوپیر ڕۆیشتن و قەبووڵ کردن و وەرگرتن کەوتوە.

**پیرار** (ئاک.)[زا] بڕ: پێرار

**پیران** (ئان.)[؟] بێ دەنگ، تاساو.

**~ بردنەوە:** ١ـ دەنگ دەر نەهاتنی منداڵ دوای گریانی زۆر، دە تاسەوە چوون. ٢ـ دڵ بوورانەوە، لە هۆش چوون.

**~ کردن:** دە تاسەوە چوون، دەنگ دەر نەهاتن، پیران بردنەوە

**پیرانە** (نا. ل)[پیر1 + ئانە2] ١ـ تەمەنی پیریی، پیریی. ٢ـ (ئاک. ل) چەشن و شێوەی پیر. ٣ـ (ئان. ل) هەرچی کە تایبەتی پیران بێ.

**پیرایشۆکە** (گیانـ.)[پیر1 + ئایشێ (ناوی ژن) + ئۆک + ئە] گیاندارێکی چووکی بۆرە، پێی وردە و سەر زاری دوو چنگاڵی هەیە، لە بن خاکی نەرم، لە سەر ڕێی جڕ و جانەوەریی ورد، لانەیەکی وەک ڕاحەتی ساز دەکا و خۆی لە بنەوە دەشارێتەوە. کاتێک مێروو یا گیانداری دیکەی تێکەوێ هاتنە دەری زەحمەتە و ئەویش گورج خۆی پێدادەدا و دەیباتە بن خاک و دەیخوا، پوورایشۆکە، داپیرۆکە، پیرێژنۆکە، پیرۆشک، داپیرۆشک.

**پیرباب** (نا. ل)[پیر1 + باب1][زا] بڕ: باپیر

**پیرباڤ** (نا. ل)[پیر1 + باڤ][زا] بڕ: باپیر

**پیرپنتک** (ئان. ل)[پیر1 + پنت (پەند) + ک] منداڵێک کە کردار و شێوەی قسە کردنی وەک گەورە بچێ، پیرپەنک، پیرەباب.

**پیرپەڕۆ** (ئان. ل)[پیر1 + پەڕۆ] چاک و گۆڕی بێ کەلک کە هیچ نیازێک پێک نەهێنێ.

**پیرپەنک** (ئان. ل)[پیر1 + پەن (پەند) + ک] بڕ: پیرپنتک

**پیرچەمەک** (گیانـ.)[پیر1 + چەم (چەرم) + ئەک][باک] بڕ: چەکچەکی

**پیرخەنی** (نا. ل)[پیر1 + خەنی] بڕ: پیرخەنیلە

**پیرخەنیلە** (نا. ل)[پیر1 + خەنی + ئیلە] چێشتێکی شلە کە لە ساوار سازی دەکەن، پەتلە، پیرخەنی، سندک.

**پیرسۆز** (نا. ل)[پی1 + ر + سۆز] بڕ: پیسۆز

**پیرک**1 (نا. ل)[پیر1 + ک] ١ـ (گیانـ.)[باک: پیرک ـ زا: پیرکە] بڕ: جاڵجاڵۆکە. ٢ـ [زا] باپیر، بابەگەورە. ٣ـ [باک] دایەگەورە، داپیر، نەنک. ٤ـ [باک] ژنێک کە یاردیدەی دایک دەدا بۆ زان، مامان.

**پیرک**2 (گیانـ.)[باک] بڕ: پەپوولە

**پیرک**3 (گیا.)[بڕ: پرگ][باک] برش، کەڕوو.

**پیرک**4 (نا.)[؟][باک] شە، شانەی جۆلایی.

**پیرکوونی** (ئان. ل)[پیر1 + کوونی] پیاوی پیری جلف و هەرزەکار.

**پیرکە** (نا. ل)[پیرک1 + ئە][زا] ١ـ (گیانـ.) بڕ: جاڵجاڵۆکە. ٢ـ تەونۆکەی جاڵجاڵۆکە. ٣ـ ژنی پیر، پیرێژن.

**پیرکەچەل** (نا. ل)[پیر1 + کەچەل] [زا] قەرەقەرێن، خۆشارۆکە.

**پیر و پاتاڵ** (نا. ل)[پیر1 + و + پاتاڵ] ١ـ زۆر پیر، پیر. ٢ـ پیری خەرفاو و کەللە ویشک.

**پیرۆپند** (گیانـ.)[باک][پیر1 + ئۆپند؟] بڕ: جاڵجاڵۆکە

**پیرۆت** (نا.)[؟][باک] کەسێک کە گۆزە و شتی گڵین ساز دەکا و دەیفرۆشێ، گۆزەکەر، گۆزەفرۆش.

**پیرۆز** (ئان.)[ئەو: پەئیتی رەئۆچەه ـ پاز: پێرۆژ ـ پەه: پێرۆچ، پێرۆژ. باک: پیرۆز، پێرووز ـ ناو: پیرۆز ـ هەو: پیرۆز] ١ـ مبارەک ٢ـ موقەدەس. ٣ـ سەرکەوتوو. **~ بوون:** ١ـ مبارەک بوون. ٢ـ موقەدەس بوون.

**پیرۆزانە** (نا. ل)[پیرۆز + ئانە] دیارییەک کە بۆ پیرۆزبایی لە کردەوە و سەرکەوتن و مەبەستێک دەدرێ بە کەسێک.

**پیرۆزبایی** (نا. چا)[پیرۆز + با + ئی] مبارەکیی. **~ لێکردن:** دەربڕینی شادی و خۆشی و مبارەک بوون لێکردن بە بۆنەی سەرکەوتن، جەژن و شتێکی لەم بابەتە.

**پیــرۆزە** (نا. ل)[پیــرۆز + ئە][پەھ: پیرۆزەک، پیرۆچەک. باک: پیرۆزە ـ ناو: پیـــرۆزە] ١ـ بەردێکی بە بایخی رەنگ ئاسمانیە کە لە کانی دەردەهێندرێ و پتر بۆ نەقیمەی ئەنگوستیلە کەلکی لێوەردەگرن. ٢ـ (گیانـ.) مەلێکی راوکەرەی زلە، پەڕەکانی پشتی بۆری مەیلەو سپین و پەڕەکانی سەر سینگی زەردی خەنەیین. هەندێک لە پەڕەکانی سەر سەری درێژترن و لە ژێر دندووکیشی پەڕی درێژی هەیە کە نموودێکی تایبەتی دەداتێ. خواردنی هوما تەنیا ئێسکە و ئێسکی گیانداران هەڵدەگرێ و لە بەرزاییەوە دەیخاتە سەر رەوەزەبەردان و دەیانشکێنێ و نێوەکەیان دەخوا، هەڵۆی ئێسک خۆر، پێشەخۆرە، هوما، داڵەسوورە، سوورەداڵ، سوورەواڵە. ٣ـ مەلێکی ئەفسانەیی پیرۆزە کە سێبەری بکەوێتە سەر هەر کەس بەختەوەر دەبێ، هوما. || **پیــرۆزەی رەگــدار:** جۆرێک پیرۆزەی بایخدار کە ساف نیە و رەگی تێدایە.

**پیرۆزەیی** (ئان. ل)[پیرۆزە/١ + ئیی] جۆرێک رەنگی شین و ئاسمانیی، لە رەنگی پیرۆزە

**پیرۆزیی** (حم.)[پیرۆز + ئی] مبارەکی

**پیــرۆشک** (گیانـ.)[پیــر1 + ئۆشک] بڕ: پیرایشۆکە

**پیرۆک** (نا. ل)[پیر1 + ئۆک] ١ـ چرچ و لۆچی دەست و پێست بە ئاو، پیـــرەڵۆک. ٢ـ (گیانـ.)[باک] بڕ: جاڵجاڵۆکە

**پیرهەڤۆک** (نا. ل)[پیر1 + هەڤۆک؟] [باک] ١ـ گیانلەبەرێکی خەیاڵی کە منداڵانی پێدەترسێنن، دێوەزمە. ٢ـ (گیانـ.) جاڵجاڵۆکە

**پیــرە** (ئان. ل)[پیــر1 + ئە][زا] ١ـ پیرێژن. ٢ـ (گیانـ.) جاڵجاڵۆکە. ٣ـ تەونۆکەی جاڵجاڵۆکە. ٣ـ وەک ئامرازی بانگ کردن و وریا کردنەوە و یان وتەیەکی دۆستانە و هەندێک مەبەستی دیکە بە کار دێ. :: پیرە دا وەرە ئێرە! پیرە نەکەی ئەم کارە بکەی!

**پیـــرەباب** (ئان. ل)[پیــر1 + ئە + باب1] ١ـ منداڵی قسەزل و ئاکار گەورە، پیرپنتک. ٢ـ کەیخودا و زانای کۆمەڵ، دەمڕاست.

**پیـرەپیـا** (ئان. ل)[پیـر1 + ئە + پیـا] [هەو] بڕ: پیرەپیاو

**پیرەپیاو** (ئان. ل)[پیر1 + ئە + پیاو] پیاوی پیر و بە ساڵاچوو، پیرەمێرد،

پیرەپیا.

**پیرەزا** (ئان. مف.)[پیر1 + ئە + زا] ١ـ منداڵێک کە لە دایک یان بابێکی پیر بووبێ. ٢ـ منداڵێک کە لە کاتی بوونی شوباری پیران بدا، منداڵی سەرسپی و پێست چرووک و ناحەز.

**پیرەزاڵ** (نا. ل)[پیر1 + ئە + زاڵ] شۆرباى پەنیر، پەنیراو.

**پیرەژن** (ئان. ل)[پیر1 + ئە + ژن] بڕ: پیرێژن

**پیرەژەنی** (ئان. ل)[پیر1 + ئە + ژەنی][هەو] بڕ: پیرێژن

**پیرەسەگ** (ئان. ل)[پیر1 + ئە + سەگ] ١ـ سەگی پیر. ٢ـ (کنـ.) پیری خراپ و ناخۆشەویست.

**پیرەک** (نا. ل)[پیر + ئەک][باک] ژن، خێزان، ئافرەت.

**پیرەکەر** (ئان. ل)[پیر1 + ئە + کەر] ١ـ کەری پیر. ٢ـ (کنـ.) پیری خەرفاو و نەزان.

**پیرەگورگ** (ئان. ل)[پیر1 + ئە + گورگ] ١ـ گورگی پیر. ٢ـ (کنـ.) پیاوی بە ئەزموون و تێگەیشتوو و زیرەک. ٣ـ (کنـ.) پیرەمێردی زیرەک و بەفڕ و فێڵ و فێڵەزان.

**پیرەڵۆک** (ئان. ل)[پیر1 + ئە + ڵۆک] ١ـ چرچ و لۆچی دەست لە بەر کار کردنی زۆر بە ئاوی سارد و گەرم. ٢ـ داری پیری گەندەڵ و رزیو. **~ بوون:** ١ـ چرچ بوونی دەست بە ئاوی سارد و گەرم وەها کە دەست شێوەی دەستی پیران دەدا. ٢ـ رزانی دار و دەرخت.

**پیرەمێر** (ئان. ل)[پیر1 + ئە + مێر] بڕ: پیرەمێرد

**پیرەمێرد** (ئان. ل)[پیر1 + ئە + مێرد] پیاوی پیر، پیرەپیاو، پیرەمێر.

**پیریی** (حم.)[پیر1 + ئیی] ئاکامی تەمەنی زۆر، پیر بوون، ئیختیاریی، پیرێتی. ⁘ پیریی و هەزار عەیب.

**پیرێتی** (حم.)[پیر1 + ئێتی] بڕ: پیری

**پیرێژن** (ئان. ل)[پیر1 + ئێ + ژن] ژنی بە تەمەن و بە ساڵا چوو، پیرەژن، پیرەژەنی، پیرە. **~ لە کیری کەر ترساندن:** (کنـ.) ترساندنێکی بێخود و بێکەلکی کەسێک، مراوی لە ئاو ترساندن. || **پیرێژنی دۆ لێڕژاو:** (کنـ.) کەسی زۆر بە پرتە و بۆڵە. ⁘ پیرێژنێکی نۆ جار سی ساڵ زاوی دۆ لێڕژاو با هەر

قـــســـە پـكا و بوەڕێ (لاس و خـــەزاڵ ل ١٦٢). ئەرێ ئەوە ئەو بۆڵەبۆڵەت لە چيـە دەڵێـی پيـــرێژنـی دۆ لێـــڕژاوی! **پيـــرێژنی فەرهادكوژ:** (كنـ.) پيرێژنی بە فرِ و فێڵ، پيرێژنی بە دهۆ.

**پيرێژنۆكە** (گيانـ.)[پيـرێژن + ئۆكە] برِ: پيرايشۆكە

**پيـــراندن** (چا. م)[لە: پيـرە] ١ـ پرمــە كـــردنـی ئـەسپ، دەنـگ لـە لووت هـێنانـە دەری يەكسم، پرماندن، پيرانن. ٢ـ دەنگ لە لووت دەرهێنانی حەيوانی گەورە

**پيرانن** (چا. م)[ئەر] برِ: پيراندن

**پيــــــرك** (نا.)[؟] شــــتــــێكە وەك ســـەكـــۆيەكی باريك لە ســـەرووی ژوور دروســــتـی دەكـــەن، ژێرەكـــەی بۆش و خانخانە بۆ شت تێنان و لە سـەرەكەشـی كەلوپەل و شـمەكی دادەنێن، ئەستێرك، شوقەللەت.

**پيرە** (وشـد.) ١ـ دەنگی لووتی يەكسم پرمـە. ٢ـ دەنگی لوتی نێرييە كـێـويی و حەيوانی گەورەی ديكە.

**پيـــرەپيـــر** (وشـــد.)[پيـــرە + پيـــر] ١ـ پرمـەی پەيتـاپەيتـا، پرمـەپرم. ٢ـ دەنگی پەيتاپەيتای لووتی حەيوانی گەورە.

**پيزاڵ** (گيا.)[فـار: پيزر (پيزۆر). ناو: پيـزاڵ، پيزڵ] جـۆرێك جەگـەنە كە دە نێو ئاو دا دەروێ بۆ باوەشـێن و حـەسـيـر و دە نێو پالان نان كەلكی لێوەردەگرن. زوو ميسرييەكان لەم جـەگەنە كاغـەزيان ساز دەكرد، پاپيرۆس.

**پيزاگ** (گيانـ.)[؟] جـۆرێك زەرگـەتەی باريكی كـێـويی، vespa germanica ناوی لاتينی ئەم گيانلدارەيە، پيزانگ.

**پيزانگ** (گيانـ.) برِ: پيزاگ

**پيـزپيـزەك** (گـيـانـ.)[پيـز؟ + پيـز؟ + ئەك][باك] برِ: بەرگاييلكە

**پيزڵ** (گيا.) برِ: پيزاڵ

**پيـــزۆكـــە** (نا. ل)[پيـز (پز) + ئۆكـە] زيپكەی بچووك سەر پێستی لەش.

**پيزە** (ئا.)[برِ: پز] ١ـ بێچووی گياندار لە نێـو زگ دا، ئاولەمـە، پز. ٢ـ [زا] زگ، گەدە

**پيـــزەدان** (ئا.)[پيـــزە/١ + دان] برِ: پزدان/١

**پيـزيی** (ئا.)[پيـز (پز) + ئيی] كـونی كونگ، پزووی كونگ، پزی.

**پيس** (ئان.)[ئەو: پـەئيــــســــە ـ پەه: پێـســـەك. تـات: پيس. بـاك: پيس ـ ناو:

پیس ـ هەو: پیس ـ زا: پیس] ١ـ حـالّی هەر شـتێک و شـوێنێکی ناخـاوێن، چەپەڵ. ٢ـ مـرۆڤی چڵکن. ٣ـ گـول. ٤ـ مـرۆی بێنامـووس و رژد، پیـسکە. ٥ـ هێلکەی نێو بۆگەن و خراپ. ٦ـ وشەیەکە لە کـایەی قـەرەقـەرێن دا دەکـوترێ بە مانای خیچاو. [کاتێک کە ئەو کەسەی وە دوایان دەکـەوێ و دەسـتـیـان لێـدەدا دەڵێ: پیس]. ٧ـ (کنـ.) توند، تیژ. ⁜ زۆر پـیـس لـێـی تـووڕە بـوو. ~ **بـوون:** ١ـ شـوێنێک یا شـتێک کە نـاخـاوێن بێ. ٢ـ چڵکن بوون. ٣ـ گول بـوون، تووشی گولی بوون. ٤ـ خـراپ بـوونی هـێـلـکە. ٥ـ بێنامـووس بوون. ٦ـ خـیـچـان لە قـەرەقـەرێن دا. ~ **پێوە بوون:** (کنـ.) لە هیر کەوتن، خراپ تووشی مەسەلەیەک بوون، خـراپ پێـوە بوون. ~ **کردن:** ١ـ شـپـرزە کـردن و چـەپەڵ کـردن. ٢ـ پەڵە خـسـتنە سـەر جلی کـەسـێک، چەپەڵ کردن. ٣ـ خیچاندن لە قەرەقـەرێن دا. ٤ـ خراپ بوون و هەڵنەهێنانی هێلکە.

**پیـسـایی** (نا. ل)[پیس + ئایی] ١ـ گوو. ٢ـ زبڵ و زاڵ و شتی پیس.

**پیس پیسۆک** (گیانـ.)[پیس (پەس) + پیس (پەس) + ئۆک] بڕ: پەسپەسەکۆڵە

**پیسکە** (ئان. ل)[پیس + کـە] مرۆڤی چەپەڵ، کەسی ئاکارپیس، چرووک، رژد، رەزیل، پیـسـەک. ⁜ لەوێش پیـسکە و درۆزن کـــاری باش بـوو/ لـەوێـش مـەردایەتی و پاکی لە پاش بوو (ناڵەی جودایی ل ٦٦).

**پیـسکەیی** (حم.)[پیـسکە + ئیی] چرووکیی، رژدیی، رەزیلیی.

**پیـسـۆ** (نا. ل)[پی1 + سـۆ][باک] بۆسۆ

**پیـسـۆز** (نا. ل)[پی1 + سـۆز][بیـر: پێسـووز ـ فار: پیـەسوز ـ لۆر: پیسوز ـ کـرم: پیـسـور. ناو: پیـسـۆز، پیـرسـۆز] چرایەک بوو کە زوو بۆ رووناکی کەلکیان لێـوەردەگـرت. (پیـسـۆز بریتی بوو لە دەفرێکی چووکەی مسی یا گڵێنە، رۆن کەرچەک یا رۆن پیویان تێدەکرد، پڵیتەی لۆکە یا شتێکی دیکەیان تێـهەڵدەکێشا و هەڵیـان دەکرد). **وەک ~ هەر شـۆق بۆ خـۆ هەبوون:** (کنـ.) هەر خـۆ لەبەر چاو گرتن و قازانج و فایدە بۆ کەس نەبوون.

**پیـسـەک** (ئان. ل)[پیس + ئەک] ١ـ چڵکن، چەپەڵ، پیس. ⁜ لەگـەڵیـانە کـەڵێکی پیـسەکی بچکۆلانە/ نەقـورچی دەداوە لە بەردی، هەڵیدەکەندەوە رەگ و

ریشـــەی دە دارانـە (گـــەنج ل ٣٣٢). ٢ـ گـول، پیس و گـول. ٣ـ پیـسکە، چرووک، رژد، رەزیڵ.

**پیسیی** (حم.)[پیس + ئیی] ١ـ خاوێن نـەبـوون، پـیـس بـوون، چـەپـەڵـیـی. // خـاوێنیی، پاکـیی ٢ـ (نا.) نەخـۆشی گولیی.

**پیش** (نا.)[؟] ١ـ هـەڵمـژینی هـەوا بۆ نێو سییەکان و راگرتن و نەدانەوە دەری. ٢ـ رک و توورەیی لە نێـو خـۆ دا. ~ **بردنەوە بەر خـۆ:** (کنـ.) توورە بوون و رق هـەستان بەڵام دەنگ نەکردن و بەری خۆ گـرتن، پیش خـواردنەوە، پیش کـردن. ~ **خـواردنەوە:** ١ـ راگـرتنی پشوو لە سییەکان دا و نە دانە دەری. ٢ـ (کنـ.) توورە بوون و رق هەسـتان بەڵام دەنگ نـەکردن و بەری خۆ گـرتن، پیش بردنەوە بەر خۆ. ∷ خەریک بووم بە گژ ئەو پیـاوە دڵرەشـە دا بێم، بەڵام پیـشم خواردەوە، خۆم راگرت (تاریک و روون ل ٣٥). ~ **کردن:** پیش خـواردنەوە، پیش بردنە بەر خۆ.

**پیشان** (چا. ل)[ئێک: پەک ـ ئەو: پەک. پەھ: پەچییتەن. ناو: پیشان، پیشیان] [بڕ: پێـژتن] ١ـ پێگەیشـتنی خـۆراک و خواردەمەنی وەک کوولەکە و چەوەندەر و ... دە نێو ژیلەمۆ و خۆڵەمێش و بە دوور لە گڕی ئاگر. ٢ـ کوڵاندن و پێگەیاندنی خـواردەمـەنی بە ئاوێکی کـەم و بە تینی هـەڵم. ٣ـ (مـجـ.) زۆر گـەرمـا بـوون، هەست بە گەرمای زۆر کردن.

**پیشاندن** (چا. ل)[لە: پیـشـان] پێگەیاندنی خـۆراک و خـواردەمـەنی بە دوور لە گـڕی ئاگـر. ٢ـ (مـجـ.) پێک هێنان و ساز کردنی گەرمایەکی زۆر. ∷ ئەو سۆبەیەت بۆ وا تین داوە هەموومانت پیشاند. & پیشانن

**پیشانن** (چا. ل)[ئەر] بڕ: پیشاندن

**پیشاو** (نا. مف.)[لە: پیشان] هەر شتێک کە بە تینی ناڕاستەوخۆی ئاگر پێگەیشتبێ، پیشیاگ. ∷ بێی پیشاو، چەوەندەری پیشاو.

**پیشک** (نا.)[ناو: پیشک، پیشکان، پیشەقان، پێشەقان] ئامرازێکی چووکە وەک بێڵ بەڵام زۆر چووکـتـر، کـوتە ئاسنێکی دەم باریکە، دەسکی لە دار و پەیاغ بۆ دەکەن و بۆ بژار و گیا و گوڵ هەڵقەندن کەلکی لێوەردەگرن، گیاکەن، بێڵەکان، بژارچن.

**تێبینی:** پیشک و هاوناوەکانی لە

ڕەگی چاوگی پشکنین کەوتوون.

**پیشکان** (نا.) بڕ: پیشک

**پیشۆ** (نا. ل)[پیش (پووش) + ئۆ] [باک] بڕ: پووشوو

**پیشۆک** (گیا.)[پیش + ئۆک][لۆر: پیشوک. باک: پیڤۆک، پیڤۆنگ ـ ناو: پیشۆک، پیفۆک، کیفۆک] گیایەکی خۆڕسکی بەهارییە، گەڵاکانی باریک و ناسکن و چووکن، لە زەوی بەرز نابێتەوە، بنکێکی سپی چووکی هەیە کە بە توێکڵی تایبەتی وەک پرزە داپۆشراوە، لە کوردستان بە پیشک هەڵیدەقەنن و لە ئاو یا لە شیر دا دەیکوڵێنن و دەیخۆن و تامی پەتاتە دەدا. (عەر: حلیلان]

**پیشە** (نا.)[ئەو: پیشترە ـ پەه: پێشەک. باک: پیشە ـ ناو: پیشە، پێشە] کار، ئیش، سەنعەت. ٢ـ ئاکار، عادەت. ⁂ پیشەی ئارەق خواردنەوەیە. ~ **فێر بوون:** کار و سەنعەتێک فێر بوون. **کردنە ~ی خۆ:** کار و کردەوەیەک کردن بە عادەت. ⁂ بەرەڵڵایەتی کردۆتە پیشەی خۆی.

**پیشەساز** (ئان. فا)[پیشە + ساز] کەسێک کە خەریکی سەنعەتێکە، سەنعەتکار.

**پیشەسازیی** (حم.)[پیشەساز + ئیی] کار و پیشەی پیشەساز.

**پیشەقان** (نا.) بڕ: پیشک

**پیشیاگ** (نا. مف.)[لە: پیشان][ئەر] بڕ: پیشاو

**پیشیان** (چا. ل)[ئەر] بڕ: پیشان

**پیفک** (نا.) بڕ: پیفوو

**پیفۆک** (گیا.)[ئەر] بڕ: پیشۆک

**پیفوو** (نا.)[لۆر: پیفە ـ فار: پیفە. ناو: پیفوو، پیفی، پیفک، پیوە] شتێکی نەرم و وشک و پفڵەیە کە لە داربەڕوو یا دارگوێز یان کارگ دەستیان دەخست و زوو بۆ ساز کردنی ئاگر بە بەرد و ئەستی کەلکیان لێوەردەگرت، پووشی، پووشوو، قاو.

**پیفی** (نا.) بڕ: پیفوو

**پیڤ** (نا.)[باک] بڕ: پیو

**پیڤاز** (گیا.)[باک] بڕ: پیاز

**پیڤۆنگ** (گیا.)[باک] بڕ: پیشۆک

**پیڤۆک** (گیا.)[باک] بڕ: پیشۆک

**پیڤین** (چا. م)[باک] بڕ: پێوان

**پیق** (نا.) بڕ: پیک1

**پیک** 1 (نا.) ١ـ (مۆس.) دوو قامیشی چووکن کە لە قامیشێک بە ناوی قەڕغوو دەیبڕن و بۆ سەری تووزەلە کەلکی لێوەردەگرن و بە فوو تێکردنی دەنگی لێوە دێ، پیق، بیک، فیقەنە. ٢ـ لاسکی گەنم و جۆ و ئەو گیایانەی کە لاسک دارن.

**تێبینی:** پیک، بیک یا پیق شێوەیەکی دیکە لە بیق، بۆق یا بووق ـ ە کە لە عەرەبییەوە هاتۆتە نێو زمانی کوردیی و عەرەبیش لە زمانی لاتینیان وەرگرتوە (بڕ: بۆق7).

**پیک** 2 (نا.)[فەر: pîc] یەکێک لە چوار نەقشی پەڕی قومار کە دڵێکی رەشە. (خشت، دڵ، گشنیز، پیک).

**پیک** 3 (نا.)[پەه: پەتەک. فار: پۆک، پۆتک. ئاڵ: picke (قولێنگ) ـ ئین: pick(قولێنگ). باک: پیک ـ ناو: پیک ـ هەو: پیک] ١ـ کوتکی قورس و گەورەی ئاسن. :: هێنای ئاسنی خەدێوی قەڵشتەوە، ... هەتا تواندییەوە و مەحکەم و قاییمی کرد بە پیکان (لاس و خەزاڵ ل ١٣٢) گرتم نە گەردەن بێباک و شادان/ بەڵای پیک سەخت کوورەی ئوستادان (مەولەوی ل ٢٥٧). ٢ـ [باک] پاچوولکەی دەم تیژی دەست کەنکەنەچی، پاچەکۆڵە.

**پیک نیک** (نا.)[ئین: picnic] چوونە سەیرانی چەند کەسی و چێشت و خواردن دەگەڵ خۆ بردن.

**پیکە** (گیا.)[پیک1 + ئە] قامیشێکی باریکی پتەوە چیغی لێ دروست ئەکرێ (خاڵ ب ١ ل ٢٦٧). تەرکە، نەیجە، نەیجەڵە

**پیکەبڕە** (گیان.)[پیک1 + ئە + بڕ (بڕین) + ئە] بڕ: پیتەبڕە

**پیل** 1 (ئا.)[باک: پیل، پی، پۆل ـ ناو: پیل ـ هەو: پێڵ ـ زا: پۆل] ١ـ شان و سەرقۆڵ، شان و پیل، قۆڵ. ٢ـ (ئاک.) لا. :: لە کێها پیلی هەڵکەوتوە.

**تێبینی:** پیل لە پێریسو ـ ی ئەوێستایی بە مانای پەراسوو و پاڵ و تەنیشت و پەهلووک ـ ی پەهلەویی کەوتوە. هەروەتر لە زمانی رووسی دا پلێچۆ plecho بە مانای شان و پیل هاتوە.

**پیل** 2 (گیان.)[پەه: پییل] بڕ: فیل.

**پیل** 3 (ئان.)[بڕ: پیر1][تات: پیلە. زا: پیل، پیلە، پیڵ] گەورە، مەزن.

**پیل** 4 (ئا.)[باک] بڕ: سپڵ

**پیل**[5] (نا.)[فەر: pile] جۆرێک باتریيە بۆ ساز کردنی گەڕیانی بەرق، باتری ویشک.

**پیلاڤ** (نا.)[باک] بڕ: پڵاو

**پیلان** (نا.)[فەر: plan] بەرنامە و نەخشەیەک بە دژی کەسێک بۆ لە سەر ڕێ لابردنی. ~ **کێشان:** نەخشە کێشان و بەرنامە داڕشتن بە دژی کەسێک. ~ **گێڕان:** بەڕێوە بردنی پیلان و نەخشەی داڕێژراو.

**پیلانگێڕ** (ئان. فا)[پیلان + گێڕ][لە: پیلان گێڕان] کەسێک نەخشە و پیلانی خراپ بۆ خەڵک ساز دەکا، ئاژاوەگێڕ.

**پیلانگێڕی** (حم.)[پیلانگێڕ + ئیی] کار و کردەوەی کەسی پیلانگێڕ.

**پیلاو** (نا.)[زا] بڕ: پڵاو

**پیلستەنگ** (گیان.)[باک] بڕ: پەڕەسلێرکە

**پیلک**[1] (نا.)[هس: پلک][باک] خوشکی دایک، پوور، خالتی.

**پیلک**[2] (ئا.)[پیل1 + ک] پەنجە، قامک

**پیلکە** (نا. ل)[پیلک2 + ئە] ١ـ بڕ: پتە. ٢ـ بڕ: پەلەپیتکە

**پیله**[1] (نا.)[؟] تەشقەڵە، گرنە. «« مەمکەنە پێخوست لە پیلەی نارەوا دا چونکە من/ ئارەزووی ژینێکی سادە و هێمن و بێوەی دەکەم (هێدی ل ٣٦٧). ~ **پێگرتن:** تەشقەڵە پێکردن، گرنە بە کەسێک گرتن و لە کۆڵ نەبوونەوە. ~ **کردن:** تەشقەڵە کردن، گرنە گرتن.

**پیله**[2] (ئان.)[زا] بڕ: پیل3

**پیله**[3] (نا.)[پەه: پیلەک. ناو: پیلە، پێلە] کیسەیەکی چووک کە هەندێک حەشەرە بە تایبەت کرمی ئەوریشم بە دەوری خۆیان دا دەیتەنن و سەردەمی شێوەگۆڕکەی خۆیانی تێدا تێپەڕ دەکەن و لە دوایی کونی دەکەن و وەک حەشەرەیەک لێی دەردەکەون، قوزاخە.

**پیلەتەن** (ئان. ل)[پیل2 + ئە + تەن] کەسێک کە کەڵەگەت و زل و زەلام بێ، بەژن و باڵای وەک فیل، فیلەتەن.

**پیلەوار** (نا. ل)[پیل1 + وار (بار)] ١ـ دارێکی گەورە کە لە سەر شان دایدەنێن و لە دارستانەوە دەیهێننەوە، لەت و کوتی دەکەن بۆ سووتاندن، باسکەملە ٢ـ بڕە داری سووتاندنی ئەستوور و گەورە. & پێڵەوار

**پیلّ** (ئان.)[زا] بڕ: پیل3

**پەین** (نا.)[باک: پەین، پەێن، پەهەین، پێهن، پهین] پێلاقە، لەقە، شەپ.

**پینج** (ئان.)[بڕ: بیژ][باک ـ زا] بیژوو، بیژی، حەرامزادە.

**پینگۆک** (گیان.)[؟][باک] بڕ: ئاخرکە

**پینگ پۆنگ** (نا.)[ئین: ping pong] جۆرێک یاریی دوو کەسی و هەندێک جار چوار کەسییە کە بریتی لە جووتێک میزی هاوتایە کە نێوەڕاستەکەی تۆڕێکی باریکی پێوەیە، تۆپێکی چووکی رەقە کە بە راکت لێیدەدرێ و هەرکەس کە بگاتە بیست و یەک براوەی ئەم کایە دەبێ.

**پینە** (نا.)[پەش: پینە ـ فار: پینە ـ کرم: پینە ـ گیل: پینیک. باک: پینە، پنی ـ ناو: پینە ـ هەو: پینە ـ زا: پینە] ١ـ کوتە پارچە یا چەرم لە سەر شوێنی دڕاوی جل یا کەوش، پاتە، پسپان، تیمانج. ٢ـ توێژێکی رەقی پێست کە لە بەر کاری زۆر لە بەری دەست پەیدا دەبێ. ٣ـ بەشێک لە دیواری ساز کراوە. **بۆ ~ کردن:** (کنـ.) داپۆشینی عەیب و هەڵەی کەسێک وەها کە دەنگ نەداتەوە، بۆ داپۆشین، پینە کردن. **~ کردن:** ١ـ دڕوون و لێدانی پینە لە سەر جل و کەوشی دڕاو، پینە لێدان. ٢ـ (کنـ.) داپۆشینی عەیب و هەڵە. **~ لێدان:** بڕ: پینە کردن.

**پینەچی** (ئان. ل)[پینە + چی] کەسێک کە کەوش و پێڵاوی دڕاو و خراپ چاک دەکاتەوە، پنیکەر.

**پینەدروو** (ئان. فا)[پینە + دروو] کەسێک کە پینە لە سەر شوێنی دڕاوی جل دەدروێ.

**پینەچێتی** (حم.)[پینەچی + ئێتی] کار و پیشەی پینەچی.

**پینەوپەڕۆ** (نا. ل)[پینە + و + پەڕۆ] ١ـ پینە. ٢ـ جل و پارچەی کۆن و بێکەلک. **~ کردن:** پینە لە جل دان، پینە کردن

**پیو** (نا.)[هیک: پیڤەس ـ ئەو: پییڤەه ـ هەخ: پیثو ـ پەه: پییە، پیە، پییم، پیەڤ. لۆر: پی ـ فار: پیە ـ کرم: پی ـ بیر: پێ ـ گیل: پی. باک: پیڤ ـ ناو: پی، پیو] ١ـ چەوریی لەشی حەیوان، بەز. ٢ـ رۆنێک کە لە قاڵ کردنی دووگ دەگیرێ.

**پیواز** (گیا.) بڕ: پیاز. **~ پاک کردن:** (کنـ.) بڕ: پیاز پاک کردن

**پیوازەخووگانە** (گیا.)[پیواز + ئە + خووگ + ئانە2] بڕ: پیازەخووگانە

**پیوازەکێوییلە** (گیا.)[پیواز + ئە + کێویی + لە] بڕ: پیازەخووگانە

**پیوداڕوو** (نا. ل)[پیو + داڕوو] بڕ: پیداڕوو

**پیوە** (نا.) بڕ: پیفوو

**پیۆنز** (گیا.)[زا] بڕ: پیاز

**پیوونز** (گیا.)[زا] بڕ: پیاز

**پێ** 1 (ئا.)[هیک: پادە ـ ئێک: پاد ـ ئەو: پاذە ـ هەخ: پاد ـ پەهـ: پاد، پای. تات: پا ـ فار: پا، پای ـ پەش: پای ـ لۆر: پا ـ گیل: پا، پێ. باک: پاق، پێق، پێ ـ ناو: پا، پێ ـ هەو: پا ـ زا: پا] ١ـ بەشێک لە ئەندام کە قورسایی لەشی لە سەرە و پێی دەڕوا، بەشی ژێرەوەی ران لە گوێزینگەوە هەتا پەنجەکانی پێ. ٢ـ بن و ژێری هەر شتێک. :: پێدەشت. ٣ـ بەرانبەر، هاوشان و یەک بوون. ٤ـ وەئەستۆ گرتن، لە سەر، لەمل. :: جێبەجێ کردنی ئەو کارە لە پێی تۆ. پارەکەی لە پێی من حیساب بکە! ٥ـ ئەندازەیەک کە بەرابەرە دەگەڵ هەنگاوێک. ٦ـ دارێکە سەرێکی لە ژێرەوە ئەبەستری بە خوانکەی ئاشەوە و سەرەکەی تری بە دەرەوە ئەبێ، بەرداشی پێ بەرز و نزم ئەکرێتەوە (خاڵ ب ١ ل ٢٤٨). **~ بڕانەوە( لە شوێنێک):** بڕانەوەی هاتوچۆ، واز هێنان لە ئامشۆ، پێ لێبڕین. // پێ کرانەوە. :: شوکور تازە پێی لەو ماڵە بڕاوەتەوە ئیدی چاومان پێی ناکەوێتەوە! **~ بڕینەوە( لە شوێنێک):** بەری هاتوچۆی کەسێک گرتن بۆ ماڵ و شوێنی دیکە. :: کابرایەکی دەست پیس بوو هەر لەبەر ئەوە پێم لەم ماڵە بڕیوە! **~ بە پۆلوان سووتان:** (کنـ.) ترسان و تەمێ بوون، چاوترسێن بوون. **~ بە ~ هاتنەوە:** بەرابەر هاتنەوە، وەک یەک بوون و بە قەرا یەک بوون. **~ (لاق) بە قەد بەرەی خۆ راکێشان:** (کنـ.) لە قەدەر و ئەندازەی توانایی و دەستەڵاتی (چینایەتی، مادی، مەعنەوی) خۆ جووڵانەوە، سنوور تێنەپەڕاندن. **~ (لاق) بە عەرزییەوە وشک (رەق) بوون:** (کنـ.) واق وڕمان، زۆر پێ سەیر بوون و باوەڕ نەکردن، شاخ دەرێنان. :: لەپڕ شتێکی وامان گوێ لێبوو کە وەختابوو پێمان بە عەرزەوە وشک بێ (تاریک و روون ل ٢٦). **~ پێوەنان:** ١ـ بە پڕتاو راکردن، توند هەڵاتن. ٢ـ بە قەو پێ لە سەر گازی

ماشێن دانان بۆ توند ڕۆیشتن. ~ **تێنان:** ١ـ چوونە نێو قۆناغێکی دیکەی تەمەن. ⁘ سێ ساڵی تەواو کردوە و پێی دە چوار ساڵی ناوە. ٢ـ پێ دە شوێن و جێگەیەک نان. ⁘ حەقت نیە پێ دە ژووری بنێی. ~ **تێنانەوە:** هاتوچۆ کردنەوە و سەردانی شوێنێک. ⁘ هەتا ماوم تازە پێ دە ماڵە نانیمەوە. ~ **چەقاندن:** ١ـ ڕاوەستان و سوور بوون لە سەر ویست و داخواز، پێ داگرتن. ٢ـ لە سەر جێ وەستان و مان گرتن لە ڕۆیشتن. ~ **داگرتن:** پێ چەقاندن، سوور بوون لە سەر ویست و داوا، پێ لێداگرتن. ~ **دەبەند چوون:** بەند بوونی پێ و توانای ڕۆیشتن لێبڕان لە ترسان یا حەپەسان یا لەبەر هەر شتێکی دیکەی لەم بابەتەوە. ⁘ ئەگەر چاوم پێکەوت، لە سوێیانی شێت بووم، نە توانیم بێمەوە، نە توانیم بچمە سەراوێ، پێم دە بەند چوو، هەتتا سەحاتێکی. (مان ل ١٩٥). ~ **دە دەرک نان:** (کنـ.) ١ـ زۆر بۆ هێنان، زەخت لێکردن، قوون دە دەرک نان. ⁘ بۆ قەرزەکەی پێی دە دەرکم ناوە و لە کۆڵم نابێتەوە. ٢ـ ڕووی تێکردنی بەدبەختی. ⁘ لە لایەک ئارامی دڵم بە عومری تۆ لەبەر چاوم هەڵگیراوە/ لە لایەک دوژمنایەتی حەوت هەزار سوار پێی دە دەرکم ناوە (سەعید و میرسێوەدین ل ٨٦). & کونگ دە دەرک نان. ~ **دە ماڵە کەسێک نەنان:** هاتووچۆی کەسێک نەکردن، نەچوونە ماڵە کەسێک. ⁘ لە سەر ئەو بوختانەی کە پێتکردم تازە هەتا من مابم ئیدی پێ دە ماڵتان نانێم. ~ **ره زگ خستن:** ١ـ زگی کەسێک پێشێل کردن. ٢ـ (کنـ.) پێشێل کردن و نابوود کردنی کەسێک. ~ **کرانەوە (بۆ شوێنێک):** دەست پێکردنی هاتوچۆ. // پێ بڕانەوە. ⁘ تازە پێم بەو ماڵەی کراوەتەوە و لەوە بەدوا زوو زوو سەردەدەم!. ~ **گرتن:** وەڕێ کەوتنی منداڵی مرۆڤ یا ساوای گیاندار، فێرە ڕۆیشتن بوون، پێ هەڵگرتن. ~ **گیران:** ١ـ کۆ بوونەوە و گیرانی ماسوولکەی پێ لە کاتی مەلە کردن دا. ٢ـ گیرانی ماسوولکەکانی پێ لە کاتی ڕۆیشتن و ماندوو بوونی پێیەکان. ~ **لە دوو نەهاتن:** توانایی ڕێ بڕین و ڕۆیشتن نەمان لەبەر ترس، بێهێزیی و شتی لەم بابەتە. ⁘ هێند لە دووی کوردایەتی چووم، هێز و تینم لێبڕا/ پێم لە دوو نایە بڵێم هەنگاوی دی داوێمەوە (هێدی ل ٣٦٥). ~ **لە کلک**

**نان:** (کنـ.) بە قسـە و کردەوە و کارێک بوونـە هۆی هارووژاندن و توورە کـردنی کـەسـێک. **~ لێ لە کـەوشـان کـردن:** (کنـ.) بە بڕشت و سوور لە سەر ئەنجام دانی کار و مەسـەلەیەک کە دەبێ هەر بکردرێ. ∷ دایکم ئەو ساڵی پێی لێ لە کەوشان کردم و گوتی: ئیلا بیلا، پێتخۆش بێ و پێت ناخۆش بێ ژنت بۆ دێنم (تاریک و روون ل ٢٥). **~ لە نان نان:** (کنـ.) کوفر کردن، ناشکوری کردن. **~ لێبڕین:** بڕانەوەی هامشۆ، پێ بڕانەوە لە شوێنێک. **~ لێداگرتن:** ١ـ بڕ: پێ داگرتن. ٢ـ دانواندنی پێی ئاش بۆ ئەوەی کە ورد بێهاڕێ. **~ لێڕاکێشان:** ١ـ پێ درێژ کردن بۆ حەسانەوە. ٢ـ (کنـ.) حەسانەوە و پاڵ دانەوە بە ئەرخەیانی و بێخەمی. ∷ میراتێکی باشی پێبڕاوە، پێی لێڕاکێشاوە و بە کەیفی دڵی خۆی دەیخوا. **~ لێنان:** ١ـ پێشێل کردن، پێ رێخشاندن. ٢ـ دان پێدا هێنان، راستی دەربڕین، سەلماندن. **~ هەڵگرتن:** ١ـ بڕ: پێ گرتن. ٢ـ خێرا رۆیشتن، پێ هەڵێنان. **~ هەڵێنان:** هەنگاو هەڵێنان، خێرا کردن، توند رۆیشتن. **~ یەک لە سەر لێوی قەبر بوون:** (کنـ.) پیر بوون و لە مەرگ نزیک بوون. ∷ حاجی پێیەکی لە سەر لێوی قەبرێیە و هێشتاش هەر خەریکی ماڵ پێکەوە نانە. **دە ~ کردن:** پۆشینی گۆرەوی، دەرپێ، دوولینگە و کەوش و شتی لەم بابەتە. **لە ~ کەوتن:** ١ـ تاقەت و توانایی لێبڕان. ٢ـ دەست هەڵگرتن لە هەوڵ و تێکۆشان و تەسلیم بوون. **لە سەر ~ی خۆ راوەستان:** سەربەخۆ بوون، پشت بۆ خۆ بەستن، خۆ بەڕێوە بردن، لە سەر پێی خۆ وەستان. **لە سەر ~ی خۆ وەستان:** بڕ: لە سەر پێی خۆ راوەستان.

**پێ**[2] (نا.) ناوی سێهەم پیتی ئەلفوبێی کوردیی (پ).

**پێ**[3] (پێشـ.)[باک: پێ ـ ناو: پێ ـ هەو: پەنە ـ زا: پا] پێشگری کردارە کە ئەو مانایانە دەدا. ١ـ (حرف اضافە) مانای بە (من، تۆ، ئەو، ...) دەدا وەختایەک کە ناوی فاعل نایە. ∷ پێ نیشان دان (بە ئەو نیشان دان)، پێی دادام (بە منی دادا). ٢ـ کات و خایاندنی زەمان دەگەیەنێ. ∷ پێچوون. ٣ـ جەبر و زۆریی دەگەیەنێ. ∷ پێداکەندن، پێهەڵوەشاندنەوە، پێکردن. ٤ـ مانای کردار دەگۆڕێ و کردارێکی

دیکە ساز دەکا. ⁂ پێهەڵچوون (هەڵچوون)، پێبوون (بوون)، پێکردن (کردن). ٥- بە پێشگری دیکەی کردارەوە دەلکی و پێشگری لێکدراو ساز دەکا. ⁂ پێدا، پێرا، پیا. ٦- بە رەگی کردارەوە دەلکێ و ناوێکی نوێ ساز دەکا. ⁂ پێخەف، پێخۆر، پێناس

**پێ**[4] (نا.)[هس: پێوان] پێوانە، پێودان، حیساب. ⁂ بەو پێیە دوو ساڵی دیکەش دەبێ بخوێنم.

**پێباز** (نا. ل)[پێ1 + باز2] چەند بەردی ریز کراو لە تەنکاوی چۆم و جۆگە دا بۆ باز دان و پەڕینەوە، پردەباز، بەردەباز، بەردەواز، پێواز.

**پێبازە** (گیا.)[پێ1 + باز1 + ئە] گیایەکی بەهارییە گەڵای وەکوو پێ باز چنگدارە (کشت و کاڵ ب ١ ل ٧٣). گیایەکە گەڵای وەک پێی باز وایە (خاڵ ب ١ ل ٢٥٢).

**پێبڕان** (چا. م)[پێ3 + بڕان] بەش پێگەیشتن، بەرکەوتن، پێ بڕین، بە نەسیب بوون. ⁂ بەشە ماڵێکی باشم پێبڕاو. کاڵەم درا و چم پێ نەبڕا.

**پێبڕین** (چا. م)[پێ3 + بڕین] ١- بەش بەرکەوتن، بە نەسیب بوون، پێبڕان. ٢- بڕین بە ئامرازی بڕینەوە.

**پێ بژاردن** (چا. م)[پێ3 + بژاردن] حیساب کردن و پێ قەرەبوو کردنەوەی زەرەر و زیان لە کەسێک.

**پێ بژیو** (نا. ل)[پێ3 + بژیو] ئەو شتەی کە بۆ گوزەرانی ژیان پێویستە، بژیو، بژیوە مایەی ژیان.

**پێبوون** (چا. م)[پێ3 + بوون] ١- دەگەڵ خۆ بردن، هاوڕێی خۆ بوون. ⁂ کتێبەکانم پێیە، پارەم پێ نیە. ٢- بە رۆژوو بوون، رۆژوو گرتن. ٣- هەڵبوون، ئاگر یا چرا ئایسان.

**پێبەپێ** (ئاک. ل)[پێ1 + بە + پێ1] هاوڕێ دەگەڵ کەسێک یا شتێک، هەنگاو بە هەنگاو. ⁂ کوڕە چووکەکەم پێبەپێی من رێگای دەبڕی. پێبەپێی تابووت هەتا قەبرستان چوو.

**پێبەتاڵ** (ئان. ل)[پێ1 + بە تاڵ] پێڵاو کەوشی گەورە و فرەوان.

**پێبەخشین** (چا. م)[پێ3 + بڕین] ١- لە کەسێک خۆش بوون لەبەر خاتری کەسێکی دیکە. ⁂ ئەوجار لێی خۆش بە و بەمەی ببەخشە. ٢- بەخشین و پێشکەش کردنی شتێک بە کەسێک. ⁂ فەقیرێکی دیت کراسی دەبەر دا نەبوو،

کراسەکەی خۆی پێبەخشی. ٣ـ لێخۆش بوونی قەرز. :: ئەوەی لە سەرت ماوە هەمووت پێدەبەخشم.

**پێبەداره** (ئا.)[پێ1 + به + دار + ئه] ئێسقانێکە بە دەم ران و قۆلی گیاندارەوە سەرەکەی وەکوو چاکڵ وایە (خاڵ ب ١ ل ٢٥٢)، پێداره.

**پێبەسته** (نا. مف)[پێ1+ بەسته] بڕ: پابەستە. **~ بوون:** بڕ: پابەستە بوون

**پێبەستیی** (حم.)[پێبەست + ئیی] ١ـ پابەند بوون، پابەستە بوون. ٢ـ هۆگر بوون، گیرۆدە بوون. :: قسەی ئەو کیژێ مەرزینگان یەگجار خەمناکی و پێبەستی هاویشتوومە دڵییە/ ... جوابی بدەوە بزانە مەنزووری چییە (لاس و خەزاڵ ل ١٣٥).

**پێبەقنگه** (گیان.)[پێ1 + به + قنگ + ئه] بڕ: پێبەقوونه

**پێبەقوونه** (گیان.)[پێ1 + به + قوون + ئه] جۆرێک مراوی چووکە. ئەم مراوییە زۆر ژیرە و کاتێک کە هەست دەکا راوی دەکەن گورج دەچێتە بن ئاوەوە (فرهنگ پرندگان ل ٥١)... دنووک و ملی قوڵەیە، کلکی نییە. هاوینان رەنگی قاوەییە و زستانان کاڵترە. لاجانگی مەیلەو قاوەییە، ئەستوورایی دندووکی سەوزی مەیلەوزەردە، زۆرەتر خۆ لەبەر چاوان نەدیو دەکا. هەڵنافڕێ، ئەگەر هەڵیشبفڕێ بەرزەفڕ نییە و نەوی و خێرا بە سەر ئاو دا باڵێک دەفڕێ. لە گۆل و زەل و شەتی پڕ گیاوگۆڵ دەژی ... بە پێچەوانەی باڵندەکانی تر لاقیان زۆر بۆ لای پاشەوەیان چوە و هەر بۆیەش ئەم ناوەیان بە سەر دا بڕاوە (فەرهەنگی باڵندە ل ٢٠) Podiceps ruficollis ناوی لاتینی ئەم باڵندەیە، پێبەقنگە. ‖ **پێبەقوونەی سەربەکڵاوە:** لە تۆرەمەی خۆی دا لە هەموان گەورەترە. کڵاوەی سەری قاوەیی مەیلەوڕەشە، بەڵام زستانان دیاری ناکا. (فەرهەنگی باڵندە ل ٢٠). Podiceps cristatus ناوی لاتینی ئەم مەلەیە. **پێبەقوونەی شاخدار:** لە سەر برۆی تووکی مەیلەوزەرد رواوە؛ لە دوورەوە وەک شاخ دەچێ. تووکی بەر زگی لە هی پشتی کاڵترە و لە کاتی فڕین دا سەرباڵی سپی دیاری دەکا. سەر و ملی وەک مار رادەگرێ ... لە گۆل و شەتاوی شیرن دا دەژی (فەرهەنگی باڵندە ل ٢١).Podiceps auritus ناوی لاتینی ئەم باڵندەیە. **پێبەقوونەی گەردن رەش:** بە ملی رەش و نێوچاوانی

پانیـــەوە لـە هاوڕەگـــەزی خـــۆی جـــوێ دەکرێتەوە... هێندێک تووکی مـەیلەوزەرد لـە نێـــوچـاوانی راوە و لـە دوورەوە وەک پۆپـە دەچێ. ســـەری دەنووکی کـــەمــێک قیتـە. ملی راست رادەگرێ (فـەرهـەنگی بـــاڵـــنـــدە ل ٢١). Podiceps nig-ricollis نـاوی لاتـیـنـی ئـەم بـاڵـنـدەیـە.

**پێبەقوونەی گەردن سوور:** سەری گەورەیە ... مـلی قـــاوەیی تونـدە و دوو تیـــسکـی چووکی لێـڕواوە. دندووکی زەردی روونە و سـەری دەنووکی رەشـە. پشـتی قـاوەیی مـەیلەوبۆرە. بەر زگی سپـی ئاوریشـمـییـە (فـەرهـەنگی باڵندە ل ٢١). Podiceps grisegena ناوی لاتینی ئەم باڵندەیە.

**پێـــبـــەند** (نا. ل)[پیَ1+ بەند] بڕ: پابـەند. **~ بوون:** بڕ: پابەند بوون. ⁂ عیشقت ئەسیری کردووم پێبەندی داوی تۆ بـووم/ رۆیی بـێ مـــاڵاوایی، لـە دونیــا رەنجـــەڕۆ بـووم (لالە بـە دەســـتـــان ل ١٩٧). **~ کردن:** بڕ: پابەند کردن.

**پێبەندیی** (حم.)[پێبـەند + ئیی] بڕ: پابەندیی. ⁂ دەیگوت: خەزاڵ قـەرەزولفی تۆ ئەمنی کردبوو پابەندییە/ ئێرەکانە بۆ من وەتەن نییە، غەریبییـە (لاس و خەزاڵ ل ١٧٧).

**پێـــپلکە** (نا. ل)[پیَ1 + پل (پلـە) + کـە] بـڕ: پلە. **~ دان:** لاق وە بەر لاقی کەسێک دان بۆ خستنی، پێپیلکە دان.

**پێـــپلیکان** (نا. ل)[پیَ1 + پلیکان] نەردیوان، نێـردیوان، پەیژە پێـپـەلووک، قاڵدرمە.

**پێـپـڕژە** (ئان. ل)[پیَ1 + پڕژ (پڕژان) + ئە] لاق لـە خـۆڵ وەردانی مـریشـک بۆ دۆزینەوەی دان، چینە.

**پێـپـشـیلە** (ئان. ل)[پیَ1 + پشـیلە] گـیـایەکی خـۆڕسکە، بـە دار و دیوار و گــــیــــــای دەوروبـەری هـەڵدەچێ و تێـاندەهـاڵێ، گـوڵەکـانی زەردی ئـامڵ شینە، بەرێکی چووکی بە قەرا نۆک هەیە کـە بـە گـەیشـتـوویی رەنگی رەشــە. لەم گـیـایـە بۆ دەرمـان کـەلک وەردەگــرن، Hedera helix نـاوی لاتـیـنـی ئـەم گیایەیە. (فار: عشـقە ـ عـەر: رجل الهر ـ ئین: cat´s foot)

**پێـپـەتی** (ئان. ل)[پیَ1 + پەتی1] ١ـ بێ پێـڵاو، پاپەتی، پێـخـواس. ٢ـ (مـجـ.) هـەژار و نەدار. & پاپەتی.

**پێپەلنگ** (نا. ل)[پیَ1 + پەل (پلە) + نگ][باک] نەردیوان، پێپەلووک، پەیژە.

**پێپەلووک** (نا. ل)[پیَ1 + پەل (پلە) +

ئووک][باک] نەردیوان، نێردیوان، پەیژە.

**پێپیلکە** (نا. ل)[پێ1 + پیل (پلە) + کە] بڕ: پلە. **~ دان:** بڕ: پێپلکە دان.

**پێت** (نا.)[؟][باک] گڕ، بڵێسە

**پێتاتە** (نا. ل)[پێ1 + تاتە (تەختە)] بەشێکە لە دەزگای جۆلایی کە تەختەیەکە لە ژێر پێی جۆلا دایە و لە کاتی جۆلایی دا پێی لە سەر دادەگرێ و گورد دێتە خوار، پێتەتە، پاتەتە، پاگیرە، پائەوشار. [هەر گوردەی دۆخینێکی پێوە شۆڕ بۆتەوە کە دەکەوێتە بەر پێی جۆلا. جۆلا بە نۆرە و لە سەر نەزمێکی رێک هەر جارەی پێ بە یەکیان دا دەدات و بەم کارە گوردەکان بلێند و نەوێ دەکا تاکوو مەکووک بە نێوان تانەکان دا رەت بکا و پۆپەکە جێگیر بکات. واهەی کە جۆلا لەبەر پێی جۆی قولکەیەک دروست دەکا و سەری پێتاتە دەچێتەوە ئەوێ. ئەو قولکەیە پێچاڵ ـ ی ناوە. هەروەها جۆلا زۆر زوو پێ بە پێتاتەکان دا دەدا و لە ژێرەوە وەک شەڕەشەپ بکا وایە. ئەم لاق تێوەژاندنە لە زاراوەی جۆلایی دا شەپیتکەی ناوە (گۆڤاری هاوار ژمارەی هەشت ل ٢٩).

**پێتاڤ** (نا. ل)[پێ1 + تاڤ2][باک] پێتاو، پێڵاو.

**پێتاگ** (نا.)[؟][باک] ١ـ ئەنبار. ٢ـ شەڵخە، پلوورە.

**پێتاو** (نا. ل)[پێ1 + تاو3] ١ـ پارچە تەنراوێک کە دە پێی دەهاڵێنن و کاڵەی لە سەر دە پێ دەکرێ، پیتاڤ، پێتاڤ، پاتاوە، پێتاوە. ٢ـ کەوش، قۆندەرە، سۆل، پێڵاو. **~ی غەریبی ( لە لای کەسێک یا لە شوێنێک) کردنەوە:** یەکەم شوێن یا ماڵێک لە غەریبایەتی دا کە لێی سەقامگیر دەبن، سەرەتای ناسیاوی لە غەریبایەتی دا، پێڵاوی غەریبی کردنەوە. ⁂ میوانی ئەو پیرێژنە بوو کە هەوەڵ جار لە موسڵێ کاڵە و پێتاوی غەریبی لە ماڵە وان کردەوە (سەعید و میرسێوەدین ل ٢٤٢).

**پێتاوە** (نا. ل)[پێ1 + تاو3 + ئە] بڕ: پێتاو

**پێتەتە** (نا. ل)[پێ1 + تەتە (تەختە)] بڕ: پێتاتە

**پێتەخت** (نا. ل)[پێ1 + تەخت] بڕ: پاتەخت

**پێتەک** (نا. ل)[؟] کەل و پەل و کەرەسەی نێومال و ژیان کە دەگەڵ بووک دەنێردرێتە ماڵە زاوا، گیاز.

**پێچ** (نا.)[لە: پێـچـانـدن] ١ـ [مـۆک] مێزەری پیاوان کە لە پارچە و قوماشی تەنک سازی دەکەن، ریشووی لێدەنێن و لە سەری دەبەستن. ٢ـ سەرپۆشی ژنان. ٣ـ ئامـرازی لێک توند کـردنی دو پـارچە شت لە یەک. (برغـوو وەک بزمـار درێژە بەڵام لوس نیـە و پێـچـی لە سـەرە و بادەدرێ) بورغوو، جەڕ، برغوو، بورغی، ڤـیدە. ٤ـ لە رەگـی پێـچـان دەکـەوێ و بە ناوەوە دەلکێ و مـانـایەکی تازە سـاز دەکا. ٥ـ شـوێنی خـوار و کل. ؛؛ پێـچی کۆڵان، پێچی جادە. ٦ـ بادراو، سووڕاو، لوول. ٧ـ خـولانەوەی بـا بە دەوری خـۆی دا. ٨ـ خـولانـەوەی بای نێـو زگ. **~ پیـاهاتن:** برِ: پێڵ پێـدا هاتن. **~ پێـدان:** بادان، بـاو پێـدان. **~ پێـدا هاتن:** خولانەوەی بای نێو زگ، ژانە زگ دەست پێـدان، پێچ پیـاهـاتن. **~ خـواردن:** ١ـ لوول بوون. ٢ـ بـادران. ٣ـ لێـهاڵان. **~ خواردنەوە:** ١ـ گـەڕانەوە، پێـچ دانـەوە. ٢ـ لادان لـە سـەر رێ و چوونـە لایەکی دی، پێچ کـردنەوە. **~ دان:** ١ـ پێـچـانەوە. ٢ـ لوول دان. ٣ـ بادان. ٤ـ لە دەوری خـۆ خـولانەوە. **~ دانەوە:** گـەڕانـەوە، بـادانـەوە. ؛؛ ئای خۆزگە ببایە جێگە بۆ سانەوەیەک/ لەم رێگەیە دوورە سـووڕ و پێچ دانەوەیەک (هـەژار ـ خـەیام). **~ شل بوونەوە:** (کنـ.) زۆر قسە کردن، چەنەوەڕی کردن، چەنە شل بوونەوە. **~کردنەوە:** لادان لە رێ و بەرەوە چەپ یا راست خـۆ خـوار کـردنـەوە، پێچ خـواردنەوە. **~ لێـدان:** (کنـ.) فریو دان، کڵاو لە سەرنان،.

**پێچاڵ** (نا. ل)[پێ1 + چاڵ] چاڵی بەر پێی جۆڵا و ئاسنگەر، پاچاڵ.

**پێچان** (چا. م) پێچ پێدان، بادان.

**پێـچـانـدن** (چا. م)[پەه: پێـچـییـتـەن. باک: پێـچـانـدن ـ ناو: پێـچـانـدن] پێچ پێدان، بادان، سووڕاندن.

**پێچانەوە** (چا. م)[لە: پێچان] ١ـ خڕ کردنەوە و کۆ کردنەوەی بوخچە و سفرە و بەسـتـەی کـراوەی دیکە. ٢ـ دەردەست کـردنی کـەسێک و دەگـەڵ خـۆ بردن. ؛؛ نیـوە شـەوێ سـەربـاز هاتن و عـەوڵڵایان پێچاوە و بردیان. ٣ـ هەڵگرتنی شتێک بە کـۆمـەڵ بێ ئـەوەی بە تـەواوی ببەسترێتەوە، تێکەوە پێچان. ؛؛ دز هات و ماڵەکەمانی پێچاوە و بردی. ٤ـ لوول دانی شـتێک. ؛؛ سیگار پێـچـانەوە. ٥ـ (مجـ.) شـاردنەوەی قسـە و بـاسێک لە کـەسێک. ؛؛ تکایە هەمـوو بـاس و

مەسەلەکەم بۆ بگێڕەوە و هیچ قسەیەکم لێ مەپێچەوە!

**پێچاوپێچ** (ئان. ل)[پێچ + ئاو2 + پێچ] ١ـ حاڵی ڕێگا و شوێنێک کە پێچ و خەمی زۆر بێ. ٢ـ حاڵی مەسەلە و شتێکی سەخت و گران. & پێچ پێچ، پێچەڵپێچ، پێچەڵپاچ، پێچ و فڵووچ، پێچەڵپووچ.

**پێچبادەر** (نا. ل)[پێچ/٣ + بادەر (بادان)] ئامرازێکی ساکار کە شکڵ و شێوەی لە پێوەندی دەگەڵ جۆری پێچ تۆفیر دەکا و بۆ توند کردن و شل کردنەوەی پێچ کەلکی لێوەردەرگرن، جەڕبادەر.

**پێچ پێچ** (ئان. ل)[پێچ + پێچ] بڕ: پێچاوپێچ

**پێچ پێچووکە** (گیان.)[پێچ/٦ + پێچ/٦ + ئووکە] ١ـ گیاندارێکی لەش نەرم و لیچقە، لە سەر زگ دەخزێ و قاپیلکەیەکی سەدەفی پێچ پێچی لە سەر پشتە، هێلکەی شەیتانۆکە، هێلکە شەیتانۆکە، شەیتانۆکە. ٢ـ (ئان. ل) شتێکی کە پێچی زۆر هەبێ.

**پێچرا** (نا. ل)[پێ1 + چرا] ئامرازێکی ساز کراوە لە دار یا هەر شتێکی دیکە بۆ لە سەر دانانی چرا، پاچرا.

**پێچران** (چا. ل) پێچ پێدران، بادران.

**پێچرانەوە** (چا. ل)[لە: پێچران] خڕ و کۆ بوونەوەی بەستەی کراوە و سفرە.

**پێچراو** (نا. مف.)[لە: پێچران] پێچ دراو، بادراو، خڕکراو.

**پێچراوە** (نا. فا)[لە: پێچران] خڕ کراوە، هەڵگرتراو، لوول دراو، پێچ پێدراو.

**پێچک** (نا. ل)[پێ1 + چک] ١ـ پایەی کورسی و سەندەڵی، پێچکە. ٢ـ چەرخی داشقە و عارەبە و شتی لەم بابەتە، پێچکە. ٣ـ پاچەی ئاژەڵ، پێچکە، قاچک.

**پێچکە**[1] (نا. ل)[پێ1 + چکە (چکۆڵە)] ١ـ ئامرازی لە سەر راوەستانی میز و سەندەڵی کە وەک پێ وایە، پایە، پێچک. ٢ـ ئامرازی پێ رۆیشتی داشقە، عارەبە، کالیسکە و شتی دیکەی لەم جۆرە، چەرخ، پێچک. ٣ـ بەشی خوارەوەی بەلەک و پۆز کە دەکەوێتە پشت گوێزینگی پێ، پاشپانی. ٤ـ پاچەی ئاژەڵ، پێچک، قاچک.

**پێچکە**[2] (نا. ل)[پێچ + کە] منداڵی

ســاوا و چکۆڵە، پێــچــەک. بەم مــانـایە هەمیشـە دەگەڵ وشـەی سـەر دێ. ﷼ دوو منداڵی سەر و پێچکەی هەیە.

**پێچن** (گیا.)[پێچ + ن] گیـایەکە کە سی هەتا هەشـتـا سانت بەرز دەبێتـەوە، گـەڵاکـانی شین و ئەسـتــوور و ئاودار و سێ سـێ پێکەوەن، گــوڵەکــانی زەردە و بەرەکەی کەلوویە کە دەنکەکانی قاوەیین. بۆنی ئەم گیایە زۆر ناخۆشە و گەڵاکانی تـاڵن و بۆ هـەندێک دەرمـــان کــەلکی لێــوەردەگــرن، Ruta graveolens و Ruta fetide ناوی لاتینی ئەم گیایەن. (عەر: سذاب، خفت ـ فار: سداب)

**پێچ و پلـــووچ** (ئان. ل)[پێچ + و + پلۆوچ] شوێن یا شـتێکی نارێک و پڕ لە پێچ و پەنا، پێچ و فلۆوچ

**پێچ و پەنا** (ئان. ل)[پێچ + و + پەنا] ١ـ شـــوێنی نارێک و پێچ و پلـــووچ. ٢ـ شـتی شاراوە و شاردراوە، گرێ و گۆڵ، راز، نهـێنی. **بە ~ بوون:** (کنـ.) راست نەبوون، شاردنەوەی مەسـەلەکانی خۆ لە خـەڵک و نـاسـیـاو. **بە ~ قسـە کـردن:** (کنـ.) راسـت و رەوان قسـە نەکـردن، بە کــیـنایە و ئـامــاژە مـــەبەســـتی خـــۆ دەربڕین. **~ هەبوون:** (کنـ.) راگـرتـنی نـهــێـنی و راست نـەبوون، شـــاردنـەوەی مەسـەلە و مەبەست لە دەوروبەری خۆ.

**پێچ و فـلـــووچ** (ئان. ل)[پێچ + و + فـلــووچ] شــوێنی نارێک و پڕ لە پێچ و پەنا، پێچ و فلۆوچ.

**پێـچـۆڵەکـە** (گیـا.)[پێ1 + چۆڵەکـە] گیـایەکی بەهارییە، گەڵای وەکوو گەڵای کــەرەوەزە، گــوڵێکـی زەردی ورد ئەگــرێ (کشت و کاڵ ب ١ ل ٧٤). گیـایەکە گوڵی ورد و سـپی هەیە، دەیدروونەوە و مـاڵات دەیخوا. (عەر: رجل العصفر)

**پێچۆک** (نا. ل)[پێ3 + چۆ (چوون) + ک] ئـامــێــرێکی چووکی چێــوییــە، سێ چەرخی پێوەیە و منداڵی سـاوا دەسـتی پێــوە دەگـرن هـەتا فـێــرە رۆیشـتن بێ، ئیـمـرۆکە جۆری کارخـانەیی باوە کە لە کـانزا سـازی دەکـەن و منداڵی تێـدەنێن، رەورەوە.

**پێــچـــوون** (چا. م)[پێ3 + چوون] ١ـ مـاوە و خـایاندنی سـەفـەر یا رۆیشـتن. ﷼ زوو ورەوە زۆرت پێ نەچێ. بە پێیـان دوو رۆژمـان پێ چوو هـەتا گـەیشـتـینە سـەر سنوور. ٢ـ بـە سـواری شـتـێک رۆیشـتن. ﷼ مـاشـێنەکـەم بەرە و پێی بچـۆ مـاڵە پوورت.

**پێــچــه** (نا. ل)[پێچ + ئه] رووبەندی رەشی ژنانە، پەچە.

**پێـــچـــەک** (نا. ل)[پێچ + ئەک] ١ـ دارێکی دووفلیـقانەی درێژ کە نێـچیری پێ لە کۆن دەردەکێشن. ٢ـ گلۆڵە بەن و ئاوریـشم. ٣ـ [بـاک] بڕ: لاولاو. ٤ـ [زا] منداڵی ساوا، پێچکە. ٥ـ [زا] مەلۆتکە، قــۆنداغـــه. **لە ~ دان:** لێــبـــادانـی پێچەک/١ی لە نێچیری وەک کەروێشک و ڕێوی لە کون دا بۆ دەرکێشانیان.

**پێچەڵپاچ** (ئان. ل)[پێچ + ئەڵ + پاچ (پێچ)] زۆر پێــچــدار و دژوار، نـاڕێک و پێچاوپێچ، پێچەڵپێچ، پێچەڵپووچ.

**پێـچـەڵپـووچ** (ئان. ل)[پێچ + ئەڵ + پووچ] بڕ: پێچەڵپاچ

**پێـچـەڵپـێچ** (ئان. ل)[پێچ + ئەڵ + پێچ] بڕ: پێچەڵپاچ

**پێـــچـــەن** (نا. ل)[پێچ + ئەن] ١ـ دارۆچکەیەکــە کــە پەت و گــوریســی پێ بادەدەن. ٢ـ پێچانەوەی دەوار بە بەش بۆ بـارکـــــردنـی (خــــاڵ ب ١ ل ٢٥٤). ٣ـ دارێکی درێژە و ئەسـتـوور بە قـەد کلکە بێـڵێ، پەتی ئەخـرێتە ناوەڕاسـتی... ئەو دارە لە پشت قـاپییـەوە با ئەدرێ تا توند ئـەبێ. ئـەدرێتـــە پـشت قـــاپـی بۆ ئـەوەی قاپییەکە نەکرێتەوە، چۆڵەپێچەن (کشت و کاڵ ب ١ ل ٧٤).

**پێچەوانە** (ئاک. ل)[پێچ + ئە + وانە] ١ـ کـاری بە عکس و دژی باری راســتی خۆی، چەپەوانە. ٢ـ دژ، نەیار. ≈ حەمەد هەمـیشـە کابرایەکی پێچـەوانە بوە. ٣ـ جل و بـەرگی بـەراوەژوو. ٤ـ کــــەوشـی لنگاولنگ.

**پێح** (ئام.) بڕ: پەح

**پێـخـاس** (ئان. ل)[پێ1 + خـاس3] [باک] بڕ: پێخواس

**پێـخـاوس** (ئان. ل)[پێ1 + خـاوس] بڕ: پێخواس

**پێـــخـــرە** (نا. ل)[پێ1 + خـــڕ+ ئە] نەخـۆشی هەڵمسـان و ئەسـتـوور بوونی لاق و پێیـەکان وەها کە شێوەی پێی فیل دەدا، پامـاسێ، پامـاسـە، پاگرە. (عـەر: داء الفیل. فـار: پاغـر، پاغرە. ئین: el-ephantiasis).

**پێـخـواس** (ئان. ل)[پێ1 + خـواس] [باک: پێخواس، پێخاس ـ ناو: پێخواس، پێخاوس] ١ـ مرۆی بێ پێڵاو، کەسێک کە لـە کـــاتـی ڕۆیشـتن دا کــــەوشـی دە پێ دانـەبێ، پـاپـەتـی، پێــــپـــەتـی. ٢ـ وڵاغ و بارەبەرێک کە ناڵەکانی کەوتبێ و بێ ناڵ

بێ. ؛؛ جـا خـۆ ولاغ ئـەمن ناباتـەوە بۆ جێگای خۆم بەبێ ناڵی و بە پێخواسییە (لاس و خەزاڵ ل ١٣٢).

**پێخوس** (ئان. مـفـ.)[پێ1 + خوس] بڕ: پێخوست

**پێخوست** (ئان. مفـ.)[پێ1 + خوست (خـسـتـران)] هەرچێک کـە لە ژێر پێ شـێلدرابێ، ژێر پـێ کـەوتوو، پێـشـێل، پێخـوس، پامـاڵ. ~ **کردن:** ١ـ پێ لە سـەر نان و لە ژێر پێ پان کـردنەوە. ٢ـ (کنـ.) ڕەچاو نـەکردنی پەیمان و بـەڵێنی. & پاماڵ کردن، پێشێل کردن.

**پێخولە** (ئان. ل)[پێ1 + خول + ئە] منداڵی سـاوا کـە تازە پێی هەڵگرتبێ و باش بڕوا، پێڕۆکە، پێڕەوکە. ~ **بوون:** پێ هەڵگرتنی منداڵ، پێڕۆکە بوون.

**پێخـوێ** (نا. ل)[پێ1 + خـوێ] ١ـ کڵۆشی بە پێ گێرەکراو. ٢ـ ئەندازەیەک قوڕ بۆ ڕۆژە سـواغێک. & پـاخـوا. ~ **کردن:** ١ـ گێرە کردنی کلۆش بە پێ. ٢ـ (کنـ.) پارە بە کـەسـێک خـەرج کـردن، کەسێک تووشی خەرج کردن. ؛؛ لەو بێ پووڵییە دا هەزار تمەنیان پێخوێ کردم.

**پێخـۆر** (نا. ل)[پێ3 + خـۆر (خواردن)] ١ـ هەر خواردنێک کە بە نان دەیخـۆن بە تایبـەت خـواردنی سـووکی وەک پەنیر، کەرە. ؛؛ نان و پێخۆری خۆم پێـیـە، منەتی کـەس ناکـێـشم. ٢ـ بە ئەندازە، کـەم کـەم. ~ **پێکردن:** بە ئەندازە خـواردن، بـە قـەرا پێـویست خـواردن، دەست پێوە گـرتن. ؛؛ ئەو دوو کیلۆ گـۆشـتـە پێـخـۆری پێبکەن هەتا مـانگێکی دیکە چاوتان بە گـۆشـتـی ناکەوێتەوە.

**پێخۆش** (ئان. ل)[پێ3 + خۆش] ١ـ دەگـەڵ نـاو دێ و مـانـای پێـخـۆش بوون دەدا. ؛؛ نان پێخۆش، گەڕان پێخۆش، دڵ پێخۆش. ٢ـ (کنـ.) ژن یا کـیژێک کـە گانی پێخۆشە، گان پێخۆش. ~ **بوون:** ١ـ شـاد بوون، خـۆشـحـاڵ بوون بـە کـەسـێک یا شـتـێک و مـەسـەلەیەک. ٢ـ کەیف پێ هاتن بە چێژ (خواردن، دیتن، بیـسـتن یا بابـەتێکی دیکـەی چێـژ وەرگرتن.) ؛؛ کفتەم زۆر پێخۆشە. شەڕم پێخـۆش نیـە. ~ **بوون و پێ ناخـۆش بوون:** (کنـ.) جـەبر و ئـەنجـام دان یا سـەرگـرتنی کـارێک بـە هـەر جـۆرێک. ؛؛ پێتخـۆش بێ یا پێتناخـۆش بێ ژنت بۆ دێنین. ئەو سـەفـەرەمان هـەر دەبێ دەگەڵ بکەی جا چ پێتخـۆش بێ و چ پێتناخۆش بێ. ~ **کردن:** خۆشحـاڵ کردن، شـاد

کردن. ⁙ دوژمن بە خۆت خۆش مەکە!

**پێخۆشحاڵ** (ئان. ل)[پێ3 + خۆشحاڵ] حاڵی کەسێک کە بە مەسەلەیەک خۆشحاڵە. **~ بوون:** دڵشاد و شاد بوون بە بیستنی رووداوێکی خۆش یا دیتنی کەسێک. ⁙ زۆر پێخۆشحاڵم کە بوویە جیرانم.

**پێخەسوو** (نا. ل)[پێ + خەسوو] ئافرەتێک کە بە پارە کار دەکا، هەمیشە دەگەڵ بووکە و کاروباری بووک هەڵدەسوورێنێ و دەگەڵ بووک دەچێتە ماڵی زاوا، بەربووک، پاخەسوو، پاوەوی، پاوەوە، پاوەیوە.

**پێخەف** (نا. ل)[ پێ3 + خەف (خەفتن)] ١ـ نوێن و بانی خەو. ٢ـ لێفە یا پەتوو کە بە خۆ دادەدرێ.

**پێخەنین** (چا. ل)[پێ3 + خەنین] بڕ: پێکەنین.

**پێدا**[1] (پێشـ. ل) پێشگرێکی لێکدراوە لە " بە ... دا " کەوتوە هەر بەم مانایە، پیا. ⁙ پێدا چوون، پێدا بردن. پێدا کەوتن.

**پێدا**[2] (نا.)[زا] بڕ: پەیدا

**پێدا بردن** (چا. م)[پێدا1 + بردن] کەسێک دەگەڵ خۆ بە شوێنێک دا بردن.

**پێداچوون** (چا. ل)[پێدا1 + چوون] بە شوێنێک دا رابوردن.

**پێداچوونەوە** (چا. ل)[پێدا1 + چوونەوە] ١ـ سەر لە نوێ بە نووسراوە یا حیساب دا چوونەوە بۆ دڵنیا بوون لە دروستی و راستی. ٢ـ بەراورد کردن و هەڵسەنگاندنی وەرگێڕاوێک دەگەڵ زمانی ئەسڵی. ٣ـ گەڕانەوەی بە شوێنێک یا رێگایەک بۆ دیتنەوەی شتی ونبوو یا بۆ مەبەست دیکە. ٤ـ بە مەکینەی دروون بە سەر دروومان دا هاتنەوە بۆ قایمتر بوون. & پێدا هاتنەوە، پیاهاتنەوە، پیاچوونەوە.

**پێدادان** (چا. م)[پێ3 + دادان] ١ـ سەرپۆش یا لێفە بە سەر دا کێشان. ٢ـ داپۆشینی سەری هەر شتێک. ٣ـ هێرش بردنە سەر دوژمن. ٤ـ بە کۆمەڵ چوونە شوێنێک بۆ میوانی بێ ئەوەی بانگێشتن کرابن. ٥ـ بەرد یا هەر شتێکی دیکە بە کەسێک یا بە شوێنێک دادان. ⁙ بەردێکی پێدادا و سەری شکاند. ٦ـ چارشێو، لەچکە و هەر شتێکی دیکە بە سەر خۆ دادان. ⁙ چارشێوەکەت پێدادە با بڕۆین. & پیادان

**پێـــــداره** (ئا.)[پـێ1 + دار + ئه] ئێـــســــقـــانێکه بـه دهم قـــۆڵ و رانـی گـیـاندارەوه وەکـوو چاکڵـه (چەڵەمـه)یه (کشت و کاڵ ب ١ ل ٧٤).

**پێـــدارشـــانەوه** (چا. م)[پێـــدا1 + رشانەوه] رشانەوه به سەر کەسێک دا.

**پێدافسین** (چا. ل)[پێدا1 + فسین] پەڕینی کەڵەباب بۆ سەر مامر بۆ جووت بوون و فس خـواردنی مـریشک له بەری، پیاتسان، پیاتسین.

**پێداکردن** (چا. م)[پێدا1 + کردن] ١ـ هەڵاوەسین. ⁝⁝ جلەکـانی پێــدا کــرد و هاتەوه. (به تـەنافـەوه). ٢ـ هەر شـتـێکی ورد به کــەســێـک یا شــتــێک داکــردن، پێوەرکردن. ٣ـ هەڵقورتاندن، خواردنەوه به یەک پشوو. ٤ـ ئاو یا ئاوەکی به سـەر کەسـێک یا شتـێک داکردن، بـه سـەر دا کردن. & پیا کردن

**پێداکەوتن** (چا. ل)[پێدا1 + کەوتن] به ســـەر کــەســێک دا چوون، له نـەکـاو تووش هاتن و غافڵ کردنی کەسێک. ٢ـ به بێ ویست و له نەکاو تووشی شوێنێک هاتن. ٣ـ شـتـێک له بەرزیەوه به ســـەر لەش و گیان داکەوتن ٣ـ دەوڵەمەند بوون لـه پڕ، بـه ســــەر مــــاڵ و پارەیەکی زۆر داکەوتن.

**پێـــداکـــێـــشـــان** (چا. م)[پێ3 + داکێشان] ١ـ داکەندنی به زۆری پاتۆڵ یا شاڵواری کەسێک بۆ تەجاوز پێکردن. ٢ـ به سـەر دادانی پەتوو یا هەر شـتێکی دیکه به ســەر کــەسـێک یا شــتـێک دا، پێدادان. ٣ـ به دار یا ئامـرازێکی دیکەی لێدان توند له کـەسـێک راکـێـشـان، لێ راکێشان.

**پێداگۆژی** (نا.)[فەر: pedagogie] زانستی بارهێنان و پێگەیاندنی منداڵ.

**پێداڵ** (نا.)[فەر: pedale] ئامێرێکه له مـاشـێن یا دووچەرخـه دا کـه پێی له ســـەر دادەگـرن یا دادەنێن. || **پێـداڵی دووچەرخـه:** ئامــرازێکه وەک رکـێف له دووچەرخـه دا که پێی له سـەر دادەنێن و به پـێ لێـــدان و ســـووڕانی دووچـەرخـــه وەڕێ دەکەوێ. **پێداڵی گاز:** ئامێرێکه له مـاشـێن دا کـه له ژێر پـێی شـوفـیره و به پێ داگرتن یا هەڵگرتن توندیی ماشـێنی پێ زیاد و کەم دەکردرێ.

**پێدان** (چا. م)[پێ3 + دان] ١ـ دان به کـەسـێک. ⁝⁝ دوو تمەنم پێـدا و ڕۆیشت. چایەکم پێبده! ٢ـ مەبەسـتێک به کەسێک راگـەیاندن. ⁝⁝ خـــەبەر پێـدان، جــوێن

پێدان.

**پێـــداویست** (نا. ل)[پێـدا + ویست] بڕ: پێویست

**تێبینی:** هەر ئەوجۆرەی پێـویست لە چاوگی پێ ویستن کەوتوە، پێداویستیش دەبێ لە چاوگی پێـداویستن کــەوتبێ کەچی وەها چاوگێکمـان لە کـوردیی دا نیە.

**پێداویســتیی** (حم.)[پێـداویست + ئیی] بڕ: پێویستی

**پێـداهاتن** (چا. ل)[پێـدا + هاتن] ١ـ بە شـوێنێک دا ڕۆیشتن و تێـپـەڕین. ⁘ کـــاروان بێـــرە دا هـات و تێـــپـــەڕی. کـۆڵانەکـانی ئەم شـــارە ناناسم قـەت پێـــیـــاندا نەهـاتووم. ٢ـ جـــووڵانـەوە و بزووتنێک لـە ســـــەرە بۆ خـــوار یا بە سەرتاپا دا. ⁘ مچوڕکێکم پێداهات. ژان و برکـێکم بە کـەلەکـەی داهـات. دوژمن پێـــداهاتـە خـــوار و چی نـەهێـــشـت. & پیاهاتن

**پێداهاتنەوە** (چا. ل)[پێدا + هاتنەوە] بڕ: پێدا چوونەوە.

**پێــدزکێ** (ئاک. ل)[پێ1 + دز + کێ] بڕ: پێدزە

**پێدزە** (ئاک. ل)[پێ1 + دز + ئە] خـۆ دوور کردنەوە بە دزی و نەهێـنی، هەنگاو شل کـردنەوە لە کـۆمـەڵ و کـەسـانێک بۆ خـــۆ دزینـەوە، پێـــدزەکـێ، پێـــدزیـڵکـە، پێدزکێ، پاچرکێ.

**پێـــــدزەکێ** (ئاک. ل)[پێ1 + دز + ئەکێ] بڕ: پێدزە

**پێـــدزیـڵکە** (ئاک. ل)[پێ1 + دز + ئیـڵکە] بڕ: پێدزە ⁘ کەڵەباب لە ترسـان هەر پێدزیڵکەی بوو ... (مان ل ٦)

**پێـدەشت** (نا. ل)[پێ1 + دەشت] ئەو شـوێنـەی کە دەشت و کێو دەگـەنە یەک، دەشـــتـــایی بنـاری چیـــا، پادەشت، پاچەکوو.

**پێر**[1] (ئاک.) بڕ: پێرێ

**پێر**[2] (نا.)[زا] بڕ: پێرد

**پێــرار** (ئاک. ل)[پێـر1 + ئار][تات: پیرارە ـ فار: پیرار ـ بیر: پێرار ـ گیل: پیـــلار. باک: پێـــرار ـ ناو: پێـــرار ـ زا: پیرار، پێرار] ساڵی بەر لە پار، دوو ساڵ بەر لە ئێمساڵ، پێرارەکە، پێرارەکانێ.

**تێـــــبـــــینی:** ئار لە یار yār ـ ی ئەوێستـایی و هەخـامـەنشی بە مـانای ســاڵ کــەوتوە کـە هاوتا و هاوڕیشـــەیە

دەگەڵ year ـ ی ئینگلیسی و ئۆر år ـ ی سـویدیی و هەندێک لە زمانەکانی دیکەی ئەورووپایی هەر بەو مانایە.

**پێرارەکانێ** (ئاک. ل)[پێرار + ئەک + ئانێ] بڕ: پێرار

**پێرارەکە** (ئاک. ل)[پێرار + ئەکە] بڕ: پێرار

**پێرد** (نا.)[هیک: پیتەر ـ ئەو: پیتەر ـ هەخ: پیتەر. زا: پی، پێر، پێرد] باوک، باب.

**تێبینی:** ئەم وشە بە تەنیا لە نێو زاراوەکانی دیکە دا نەماوە و تەنیا زازاکان ئەم وشەیان پاراستوە، کەچی لە هەندێک وشەی تێکەڵاوی زاراوەکانی کوردیی دا ئەم وشە هێشتا ماوە. ⁘ باوەپیارە، باپیر

**پێرست** (نا.)[فار: فهرست ـ پەش: فیهریست. باک: پێرست ـ ناو: پێرست] ریزی یەک لە دوای یەکی ناو یا مەبەستی کتێبێک یا نووسراوەیەک کە لە پێش یا لە دوایی کتێب ریز دەکرێ و نیشان دەدا کە ناوەرۆکی کتێبەکە لە چی پێکهاتوە.

**پێرگین** (نا.)[بڕ: پیر2][باک] پیر، پێشواز

**پێروو** (نا.)[سوغ: پەرووی ـ پەه: پەرڤیچ. پەش: پێرۆنە ـ بەل: پەنوەر ـ فار: پەروین. باک: پێروو ـ ناو: پێروو، پێرۆ] کۆمەڵە ئەستێرەیەکن، کە وەک هێشوو لە یەک کۆ بوونە و تەنیا شەشیان بە چاو دەبیندرێ، ئەستێرەی کۆ. (عەر: ثریا)

**پێرووز** (ئان.)[باک] بڕ: پیرۆز

**پێرەشەو** (ئاک. ل)[پێرە (پێرێ) + شەو] بڕ: پێرێشەو

**پێرەکە** (ئاک.) بڕ: پێرێ

**پێری** (نا.)[باک ـ زا] بڕ: پەری

**پێرێ** (ئاک.)[هیک: پەرە ـ ئەو: پەرۆ، پەریی ـ هەخ: پەرەنە ـ پەه: پەرێر. تات: پەریرە ـ فار: پریر ـ بەل: پەرێری. باک: پێر ـ ناو: پێر، پێرێ ـ زا: پەرەی] دوو رۆژ بەر لە ئیمرۆ، رۆژێک بەر لە دوێنێ، پێرێکە، پێرێکانێ، پێرەکە.

**تێبینی:** وشەی پێرێ لە دوو بەشی [پێر + ئەیەر] پێکهاتوە. پێر لە ئەوێستایی پەئۆئورڤا paourva و هەخامەنشی پەرئوڤە paruva بە مانای پێش، بەر. هەروەها ئەیەر لە ئەوێستایی ئەیەر ayar بە مانی رۆژ کەوتوە و لە کوردیی ئیمرۆ دا ئەم وشەیە

نەماوە و تەنیا سواوەکەی بە شێوەی (ئێ) خۆ دەنوێنێ.

**پێرێشەو** (ئاک. ل)[پێرێ + شەو] دوو شەو لەمەوبەر، شەوێک بەر لە دوێشەو، پێرەشەو.

**پێڕا** (پێشگـ. ل)[پێ3 + ڕا] پێشگرێکی لێکدراوە.

**پێڕابواردن** (چا. م)[پێ3 + ڕابواردن] ڕابواردن و گاڵتە کردن بە کەسێک، فشە بە کەسێک کردن.

**پێڕاسپاردن** (چا. م)[پێ3 + ڕاسپاردن] ١ـ بە ئەمانت سپاردنی ماڵ یا کەس و شتێک بە کەسێکی جێی بڕوا. ٢ـ گەیاندنی قسە و هەواڵی کەسێک بە کەسێکی دیکە.

**پێڕاگەیاندن** (چا. م)[پێ3 + ڕاگەیاندن] گەیاندنی هەواڵ و خەبەر و مەسەلەیەک بە کەسێک. ∷ دەزانم سبەی داوەتەی برایمە پێیانڕاگەیاندووم.

**پێڕاگەیشتن** (چا. ل)[پێڕا + گەیشتن] ١ـ کات و ماوە هەبوون بۆ ئەنجام دانی کارێک. ∷ ئیمڕۆ پێڕاناگەم تەواوی کتێبەکە بخوێنمەوە. ٢ـ ئاگا لێبوون و چاوەدێری کردن. ∷ ئەو ژنەی من هەر بە منداڵەکانی ڕاناگا.

**پێڕۆ**[1] (نا.) بڕ: پێڕوو

**پێڕۆ**[2] (نا. ل)[پێ1 + ڕۆ4] کوللەیەک کە هێشتا باڵی دەرنەهاتوە، پێکوڕە.

**پێڕۆکە** (ئان. مفـ.)[پێ1 + ڕۆ4 + کە] منداڵێک کە بە تەواوی پێی هەڵگرتوە و باش دەڕوا، پێڕەوکە، پێڕەوک، پێخولە. ~ **بوون:** پێ هەڵگرتن، وەڕێ کەوتنی ساوا.

**پێڕەوک** (ئان. مفـ.)[پێ1 + ڕەو + ک] بڕ: پێڕۆکە

**پێڕەوکە** (ئان. مفـ.)[پێ1 + ڕەو + کە] بڕ: پێڕۆکە

**پێز**[1] (نا.)[؟] ١ـ کێش، کەش. ٢ـ توانا، تاقەت. ٣ـ نێوەڕۆک، ماک. **بە ~ بوون:** ١ـ کێش هەبوون، بە تاقەت بوون. ∷ ئەو هەویرە زۆر بە پێزە چاک کێش دێنێ. ٢ـ پڕ نێوەڕۆک بوون، پوخت بوونی وتە و نووسراوە. ~ **مان:** توانایی هەبوون، هێز و تاقەت هەبوون.

**پێز**[2] (نا.)[باک] بڕ: پەز

**پێزان** (ئان. فا)[لە: پێزانین] کەسێک کە چاکەی دە چاو دابێ، کەسێک کە سپڵە نەبێ، ئەمەگدار، بە ئەمەگ.

**پێزانین** (چا. ل)[پێ3 + زانین] ١ـ

جـێگا و شـوێنی شـتـێک زانین، شـارەزا بوون بـە ڕێگا یا شـوێنی جـێگایەک. ٢ـ ئەمـــەگ دە چاو دابـوون، چاکـــە دە چاو دابوون، سپڵە نەبوون.

**پێــزەوەنگ** (ئان.)[باک: پێـزەوەنگ، پـەزەوەنگ ـ زا: پێـــزەوەنگ] گـــەواد، قورمساغ.

**پێـژ** (ر.)[لە: پێـژتن] ١ـ ڕەگی چاوگی پێژتن. ٢ـ بە ناوەوە دەلکێ و ناوی فاعلی ساز دەکا، پەز2. ؞ ئازپێژ، خشت پێژ، نانپێژ.

**پێژان** (چا. م) بڕ: پێژتن

**پێژتن** (چا. م)[ئێک: پەک ـ ئەو: پەک. پەه: پـەچیـیـتـەن. ڕوس: pech. فـار: پختن ـ تات: بێپێتـەن ـ بیر: پۆختـەن ـ گیل: پوتەن، پەتەن، پەختـەن. باک: پاتن، پژانـدن ـ ناو: پێـژتن، پێـژان] ١ـ سـاز کـردنی چێشت لە سـەر ئاگـر. ٢ـ سـاز کـردن و بـرژاندنی نان لـە تەندوور دا. ٣ـ پێگەیاندن و سـوور کـردنەوەی خـشت لە کوورە دا.

**پێژە** (نا. ل)[پێ1 + ژە] بڕ: پەیژە

**پێس** (نا.) بڕ: پێست

**پێــست** (نا.)[ئـەو: پەســتــە ـ پـەه: پۆست، پووست. لۆر: پوس ـ گیل: پوش ـ فـار: پوست ـ پەش: پۆست ـ بیـر: پوس. باک: پۆست ـ ناو: پێست، پێس، پۆست، پۆس ـ هەو: پـۆس، پۆست ـ زا: پۆسـتـە] ١ـ توێژی نـاسکـی ســـەر گـــۆشت و ماسوولکەی لەش کە کاری هەست کردن بە سەرما و گەرما و ئێشە. ٢ـ توێکڵ. ٣ـ کـەوڵ. ٤ـ چەرم. **~ کـردن:** ١ـ توێکڵ کـردن ٢ـ کـەوڵ کـردن. **~ هەڵکەندن (هەڵقەندن):** ١ـ کەوڵ کردن، لێکردنەوەی پێـسـتی لەش. ٢ـ هەڕەشـە لە منداڵ یا کـەسی دیکە بۆ تێـهـەڵدانێکی قـورس. **~ی بێعـاریی بە ڕووی خۆ دا کێشان:** (کنـ.) بێــشـــەرمی کــردن، بێــعـــاری کردن. **~ی کەسێک لە دەباغی نەهاتن:** (کنـ.) هیـوای خێـر لە کەسـێک نەبوون، خێر پێنەگەیشتن لە کەسێک، بێکەلک و فـایدە بوونی کـەسـێک. **لە ~چوونە دەرەوە:** بڕ: لە پێست دەرچوون. **لە ~ دەرچوون:** تووڕە بوون و هیچ پێنەکـران، زگ دان، لە پێست چوونە دەرەوە. ؞ لە داخ ئەو کـوڕە بێ گـوێیـەم وەختـە لە پێست دەرچم. || **پێستی سەر:** (ئا.) ئەو بەشە پێستەی کە بە سەر کاسەی سەر دا کشاوە، پێستە سەر. ***پێستی سەری کـەسێک بە لەعنەت کـردن:** (تووک) بە

لەعنەت کــردنێکی هەندێک ســووک لە کـــاتی جنێـــو دان و تووک لێکردنــی کـەســێک. ⁝⁝ دەک پێــستــی ســەرت بە لـەعـنـەت بـێ رۆڵـە ئـەوە تـۆ بـۆ هـێـنـدە بەدفـەڕی! & پێستـەسـەری کەسـێک بە لەعنەت کردن. ***پێستی سەری کەسێک هەڵکەندن (هەڵقــەندن):** ١ـ لێکردنەوەی پێسـتـە سـەری کەسێک هـەتا بە ئێش و ئـازارەوە بمرێ. ٢ـ (هــەڕەشـــــــە) بـۆ هەڕەشـە کـردنی لێدان و تێـهـەڵدانێکی قـــورس لـە کـــەســـێک دەردەبڕدرێ. & پێـــســـتـــەســـەری کـەســێک هـەڵکەندن (هەڵقــەندن) ***کــا دە پێــســتــی ســەری کەسێک ئاخنین:** ١ـ لێکردنەوەی پێستە ســەری کــەســێک و کــا تێ ئاخنین بۆ چاوترسێن کردنی خەڵک لە سەربزێوی و ڕاپەڕین و ... ٢ـ (هەڕەشــە) هەڕەشـــەی تەمێ کردن و سزا دانێکی قورس. & کا دە پێستەسەری کەسێک ئاخنین.

**پێـسـتـە** (نا. ل)[پێست + ئە] کەوڵی لێکراوەی حــەیوان. **~ خـۆش کـردن:** خۆش کردنی کەوڵ، لە دەباغ دان.

**پێستەسەر** (ئا.)[پێست + ئە + سەر] بەشـێ پێـــست کــە کـــاســـەی ســـەری داپۆشیوە، پێستی سەر. ***پێستەسەری کـەسـێک بە لەعنەت کـردن:** (تووک) بڕ: پێـــستی ســـەری کـەسـێک بە لەعنەت کردن ***پێستەسەری کەسێک هەڵکەندن (هەڵقەندن):** بڕ: پێستی سەری کەسێک هەڵکەندن. ***کا دە پێستە سەری کەسێک ئاخنین:** بڕ: کا دە پێستی سەری کەسێک ئاخنین.

**پێسیر** (نا.)[؟][باک] یەخە، بەرۆک.

**پێش** (ئاک.)[ئەو: پەئیـتـیش ـ هەخ: پـەتـیش ـ پـەه: پـێـش] ١ـ ئـاوەڵـکـاری زەمـــانە هـاومـــانا دەگـــەڵ بـەر٣/3. ٢ـ ئاوەڵکاری جێگایە هاو مـانا دەگـەڵ بەر ٤/3. ٣ـ بڕ: بەر ٥/3. ٤ـ (نا.) هەر کام لە چوار ددانـی پێشـەوەی مـرۆڤ کـە لە مـــرۆڤ دا بە گـــشـــتـی لە هـەشت ددان پێکهـــاتوون. **بردنە ~:** ١ـ بۆ پێش بردنی کەسێک یا شتێک. ٢ـ سەرکەوتن، پێـــشکەوتن لە ئەنجـــام دانـی کـــار و مـەسـەلەیەک. **~ پێگرتن:** سـەر ڕێگای کـەسـێک گـرتن بە نیـازی شـەڕ، پێش لێگرتن. ٢ـ بەری ڕۆیشـــــتنی ئاو یا گـــیـــانلـەبەرێکی دیکە گـــرتن بۆ نەڕۆیشـتن. **~ خـــستن:** بڕ: وەپێش خـسـتن. **~ دەرک پێگرتن:** بەر دەرکی کـەسـێک گـرتن بـە نیـازی شـەڕ **~ کـەوتن:** ١ـ تەرەقی و پێشکەوت لە کـار دا. ٢ـ چوونە پێش نۆرەی کـــەســـێکی

دیکە. ٣ـ لە پێشەوەی خەڵک ڕۆیشتن. ٤ـ سەرۆکایەتی و پێشەنگی کارێک وە ئەستۆ گرتن و خەڵک هان دان بۆ ئەم مەبەستە، هان دان و دنە دان. & وەپێش کەوتن. **~ گرتن:** ١ـ بەری پەرەسەندنی ڕووداوێک گرتن. ٢ـ بەری کەسێک گرتن، پێش پێگرتن. ٣ـ بەری شتێک گرتن. ⁘ پێش ئاوەکەی بگرە با نەڕوا. **~ گیران:** بەر گیران لە لایەن کەسێکەوە یا شتێکەوە بۆ هەر مەبەستێک، پێش گیرسان. **~ گیرسان:** بڕ: پێش گیران. **چوونە ~ :** ١ـ بۆ لای پێشەوە چوون. ٢ـ جێبەجێ بوون و پێش کەوتنی کار و مەسەلەیەک. **خستنە ~ :** وەپێش خستن، پێش خستن، وە پێش دان. **کێشانە ~:** لە بەر دەم دانان. ⁘ قابڵەمە یاپراغەکەی کێشا پێش من و خۆی و پێکەوە تەقەمان لێهێنا. **لە ~بوون:** ١ـ شتێک یا کەسێک لە بەرەوە بوون. ٢ـ پێشتر بوون لە کایە و یاری و کێبەرکێ دا. ⁘ دوو هیچ ئێمە لە پێشین. **لە ~ دانان:** ١ـ شتێک لە بەر کەسێک نان. ⁘ دەفتەرەکەی لە پێش مامۆستا دانا. ٢ـ پێشنیار پێکردن. ⁘ دوو ڕێگام لە پێش دانا هەر کامەیانم بە قسە بکا ئەوە سەردەکەوێ دەنا هیچ. & لە پێش نیان. **لە ~ نیان:** بڕ: لە پێش دانان. **هێنانە ~:** ١ـ کەسێک یا شتێک بە تەواوی لە خۆ نزیک کردنەوە، کێشانە پێش. ⁘ قاپە میوەکەی هێنایە پێش و هەمووی خوارد! ٢ـ هێنانە گۆڕی باس و مەسەلەیەک. ⁘ باسێکی وای هێناوەتە پێش کە ناچارم قسەی لە سەر بکەم. **وە ~ خستن:** ١ـ بەرەو پێش بردنی کارێک. ٢ـ کەسێک وە پێش خۆ دان. & پێش خستن، خستنە پێش، وەپێش دان. **وە ~ دان:** بڕ: وەپێش خستن. **وە ~ کەوتن:** بڕ: پێش کەوتن.

**پێشات** (ئان. مف.، نا. ل)[پێش + هات] بڕ: پێشهات. ⁘ ئەمن باوەڕیم هەیە هیچ پێشاتێک بەبێ قەڵەمی هەق، دەستی ئیلاهی نایە و ڕانابری (سەعید و میرسێوەدین ل ٢٣٢).

**پێشاپێش** (ئاک. ل)[پێش + ئا + پێش] بڕ: پێشاوپێش

**پێشان** (ئاک. ل)[پێش + ئان] لە پێش دا، پێشەکی، سەرەتا. ⁘ پێشان بە هومێد و شاد و خۆشین/ پاشان لە دەسی زوخاو دەنۆشین (مەم و زین ل ٣٢٣).

**پێشاو** (نا. ل)[پێش + ئاو1] ١ـ

شـــــوێنـی دەست بـە ئـاو گـــــەیـانـدن، ئاودەســـتـخـانە، ئـاوخـانە، ئەدەبخـانە، ئاودەست. ٢ـ میز، گمێز.

**پێشاوبڕکە** (نا. ل)[پێش + ئاو + بڕ + کـە] بڕ: پێـشـبـڕکـە. ~ **دان:** بڕ: پێشبڕکە دان.

**پێشاوپێش** (ئاک. ل)[پێش + ئاو + پێش] ١ـ لای پێشەوە، بەرانبەر. ⁘ ئەمن زەینی خـۆم دەداوە ئەو مـاڵ و مـەڕەکـەی کاکـە سـەیدەوانـی/ هەڵیدەدا لە تیلەگی دە کوێستانێ، بەرانبەر و پێشاوپێش بە گـــۆمـــــە دەڵاوێ (گـــەنج ل ٢٤١). ٢ـ پێشەکی، بەر لە هـەر شتێک، لە پێش دا. & پێشاپێش

**پێشاهەنگ** (نا. ل)[پێش + ئاهەنگ] بڕ: پێـشـەنگ. ⁘ وزان نە گـەردەن بەرز پێشاهەنگ/ بشۆ بدۆ دەنگ فرسەنگ وە فرسەنگ (مەولەوی ل ٥٠٢).

**پێشبار** (نا. ل)[پێش + بار1] کەل و پەل و کـەرەسـەی پێـویستی هەوارچیان کە زووتر بەڕێی دەکەنە هـەوار هەتا بەر لە گەیشتنی وان دایمەزرێنن.

**پێشبڕکە** (نا. ل)[پێش + بڕ + کە] ڕێگای کورتتر بۆ پێشـەوە، پێشاوبڕکە. ~ **دان:** بـە لاڕێ دا ڕۆیشـتن و وەپێش کەسی دیکە کەوتنەوە.

**پێشبەست** (نا. ل)[پێش + بەست] بەرهەڵستی بەر ئاو، ئاوبەند، بەربەست.

**پێشبەن** (نا. ل)[پێش + بەن] بڕ: پێشبەند

**پێشبەند** (نا. ل)[پێش + بەند] ١ـ هەر پارچەیەک کە لە کـاتی کـار کردن یا نان دان بـە مـنداڵ بـەر و ســـــــینـگـی پـێ دادەپـۆشـن هـەتـا جل پـیـس نـەبـێ. ٢ـ زنجیر یا گوریسێک کە دەستی چواروێی پێ دەبەستنەوە. // پاشبەند، پێوەند. & پێشبەن

**پێشبین** (ئان. فـا)[پێش + بین2] کەسێک کە توانای دیتنی ڕووداوەکانی داهاتووی هەیە.

**پێشبینیی** (حم.)[پێشبین + ئیی] لێکدانەوە و دیاری کردنی ئەنجام و ڕوو دان و هاتنە دی ڕووداوەکـانی داهاتوو. (پێشبینیی دەتوانێ هەم پشتیوانەیەکی زانسـتـیی هەبێ و هەم هەر وا ئـاسـایی بێ. ماموەستایەک بە تێگەیشتنی وەزعی دەرسی شاگردێک دەتوانێ پێشبینی بکا کـە دەردەچێ یان نـا، یان دوکـتــورێک هەست دەکا نەخۆش چاک دەبێتەوە یان نا، کەچی پێشبینیی ئاسـایی زۆرتر لە

باری ئەزموونەوەیە و دەتوانێ راست دەر نەچێ وەک ئەوساڵ باران زۆر دەبێ یان کەم، فلانی شوو دەکا یا نا، ئاکامی پەیوەندییەک بە کوێ دەگا، ...) **~ کردن:** ١ـ زانین و دیتنی هەواڵ و رووداوەکانی داهاتوو. ٢ـ دوارۆژ لەبەر چاو گرتن، ئاکامی کار و مەسەلەیەک لەبەر چاو گرتن. || **پێشبینیی بارودۆخی هەوا:** لێکدانەوەی چلۆنایەتی هەوا لە ماوەی رۆژ یا رۆژگەلی رابوردوو کە یانەی هەواناسی لەرادیۆ و تەلەویزیۆن و شوێنی دیکە بڵاوی دەکاتەوە.

**پێشپەردە** (نا. ل)[پێش + پەردە] بەشێکی کەم لە فیلمی سینەما، تەلەویزیۆن یان شانۆ کە بۆ رێکلام نیشان دەدرێ.

**پێشت** (نا.)[زا] بڕ: پشت1

**پێشتەماڵ** (نا. ل)[پێشت + ئە + ماڵ][باک] پشتەماڵ/٢.

**پێشتەماڵە** (نا. ل)[پێشت + ئە + ماڵ + ئە][زا] پشتەماڵ/٢.

**پێش جڵەو** (ئان. ل)[پێش + جڵەو] کەسێک کە جڵەو و هەوساری ئەسپ و ماین دەکێشێ، جڵەودار، جڵەوکێش.

**پێشخان** (نا. ل)[پێش + خان] بڕ: پێشخانە

**پێشخانە** (نا. ل)[پێش + خانە] ژووری بەر لە دیوی دانیشتن، ژووری کەوش داکەندن، پێشخان.

**پێشخزمەت** (ئان. ل)[پێش + خزمەت] کەسێک کە لە ماڵ یا یانەیەک خزمەتی کارمەند و یانەکە دەکا، خزمەتکار.

**پێشخزمەتیی** (حم.)[پێشخزمەت + ئیی] کار و پیشەی پێشخزمەت، خزمەتکاریی.

**پێشخوان** (نا. ل)[پێش + خوان] مێز و تەبەقی چووکی بەر دەستفرۆش کە وردەواڵەکانی لە سەر دادەنێ. ٢ـ بڕ: پنە

**پێشخۆریی** (نا. ل)[پێش + خۆر + ئیی][پەهـ: پەتیشخڤار] دەفرێکی لە دەوری هەندێک قووڵترە و بەر لە خواردنی چێشتی ئەسڵی، ئاش و سووپ یا شتی دیکەی تێدا دەخۆن. ٢ـ دەورییەکی چووک کە میوەی تێدا دەخۆن، پێشدەستیی.

**پێشدەستیی** (نا. ل)[پێش + دەست + ئی] ١ـ بڕ: پێشخۆریی. ٢ـ (حم.) زووتر چوونە پێش. **~ کردن:** وە پێش دەستی کەسێک کەوتن بۆ کارێک، وە

پێش کەوتن، دەست ڕەپێش خستن. ⁘ عەلی پێشدەستیی کرد و کارەکەی بۆ خۆی هەڵگرت.

**پێشڕۆ** (ئان. فا)[پێش + ڕۆ (ڕۆیشتن)] بڕ: پێشڕەو

**پێشڕەو** (ئان. فا)[پێش + ڕەو (ڕۆیشتن)] ١ـ ئەوەی کە لە پێشەوەی هەموان دەڕوا. ٢ـ پێشەوا، سەرۆک، سالار. ٣ـ پێشەنگی لەشکر و کاروان، سەرقەتار. ٤ـ پێشەنگی گەلە و ران، سەرگەلە، سەرجەلە، ڕەمکێش. ٥ـ پێشەنگی مەل و باڵندە، سەرقافڵە. ⁘ پێشڕەوی ئەوان داعبایانە چییە؟/ کۆترەگاگمێکی باڵ بە شۆڕاب وردە وردە لە پێشیان دەڕوا دەکاتەوە چینە (گەنج ل ٨٢). & پێشڕۆ.

**پێشفرۆش** (نا. چا)[پێش + فرۆش] کاری فرۆشرانی بەر و بەرهەم و حاسلات بەر لە گەیشتن. ~ **کردن:** فرۆشتنەوەی هەموو بەر و بووی زراعەت و بەرهەمی کار بەر لە گەیشتن یا تەواو بوونی کارەکە. ⁘ سێوەکانی ئەوساڵم هەر لە بەهارەوە پێشفرۆش کردوە.

**پێشفرۆشیی** (حم.)[پێشفرۆش + ئیی] کاری پێشفرۆش.

**پێشقەرەوڵ** (نا. ل)[پێش + قەرەوڵ] تاقمێک چەکدار کە لە پێشەوەی سپا دەڕۆن.

**پێشکار** (نا. ل)[پەه: پێشکار] ١ـ کاربەدەستی خان و ئاغا. ٢ـ نۆکەر. ٣ـ کڵفەت، قەرەواش. ⁘ هەرچیکی ژنە، پێشکاریان شەیتانە/ ئێستا چۆڕێکم ئاو ناداتێ ... (مان ل ٦٤)

**پێشکرێ** (نا. ل)[پێش + کرێ] پارە یا بەعییەک کە کاتی بەکرێ گرتنی ماڵ یا شتی دیکە دەدرێ بە خاوەن ماڵ هەتا لە دوایی تەواوی پارەکەی داتێ.

**پێشکڕ** (نا. چا)[پێش + کڕ (کڕین)] کڕینی بەروبوو و حاسڵ بەر لە پێگەیشتنی.

**پێشکۆ** (نا. ل)[پێش + کۆ1] ١ـ گۆپکەیەکە لە لای پێشەوەی زین کە لە کاتی سوار بوون دەستی پێوە دەگرن یا ئەوە کە دەستەجڵەوی پێدادەکەن، قەرپووز، قەلپووز، قەرپووس. ٢ـ هەرچی کە سوار لە پێشەوەی خۆی دابنێ.// پاشکۆ. & بەرکۆ.

**پێشکەش** (نا. چا)[پێش + کەش (کێشان)] ١ـ دیاری، خەڵات، پێشکێش. ٢ـ بێبایخ، ناقابیل، خۆڕایی. ~ **بوون:**

ناقابیل بوون. ؛؛ ئەو کراسە هەر دەبەر تۆ دا جوانە، پێشکەشت بێ هەڵیگرە. **~ کردن:** ١ـ دانی خەڵات یا دیاری بە کەسێک. ٢ـ بەخشین بە دڵەوە.

**پێشکەوت** (نا. چا)[لە: پێش کەوتن] ١ـ چوونە پێش و پێش کەوتن لە باری کاروبار ومەسەلەیەکەوە. ؛؛ خەریکی کار و کاسبیم بەڵام پێشکەوتێکی زۆرم نەکردوە. ٢ـ چوونە پێش و پێش کەوتن لە باری زانستییەوە.

**پێشکەوتوو** (ئان. مف.)[لە: پێش کەوتن] ١ـ کەسێک کە لە باری بیر و زەین و ئاگادارییەوە لە چاو خەڵکی ئاسایی لە پێشترە. ٢ـ وڵات و کۆمەڵگایەک کە لە باری زانستەوە لە وڵات و کۆمەڵگاکانی دیکە لە پێشترە. // دواکەوتوو.

**پێشکێش** (نا. چا)[پێش + کێش] بڕ: پێشکەش

**پێشگر** (نا. ل)[پێش + گر (گرتن)] ١ـ بەرهەڵست و لەمپەر لە بەر شتێک، پەرگر، پێشگیر. ٢ـ ئامرازێکی ڕێزمانە کە بە تەنیا مانایەکی وەهای نیە و لە پێشەوەی وشە یان چاوگ دێ و ئاڵوگۆڕێک لە ماناکەی دا پێکدێنێ. // پاشگر.

**پێشگریی** (حم.)[پێشگر + ئیی] بەرگریی، پێشگیریی. **~ کردن:** بەر گرتن لە کەسێک یا مەسەلە و ڕووداوێک، بەرگریی کردن، پێشگیریی کردن.

**پێشگۆ** (ئان. فا)[پێش + گۆ] کەسێک کە ڕووداوەکانی داهاتوو پێش بینی دەکا و بەر لە ڕوودان دەیڵێ.

**پێشگۆیی** (حم.)[پێشگۆ + ئیی] کار و پێش بینی پێشگۆ. **~ کردن:** پێش بینی کردن و کوتنی ڕووداو بەر لە ڕوو دانی.

**پێشگیر** (نا. ل)[پێش + گیر (گرتن)] بڕ: پێشگر/١

**پێشگیریی** (حم.)[پێشگیر + ئیی] بڕ: پێشگریی. **~ کردن:** بڕ: پێشگریی کردن. ؛؛ ئەگەر خەزاڵ کۆمەک نەکا و لەو لەشکرە نەکەن پێشگیرییە/ وەبزانێ لە ماڵە بابی دادەنیشێ بە سەری بەتاڵ و بە ملی بە کوێن و بە خەمناکییە (لاس و خەزاڵ ل ١٤٦).

**پێشماڵ** (نا. ل)[پێش + ماڵ][باک] پشتەماڵ/٢.

**پێشمامان** (نا. ل)[پێش + مامان]

ژنی بەردەست و یاریدەدەری مـامـان لە کاتی زان دا.

**پێشمەرگە** (نا. ل)[پێش + مەرگ + ئە] چەکداری هێزەکانی رزگاریخـواز، پارتیـزان. **~ بوون:** چەکـدار بوون، پێشمەرگایەتی کردن.

**تێبینی:** ئەم وشـە لە سـەردەمی کۆمـاری مـەهاباد لە جیـات سـەرباز هەڵبژاردرا و برەوی سەندوە.

**پێشمەرگایەتی** (حم.)[پێشمەرگە + ئایەتی] کـار و ئەرکی پێـشـمـەرگـە، پێشمـەرگە بوون. **~ کردن:** چەکدار بوون، پێـشـمـەرگـە بوون لە هێـزەکـانی چەکداریی دا.

**پێشنوێژ** (نا. ل، ئان. ل)[پێش + نوێژ] مەلا یا کەسێکی دیکە کە لە کاتی نوێژی جەماعەت لە پێشەوەی نوێژکەران رادەوەستێ و نوێژ بەڕێوە دەبا، بەرنوێژ، وەرنما، ئیمامی جەماعەت. ٢- (ئاک.) کـاتی بەر لە نوێژی نیـوەڕۆ، بەر لە نیوەڕۆ. // پاشنوێژ. ٭ پێشنوێژێ دێم سەرێکتان دەدەم. ٣- (ئاک.) کاتی بەر لە نوێژەکانی دیکە. ٭ پێشنوێژی شێوان وەرە

**پێشنوێژیی** (حم.)[پێشنوێژ + ئیی] کار و ڕێبەرایەتی کەسی پێشنوێژ.

**پێشنووس** (نا. ل، ئان. مفعـ.)[پێش + نووس] نووسـراوەی سـەرەتایی بەر لە پاکنووس. پێشنووس کـردن: نووسـینی نووسراوە و نامـە و شتی لەم بابەتە هەتا هەڵەکانی دەرکەوێ و لە دوایی پاکنووس بکردرێ.

**پێشنیار** (ئان. مفـ.، نا. ل)[پێش + نی (نیان) + ئار4] ١- بیر و تەگبیری چاکە و خراپەی کارێک بەر لە ئەنجام دانی. ٢- بانگەواز بۆ ئەنجام دانی کار و مـەسـەلەیەک. & پێشنیـاز. **~ پێکردن:** ١- راگـەیاندن و را دەربڕینی چاکە و خراپەی مەسەلەیەک بە کەسێک. ٢- پێناسـاندنی کـەسـێک بۆ کـار یا خوازبێنی. ٭ پێشنیاری کچێکیان پێکردووم کە بیهێنم گۆیا زۆر کچی چاکە. **~ دان:** ١- پێشکەش کردنی را و تەگبیری مەسەلەیەک بە کەس یا شوێنێک، پێشنیار کردن. ٢- باس کردن و هێنانە گۆڕی مەسەلەیەک بۆ لێکدانەوە و شی کردنەوە. **~ کردن:** ١- باسی کردنی مەسەلەیەک بۆ لێکدانەوەی چاکە و خـراپەی بەر لە ئەنجـام دانی. ٢- پێشنیار دان.

**پێشنیاز** (نا. ل)[پێش + نیاز] بڕ: پێشنیار

**پێشواز** (نا. ل)[پێش + واز][فار: پیشواز ـ لۆر: پیشڤاز ـ کرم: پیشڤاز. باک: پێشواز ـ ناو: پێشواز ـ هەو: پێشواز] پیر، پێرگین، بەرەوپیر. **~ لێکردن:** بڕ: پێشوازیی لێکردن. ⁂ بەشی زۆری خەڵکی مەهاباد روویان لە گوندەکەی ئێمە کرد. بابم پێشوازێکی باشی لێکردن (تاریک و روون ل ١٩).

**تێبینی:** واز لە ریشەی ڤەز vaz ی ئەوێستایی کەوتوە (بڕ: باز 2 و 3).

**پێشوازیی** (حم.)[پێشواز + ئیی] ١ـ بەرەوپیر چوون. ٢ـ قەبووڵ کردن. **بە گەرمی ~ لێکردن:** بە گەرموگوڕیی قەبووڵ کردن و پێشوازیی لێکردن. ⁂ مەلانەبی بە پیریەوە چوو، کوتی: ئەوە خەزاڵم پێشکێش کردی، دوژمنی قەویت بۆ نەوی کردم. بە گەرمی پێشوازییان لێکرد (لاس و خەزاڵ ل ٦٠). **~ لێکردن:** ١ـ بەرەوپیر چوون و بەخێر هێنانی کەس یا کەسانێک کردن، پێشواز لێکردن. ٢ـ قەبووڵ کردن، وە خۆ گرتن و پەسند کردن. ⁂ چەندکەسی کورد و ئەرمەنی تێکۆشان لکی ئەو حیزبە لە موکریان دابمەزرێنن بەڵام خەڵک پێشوازیی لێنەکردن (تاریک و روون ل ٢٠).

**پێشۆر** (نا. ل)[پێ + شۆر] ١ـ لێواری سەر حەوز کە پێی لە سەر دادەنێن و دەیشۆن. ٢ـ (نا. چا.) شۆردنی پێ. **~ کردن:** شوشتن و تەڕ کردنی پێی کەسێک کە تاو و نۆبەتی هەیە بۆ دابەزینی پلەی گەرمای لەش.

**پێشوو** [1] (نا. ل)[پێش + ئوو] ١ـ دوو دەستەکانی ئەو گیاندارانەی لە سەر دەست و پێیان دەڕۆن، پێشی. // پاشوو، پێشی. ٢ـ (ئان.) زەمانی بەر لە ئێستا، زوو، قەدیم، پێشین.

**پێشوو** [2] (گیانـ.) بڕ: پەخشە

**پێشوولە** (گیانـ.)[پێشوو2 + لە] ١ـ جانەوەرێکی چووکە، جۆری زۆرە، دوو باڵی هەیە. مێشوولەی ئاسایی درێژ و باریکە، لووتێکی درێژی هەیە بۆ هەڵمژتن و شوێنی مژینەکەی لە سەر لەشی مرۆڤ خرووی دێنێ، تۆڤانە، مخک، مخمخک، مرمرک، پێشی، پێشیک، پێشیلک، پێشوو، مەلەشە، مەرەشە، مەرشە، مێشوولە. ٢ـ [باک] جۆرێک مێشوولەی وردە، رەنگی وەک

خۆڵە، پیس پێوە دەدا و شوێن و جێگای پێوەدانی زۆر دەخورێ، Phlebotomus ناوی لاتینی ئەم گیاندارەیە، ئاخیرک، ئاخویرک، ئاخورک، ئاخرکە، پینگۆک.

**پێشوو نەوی** (ئان. ل)[پێشوو1 + نەوی] ئەو گیاندارانەی کە دەستیان لە پێیان چووکترە وەک کەروێشک و مشک و کانگۆرۆ، پێشی نەوی ؛ کەروێشکی پێشوو نەوی.

**پێشهات** (ئان. مف.، نا. ل)[لە: پێش هاتن] رووداو یا مەسەلەیەک کە بە سەر کەسێک دادێ، مەسەلەیەک کە دێتە پێش، رووداو، کارەسات، پێشات.

**پێشە** [1] (نا.)[؟][هەو ـ ئەر] ١ـ بەشی رەقی نێو لەشی گیاندار کە ماسوولکە و گۆشت لە سەری خۆی راگرتوە، ئێسک، ئێسک، هێسک، ئێسقان. ٢ـ ناوک و دەنکی رەقی هەندێک میوە و بەر.

**پێشە** [2] (نا.) بڕ: پیشە

**پێشەخۆرە** (گیانـ.)[پێشە + خۆر + ئە][ئەر] بڕ: پیرۆزە

**پێشەسەر** (نا. ل)[پێش + ئە + سەر] ١ـ پێشەوەی سەر، شوێنی سەرەوەی نێوچاوان. ٢ـ خشڵێکی زێڕی ژنانە، کە لە سەری دەدەن، پووشین.

**پێشەقان** (نا.) بڕ: پیشک

**پێشەکی** (نا. ل)[پێش + ئەکی] ١ـ پارەیەک کە کڕیار بۆ بەڕێوە بردنی سەودا و مەعامەلەکەی بەر لەوەرگرتنی کاڵاکە دەیدا بە فرۆشیار. ٢ـ پارەیەک کە بەر لە کار دەدرێ بە کرێکار. ٣ـ سەرەتای کتێب و نووسراوە. ٤ـ (ئاک. ل) لە پێشدا، بەر لە هەرشتێک، سەرەتا. ؛ پێشەکی سڵاوی خۆمتان پێشکێش دەکەم. **~ دان:** دانی پارە بە فرۆشیار بەر لە تەواو بوونی سەودا. **~ لێستاندن (لێسەندن):** پارەی پێش لە کەسێک وەرگرتن کە زۆر مەیلی بۆ دانی پێشەکی نەبێ، پێشەکی لێوەرگرتن. **~ لێوەرگرتن:** بڕ: پێشەکی لێستاندن. **~ وەرگرتن:** پارە وەرگرتن لە کڕیار بەر لە تەواو بوونی سەودا.

**پیشەڵ** (نا. ل)[پێش + ئەڵ] لای پێشەوەی لەش. // پاشەڵ.

**پێشەنگ** (نا. ل)[پێش + هەنگ] ئەوەی کە لە پێشەوەی سوار یا کاروان دەڕوا. ٢ـ سەرگەلەی مێگەل. ٣ـ کەس یا گیاندارێک کە لە پێشەوەی هەموان بێ یا پێشەوایەتی بە دەستەوە بێ. ؛ لەم کاتە دا... دەبوو خەزاڵ دەگەڵ بێریان

بێ، بێری خەزاڵەشۆڕی مەلا نەبییان پێشەنگ بوو. (لاس و خەزاڵ ل ١٧). & پێشاهەنگ.

**پێشەوا** (ئان. ل، نا. ل)[پێش + ئە + وا1][پەه: پێشۆپای] کەسێک کە لە پێشەوەی هەموو کەسە و کۆمەڵێک بەڕێوە دەبا و خەڵک پەیڕەوی لێدەکەن، ڕێبەر.

**تێبینی:** مانای وشەکە بە گشتی یانی کەسێک کە پێی لە پێشەوەیە. وا یا وێ بە مانای پێ لە هەندێک وشەی دیکەش دا بەدی دەکەردرێ وەک چواروا، چواروێ، گۆروا، گۆرەوی.

**پێشەوایی** (حم.)[پێشەوا + یی] کاری پێشەوا، ڕێبەریی، سەرۆکایەتی. **~ کردن:** وە ئەستۆ گرتنی پێشەوایی و سەرۆکایەتی، ڕێبەرایەتی کردن.

**پێشەوە** (ئاک. ل)[پێش + ئەوە] فەزا و مەکانی ڕووبەڕوو، لای پێش، بەرەوە.

**پێشی[1]** (نا. ل)[پێش + ئی] بڕ: پێشوو1

**پێشی[2]** (گیانـ..)[باک] بڕ: پەخشە

**پێشی نەوی** (ئان. ل)[پێشی1 + نەوی] بڕ: پێشوو نەوی. ፡፡ کلک و یاڵ بە ژەنگارە، پاشی بڵندە، پیشی نەوییە/ پەسندە بۆ رکێفی هەموو پادشایەک دەبێ، خاڵ خاڵە، گوڵ گوڵییە (سەعید و میرسێوەدین ل ١٩٨)

**پێشیک** (گیانـ.)[پێشی + ک][باک] بڕ: پەخشە

**پێشیلک** (گیانـ.)[پێشی + لک][باک] بڕ: پەخشە

**پێشین** (ئان. ل)[پێش + ئین] ١ـ بەر لە ئێستا، زوو، پێشوو. ٢ـ (نا. ل) کەسی کۆن و بەر لە ئێستا ژیاو.

**پێشینان** (نا. ل)[پێشین + ئان] بڕ: پێشینیان

**پێشینە** (نا. ل)[پێش + ئینە] ١ـ لەمێژینە، کۆن، قەدیمی. ٢ـ کردەوە و چلۆنایەتی کار و دەرس و ژیان کە هەرکەس لە رابوردووی خۆی دا ئەنجامی داوە. ፡፡ پێشینەی سیاسی.

**پێشینیان** (نا. ل)[پێشین + یان] ئەو کەسانەی کە بەر لە ئێمە ژیاون، رابوردوان، پێشینان، بەرینان. // پاشینیان.

**پێشێل** (ئان. مفـ.)[پێ1 + شێل (شێلان)] ١ـ وە بن پێ دراو، پێخوست،

پامالّ، پاشێل، پاکوت. ٢ـ فەوتاو. **~ کردن:** ١ـ وەبن پێ دان، پان کردنەوە بە پێ. ٢ـ فەوتاندن. ٣ـ لەبەر چاو نەگرتنی پەیمان و بەڵێن. & پامالّ کردن، پێخوست کردن.

**پێشێلکراو** (نا. مف.)[لە: پێشێل کردن] ١ـ وە بن پێ دراو، پێ رێخراو، پامالّکراو. ٢ـ فەوتاو. ⁘ مافی پێشێلکراوی خۆمان هەر دەستێنین.

**پێغەمبەر** (نا. ل)[پێغەم (پەیام) + بەر7] ١ـ مرۆڤێک کە لە لای خوداوە بۆ رێبەرایەتی مرۆڤ هەڵبژاردراوە و قسەکانی خودا بە خەڵک دەگەیەنێ. ٢ـ پێغەمبەری ئیسلام، حەزرەتی مەحەممەد. ٣ـ کەسێک کە پەیام و قسەی پەیامنێر دەگەیەنێتە کەسێکی دیکە، پەیک، قاسد. ٤ـ (مجـ.) مرۆڤی پاک. & پەیامبەر، پەیغامبەر، پێغەمەر، پێغەممەر، پەیخامبەر، پەیخەمبەر، پەیغەمبەر، پەیغەمەر. **وە بەر ئالآی ~ کەوتن:** (دوعا) وە بەر رەحمەتی خودا کەوتن لە قیامەت دا، دەگەڵ تاقم و دەستەی پێغەمبەر چوونە بەهەشت. ‖ **بە پێغەمبەر:** (سوێند) سوێند خواردن بە پێغەمبەر. ⁘ بە پێغەمبەر من ئەو کارەم نەکردوە! **بە شالّی پێغەمبەر:** (سوێند) سوێند خواردن و شالّی پێغەمبەر کە پێیان پیرۆزە. **پێغەمبەری ئاخر زەمان(ێ):** حەزرەتی مەحەممەد. **پێغەمبەری عەرەبی:** حەزرەتی مەحەممەد. **پێغەمبەری ئیسلام:** حەزرەتی مەحەممەد.

**پێغەمبەرایەتی** (حم.)[پێغەمبەر + ئایەتی] کارێک کە پێغەمبەر دەیکا، ئەرک و کاری گەیاندنی قسەی خودا بە خەڵک لە لایەن پێغەمبەرەوە. **داوای ~ کردن:** ئیدعای پێغەمبەرایەتی کردن، خۆ بە پێغەمبەر ناساندن.

**پێغەمبەرزادە** (نا. ل، ئان. ل) [پێغەمبەر + زادە] مندالّی پێغەمبەر.

**پێغەممەر** (نا. ل)[پێغەم (پەیام) + مەر (بەر7)] بڕ: پێغەمبەر

**پێغەمەر** (نا. ل)[پێغەم (پەیام) + ئەر (بەر7)] بڕ: پێغەمبەر

**پێقژک** (گیا.)[پێ + قژک][باک] بڕ: پێمریشکە

**پێقەلە** (گیا.)[پێ + قەل + ئە] گیایەکەی خۆڕسکە، هەتا ٣٠ سانت بەرز دەبێتەوە، گەڵاکانی درێژ و گڕنی گڕنیە، دەخورێ و پتر بۆ ئاش و دۆکلێو کەلکی لێوەردەگرن و بۆ دەرمانیش دەبێ. Plantago coronopus ناوی

عیلمی ئەم گیایەیە، قازیاخە. (عەر: رجل الغراب)

**پێک** 1 (پێشـ. ل) ١ـ پێشگری کارە کە لە مانا و شکڵی (بە یەک) کەوتوە. ؛؛ پێک گەیشتن، پێک دادان، ... ٢ـ (حرف اضافە) بە یەک. ؛؛ پێک شاد بوونەوە.

**پێک** 2 (نا.)[؟] ئەندازەیەک لە خواردنەوەی مەشرووب، پەیک.

**پێکان** (چا. م) ١ـ لە نیشانە دانی تیر و گوللە و شتی هاویشتراو، ئەنگاوتن، لێدان. ٢ـ (مجـ.) لە مانا و مەبەست گەیشتن، بۆ دەرکەوتنی ناوەرۆک و کاکڵ. ٣ـ (مجـ.) دە داوی ئەوین کەوتن، گیرۆدە بوون.

**تێبینی:** لە زمانی سویدی دا peka بە مانای بە قامک دەست نیشان کردنی کەسێک یا نیشان دانی شتێک بە قامک هاتوە.

**پێکانین** (چا. م)[پێک1 + ئانین] ١ـ بڕ: پێکهێنان. ٢ـ پێکهێنانەوە، ئاشت کردنەوە.

**پێکبڕان** (چا. ل)[پێک1 + بڕان] ١ـ بە یەک گەیشتنی دوو دڵدار، پێک گەیشتن. ٢ـ بڕدران بە قەرا وێنە و ئەندازەیەک.

**پێکبڕین** (چا. ل)[پێک1 + بڕین] ١ـ گەیشتنە یەکی دوو دڵدار. ٢ـ وێنە و مۆدێل دانان لە سەر پارچە یا شتی دیکە بۆ بڕینەوە لە رووی ئەو و یەک ئەندازە بوون.

**پێکدادان** (چا. م)[پێک1 + دا + دان] ١ـ توند لێک دانی دەرکە و پەنجەرە و هەر شتێکی لەم شێوەیە. ٢ـ لێک راکێشان دوو یا چەند کەس لە یەکتر.

**پێکران** 1 (چا. ل)[پێ + کران] ١ـ توانا و بڕستی کارێک هەبوون، لە توانا دا بوون بۆ کردنی کارێک. ؛؛ هەر ئەوەندەم پێکرا کە ناوت بنووسم لەوە زیدترم پێنەدەکرا. ٢ـ بە زۆر کارێک پێ ئەنجام دران. ٣ـ ئەتک پێکران، سووکایەتی بە سەر هێنان. ٤ـ هەڵبوونی چرا و ئاگر.

**پێکران** 2 (چا. ل)[لە: پێکان] وێکەوتنی گوللە و تیر و شتی لەم بابەتە، ئەنگێوران، ئەنگوان.

**پێکراو** 1 (نا. مفـ.)[لە: پێکران1] ١ـ کەسێک کە ئەتکی پێکرابێ، سووکایەتی پێکراو. ٢ـ ژنی سووک و جڵف.

**پێکراو** 2 (نا. مفـ.)[لە: پێکران2] گوللە و تیر وێکەوتوو، ئەنگێوراو.

**پێکردن** (چا. م)[پێ3 + کــردن] ١ـ ئەنجام دانی بە زۆری کارێک بە کەسێک. ٢ـ هەڵکردنی چرا و ئاگــر و... ٣ـ فــریو دان و سووک کردنی کەسێک بە تایبەت لە باری جنسیەوە، لە خشتە بردنە دەر.

**پێکرا** (ئام.)[پێک1/١ + را] تێکڕا، تێکڕا، بەیەکــەوە. ؛؛ ڕۆیشــتن خــۆشــە لەگــەر نازداران/ پێکڕا دانیشــین لە بن هەناران (سێسەد هۆنراوە ل ١٢).

**پێکزانین** (چا. م)[پێک1 + زانین] ناسینەوە و یەکتر دیتنەوەی دوو کەسی ناســیــاو دوای مــاوەیەکی زۆر، یەکــتــر نـاســـــیــنـەوە، یـەکـــــتـــــر دیـتـنـەوە، پێکگەیشتنەوە.

**پێکگرتن** (چا. ل)[پێک1 + گرتن] بە یـەک گـــــرتـنـی دوو یـا چـەنـد شـت بـۆ دەرکــــەوتـنـی درێژایـی و ئـەنـدازە. ؛؛ ئـەو گــوریســانـە پێک بگرە بزانە کــامــەیانە درێژترە.

**پێکگەیشتن** (چـا. ل)[پێک1 + گــەیشـتن] ١ـ بە یـەک گــەیشــتـنی دوو دڵدار، پێک بران. ٢ـ گــەیشــتنە یەک لە ڕێگا و ڕێباز یا شوێنێک.

**پێکگەیشتنەوە** (چا. ل)[پێک1 + گەیشتنەوە] بڕ: پێکزانین

**پێکگەیین** (چا. ل)[پێک1 + گـەیین] بڕ: پێک گەیشتن

**پێکوتن** (چا. م)[پێ3 + کوتن] قسـە و مـەسـەلە و مـەبەسـتێک بە کـەسێک ڕاگەیاندن، پێوتن، پێگوتن.

**پێکورە** (گیـانـ.)[پێ1 + کورڕ؟ + ئە] کوللەی ساوا کە هێشتا باڵی لێنەڕواوە، پاکورە، پێڕۆ.

**پێکوڵ** (گــیــا.)[پێ1 + کــوڵ] ١ـ گیایەکی خۆڕسکە کە بە سەر زەوی دا خۆی بڵاو دەکاتەوە و بەرەکەی دڕکێکی سێ ســووچە Ttibulus terrestris ناوی لاتینی ئەم گــیــایەیە. ٢ـ بـەری ئەم گیایە کـە دڕکێکی سێ سـووچی چووکی تیژە زۆر سانا دە پێ رادەچێ. & پەیکوڵ

**پێکۆ** (نا. چا)[پێ1 + کۆ2] دروێنەی گیا بەبێ دەسکە سـواڵە گرتن و هەر بە دروون و کۆ کردنەوە.

**پێکۆترە** (گیـا.)[پێ1 + کـۆتر + ئە] گیایەکی خۆڕسکە، ریشـەکەی سووری ئامـاڵ مـۆرە. لە ریشـەکـەی مـاددەیەکی سـوور دەست دەخـەن کـە بۆ دەرمـان و ماتیک و عەتر کەلکی لێوەردەگرن، -An chusa tinctoria و Alkana tinctoria ناوەکانی لاتینی ئەم گیایەن،

کاهووکەرانە. (عەر: رجل الحمامە، خس الحمار ـ فار: شنجار، هوەچوبە)

**پێکۆڵ** (نا. چا)[پێ1 + کۆڵ2] کاری پێشــوو و سم لە زەوی کوتانی گــیاندار، سمکۆڵ. **~ کردن:** پێ لە زەوی کوتان، کــۆڵینی خــاکی بەر پێ لــە کــاتی شــەڕ و تووڕەیی گیاندار، سمکۆڵ کردن. ؛؛ ئەوە کەڵێکی رەشی خڕەیان تێدایە/ پێکۆڵێ دەکــا لــە هەلاڵێ، لە ســـومـــبـــولێ، لە بەیبوونێ (گەنج ل ٣١٦).

**پێکهاتن** (چا. ل)[پێک1 + هاتن] ١ـ رێک کەوتنی دوو یا چەند کــەس لە ســەر مــەســەلە و بابــەتێک. ٢ـ رێک کــەوتن لە سەودا و مەعاملە دا. ٣ـ جێبەجێ بوون.

**پێکهـــــاتنەوە** (چا. ل)[پێک1 + هــاتنــەوە] ١ـ ئــاشــت بــوونــەوە. ٢ـ رێـک کەوتنەوە.

**پێکهــانین** (چا. م)[پێک1 + هانین] بڕ: پێکهێنان

**پێکهـــەڵپـــڕژان** (چا. ل)[پێک1 + هەڵپــڕژان] ١ـ شـــەڕی پــەلەوەر و باڵندە دەگەڵ یەک. ٢ـ شــەڕی مــرۆڤ بە چنگان و خۆ پێکدادان.

**پێکهـەڵرووسکان** (چا. ل)[پێک1 + هــەڵرووسکــان] بە گژ یــەک دا چوون و بە شەڕ هاتن، وێک هەڵرووسکان.

**پێکهـێنان** (چا. م)[پێک1 + هێنان] ١ـ ســـاز کـــردن، ئامـــادە کـــردن. ٢ـ خوڵقاندن، ئافراندن. ٣ـ جێبەجێ کردن، رێک خـــســـتنی مـــەســـەلە و کـــار یا ســـەودایەک. ؛؛ باران دەبارێ عـــەرزی دەرشــێنێ/ رەحــمــەت لەو کــەســەی دوو دڵان پێکدێنێ (کــانی مــرادان ل ٦٨). & پێکهانین، پێکانین.

**پێکهــــێنانەوە** (چا. م)[پێک1 + هـێنـانـەوە] ١ـ ئـاشت کـــردنەوە. ٢ـ رێک خـســتنەوە. ٣ـ جـێـبـەجێ کـردنەوە. ؛؛ نــارەحـــــەت مـــــەبە بەشکەم خـــــودا کاروبارەکەت پێک بێنێتەوە.

**پێکهێنەر** (ئان. فا)[لە: پێکهێنان] ١ـ خـوڵقـێنەر، ئافـرێنەر. ٢ـ کـەسـێک کـە کـارێک، ســەودایەک یا دوو کەســان رێک دەخا، دەلاڵ، رێکخەر.

**پێکەروێشکە** (گـــیـــا.)[پێ1 + کەروێشک + ئە] جۆرێک سێـوەرەیە کە گــەلاکــانی ورد و چووکــە و لە مــووچە و مەزرا و دەم جۆگە دەڕوێ، Trifolium arvense ناوی لاتینی ئەم گــیــایەیە، سێوەرەی دەشتی. (عەر: رجل الارنب)

**پێکەفتن** (چا. م)[پێ3 + کەفتن][ئەر]

بڕ: پێکەوتن

**پـــێـــکـــەنـــین** (چـــا. ل)[پـــێ3 + کـــەنین][ئێک: خـــەند ـ پەه: خـــەندەن، خەندییتەن. تات: بێخەندەستەن ـ فار: خندیدن ـ پەش: خەندل ـ لۆر: خەننێسێ. باک: کـەنین ـ ناو: پێکەنین، پێـخـەنین، کـــەنین ـ هـەو: خـــوای، پەنەخـــوای] ١ـ کـــرانەوەی لێـــوەکـــان و هـاتنە دەری دەنگێک لە گـەروو لە خۆشـیـان یا لە بەر بیـسـتنی گـاڵتـە، دەربڕینی شـادی و خۆشی بە قاقا و کەنین. // گریان. ٢ـ (نا. چا) حاڵەتێک لە مرۆڤ دا کە لەبەر خـۆشـیـی و شـادیی پێکدێ و دەم و لێـو دەکرێنەوە و دەنگێکی تایبەتی لە گەروو دا پەیدا دەبێ، خـەنە. **وە ~ خستن:** بە قسـەی خۆش و ئەدا و ئەتوار و شتی لەم بابەتە کەسێک هێنانە سەر پێکەنین. **وە ~ کـەوتن:** پێکەنین بە قـســـە و کـرداری کـەســێک. || **پێکەنینی تاڵ:** پێکەنینێک لەبەر روداو یا حـــاڵەتێکی ناخۆش.

**پێکەوتن** (چا. م)[پێ3 + کەوتن] ١ـ هەر خـواردن و خـۆراکـێک کـە مـرۆڤ پێـوەی نارەحـەت نـەبێ و بۆ لەشـی باش بێ. ⁘ پەنـیـرم پێناکـەوێ هـەر دەیخـۆم لیری دەردەکەم. ٢ـ هەر شتێکی دیکەی جگە لە خـواردەمـەنی کـە مـرۆڤ پێی جوان و بە دەماغ بێ. ⁘ ئەو کچە مێردی پێکەوتوە جـا چاو چەند جـوان بوە. & پێکەفتن.

**پێکەوە** (پێشگ.) بە یەکەوە، دەگـەڵ یەک، هاوڕێی یەک. ⁘ با پێکەوە بچـینە بازاڕێ. پێکەوە بوون، پێکەوە نوستن.

**پێکەوەنان** (چا. م)[پێکەوە + نان] ١ـ بەستنی کتێب و دەفتەر و هەر شتێکی لەم شـێـوەیە. ٢ـ سـاز کـردن، دروست کـردن، پێکهـێنان. ٣ـ خـڕ کـردنەوە، کـۆ کـــــردنەوە، وە ســــــەر یـەک نـان. ⁘ نەخـۆشـەکـانی پێش ئێـمـە وردەوردە کتێبخانەیەکیان پێکەوەنابوو (چێشتی مجێور ل ١٥٦) ماڵ و سامانێکی زۆری بە مـــاوەیەکی کـــەم پێکەوەنـابوو. ٤ـ قـــووچاندن. ٥ـ تفـــەنگ یا تیـــر بۆ لای یەکـــتـــر هـاویشـتن. ٦ـ بە یەکـــتـــرەوە نووساندن.

**پێکوتن** (چا. م)[پێ3 + گـوتن] بڕ: پێکوتن.

**پێگە** (نا. ل)[پێ + گە] شوێنی ژیانی کۆمەڵێکی کەم لە چەکدار کە ناوچەیەک دەپارێزن یا ئاگاداری لێدەکەن.

**پێگەیاندن** (چا. م)[پێ3 + گەیاندن]

١ـ گەیاندنی شتێکی ناردراوە بۆ کەسی راسپاردە. ⁙ نامەکەت پێگەیاند؟ ٢ـ گەیشتنی پێداویستی. ⁙ ئاویان پێ نەگەیشتبا لە تینوان دەمردن. ٣ـ بەرگەیاندن، گەیاندنە بەر. ⁙ سێ ساڵی کێشا هەتا ئەو باغەم پێگەیاند. ٤ـ بەخێو کردن، گەورە کردن. ⁙ هەتا ئەو منداڵانم پێگەیاند خۆم پیر بووم.

**پێگەیشتن** (چا. ل)[پێ3 + گەیشتن] ١ـ گەیشتنە دەستی شتی ناردراوە. ⁙ نامەکەم پێگەیشت. ٢ـ گەیشتنە بەری حاسڵ. ⁙ باغەکەم پێگەیشتوە. ٣ـ گەورە بوونی منداڵ و توانای بەڕێوە بردنی خۆ. ٤ـ تووش بوون و گەیشتنە ئاستی کەسێک. ⁙ هەر لە رێگا پێیگەیشتم و شەڕەکەم دەگەڵ دامەزراندن. ٥ـ پەی پێبردن، زانین. ⁙ ئەوەندەی کە من سەبارەت بە ژیان خوێندوومەتەوە پێیگەیشتووم کە ژیان زۆر خۆشە ئەگەر لێتگەڕێن! ٦ـ باڵغ بوون. & پێگەیین.

**پێگەیشتوو** (ئان. مف.)[لە: پێگەیشتن] ١ـ حاڵی بەر و میوەیەک و هەر شتێک کە گەیشتبێتە بەرهەم و ئامادە بوون. ٢ـ مرۆڤی کامڵ، کەسێک کە گەیشتبێتە بەرهەم و کەماڵ. ٣ـ سەرکەوتوو و بە ئامانج گەیشتوو لە کاروبار و مەسەلەیەک دا. & پێگەییو، پێگەییگ

**پێگەییگ** (ئان. مف.)[لە: پێگەیین] [ئەر] بڕ: پێگەیشتوو

**پێگەیین** (چا. ل)[پێ + گەیین] بڕ: پێگەیشتن

**پێگەییو** (ئان. مف.)[لە: پێگەیین] بڕ: پێگەیشتوو

**پێل** (نا.)[باک ـ زا] بڕ: شەپۆل

**پێلاف** (نا. ل)[پێ1 + لاف (ئالاو)] [باک] بڕ: پێڵاو

**پێلاقە** (نا. ل)[پێ1 + لاق + ئە] زەربەی بەری پێ، لە کەسێک یا شتێک، پێلەقە، پالەقە، پێن. ~ **پێدادان:** بەری پێ لە کەسێک یا شتێک راکێشان، پێلاقە لێدان، پێلاقە هاویشتن. ~ **لێدادان:** بڕ: پێلاقە پێدادان. ~ **هاویشتن:** بڕ: پێلاقە پێدادان.

**پێلنگ** (نا.)[باک] بڕ: پلیکان

**پێلەک** (نا.)[؟][زا] توور، توورەکە.

**پێلوو** (ئا.)[باک] بڕ: پێڵوو

**پێلووک** (نا.)[باک] بڕ: پلیکان

**پێلەقــە** (نا. ل)[پێ1 + لەقــە] بڕ: پێلاقە

**پێلەکان** (نا.)[باک] بڕ: پلیکان

**پێڵ** 1 (نا.)[ئەر] بڕ: پرد

**پێڵ** 2 (نا.)[هەو] بڕ: پیل1

**پێـلا** (نا. ل)[پێ1 + لاو (ئالاو)][ئەر] بڕ: پێلاو

**پێـــــلاو** (نا. ل)[پێ1 + لاو (ئالاو)] [لۆر: پەهلا. باک: پێــلاڤ ـ ناو: پێــلاو، پێلا، پالا] ١ـ شتێکی چەرم یا پلاستیکی دەستساز یا کارخانە کە دە پێی دەکەن، کەوش، قۆندەرە، پیتاڤ، پێتاڤ، سۆل. ٢ـ (کنـ.) مـرۆڤی هیـچ و بێنرخ، سـووک، چرووک. **~ لە شــوێنێک کــردنەوە:** (کنـ.) دامــەزران و سـەقـامگیـر بوون لە شــــوێنێک. **~ ی غـــەریبی بردنە شوێنێک:** شـوێنێک کە لە غەریبـایەتی دا رووی تێــدەکـرێ. ⁚⁚ ئەو دەیگوت: رۆڵە چوونکی پێلاوی غەریبیت هێناوەتەوە ئەو شـارە/ ئەوە چوونکی پێـلاوی غـەریبـیت هێنـاوەتە مـاڵەکـەی من/ ئەوە سـبـەینێ چایخـانـەیەکت بۆ دەگـرم بە ئـیــجــارە (سـەعـید و مـیـرسـێوەدین ـ سروە ٧٢ ل ٤٢). **~ ی غـەریبی لە ( لای کـەسـێک یا لە شوێنێک) کردنەوە:** یەکەم شـوێن یا مــاڵێک لە غــەریبــایـەتی دا کـــە لێی سـەقامگیـر دەبن، سـەرەتای ناسیـاوی لە غەریبایەتی دا، پێتاوی غەریبی کردنەوە. ⁚⁚ چومکە پێـلاوی غــەریبـیـم لە کن تۆ کردەوە، لە کن تۆ بوومـەوە بە میوان و بە پەنهانە (سـەعید و میرسـێوەدین ل ٩٩). **~ ی کەسێک لە سەر چاو (یا لە سەر ســـەر) دانان:** (کنـ.) زۆر رێز گــرتـن لە کـەسـێک لە کـاتی بە خـێـر هێنان یان مـالاوایی. ⁚⁚ دەیگوت خـەجێ خـۆ من بە زۆریم نەهێـناوی، پێـلاوت لە سـەر چاوم، بگەڕێوە دواوە (گەنج ل ٣٣٣).

**پێڵوو** 1 (ئا.)[لۆر: پیلە ـ فـار: پێلک ـ دەر: پـیـلـک. بـاک: پـەلـک، پێـلـوو ـ نـاو: پێڵوو، پێڵە پەلک] پێستی دەوراندەوری چاو کـــە چاو دادەپۆشـن و مـــژۆڵ لە لێوارەکانی رواوە، پەلکی چاو. || **پێڵووی سـەر(ێ):** پێـسـتـی سـەرەوەی چاو کـە دەجووڵێتەوە. **پێڵووی خوار(ێ):** پێستی خوارەوەی چاو کە جووڵەی نیە.

**پێڵوو** 2 (گیا.) درەختـێکی دڕکاویی چرە گوڵەکانی سپی چووکی هێشوویین. بەرەکەی وەک ترێ وایە و رەنگ زەردە کە دەخـــورێ و بۆ دەرمـــانیش کـــەلکی لێوەردەگرن. لە لک و ریشەی ئەم دارە بۆ سیواک کەلکیان وەردەگرت و ئێستاکەش

وەک ســـوننـەت و دیاریـی بـاوی مـــاوە، Salvadora persica نـاوی لاتیـنـی ئەم دارەیە، مـسواک، درەختـی سـیواک، دارسـیـواک، چێوسـیـواک (عـەر: اراک، شجرەالسواک).

**تێبینی:** ئەم وشـەیە تەنیـا فـەرهـەنگی مـەردووخ نووسیـویەتی. هـاوریشەکەی لە فەرهـەنگەکانی فارسـی دا بە پیلو (پیلوو) نووسراوە.

**پێڵە** 1 (ئا.) بڕ: پێڵوو

**پێڵە** 2 (نا.) بڕ: پیلە3

**پێڵە** 3 (گیاند.)[؟] ڕەشـەوڵاخێکە کـە شاخـی بۆ لای چەنەی هـاتبێتەوە (خاڵ ب ١ ل ٢٥٩).

**پێڵەوار** (نا. ل)[پێڵ (پیل) + وار] بڕ: پیلەوار

**پێـمـریشـک** (گـیـا.)[پێ + مـریشـک] [باک] بڕ: پێمریشکە

**پێـمریشکە** (گیا.)[پێ + مـریشـک + ئە] گـیـایـەکی بەهـاریـی لقلقـە لە چنـگی مـــریشـک ئـەچێ (خـــاڵ ب ١ ل ٢٦٠) گـیـایەکی بـەهـارییـە گـەڵای وەکـوو پێی مـریشـک پـەڕەدارە (کـشت و کـاڵ ب ١ ل ٧٦)، چنگەمریشکە، پێمـریشک، پێقژک. Cynodon dactylon نـاوی لاتیـنـی ئەم گیایەیە. (عەر: رجل الدجاج)

**پێـــمـــوورە** (نا. ل)[پێ1 + مـــوورە (مووروو1)] بڕ: پاموورە

**پێـــمـــەرد** (نا. ل)[پێ1 + مـــەرد] ١ـ نیـوبژیکەر، یاریدەدەر. ٢ـ خزمـەتکار. ٣ـ فـریشـتـەی گـیـان کـێـشـانی مـرۆڤ، گیانکێش، عیزرائیل، پێمەردی میران. & پێـمـێـرد. || **پێـمـەردی خـودا (خـولا):** فـریشـتـەی گـیـان کـێـشـان، پێـمـەردی مـەردان، عـیـزرائیل. **پێـمـەردی مـیـران:** فریشتـەی گیان کێشان، عیزرایل. ⁘ مـەگـەر بە دیتنی مـەرزینگان ئـەو خـەم و پەژارەیە لە من ببێ بڵاوە / دەناوە بزانن پێـمـــەردی مـیـرانم لە سـەرە، گـیـانی شـــۆڕمـــەحـــمـــوودیان کـــێـــشـــاوە (شـۆڕمـەحـمـوود ل ٧١). مـاچێکم لە کۆڵمێکە ناسک دەرێ با پێمەردی میران نەڵێن: لاس زەخیـرەی قیـامـەتی پێ نییـە (لاس و خەزاڵ ل ١٧٦).

**پێمەڕە** (نا. ل)[بڕ: بێڵ][پێ1 + مەڕ2 + ئـە] ئـامـــــرازی هـەڵکـەندنـی زەوی و ڕاگوێزتن و هەڵگرتنی کۆما شتی دیکە، کە بریتیـە لە دەسکێکی درێژی چێوی و ئاسنێکی پان و سـاز کـراو کـە هـەندێک

جار بۆ هەڵکەندن کوتە دارێکی بە ناوی ئەسپەرە تێدەخەن، پامەڕە.

**تێبینی:** پێمەڕە هەروەکی نووسراوە لە [پێ + مەڕ] پێکهاتوە و خودی مەڕ بە مانای بێڵ ـ ە (بڕ: بێڵ). پێمەڕە چوونکە ئەسپەرەی پێوەیە و بە پێ دادەگرتێ ئەو ناوەی لێنراوە.

**پێمەلە** (نا. ل)[پێ$1$ + مەلە] جۆرێک مەلە کە بە وەستان لە قووڵایی دا و جووڵاندنەوە پێ ئەنجام دەدرێ بۆ قووم نەبوون، پامەلە، مەلەپێیە، مەلەپایە. ؛؛ بنوارە وشکە سۆفی و رەقسی بە هەلهەلە/ دیسان لە بەحری وشکی هەوا کەوتۆتە پێمەلە (نالی ل ٤٦٦).

**پێمێرد** (نا. ل)[پێ$1$ + مێرد] بڕ: پێمەرد. || **پێمەردی خودا (خوڵا):** فریشتەی گیان کێشان، پێمەردی مەردان، عیزرائیل. ؛؛ جا ئەودەمی شوکرانەبژێرم، ئەگەر پێمێردی خوڵام بێنە سەرێ بۆ گیان کێشانێ. (مان ل ٧٥). ئەوە ئەستێرێک هەڵدێ قەت ئاوا نابێ/ پێمێردی دە خودای سواران قەت پیادە نابێ (کانی مرادان ل ١٩٤).

**پێن** (نا.)[باک] لەقە، شەپ، پێلاقە. بڕ: پین

**پێنازان** (چا. م)[پێ$3$ + نازان] بڕ: پێنازین

**پێنازین** (چا. م)[پێ$3$ + نازین] شانازی پێوە کردن، بە زۆر دانانی کەسێک، پێنازان، پێوەنازین. ؛؛ چونکە باوکی ئاغایە زۆری پێدەنازێ.

**پێناس** (نا. ل)[پێ$3$ + ناس] بەڵگە و کاغەزێکی نووسراو، کە ناو، ساڵی لە دایک بوون و ئاگاداری لە مەڕ کەسێکی تێدا نووسراوە و لە لایەن دەوڵەت یا یانەیەکەوە مۆر کراوە، ناسنامە، پێناسە.

**پێناساندن** (چا. م)[پێ$3$ + ناساندن] دوو کەسی نەناسیاو دەگەڵ یەک ئاشنا کردن.

**پێناسە** (نا. ل)[پێناس + ئە] بڕ: پێناس

**پێناو** (نا. چا)[پێ$1$ + ناو (نیان)] ١ـ خاتر، هۆ. ؛؛ لە پێناو تۆ دا من دەگەڵ ئەم پیاوە دوژمنایەتی دەکەم. ٢ـ رێگا، رێباز. ؛؛ جەماوەرەکە هەموو سوێندیان خوارد کە لە پێناوی ئایینی خۆیان دا، لە پێناوی نیشتمانی باب و باپیرانیان دا سەری خۆیان دابنێن (دمدم ل ٢٧٢). ٣ـ کەسێک کە دە نێوانی دوو دڵدار دا هات

و چۆ دەکا و قسەکانیان بۆ یەک دەبا. ﷿ مانگەشەو خۆشە دەیدا لە ئاوێ/ دوو دڵی خۆشەویست پێناویان ناوێ (فۆلکلۆر ل ١٦٢). **دە(لە) ~ نان:** بەخت کردنی گیان یا ماڵ یا شتێکی گرانبایی لە ڕێگای کەسێک دا. ﷿ دەڵێ: « برام چوو، ئەو کۆرپەی ماوە/ دەیبەم بەخێوی دەکەم، هەموو ماڵی خۆمی دەنێم دە پێناوە (مان ل ١٤١). سەر و گیانم دە پێناو تۆ دەنێم.

**پێناودار** (ئان. فا)[پێناو + دار2] ئاز و بەزە، مشکڵۆزمە، ئۆباڵ لە ئەستۆ. **~ بوون:** مشکڵۆزمە بوون، ئۆباڵ لە ئەستۆ بوون. ﷿ دەیکوت ئەو کەسانە پێناودارمان بن ئەگەر گوێیان لە دەنگمانە/ ئەگەر بە جووت نەمانێژن لە سەر ئەو چاردە ڕێیانە (گەنج ل ٣٤٢).

**پێنج** (ژ.)[هیک: پەنچە ـ ئێب: پەنچە ـ ئەو: پەنچە ـ سوغ: پەنچ ـ پەه: پەنچ، پەنج. بەل: پەنچ ـ فار: پنج. باک: پێنج ـ ناو: پێنج، پەنج ـ هەو: پەنج ـ زا: پۆنژ، پۆنج، پانج، پانژ، پانز، پاژ] ژمارەی نێوان چوار و شەش، ژمارەی ٥. || **پێنج ڕۆژەی تار:** بڕ: پەنجەی تار. **پێنجەی تار:** بڕ: پەنجەی تار

**پێنجبەردە** (نا. ل)[پێنج + بەرد + ئە] کایە و یاریی کێژۆڵان کە بە پێنج بەرد دەکرێ، بازەڵێن، پێنج بەرک، پێنجۆک.

**پێنج بەرک** (نا. ل)[پێنج + بەر4 + ک][باک] بڕ: پێنج بەردە.

**پێنجتیر** (نا. ل)[پێنج + تیر] تفەنگ و دەمانچەیەک کە پێنج گوللە بخوا.

**پێنج خشتەکی** (نا. ل)[پێنج + خشت + ئەک + ئی] شێعرێک کە هەر بەندێکی لە پێنج میسرەع پێکهاتبێ. (عەر: مخمس)

**پێنجدەریی** (نا. ل)[پێنج + دەر + ئی] ژوور یا تەلارێکی گەورە کە پێنج پەنجەرەی لە ریزێکەوە تێدابێ.

**پێنج ڕۆژەی تار** (نا. ل)[پێنج + ڕۆژ + ئەی + تار] بڕ: پەنجەی تار

**پێنجشەم** (نا. ل)[پێنج + شەم] بڕ: پێنجشەمبە

**پێنجشەمبە** (نا. ل)[پێنج + شەمبە] ڕۆژی شەشەمی حەوتە، ڕۆژی بەر لە هەینی، پێنجشەم، پێنجشەم، پێنجشەممۆ، پێنجشەممە، پێنجشەمۆ، پێنجشەمە.

**پێنجشەممۆ** (نا. ل)[پێنج + شەممۆ]

بڕ: پێنجشەمبە

**پێنجشەممە** (نا. ل)[پێنج + شەممە] بڕ: پێنجشەمبە

**پێنجشەمۆ** (نا. ل)[پێنج + شەمۆ] بڕ: پێنجشەمبە

**پێنجشەمە** (نا. ل)[پێنج + شەمە] بڕ: پێنجشەمبە

**پێنجگا** (مۆس.)[پێنج + گا] جۆرە مەقام و ئاوازێکی کوردیی و ئێرانی.

**پێنجگۆشە** (نا. ل)[پێنج + گۆشە] هەر شکڵێکی هەندەسی کە پێنج سووچ و گۆشەی هەبێ.

**پێنج وەختە** (نا. ل)[پێنج + وەخت + ئە] هەموو ئەو کاتانەی لە ماوەی شەو و ڕۆژێک دا نوێژی تێدا دەکردرێ. بە پێی بیر و باوەڕی سوننیەکان ڕۆژێ پێویستە پێنج کات نوێژ بکردرێ. ::: پێنج وەختە لە بەر خودا بۆت دەپاڕێمەوە لەو نەخۆشییە رزگاریت بێ.

**پێنجۆک** (نا. ل)[پێنج + ئۆک][باک] پێنج بەردە، بازەڵێن.

**پێنجووم** (ژ.)[پێنج + ئووم] بڕ: پەنجەم

**پێنجوومی** (ژ.)[پێنجووم + ئی] بڕ: پەنجەم

**پێنجوومین** (ژ.)[پێنجووم + ئین] بڕ: پەنجەم

**پێنجە** (ژ.)[باک] بڕ: پەنجا

**پێنجەم** (ژ.) بڕ: پەنجەم

**پێنجەمی** (ژ.)[پێنجەم + ئی] بڕ: پەنجەم

**پێنجەمین** (ژ.)[پێنجەم + ئین] بڕ: پەنجەم

**پێنجی** (ژ.)[باک] بڕ: پەنجا

**پێندر** (نا.)[زا] بڕ: پەنیر

**پێنواندن** (چا. م)[پێ3 + نواندن] نیشان دان، پێ نیشان دان.

**پێنووس** (نا. ل)[پێ3 + نووس] ئامرازی نووسین، قەڵەم.

**پێنەزان** (ئان. فا)[لە: پێ نەزانین] کەسێک کە چاکە و ئەمەگی دە چاو دا نەبێ، سپڵە. ~ **بوون:** نرخ و ڕێز دانەنان بۆ چاکە، چاکە و ئەمەگ دە چاو دانەبوون، سپڵە بوون.

**پێنەزانین** (چا. ل)[پێ3 + نە + زانین] ڕێز و نرخ دانەنان بۆ چاکە و کردەوەی جوامێرانەی کەسێک، سپڵە بوون.

**پێنەزانیی** (حم.)[پێنەزان + ئیی] سپڵە و پێنەزان بوون، سپڵەیی.

**پێو** (ر.)[لە: پێوان] ١ـ رەگی چاوگی پیوان. ٢ـ دوای ناو دێ و مانای پێوەر دەدا. ⁘ گەنم پێو، زەوی پێو

**پێوابوون** (چا. م)[پێ3 + وابوون] گومان کردن، بە خەیاڵ داهاتن، ئیمکان هەبوون. ⁘ تۆ پێتوایە ئەوساڵ زستانێکی سەختمان دەبێ بەڵام من پێموانیە.

**پێوار** (نا.)[؟] نادیار، شاراوە، غەیب، پەنهان. ⁘ داد جە هەوای شووم بەد ستارەی من/ هەر ئەو گوڵاڵەی من نە پێوارەن (مەولەوی ل ٦٩). وا رەوی مژ لەبەر ئەو پێوارە/ گەش و روون بوونەوە بەو دیدارە (بۆ کوردستان ل ١١١).

**پێواز** (نا. ل)[پێ1 + واز (باز2)] بڕ: پێباز

**پێوان** (چا. م)[ئێک: پەتیما ـ ئەو: پەئیتیما ـ پەه: پەتموتەن. باک: پیڤین، پەیڤین ـ ناو: پێوان ـ زا: پەیماوتش] ١ـ ئەندازە گرتنی درێژایی (بە بست، بە گەز یا شتی دیکەی لەم بابەتە). ٢ـ بەراورد کردنی رادە بە پێوانە و دەفر. ٣ـ بڕینی رێگا. ⁘ هەر دەپێوم کێو و شاخ و چۆڵ و دەشت/ دێم بەرەو کوێستان بەرەو باخی بەهەشت (ناڵەی جودایی ل ٢٣).

**پێوانە** (نا. ل)[پێوان + ئە] ١ـ دەفرێک بە ئەندازەیەکی تایبەتی و دیاریکراو کە هەندێک شتی ئاوەکی یا وردی پێ ئەندازە دەگرن، پەیمانە. ٢ـ (مجـ.) مەحەک، معیاری قسە و کارێک، پێودان. **~ کردن:** دەغڵ و دان بە پێوانە و ئەژمار هەڵسەنگاندن.

**پێوتن** (چا. م)[پێ3 + وتن] بڕ: پێکوتن.

**پێور** (نا.)[هس: پێروو] ١ـ کۆمەڵە ئەستێرەیەکی یەکجار زۆر شەوانە بە ئاسمانەوە وەک پەڵە هەورێکی سپی و رووناک دیاری دەکا، تەم (عەر: السدیم ـ فار: ستارگان سحابی]

**پێورچە** (گیا.)[پێ1 + ورچ + ئە] گیایەکی کوێستانییە گەڵای وەک کاهوو وایە وڵاخ ئەیخوا (خاڵ ب ١ ل ٢٦٢). (عەر: رجل الدب ـ ئین: Bear´s paw)

**پێورە** (گیا.)[؟] ئاخر بەری وێنجە کە تەواو بەرز نابێتەوە و کورتەباڵایە، پێورەوێنجە.

**پێورەوێنجە** (گیا.)[پێورە + وێنجە]

بڕ: پێوره

**پێـوشـوێن** (نا. ل)[پێ + و + شـوێن] پەی، سـوراغ، شـوێن. **~ گـرتن:** وه شـوێن کـەسـێک کـەوتن، وه دوو کـەوتن، سوراغ گرتن. **~ هەڵگرتن:** وه شوێن و سوراغی کـەسـێک کەوتن کـه خـۆی له ئارا دانیه (وەک راکردن، ون بوون) بەڵام شــوێن و ئاســەواری بەجـێ مــاوه. ⁂ شوێن پێی دز هەڵگرتن.

**پێـوقـەدەم** (نا. ل)[پێ$1$ + و + قـەدەم] قەدەم و هەنگاوێک که بەخت و خۆشی یا بـەدبـەخـتـی و ناخـۆشی پێـوه بێ. ‖ **پێوقـەدەمی باش:** بڕ: پێوقـەدەمی پیرۆز. **پێوقەدەمی پیرۆز:** بڕ: پێوقەدەمی پیرۆز. **پێـوقـەدەمی پیس:** بڕ: پێـوقـەدەم پیس. **پێوقەدەمی خێر:** بڕ: پێوقەدەمی پیرۆز. **پێوقەدەمی رەش:** بڕ: پێوقەدەم پیس.

**پێوقـەدەم باش** (ئان. ل)[پێوقـەدەم + باش] بڕ: پێ و قەدەم پیرۆز

**پێوقەدەم پیرۆز** (ئان. ل)[پێو قەدەم + پیرۆز] کەسێک که بچێته هەر شـوێنێک خۆشی و بەختەوەریی دەگەڵ خۆی دەبا. خۆش قەدەم، قەدەم خێر، پێوقەدەم باش. پێوقەدەمی خێر. // پێوقەدەم پیس

**پێوقـەدەم پیس** (ئان. ل)[پێوقەدەم + پیس] کـەسێک کە بچێتـه هەر شـوێنێک بەڵا و بەدبـەخـتـی دەگـەڵ خـۆی دەبا، بەد قەدەم، پێوقەدەم رەش، پێوقەدەمی پیس، پێوقەدەمی رەش. // پێوقەدەم پیرۆز.

**پێـوقـەدەم رەش** (ئان. ل)[پێـوقـەدەم + رەش] بڕ: پێوقەدەم پیس

**پێــوه** (پێـشـ.)[پێ + وه] پێـشـگری لێکدراوی کـرداره بـه مـانـای بـه ... وه. **~ بەند بوون:** وەسـتـان، پێـوه گـیـر بوون، پێوه راوەستـان. ⁂ گەلێک زەریف و هێدی و ئەهوەنده/ بەدەن دارمێخـەک، گوڵ پێوەبەنده (بارام و گوڵندام ل ٥٥). **~ خـەریک بوون:** مـەشـغـووڵ بوون بـه کـار و مـەسـەلەیەکـەوه. ⁂ دەمێکه بـه کتێبێکەوه خـەریکم و هێشـتـا بۆم تەواو نـەبوه. **~ دیار بـوون:** دەرکــــەوتـن و ئاشکرا بوونـی چلۆنایەتی و حاڵەتێک له رواڵەت دا. ⁂ مـاندوویەتی پێـوه دیاره. ئەرێ رەنگی حـەمامم پێـوه دیاره؟ **~ گـیـر بوون:** پێـوه بەند بوون، گـیـر بوون شتێک به شتێکی دیکەوه.

**پێــوەبوون** (چا. ل)[پێـوه + بوون] ١ـ تووش بوون، به کارێکەوه گرفتار بوون. ٢ـ له داو کەوتن، ئەسیر بوون. ⁂ تەپکەم داناوه، دوو چۆلەکــەی پێـــوه بـوو. ٣ـ

خـــاوەن بـوون، هـەبـوون. ⁘ ئەو دارە چ بەری پێوە نیە. ٤ـ خـەریک بوون، لە فکر دابـوون، بە تـەمـــا بـوون، ویسـتن. ⁘: لە مێژە پێوەم سـەرێکتـان بدەم بەڵام باوەڕ بکەن وەختم نەبوە.

**پێوەچوون** (چا. ل)[پێوە + چوون] ١ـ فـەوتان و لە بەین چوون بە هۆی کەسێک یا شـتێکەوە، پێوە رۆیشـتن. ⁘ گیشـەی کاک رەحمان ئاوری گرتبوو کەچی ماڵی منیشی پێوەچوو. ٢ـ چوونە ماڵە کەسێک و دیاری بۆ بردن کە تـازە مـاڵی دانێ، یا ژنی هێنابێ...

**پێـــوەدان** (چا. م)[پێـــوە + دان] ١ـ گەزتنی گیانلەبەری ژارداری وەک مـار و دووپشـک و زەرگــەتە یا مــێــشـــوولە و گـیـانداری دیکە. ⁘ پێـوەدان لە وزەوز خـۆشـترە. ٢ـ چزاندن، تـەمبیـە کردن و سـزا دانێکی توند. ٣ـ هەڵقـورینجـاندن، نقـورچ لێگرتـن. ٤ـ داخـسـتنی دەرگـا و پەنجـەرە. ٥ـ شـتێک بە شـوێنێکەوە نان، پێـــوە لکاندن. ⁘ نـانەکــەی پێـــوە دە! ئەوساڵ قورم پێوە داوە.

**پێـــــوەربوون** (چا. ل)[پێ3 + وەر + بـوون] ١ـ کـــــــۆ بوونـەوەی بـەربـڵاوی گـیـانلـەبەر و مـرۆڤ لە شـوێنێک یا لە شتێک. ⁘ کوللە بە مـەزراوە وەر بوون و چیان نەهێشت. ٢ـ لێک بڵاو بوون و لێک پرژانی شتی وردە.

**پێـــوەرکـــــردن** (چا. م)[پێ + وەر + کردن] پرژاندن و بڵاو کردنی شـتی ورد، پێدا کردن. ⁘ گەنمەکەم پێوەر کردوە. خوێی پێوەر کە.

**پێـــــوەرۆیشـتن** (چا. ل)[پێـــــوە + رۆیشـتن] ١ـ بڕ: پێـوە چوون/١. ٢ـ پتـر هەڵوەشـان و دڕانی شـتی درواو و چنراو لەبەر هەڵوەشانەوە و دڕانی شوێنێک. ⁘ دایە ئەو ســـەردەســـتـــەم ئەگـــەر بـۆ نـەدروویـەوە پێـــوەی دەڕوا و کـــەلکی نامێنێ!

**پێوەکردن** (چا. م)[پێوە + کردن] ١ـ تووشی کـێـشـە و گـرفـتـاری کـردن. ٢ـ ئەسیر کردن، بە زیندان دان. ٣ـ دەزوو و بەن و هـەر هەوداپەک لـە نێـو شــتـێکی دیکە نان. ⁘ دەزووم پێوە کرد، مووررووی پێـــوەکـــە! ٤ـ لە شـــیش دان ⁘ ئەو پلە گۆشتانە دەگەڵ دوو باینجانان پێوە کە!

**پێوەگرتن** (چا. م)[پێوە + گـرتن] لە بەرابـەر راگـرتـن، بەر گـرتن. ⁘ پەردەی پێوە گرە

**پێوەلکان** (چا. ل)[پێوە + لکان] بڕ:

**پێـــــــوەن** (نا. ل)[پێ1 + وەن] بڕ: پێوەند/١

**پێوەنازین** (چا. ل)[پێوە + نازین] بڕ: پێنازین

**پێــوەنان** (چا. م)[پێــوە + نان] ١ـ لێ زیاد کــــــردن، درێژتر کــــــردنەوە. ჻ قــســەیەکی چووک ببـیـسێ دوو هـێندەی پێــوە دەنێ و دەرخــواردمـــان دەدا. ٢ـ هـەڵکردن و پێکردنی ســـۆبـە، کـــوورە، ســەمـاوەر و ... ٣ـ لـێ جـووت کـردن. ٤ـ تەقـە لێکردن، تیـر بە کەسـێکەوە نان. ٥ـ لە شــتـێـک قـایم کـردن. ჻ دەسـتـی بە دیوارەوە نابوو و راوەستابوو.

**پێــوەند** (نا. ل)[پێ1 + وەند (بەند)] ١ـ زنجـیـر و بەندێکی درێژ کـە پێـیـەکی وڵاغـی بـەرزەی پێ دەبـەســــتـنـەوە هـەتـا بلـەوەرێ و دوور نەکـــەوێتـــەوە، پێـــوەن، کۆستەک، پاشبەند. ٢ـ نزیکایەتی و پێوە لکانی دوو یا چەند کەس دەگەڵ یەکـتـر. ٣ـ هۆ و نـزیـکـایەتی کــار، مـــەســـەلە بە کەسێک یا بە کارێکی دیکەوە. ٤ـ تەمای پێکەوە ژیان، زەماوەند.

**پێــوەندیی** (حم.)[پێـوەند + ئیی] ١ـ نزیکایـەتی و پێـــوە لکانی دوو یـا چەند کــەس دەگــەڵ یەکــتــر. ٢ـ بەین، نێــوان. **~ بە یەکەوە گرتن:** دوو یا چەند کەس کـە هەواڵی یـەکـتـر دەپرسن و بـەینیـان دەگــەڵ یـەکــتــر هــەیە. **~ بە یەکــەوە هەبوون:** بەین و نێــوان دەگــەڵ یـەکــتــر هەبـوون، لە پێــوەندیی دەگـــەڵ یەکــتــر دابوون. ჻ من و کـەریم چ پێوەندییـمـان بە یـەکـــەوە نیــــە. **~ پچـــڕان:** ١ـ هـەڵبـــڕانـی نێـــوان و پێـــوەندیی. ٢ـ هەڵبـڕانـی خـەتی تەلەفۆن لە کـاتی قسـە کــردنی دوو یـا چەند لایەن. **~ پێــوە گرتن:** دەگـەڵ کـەسـێک قـسـە کـردن و ئاگـادار کردنـی لە حـاڵ و مـەسـەلەیەک. **~ هــەبــوون:** ١ـ بــەیـن هــەبــوون. ٢ـ ئیمکانی تەماس و پەیوەندیی هەبوون. **لە ~ پێــوەندیی دەگــەڵ یەکـتــر دابوون:** دەگـەڵ یەک نێـوان هـەبوون و لە حـاڵ و کاری یەکتر پرسین و ئاگادار بوون.

**پێوەنووسان** (چا. ل)[پێوە + نووسان] ١ـ لکـان بـە هـۆی مـــــادەی چـەســــــپی. پێــــوەلـکـان. ٢ـ تـوند پێــــــوەلـکـان یـا پێوەلکاندنی شـتـێک بە شـتـێکی دیکەوە، بە خــۆوە گــرتن. ჻ وەک قــڕنوو پێــوەم نووسـابـوو. ٣ـ تووشی نەخـۆشـی و ئاهۆ بوون. ჻ نەخــۆشــیــەکی پیــسم پێــوە نووساوە.

**پێـوەهاتن** (چا. م)[پێـوە + هاتن] ١ـ شانس و بەخت لە کار و کردەوەیەک دا هەبوون. :: سمێڵ تاشینم پێوە نایە، هەرکات دەیتاشم بەڵایەکم بەسەر دێ. ٢ـ بۆ سەر دان و باروبوو کردنی تازەماڵ هاتن. :: سبەی لە ماڵم قەرارە ماڵە مامم پێمانەوە بێن.

**پێـــویس** (نا. ل)[پێ3 + ویس] بڕ: پێویست

**پێـویست** (نا. ل)[پێ3 + ویست] ١ـ لازم، واجب. ٢ـ نیاز، ویست. & پێویس، پێداویست. ~ **بوون:** واجب بوون، لازم بوون. ~ **کـــردن:** واجب بوون، پێویستی پێ هەبوون. :: کارەکان جێبەجێ بوون ئیدی پێویست ناکا تۆ بێی.

**پێویستن** (چا. م)[پێ3 + ویستن] ١ـ خایاندن، کێشان، پێچوون. :: زۆری پێدەوێ هەتا ئەو منداڵانە گەورە دەبن. ٢ـ لازم بوون، پێویست بوون. :: دەلیلی چاک و پاکی پێدەوێ وەسڵی روخ و زولفی/ خودا شادی بە شانەی دا، سەفای جەننەت بە ئاوێنە (وەفایی ل ١٤٦).

**پێویستیی** (حم.)[پێویست + ئیی] نیاز، ئیحتیاج، پێداویستیی. ~ **پێ هەبوون:** نیاز بە شتێک یا کەسێک هەبوون. :: پێویستییم بە دووسەد تمەن هەبوو کەس نەبوو بمداتێ.

**پێـوێران** (چا. ل)[پێ3 + وێران] ١ـ دەرەقەت هاتن، توانایی هەبوون. ٢ـ دەرەقەتی کەسێک یا تاقمێک هاتن لە شەڕ دا. ٣ـ توانایی بەرابەریی کردن دەگەڵ کەسێک لە کێبەرکێ یا قسەزانی و ... دا.

**پێهن** (نا.)[باک] بڕ: پێن

**پێهەڵاکوتن** (چا. م)[پێ3 + هەڵ + ئا3 + کوتن] بڕ: پێهەڵکوتن

**پێـهـەڵاواسین** (چا. م)[پێ3 + هەڵاواسین] بڕ: پێهەڵواسین

**پێهەڵپڕژان** (چا. ل)[پێ + هەڵپڕژان] ١ـ پڕشکی ئاو و قوڕاوی قوڵکە و چاڵان بە سەر جل و بەرگی، پێ هەڵپژان. :: ماشێن وا بە توندی هات هەموو ئەو بەفر و قوڕاوەی پێ هەڵپڕژاندین. ٢ـ خۆ پێدادانی پەلەوەر و گیانداری چووک. ::: کەڵەبابەکە هەر چاوی پێمکەوت پێمهەڵپڕژا.

**پێهەڵپژان** (چا. ل)[پێ3 + هەڵپژان] بڕ: پێ هەڵپڕژان

**پێهەڵپەسارتن** (چا. م)[پێ3 + هەڵ + پەسارتن (سپاردن)] بڕ: پێ هەڵپەساردن

**پێهەڵپەساردن** (چا. م)[پێ3 + هەڵ + پەساردن (سپاردن)] ئامراز و شتی درێژی وەک پەیژە و چەڵەگە و ... بە درێژایی بە دیوار یا بە شوێنێکەوە نان بۆ ڕاگرتنیان، پێهەڵپەسارتن، پیاهەڵپەساردن. ⁘ وەرە یاریدەم بدە ئەو ئالوودارانە بە دیوارەوە هەڵپەسێرین.

**پێهەڵچوون** (چا. ل)[پێ3 + هەڵچوون] جۆرێک وە سەر کەوتنە کە پتر بۆ چوونە سەر دار یا بەرزاییەکی لەم چەشنە کە دار یا دارتێل لە باوەش دەکردرێ و بە پێ لە شوێنێکی چەقاندن خۆ هەڵدەکشێننە سەر، پیاهەڵچوون.

**پێهەڵڕووسکان** (چا. ل)[پێ3 + هەڵڕووسکان] چوونە سەر دیوار و بەرزاییەکی لەم چەشنە بە پەنجە و پێ لە دیوار گیر کردن.

**پێهەڵکالان** (چا. ل)[پێ + هەڵکالین] ئێرەیی بە کەسێک بردن، بە حەسوودیی قسە کردن، پێهەڵکالین.

**پێهەڵکالین** (چا. ل)[پێ + هەڵکالین] بڕ: پێهەڵکالان.

**پێهەڵکوتن** (چا. م)[پێ3 + هەڵ + کوتن] تەعریف کردن و بە باشی باس کردنی کار و کردەوەیەک، دیمەنێک یا قەد و بالای کەسێک، پێهەلاکوتن. ⁘ لە زەماوەند شایەر بە هەرکەس هەڵبلێ شاباشی لێوەردەگرێ.

**پێهەڵگرتن** (چا. م)[پێ3 + هەڵگرتن] شتێک بە زۆری بە کەسێک هەڵگرتن.

**پێهەڵگەڕان** (چا. ل)[پێ3 + هەڵگەڕان] ١ـ وە سەر کەوتن لە خوارەوە بەرەو سەر، چوونە سەر لە کێو و بەرزایی. ٢ـ جڕ و جانەوەر کەوتنە لەش. ⁘ ئەسپێم پێهەڵگەڕاوە. لەو مێرووولانە نزیک مەبەوە پێتهەڵدەگەڕێن. & پیاهەڵگەڕان.

**پێهەڵمیزتن** (چا. ل)[پێ3 + هەڵ + میزتن] بە پێوە میز بە سەر تاپێی کەسێک داکردن، لە سەرڕا میز بە شتێک داکردن، پێهەڵمیزین، پیاهەڵمیزتن، پیاهەڵمیزان، پیاهەڵمیزین.

**پێهەڵمیزین** (چا. ل)[پێ3 + هەڵ + میزین] بڕ: پێهەڵمیزتن

**پێهەڵواسین** (چا. م)[پێ3 +

هەڵواسین] هەڵواسینی شتێک بە شتێکی بەرز دا، پێهەڵاواسین، پیاهەڵواسین.

**پێین** (ئاک. ل)[پێ1 + ئین] خوار، لای خوارەوە، لای خوارەوەی پێ. ⁂ فەقییانم بۆ بێننە پێینێ، مەلایانم بێننە سەرینێ/ بە دەنگی خۆش لە بۆ منی ماڵوێران بخوێنن یاسینێ (گەنج ل ٢٢٢) پێلاقێکم دادەوە بە سەرینێ/ ئەویدیکەم دادە بە پێینێ/ بلێ ئامۆزا سیامەند گۆڕغەریبەکەی من ئەوەتانێ (گەنج ل ٣١٤).

# ت

**ت ـ** چوارەمین پیتی ئەلفوبێی کوردیی کە لە وشە دا بە چوار جۆر خۆ دەنوێنێ ( تـ ، ـتـ ، ـت، ت)(تاڵ، ئەستێرە، بست، پەت). ناوی ئەم پیتە " تێ " یە.

پیتی تێ ئاڵوگۆڕیی دەگەڵ ئەم پیتانە هەیە. دەگـەڵ د: تایەن، دایەن ـ بژاردن، بژارتن. دەگـــەڵ س: تێـــر، ســـێـــر ـ بەترپێـــرێ، بەســرپێـــرێ. هەروەها لە گـــەلێک وشـــە دا دەســـوێ بێ ئەوە کـــە مانای وشەکە تێک بدا یا بیگۆڕێ: دیتن، دین ـ دەست، دەس ـ بیست، بیس.

**ـ ت** (جنا.) ١ـ جێناوی پێکەوە لکاوی دووهەم کـــەسی تاک (ئیـــزافی)، تۆ. ** دەســــتت، چاوت، پوورت. ٢ـ جـــێناوی پێکەوە لکاوی دووهەم کــــەسی تاک (مفعوولی). ** پێمدایت، لێمدایت.

**تا**[1] (نا.)[ئەو: تەفنو، تەفنەه ـ پەه: تاپ، تەپ. لۆر: تۆو ـ فـــار: تب ـ گـیل: تۆو. باک: تا، تان ـ ناو: تا، تێ ـ باش: تەو ـ هەو: تا ـ زا: تا] نەخۆشییەکە کە بە زۆر بوونی تین و گـەرمـــای لەش خـۆ نیشان دەدا، گەرمای لەش ٣٧ دەرەجەیە و کـاتێک کـە لەو رادەیە چوو ســـەرتر

نەخـۆش تای گـرتوە، یاو، نۆبـەتێ. **~ لێـهـاتن:** تووشـی تـا و نۆبەتی بـوون، تاو لێهاتن.

**تا** 2 (نـا.)[پەهـ: تـاک. نـاو: تا ـ زا: تـا] ١ـ لایەکـی بار ٢ـ لایـەکی تەرازوو، لینـگە تـەرازوو، تـای تـەرازوو. ٣ـ تـەلـیـس و فـەردەیەک بار. ؛؛ تایەکم گـەنم کڕی. ٤ـ (ئان.) هـاوتا، وێنە. ٥ـ (ئان.) تەنیـا. ؛؛ بە تـای کـراســەوە هاتبــوو دەر. **~ نەبوون:** هـاوتـا نەبوون، بێـوێنـە بوون. ؛؛ ئامـۆزایەکم هەیە لە جـوانیی دا تای نیـە. لە پیــاوەتی دا تـات نەبوە و نیــە. **~ نەکردن:** بەرابەریی کـردن، بێـهـاوتا بوون. ؛؛ لە دۆسـتـایـەتی و ئازایـەتی دا کـەس تـای نـاکــــا. || **تای تـەرازوو:** لایـەکی تەرازوو، لینگەی تەرازوو. * **خسـتنە تای تەرازوو:** هەڵسـەنگاندن، بەراورد کـردن، نرخاندنی مەسەلە و کار و قسەیەک.

**تێـبـینی:** تا سـواوی وشـەی تاک یا تاقە کە هەندێک مـانای دیکەی بە خـۆوە گرتوە.

**تا** 3 (ئام.)[پەهـ: تاک. باک: تا، هـەتا ـ نـاو: تـا، هـەتـا، تـاکـــوو، تـاوەکـــوونـێ، تاوەکوو، تاوەکی، هـەتاکوو، هـەتاکوونێ، هـەتـاکـــینـێ، هـەتـانـێ، هـەتـاوەکـــوو، هـەتاوەکـوونێ، هـەتاوەکی، هـەتاوەکـینێ ـ هـەو: تـا] ئامـرازی پـەیوەندیی دانـە و بـەو مــانایـانە دێ: ١ـ هـەتـا، هـەتاکــوو، هـەتا ئەوەکە. ؛؛ شایی پێخـۆشترە تا شین. دە کەس باشترە یارمـەتیم بدەن تا کەسێک. ٢ـ بۆ مـاوەی. ؛؛ دوای سـەرەخـۆشی تا دوو ڕۆژان هـەر ســـــەرم دێشـــــا. ٣ـ تەقریبـەن، نزیکەی، کەمـتر نا. ؛؛ ئەگەر پارەت پێــویســتــە تـا هەزار تمـەنێکت دەتوانم دەسـتت بگرم. ٤ـ ئەوەندی کـە، هـەرچـەند کــە، هـەتا ئـەو جـێگـەیەی. ؛؛ ئەوە نان لێــرە قـــەڵاپاچن کـــراوە تـا پێتـدەکرێ باوەشی پێداگرە و بیـبە. تا دەتوانی بیـخـوە. ٥ـ هـەر. ؛؛ تا چاوم لێ غـافڵ کـرد دەرپەڕی. ٦ـ پێـوەندیی هەیە بەوە کە، بە پێی ئەوە کـە، هەتاکوو. ؛؛ تا خــودا چـی بوێ و چ بـخــوازێ. تـا چۆن بێتە پێش. تا چ بقەومێ. ٧ـ بەر لەوە کە، لە ئێستاوە هـەتاوەکوو وەختایەکی. ؛؛ تا چێـشـتـەکـە سـاز دەبێ با دەسـتـێک تەخـتـەی بـکەین! تا باوکم نـەهاتۆتەوە وا باشـترە تۆ بڕۆی. ٨ـ لەو مـاوەیەی دا کە. ؛؛ تا دوکـتـور گـەیشـتـە سـەری عـەمـری خـودای کـرد. تا چێـشت دەگـاتێ من لە برســــــان دەمـــــــرم. ٩ـ بـۆ دەربـڕینـی کـــردەوەیـەکی هـاوتا و هـاووێنـە. ؛؛ وات

نەکردبا تا منیش وام نەکردبا. پارەکەم بدەیە تا شتەکەت بدەمێ. ١٠- بۆ دەربڕینی تووک و نفرین و خنێو. ⁘ تا چاوت کوێر بێ! تا ئەستۆت شکێ! ١١- نەهایەت و ئاکامی زەمان یا شوێنێک دەگەیەنێ. ⁘ تا شەوێ، تا سبەی، تا سەر، تا شار دوو سەعات رێیە.

**تا4** (نا.)[بڕ: تار] تاڵی تووک و موو، تار.

**تاب** (نا.)[بڕ: تاو2] ١- تاقەت، توان. ٢- سەبر، سێبووریی. ~ **هێنان:** تاقەت هێنان، بەرگە گرتن.

**تابار** (نا. ل)[تا2 + بار1] لایەکی بار، تا، جەم.

**تابان** (ئان. فا)[فار: تابان][کلاسیک] درەوشاوە، رووناک، گەش. ⁘ ماهی تابان، خورشیدی تابان، رویی تابان.

**تابلۆ** (نا.)[فەر: tableau] ١- پەردەیەک کە نەقاشی لە سەر کراوە، تابلۆی نەقاشی. ٢- تەختەیەکی چوار گۆشی هەندێک گەورە کە لە یانە و شوێنی دیکە هەڵیداوەسن و ئاگاداریی یا کوتە کاغەزی دیکەی لێدەدەن. ٣- چوار گۆشەیەکە لە هەر کەرەسەیەک کە لە سەر دەرکی دوکان یا شوێنی دیکە دەدرێ و ناوی ئەم جێگایانەی لێ دەنووسێ. ٤- تەختەیەکی رەش کە لە فێرگەگان بە گێچ دەرسی لە سەر دەنووسرێ. ٥- (مجـ.) بیچم و قیافەی سەیر و سەمەرە. ٦- دارشتنی بیر و خەیاڵی بە نووسین یا شێوەیەکی دیکەی هونەریی. ⁘ ئەم رۆمانە تابلۆیەکی زۆر بە سام و رەشە لە ژیانی هیتلێر.

**تابلۆساز** (ئان. فا)[تابلۆ + ساز] کەسێک کە تابلۆ ساز دەکا.

**تابلۆسازیی** (حم.)[تابلۆساز + ئیی] کار و پیشەی تابلۆساز.

**تابوو** (نا.)[فەر: tabou لە: زمانی پۆلینێزیی: tapu یا tabu = پیرۆز و قەدەغە] کۆمەڵە یاسا و بیر و باوەڕ و داب و نەریتێک لە کۆمەڵگا دا کە پیرۆز کراون و شکاندن و دەست تێوەردانیان قەدەغە کراوە (وەک زەماوەندی دایک و کوڕ یا خوشک و برا)

**تێبینی:** پۆلینێزیی کۆمەڵە دوڕگەیەن لە رۆژهەڵاتی ئوسترالیا کە بە پێی ئایین و بڕوای ئەم خەڵکە کەسێک یا شتێک (گیاندار یا بێگیان) پیرۆز (تابوو) دەکرێ و نزیک بوونەوە و دەست لێدان لەم شتە قەدەغەیە.

**تابووت** (نا.)[عــــــەر: تـابوت] ١ـ سندووقێکی چێوییە کە مردووی تێدەنێن و دەینێـژن. ٢ـ داری مــەیت راگـوێزتن، دارەمەیت، دارەتەرم، دارتەرم، دووداره.

**تێبینی:** لە کوردەواریی دا مردووی بە تابووتەوە دە قـەبر نـانێن و دارەمــەیت و تابووت هەر یەک مـانایان هەیە و بۆ یەک مـەبەسـتـە. هەروەها تابووتی عـەرەبی لە تبە (تێبە) ـ ی عیبریی کەوتوە بە مانای سندووقی چێویی.

**تـابـوور** (نـا.)[تــور: tabur] پــۆل، دەســـتـــە، دەســـتـــەیەکی هەزار کـــەسی لەشکر، تابوون. ∷ مـەمـدە بـەر تابووری مــوژگــانت هەتاکــوو غــەمــزە بێ/ هـا بە جارێک بمکوژە، یەخسیری تورکانم مەکە (وەفـایی ل ١٣٠). فـاتیـحـە تـەسـخـیـری شـاری دڵ بە تابووری ئەلـەم/ مـودەتێکی زۆرە پاتەختـە لەبۆ خاقانی غـەم (نالی ل ٣٠٨). بابێ بابم شێخ مەحمـوود بە خۆی دێ لــە بــاژێــڕی/ لــۆی دێ نــۆ تــابــوور عـەسکەر تفەنگ لە ماهوزێڕی (سێسەد هۆنراوە ل ٤١).

**تابوون** (نا.)[ئەر] بڕ: تابوور

**تـابیـــعـــە** (نـا.)[عـــەر: تابعة] ١ـ خــزمــەتکار، فـــەرمـــانبـــەر، نۆکـــەر و قـەرەواش. ∷ ئێـسـتـا نۆکەر و تابیـعـەی من هەمـوو تازیەدارن، دەڵێن: قـەر کـوڕی فەرەجوللاخانی نەماوە (مان ل ٢٦٣). ٢ـ جندۆکــەیەک کــە ئـاشــقی پیـــاو دەبێ و هەمیشە دەگەڵیەتی.

**تاپڕ** (نا. ل)[فـــار: تە پر ( بن پر)] جــۆرێک تفــەنگی راوە کــە لە بنەوە ڕا فــیــشـــەکی پڕ کــراوەی تێــدەنێن (بە پێچەوانەی تفەنگی کۆن کە لە سـەرەوە را باروتیـــان تێــدەکــرد) و لە کـــاتی تەقینـەوە کۆمـەڵێک ساچمـە دەپڕژێنێ و لە وانەیە چەند نێچیر یەکڕا وە بەر بێن.

**تاپک** (نا.)[باک] بڕ: تەپکە

**تاپۆ**[1] (نا.)[؟] بیـچم و قـەلافـەتێک لە دوورەوە کــە روون نیـە کــێــیــە یا چیــە، تارمایی.

**تاپۆ**[2] (نا.)[تور: tapu] قەباڵەی مڵک و زەوی. **~ کردن:** سەبت کردنی زەوی و مڵک

**تـــاپـــەڵـــە** (نــا. ل)[تـــا1 + پــەڵــە] نەخــۆشــیــەکی ئاهۆدارە، پتـر بـە هۆی ئـەســـپـــێـــوە مـــرۆڤ تووشی دەبێ، نیشانەکانی سـەرئێشـە، پشت ئێشـە، تا و یـاوی زۆر و وڕێنـەیە. نـەخــــۆش دوای چەند رۆژان پەڵەی لە ســـەر لـەش پەیدا

دەبێ (هۆی ناو نان) و ئەگەر زوو چارەسەری نەخۆشییەکەی نەکردرێ مەترسی زۆرە، گرانەتا، گرانەتێ. (فەر: typhus).

**تات**[1] (نا.)[بڕ: تەخت] ١ـ بەردێکی تەخت و پان و لووسە، لە دەم حەوزی مزگەوت یا کانی دادەندرێ بۆ نوێژ لە سەر کردن یا مردوو لە سەر شوتن، تاتەبەرد. ٢ـ [باک] کێوی یەکپارچە بەرد، زەردوماھ.

**تێبینی:** وشەی تات هەمان وشەی تەخت ـ ە کە هەندێک مانای لەقاوە و مانای تایبەتی تەختەبەردی بەخۆوە گرتوە.

**تات**[2] (ئان.)[؟] حاڵی ژنێک کە ئێسکێکی بچووک دە نێو شەرمی دا بەری منداڵدانی گرتبێ. [گۆیا پیاو ناتوانێ بە سانایی دەگەڵ ئەو جۆرە ژانە نزیکی بکا و دەبێ بە جەراحی ئەم ئێسکە لابەن.]

**تات**[3] (نا.)[باک] بڕ: تۆتە

**تاتا** (نا. ل)[تا4 + تا4] تاڵەکانی مووی سەر و زولف. ⁂ تاتایی سەری تووڕەیی پڕ پێچشی با دا/ هەر تایەکی بارێکی گوڵ و نافە بە با دا (نالی ل ٣) رووی لە تاتا زولفی دەرخست، هاتە سەر رووی مەرحەمەت/ نەوبەهار بوو، شەو بەهار بوو، وا کە دایسان چراغ (وەفایی ل ٤٤).

**تاتوورە** (گیا.)[لات: datúra] گیایەکی خۆڕسکی ژارداری یەکساڵەیە. هەتا گەز و نیوێک بەرز دەبێتەوە، بۆنێکی توند و ناخۆشی هەیە، ریشەکەی ئەستوور و گەڵاکانی پان و نووک تیژە، گوڵەکەی شەیپووری و سپی یا ئەرخەوانییە، بەرەکەی دڕکاوی و وەک گوێز وایە و بە چوار بەش دابەش کراوە، دەنکەکانی ورد و رەشن، مادەیەکی بە ناوی daturine هەیە کە موخەدرێکی یەکجار بە هێزە Datura stramonium ناوی لاتینی ئەم گیایەیە، تاتوولە (عەر: جوزالماثل ـ ئین: devil's apple).

**تاتوولە** (گیا.) بڕ: تاتوورە.

**تاتوولە** (ئان.)[؟][ئەر] کەسێک کە زار و دەمی خوار بووبێ.

**تاتک** (نا.)[بڕ: تاتە][باش] برای باوک، مام.

**تاتە** (نا.)[سان: تاتە، تەتە ـ پۆلۆنیایی: تاتە. ناو: تاتە، تاتی ـ باش:

تاتگ، تاته (مام) ـ هەو: تاته] ١ـ [هەو] باب، باوک. ٢ـ [ئەر] شووی تایەن، مێردی دایەن، تاتی. ٣ـ [ئەر] نۆکەری پیر، غولامی پیر. ٤ـ (باش) برای باوک، مام.

**تاتەبەرد** (نا. ل)[تات1 + ئە + بەرد] بڕ: تات1

**تاتەزا** (نا. ل)[تاتە/٤ + زا][باش] منداڵەکانی مام، ئامۆزا.

**تاتەشوار** (نا. ل)[تات1 + ئە + شوار (شۆردن)] بەردێکی پان و درێژ و یا تەختەیەک کە لە دەم حەوزی مزگەوت یا لە گۆڕخانە دایدەنێن و مردووی لە سەر دەشۆن، تاتەشۆر، تەتەشۆر، تەختەشۆ. ⁂ کاکەمەمیان بردە سەر تاتەشواریٚ و شۆراوە/ هەڵیانگرت بۆ گۆڕخانان لەویٚ تەسلیم بە خاکیٚ کراوە (مان ل ٧٧).

**تاتەشۆر** (نا. ل)[تات1 + ئە + شۆر] بڕ: تاتەشوار

**تاتی**[1] (نا.)[بڕ: تاتە][ئەر] شووی تایەن، تاتە.

**تاتی**[2] (نا.)[؟][ئەر] سەر و ژێری پیتی نووسراوەی زمانگەلی وەک عەرەبی و فارسی.

**تاتی**[3] (نا.)[زا] بڕ: تۆتە

**تاتی**[4] (نا.)[؟] ١ـ لبادی راخستن. ٢ـ [باک] لباد. ٣ـ کوتێکی درێژ و باریکی چەرم.

**تاج** (نا.)[پەه: تاگ، تاج. باک: تاج ـ ناو: تاج، تانج ـ هەو: تاج ـ زا: تاج] ١ـ کڵاوێکی رازاوە بە گەوهەر و بەردی بایخدار کە شا دە سەری دەکەن. ٢ـ جۆرێک تاجی چووکی بە بایخ کە شاژن لە سەری دەنیٚ. ٣ـ تاجێکی وەک تاجی شاژن بەڵام بێ بایخ و هەرزان کە بۆ جوانی لە سەر بووکی دادەنێن. ٤ـ کڵاوی قووچ و درێژ. ‖ **تاجی دەروێشیی:** جۆرە کڵاوێکی درێژیی دەروێشانە کە لە لیباد یا کورک سازی دەکەن، تانجی دەروێشیی. **تاجی سەر:** ١ـ تاج، تانج. ٢ـ (مجـ.) کەسی زۆر خۆشەویست کە کەس گەورە و پایەبەرز دەکا. **تاجی عەرەب:** (کنـ.) پێغەمبەری ئیسلام، حەزرەتی مەحەممەد. ⁂ گوتی تاجی عەرەب و ئالی عەبا فەرمووویان/ عەیبە تەنپەروەری و نەرمی و نازک بەدەنی (نالی ل ٦٧١).

**تاج خرووس** (گیا.)[فار: تاج خروس] ١ـ گیایەکە یەکساڵە، گوڵەکانی پتر سوور و هەندێک جار شینە و هەندێکیان

لە پۆپەی کەڵەباب دەچن، Amaranthus ناوی لاتینی ئەم گیایەیە، گوڵەقەیفە، پۆپە کەڵەشێرە، پۆپنە کەڵەشێرە، (عەر: عرف الدیک). ٢ـ جۆرە ترێیەکی سووری دەنک خوار و خێچ کە لە پۆپەی کەڵەشێر دەچێ.

**تاجدار** (ئان. فا)[تاج/١ + دار2] ١ـ خاوەن تاج، شا، پادشا. ؛؛ هەموو خوێنی شەهان و تاجدارانە لە بن خاکا/ کەوا هەوری بەهاریی سەرزەمینی پێدەکا گوڵ گوڵ (مەحوی ل ٢٠٥). ٢ـ ئاگاداری تاج.

**تاجـداریی** (حم.)[تاجـدار + ئیی] پاشایەتی، سەڵتەنەت.

**تاجـر** (نا.)[عـەر: تاجـر] بازرگان، سەوداگەر.

**تاجی** (گیانـ.) بڕ: تاژی

**تاجیەوان** (نا. ل، ئان. ل)[تاجی + ئە + وان] بڕ: تاژیەوان

**تاجیلۆکە** (گیانـ.)[تاجی + لۆکە] بڕ: تاژیلۆکە.

**تاجیلە** (گیانـ.)[تاجی + لە] چووک کـراوی تـاجی، تاژی چووک، تـاجی ژیکەڵە. ؛؛ ئەمن تێم بەردەدا جـووتە تاجیلەی شڵە شینکی چوارپێ خەنە (گەنج ل ١٥٣).

**تاخ** (نا.)[؟][باک: تاخ، تاخە] گەڕەک

**تاخمە** (نا.)[سۆر] بڕ: تاقم/١

**تاخـورک** (نا. ل)[تا2 + خـور + ک] [باک] عەرابەیەکی بێ چەرخ کە بە سەر بەفر دا دەیکێشن، تاخۆک.

**تاخۆک** (نا.)[باک] بڕ: تاخورک

**تاخە** (نا.)[هس: تاقم] ١ـ باقە، بەستە گیای بەستراوە. ٢ـ باقە و بەستەی تووتن ٣ـ دەستە، تاقم. ٤ـ [باک] گەڕەک، تاخ.

**تادار**[1] (ئان. فا)[تا1 + دار2] کەسێک کە نۆبەتێ و یاوی هەیە، تێدار. ؛؛ ئارەقم کرد و نەجاتی هەر نەدام دەردی گوناح/ لەرز و تاداری خەجاڵەت خۆم و روو زەردی گوناح (بێخود ل ٢٢).

**تادار**[2] (نا. ل)[تا1 + دار1][باک] دارێکی بەرزە کە رەگەزەکەی لە ئوستترالیایەوەیە، هەتا ١٤٥ میتر بەرز دەبێتەوە و ئەستوورایی قەفەکەی دەگاتە ٢٥ میتر، دارێکی هەمیشە شینە، گەڵاکانی درێژ و نووکتیژ هەروەک گەڵای بی ـ یە، مادەیەکی بە ناوی ئۆکالیپتول

هەیە کە بۆ گەلێک نەخۆشی کەلکی لێوەردەگرن، Eucalyptus glanca ناوی لاتینی ئەم دارەیە (فار: اکالیپتوس ـ فەر: Gommier).

**تار**[1] (ئان.)[هیک: تەمیسرە ـ ئەو: تەثرە ـ پەه: تار. لۆر: تار ـ فار: تار. باک: تار، تاری ـ ناو: تار، تاری ـ هەو: تار ـ زا: تاری] بڕ: تاریک

**تار**[2] (نا.)[هیک: تەنترە ـ ئەو: تەثرە] ١ـ تاڵ، تاڵی موو. ‌:: نە باخچەی تار مووی تار دا/ سپی شکۆفەی پیریم دیار دا(مەولەوی) ٢ـ راهێڵی تەون، تان. ٣ـ هەودای درێژی باریک. ٤ـ (مۆس.) ئامێرێکی مۆسیقایە. پتر لە دارەتوو سازی دەکەن، دەسکی درێژە، کاسەیەکی تایبەتی نێو بۆشی هەیە کە سیم بە سەری دا تێدەپەڕێ هەتا دەگاتە دەسکەکەی و لەوێ دەبەستریتەوە، لە سەر کوشی دادەنێن و بە مزراب لێدەدرێ. ٥ـ (مۆس.) ژێی ئامێری مۆسیقا.

**تار**[3] (ئان.)[سۆر] بڕ: تاڵ

**تار**[4] (نا.)[زا] بڕ: تەڕە

**تار**[5] (نا.)[لە: تاران] تەرە، تاراو، پرژ، بڵاو. **~ بوون:** تەرە بوون، تاران، رەوین. **~ کردن:** تەرە کردن، تاراندن، رەواندن.

**تارا** (نا. ل)[تار2 + ئا] رووپۆشی بووک کە پێشتر لە زەڕی و پارچەی سووری رایەڵ رایەڵ ساز دەکرا و ئیمرۆکە زۆرتر پارچەی تۆڕ بەکار دێنن. **~ لە سەر لادان:** لا بردنی تارای سەر بووک بۆ دیتنی رووخساری.

**تاراج** (نا.)[؟] بردن یا برانی بە زۆریی ماڵ و سامان و دەوڵەتی کەسێک یا شوێنێک بە تێکڕایی، تالان، بڕۆ. **بە ~ بردن:** تالان کردن، تاراج کردن، بە تالان بردن. **بە ~ چوون:** تووشی تالان هاتن و دزران و برانی هەموو ماڵ و حاڵ، بە تالان رۆیین، بە تاراج رۆیین. **بە ~ دان:** نابوود کردن، فەوتاندن، بە تالان دان. :: بە شۆخی دین و دڵمی دا بە تاراج، ئێستە وەک سۆفی/ بە سەبحەی ئەشکەوە هاتۆتە سەر تەرکی نەزەر چاوم (مەحوی ل ٢٢٤). **بە ~ رۆیین:** بە تالان چوون. :: بە ناڵەی بولبول و قومری وەفایی بۆیە هەر دەگریم/ گوڵێکی سەرو باڵام بوو، بە تاراجی خەزان رۆیی (وەفایی ل ٢٠٧). **~ کران:** رووت کران و بە تالان بردنی ماڵ و سامان. **~ کردن:** بە

تالان بردن، تەخت و تاراج کــردن، بە تاراج بردن. ⁂ سوڵتان بە شاعەبباسی تێگەیاندییـە/ ئەگەر دەڵێ تاراجی بکەم بە یەگجارێکییە (مان ل ٢٧٤).

**تـاران** (چـا. ل)[بـڕ: تـارانـدن] دوور کــەوتنەوە و ڕۆیشتن بێ گــەڕانەوە لە ترسان یا لەبەر هۆی دیکە، تەرە بوون.

**تاراندن** (چا. م)[ فار: تاراندن ـ کرم: تـارۆندن. نـاو: تـارانـدن، تارانـن] دوور کردنەوە و ڕەواندن، تەرە کردن.

**تارانن** (چا. م)[ئەر] بڕ: تاراندن.

**تارانی** (نا. ل)[تاران (پێــتــەخــتـی ئێـــــران) + ئـی] دووقــــڕانـی زێوی (سەردەمی ؟) ئێران، جووتە.

**تاراو** (نـا. مــــفـ.)[لە: تاران] تەرە، ڕەویو لە ترسان.

**تاراوگـــــە** (نا. ل)[تاراو + گـــە1] شـــوێنێک کــە کـــەسی تـاراو خـــۆی لێدەگـرێتـەوە و لەوێ دەگـیـرسـێـتـەوە، غەریبایەتی.

**تارتاله** (نا.)[؟][باک] بڕ: تاڵان

**تارخوون** (گیا.)[باک] بڕ: تەڵخوون

**تارژەن** (ئـان. فـــا)[تـار2/٤ + ژەن] کـەسێک کـە شـارەزایی لە سـەر لێدانی تار هەیە، کەسێک کە تار دەژەنێ.

**تارژەنیی** (حم.)[تارژەن + ئیی] کار و پیشەی کەسی تارژەن.

**تارگۆن** (گیـا.)[باک] جۆرێک گـەنمی خــۆڕسک و کـێـویی (ئیــزۆلی ل ٤٠٨) (هس: تاریگان)

**تارم** (نـا.)[عــەر: طارم لە یون: tar-onana] ١ـ کـەپر، هەیوان، بەربێـلایی. ٢ـ داربەسـتی مـێو و ئەو گیـایانەی کـە ناتوانن خۆ ڕاگرن. ٣ـ چادر و دیوەخانی چادر. ٤ـ تاق، گومبەز. ٥ـ مەحەجەرەی چێــو یا ئاسنی دەوروبەری باغ، مـــاڵ، هەیوان یا شـوێنێک، تارمی. ٦ـ دەسـتـە، جەڵەب. & تارمە. ٧ـ خەرمانی گێرەکراو و ئامادەی شەن کردن.

**تارمــایی** (نا. ل)[تار1 + م + ئایی] بیــچم و قـــەلافـــەتێک لە دوورەوە کــە روخساری روون نیە و دیار نیە کە کێیە و چیە، ڕەشایی، تاپۆ.

**تارمــە** (نا.) بڕ: تارم (١ هەتا ٦). ⁂ لە تارمەی ڕوو بە مەغریب خۆی نیشان دا ئەو کـلاوڵارە/ وتم یاران کـە حەشـرە ڕۆژ لە مەغریب وا عەیانی کرد (ئەحمەد موختار ل ٧١).

**تــــارمـــی** (نـــا. ل)[تـــارم + ئـــی]

مەحەجەرە، تارم/٥.

**تارودمــبــەک** (نا. ل)[تار2/٤ + و + دمبەک] ١ـ تار دەگەڵ دمبەک ٢ـ (مجـ.) تەواوی ئەو ئامێرە مۆسیقاییانەی کە بۆ خۆشی و شـادی لێدەدرێن. ⁂ لێیـدە لە تـارودمـــبـــەک پەروانـە دێ بـۆ شـــایـی (گۆرانی)

**تارومــار** (نا. ل)[تار5 + و + مــار] [فــار: تارومـــار. باک: تارومـــار ـ نـاو: تـارومـــار] تێکشکاو و لێک بڵاو، پرژ و بـڵاو و لێـک تـاراو. ~ **بـوون:** تـاران و لێک بڵاو بوونی کـۆمـەڵێک. ~ **کـران:** تارومـار بوون و لێک پرژان. ~ **کـردن:** تـاراندن و لـێک پـرژ و بـڵاو کـــــــردن کۆمەڵێک.

**تێبینی:** مـار لەم وشەیە دا مـانایەکی تایبــەتی نیــە و بۆ هـاوتایی دەگــەڵ تار هـاتوە.

**تارەت** (نـا. چـا)[عـــەر: طـهـــارت] شــوشــتنەوەی قــوون بە ئـاو دوای ریان. ~ **هەڵگرتن:** خـۆ شـوشـتـنەوە دوای ریان.

**تاری** (ئان.)[بڕ: تـاریک] ١ـ شـوێنێک کـە شـۆقی تێـدا نەبێ، تاریک. ⁂ دونیـا دەبوو شـــەوی تاری/ خـــوێن لە ســـامی ســۆران باری (مــان ل ٢٩٦). ٢ـ رەنگی رەش، سیا. ⁂ هاتە ئاسمانێ هەورێکی رەشی تـاری/ کل و تـۆتیـــای لێـــدەباری (مان ل ٢٤١). ٣ـ رەنگی تاڵخ.

**تاریتی** (حم.)[تـاری + ئیـــتـی][باک] تاریکیی، تاریکایی.

**تاریف** (نا. چا)[عــەر: تعــریف] ١ـ پەسن، باسی چاکە. ٢ـ باس، قسە. ~**ی خـۆ کــردن:** بە خـــۆ هەڵکوتن، باسی چاکەی خۆ کردن. ⁂ تاریفی خـۆ کردن، پەمۆ جوونە (پەند). ~ **کردن:** بە چاکە باس کـردن، پێـهـەڵکوتن. ٢ـ گێـڕانەوەی قسە و باس.

**تاریخ** (نـا.)[عەر: تاریخ] ١ـ مێژوو. ٢ـ رێکەوت

**تاریخیی** (ئان. ل)[تاریخ + ئیی] بڕ: مێژوویی

**تاریک** (ئان.)[هیک: تەمیسرە ـ ئەو: تەثرە ـ پەه: تار، تارییک. فـار: تـاریک ـ تـات: تاریکە، تاریچـــە ـ پەش: تاریک، تیـارە. باک: تار، تاری ـ نـاو: تار، تاری، تاریک ـ هەو: تـار، تاریک ـ زا: تاری] ١ـ شــوێنێک کــە شــۆق و رووناکــایی تێـدا نـەبێ. // رووناک. ٢ـ شـــــوێنێک کـــە رووناکــایی کــەم بـێ. ٣ـ رەنگی تـاڵخ. ٤ـ

رەش، سیا. **بەرچاو ~ بوون:** (کنـ.) زۆر تووڕە بوون و رق هەستان و گرینگایەتی بە هیچ نەدان، هیچ نەدیتن لەبەر تووڕەیی. **~ بوون:** ١ـ رەش هەڵگەڕانی دونیا دوای تاو پەڕان. ٢ـ رووناکی بڕان، شۆق نەمان. **~ کردن:** ١ـ پەیدا بوونی تاریکی دوای تاو پەڕان. ٢ـ کووژاندنەوەی شۆق یا کەم کردنەوەی شۆق بۆ تاریک بوون. **~ مانەوە:** لە تاریکیی دابوون، نائاشکرا بوون، روون نەبوون. ∷ ئەوەی هێشتا تاریک ماوەتەوە... ژیان و سەرگورشتەی ئەم شاعیرە مەزنەیە (چەپکێ گوڵ ل ٤٦). **دونیای روون لێ ~ بوون:** (کنـ.) بێمەیل بوون بە ژیان و ژین لەبەر رووداو و کارەساتێکی ناخۆش و دڵتەزێن. ∷ دەڵێ: براڵە بۆچ وا درەنگ هاتییە چزیرێ وێرانێ/ دونیای روونم لێ تاریک بوو، لە سوێی تو لێمبڕا رێی گوزورانێ (مان ل ٥٤).

**تاریکان** (ئاک. ل)[تاریک + ئان] ئێوارەیەکی زۆر درەنگ، سەرەتای شەو. ∷ تا تاریکان پەیدا دەبێ/ چۆڵ و چۆڵتر دەبێ جادە (ناڵەی جودایی ل ٢٩)

**تاریکایی** (حم.)[تاریک + ئایی] ١ـ (ئاک.) ئێوارەیەکی زۆر درەنگ، تاریکان. ٢ـ رەشایی، تاریکیی. ٣ـ بێخەبەریی، نەزانیی. & تاریکیی. **~ خستن:** ١ـ بەری شۆق و نوور گرتن، تاریکایی کردن. ٢ـ نائاشکرابوون و روون نەبوونی مەسەلە و مەبەستێک. **~ داهاتن:** پەیدا بوونی تاریکیی دوای تاو پەڕان، تاریک کردن. **~ کردن:** بڕ: تاریکایی خستن. **لە ~ دابوون:** (کنـ.) لە بێخەبەریی دابوون، نەزانین، هیچ ئاگاداری مەسەلەیەک نەبوون.

**تاریکخانە** (نا. ل)[تاریک + خانە] ١ـ دیووی تاریک. ٢ـ ژوورێکی تایبەتی تاریکە کە وێنەگر عەکس و وێنەی تێدا روون دەکاتەوە و دەیشواتەوە.

**تاریکستان** (نا. ل)[تاریک + ستان] ١ـ شوێنی تاریک. ∷ لە سەری شاخان ناڵەناڵە، تاریکستانە/ تیری لاس ئاوازی دێ دەڵێی ناڵەی هەورانە (لاس و خەزاڵ ل ١٥٤). ٢ـ شوێنێک لە باکووری گۆی زەویی کە گۆیا هەمیشە شەوە و گەوهەری لێکەوتوە و ئاوی حەیاتیش لەو ناوچەیە هەڵکەوتوە. ∷ یایەزین دەڵێ: میرمەم، کۆشکی من بڵیندە سەر لە حەو تەبەقەی ئاسمانێ/ وەستای بۆ هاتووە لە هیندێ، مەیماری لە بوخارایێ، گێچی بۆ هاتوە لە تاریکستانێ (مان ل ٣٢).

**تاریک و تنۆک** (ئان. ل)[تاریک + و + تنۆک] تاریکی زۆر خــەست و تونـد، تاریک و تنووک، تاریک و نووتەک، تاریک و توناک.

**تاریک و تنووک** (ئان. ل)[تاریک + و + تنووک] بڕ: تاریک و تنۆک

**تاریک و توناک** (ئان. ل)[تاریک + و + تنۆک][سۆر] بڕ: تاریک و تنووک

**تاریک و روون** (ئاک. ل)[تاریک + و + روون] بەرەبەیان کە هێشـتـا وڵات بە تەواوی رووناک نەبوە، بوولێـڵـی بەیانی، تاریک و روونە، تاریک و روونی، تاریک و لێـڵ. || **تـاریـک و روونی بـەیـانـی:** بـڕ: تاریک و روون. ⁂ تاریک و روونی بەیانی وەدەرکـەوتین. ***تاریک و روونی بەیانی لێک بوونەوە:** جـیـا بوونەوەی تاریکی و رووناکی لە بەرەبەیان دا، بەرەو رووناکی چوون و لە تاریکی کەم بوونەوە. ⁂ ئەوە خـانزادەخـانی حـەریری بۆ خـۆی دێتـە سـەر رێگایە، ئەو وەختی ئەگەر تاریک و روونی بەیانی لێک دەبێــتـــەوە (لاس و خەزاڵ ل ١٣٤).

**تاریک و روونە** (ئاک. ل)[تاریک + و + روون + ئە] بڕ: تاریک و روون

**تاریک و روونی** (ئاک. ل)[تاریک + و + روون + ئی] بڕ: تاریک و روون

**تاریک و لێڵ** (ئاک. ل)[تاریک + و + لێڵ] بڕ: تاریک و روون

**تاریک و نووتەک** (ئان. ل)[تاریک + و + نووتەک] بڕ: تاریک و تنۆک

**تاریکەسـەلات** (ئان. ل)[تاریک + ئە + ســـەلات؟] ١ـ تـاریکـی خـــەست، زۆر تاریک. ٢ـ شـوێنی و جێگـای بێ شـۆق و رووناکی. ⁂ لەو ژوورە تـاریکەســـەلاتەی بۆ دانیشتوون.

**تاریکەشـەو** (ئان . ل)[تاریک + ئە + شـەو] شەوێک کـە مـانگ بە دەرەوە نەبێ، شەوەزەنگ. // مانگەشەو.

**تاریکیی** (حم.)[تاریک + ئیی] بڕ: تاریکایی

**تاریگان** (گــیـــا.)[باک] بڕ: چەودەر (هس: تارگۆن)

**تاڕ** (نا.)[زا] بڕ: تەڕە

**تازووکــــــە** (ئاک. ل)[تاز (تازە) + ئووکە] تازە، ئێستـا، نووکـە، بەم زوانە. ⁂ ئەمن دەمگۆ بلەورە تازووکە داڕژایە/ لەبەر چەکی بە قـیمـەت هێ برام سـەرم سوڕمایە (سێسەد هۆنراوە ل ٩٦).

**تازە** (ئـان.)[پـەهـ: تـازەک. لۆر: تـازە ـ

فار: تازە ـ پەش: تازە. باک: تازە، تەزە ـ ناو: تازە ـ هەو: تازە ـ زا: تەزە] ١ـ نویٚ، نەو. // کـۆنە. ٢ـ شـین، شـەق بـۆ بەر و مـیـوە و گـیـا. // ویشک، سـیس. ٣ـ (ئاک.) ئێستا، نووکە. ⁝⁝ دوو سەعاتە دانیشتووم تازە لێم دەپرسی چۆنی. ٤ـ ئیدی، ئیتر، تازەکانیٚ. ⁝⁝ تازە ئەو ماڵە بۆ من نابێتەوە ماڵ. رۆیشت و تازە نایەتەوە. ٥ـ بەم زوانە، تازووکە. ⁝⁝ تازە دوکانم داناوە. هێندە لەمێژ نیە تازە ژنم هێناوە. ٦ـ سەرەڕای ئەوانە، لەوە تێپەڕیٚ. ⁝⁝ ماڵم بۆ دانا، ژنم بۆ هێنا، تازە دەڵیٚ مەگەر چت بۆ کردووم. دوای ئەو هەموو پیاوەتییە تازە قەرزداریشم دەکا. ٧ـ دەگەڵ ژمار و بژار دیٚ و مانای درەنگ و زۆر نەبوون دەدا. ⁝⁝ تازە سەعات دەی شەوە! پەلەی چتە تازە دوو رۆژ تێپەڕیوە! ~ **بوون:** ١ـ کۆن نەبوون، نویٚ بوون. ٢ـ تازە پەیدا بوون، تازە لە دایک بوون. ~ **بوونەوە:** ١ـ شتی کۆن کە لە سەرڕاوە ساز بووبێتەوە، نویٚ بوونەوە. ٢ـ بووژانەوە، ژیانەوە. ~ **داهاتن:** شتێک کە تازە پەیدا بووبیٚ یا بووبێتە باو. ~ **کردنەوە:** ١ـ دەست پێدا هێنان و ساز کردنەوەی شتێک کە هەندێک کۆن بووبیٚ، نویٚ کردنەوە. ٢ـ دووپات کردنەوە هەندێک کردار کە زەمانێکی بە سەر دا تێپەڕیبیٚ. ⁝⁝ دیدار تازە کردنەوە، پەیمان تازە کردنەوە. ~ **لە دایک بوونەوە:** (کنـ.) بووژانەوە، سەر لە نویٚ ژیانەوە، چارەسەر بوونی گیر و گرفتێک و هیوادار بوون بە ژیان.

**تازەباو** (نا. ل)[تازە + باو2] هەرچێک تازە داهاتبیٚ و برەوی سەندبیٚ، شتی باوی رۆژ، تازەداهاتوو.

**تازەبرین** (نا. ل)[تازە + برین] ١ـ برینێک کە تازە و لەش کەوتبیٚ و هێشتا خۆش نە بووبێتەوە. ٢ـ (کنـ.) کۆستی نویٚ. & تازەزام، گەرمەبرین.

**تازەبووک** (ئان. ل)[تازە + بووک] کچێکی تازە شووی کردبیٚ، نەوبووک، نۆبووک. // تازەزاوا.

**تازە بە تازە** (ئاک. ل)[تازە + بە + تازە] شتێک کە تازە بێتەوە و کۆن نەبیٚ، هەمیشە تازە، نویٚ. ⁝⁝ نان تازە بە تازە خۆشە.

**تازەبەر** (ئان. ل)[تازە + بەر1/1] بەر و میوەی تازە، نۆبەرە.

**تازەبەهار** (ئان. ل)[تازە + بەهار] بەهاری تازەداهاتوو، سەرەتای بەهار،

نەوبەهار، بەهاری نوێ.

**تازەپیاکەوتوو** (ئان. مف.)[تازە + پیاکەوتوو (پیاکەوتن)] بڕ: تازەپێداکەوتوو.

**تازەپێداکەوتوو** (ئان. مف.)[تازە + پێداکەوتوو (پێداکەوتن)] کەسێک کە تازە پووڵدار و ماڵدار بووبێ، تازە پیاکەوتوو، تازە کیسە.

**تازەجەوان** (ئان. ل)[تازە + جەوان] مێرمنداڵ، لاوی تازەپێگەیشتوو، تازەلاو.

**تازەداهاتوو** (ئان. مف.)[تازە + داهاتوو (داهاتن)] بڕ: تازەباو

**تازەدەم** (ئان. ل)[تازە + دەم2] چا یا شتێکی دیکە کە تازە دێم کرابێ، تازەدێم.

**تازەدێم** (ئان. ل)[تازە + دێم] بڕ: تازەدەم

**تازەزام** (نا. ل)[تازە + زام][هەو] بڕ: تازەبرین

**تازەزاو** (ئان. مف.)[تازە + زاو] ژن یا گیاندارێک کە تازە زابێ.

**تازەزاوا** (ئان. ل)[تازە + زاوا] پیاوێکی تازە ژنی هێنابێ و زۆر لە زەماوەندی تێنەپەڕیبێ. // تازەبووک، نەوبووک.

**تازەساز** (ئان. مف.)[تازە + ساز] ماڵ، خانوو یا بینایەکی تازە ساز کرابێ.

**تازەساو** (ئان. مف.)[تازە + ساو (ساوین)] ئامرازێکی برین کە تازە تیژ کرابێتەوە، تازەسوو. ៖ تازە ئەبرۆت وەسمە کێشاوە بە ناز/ دڵ لەتی شمشێری تازەساوم ئەز (نالی ل ٢٢٣) بەو شیری برۆ کە تازەساون/ بەند بەندی دڵ و جگەر پساون (مەم و زین ل ٢٦٩).

**تازەسوو** (ئان. مف.)[تازە + سوو (ساوین)] بڕ: تازەساو. ៖ دڵم یەکە و غەمم دوو/ لەت لەت لە جەرگم هەڵبوو/ بوومە کێردی تازەسوو/ یەکسەر هەرام لێ بڵێند بوو (کانی مرادان ل ٩٦).

**تازەکار** (ئان. ل)[تازە + کار] کەسێک کە تازە دەستی بە کار کردبێ و هێشتا چاک لە کاران رانەهاتبێ، کەم ئەزموون لە کار. // کۆنەکار.

**تازەکانێ** (ئاک. ل)[تازە + کانێ] ١ـ ئێستا، نووکە. ٢ـ ئیدی، ئیتر. ៖ هەتا قیامەتێ تازەکانێ ئەوانە سەرهەڵدانەوەیان بۆ نییە (لاس و خەزاڵ

ل ١٥٨). ٣ـ بەم زوانە، تازووکە.

**تازەکیسە** (ئان. ل)[تازە + کیسە] بڕ: تازەپێداکەوتوو

**تازەلان** (نا. ل)[تازە + لان] بڕ: گەرمەلان

**تازەلاو** (ئان. ل)[تازە + لاو] کوری تازە پێگەیشتوو، مێرمندالّ، تازەجەوان، نەوجەوان، نۆجوان.

**تازەماڵ** (ئان. ل)[تازە + ماڵ] ١ـ کەسێک کە تازە ماڵ و ژیانی سەربەخۆی پێکەوە نابێ. ٢ـ کەسێک کە ماڵی تازە هاتبێتە گەڕەکێک یا ئاوایییەک. & نۆماڵ.

**تازەنەفەس** (ئان. ل)[تازە + نەفەس] کەسێک کە تازە دەستی بە کار کردبێ و هێشتا ماندوو نەبووبێ. ∷ ئێمە ماندوو بووین، دەستەیەکی تازەنەفەس بنێرە درێژە بە کار بدەن!

**تازەیی** (حم.)[تازە + ئی] تازە بوون، نوێ. // کۆنی

**تازی 1** (ئان.)[؟][باک ـ زا] بێ جل، رووت.

**تازی 2** (گیانـ.)[زا] بڕ: تاژی

**تازیە** (نا.)[عەر: تعزیة] ١ـ شین. ٢ـ پرسە، سەرەخۆشی، تازیمانە، ئازیەت.
**~ دانان:** سەرەخۆشی دانان. **~ راگرتن:** تازیەدار بوون و تازیە گێڕان. **~ گرتن:** تازیە گێڕان و سەرەخۆشی دانان. **~ گێڕان:** شین کردن. **~ هەڵگیران:** تەواو بوونی تازیە، سەرەخۆشی نەمان.

**تازیەدار** (ئان. فا)[تازیە + دار] ١ـ کەسی خاوەن سەرەخۆشی. ٢ـ شینگێڕ. **~بوون:** شینگێڕان، تازیە مردوو راگرتن.

**تازیەگا** (نا. ل)[تازیە + گا] شوێنی شین گێڕان، شینگا.

**تاژی** (گیانـ.)[پەه: تازییک. بیر: تازیک ـ فار: تازی ـ پەش: تازی. باک: تاژی، تەحژی ـ ناو: تاجی، تانجی، تاژی ـ زا: تاژی، تازی، تانزی] جۆرێک سەگە، لەشی باریک و لاقی درێژن، پێستی تەنک و ئاماڵ رووتە، تیژ هەڵدێ و بۆ راو رایدەگرن. (بە نێرەکەی دەڵێن گۆڵ و بە مێیەکەی دەڵێن دێڵ. دەترەکێ. سێ تا یازدە تووتکی دەبێ کە کەمێک ژیوەڵە بوون پێی دەڵێن گوجووک. دوای ساڵێک پێی دەڵێن شەک و ساڵی دوایی دەبێتە خەرت)

**تاژیلۆکــە** (گـیــانـ.)[تاژی + لۆکـە] جـانەوەرێکی رەنگ سـەوزی درێژووکـەیە، لە کولله دەچـێ، سـەری زلە، لاقی درێژ و جـووتێک بـاڵی لە سـەر پشـتـە، لە نێـو شـیناوەرد دەژی و بـۆ زەراعـەت باشـە و جـــانـەوەری زیـانـدار دەکـــووژێ. لە کوردەواریی دا ئەم جـانەوەرە ناکووژن و پێیان وایە بالـۆکەی دەست و پەل دەخـوا و هەر بـۆیە لە سـەر بالـۆکـەی دادەنێن. Mantis religiosa نـاوی لاتینـی ئـەم جـانەوەرەیە، تاجـیلـۆکـە، شـێرەکـولله، ئەسپی ئەحمەد راوکەرە، هەسپێ خودێ، بالبالۆک، تاژی ئەحمەد راوکەرە، تانجی پێـغـەمـبـەر، تـانجی پێـغـەمـەرانە، وشـترخـوا، بالووک، ئەسپی پێغـەمبەر، کوللەحاجی.

**تاژی ئەحمەد راوکەرە** (گیانـ.)[تاژی + ئەحمەد + راوکەر + ئە] بڕ: تاژیلۆکە

**تاژیەوان** (نا. ل، ئان. ل)[تاژی + ئە + وان] کەسێک کە ئاگاداریی و چاوەدێریی تـاژی بە دەســتــەوەیە، تاجــیــەوان، تانجیەوان.

**تاس**[1] (نـا.)[پەھ: تـاس. بـاک: تـاس ـ نـاو: تـاس ـ زا: تاسـە، تۆسـە] ١ـ قـاپـی قووڵی سـاز کراو لە مس، بادی، سـەکرە، زەرک. ٢ـ زێڕ و زەمبـەری دەوری کـڵاو. ٣ـ مۆرەیەکی چووکی موکـەعەبییە کـە لە یەک هەتا شـەشـی لە سـەر نەخش کراوە و بۆ کایە و قـومـار کـەلکی لێوەردەگرن، زار. **~ گـرتن:** بە تـەڕدەسـتـی تاس و زار وەهـا هەڵاویشـتن کــە خــاڵەکــانی دڵخواز بێن.

**تێـبـینی:** تاس شـێـوەیەکی دیکە لە وشـەی تـەشت ـ ە بە لە بـەر چاو گـرتنی ئاڵوگـۆڕیی دوو پـیـتی س و ش دەگـەڵ یەکتر. (بڕ: تەشت)

**تاس**[2] (ئـان.)[؟] ١ـ کــەســێک کــە تـووکـی ســـەری وەریوە، بـێ مــــوو. ٢ـ شـــوێنێک کـــە تـووک و مـــووی پێـــوە نـەبـێ. **~ بـوون:** تـووکـی ســـــــەر وەرین. **~ کـــردن:** تـووکـی ســـەر بـە گوێزان تاشین وەها کە وەک تاس دیاری بکا. ؛؛ ئەوە سەرت بۆ وا تاس کردوە.

**تاس**[3] (نـا.)[لە: تاسان] ١ـ گێژ و وڕ، کاس. ٢ـ خـەفە، پیران. ٣ـ نەخـۆشییـەکە کـە لە گەروو دا پەیدا دەبێ، دووشـاخـە. **~ بردنەوە:** ١ـ پشـوو بڕان، دە تاسەوە چوون، تاسـان، پیـران کـردن. ٢ـ واق وڕ مـان لە بـیـستن و دیتنـی شـتێکی سـەیر، سـەر سـوڕ مـان، حـەیران بوون، تاس بە

سـەرا هـاتن. **~ بە سـەرا هاتن:** بڕ: تاس بـردنەوە. **~ کـردن:** دەتاســەوە چـوون، خـنـکـان. **دە ~ەوە چـوون:** پشـوویڕان و دەنگ دەرنەهاتنی منداڵ یا کــەســێک لـە کــاتـی گــریان دا، تـاس بردنەوە، پیران کردن.

**تاسان** (چا. ل)[هس: تـەواسـان. لۆر: تاسـەنـە (خـەفـە کـردن)] ١ـ خـەفـە بوون، دەتاسەوە چوون، تاسیان. ٢ـ گێژ بوون. ٣ـ خەفە بوون و خنکان بە دووشاخە.

**تاسـاندن** (چا. م)[لە: تاسـان] ١ـ خنکاندن، خـەفە کردن، تاسـانن. ٢ـ گێژ و کاس کردن.

**تاسانن** (چا. م)[ئەر] بڕ: تاساندن

**تاساو** (نا. مفـ.)[لە: تاسان] ١ـ گێژ و وێژ، وڕ. ٢ـ کـەسـێک کـە دەتاسـەوە چوە، خەفەبوو. ❊ مەگەر مەیخانەیە دنیا کەوا کاسی لەبەر کەئسی/ بە نەغمەی عوودی سـووتاوی، بە نـەشـئـەی تـاسـی تـاسـاوی (نالی ل ٦٨٢).

**تاسک** (نا. ل)[تاس١/1 + ک][باک] بڕ: تاسوولکە

**تاسکڵاو** (نا. ل)[تاس٢/1 + کـڵاو] ١ـ جــۆرێک کــڵاوی ژنانە، لـە پارچـەی رەنگی دەیدروون، رەقـە و دەورەکـەی بـە خــشـڵ و پـووڵەکــە دەرازێننـەوە. ٢ـ کڵاوێکی ئاسنین کە شـەڕکەر لە شـەڕ دا دە سـەری دەکەن، قەتلاو، کڵاوخوود. ❊ مــەیدان نـە دیدەی ســوپایی تـارەن/ شۆڵەی تاسکڵاو تۆ نە پێوارەن (مەولەوی ل ٣٧١).

**تاسکە** (نا. ل)[تاس١/1 + کـە][زا] بڕ: تاسوولکە

**تـاسـکـەبـاب** (نـا. ل)[تـاس١/1 + کەباب] چێشـتێکە لـە گۆشت، سـێوک، باینجـانی ســوور و رەش و پیــواز کــە تەبەق تەبەق لە سەریەکی دەچنن، خوێ و ئاڵەتی لێدەدەن و دەیکوڵێنن، تاسکەواو، تاسکەبابیی.

**تاسکەبابیی** (نا. ل)[تاسکەباب + ئیی] بڕ: تاسکەباب.

**تاسکەتاسک** (ئاک. ل)[؟][تاسکە + ئاسک] ١ـ رەوتی ئاسک مــامـــز. ٢ـ (مجـ.) رۆیشتنی بەناز و غەمزەی، لەنجە و لاری ژن.

**تاسکەچەڵە** (گـیـانـ.)[تاس٢/1 + کەچەڵ + ئە] بڕ: سیسارک

**تـاسـکـەواو** (نـا. ل)[تـاس١/1 + کەواو][ئەر] بڕ: تاسکەباب

**تاس و لووس** (ئان. ل)[تاس2/٢ + و + لووس] کچ یا کوڕێک کە مووی زیادەی بە روخسارەوە نەبێ، زەریف و بێ موو. ⁘ ئەو کەسەی رامووسێ کوڵمەی تاس و لووس/ ئەو کەسەی تێی هەڵنەدابێ چارەنووس (ناڵەی جودایی ل ١٤). ~ **بوون:** جوان و زەریف بوون. ~ **کردن:** بە کەسێک راگەیشتن و جوان کردن. **خۆ~ کردن:** خۆ جوان کردن، تراش کردن و بە خۆ راگەیشتن.

**تاسوولکە** (نا. ل)[تاس1/١ + ئوولکە] قاپی چووکی مسی، پیاڵەی مسین، تاسیلە، تاسکە، تاسک.

**تاسە 1** (نا.)[ناو: تاسە ـ هەو: تاسە] ١ـ مەیل و ئارەزوی زۆر، کەڵکەڵە. ٢ـ ئیشتیا، تامەزرۆیی ~ **کردن:** ١ـ مەیل و ئارەزوی زۆر بۆ دیتنی کەسێک. ⁘ دەمێکە تاسەی دایکم دەکەم. ٢ـ ئیشتیای زۆر بۆ خواردنی شتێک. ⁘ تاسەی سەروپێم کردوە.

**تێبینی:** تاس، تاسە، تاسا لە فەرهەنگەکانی فارسی دا بە مانای مەیل و ئیشتیای خواردن بە تایبەتی مەگیرانی ژنان هاتوە.

**تاسە 2** (نا.)[زا] بڕ: تاس1

**تاسەبار** (ئان. فا)[تاسە1 + بار1/٩] کەسێک کە تاسە و ئارەزووی زۆرە، تاسەدار، تاسەمەند، ئارەزوومەند. ~ **بوون:** بە ئاواتەوە بوون بۆ پێگەیشتن، تاسەدار بوون.

**تاسەباریی** (حم.)[تاسەبار + ئیی] حاڵەت و چلۆنایەتی تاسەبار، تاسەدار و ئارەزوومەند بوون، تاسەداریی، تاسەمەندیی، ئارەزوومەندیی.

**تاسەدار** (ئان. فا)[تاسە1 + دار2] بڕ: تاسەبار

**تاسەداریی** (حم.)[تاسەدار + ئیی] بڕ: تاسەباریی

**تاسەمەند** (ئان. فا)[تاسە1 + مەند] بڕ: تاسەبار

**تاسەمەندیی** (حم.)[تاسەمەند + ئیی] بڕ: تاسەباریی

**تاسیان** (چا. ل)[ئەر] بڕ: تاسان

**تاسیلە** (نا. ل)[تاس1/١ + ئیلە] بڕ: تاسوولکە

**تاسیی** (حم.)[تاس2 + ئیی] حاڵەت و چلۆنایەتی سەری بێ موو، تاس بوون. ⁘ هەندێک مووی لە لا سەریەوە هێنابوو پێش سەری هەتا تاسییەکەی داپۆشێ.

**تــاش** (ر.)[لــە: تــاشــین] ١ـ رەگــی چاوگی تاشین. ٢ـ مانای تاشەر دەدا. ** ســـــــەرتــاش، بــەردتــاش، دارتــاش. ٣ـ (نـا.)[هەو ـ ئەر] رەوەز، گـــاشـــەبــەرد، تـاشـــەبـەرد. ** تـای بەرەزای شـــەنگ عــەنبــەربۆی شــەورەنگ/ پەخش بـی نە رووی تـاش ئەلحـــەد ســـەرای ســـەنگ (مەولەوی ل ٣٨٤).

**تاشتی** (نا.)[بڕ: چێشت][زا] چێشتی نیوەڕۆ، نەهار.

**تاشتێ** (نا.)[بڕ: چێشت][باک] نان و چای بەیانی، بەرچایی.

**تاشــراو** (نا. مــفـ.)[لە: تاشین] هەر شتێکی کە تاشرابێ، تراشراو.

**تاشـــەبەرد** (نا. ل)[تاش/٢ + ئە + بەرد/١] بـەردی یەکـــپـــارچەی گـــەورە، رەوەز.

**تاشەر** (نا. فا.)[لە تاشین] کەسێک کە شتێک دەتاشێ.

**تاشین** (چا. م)[هیک: تاشتی، تەکش ـ ئێک: تەخش ـ ئەو: تاش، تەش ـ ســوغ: تەش ـ پەهـ: تاشــتــەن، تەشــیــتــەن، تاشـــیـتـــەن. فــار: تـراشــیـــدن ـ لۆر: تێــراشــتێ. ـ پەش: تەراشـێـدل ـ تات: بێـتـاشـەسـتـەن ـ گیل: تاشـتـەن. باک: تاشین ـ ناو: تاشین، تراشـین، تەراشین ـ هەو: تاشـای ـ زا: تاشـتش] ١ـ لێدان و بڕینەوەی تووکی ســەر و بەر. ٢ـ دادانی کــەرەســـەی چێــوی و دار. ٣ـ کـڕاندنی شـــتـی زێدە. ٤ـ لێک و لووس کـــردنـی تەخـتــە و چێـو. ٥ـ لێک و لووس کـردنی بەرد و مــجـــەســـەمـــە. ٦ـ [ئەر] درووێنە کردن، دروونەوە.

**تاعل** (ئان.)[زا] بڕ: تاڵ

**تاعـــوون** (نـا.)[عـــەر: طاعـــون] نەخـۆشیەکی پڕ مەترسی و ئاهۆدارە کە لە سـاڵی ١٨٩٤ ی زایینی مـیکرۆبەکـەی دۆزراوە. ئەو نەخـۆشیـە لە کۆنەوە هەبوە و گــەلێک جــار بە مــیلیــۆن مــرۆڤ بۆتە قــوربـانی. نیــشــانەکــانی ســەرەئێــشـــە، چەقــوچۆ، ورێنە، نۆبـەتی، هەڵـمـســانی جەرگ، سپڵ و گورچیلەکان، پەیدا بوونی کوانـی گەورە لە بن هەنگڵ یا نێـوگەڵ و ئەســتــۆیە کــە دوای حــەوتــەیەک کــێم و چڵکی لێ وە دیار دەکەوێ. مشکەکانیش ئەم نـەخـۆشــیــە دەگـرن و بـە هـۆی کـێچ دەگاتە ئینسان. ئیمرۆکە چاوقوڵکە جێی مـــەترسی نیـــە و بـە واکـــســـێن بەری دەگرترێ، چاوەقووڵە، چاوقوڵکە.

**تاعەت** (نا.)[عەر: طاعة] عیبـادەت.

**~ کردن:** عیبادەت کردن، پەرستن.

**تاعەتخانە** (نا. ل)[تاعەت + خانە] شوێنی تاعەت کردن، پەرستگا.

**تاغووت** (نا.)[عەر: طاغوت] ١ـ بوت، سەنەم. ٢ـ جادووگەر، سیحرباز.

**تاغی** (نا. فا)[عەر: طاغی] ١ـ نافەرمان، سەرکەش، یاغی. ٢ـ زۆرکار، زاڵم.

**تاف** (نا.)[بڕ: تاو4] ١ـ هەڕەت، جەنگە. ⁂ لە تافی لاوەتی دا. ٢ـ (ئاک.) [باک ـ ئەر] گورج، دەستبەجێ، تاو، هەشتاو. ⁂ تە خەبەر شاند، ئەز تاف دەست رە هاتم. ٣ـ ئاوێکی زۆر و بە خۆڕ، خوڕێناو. ٤ـ تافگە، ئاوهەڵدێر.

**تافاو** (نا. ل)[تاف/٣ + ئاو1/١] ئاوی بەهێز و خوڕێن، لافاو.

**تافتە** (نا. مف.)[فار: تافتە (تافتن = بادان)] ١ـ تەنراو. ⁂ دەسرۆکەی دەستت تافتەی پیوازی/ قاوە دە دێی دا تۆ ژن بخوازی (کانی مەرادان ل ٧٦). قازان بە قازان قورینگان فڕینە/ تافتە و زەرد و سوور لە ملت ئارینە (سێسەد هۆنراوە ل ٣١). ٢ـ تەنراوێکی ئاوریشمی. ⁂ بە سەری دادا تافتەیەکی تار/ بریسکەی دەدا وەک هەوری بەهار (سەعید و میرسێوەدین ل ٢٩).

**تافگە** (نا. ل)[تاف/٤ + گە1] بڕ: تاڤگە

**تافە** (وشد.)[ئەر] ١ـ دەنگی با، وژە. ٢ـ دەنگی تەوژمی ئاو، خوڕە، هاژە.

**تافەتاف** (نا. ل)[تافە + تاف] هاژەهاژی ئاوی خوڕێن، خوڕەخوڕ. ⁂ خۆزگەی خەمم بە قەڵبەزەی سەرچاوەکەی زەڵم/ چاو وشکی کرد و ئەو وەکوو خۆی تافەتافیە (گۆران ل ٦٤).

**تاڤ 1** (نا.)[بڕ: تاو1][باک] شۆق و تیشکی هەتاو یا مانگ. ⁂ تاڤا هیڤێ، تاڤا رۆژێ.

**تاڤ 2** (نا.)[باک] بڕ: تاو3

**تاڤگە** (نا. ل)[تاڤ + گە1] شوێنێک کە ئاو لە بەرزاییەوە بە تاو دەڕژێتە خوارەوە، تافگە، ئاوهەڵدێر

**تاڤی** (نا. ل)[تاڤ1 + ئی][باک] باران و هەتاو پێکەوە، بارانی گورگەزێ، داوەتی رێوییان.

**تاق 1** (ئان.)[بڕ: تاک] ١ـ تاک، تەنیا. ٢ـ بێهاوتا، تەک، تاقانە. ٣ـ ژمارەیەک کە نیوەکەی تەواو نەبێ. // جووت. ٤ـ

کەس. ٥ـ (نا.) بەشێک لە بیست و چوار بەشی ئاو. هەموو ئاوێک بە بیست و چوار بەش ئەژمێررێ هەموو بەشێکی ناو ئەبرێ بە (تاق)ێک: لە بیست و چوار تاقەی ئەم کارێزە هەشت تاقم هەیە (خاڵ ب ١ ل ٢٧٢). ٦ـ نیوەی ڕۆژێک. ៖ لێرەوە تا چەمچەماڵ ڕۆژ و تاقێکە. ٧ـ [باک] بزن و حەیوانی گوێ سپی یا پنۆک پنۆک. ‖ **تاق تاق**: بڕ: تاک تاک. **تاقی تەنیا:** بەتەنێ، تەنیا، تاق و تەنیا

**تاق$^{2}$** (نا.)[پەه: تاک. باک: تاک، تاق ـ ناو: تاق] ١ـ میچێک بە شکڵی کەوان، کە لە سەر دەرگا، لە سەر ژوور یا لە بن پرد و جێگەی دیکە ساز کرابێ. ٢ـ بڕ: تاقە ٣ـ بڕ: گومبەز. ٤ـ (مجـ.) حاڵەتی کەوانیی برۆ و شتی دیکە. ٥ـ کەوڵی مەڕ و بزن. ٦ـ جۆرێک پۆشاک و جل، جوببە، تەیلەسان. ៖ لاچوو بە جارێ پەردە لە رووی جەننەتی ئیرەم/ رازاوە تاقی ئەتڵەس و کیمخوا و حەریر و واڵ (حەقیقی ل ٥١). ‖ **تاقی ئاسمان**: پەرپەرۆچکەی ئاسمان، تەشقی ئاسمان، تەشک. **تاقی برۆ**: کەوانی برۆ. ៖ لەبەر تاقی برۆت بمرم چ نابێ/ کە من شا بم لە بن باڵی هوما دا (وەفایی ل ٤).

**تێبینی:** عەرەب ئەم وشەیەی خواستۆتەوە و کردوویەتی طاق.

**تاقانە** (ئان. ل)[تاق1 + ئان + ئە] بڕ: تاکانە

**تاقتاق** (گیانـ.)[تاق1 + تاق1] بڕ: تاقتاقکەرە

**تاقتاقکەرە** (گیانـ.)[تاق1 + تاق1 + کەر3 + ئە] باڵندەیەکە لە ڕەگەزی کوند، خۆ لە دار هەڵداوەسێ و دەقێژێنێ و دەنگێکی وەک تووک یا تاق دەردێنێ و خەڵک لای وایە مەبەستی لە تاقانە بوونی خودایە، Otus scops ناوی لاتینی ئەم مەلەیە، تاکتاککەرە، تاقتاق، یاهەق، هەقهەقکەرە، هووهووکەرە، حەقحەقۆک، تووتەک، تووتاک، تۆتاک.

١٩ سانتیمێترە. قاوەیی ئاماڵ بۆرە، پەروباڵی ڕێ ڕێیە. لە سەری دا دوو شاخی تووک بە ئاستەم سەریان هەڵداوە. شەوانە مێش و مەگەز ڕاو دەکا. لە دارستانی نیزیک دەوروبەری ئاواییان، باغ و باغچان، کۆنەخانوو و هێلانەی کۆنی باڵندان هێلانەی ساز دەکا (فەرهەنگی باڵندە ل ١٢٣).

**تاقچە** (نا. ل)[تاق2 + چە] تاقە، تاقەی بچووک.

**تاقم** (نا.)[تور: takım] ١ـ دەستە، گرۆ، جەماعەت، تاخمە. ٢ـ دەستێک چینی. ٣ـ جووتێک ددانی دەسکردە بۆ مرۆی بێ ددان کە ددانساز سازی دەکا، لە سەر پووکی دادەنێن و کاری ددانی پێ دەکەن، ددانی عەمەلی.

**تاقمانلەجووت** (نا. ل)[تاق1 + مان + لە + جووت] بڕ: تاقمانەجووت

**تاقمانەجفت** (نا. ل)[تاق1 + مان + ئە + جفت][ئەر] بڕ: تاقمانەجووت

**تاقمانەجووت** (نا. ل)[تاق1 + مان + ئە + جووت] یاریەکی دوو کەسییە، لایەک هەندێک خیز یا شتی وردی دیکە لە مستی دەنێ و بە ویدیکەی نیشان دەدا و دەڵێ تاق یا جووت. ئەو کەسە یەکێکیان هەڵدەدا و ئەگەر قسەکەی وە راست گەڕێ ئەوە براوویەتیەوە. ئەم یاریە بۆ سەرەتای یاری دیکەش کەلکی لێوەردەگرترێ بۆ ئەوەی کە نۆرەی کایە دیاری بکرێ. تاقمان لە جووت، تاقمانەجفت، تاکمانلەجووت، گێجبازیی.

**تاق و تەنیا** (ئان. ل)[تاق1 + و + تەنیا] بێ کەس و کار، تەنیا، تاک و تەنیا، تاقی تەنیا.

**تاق و لۆق** (ئان. ل)[تاق1 + و + لۆق] ١ـ چەند شت یا چەند کەسی دوور و تەنیا لە کۆمەڵ و پۆل دا. ٢ـ بە دەگمەن، بە هەڵکەوت. & تاق تاق، تاق و لۆقە، تاک و تووک، تاک و تەرا، تاک و لۆک، تاکە و لۆکە.

**تاق و لۆقە** (ئان. ل)[تاق1 + و + لۆق + ئە] بڕ: تاق و لۆق

**تاقە** (نا. ل)[تاق2 + ئە] ١ـ شوێنێکی هەندێک قووڵ لە دیوار دا بۆ شت لە سەر دانان، تاق. ٢ـ تۆپێک پارچە. ٣ـ جۆرێک پارچەی بە نرخ لە ئاوریشم. ؛؛ چەندم پێخۆش بوو نە کەوای مەخمەر و تاقە و قوتنی و خەزەلم لە بەر دابا... (تاریک و روون ل ٥).

**تاقەت** (نا.)[عەر: طاقة] ١ـ هێز، توانا، توانست. ٢ـ سەبر و حەوسەلە. ٣ـ ئۆقرە. ٤ـ بەرگە. **~ بوون:** جێبەجێ بوون، دامەزران. **~ بە سەر چوون:** بێتاقەت بوون، تاقەت نەمان، تاقەت چوون. **~ پێشکان:** دەرۆست هاتن، قەوە پێشکان. ؛؛ ئەو بەردە بە من هەڵناگیرێ، تاقەتم پێیناشکێ! **~ تەواو بوون:** ١ـ توانایی نەمان. ٢ـ وەڕەز بوون، بێتاقەت بوون. **~ چوون:** وەڕەز بوون، بێ حەوسەلە بوون. **~ کردن:** ١ـ

شاردنەوە. ⁖ پووڵەکانم لە شوێنێکی چاک تاقەت کردوە. ٢ـ دامەزراندن، جێبەجێ کردن بە ڕێکوپێکیی. ⁖ هەتا من دێمەوە میوانەکان تاقەت کە! **~ مان:** توانایی هەبوون، حەوسەلەی ئەنجام دانی کارێک هەبوون، تاقەت هەبوون. ⁖ تاقەتی کار کردنی نەماوە بەڵام تاقەتی خواردنی هەر ماوە. **~ گرتن:** ١ـ ئارام گرتن، ئۆقرە گرتن. ٢ـ بەرگە گرتن، دەوام هێنان. ⁖ تاقەتی مستێک ناگری. **~ لێبڕین:** بێتاقەت کردن، توانایی ئەنجام دان یا درێژەی کارێک دە کەسێک دا نەهێشتنەوە، لە تاقەت خستن. **~ هەبوون:** ١ـ بەهێز بوون، توانایی هەبوون. ٢ـ تاقەت و توانای ئەنجام دانی کارێک هەبوون، وەڕەز و بێ تاقەت نەبوون. **~ هێنان:** بەرگە گرتن، دەوام هێنان، تاقەت گرتن، خۆ ڕاگرتن لە بەر مەسەلە و کارێک. **~ی خۆ نەبوون:** زۆر بێتاقەت بوون، زۆر وەڕەز بوون. **~ی هیچکەس نەبوون:** توانایی دیتن و گوێ ڕاگرتن لە کەس نەبوون، زۆر بێواز بوون. **دە (لە) ~ی کەسێک دا هەبوون:** توانایی ئەنجامی کارێک هەبوون، قەوە پێشکان، دەرۆست هاتن. ⁖ کڕینی ئەو ماڵە دە تاقەتی من دا نیە! ئەوەی تۆ کردت دە تاقەتی هەموو کەس دانیە! **لە ~ خستن:** تاقەت لێبڕین، بێتاقەت کردن.

**تاقەڕووح** (نا. ل)[تاق + ئە + ڕووح] تەنیا، تەنیابالْ، بەتەنێ، یەک تەنە. ⁖ بابت تاقەڕووحێکە و دەبێ زگی هەشتان تێر بکا.

**تاقی** (نا.)[عەر: تحقیق] سەنگ، ئازمایش، بەراورد. **بە ~ کردنەوە:** بڕ: تاقی کردنەوە. **~ کردنەوە:** ئازمایش کردن و سەنگاندنی شتێک یا کەسێک بۆ دەر کەوتنی چاک و خراپ، بە تاقی کردنەوە.

**تاک**[1] (ئان.)[پەه: تاک، تەک. باک: تەک ـ ناو: تاک، تەک، تەق، تاق ـ هەو: تاک، تاق ـ زا: تەک] ١ـ تەنیا، بەتەنێ. ٢ـ بێ هاوتا، تەک، تاقانە. ٣ـ ژمارەیەک کە نیوەکەی تەواو نەبێ. // جووت. ٤ـ کەس. **~ بوونەوە:** ١ـ جوێ بوونەوە و تاک کەوتنی گیاندارێک لە کۆمەڵەکەی. ٢ـ تاک کەوتن، تەنیا مانەوە. **~ کەوتن:** تەنیا بوون، جوێ بوونەوە لە کۆمەڵ. ‖ **تاک تاک:** ١ـ یەک یەک. ٢ـ کەم، هەندێک، تاق و لۆق. ⁖ تاک تاک خەڵک بە دەرەوەیە. & تاق تاق

**تاک**[2] (نا.)[باک] بڕ: تاق2

**تاکانە** (ئان. ل)[تاک1 + ئان1 + ئە] ١ـ تەنیا منداڵی بنەماڵەیەک. ٢ـ تەنیا کوڕی بنەماڵەیەک. ⁂ تاکانە یا شێتە یا دێوانە (پەند). ٣ـ بێهاوتا، تاک، تەک. & تاقانە، تەکانە. ~ **بوون:** ١ـ تاکە منداڵی ماڵ بوون. ٢ـ بێهاوتا بوون، بێوێنە بوون.

**تاکتاککەرە** (گیانـ.)[تاک1 + تاک1 + کەر3 + ئە] بڕ: تاقتاقکەرە

**تاکتیک** (نا.)[یون:taktika] ١ـ بەڕێوە برن و وە کار خستنی هێزەکانی جۆربەجۆر لە شەڕ دا. ٢ـ فەن، زانست و شێوەی جوڵانەوە.

**تاکسی** (نا.)[فەر: taxi] ماشێنی تایبەت بۆ راگوێزتنەوەی مسافیر لە نێو شار دا بە پووڵ.

**تاکسی میتر**(نا. ل)[فەر:taximetre] دەزگایەکی چووک کە لە نێو تاکسی دادەندرێ هەتا مەودای ئاژوانی دیار کەوێ و مسافیر بە پێ ئەم مەودایە کرێکەی بداتێ.

**تاکمانلەجووت** (نا. ل)[تاک + مان + لە + جووت] بڕ: تاقمانەجووت

**تاک و تووک** (ئان. ل)[تاک1 + و + تووک5] بڕ: تاق و لۆق

**تاک و تەرا** (ئان. ل)[تاک1 + و + تەرا] بڕ: تاق و لۆق

**تاک و تەنیا** (ئان. ل)[تاک1 + و + تەنیا] بڕ: تاق و تەنیا

**تاک و لۆک** (ئان. ل)[تاک1 + و + لۆک] بڕ: تاق و لۆق

**تاکوو** (ئام.) بڕ: تا3

**تاکە** (ئان. ل)[تاک1 + ئە] ١ـ تاکانە، تاقانە. ٢ـ یەک کەس. ٣ـ تاقڕانی زێوی ئێران (هس: تارانی)

**تاکەوتاک** (ئان. ل)[تاک1 + ئەو + تاک] جووتە کەوشێک کە لینگەکانی بە هەڵە دەپێ کرابێ یا داندرابێ، لینگاولینگ.

**تاکە و لۆکە** (ئان. ل)[تاک1 + ئە + و + لۆک + ئە] بڕ: تاق و لۆق

**تاڵ** (ئان.)[باکـ زا] بڕ: تاڵ1

**تالار** (نا.)[گیل: تەلار ـ پەش: تالار ـ فار: تالار. باک: تەلار ـ ناو: تالار، تاللار، تەلار] ١ـ دیوی گەورە و بەربڵاو. ٢ـ شوێنی گەورە بۆ بەڕێوە بردنی شانۆ و نمایش. ٣ـ شوێنی گەورە، ساڵۆن. ٤ـ

دیوی گــەورەی لە نهــۆمی ســەرەوە، شانشین، باڵەخانە. ﷼ میر دەچۆ سەر کۆشک و تالاران، تەمەشای قووچی قەزەنی کرد (مان ل ١٢٧).

**تالحە** (نا.) بڕ: تالع

**تالدە** (نا.)[باک] بڕ: داڵدە

**تالع** (نا.)[عەر: طالع] ١ـ شانس، بەخت. ٢ـ چارەنووس. ٣ـ پێشگۆیی چارەنووسی خەڵک، فاڵ. & تاڵە، تالحە. ~ **گرتنەوە:** شانس و بەخت بە تاقی کردنەوە بە فاڵ، فاڵ گرتنەوە. ~ **نووسران:** ئەو رووداوانەی کە بۆ مرۆڤ دیاری کراوە، چارەنووس نووسران.

**تاللار** (نا.) بڕ: تالار

**تالک** (گیا.)[تال + ک][باک] بڕ: تاڵوو

**تالووکە** (نا.)[عەر: تهلكة][باک] خەتەر، مەترسی.

**تالە** (ئان.)[زا] بڕ: تاڵ1

**تالی** (گیا.)[تال + ی][باک] بڕ: تاڵوو

**تالیب** (نا. فا)[عەر: طالب] داواکەر، خوازیار. ﷼ گەر تالیبی ماچێکی ئەتۆ لەو دەمە قەندەی/ بەو زولفە دەبێ هەروەکوو من خۆت لە رەسەن دەی (وەفایی ل ١٩٨). ~ **بوون:** خوازیار بوون، داواکار بوون.

**تالیـژاری** (نا. ل)[تال + ئی + ژار + ئی][باک] بڕ: تاڵشاریی

**تالیشک** (گیا.)[تال + ئیشک][باک] ١ـ بڕ: تاڵیشکە. ٢ـ بڕ: تاڵە/١

**تاڵ**[1] (ئان.)[هیک: تەکرە ـ پار: تخل ـ پەهـ: تەخل، تەهل. پەش: تریخ ـ فار: تلخ ـ تات: تەل ـ گیل: تەل. باک: تال، تەحل، تەعل ـ ناو: تاڵ، تار ـ هەو: تاڵ ـ زا: تاعل، تال، تالە، تۆل، تەلە] ١ـ تامی لە زاران ناخۆش. // شیرین. ٢ـ هەر شتێکی ناخۆش. ﷼ رووداوی تاڵ، قسەتاڵ، رۆژی تاڵ. ٣ـ ناشیرین، ناحەز. ﷼ خوێنتاڵ، گۆشت تاڵ. ٤ـ رۆژێکی سارد و ناخۆش و رهێڵە کە نەکرێ جووتی تێدا بکەن یا ئاژەڵی بڵەوەرێنن، تووش. ~ **بوون:** ١ـ گۆڕانی تامی شتێک و بەرەو تامی تاڵ چوون. ٢ـ تامی تاڵ هەبوون. ٣ـ (کنـ.) رەزاگران بوون، خوێنتاڵ بوون.

**تاڵ**[2] (نا.)[هیک: تەنترە ـ ئەو: تەثرە. لۆر: تال. ناو: تاڵ، تار] ١ـ هەودا، داو، تار. ٢ـ دەنکێک موو. ﷼ مامم تەمەنی زۆرە بەڵام سەری یەک تاڵی سپی تێدا

نیە. & تەڵ.

**تاڵ**[3] (ئان.)[بڕ: تار1] ١ـ رەنگی رەش مەیلەو زەرد یا زەردی مەیلەو رەش. ٢ـ [ئەر] رەش، تار. ∷ تاڵ داگەڕیان.

**تاڵ**[4] (ئا.)[عەر: طحال] بڕ: سپڵ

**تاڵ**[5] (نا.)[؟] جەوت و مازوو و تۆکڵەهەنار کە مەشکە و هەمبانە و چەرمی پێخۆش دەکەن، هەڵاڵ. ~ **دان:** خۆش کردنی چەرم بە تاڵ و هەڵاڵ.

**تاڵان** (نا.)[مەغ: تالان] ١ـ بردن یا برانی بە زۆریی ماڵ و سامان و دەوڵەتی کەسێک یا شوێنێک بە تێگڕایی، چەپاو، تاڵان و برۆ، تاراج، تاڵوو، تارتاله، نژده. ٢ـ دۆڕانی تەواوی پووڵ و پارە و ماڵ. **بە ~ بردن:** تاڵان کردن و بردنی ماڵ و دەوڵەتی کەسێک یا شوێنێک، تاڵان کردن، چەپاو کردن. **بە ~ چوون:** تووشی تاڵان هاتن و دزران و برانی هەموو ماڵ و حاڵ، بە تاڵان ڕۆیین، بە تاراج ڕۆیین. **بە ~ دان:** نابوود کردن، فەوتاندن، بە تاراج دان. **بە ~ ڕۆیین:** بڕ: بە تاڵان چوون. ∷ ماڵمان تاڵان کرا، مەڕ و ماڵمان هەمووی بە تاڵان ڕۆیی/ ئێمە دەبێ دانیشین بە هەناسەساردی و بەبێ نانی و بەبێ دۆیی (لاس و خەزاڵ ل ٥٣). ~ **بوون:** دۆڕانی هەموو پووڵ و پارە لە قومار دا، سوخت بوون. ~ **بردن:** تاڵان کردن، بە تاڵان بردن. ∷ ئاخر چ بکەم لەوەی دا سەرزەنشتی من دەکەن، دەڵێن تاڵانیان برد و لاس پێی نە گەڕاوە (لاس و خەزاڵ ل ١٦٣). ~ **ستاندن:** بە تاڵان بردن، تاڵان کردن، تاڵان بردن، تاڵان ئەستاندن. ~ **کران:** رووت کران و بە تاڵان بردنی ماڵ و سامان. ~ **کردن:** ١ـ بڕ: بە تالان بردن. ٢ـ بردنەوەی هەموو پووڵ و پارەی کەسێک لە قومار دا، سوخت کردن. ~ **ئەستاندن:** بڕ: تاڵان ستاندن.

**تاڵانبەر** (ئان. فا)[لە: تاڵان بردن] کەسێک کە ماڵی خەڵک بە تاڵان دەبا، تاڵانکەر. ∷ کوڕ تاڵانگێڕەوەیە و کچ تاڵانبەر (پەند ل ٣٣١).

**تاڵانستێن** (ئان. فا)[لە: تاڵان ستاندن] کەسێک کە ماڵی خەڵک بە تاڵان دەبا، تاڵانکەر، تاڵان ئەستێن.

**تاڵانکراو** (ئان. مف.)[لە: تاڵان کران] کەسێک کە ماڵ و سامانی بە تاڵان بردراوە. ∷ تاڵانکراو بە ماڵ ئەبێ،

سکەڕۆ بە ماڵ نابێ (پەند ل ١٥٠).

**تالانکەر** (ئان. فا)[لە: تالان کردن] ١ـ کەسێک کە ماڵی خەڵک بە تالان دەبا، تالانبەر. ٢ـ دز، ڕێگر.

**تالانکەریی** (حم.)[تالانکەر + ئیی] کار و پیشەی تالانکەر، دزیی، ڕێگریی.

**تالانگێڕەوە** (ئان. فا)[تالان + گێڕەوە] کەسێک کە بەری تالان دەگرێ و ناهێڵێ ماڵی بە تالان بەرن. ⁂ کوڕ تالانگێڕەوەیە و کچ تالانبەر (پەند ل ٣٣١).

**تالان و بڕۆ** (نا. ل)[تالان + و + بڕۆ] ١ـ بڕ: تالان. ٢ـ شێواویی و کەس بە کەس نەبوون، تێکەوڵێکە.

**تالانە** (نا. ل)[تالان + ئە][ئەر] بڕ: تەڵان

**تالان ئەستێن** (ئان. فا)[لە: تالان ئەستاندن] بڕ: تالانستێن. ⁂ ئەحمەدخانی سوورچی و زووراری تالانی برد و تالان ئەستێنە/ ئەی بۆ دەڵێن لاس پیاوێکی ڕەشیدە، بازە، شەهێنە (لاس و خەزاڵ ل ١٦٢).

**تالانیی** (نا. ل)[تالان + ئیی] ماڵ و شتێک کە بە تالان براوە.

**تالاو** (نا. ل)[تاڵ1 + ئاو1] ١ـ ئاوی تاڵ و ناخۆش. ٢ـ ئاوی سەفرا، زەرداو. ⁂ ئەمێستەش گەرچی عەیش و عوشرەتت هەر تاڵ و تالاوە/ بە مەرگی تۆ لە پاشانیش دەخۆی تالاوی تالاوی (نالی ل ٦٨٢). ٣ـ شوێنێک کە ئاوی ڕووبار و جۆبار و بارانی تێدا کۆ ببێتەوە و مەنداو بێ، زۆنگ. ٤ـ (مجـ.) دەرد و خەمی زۆر.

**تالاویی** (نا. ل)[تالاو + ئیی] ١ـ ئاوی ناخۆش و تاڵ، تالاو. ٢ـ تالایی ژیان، دەرد و خەم.

**تالایی** (حم.)[تاڵ1 + ئایی/١] ١ـ تامی تاڵ، تاڵ بوون. ٢ـ ناخۆشیی. ٣ـ ڕەزاگرانیی، ناحەزیی. & تاڵیی

**تاڵخ** (نا.)[؟] سنووری نێوان دوو دێ یا دوو زەوی، مەرز، حدوود، کەوشەن، توخووب، تووخب، تخووب. ~ **دانان:** سنوور کێشان، دیاری کردنی مەرز و حدوود، تخووب دانان.

**تاڵشاریی** (نا. ل)[تاڵ1 + شار (ژار) + ئیی] جیوەیەکی ڕەنگ قاوەیی تۆخە کە لە گیایەکی بە ناوی [لات: Aloe vera، عەر: صبر] دەگرترێ، تامی زۆر تاڵە و بە سانایی لە نێو ئاوی داغ دا دەتوێتەوە

و بۆ دەرمــان کــەلکی لێــوەردەگــرن، تاڵیشاریی، تالیژاری.

**تاڵشک** (گـیـا.)[تاڵ1 + شک] بڕ: تاڵیشکە

**تاڵک** (گیا.)[تاڵ1 + ک] ١ـ بڕ: تاڵکە ٢ـ بڕ: تاڵوو. ٣ـ جۆرێک هەرمێ.

**تاڵکە** (گـیـا.)[تاڵ1 + کـە] جـۆرێک گـرکـەیە کـە بە نەگـەیوی تاڵە، تاڵک، تەحلک.

**تاڵگ** (گـیـا.)[تاڵ1 + گ][ئەر] بڕ: تاڵیشکە

**تاڵگە** (گـیـا.)[تاڵگ + ئە][ئەر] بڕ: تاڵیشکە

**تاڵ و ســـوێریی** (نا. ل)[تال + و + سوێریی] دەرد و ناڕەحەتیی، مەینەت و نـاخــۆشـــیـی، تـاڵـیی و ســـوێریی. ¤ کــراســـێکە بە بەژنی مـن بڕاوە تاڵ و سوێریی ژین/ کە هەر ئەسرینە دەیڕێژم، کە هەر زووخـاوە دەیچێژم (حـەقـیـقی ل ١٧٩). **~ چێـژتن:** (کنـ.) مـەینەت و نـاخــۆشـــیی دیتن لە ژیان دا، تـاڵـیی و سوێریی چێژتن.

**تاڵوو** 1 (گیا.)[تاڵ1 + ئوو] گیایەکی تاڵە مـاڵات نایخـۆن، هـەتا گـەزێک بەرز دەبێتـەوە، گەڵاکـانی پان و ناسکن و لە دوایـی جـــــوێ دەبـنـەوە و بـا بـۆ هــەر لایەکــیــان دەبا، لە ریشـــەکـــەی بـۆ سـووتـەمـەنی کـەلک وەردەگـرن کـە پێی دەڵێن کــــۆڵوو، Centaurea cen- taurium ناوی لاتینی ئەم گـیـایەیە، تاڵک، تالی، تالک (عەر، فار: قنطوريون، قـنـطـريـون ـ ئـين: centaurea). **لـە خــشـــەی ~ رەوینەوە:** (کنـ.) زۆر ترسەنۆک بوون

**تاڵوو** 2 (نا.) بڕ: تاڵان

**تاڵووکــە** (ئاک.) پەلە، لەز. **بە ~ بوون:** بـە پـەلـە بـوون، پـەلـە هــەبـوون، تاڵووکـە هـەبوون. **~ کـردن:** پەلەپەل کـردن، پەلە کـردن. ¤ تاڵووکـەی مـەکـە هەر ئێـسـتـا خـۆم سـاز دەکـەم! **~ هەبوون:** بە پەلە بوون، بە تاڵووکە بوون.

**تێبینی:** لە زمـانی سـانسـکریت دا تـەرو taru هـەر بـەو مـــانـایـە هـاتوە. هـەروەها لـە فـــەرهـەنگەکـانی زاراوەی باکـووری دا تالووکە بـە مـانای خـەتەر و مـــەترسـی لە tehlike ـ ی تورکی کـــە خـۆی لە تهلكة ـ ی عـــەڕەبی کـــەوتوە، هـاتوە.

**تاڵە** 1 (گیا.)[تاڵ1 + ئە] ١ـ گیایەکی

خۆرِسکە لە دەستەی سێوەرِە، گەڵاکانی پەنجەیی و گوڵەکانی شین و سپی و مۆر و زەردن، بەرەکەی دەنکێکی تاڵە دە نێو کەلوو دا کە خۆش دەکرێ و دەخورێ، Lupinus albus ناوی لاتینی ئەم گیایەیە، هەرزەڵە، تالیشک. (عەر: ترمس ـ فەر: lupine). ٢ـ دەنکێکی چووکی خرِی رەشە کە لە نێو گەنم و نیسک و دانەوێڵەی دیکە دا پەیدا دەبێ و تامی تاڵە، تاڵەکە، مرۆر. (فار: سیهک). ٣ـ (ئان.) مەرِی لەش سپی دەم و چاو بۆر. ٤ـ (ئان.) گوێدرێژ و ئێستری دێزە.

**تاڵە**[2] (نا.)[باش ـ هەو] بر: تالع

**تاڵەکە** (گیا.)[تاڵ1 + ئەکە][ئەر] بر: تاڵە/٢

**تاڵیش** (گیا.)[تاڵ1 + یش] بر: تاڵیشکە

**تاڵیشاریی** (نا. ل)[تاڵ1 + ئی + شار (ژار) + ئیی] بر: تاڵشاریی.

**تاڵیشک** (گیا.)[تاڵ1 + ئیشک] بر: تاڵیشکە

**تاڵیشکە** (گیا.)[تاڵ1 + ئیشک + ئە] گیایەکی خۆرِسکە کە هەتا گەزێک بەرز دەبێتەوە،، ساقەتی زوور و گەڵاکانی ناسک و تووکن (کە لە کاتی لێکردنەوەی شیرەیەکی سپی لێدێتە دەر)، تامی تاڵە و کەو زۆری پێخۆشە، تاڵیشک، تاڵشک، تاڵیش، تاڵگ، تاڵگە، تالیشک، گیاکەو، تەحلی.

**تاڵیی** (حم.)[تاڵ1 + ئیی] ١ـ تامی تاڵ، تاڵ بوون. ٢ـ ناخۆشیی. ⁂ وەرە با هەڵمژم ئەو لێوە شیرینە بە کەیفی خۆم/ لە پاش ئەو تاڵییە با من دەمێک شەکرم لە دەم دابێ (تاریک و روون ل ٢١٨). ٣ـ رەزاگرانیی، ناحەزیی. & تاڵایی. **بە ~ باس کردن:** بە خراپ و ناحەز باسی کەسێک کردن، باسی رەزاگرانی و خوێنتاڵی کەسێک کردن. ⁂ کەسێکی تۆ ناخۆشت ویست و بە تاڵییت باس کرد، ئەویش ناخۆشی دەوێ و دەبێتە قەستەسەری (سەعید و میرسێوەدین ل ١١٧).

**تاڵیی و سوێریی** (نا. ل)[تالیی + و + سوێریی] بر: تاڵ و سوێریی. **~ چێژتن:** (کن.) بر: تاڵ و سوێریی چێژتن.

**تام** (نا.)[عەر: طعم] ١ـ هەستی تاڵیی، سوێریی، شیرینیی و ترشیی کە لە خواردن و خواردنەوە دەکرێ، چێژ، چێژە. ٢ـ چەوریی و رۆنی نێو چێشت. ٣ـ لەززەت، خۆشیی، چێژ. ⁂ تامی ئەو

دیدارەم لە بیـــــر ناچێ. ٤ـ [باک] رووکێشی سەر کانزا بە تایبەت زێڕ و زێو. ~ **تێکردن:** چەوریی و ڕۆن و ئاڵەت دە چێشت کردن، تامدار کردنی چێشت. ~ **چێژتن:** بە تاقی کردنەوەی تامی خواردەمەنی، تام کردن، چێژتن. ~ **دان:** ١ـ تام هەبوون، چێژ هەبوون. ٢ـ رووکێشی زێڕ یا زێو لە کانزای دیکە دان. ~ **شتێک یا خواردنێک دە بن ددان دابوون:**(کنـ.) بیرەوەری حاڵەتێک یا خواردنێک لە بیر نەکردن. :: تامی ئەو کفتەی دایکتم هەر لە بن ددان دایە. تام و چێژی ئەو سەفەری پێکەوە کردمان هەر لە بن ددانم دایە و قـــەتم لە بیـــر ناچێ. ~ **کـــردن:** بڕ: تام چێـــژتن. ~ **نەبوون:** ١ـ بێـتـــام بوون، چێـــژ نەبوون. ٢ـ خـــۆش نەبوون، بێ لەززەت بوون. :: بێ تۆ هیچ کۆڕ و مەجلسێک تامی نیە. || **تامی تامی:** چاوبز* **تامی تامی دان:** چاوبز دان. **تامی زار:** (کنـ.) نیـــەت، بۆچوون، ویست. * **تامی زاری کەسێک چێژتن (زانین، کردن):** (کنـ.) پەی بردن بە نیەت و ویستی کەسێک سەبارەت بە مەسەلەیەک بە قسە کردن و دواندن. :: دەستبەجێ مەنێرە سەری لە پێشدا تامی زاری دایک و بابی بزانە لە دوایی تێگرا دەچینە خوازبێنی.

**تامـــازرۆ** (ئان. ل)[تام + ئا + زرۆ] [ئەر] بڕ: تامەزرۆ

**تامـان** (نا.)[هس: تان1] ١ـ دەرک و دیوارۆچکە یا بەرهەڵســتی لە شـــووڵ تەنراو، تەیمان، تان، تانە، چەپەر. ٢ـ پـەرژیـن. ٣ـ [بـاک] پـەیـوەنـدی دار و درەخت، متوربە، لوول.

**تاماندن** (چا. م)[لە: تامان/٣][باک] متوربە کردنی درەخت، پەیوەند کردن.

**تامـدار** (ئان. فـا)[تام/٣ + دار2] خواردنێک کە تامی خۆش بێ، خۆش چێژ، بەتام.

**تامــــزیڤ** (ئان. ل)[تام/٤ + زیڤ] [باک] رووکێشی زێو، ئاوەزێو.

**تامـزێڕ** (ئان. ل)[تام/٤ + زێڕ][باک] رووکێشی زێڕ، زێڕکفت، ئاوەزێڕ.

**تامـسـار** (ئان. ل)[تام/١ + سـار] [باک] مەیخۆش، تفت.

**تام و بۆ** (نا. ل)[تام + و + بۆ] بۆن و بەرامەی چێشت.

**تام و خـــوێ** (نا. ل)[تام/٢ + و + خـــوێ] ١ـ رادەی ڕۆن و خـــوێی نێـــو

چێشت، چێژی چێشت. ⁂ چێشتێکی بە تام و خوێیە. ٢ـ (مجـ.) تـام، چێژ. **~ کـردن:** چێـژتنی چێـشت بۆ دەرکـەوتنی ئـەنـدازەی رۆن و خــــــوێ و بـەهـارات، چێژتن، تام کردن.

**تامووسک1** (نا. ل)[تا (تار2) + موو + س + ک] مـووی درێـژی کلکی یەکـسم کە بـۆ داو و تەپکە کـەلکی لێـوەردەگرن، داممووس، داممووسک، داممووسکە.

**تامــووسک2** (نا. ل)[تا1 + مــووس (میز) + ک][باک] بڕ: تێمیسک

**تامیسک** (نا. ل)[تا1 + میس (میز) + ک] بڕ: تێمیسک

**تامیسکە** (نا. ل)[تا1 + میس (میز) + کە][باک] بڕ: تێمیسک

**تامێزک** (نا. ل)[تا1 + مێز (میز) + ک] بڕ: تێمیسک

**تامێسک** (نا. ل)[تا1 + مێس (میز) + ک] بڕ: تێمیسک

**تامــــەزرۆ** (ئـان. ل)[تام + ئە + زرۆ (ئارەزوو؟)][لۆر: تەمارزو ـ ناو: تامەزرۆ، تامـازرۆ][هس: تـامـسـار] کـەسـێک کـە مــەیل و تاســەیـەکی زۆری هـەیە. **~ بوون:** مەیل و تاسەیەکی زۆر هـەبوون. ⁂ زۆر تامـەزرۆی شـۆرباوکفتەم. تـامەزرۆی دەرس خــوێندنم. **~ کــردن:** مــەیل و تـاســـەیەکی زۆر دە کـــەســـێک دا پێـک هێنان. ⁂ هێندەی بـاسـی سـەفـەرەکـانـی خۆی بۆ کردووم منیشی تامەزرۆ کردوە.

**تامــەزرۆیی** (حم.)[تامـەزرۆ + ئیی] حـاڵەتی کـەسـی تامـەزرۆ، مـەیل و تاسـە. **~ شکان:** پـێـگـەیـشـتن بـە مـــــەیل و ئارەزوو و تـامــەزرۆ نـەمـان. ⁂ هێندەم خــوارد و خــواردەوە هـەتا تـامـــەزرۆییم شکا.

**تان1** (نا.)[نـاو: تـان ـ هـەو: تـان] ١ـ تـاڵی هـەر تـەنـراوەیـەک لـە ســـــەرەوە بـۆ خـوار کـە پۆی تێـهـەڵدەکـێـشن، رایەڵ، تـانـتــــــە. // پـۆ. ٢ـ [باک] دیـوار یـا پەرژینی سـاز کـراو لە شـووڵ و قـامـیش، چیت، تامـان. **بە ~ا چوون:** بژاردن و دەست نیشـان کـردنی چاکە یـا خـراپەی کەسێک بە دوور و درێژیی، بە تانا هـاتن، بە تـانـوپـۆ دا هـاتن، بـە تـانوپۆ دا هـاتن. **~ دەرکــەوتن:** ١ـ شــڕ بوون و کــۆن بوونـی تەنـراوە. ٢ـ (کنـ.) عــەیب و عــار دەرکەوتن و ئاشکرا بوون.

**تێبـینی:** تان لە چاوگی تەوێستـایی تەن tan و تەنین ـ ی کوردیی کەوتوە.

**تان**[2] (نا.)[باک] بڕ: تا1

**- تان**[3] (ئام.) جێناوی دووهەم کەسی کۆ. ‡ ماڵتان، کتێبەکەتان.

**تانار** (نا.)[؟][باک] بەخـــــیــــە و درووماننێکی تایبەتی کە بنی کتێب لێک دەبەســـتــێــتـــە و لە دوایی بەرگی تێدەگرترێ، شیرازە، شیرازی.

**تانتە** (نا.)[هەو] بڕ: تان1. ‡ دیسان دەس چەرخ هەم ها نە کـــار دا/ تای تـانتـــەی دووریش وســـتـــەن وە دار دا (مەولەوی ل ٢٥٣).

**تـــانج** (نـــا.) بـــڕ: تـــاج. || **تــانجـــی دەروێشیی:** بڕ: تاجی دەروێشیی.

**تانج زێڕین** (گیانـ.)[تانج + زێڕین] ٩ سانتیمێترە... سەری زەردە و دوو هێڵی رەشـی پێــداهاتووە. کــاکــۆڵی نێــرە نارنجـیـیـە و هـی مێـیـە زەردی کـاڵە. بە باڕی کاکۆڵی نییە. ئەو باڵندەیە پشتی ســەوزی زەیتــوونیــیــە و بەرزگی زەردی ئامـاڵ سپی. تەنیشتی شین دەچن؛ باڵی دوو خەتی سـپی و خەتێکی پانی رەشی پێــداکـــشـــاوە. لە لێـــڕەواران دەژی. زســـتـــانـان لە ســـەر پەرژین و پنچکان دەبینرێ. هێلانەی بە چڵـووکی دارانەوە هـەڵداوەسـێ (فـــەرهەنگی بـاڵنـده ل ٣٤) Rrgulus regulus نـاوی لاتینی ئەم باڵندەیە.

**تانجـــۆکـــە** (نا. ل)[تانج + ئۆکـە] ١ـ تانجی چووک. ٢ـ لیزگە مـووڕووی سـەر نێـوچاوان. ٣ـ مـووی نێـوچاوانی کـچی بچکۆڵە کـە دەیهـۆننەوە و بە ســەریەوە دەبەستنەوە هەتا نەچێتە نەکەوێتە سەر چاوی.

**تانجی** (گیانـ.) بڕ: تاژی

**تانجی پێـغـەمەر** (گـیـانـ.)[تانجی + پێغەمەر] بڕ: تاژیلۆکە

**تانجی پێغەمەرانە** (گیانـ.)[تانجی + پێغەمەر + ئانە] بڕ: تاژیلۆکە

**تانجیـــەوان** (نا. ل، ئان. ل)[تانجی + ئە + وان] بڕ: تاژیەوان

**تانزی** (گیانـ.)[زا] بڕ: تاژی

**تانک** (نز.)[ئین: tank] مەکینەیەکی قـورس و گـەورەی زرێپـۆشی شـەرە کـە تۆپ و رەشــاشی لە ســەر دامـــەزراوە، چەرخی تایبــەتی هەیە و لە ســەر زەوی ناڕێکیش جوان دەڕوا. بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩١٦ی زایینی، سەردەمی شەڕی یەکـــەمی جـــەهانی وەکـــاریان خـــست، دەبابە.

**تانکێــــر** (نا.)[ئین: tanker] ١ـ ماشێنی گەورەی نەفتکێشی کە دەفرێکی گەورەی لە سەر پشتە و نەفت و گازۆڵ و شتی دیکەی لەم بابەتی پێوە رادەگوێزن. ٢ـ دەفرێکی گەورە کە لە ماڵ یا شوێنی دیکە ئاو یا نەفتی تێدا پاشەکەوت دەکەن، ئەنباراو.

**تانگۆ** (نا.)[ئیس: tango] جۆرێک سەمای دوو کەسییە کە سەرچاوەکەی لە مکزیکەوەیە و دوایی لە دونیا بوو بە باو و مووزیکی تایبەتی خۆی هەیە.

**تانوپۆ** (نا. ل)[تان1 + و + پۆ] ١ـ تاڵەکانی تەنراو بە گشتی، رایەڵ و پۆ. ٢ـ (مجـ.) بنەچەکە، رەگەز. :: دەزانم کێی تانوپۆت باش دەناسم. **بە ~ دا چوون:** بە دوور و درێژیی چاکە یا خراپەی کەسێک باس کردن و بژاردن، بە تانوپۆ دا هاتن، بە تانا چوون. **بە ~ دا هاتن:** بڕ: بە تانوپۆ دا چوون. **لە ~ کەوتن:** لە کەلک کەوتن، ئیدی بە کار نەهاتن، زۆر پیر بوون. || **تانوپۆ ئاوریشم:** (کنـ.) کەسێک کە لە لایەن دایک و باوکییەوە رەگەزی رەسەن بێ.

**تانووت** (نا.)[عەر: طعنة] ١ـ سەرکۆنە، لۆمە، توانج، تانە. ٢ـ غەیرەت، ئازایەتی. :: کەس ئەو تانووت و غیرەت و ئازایەتییەی نەبووە/ کەس چاوی بە گوڵی چل پلەی حومامێ نەکەوتووە (لاس و خەزاڵ ل ٨٧). **~ لە خۆ دان:** ١ـ خۆ لۆمە کردن، عەیب لە خۆ گرتن. ٢ـ غیرەت وەبەر خۆ نان. :: هەموو لە خۆیان دا تانووت و هونەرییە/ خۆیان غەرق کرد لە ئەسپاب و هاچە و چەکییە (لاس و خەزاڵ ل ٥٤) دەستی منت دامێن بێ لە خۆت بدە تانووت و حونەرێ/ بە وەعدەی پازدە شەو لە مزگەوتێ وەرە دەرێ (شێخ فەرخ ل ٦٣). **~ لێدان:** سەرکۆنە کردن، عەیب لێگرتن.

**تانە**[1] (نا.)[عەر: طعنة] ١ـ عەیب، لۆمە، تەشەر، تانووت. ٢ـ[باک] برین، زام. **~ تێگرتن:** تەشەر لێدان، تانە لێدان. **~ لێدان:** لۆمە کردن، عەیب گرتن.

**تانە**[2] (نا.)[بڕ: دانە1] ١ـ [باک] دانە، دەنک، قل. ٢ـ [ئەر] پەڵە، خاڵ. ٣ـ پەڵەیەکی سپییە ئەکەوێتە سەر بیبیلەی چاو، تاریکی دەکا، (خاڵ ب ١ ل ٢٧٦). :: زمان بۆ پەسنی ئەو لێوئاڵە لاڵە/ گلێنەم تانەداری دانە خاڵە (خەیام ل ٩٥) تاریکی، تەمی دەشتی دڵ و تانەیی

سەر چاو/ شاباڵی پەخش کردبوو تاکوو ئەبەدییەت (گۆران ل ١٧١). ٤ـ نیشانەی پێگەیشتنی میوە (کشت و کاڵ ب ١ ل ٧٨). ~ **تێکەوتن:** سەرەتای پێگەیشتنی بەر و میوە. :: بێستانەکەم تانەی تێکەوتوە.

**تانە**$^{3}$ (نا. ل)[تان1 + ئە] دیواری لە شووڵ تەنراو، تامان، تان، تەیمان.

**تانین** (نا.)[فەر: tanin] ماددەیەکی پێکهاتوو لە ئۆکسیژێن، کەربۆن و ئیدرۆژێنە کە لە گیا و داری شین دا زۆرە بە تایبەت لە بەڕوو دا و بۆ چەرمسازیی کەلکی لێوەردەگرن، جەوت.

**تاو**$^{1}$ (نا.)[پەه: ئافتاپ. لار: تاڤ ـ بەل: تاپ ـ پەش: تاو (گەرما). باک: تاڤ، تەڤ ـ ناو: تاو] ١ـ هەتاو، خۆرەتاو، خۆر، وەر. ٢ـ شۆق و تیشکی خۆر. ٣ـ بە ناوەوە دەلکێ و مانای تواوە دەدا. :: بەزەتاو، قیرەتاو. ٤ـ یاو، تا، تێ. ٥ـ تین، جۆش، توندیی و تیژیی گەرما. ~ **پەران:** بڕ: تاو پەڕین. ~ **پەڕین:** ئاوا بوونی تاو لە ئاسۆ، تاو پەڕان. ~ **تێکردن:** شوێنێک کە تاو دەیگرێتەوە و شۆقی لێدەدا. ~ **دان:** ١ـ تین دان، زیاد کردنی گەرمای ئاگر. ٢ـ (مجـ.) هان دانی کەسێک بۆ ئەنجام دانی کارێک. ~ **سەندن:** تیژ بوونی ئاگر، گەرم بوونی زۆر. ~ **لێهاتن:** تووشی یاو و نۆبەتی بوون، تا لێهاتن. ~ **هەڵاتن:** هاتنە دەری خۆر لە بەیانیان دا، تاو ئەنگووتن، رۆژ هەڵاتن. ~ **ئەنگووتن:** بڕ: تاو هەڵاتن. || **تاوی سەرمابردوو:** (کن.) خۆرەتاوی زستان کە تینی کەمە.

**تێبینی:** چاوگی تەپ tap لە ئەوێستا دا بە مانای گەرم بوون هاتوە و کۆمەڵێک وشەی کوردیی کە گەرما و تین دەگەیەنن وەک (تەو، تێ، تاوە، ...)لەم چاوگە کەوتوونەتەوە. (بڕ: تا1)

**تاو**$^{2}$ (نا.) توانایی، تاقەت، هێز، تاب. :: دڵ تینوە، سووتاوە، بەبێ تاقەت و تاوە/ رێگەم بە سەراوە کە دەچم رێم بەسراوە (نالی ل ٥٣٢).

**تێبینی:** تاو لە چاوگی تاوین کەوتوە.

**تاو**$^{3}$ (نا.)[باک: تاڤ ـ ناو: تاو] ١ـ پێچ، با. ٢ـ ئالاو، بادراو. :: پاتاوە، پێتاو. ٣ـ تاڵ، هەودا. ~ **دان:** ١ـ بادان، پێچ پێدان. ٢ـ سووڕاندن، هەڵسووڕاندن

**تێبینی:** تاو بەم مانایە چاوگەکەی

نەمــاوە، لە زمــانی فــارسی دا تاب لە چاوگی تابیــدن (تابیــدەن) بـە مــانای پێچانەوە و بادان هەرماوە.

**تاو** 4 (نا.)[پەھ: ئۆشـتـاپ. باک: تاو ـ ناو: تـاو، تاف، هەشـتـاو ـ هـەو: تاو] ١ـ غار دانی توند، هەشتـاو، تاف. ٢ـ پەلە، لەز. ٣ـ وشــــار، زەخت. ٤ـ هـێـــــرش، هەڵمــەت.٥ـ داخ و خـەفـەتی دەروون. ❊ کوڕەکـەم نەخـۆشـە و شـەوانـە لە تاوانی خـەوم لێناکـەوێ. ٦ـ ترس، باک، خـۆف. ٧ـ مــەیل، ســـوێ، ئارەزوو. ٩ـ تونـدیی، تـەوژم. ~ **بـۆ هـێـنـان:** ١ـ زەخـت بـۆ هێنان، دە فـشــار نان. ٢ـ تەنگان. ~ **دان:** ١ـ لێـخـورین بە تونـدیی. ❊ ئەسپ تــاو دان. ٢ـ زەخــت بــۆ هــێــنــان. ❊ زگــــچـــــوون وەها تـاوی دام ئەگـــــەر نەگـەیشـتـبـامـە ئاودەسـتـێک لە خـۆ دەڕیام. ~ **گــرتن:** بـە تونـدی وەکــار کەوتن.

**تاو** 5 (ئـاک.)[بـاک: تـاو ـ نـاو: تـاو] کاتێکی کەم، دەم، سات، ئان، لەحزە. ❊ مامم هاتە لام تاوێک دانیشت و ڕۆیشت. || **تاوتاو:** ســات ســات، دەم دەم. **تاو نا تاوێک:** دوو کـاتی کـەم بە مـەودایەک دە نێـوانیـان دا، دەم نـا دەمـێک. ❊ تاو نا تـاوێک چـاوێکی لێـدەکــردم و ســەری دادەخستەوە.

**تـاو** 6 (نـا.)[نـاو: تـاو ـ هــەو: تـاوە] ڕەهێــڵــەی باران، تـاوەباران، ڕێژنە. || **تاوی باران:** ڕەهێـڵـەی باران. ❊ دەزانێ تاوی بـارانە شـــەرابی پێکەنینی گــوڵ/ دەمێک نابێ لە سەر خـەندێکی سەدجارم نـەگــریێنێ (وەفــایی ل ٢٠٤) خـــەجێ دەگـریا وەکـوو تاوی دە بارانە (گـەنج ل ٣١٢).

**تاوان** 1 (نا.)[پەھ: تاڤان. گیل: تاڤان. باک: تاوان ـ ناو: تاوان ـ هەو: تاوان] ١ـ ســــووچ، گـــوناھ، خـــەتا. ٢ـ ســــزا، جـەریمە. ~ **بژاردن:** سـزای تاوان دان، جـــەریمە بژاردن، تـاوان دان. ~ **دان:** سزای تاوان دان، جەریمە بژاردن. ~ **دانـە پـاڵ:** بـڕ: تـاوان وەپـاڵ دان. ~ **دانەوە:** ســزا دانەوە. ~**کـردن:** گـوناھ کـردن، خـەتا کـردن. ~ **لە سـەر شـان هەبوون:** تاوانبــار بـوون بە مـــەســـەلە و کـــارێک، هـەڵگری تاوانێک بـوون. ❊ نە پیـاوم کوشـتـوە و نە هیچ تاوانێکم هەیە لە سەر شانی (سـەعید و میرسێوەدین ل ٢١٥). ~ **وەپاڵ دان:** ســـووچ و تـاوان خـسـتنە ئـەسـتۆی کـەسـێک و تاوانبـار کـــردن، تاوان دانە پاڵ. ❊ کـــۆمـــەڵێک تاوانیـــان وەپاڵ من دابـوو کـــە هـیــچی

راست نەبوو. **دەست لە هیچ ~ یک نەگێڕانەوە:** (کنـ.) هەمە چەشنە تاوان و کارێکی چەوت کردن تەنانەت جەنایەت بۆ سەرکەوتن و بە مەبەست گەیشتن. ⁘ کۆنەپەرستی لە هەموو شوێنێکی جیهان دا بۆ پاراستنی دەستەڵاتی خۆی دەست لە هیچ تاوانێک ناگێڕێتەوە (تاریک و روون ل ٣٧).

**تاوان$^2$** (چا. ل) بڕ: توانەوە

**تاوانبار** (ئان. فا)[تاوان1 + بار1/٩] کەسێک کە سووچ و گوناه و خەتایەکی کردوە، خەتاکار، تاوانکار، تاواندار. **~ بوون:** خەتاکار بوون، گوناهکار بوون. **~ کردن:** خەتاکار کردنی کەسێک.

**تاوانباریی** (حم.)[تاوانبار + ئیی] کار و کردەوەی تاوانبار، تاوان کردن، تاوانکاریی، تاوانداریی.

**تاواندار** (ئان. فا)[تاوان1 + دار] بڕ: تاوانبار

**تاوانداریی** (حم.)[تاواندار + ئیی] بڕ: تاوانباریی.

**تاواندنەوە** (چا. م) بڕ: تواندنەوە

**تاواندەر** (ئان. فا)[تاوان1 + دەر (دان)] کەسێک کە سزای تاوانەکەی دەدا، کەسێک کە جەریمەی دەدا.

**تاوانکار** (ئان. فا)[تاوان1 + کار] بڕ: تاوانبار

**تاوانکاریی** (حم.)[تاوانکار + ئیی] بڕ: تاوانباریی

**تاوانگاز** (ئان. ل)[تاو1/١ + ئان + گاز] بڕ: تاوەسووت

**تاوانەوە** (چا. ل) بڕ: توانەوە

**تاوبردوو** (ئان. ل)[تاو1/١ + بردوو] بڕ: تاوەسووت

**تاوبردە** (ئان. ل)[تاو1/١ + بردە] بڕ: تاوەسووت

**تاوپەرست** (ئان. فا)[تاو1/١ + پەرست] کەسێک کە هەتاو دەپەرستێ.

**تاوپەرستیی** (حم.)[تاوپەرست + ئیی] دین و ئایینی تاوپەرست، هەتاو پەرستن.

**تاوپەڕ** (نا. ل)[تاو1/١ + پەڕ (پەڕین)] ١- (ئاک.) کاتی تاوپەڕین ئەودەم کە زەردە دەکەوێ، تاوپەڕان. ٢- تاوی پشت کێوان کە تەنیا رەنگی بە ئاسمانەوە یا بە ئاسۆوە دیارە، زەردەپەڕ، زەردە.

**تاوپەڕان** (ئاک. ل)[تاو1/١ + پەڕ + ئان] بڕ: تاوپەڕ/١

**تاوتوو** (نا. چا)[تا2 + و + توو3] ١ـ کاری سەنگ و سووک کردنی دوو دەفر و لینگەبار کە شتێکیان تێدابێ بۆ هاوسەنگ کردن. ٢ـ کاری هەڵسەنگاندن و لێکدانەوەی بیر و مەسەلەیەک. **~ کردن:** ١ـ سەنگ و سووک کردنی دوو دەفر کە شتێکیان تێدابێ بۆ هاوسەنگ بوون و بە قەد یەک لێهاتن. ٢ـ بیر و مەسەلەیەک سەنگ و سووک کردن، لێدوان و باس کردنی بیر و مەسەلەیەک.

**تاوتێ** (نا. ل)[تا1 + و + تێ2] لەرز و تای نۆبەتی و یاو، چەقوچۆ.

**تاوس** (گیانـ.)[عەر: طاوس لە: هیندیی] ١ـ مەلێکی باڵ و پەڕ جوان و رەنگاورەنگە (سپی و شینیشی هەیە) رەگەزەکەی هی هیندوستان و مالێزییە، دەنگی تیژ و ناخۆشە، نێرەکەی کلکێکی درێژی هەیە کە وەک چەتر هەڵیدەدا، بۆ جوانییەکەی رادەگیرێ، گۆشتی دەخورێ بەڵام خۆش نیە، سی ساڵ دەژی و لە سێ ساڵەی پێدەگا Pavo ناوی لاتینی ئەم مەلەیە. ٢ـ (نا.) ئامێرێکی ژێداری مۆسیقایی هێندووستان. ٣ـ (مجـ.) رەوتی جوانی ئافرەت.

**تاوسان** (نا. ل)[تاو1 + سان][پەه: تاپەستان. لۆر: تۆوسۆ ـ فار: تابستان ـ گیل: تابەسۆن، تاڤەسۆن ـ پەش: تابیستان. ناو: تاوسان][ئەر] دووهەم وەرزی ساڵ (پووشپەڕ، گەلاوێژ، خەرمانان)، وەرزی هەتاو و گەرما، هاڤین، ئامنان، هامن، هاوین.

**تاوسە** (گیانـ.)[تاوس + ئە] ٤٧ سانتیمێترە. شینی مەیلەوبنەوشە. دندووکی درێژە. چاو، نێوچاوان و لاقی سوورە. زەنگە درێژە. بە باریی بۆری مەیلەوشینە. ئەو باڵندەیە بە قامیشان هەڵدەچێ. لە کاتی فڕین قاچی شۆڕ دەکاتەوە. لە قامیشەڵانی قەراغ شام دەژی و هەر لەوێ هێلانەی دەکا (فەرهەنگی باڵندە ل ١٤٨)، Por-phyrio porphyrio ناوی لاتینی ئەم مەلەیە.

**تاوک** (گیا.) بڕ: تاوکە

**تاوکە** (گیا.)[؟] دارێکی سەختی خۆڕسکە، بەرێکی چووکی بە قەرا نووک دەدا کە دەخورێ، تاوک، تایلە.

**تاوگر** (نا. فا، نا. ل)[تاو1/١ + گر] ماڵ یا شوێنێک کە هەمیشە هەتاو

لێیدا.

**تاولەمــە** (نا.)[؟] دەفــرێکی چووکی کـون کـونە کـە لـە سـیم سـازی دەکـەن، رەژی تێدەکەن و ئاگری دەدەن. لە دوایی دەسـکـێکـی درێـژ کـــــــە هــەیـەتـی هەڵیدەسووڕێنن هەتا رەژی بگەشێتەوە و بۆ ســەری قـەننـە کـەلکی لێـوەردەگـرن، ئاگـــرگـــەشکەرە، ئاگـــرگـــەشکەرەوە، ئاوربووژە.

**تاوڵ** (نا.)[؟] چادر، رەشـمـاڵ. **~ هەڵدان:** دامـەزراندن و قـایم کـردنی تاوڵ و رەشماڵ.

**تــاوڵــە**[1] (نــا.)[تــور: tavla لــە: ئیتالیایی] تەختەنەرد، تەختە.

**تاوڵە**[2] (گیا.)[؟][ئەر] بڕ: گژنیژ. ‖ **تاوڵە کێفیلە:** بڕ: گژنیژی کێویی.

**تــاووبــان** (ئــان. ل)[تــاو1/١ + و + بان5] حـــاڵی هـەوای ســـاو و رووناک و خۆش کە هەتاو بە ئاسمانەوەیە.

**تاووتین** (ئان. ل)[تاو1/٥ + و + تین] ١ـ توند و تیژیی ئاگر، تین، تاو. ٢ـ هێز، توانایی، گوڕ و تین.

**تاووســـــاو** (ئان. ل)[تـاو1/١ + و + ساو] هەوای ساو و بێ هەور.

**تاوهەڵات** (ئاک. ل)[تاو1/١ + هەڵات (هـەڵاتن)] بەرەبـەیان کـــاتـی هـەڵاتن و ئـەنـگـووتـنـی هــەتـاو، تـاوئـەنـگـووت، خۆرهەڵات. ⁖ کوتی دەنا سبحـەینێ بۆ تاوهـەڵاتێ قـەرارمـان بێ، بێیـەوە (مـان ل ١١٤). شـەولەوەڕیان باویشـتایەتە بناری کـوێسـتـان... تـاوهـەڵاتیـان بهـێنـایەتەوە سەر کانی (لاس و خەزاڵ ل ١١٩).

**تــاوە**[1] (نــا. ل)[تــاو1 + ئــە][پــەهـ: تـاپەک، تـاوەک. فـــار: تـابـە ـ لۆر: تۆوە ـ گیل: تۆوە ـ بیر: تاوە ـ تات: تۆوە ـ گیل: تاڤێه. باک: تەوە، تاوە ـ ناو: تاوە ـ هەو: تاوە] دەفـرێکی کـانزای پەلی دەسکدارە کە بۆ سـوور کـردنەوەی خـۆراک کـەلکی لێوەردەگرن.

**تاوە**[2] (نا.)[هەو] بڕ: تاو6

**تاوەباران** (نا. ل)[تاو6 + ئە + باران] بارانی کەم دەوام، رێژنە، تاو.

**تاوەسۆ** (ئان. ل)[تاو1/١ + ئە + سۆ (سووتان)] بڕ: تاوەسووت

**تاوەســووت** (ئان. ل)[تاو1/١ + ئە + سووت] ١ـ قـاڵ و رەش بوونەوەی پێسـتی لەش لـە بـەر هـەتاو، تاوبـردوو، تـاوبـردە، تاوانگاز، تاوەگاز، تاوەسۆ، تاوەسووتوو، خـۆرەنگاز. ٢ـ مـیوە یـا گـیایـەک کـە زۆر

لەبەر هەتاو مابێتەوە و سووتابێ.

**تاوەسووتوو** (ئان. ل)[تاو1/١ + ئە + سووتوو] بڕ: تاوەسووت

**تاوەکی** (ئام.) بڕ: تا3

**تاوەکوو** (ئام.) بڕ: تا3

**تاوەکوونێ** (ئام.) بڕ: تا3

**تاوەگـــاز** (ئان. ل)[تاو1/١ + ئە + گاز] بڕ: تاوەسووت

**تـاو ئـەنـگـووت** (نـا. ل)[تـاو1/١ + ئەنگووت] ١ـ (ئاک.) کـاتـی هاتنە دەری خـۆر لە بەیانیـان دا، تاوهەڵات. ٢ـ ڕەنگ و شـۆقی خۆر بەر لە هاتنە دەر.

**تاویار** (نا. ل)[تاو (تـاوە) + یار][ئەر] بڕ: تاوێر2

**تاویان** (چا. ل)[ئەر] بڕ: توانەوە

**تاویانەوە** (چا. ل)[ئەر] بڕ: توانەوە

**تاویلکە** (نا. ل)[تاوە + ئیلکە] تاوەی بچووک.

**تاوین** (چا. ل) بڕ: توانەوە

**تاوینەوە** (چـا. ل)[تاوین + ئەوە] بـڕ: تواندنەوە

**تاوێر**[1] (نا.)[؟] ١ـ تاشـــەبـەردی زۆر گـــەورە، بەردی زل. ٢ـ بـەردی زل کـــە لە کێـو یـا لە بەرزاییـەوە خللۆر دەکـرێتـەوە، هـەتار، لاتار، جاڵە، جارە.

**تاوێر**[2] (نا. ل)[تـاو (تاوە) + ئێـر] ١ـ ئەندازەیەک بە قـەرا تاوەیەک گەنم، قـاوە یـا دەنکـی دیـکە کـــــــە بـۆ بـردێ. ٢ـ ئەندازەیەک لە قـاورمـە بە قـەرا تاوەیەک کـە سـوور بکرێتـەوە. ٣ـ ئەندازەیەک لە کەشک بە قـەرا سوێنـەیەک کە بیسـوون. & تاویار

**تـاوێـن** (ر.)[لـە: تـاویـن] ١ـ ڕەگـی چـاوگـی تـاویـن. ٢ـ بـە نـاوەوە دەلکـێ و مـــانای تاوێنەر دەدا. ፨ جــەرگ تـاوێن، گیان تاوێن.

**تایبەت** (ئان.)[؟] ١ـ حـاڵی شـتـێک، کەسێک یا مەسەلەیەک کە لە چاو شتێک کـەسـێک یا مـەسـەلەیەکی دیکە شـازتر بێ، خاس. ٢ـ تەرخان. **~ دان:** شتێک جـــیـــا کـــردنـەوە و دانان بـۆ کـــار و مـەسەلەیەکی هەڵبژاردە، تەرخان کردن. ፨ ئەو ژوورەم تایبـەت داوە بە مـیـوانان. ئەو دەورییـەم تایبـەت داوە بە تۆ کـەسـی دیکە هەقی نیە تێیدا بخوا.

**تایبەتمەند** (ئان. فا)[تایبەت + مەند] تایبەرت دراو، بژاردە.

**تایبەتمەندیی** (حم.)[تایبەت + مەند + ئیی] هەر چێک کە بۆ شتێکی تایبەت تەرخان کرابێ، خوو و رەوشتی تایبەت.

**تایبەتیی** (حم.)[تایبەت + ئیی] بژاردە، مەخسووس. ~ **بوون:** مەسەلە یا کارێک کە ئاسایی نەبێ و چلۆنایەتی و بارودۆخی خۆی هەبێ.

**تایچە** (نا. ل)[تا2 + ی + چە] بڕ: تاینچە

**تایر** (نا.)[ئین: tyre] بڕ: تەگەر

**تایفە** (نا.)[عەر: طائفة] ١ـ کۆمەڵێک لە بەرەیەک، تیرە. ٢ـ کۆمەڵ و دەستەیەکی هاوتا و هاوڕەگەرز. ⁂ تایفەی دزان. تایفەی حیز و خراپ.

**تایفەدار** (ئان. فا)[تایفە + دار2] خاوەن تایفە.

**تایفی** (گیا.)[تایف (عەر: طائف) + ئی] جۆرێک ترێی بۆڵ درێژی سپی. ⁂ دانیشتییە چەند سپییە/ دەرێی ترێی تایفییە/ ماچی نەکەی کەیفی نیە (سێسەد هۆنراوە ل ٤٢).

**تێبینی:** تایف شارێکە لە عەرەبستان کە ترێ و مێوژەکەی بە ناوبانگە.

**تاینچە** (نا. ل)[تا2 + ین + چە][تات: تایچە (جەواڵ). ناو: تایچە، تاینچە ـ هەو: تاینچە] ١ـ رەشکەی کاکێشان کە لایەکی بارە، تایچە. ٢ـ لینگە جەواڵ، تایەکی بچووک.

**تایلە** (گیا.) بڕ: تاوکە

**تایە**[1] (نا. ل)[تا2 + یە] ١ـ گزرە گیای لە سەر یەک کەڵەکەکراو بۆ تفاقی زستانانەی ئاژەڵ. ٢ـ مەڵۆی لە سەر یەک کۆکراوە، گیشەی گەنم و جۆ.. **لە ~ دان:** دروونی گیا و گیشە لێ ساز کردن.

**تایە**[2] (نا.)[ئین: tyre] بڕ: تەگەر

**تایەن** (نا.)[پەه: دایەک. کرم: تایە ـ لۆر: تایە ـ تات: تایە ـ فار: دایە. باک: دایین ـ ناو: دایەن، دایان، تایەن] ژنێک کە منداڵی ژنێکی دیکە بە خێو دەکا یا شیری دەداتێ.

**تبل** (نا.)[باک] بڕ: تلی

**تپل** (نا.)[باک] بڕ: تلی

**تخووب** (نا.)[عەر: تخوم لە سور: تخوم] پارچە زەوییەک وەک رێچکە لە نێوان دوو زەوی دا، سنووری نێوان دوو دێ یا دوو زەوی، مەرز، حدوود، کەوشەن، توخووب، تووخب، تاڵخ. ~

**دانان:** سنوور کێشان، دیاری کردنی مەرز و حدوود.

**تخوون** (نا.)[؟] نزیکیی، توخن. ~ **بوون:** نزیکایەتی کردن، تخوون کەوتن، خۆ تێگەیاندن، توخن بوون. ∷ شەرت بێ ئەمن ئەو عافرەتە بخوازم هەتا بە دەستی خۆی دۆخینم نەکاتەوە، ئەمن تخوونی نەبم (لاس و خەزاڵ ل ٩). ~ **کەوتن:** نزیک بوونەوە، خۆ تێگەیاندن، خۆ لێدان، توخن کەوتن. ∷ شێخ فەرخیان لە تەویلەی فرێ دا بەرپێی ولاغان ... هیچ تخوونی نەکەوتن بۆوەی پێی لێبنێن (شێخ فەرخ ل ٢٦).

**تر** (ئام.)[هیک: تەرە ـ ئەو: تەرە ـ هەخ: تەرە ـ پەه: تەر] ١ـ [باک: تر ـ ناو: تر ـ هەو: تەر] ئامرازی ئاوەڵناوی تەفزیلی (سفەتی تەفزیلی). ∷ چاکتر، دوورتر، خۆشتر، چێتر. ٢ـ [ناو: تر ـ هەو: تەر] دی، دیکە. ∷ رۆژێکی تر، ماڵێکی تر.

**ترازان** (چا. ل)[ناو: ترازان، ترازیان ـ هەو: ترازیای] ١ـ جووڵانەوە و لە باری ئاسایی چوونە دەری شتێک. ٢ـ لێک جیا بوونەوە، دوور کەوتنەوە، کلا بوون. ٣ـ کرانەوە، ئاواڵە بوون. ∷ ترازا دوگمەکەی سینەی بە یاری زولفی هات غەمزە/ بەیان بەربوو لە لای چین، بە خەبەر بن تیرەبارانە (وەفایی ل ١٤٢). ٤ـ پسان، پچڕان. ∷ رەگی بەدەنم پاکی لەبەریەک ترازا (لاس و خەزاڵ ل ٤٥).

**ترازاندن** (چا. م)[لە: ترازان] ١ـ جووڵاندنەوە و بزاواندنی شتێک و لە حاڵی ئاسایی دەرهێنان. ٢ـ لێک جیا کردنەوە، لێک دوور کردنەوە. ٣ـ کردنەوە، ئاواڵە کردن. ∷ ئەوە ترازاندم دەرکی چەکخانە (لاس و خەزاڵ ل ١٤٩). ٤ـ برین، پساندن. ∷ کەس ناتوانێ بترازێنێ قسەی تۆ (سەعید و میرسێوەدین ل ١٥١).

**ترازوو** (نا.) بڕ: تەرازوو

**ترازووباز** (ئان. فا)[ترازوو + باز] بڕ: تەرازووباز.

**ترازووبازیی** (حم.)[ترازووباز + ئیی] بڕ: تەرازووبازیی.

**ترازیان** (چا. ل)[ئەر] بڕ: ترازان

**تراژێدی** (نا.)[یون: tragodia] ٣ـ نمایش یا فیلمێکی غەمێنەر ٢ـ رووداوێکی راستی و غەمێنەری ژیانی مرۆڤ.

**تــراش** (نــا.)[لــه: تــراشــین] بــڕ: تراش. **~ کردن:** بڕ: تەراش کردن.

**تراشە** (نا. ل)[تراش + ئە] بڕ: تەلاش

**تراشین** (چا. م) بڕ: تاشین

**ترافانن** (چا. م)[ئەر] بڕ: رفاندن

**ترافـــیک** (نا.)[ئین: traffic] ١ـ هاتوچۆی ماشـێن و مـەکـینە لە سـەر ڕێگاکــان. ٢ـ شلووق بوون و جـــووڵەی کەمی ماشێن و مەکینەی هاتوچۆ.

**تراکتۆر** (نا.)[لات: tractor] جۆرێک ماشـێنی بە هێز و گەورەیە کە بـۆ جووت و گێرە و بار کێشان و ڕاگوێزتن کەلکی لێوەردەگرن.

**ترامـــــوا** (نا.)[ئین: tramway] جـۆرێک قـەتاری نێـو شـارە کـە لە سـەر رەیل دەڕوا و بە هێـزی بەرق کار داکا و بۆ ڕاگـوێزتنی خـەڵک لـە شـوێنێکەوە بۆ شوێنی دیکە کەلکی لێوەردەگرن.

**ترانـزیت** (نا.)[لات: transitus] ١ـ چوونـی کـاڵا و شــمــەک لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتی دیکە بێ دانی حــەقی گــومـرگ و ماڵیات. ٢ـ تێپەڕین لە وڵاتێک بێ مانەوە لەم وڵاتە.

**ترانزیستۆر** (نا.)[ئین: transistor] ئامێرێکی ئەلکتریکییە و چونکە چووک و قـایمە لە زۆربەی کەرەسـەکانی پەیوەندی دا کەلکی لێوەردەگرن.

**تراو** (نا. ل)[تر (تەڕ؟) + ئاو] ئاوەکی زۆر شل، هـەرچێکی کـە بەشـی زۆرتری ئاوەکی بێ، ترنگ.

**تراوکــــە** (نا. ل)[؟] تاریکایی چاو. **~ کــردن:** تاریک بوونی چاو، کــەم بوونی سـۆمـا و بینایی. ⁘ ئەمن شـەو و ڕۆژ بۆ وی ســـووتـاوم/ تراوکــە دەکــا، نابینێ چاوم (سـەعید و میرسێوەدین ل ٤٩)

**تــراویـلـکـە** (نـا. ل)[تراو + ئـیلکـە] شـوێنێک لە شـۆرەکات، بیابان و جادەی ئیـسـفـاڵت کـە لە بەر شـۆقی هەتاو لە دوورەوە وا دیاری دەدا کە ئاوە. (تیشکی کە لەم شوێنە دەدا، دەگەڕێتەوە و چاو بە هەڵە بە ئاوی دەبینێ.)

**ترب** (گیا.) بڕ: توور2

**ترپ** (گیا.) بڕ: توور2

**ترپۆکە** (گیا.)[ترپ + ئۆکە] گیایەکە بۆ دەقی کووتاڵ بە کار دێت (هەنبانە ب ١ ل ١٤٦)، گـیـایەکی خـۆڕسکە، گـوڵی زەرد و وردی هـەیـە، لە نێـــو گـــەنم دا دەڕوێ و زۆریش بـەرز دەبێـــــتــــــەوە.

لاسکەکەی وەک ڕێواس دەخورێ.

**ترپە** (وشد.) ١ـ دەنگی کەوتنە خواری شتی گەورە بەڵام نەرم. ٢ـ دەنگی نەرمی پێ. ٣ـ دەنگی نەرمی لێدانی دڵ. & ترفە

**ترپەترپ** (وشد.)[ترپە + ترپ] دەنگی پەیتا پەیتای ترپە.

**ترت** (ئا.)[؟][ئەر] قامک، ئەنگوست.

**ترخـێنە** (نا. ل)[تر (تەڕ؟) + خـێن (خـوون = گـەنم؟)][ناو: ترخـێنە ـ باش: تەرخـێنە ـ زا: تـەرنە] ١ـ گـەڵا و سـەلکی شـێلم ورد دەکەن و دەگەڵ برۆێشی گەنم لێکیدەدەن و دە دەفرێکی دەکەن و ئاوی تێـدەکـەن و بۆ مـاوەی حـەوتوویەک دیدەپۆشن. لە دوایی سەلک سەلک لەبەر هەتاو هەڵیـدەخـەن هەتا ویشک بێ و هەڵیـدەگرن بۆ زسـتـان بۆ چێشت. ٢ـ چێشـتـێکی کـوردەوارییـە. ( ترخـێنە بە تەڕیی (تەڕەساز) و بە ویشکیش نیسک و نۆک و مـێـوژ و گـوێز و چەوەندەر و گۆشـتی قاورمـە و خوێ و ڕۆنی تێدەکەن و خـواردنێکی شل و مـزرە بـۆ ڕۆژانی ساردی زستانیی.)

**تێبینی:** ئەم وشەیە بە شێوەی ترخینە (تەرخـینە) و ترخـوانە (تەرخـانە) لە فارسی دا هاتوە هەروەها تەرەخاناس لە زمـانی یونانیش دا هـەر بەم چێـشـتـە دەکـوترێ و تورکـەکـانیش tarhana ی پێدەڵێن.

**ترس**[1] (نا.)[ئەو: ترەس، تێـرێس ـ هەخ: تەرس ـ پەه: تیـرس، تەرس. پەش: تـەرس ـ فـار: ترس. باک: ترس ـ ناو: ترس ـ هەو: ترس، تەرس ـ زا: تەرس] ١ـ خۆف، باک، سـام. ٢ـ (نا. فا) لە وشـەی لێکدراو دا بە مـانای ترسـاو دێ. ؛؛ لە خواترس. **~ داگرتن:** ترس ڕێنیشتن، ترس لێ پەیدا بوون، ترسـان. **~ دە دڵ دا نەبوون:** نەترسـان، لە هـیچ کـەس و شـتێک نەترسان، بێبـاک بوون. **~ دەر کردن:** چارەسـەر کردنی ترسـی ترساو بە تـایبـەت منداڵـی ترسـاو بـۆ ترس شکانی. **~ ڕێ نیـشتن:** خـۆف کـردن، ترسان لە کەسێک یا لە شتێک، ترس لێ پەیدا بوون، ترس لێنیشتن. **~ شکان:** نەمـانی ترس لە شـتێک یا کـەسێک کـە پێشتر ترسی پێکدێنا، سام شکان. **~ لە چاو دا کـوشتن:** (کنـ.) نەترس بوون، بەدڵ بوون. ؛؛ چەرمەسـەری و کارەسـاتی ژیان ترسیان دە چاوم دا کوشتوە. **~ لە چاو دا مـردن:** نەترسـان، چاونەترس بوون. ؛؛ کـەریم زۆر پیـاوێکی ئازایە لە هـیـچ نـاتـرسـێ، تـرس لـە چـاوی دا

مردوه. **~ له کەس نەبوون:** نەترسان، له کەس نەترسان، بێباک بوون. **~ لێ پەیدا بوون:** ترس رێ نیشتن، ترسان، خۆف کردن. **~ لێشکان:** نەمانی ترس و ئاسایی بوونی ئەو شتە یا کەسە له لای کەسێک کە پێشتر لێی دەترسا. **~ لێنیشتن:** بڕ: ترس رێ نیشتن. **~ نانه بەر:** کەسێک له شتێک یا مەسەلەیەک ترساندن. :: نابێ له خۆڕا ترس بنێیە بەر منداڵ. **~ هەبوون:** ١ـ ترسان. ٢ـ نیگەران بوون. :: ترست نەبێ له کڕینی ئەم دوکانه زەرەر ناکەی! **له ~ان تڕ وه تڕ رانەگەیشتن:** (کنـ.) زۆر زۆر ترسان، له ترسان له خۆ ریان. **له ~ان گۆشتی لەش بوونه ئاو:** (کنـ.) زۆر ترسان، ترسی زۆر رێنیشتن. **له ~ان گوو (میز) به خۆ داکردن:** (کنـ.) زۆر ترسان، له ترسان له خۆ ریان. **له ~ان له خۆ ریان:** (کنـ.) زۆر ترسان، له ترسان گوو به خۆ داکردن.

**ترس**[2] (ئان.)[زا] بڕ: ترش

**ترس**[3] (نا.)[زا] قەڵغان. سپەر

**ترسان** (چا. ل)[ئێک: ترس ـ ئەو: تەرێس ـ هەخ: ترسە ـ پەه: تەرسییتەن. تات: بێتەرسەستەن ـ فار: ترسیدن ـ گیل: تەرسێن. باک: ترسیان، ترسین ـ ناو: ترسان، ترسیان ، ترسین ـ هەو: تەرسای ـ زا: تەرسایش] ١ـ خۆف هەبوون، ترس هەبوون، نەوێران. ٢ـ نیگەران بوون. :: دەترسێم ئەوساڵ له ئیمتەحانەکانم دەرنەچم.

**ترساندن** (چا. م)[له: ترسان][پەه: تەرسێنیتەن] کەسێک تووشی ترس کردن، ترسانن.

**ترسانن** (چا. م)[ئەر] بڕ: ترساندن

**ترساو** (نا. فا)[له: ترسان] کەسێک کە له کەسێک یا شتێک ترسی رێ نیشتوه.

**ترسناک** (ئان. ل)[ترس + ناک][پەه: تەرسناک] بڕ: ترسێنەر

**ترسنۆک** (ئان. ل)[ترس + نۆک] بڕ: ترسەنۆک

**ترس و لەرز** (نا. ل)[ترس + و + لەرز] ئەنجام دانی کار و کردەوەیەک به نهێنی و ترسان له ئاکامەکەی.

**ترسۆک** (ئان. ل)[ترس + ئۆک][باک] بڕ: ترسەنۆک

**ترسۆنەک** (ئان. ل)[ترس + ئۆنەک] بڕ: ترسەنۆک

**ترسهێنەر** (نا. فا)[ترس + هێنەر] بڕ: ترسێنەر

**ترسەترس** (نا. ل)[ترس + ئە + ترس] ئەنجام دانی کار و کردەوەیەک بە پارێز و پەنامەکی. ∷ ئەو هەموو دڵەکوتە و ترسەترسەی ناوێ لێی بچۆ پێشە و قسەی دڵتی پێبڵێ!

**ترسەنۆک** (ئان. ل)[ترس + ئەنۆک] [باک: ترسۆنەک، ترسۆک ـ ناو: ترسەنۆک، ترسنۆک، ترسۆنەک ـ زا: تەرسۆک، تەرسۆنەک] کەسێک کە لە زۆر شتی ئاسایی ترسی هەبێ، خوێڕیی، نەوێر، تەرسەزاڵ، قزە.

**ترسیان** (چا. ل)[ئەر] بڕ: ترسان

**ترسین** (چا. ل) بڕ: ترسان

**ترسێن** (ر.) لە رەگی ترسان دەکەوێ بە ناوەوە دەلکێ و مانای لێ ترساو دەدا. ∷ چاوترسێن.

**ترسێنەر** (نا. فا)[ترس + هێنەر] شتێک یا کەسێک کە ترس پێکدێنێ و جێگەی مەترسییە، ترسهێنەر، ترسناک.

**ترش** (ئان.)[پەه: تروش. تات: تۆرش ـ فار: ترش ـ بیر: تۆرۆش ـ پەش: توورش. باک: ترش ـ ناو: ترش، تورش ـ هەو: تش، ترش ـ زا: ترش، ترس] ١ـ یەکێک لە تامەکان کە دم پێی کۆ دەبێتەوە، تامی سماق و سرکە. ٢ـ (نا.) سماقی هاڕاو، ترشەسماق. ٣ـ (نا.) خۆرشت. ٤ـ (مجـ.) رووگرژ، مۆن. **~ بوون:** ١ـ تامی ترش بە خۆوە گرتنی شتێک. ٢ـ (مجـ.) رووگرژ بوون. **~ کردن:** گۆڕینی حاڵەتی خواردەمەنی بە ترش لێدانی، ترشاندن. ٢ـ (مجـ.) رووگرژ کردن، نێوچاوان تاڵ کردن.

**ترشان** (چا. ل)[لە: ترش] ١ـ ترش بوون و گۆڕانی حاڵەتی شتی ماوە. ٢ـ ئەزیەت بوونی گەدە و مێعدە لە بەر زۆرخواردن و ترش بوون و کزانەوەی گەدە. ٣ـ (کنـ.) مانەوەی کچ و تێپەڕینی تەمەن و مێرد نەکردنی. ٤ـ (مجـ.) مانەوەی زۆر لە شوێنێک. ∷ پیاو وەدەرنەکەوێ لە ماڵ دا دەترشێ. & تورشیان

**ترشاندن** (چا. م)[لە: ترشان] گۆڕینی حاڵەتی هەندێک خواردەمەنی. ٢ـ راگرتنی کچ لە ماڵ دا و بە مێرد نەدانی. ٣ـ ترش کردن. & ترشانن، تورشاندن، تورشانن

**ترشانن** (چا. م)[ئەر] بڕ: ترشاندن

**ترشاو** (ئان. فا)[له: ترشان] ١ـ شتی ماوەی ترش هەڵگەڕاو. ٢ـ کچی قەیرەی مێرد نەکردوو.

**ترشته** (نا.)[ئەر] بڕ: تەشوێ

**ترشقه** (نا.) بڕ: تریشقه

**ترشک** (نا. ل)[ترش + ک][باک] ١ـ (گیا.) بڕ: ترشۆکه. ٢ـ بڕ: ترشی

**ترشکه** (گیا.)[ترش + که] بڕ: ترشۆکه

**ترشکی** (گیا.)[ترش + ک + ی][هەو] بڕ: ترشۆکه

**ترش و تاڵ** (ئان. ل)[ترش + و + تاڵ] ١ـ میوه و خۆراکێک که تامی خۆش به زار خۆش نەبێ، تێکەڵاویی ترشیی و تاڵیی. ٢ـ (کنـ.) مرۆڤی رووگرژ و مۆن. **~ بوون:** ١ـ خۆش نەبوونی چێژی خواردنێک. ٢ـ (کنـ.) رووگرژ و مۆن بوون.

**ترش و تەڵاش** (نا. ل)[ترش + و + تەڵاش] چێشتێکه که له چەوەندەر و سماق سازی دەکەن.

**ترش و خوێ** (نا. ل)[ترش + و + خوێ] خوێ و سماق که بۆ ترش کردنی هەندێک گۆشت وەک گۆشتی ماسی به کاری دێنن. **~ کردن:** خوێ و سماق له گۆشت دان بۆ ترش بوونی.

**ترش و شیرن** (ئان. ل)[ترش + و + شیرن] میوه و خۆراکێک که تامی ترش و شیرین بێ، ترش و شیرین، مێخۆش.

**ترش و شیرین** (ئان. ل)[ترش + و + شیرین] ١ـ بڕ: ترش و شیرن. ٢ـ جۆره شەربەتێک که له دۆشاو و ترشی سماق سازی دەکەن.

**ترشۆ** (نا. ل)[ترش + ئۆ][زا] بڕ: ترشی

**ترشۆک** (گیا.)[ترش + ئۆک][باک ـ زا] بڕ: ترشۆکه

**ترشۆکه** (گیا.)[ترش + ئۆک + ئه] [باک: ترشک، ترشۆک ـ ناو: ترشکه، ترشەکه، ترشۆکه ـ هەو: ترشکی ـ زا: ترشۆک] گیایەکی خۆڕسکه، هەتا میترێک بەرز دەبێتەوه، گەڵای پانه، تامی ترشه و ده دۆکڵیوی دەکەن. Rumeux acetosa ناوی لاتینی ئەم گیایەیه.

**ترشەسماق** (نا. ل)[ترش + ئه + سماق] سماقی هاڕاو، ترش.

**ترشەکه** (گیا.)[ترش + ئەک + ئه] بڕ: ترشۆکه

**ترشـــەڵۆک** (ئان. ل)[ترش + ئە + لۆک] حاڵی چێشت و خۆراک و شـتێک کـــە تـرشـــاو و خـــراپ بـووبێ، ترشـەڵووک. **~ بوون:** تێکچـوونی چێژ و رواڵەتی خـۆراک و شـتێک، ترشـان و خراپ بوون.

**ترشـــەڵووک** (ئان. ل)[ترش + ئە + لووک] بڕ: ترشەڵۆک

**تـرشـی** (نـا. ل)[تـرش + ئـی][بـاک: ترشک، تـرشی ـ ناو: ترشی، ترشـیـات، تورشــیـات ـ هەو: تـرشی ـ زا: ترشـۆ] سـەوزی و گیـزەر و هـارویێ و مـوسـڵی و بیـزا و شـتی دیکەی لـەم بابەتـە کـە دە سرکە دەکردرێ و زستـانان بە چێشت دەیخۆن.

**ترشـیـات** (نا. ل)[ترشـی + ئات] بڕ: ترشی

**ترشـــیی** (حم.)[ترش + ئیی] تامی ترش، ترش بوون.

**ترفاڵ** (نا. ل)[بڕ: تلْفار][ئەر] بڕ: تلْتە

**ترفە** (وشد.) بڕ: ترپە

**ترقـە** (گـیـا.)[؟] جـۆرێک هـەڵووژە و قەرەڵووی درێژووکە.

**ترکـانی** (نا. ل)[ترکـان + ئی] جـۆرە سـەمـایەکـە لەگـەڵ جـووڵاندنی ئەندامـا (خاڵ ب ١ ل ٢٨٢).

**ترمس** (گیا.)[عەر: ترمس] گیایەکە لە دەستـەی سـێوەرە، گـەڵاکانی پەنجـەیین و گـوڵەکـانـی هێـشـوویی قـیتن و لـە گـوڵی باقلە دەچن کە رەنگیان سپی، مۆر، شی و هـەندێک جـار زەردن. ئـەم گـیـایـە بۆ گـــزرە دادەچێـنـدرێ و بـەرەکـــەشـی دەخـــورێ، Lupinus albus ناوی لاتینی ئەم گیایەیە، باقلەی میسریی.

**ترنج** (نا.) ١ـ (گـیـا.) بـڕ: تورنج/١ و ٢. ٢ـ (نا.) بڕ: تـورنج/٣. ٢ـ (گـیـا.) بڕ: ترنجۆک

**ترنجـان** (چا. ل)[ناو: تـرنجـان ـ هەو: ترنجنـای] گـیـر بوون و حـاسـیـە بوونی کـەس یا شـتێک لە شـوێنێکی تەنگەبەر وەها کە بە زەحمـەت دەربێ، ترینجان. ( بڕ: تێترنجان)

**تێـبـیـنی:** ترنج (تۆرۆنج، تـەرەنج) لە چاوگی ترنجـیـدن لە فــەرهـەنگـەکـانی زمـانی فـارسی دا بە مـاناگەلی: ١ـ چین، چرووک. ٢ـ تێکبـەزیو، تێک گـوشـراو هـاتوە، هـەروەتر لە فەرهـەنگی کرمانی دا تێــرۆنجــو بە مـــانـای قــورنج هـەر لەم ریشەیە.

**ترنجـــاندن** (چا. م)[لە: ترنجـــان] ترینجاندن. (بڕ: تێترنجاندن)

**ترنجۆک** (گیا.)[ترنج + ئۆک] گیایەکە گـــەڵا تووکن، گـــەڵای وەکـــوو گـــەڵای گـوڵەباغـە، بۆنـی وەکـوو بـۆنی نارنجـە، ئەکرێت بە شـۆربا، بۆ نەخـۆشی پێـست زۆر سـوود بەخشە (کشت و کاڵ ب ١ ل ٨٠). گـیـایەکی خـۆڕسکە لـە رەگـەزی نەعنا، لقـەکـانی شـۆڕن و گـەڵاکـانی هێـلکەیی و تووکن، گوڵەکـانی سـپی یا بەنـەوش و شـــین، بـۆنی خـۆشـــە و لـە پـزشـکـی دا ســـوودی لێـــوەردەگـــرن و کوردەواری لە پەنیری دەکەن و دەیخۆن، Dracocephalum royleani نـاوی لاتینـی ئەم گـیـایـەیە، باڵنگ/٢، باڵنگوو، بـادرەنـگ، ترنج/٣، بـاروونـە. (عــــەر: ترنجان ـ فار: ترنگان).

**ترنجـــەبین** (نا. ل)[عـەر: ترنجـبـین لە فـــــار: ترانـگبـین (تر= تـەڕ + انـگبـین= هەنگوین)] دەرمـانێکە شـیرین لە شـیلەی وشترخۆرکە سازی دەکەن و بۆ رەوانی و کۆخە کەلکی لێوەردەگرن، ترنجەمین.

**ترنجەمین** (نا. ل) بڕ: ترنجەبین

**ترنک**[1] (نا.)[؟] چێـشت و خـواردن و مـاسـتـاو و شـتـی دیکە کـە زۆر شل بێ و ئاو و ئاوەکی زیاترلە رادە بێ، تراو.

**ترنک**[2] (نا.)[ئەر] بڕ: ترنگە/٢

**ترنگە** (وشـد.) ١ـ دەنگی ژێی کـەوان یا سـازی بەم. ٢ـ [ئەر] پـتـە، پڵـتـۆک، ترنگ **~ هاتن:** بەرز بـوونەوەی دەنـگ لە لەرینەوەی ژێ.

**ترنگەترنگ** (وشـد.)[ترنگە + ترنگ] دەنگی پەیتاپەیتای ترنگە.

**ترومـــپـــا** (نـا.)[فـــەر: trompe] ئامـرازێکە بۆ هـەلکێـشـانی ئـاو لە چاڵاو کـە بیـتـییـە لە لوولەیەکی درێژ کـە لە ئاو دایـە و ســـەرەکـــەی لـە ســـەر چـاڵاوە، دەسکێکی هەیە کـە بە لێدانـی ئاو دێتـە دەر.

**ترۆپـک** (نـا.)[؟] ١ـ دونـد و پـۆپـەی کێو. ٢ـ ئاخر شوێنی بەرزایی

**ترۆزی** (نا.) بڕ: ترێزوو

**ترۆمبۆن** (مۆس.)[ئیتا: trombone] ئامـرازێکی مـۆسـیـقـایە، شکڵی وەک ترۆمـپـتـە بەڵام گەورەترە، بە فـوو دەنگی لێـدەردێ و پـتـر لـە جـاز دا کـەلکی لێوەردەگرن.

**ترۆمپێت** (مۆس.)[فەر: trompette] ســـازێکە وەک شـــەیپـــوور بەڵام سـێ

دووگمەی لە سەرە کە بە داگرتنی ئەوان و فوو تێکردنی دەنگی لێ دەردێ کە لە جاز و مۆسیقای مەیدانیی دا کەلکی لێوەردەگرن.

**ترۆمتە** (گیانـ.) بڕ: تۆرمتە

**تroوزی** (گیا.)[باک] بڕ: ترێزوو

**ترووسکان** (چا. ل)[لە: ترووسکە/١] ترووسکانەوە، بریقانەوە، درەوشانەوە.

**ترووسکاندن** (چا. م)[لە: ترووسکە/٣] چاو لێک دان، ترووکاندن، ترووسکانن.

**ترووسکانن** (چا. م)[ئەر] بڕ: ترووسکاندن

**ترووسکانەوە** (چا. ل)[لە: ترووسکە] درەوشانەوە، بریقانەوە، ترووسکە دان، بریقە دان، بریسکانەوە، ترووسکیانەوە.

**ترووسکایی** (حم.)[ترووسکە + ئایی] شۆق، رووناکی. **~ مان:** شوق هەبوون، هەروا ترووسکانەوە. **~ هەبوون:** بە شۆق بوون، ترووسکانەوە.

**ترووسکە** (نا.)[؟] ١ـ بریقە، تریسکە، بریسکە. ٢ـ شۆقی دووری ئاگر و چرا، ترووکە. ٣ـ ترووکانی چاو. ٤ـ شۆق، نوور. ٥ـ ناوە بۆ مێینە. **~ دان:** ترووسکانەوە، بریقانەوە. **~ دانەوە:** ترووسکانەوە، بریسکانەوە، بریسکە دانەوە. **~ هاتن:** ترووسکانەوە.

**ترووسکیانەوە** (چا. ل)[ئەر] بڕ: ترووسکانەوە

**ترووکان** (چا. ل)[لە: ترووکە] ١ـ لێکدانی پێڵووی چاو. ٢ـ شکانی تۆو بە ددان، قرتان.

**تێبینی:** ترووکان و ترووکاندن دەگەڵ وشەی ترەکان و ترەکاندن یەکن و ترەک یا ترووک وشە دەنگن و ئەو چاوگانەش لە وشە دەنگ کەوتوون.

**ترووکاندن** (چا. م)[لە: ترووکە] ١ـ چاو لێک دان، ترووسکاندن. ٢ـ شکاندنی تۆو بە ددان، قرتاندن، تووکانن. ٣ـ شکاندنی هێلکە لە لایەن جووجکەوە لە کاتی هاتنە دەر لە هێلکە. ٤ـ شکاندن و دندووک لێدانی هێلکە لە لایەن مریشکەوە. ٥ـ تەقاندنی چەک بۆ تاقی کردنەوە بەبێ فیشەک و گوللە.

**ترووکە** (نا. ل)[ترووک + ئە][باک: ترووکە ـ ناو: ترووکە ـ هەو: ترووکە] ١ـ ماوەیەکی زۆر کەم، چاو وێک نانێک، ئانێک. ٢ـ شۆقی کز و دووری رووناکی لامپ و چرا، ترووسکە. ٣ـ لێکدانی چاو،

ترووسکە.

**ترەقاندن** (چا. م) بڕ: تەقاندن

**ترەک** (نا.)[تات: تەراچ، تێراک ـ فار: ترک ـ کرم: تێرەک ـ لۆر: تێرەک. باک: تەرک ـ ناو: ترەک ـ زا: تەرک] درز، چرژ، قەڵش. **~ تێکەوتن:** قەڵشین، درز تێکەوتن. **~ هەڵگرتن:** قەڵشین، درز تێکەوتن، ترەک تێکەوتن.

**تێبینی:** ترەک وشە دەنگە و ناوەکەی لە دەنگەکەی کەوتوە.

**ترەکان** (چا. ل)[لە: ترەک] ١ـ ترەک هەڵگرتن، قەڵشین، ترەکین. ٢ـ تۆقین، ترەکین. ٣ـ زانی ئەو گیاندارە گۆندارانەی کە پتر لە بێچوویەکیان دەبێ، ترەکین.

**ترەکاندن** (چا. م)[لە: ترەکان] ١ـ قەڵەشاندن. ٢ـ تۆقاندن.

**ترەکیان** (چا. ل)[لە: ترەک] بڕ: ترەکین

**ترەکین** (چا. ل)[لە: ترەک] ١ـ ترەک هەڵگرتن، قەڵشین. ٢ـ بڕ: تۆقین. ٣ـ زانی ئەو گیاندارە گواندارانەی کە بە زگێک چەند بێچوویان دەبێ (وەک سەگ، چەقەڵ، بەراز) & ترەکان. ٤ـ [ئەر] گۆ دەر کردنی درەخت. & ترەکیان

**ترەوکە** (گیا.)[ترەو + کە] گیایەکی بەهارییە، رەگەکێکی هەندێک ئەستووری هەیە، گەڵاکەی دەخوریٚ و تامێکی هەندێک تیژی هەیە، گوڵەکەی زەردە و بەرێکی قاوەیی هەیە کە بۆ بەهارات کەلکی لێوەردەگرن، Sinaps ناوی لاتینی ئەم گیایەیە، خەردەل، خەرتەلە.

**ترەوەژە** (گیانـ.)[؟] بڕ: کورکورە

**ترەوی** (گیا.)[هەو] بڕ: توور2

**تری** (گیا.)[باک] بڕ: ترێ

**ترياق** (نا.) بڕ: تریاک/٢. ⁘ تریاقی نامەکەت کە گەیی بێخودی سەلیم/ باکی لە ماری غەم نییە گەرچی کوشندەیە (بێخود ل ١٠٠).

**تریاک** (نا.)[یون: theriaka] ١ـ شیرەیەکە کە لە قۆزەی خاشخاشکی دەگرن، رەنگی سپیە کە لە دوایی دەبێتە قاوەیی، تامی تاڵە و بۆنێکی تایبەتی هەیە، لە کۆنەوە بۆ دەرمان کەلکی لێوەرگرتراوە و دەشکێشرێ و مرۆڤ پێی نەشە دەبێ، تلیاک. ٢ـ دەرمان و دژی سەم و ژار، پازار، تریاق. ⁘ دڵم شێواوی چاو و زولفتە بەو زارە چارەی کە/ کە ئەو بیمارە مارانگەستەیە

دەرمانی تریاکە (وەفایی ل ١٢٨).

**تریاکخۆر** (ئان. فا)[تریاک/١ + خۆر٢/2] بڕ: تریاکی

**تریاک کێش** (ئان. فا)[تریاک/١ + کێش] کەسێک کە تریاک دەکێشێ، تریاکی.

**تریاک کێشیی** (حم.)[تریاک کێش + ئیی] کاری کەسی تریاکی

**تریاکیی** (ئان. ل ـ نا. ل)[تریاک/١ + ئیی] کەسێک کە بۆ نەشئە بوون تریاک دەخوا یا دەیکێشێ، کەسێک کە ئالوودەی تریاکە.

**تریان** (نا.)[ناو: تریان، تلیان، تلیانە، تریانە] سەوەتەیەکی دەسچنە لە شووڵ، شکڵی قووچە کە لە بنەوە بۆ سەرێ کەم کەمە زارکی گەورەتر دەبێ و میوەی چنراوی تێدەکەن، بەرچن، بەرچینە، بەرچنە، قووڵینە.

**تێبینی:** هاوریشە و هاومانای ئەم وشەیە لە فەرهەنگەکانی فارسی دا بە شێوەی [ترنیان، تربیان، ترینان، تریان] نووسراون.

**تریانە** (نا.) بڕ: تریان

**تریبۆن** (نا.)[؟] شوێنی قسە کردنی کەسێک بۆ بەشداران لە کۆمەڵەیەک دا.

**تریت** (نا.) بڕ: تڵێت

**تریسکە** (نا.) درەوشانەوە و بریقەی ئەو شتانەی کە دەدرەوشێنەوە، ترووسکە، بریسکە، بریقە.

**تریسکەتریسک** (نا. ل)[تریسکە + تریسک] درەوشانەوە و ترووسکەی پەیتاپەیتا.

**تریشتە** (نا.)[هەو] بڕ: تەشوێ

**تریشقە** (نا.)[؟] بەرق و برووسکی هەور، تریشکە، هەورەتریشقە، چەخماغە، ترشقە.

**تریشقەماسی** (نا. ل)[تریشقە + ماسی] جۆرێک ماسی پان لە رەگەزی سفرەماسی کە درێژایی دەگاتە گەزێک و لەشی تریشقە و بەرقی لێدەبێتەوە کە هەتا نزیک ٣٠ ڤۆڵت دەگا، torpedo marmorata ناوی لاتینی ئەم گیانلەبەرەیە.

**تریشکە** (نا.) بڕ: تریشقە

**تریشین** (نا.)[فەر: trichine] کرمێکی دەزوولەیی باریک و درێژی مەیلەوسپییە، کە لە ریخۆڵە و ماسوولکەی خووک و بەراز دایە و ئەگەر

مرۆڤ گۆشتی باش نەکولاو یا نەبرژاوی بەراز بخوا تووشی نەخۆشی تریشینۆز دێ.

**تریشـینۆز** (نا.)[فـەر: trichinose] نەخۆشیەکە کە بە هۆی کرمی تریشین لە مرۆڤ دا پەیدا دەبێ و چونکە ئەم کرمە لە نێو ماسوولکە و گەیەکان دا دەژی گە و بەندی لەش دێشێ و ئازاری زۆرە.

**تریفـە**[1] (نا.)[؟] ١ـ تیشک و شـۆقی مانگ، مانگەشەو. ٢ـ ناوە بۆ مێینە.

**تریفە**[2] (نا.)[؟] ١ـ جۆرە نەخۆشیێکە تووشی ئاژاڵ ئەبێ بە هۆی تینوێتی یا گەرمای زۆرەوە ریخۆڵەکانی رەش دائەگرسێت «سیی» ئەنووسێت بە پەراسوویدا (کشت و کاڵ ب ١ ل ٨١). نەخۆشییەکی ئاژاڵە سییەکەی ئەنووسێ بە لای ورگییەوە (خاڵ ب ١ ل ٢٨٤). جۆرە دەردێکە لە تینوێتییەوە تووشی ئاژاڵ و ولاخ ئەبێ، ریخۆڵەی رەش ئەکا (خاڵ ب ١ ل ٢٨٤). **~ تێکەوتن:** ١ـ تووشی نەخۆشی تریفە بوون. ٢ـ (کنـ.) زۆر تینوو بوون.

**تریقـە** (وشـد.)[ناو: تریکە، تریقـە ـ هـەو: تریکە، پریکە] دەنگی پێکەنین، تریکە. || **تریقـەی پێکەنین:** دەنگی پێکەنین، تریقە. * **لە تریقـەی پێکەنین دان:** پێکەنین بە دەنگی بەرز.

**تریق و هۆڕ** (وشـد.)[تریق + و + هۆڕ] حیلکە حیلکە و پێکەنینی زۆر.

**تریقـەتریق** (وشـد.)[تریقـە + تریق] دەنگی پێکەنین و تریقەی زۆر.

**تریـکـانـدن** (چا. م)[لـە: تریـکـە] چریکاندن، قیژاندن، زیقاندن.

**تریکە** (وشد.) ١ـ چریکە، قیژە، زیقە. ٢ـ دەنگی پێکەنین، تریقـەی پێکەنین، تریقە.

**ترین** (پاشگـ.)[ناو: ترین] پاشگری ئاوەڵناوی بەرزە (سفەتی عالی)، هەرە. ﻩ خۆشترین، جوانترین، بەرزترین.

**ترینجان** (چا. ل) بڕ: ترنجان

**ترینجاندن** (چا. م)[لە: ترینجان] بڕ: ترنجاندن

**تربیە** (گیا.)[زا] بڕ: ترێ

**ترێ** (گیا.)[باک: تری ـ ناو: ترێ ـ زا: ترییە] بەری دارەمێوە، میوەیەکی هێشوویيە، بە نەگەیشتوویی تامی ترشە و پێی دەڵێن قۆرە یا بەرسیلە کە گەیشت شیرین دەبێ. لە ترێ شەراب و سرکە ساز دەکرێ. ترێ رەنگ و جۆری زۆرە

وەک (ئاویلکە، بزمارە، بۆڵمازوو، پایزە، تایفی، تولڵخی، تەبەرزە، تەورێزیی، جغجغە، حوسێنی، خەلیلی، دەستەچن، رازقی، رەشمیری، ریش بابای سپی، ریش بابای سوور، زەردکە، زەلکە، ساحێبی، سپیلکە، سووراو، سوورشامی، سەعدانی، شاهانی، شەقشەقە، شیرازی، شیرەسووڵتانی، فەرخی، قزڵ، قەرەشیرە، کاژاو، کشمیشی سپی، کشمیشی سوور، کلکەرێوی (بزمارە)، گۆڵمازوو، گەرمکە، گەزەنگی، گەندمە، لەعلی بێ دان، مالیکی، مام برایمە، مایەمێو، نینۆکی بووک، هەلاقی، ئەسکەری، ...). & هەنگوور، ئەنگوور.

**تێبینی:** ترێ trä لە زمانی سویدی دا بە مانای دار و چێو و tree لە زمانی ئینگلیسی دا بە مانای دار و درەخت و هەروەتر تەرو taru لە سانسکریت دا بە مانای درەخت هاتوە و دوور نیە کە هەر یەک وشە بووبێن.

**ترێزوو** (گیا.)[باک: ترۆزی، تroوزی - ناو: ترێزوو، ترۆزی، تەرۆزی] بەری گیایەکی بڕکەییە، وەک هارۆ و خەیارە بەڵام درێژتر و رەقترە و هێڵی لە سەرە، نێوەکەی هەندێک بۆشە، رەنگی کەسکە، هەروا دەخورێ و لە ترشیاتیش دەکرێ، Cucumis flexuosus ناوی لاتینی ئەم گیایەیە، چەمیلە، خیارچەمەرە، چەمەرەخیار، خەیارچەمبەر، شارۆخ، شاراخ، کووتە.

**ترێشتە** (نا.) بڕ: تەشوێ

**ترێ مارانە** (گیا.)[ترێ + مار1 + ئانە2] گیایەکی خۆڕسکە لە تیرەی کوولەکەکان کە بە دار و گیای پەنایەوە هەڵدەچێ، ریشەیەکەی سەلکێکی ئەستوور و گەورەیە، گەڵاکانی پەنجەیی و گوڵەکانی زەردی ئاماڵ کەسکن، بەرەکەی خڕە کە بە گەیشتوویی رەنگی سوور دەبێ. تەنیا ریشەی ئەم گیایە بە کەلک دێ کە بۆ دەرمان کەلکی لێوەردەگرن، Bryonia alba ناوی لاتینی ئەم گیایەیە، مێوەمارانە، مێوەرەشە، مێوەکێوییلە، هەزارپەل، هەزارئەنگوست. (فار: فاشرا، هزارگوشان - عەر: عنب الحیە، فاشرشین)

**ترِ** (وشد.) ١- [باک: ترِ - ناو: ترِ - هەو: ترِ - زا: ترِ] بایەکی دەنگدارە کە لە پاشەوە دێتە دەر. ٢- دەنگێک کە بە لاسایی لە ترِ بە زار دەری دێنن، جرت.

٣ـ قسەی بێتام و قۆڕ. ٤ـ (مجـ.) هیچ، خۆڕایی، بێنرخ. ⁘ پێت وایە پیاو بە تڕ پێدەگا. **بە ~ بەند بوون:** (کنـ.) ١ـ زۆر سست بوون، بە ئاهێک بەند بوون. ٢ـ زۆر لە بیانوو بوون. **~ بەردان:** بەرەڵلا کردنی بای زگ بە پاشەوە دا بە دەنگەوە، تڕ کەندن، تڕین. **~ بە قونەوە بەند نەبوون:** (کنـ.) سەرسام بوون و ترسان. **~ کەندن:** بڕ: تڕ بەردان. **~ لێدان:** ١ـ تڕ بەردان، تڕ کەندن. ٢ـ (کنـ.) خۆ هەڵکێشان، تڕوتۆپ لێدان. **~ی خۆ و گێزەر لێک نەکردنەوە:** (کنـ.) تێنەگەیشتن، بێ ئاقڵ بوون، نەفامین. **~ ی کەسێک بە [نۆ] بیور نەشکان:** (کنـ.) لەخۆ رازی و خۆ پێ زۆر بوونی کەسێک. ⁘ کەریم هێندە خۆی پێ زۆرە تڕی بە نۆ بیوران ناشکێ! **~یک نەهێنان:** بێنرخ بوون، هیچ بایەخێک نەبوون. ⁘ ئەو کەوشە تڕێکی ناهێنێ کەچی وا گرانیشی دەفرۆشن. ئەو کارەت تڕێکی ناهێنێ. **دەگەڵ ~ی بزن بە شەڕ هاتن:** (کنـ.) کەسێک کە زوو هەڵچێ و دەگەڵ هەموو کەس شەڕ دەست پێبکا، مرۆڤی تووڕە و تۆسن و قەڵس، دەگەڵ تڕی خۆ بە شەڕ هاتن. **دەگەڵ ~ی خۆ بە شەڕ هاتن:** (کنـ.) مرۆڤی تووڕە و تۆسن و قەڵس. **لەبەر ~ی کەسێک هەڵپەڕین:** (کنـ.) بە کەیف و ویستی کەسێک جووڵانەوە، لە ژێر دەستەڵات و ویستی کەسێکی دیکە دابوون. **وەک ~ی سەی ساز بوون:** (کنـ.) بە کەیف بوون، ئامادە و ساز بوون. || **تڕی ئاخر:** دوایین پشوو، دوایین دەم. * **تڕی ئاخری بەردان:** فەوتان، تێداچوون، مردن، نابووت بوون. **تڕی بن گۆم:** (کنـ.) بێ سەر و شوێن، فیڕۆ. * **وەک تڕی بن گۆم چوون (رۆیین):** بێ سەر و شوێن چوون، لە دەست چوون، فەوتان و بە فیڕۆ چوون.

**تڕال** (ئان.)[باک ـ زا] بڕ: تەڕاڵ

**تڕاڵ** (ئان.) بڕ: تەڕاڵ

**تڕاندن** (چا. م)[تڕ + ئاندن] ١ـ بە هەر هۆیەک کەسێک وە تڕەتڕ خستن. ٢ـ (کنـ.) شەکەت کردن. ٣ـ (کنـ.) بەزاندنی زۆر توندی کەسێک.

**تڕتڕە** (نا. ل)[تڕ + تڕ + ئە] ١ـ (گیا.) گیایەکی ئەنگەلە، گەڵای نیە و هەودایەکی رەنگ زەردە، لە سەوزی و سێوەرە و گیای دیکە دەهاڵێ و لە خۆراکی ئەو کەلک وەردەگەێ هەتا رەنگی زەرد دەکا و لە کەلکی دەخا.

Cuscuta ناوی لاتینی ئەم گیایەیە. ٢ـ (گیانـ.) کرمێکی رەنگ سەوزە ئافەتی وێنجە و حاسڵاتە.

**تێبینی:** ناوی ئەم گیایە لە وشەی ترِ کەوتوە چونکە بە تەواوی گیای دیکە لە کەلک دەخا و دەیفەوتێنێ و بە قسەیەک دەیترێنێ.

**ترِتەپان** (ئان. ل)[ترِ + تەپان][ئەر] مرۆڤی تەنبەڵ و تەوەزەل، تراڵ.

**ترِحێو** (ئام.) قسە و وتەیەک بۆ گاڵتەجارِ بە کەسێک کە کارێکی نابەجێ و قۆرِ، ترِهێو.

**ترِرە** (وشد.) دەنگی ماتۆری مەکینە، ترِە

**ترِرەترِ** (وشد.)[ترِرە + ترِ] ١ـ ترِی پەیتاپەیتا و لە سەر یەک. ٢ـ ترِرەی یەک لە سە یەک. ٣ـ (کنـ.) قسەی زێدە و قۆرِ. & ترِەترِ. ~ **کردن:** ١ـ ساز کردن و ساز دانی دەنگی ترِە. ٢ـ (کنـ.) قسەی قۆرِ کردن. ⁂ تۆ دانیشە و هێندە ترِەترِێ مەکە! **وە ~ خستن:** ١ـ ترِاندن. ٢ـ (کنـ.) گیر کردنی خراپی کەسێک بە مەسەلە و کارێکەوە. **وە ~ کەوتن:** توشی زگچوون و ترِ کەندن بوون. ٢ـ (کنـ.) خراپ گیر کردن لە کار و مەسەلەیەک.

**ترِزل** (ئان. ل)[ترِ + زل]١ـ کەسێک کە دەنگی ترِەکەی زل بێ ٢ـ (کنـ.) کەسی خۆ پێ زۆر و بەدەعیە، بە فیز و هەوا. ~ **بوون:** بەدەعێ بوون، خۆ پێ زۆر بوون. || **ترِزلی باوان دەروێش:** (کنـ.) کەسێکی بە دەعێ و بە فیز کە لە بنەماڵەیەکی هەژار و نەدار بێ.

**ترِکەن** (ئان. فا)[ترِ + کەن] ١ـ کەسێک کە ترِ کەندنی لا ئاساییە و لە لای خەڵک ترِ بەردەدا، ترِەک. ٢ـ (کنـ.) کەسی بێنرخ و سووکەڵە و بێ نموود. & ترِن.

**ترِن** (ئان. ل)[ترِ + ن] بڕ: ترِکەن

**ترِنووسقاو** (نا. ل)[ترِنووسق؟ + ئاو] توێژێکی چەورایییەکی کەم بە سەر گۆشتاوی کوڵاوەوە، زەرِنووقایی، زرِنووچقاو، زەرِنووق، زەرِنووقاو.

**ترِنیسق** (گیانـ.)[؟] بڕ: کۆترەباریکە

**ترِوتۆپ** (نا. ل)[ترِ + و + تۆپ] ١ـ فێز و ئیفادە، پۆز. ٢ـ قسەی زەلام و بێ کاکڵ. & ترِوزرِ. ~ **لە سەر لێدان:** ١ـ پۆز لە سەر کەسێک لێدان. ٢ـ قسەی زەلام کردن. ~ **لێدان:** قسەی زل و زەلام کردن، پۆز لێدان. ~ **هەبوون:**

(کنـ.) خـۆ هەڵکێـشـان و چ دە باران دا نەبوون، تڕوتۆپ لێدان.

**تـــڕوزڕ** (نـا. ل)[تــڕ + و + زڕ] بــڕ: تڕوتۆپ

**تڕۆ** (ئان.)[بڕ: توورە][باک: تڕۆ ـ ناو: تڕۆ ـ زا: تڕۆ] ١ـ توورە، قەڵس. ⁝⁝ ئەگەر دەگەیەوە بە هەڵۆیە/ ئەو زۆر داعبایەکی توند و تڕۆیە (شــێخ فــەرخ ل ٥٠). ٢ـ ســـووک، بەدناو، ناچیــزە، بێ ئابڕوو، ریســـوا. ⁝⁝ ئەگـــەر دەڕۆی، لە ڕێیت دەگـاتیــە هــەڵۆیە/ پیـاوێکی ناچیــزەیە تڕۆیە (مـــان ل ١٨٦). ~ **بوون:** ١ـ توورە بـوون، قــەڵس بوون. ٢ـ بێ ئابڕوو بوون، ریســوا بوون. ⁝⁝ دنیـا تیـاتڕۆیە، مـەوەسـتـە تیا، بڕۆ/ کێ مایەوە تیـا کە نەبووبێ تیا، تڕۆ (مەحوی ل ٢٥٣). ~ **کــردن:** ١ـ توورە کــردن. ٢ـ بـێ ئابڕوو کـردن، بەدناو کـردن، سـووک کـردن. ٣ـ دەر کـردن بە توورەیی و جنێـو پێـدان، وەدەرنان بە سووکایەتی. ⁝⁝ ژنێ مێردە کـــرد تڕۆ/ عـــالەم هـەڵسێ نایکا پـەڕۆ (پەند ل ٢٦٦).

**تڕۆیی** (حم.)[تڕۆ + ئیی] ١ـ توورەیی، قەڵسیی. ٢ـ بەدناویی، ریسوایی.

**تڕهێو** (ئام.) بڕ: ترحێو

**تڕە** (وشد.) بڕ: تڕڕە

**تڕەتڕ** (وشد.)[تڕە + تڕ] بڕ: تڕڕەتڕ

**تڕەمــــاش** (نا. ل)[تڕ (تەڕ) + ئە + ماش] بڕ: تەڕەماش

**تڕەک** (ئان. ل)[تڕ + ئەک][باک] تڕن، تڕکەن.

**تڕەکەڵەک** (نا. ل)[تڕ + ئە + کەڵەک] کارێک کە بنج و بناوانـی نەبێ و بە فێڵ و کــــەڵەک و درۆ و شـــــتی لەم بابەتە چووبێتە پێش. ⁝⁝ بە هەزار تڕەکەڵەک و بیانوو توانیم خۆم لە دەست قەرزداران نەجات بدەم. کـار بە تڕەکـەڵەکـان سـەر ناگرترێ.

**تڕیزە** (ئا.)[ئەر] کونگ، قوون. (هس: تەڕیزە)

**تڕین** (چا. ل)[لە: تڕ] بڕ: تڕ بەردان

**تژە** (ئان.) بڕ: تژی

**تـژی** (ئـان.)[باک: تـژی، تەژی، تـژە] پڕ، لێوڕێژ.

**تێبـینی:** تەچی tači لە ئەوێستا دا ئاوەڵناوە لە چاوگی تەک tak بە مـانای ڕژان هـاتوە و من پێـــــــوایە تەژی و هاوتاکانی هەر لەم ریشەیە کەوتوون.

**تس** (وشـــد.)[بـاك: تس، فس ـ نـاو: تـس، فـس ـ هـەو: تس] ١ـ گـــــازێـكـی بێدەنگە کە لە پاشـەوەی لەش دێتـە دەر. ٢ـ دەنـگی ســــووکی بـا دانـە دەر لە هـەر شــتــێکی دیکە. ~ **بەردان:** بەڕەڵڵا کــردنی تس، تس کـــەندن، تسین، تس دان. ~ **دان:** بـڕ: تـس بـەردان. ~ **کەندن:** بڕ: تس بەردان.

**تێبـینی:** تس یا فس وشـە دەنگن و ناویان لە دەنگیان کەوتوە.

**تسقل** (گیا.)[؟] یەکێک لە بەرەکانی دارمازوو، قسقل، قسکل، تسقل، تسکل، گزگل

**تسقڵەگورگانە** (گیـا.)[تسقڵ + ئە + گـورگ + ئانە] گـیـایەکـە وەک قـارچک ناوەکـــەی بە تەڕیی وەک ســیــرێژ و بە وشکی وەک خـــەنە وایە (خـــاڵ ب ١ ل ٢٨٤). (بڕ: تسەگورگە)

**تسکل** (گیا.) بڕ: تسقل

**تسکەن** (ئان. فا)[لە: تس کەندن] ١ـ کەسـێک کە بە ئاشکرا تس بەردەدا. ٢ـ (کنـ.) مـرۆڤی بێکار و بێنرخ. & تسن، فسکەن، فسۆک.

**تسن** (ئان. ل)[تس + ن] بڕ: تسکەن

**تسوێ** (گیا.) بڕ: تێسوێ

**تسەگورگە** (گیا.)[تس + ئە + گورگ + ئە] جــۆرە گـــارگـــێکی ژەهراویی، فسەگورگە، کارگەفسە، تسقڵەگورگانە.

**تسی** (ئان.)[؟][باک] نانی ویشکی بێ پێخۆر

**تسین** (چـا. ل)[لـە: تـس] بـڕ: تـس بەردان

**تسێ تسێ** (گیانـ.)[فەر: Tsé-Tsé] جانەوەرێکی ئافریقـاییە شـێـوەی مێش دەدا، پێوەدانی نەخۆشی خەو دێنێ.

**تش** (ئان.)[هەو] بڕ: ترش

**تشت** (نا.)[باک] بڕ: شت

**تشـــتـــخـــۆر** (ئان. فـــا)[تشت (بڕ: چێشت) + خۆر2] لەوەڕاندنی ئاژەڵ بۆ مـــاوەی دوو سـێ ســەعــات ســـەر لە بەیانیان.

**تشتیر** (گیانـ.) بڕ: تویشتیر

**تشرین** (نا.)[عەر: تشرین لە: ؟] ناوی دوو مــانـگ لە مــانگەکــانی رۆمـی کــە دەکەونە نێوان ئەیلوول و کانوونی یەکەم، چری. || **تشـرینی یەکـەم:** مـانگی دەهوم کــە سی و یەک رۆژە و بـەرابەرە دەگــەڵ مـانگی دەهومی زایینی ئۆکـتـۆبر، چریا

پێـشن. **تشــرینی دووهەم:** مــانگی یازدەهوم کـە بەرابەرە دەگـەڵ نوامـبـر، چریا پاشن.

**تف** (نا.)[هیک: شـتـیـڤ ـ پەھ: توف. تات: تێف ـ فار: تف ـ پەش: تووف ـ لۆر: تۆفکە ـ بیر: تۆف. باک: تف، توو، توف، تووڤ ـ ناو: تف ـ هەو: تف ـ زا: تو، توو، توف] ١ـ ئاوی زار، خوزیی. ٢ـ ئاوی زار کە فڕێ درێتە دەرێ. ٣ـ وشەی بێزاریی، لـەعـنـەت. ⁂ تـف لـەو ژیـانـە! تـف لـەو چارەنووسـە! ~ **بە تاریکیـیـەوە نان:** (کنـ.) لە گۆترە قـسـە کـردن، تفـەنگ بە تاریکیــیــەوە نـان. ~ **پێـدادان:** تف هـاویشتن بەرەو کـەسێک یا شتێک. ~ **دان و قــوون دان:** (کنـ.) ئەنجـام دانـی کــارێک و خــێــر لێنەدیتن لە هەمــوو بارێکەوە، زەرەر کـردنی دوولایەنە. ~ **دە نێــوچاوان کــوتان:** تف لێکردن بـۆ بێــزاریی. ⁂ دایکەکــەی تفــێکی دە نێــوچاوانی کــوتا، کــوتی: بۆ ئابڕووم دەبـەی؟ دیتـم دەســـــتت دە ملـی دابـوو (بارام و گـوڵندام ل ٥٣). ~ **ڕۆ کـردن:** تف فـڕێ دانـە ســەر زەوی. ~ **کـردن:** تف فـڕێ دانە دەر. ~ **کـردنەوە:** فـڕێ دانی شـتـێکی کـە لـە زار دایە، تفـانەوە، تفــینەوە. ~ **دە زار دا ئیــشک بوون:** ویشـک بـوونـی نێــــو زار لـە بـەر هـەر هۆیـەکی وەکــوو حــەپەســان، ترســان، سـەرسـوڕمـان و شـتی لەم بابەتە. ~ **لێکردن:** تف بە کەسێک یا شتێک دادان بۆ بێــزاریی و بـە لەعنەت کــردن. ~ **هاویـشتن:** تـف پێــــدادان، تـف فــــڕێ دان. ~ **هەڵاویشتن:** تـف بۆ ســـەرەوە هـاویشتن، تف هـەڵدان. ⁂ هێندە سـاردە تف هـەڵاوێی دەیبـەسـتێ. ~ **هەڵدان:** بـڕ: تـف هـەڵاویـشـتن. **وە بـەر ~ دان:** تفی زۆر بـە کـسـێک دا کـردن، تفـبـاران کردن. || **تفی سەربەرەوژوو:** (کنـ.) لایەنی خـراپـی کـەسـی نزیـک کـە نەکـرێ باسـی بکەی و زەرەرەکەی وەخۆشت بکەوێتەوە. * **تفـی ســــەربەرەوژوو وە رووی خـــۆ کەوتنەوە:** (کنـ) خراپە و زەرەری کەسی نزیک بۆ خۆ گەڕانەوە.

**تفاق** (نا.)[؟] ١ـ ئازوخەی نێو ماڵ بۆ زستان وەک شتی ویشک کراوە و گوێز و مێوژ و کەشک و ... ٢ـ کا و گیای ماڵات بۆ زستـان. ٣ـ [ئەر] بەهارات و دانەوێڵـە و سەوزی ویشک بۆ چێشت ساز کردن.

**تفـاڵ** (نا.)[عـەر: اطفـال کـۆی طفل] منداڵ، زارۆک، تفڵ.

**تفــــانەوە** (چا. م)[لە: تف] بڕ: تف

کردنەوە

**تفایە** (نا. ل)[تف + ئایە][زا] بڕ: تفک

**تفباران** (نا. ل)[تف + باران] تفی زۆر بە سەر کەسێک دا. **~ کردن:** تفی زۆر بە کەسێک دا کردن، وە بەر تف دانی کەسێک.

**تفت** (ئان.)[باک: تفت ـ ناو: تفت] تامێکە کە چێژێکی ڕەوانی دە زار دا نیە و دەم کۆ دەکاتەوە وەک تامی بێ یان میوەی کاڵ کە هێشتا بە تەواوی نەگەیوەن، چێژی نیوەتاڵ و ترش.

**تفتک** (نا.)[باک] بڕ: تەفتیک

**تفتیی** (حم.)[تفت + ئیی] گیرایی تامی تفت، تفت بوون.

**تفک**[1] (نا. ل)[تف + ک] قامیش یا دارێکی نێو بۆش کە زیپکە بەردی بە هێزی فوو و دەم پێداوێن و گیانداری چووکەی وەک چۆلەکەی پێ ڕاو دەکەن، پفک.

**تفک**[2] (نا. ل)[تف + ک][باک: تفک ـ زا: تفایە] کوانوو، ئاورگ، ئاگردان، وجاغ.

**تێبینی:** تف لەم وشەیە دا دەگەڕێتەوە سەر تەپ tap ی ئەوێستایی و تەفتەن taftan ـ ی پەهلەویی بە مانای گەرم کردنەوە. تفک بە گشتی یانی ئامێری گەرم کردن. هەروەها تەپەک tapak لە زمانی ئەرمەنی دا هەر بەو مانایە هاتوە.

**تفلیک** (نا. ل)[تف + لیک][ئەر] ئاوی زار، تف.

**تفڵ** (نا.)[عەر: طفل] منداڵ، زارۆک.

**تفنک** (ئا.) کونی کەپۆ و لووت.

**تێبینی:** تفنک دەگەڵ دفن لە زاراوەی باکووریی دا بە مانای کەپۆ یەک ڕیشەیان هەیە.

**تفنگ** (نا.)[زا] بڕ: تفەنگ

**تفە** (نا. ل)[تف + ئە] کەپلەمە، مشتە، دەسپەڕ.

**تفەتف** (نا. ل)[تف + ئە + تف] تفی پەیتا پەیتا. **~ کردن:** پەیتاپەیتا تف کردن بۆ هەر مەبەستێک.

**تفەدڕەی** (گیا.)[تفە + دڕەی][هەو] بڕ: تووەدڕک

**تفەنگ** (نا.)[تور: tüfek][باک: تڤنگ ـ ناو: تفەنگ ـ هەو: تفەنگ ـ زا: تفنگ، تفەنگ] چەکێکی لوولە درێژی شەڕ و ڕاوە، قۆنداغی چێوی هەیە، بە شانیەوە دەنێن و تەقەی پێدەکەن، تفەنگ

جــۆری زۆرە و لـە ســـەدەی شـــازدەی زایینی لە ئاڵمان ساز کراوە و پێشتر لە جیـات فیـشـەک لە بەر نان، سـەریان پڕ دەکــردەوە. ~ **بە تاریکیـیـــەوە نان:** (کنـ.) کـــارێک لە گــۆترە کــردن بەبێ لـەبـەرچاو گـــــــرتـنـی ئاکـــــــام و سەرکەوتنەکەی.

**تێبینی:** هەندێک زمانەوان بە شکەوە ریشـــەی تفــەنگ دەبەنەوە ســـەر تف + ئەنگ پاشگری ئامێـر سـاز. (بڕ: برهان ب ١ ل ٥٠٢) هەروەها هس: تفک1

**تفەنگاوێژ** (ئان. فا)[تفەنگ + ئاوێژ] ١ـ کەسـێک کە تفـەنگ داوێ. ٢ـ (نا. ل) مەودایەک کە فیشەکی تفەنگ دەیبڕێ.

**تفـەنگچی** (ئان. ل، نا. ل)[تفـەنگ + چی] کــەسـێک کـە خــاوەن تفـەنگە و بە تفەنگ شەڕ دەکا، چەکدار.

**تفەنگساز** (ئان. فا)[تفەنگ + ساز] کەسێک کە تفەنگ ساز دەکا.

**تفـەنگســازی** (حم)[تفـەنگســاز + ئیی] ١ـ کاری تفەنگ ساز کردن. ٢ـ (نا. ل) شوێنی تفەنگ ساز کردن.

**تفی** (نا.)[هەو] بڕ: توو1

**تفـــینەوە** (چا. ل)[لە: تف] بڕ: تف کردنەوە

**تقاڵ** (نا. ل)[باک] بڕ: توێکڵ

**تڤر** (گیا.)[باک] بڕ: توور2

**تڤنگ** (نا.)[باک] بڕ: تفەنگ

**تڤیرک** (گیانـ.)[باک] بڕ: کۆترەباریکە

**تک** (نـا.)[لـە: تکان][نـاو: تک، تکە، تککە] ١ـ دڵۆپ. ٢ـ دەنگی کەوتنە خواری دڵۆپ. || **تـک تـک:** ١ـ دڵـۆپ دڵـۆپ. ؛؛ فـرمــێـسک تک تک لە چاوانی دەهـاتە خــوارێ. ٢ـ دەنگی پـەیتــاپەیتـای تکە و دڵۆپ.

**تکا** (نا.)[باک: تکا ـ ناو: تکا ـ هەو: تکا] ١ـ ویست، داو، رجــا. ٢ـ دوعــا. ٣ـ لاڵە، پاڕانەوە بۆ شـتێک. ~ **کردن:** ١ـ داوا کردن. ٢ـ دوعا کردن. ٣ـ پاڕانەوە، روو نـان. ٤ـ لە وڵامـی پێـــهـــەڵکوتـن و ســـپــاس و شـــتـی لـەم بابـەتە بـە کـــار دەبردرێ. ؛؛ ـ دەســـتت خـــۆش بـێ زۆر چێشـتێکی بەتام بوو! ـ تکایە، شـایەنی نیـە! ~ **لێکردن:** ١ـ داوا لێکردن. ؛؛ تکات لێـدەکـەم دەست لە شــەڕ و نێـوان ناخۆشی هەڵگرە! ٢ـ لەبەر پاڕانەوە، روو لێنان. & تکا لێـهـەبوون. ~ **لێهـەبوون:** بڕ: تکا لێکردن. || **تکای بێـجێ:** داوای ناماقووڵ، ویستی ناڕەوا. ***تکای بێجێ**

**کردن:** داوای ویستێکی ناماقووڵ کردن، داوای جێبەجێ کردنی کارێک نەلواو کـــردن. * **تکای بێـــجێ هەبوون:** داواکارییەکی بێجێ هەبوون، ویستێکی ناماقووڵ هەبوون.

**تکاکـار** (ئان. فـا)[لە: تکا کـردن] ١ـ کەسێک کە بۆ نیازێک دەپاڕێتەوە. ٢ـ نێوبژیکەر. ٣ـ داواکـار، ویستیار. & تکاکەر. **بۆ بوونە ~:** ١ـ بۆ کەسێک پاڕانەوە و تکا کـردن. ٢ـ بۆ کـەسێک بوونە نێوبژیکەر، نێوبژیی کەسێک کردن. **کەسێک کردنە ~:** کەسێک کردنە نێوبژیکەر بۆ تکا و پاڕانەوە. ⁝⁝ کـوتم ئەگەر کـارەکـە گـەند بوو دایکم دەکەمە تکاکار (تاریک و روون ل ١٥).

**تکاکەر** (ئان. فا)[لە: تکا کردن] بڕ: تکاکار

**تکـان** (چـا. ل) رژان بـە دڵـۆپ لـە سەرەوە بۆ خوار. ⁝⁝ حەیا دڵۆپێکە، تکا تکا (پەند) لیک لە دەم و لیـچی پەیتـا پەیتا دەتکێ.

**تێبینی:** تەکە لە ئەوێستا دا و تەچەک لـە پەهلـەویی دا لـە چـاوگی تـەک ـ ی ئەوێستـایی تەچییتـەن ـ ی پەهلەویی بە مانای رژان و و رەوان بوون کەوتوە

**تکاندن** (چا. م)[لە: تکان] دڵۆپ دڵۆپ شـتێکی ئاوەکی دە شـوێنێک کـردن، تێکردن بـە دڵـۆپ. ⁝⁝ چـاوی دێشـێ و دەرمانییان تکاندە چاویەوە.

**تکانەوە** (چا. ل)[لە: تکان] داکەوتنی و چۆڕانەوەی دڵۆپی ئاو و ئاوەکی.

**تکاو** (نا. مـــفـ.)[لە: تکان] دڵۆپی رژاو. ⁝⁝ دڵۆپە تکاوەکـانی گـەز گـۆ دەکەنەوە و گەزۆی لێ ساز دەکەن.

**تککە[1]** (نا.) بڕ: تک

**تـککـە[2]** (نا.)[بـڕ: تیکـە] ١ـ پلـێک گـۆشت، لەتێک گـۆشت. ٢ـ کـەبابی پلەگۆشت، تیکە، قۆژباشی.

**تکـە** (نـا. ل)[تک + ئـە] ١ـ دڵۆپ. ٢ـ دەنگی داکەوتن و کەوتنە خواری دڵۆپ، چکە. ٣ـ جـمـوجـووڵ. **~ کـردن:** دڵۆپە کـــردن، پڕژان یا پڕژاندنی دڵۆپی ئاو. **لە ~ کـەوتن:** لە جـمـوجـۆڵ کـەوتن، ئارام گرتن. || **تکەی فـرمـێسک:** دڵۆپی فـرمـێسک. ⁝⁝ دڵۆپەی شـەونمی پەلکی گـوڵ و بۆنی شنەی شـەوبۆ/ هـەناسـەی سـاردی فـەرهادە و تکەی فـرمـێسکی شیرینە (حەقیقی ل ٥٦).

**تکە تک** (نا. ل)[تکە + تک] دڵۆپی پەیتا پـەیتا. **~ کردن:** پڕژاندنی پەیتا

پەیتای دڵۆپی ئاو.

**تگر** (نا.)[ئەر] بڕ: تەرزە

**تگل** (گیانـ.)[پەه: تەکەل][ئەر] مەڕی نێر، بەران.

**تگە** (گیانـ.) بڕ: تەگە. ~ **گرتن:** بڕ: تەگە گرتن.

**تل**$^{1}$ (نا.)[ناو: تل ـ هەو: تل] ١ـ پاڵ لە سەر لێژایی. ٢ـ تللۆر، تلۆر، خلۆر. ~ **بوونەوە:** کەوتن و سووڕانی لە لێژیەوە بەرەو خوار، خلۆر بوونەوە. ~ **خواردن:** تل بوونەوە و خۆ خلۆر کردنی مرۆڤ یا گیاندار لە لێژایی. ~ **پێدان:** پاڵ پێوەنان بە کەسێک یا شتێک لە سەر لێژایی، خلۆر کردنەوە، جاڵە کردنەوە، تل کردنەوە، تل دان. ~ **دان:** پاڵ پێوەنان و خلۆر کردنەوەی کەسێک یا شتێک لە سەر لێژایی. ~ **کردن:** پاڵ پێوەنان و بزواندن کەسێک یا شتێک لە سەر لێژایی. ~ **کردنەوە:** جاڵە کردنەوە، خلۆر کردنەوە.

**تل**$^{2}$ (ئا.)[باک] بڕ: تلی

**تلان** (چا. ل)[لە: تل1] سووڕان و تل خواردن لە سەر لا، گلان.

**تلاندەوە** (چا. م)[لە: تلان] بزواندن و تل پێدان لە سەر لا.

**تلانەوە** (چا. ل)[لە: تلان] گەوزین و بزووتن لە سەر لا تەنیشت، گلان.

**تلاوتل** (ئاک. ل)[تل1 + ئاو2 + تل1] گەوزین و تلۆر بە لا تەنیشت دا.

**تلقە** (نا.)[باک] بڕ: تەقڵە

**تلک** (نا.)[باک] بڕ: تلیسک

**تللۆر** (نا.) بڕ: تلۆر

**تل و خوێ** (ئان. ل)[تل + و + خوێ] حاڵی هەر شتێک کە پتر لە رادەی ئاسایی خوێی هەبێ، زۆر سوێر، پڕخوێ.

**تلۆر** (نا.)[لە: تل1] ١ـ چلۆنایەتی داکەوتن و سووڕانەوەی شتێک لە لێژایەوە بەرەو خوار، خلۆر، گلۆر، تللۆر، تلێر، تل، جاڵە. ٢ـ درێژ راکشاو لە سەر تەنیشت یا لە سەر زگ. ~ **بوونەوە:** ١ـ راکشان لە سەر تەنیشت یا لە سەر زگ.. ٢ـ داکەوتنی شتێک لە لێژاییەوە. ~ **کردنەوە:** جاڵە کردنەوە، تل پێدان، خلۆر کردنەوە.

**تلۆق** (نا.) بڕ: بلۆق

**تلهی** (ئا.)[باک] بڕ: تلی

**تلی** (ئا.)[باک: تل، تلهی، تلی، تبل، تپل، تلیک] قامک، ئەنگوست.

**تلیاک** (نا.) بڕ: تریاک

**تلیان** (نا.) بڕ: تریان

**تلیانە** (نا.) بڕ: تریان

**تلیس** (ئان.)[؟] تەڕ، خـــووســـــاو، تلّیس.

**تلیسان** (چا. ل)[لە: تلیس] تەڕ بوون، خووسان، تلّیسیان.

**تلیساندن** (چا. م)[لە: تلیسان] ١ـ تەڕ کردن، خووساندن. ٢ـ خراپ کردن و زایە کردنی شتێک بە زۆر تەڕ کردن. & تلّیسانن

**تلیساندنەوە** (چا. م)[لە: تلیسان] ١ـ تەڕ کردنەوە، خووساندنەوە. ٢ـ خراپ کردن و زایە کردنی شتێک بە تەڕ کردنی زۆر.

**تلیسانەوە** (چا. م)[لە: تلیسان] ١ـ تەڕ بوونەوە، خووسانەوە. ٢ـ خراپ بوون و فەوتانی شتێک بە تەڕ بوونی زۆر.

**تلیساو** (نا. مف)[لە: تلیسان] ١ـ تەڕ بوو، خـــووســـــاو. ٢ـ فـــەوتاو و زایە بە تەڕایی زۆر.

**تلیسک** (نا.)[پەش: تەلیسەک ـ فار: تلسک ـ گونابادیی: تەلەسە. باک: تلک ـ ناو: تلیسک، تەلسک، تەلسک، تلّماسک] هێـشـوویـەکی چووک لە هێـشـوو ترێ، زەنگەتە، خشلک، چقالک.

**تلیک** (ئا.)[باک] بڕ: تلی

**تلیلی** (نا. ل)[؟] دەنگ و هەرای شادمانی خەڵک بە زار و زمان و گەروو، تلیلیلی هەلهەلە. **~ کردن:** شادمانی کردن بە دەنگ لە زار و زمان دەرهێنان.

**تلیلیلی** (نا. ل) بڕ: تلیلی

**تلیە** (نا.)[خوشناو] بڕ: بۆڵ

**تلێر** (نا.) بڕ: تلۆر

**تلێن** (ر.)[لە: تلاندن] ریشەی چاوگی تلاندن، خلێن، گلێن.

**تڵ** (نا.)[؟][ئەر] کـولانەوە و کـزەی برین، چڵ، زڵ، کزە.

**تڵەتڵ** (نا. ل)[تڵە + تڵ] کزانەوە و کولانەوەی پەیتاپەیتا، چڵەچڵ، زڵەزڵ.

**تڵپ** (وشد.) دەنگی تڵپە.

**تڵپە** [1] (وشد.)[لۆر: تلپ ـ بیر: تۆلۆپ ـ کرم: تێلۆپ، تێلێپ. ناو: تڵپ] دەنگی داکەوتنی شتی زل و نەرم بە سەر زەوی

دا.

**تلّپه**[2] (نا.) بڕ: تلّته

**تلّـته** (نا.)[كرم: تۆلف ـ فـار: تفاله ـ بیر: تلف. ناو: تلّته، تلّپه، تلّف، تلّـفه، تلّــفـــار، ترفـــالّ ـ هەو: تلّف، تلّــفـــه] پاشماوەی میوە، گیا و گەلاّ و شتی لەم بابەتە کە ئاوەکەی گیرابێ.

**تلّخ** (ئان.)[بڕ: تالّ1] ڕەنگی ڕەشی ئامالّ زەرد، تالّ، تەلّخ.

**تلّف** (نا.) بڕ: تلّته

**تلّفار** (نا. ل)[تلّف + ئار4] بڕ: تلّته

**تلّفه** (نا.) بڕ: تلّته

**تلّق** (وشد.) دەنگی تلّقه، شلّق.

**تلّـقـه** (وشـد.) دەنگی ئاوەکی دە نێـو دەفر دا، شلّقه.

**تلّقەتلّق** (وشد.)[تلّقه + تلّق] تلّقەی پەیتاپەیتا، شلّقەشلّق.

**تلّماسک** (نا.) بڕ: تلیسک

**تلّۆخ** (نا.)[؟][ئەر] ١ـ قەرتالّەی چەرم کە بۆ ڕاگوێزتنی سەهۆلّ و بەفر کەلکی لێوەردەگرن. ٢ـ (مجـ.) ژنی بێـشـەرم و بێحەیا.

**تلّــیت** (نا.)[لۆر: تلیت ـ فـار: ترید ـ كـــرم: تریت. نـاو: تریت، تلّـــیت] ١ـ ورکــەنانی تێکوشــراو لە شــۆربا، دۆ و شتی لەم بابەتە. ٢ـ (ئان.) نەمەیو و شل و لێک بلاّو. **~ کردن:** تێکوشین.

**تلّیس** (ئان.)[ئەر] بڕ: تلیس

**تلّیسانن** (چا. م)[ئەر] بڕ: تلیساندن

**تلّـــیـــســـانەوه** (چا. م)[ئەر] بڕ: تلیسانەوه.

**تلّیسیان** (چا. ل)[ئەر] بڕ: تلیسان

**تلّــیش** (نا.)[بڕ: تەلاّش] ١ـ تەلاّش، تەراش . ٢ـ درز، قـــەلّشت، تەڕاش. ٣ـ دادڕاو، دڕ **~ بردن:** قـــــەلّشـین، درز تێکەوتن.

**تلّیشان** (چا. ل)[لە: تلّیش] ١ـ دڕان، دادڕان. ٢ـ درز بردن، قەلّش تێکەوتن. & تلّیشیان

**تلّـیشـاندن** (چا. م)[لە: تلّـیشـان] ١ـ دڕاندن، دادڕاندن. ٢ـ قـەلّشــاندن، درز تێخستن. & تلّیشانن.

**تلّیشانن** (چا. م)[ئەر] بڕ: تلّیشاندن

**تلّــیـشــەبەرد** (نا. ل)[تلّـیش + ئە + بەرد] کوتێکی پەڕاو و لێبۆوه لە بەرد.

**تلّیشیان** (چا. ل)[ئەر] بڕ: تلّیشان

**تمتمه** (نا.) بڕ: تەمتەمە

**تمەز** (شر.) بڕ: تۆمەز. ⁂ تمەز خەڵقی دێ لە سەر فرمانن/ خەریکی کێشە و شەن و خەرمانن (گۆران ل ١٤٢).

**تمەن** (نا.)[مەغ: توومان (دە هەزار)] پارەی ئێران کە بەرابەرە دەگەڵ دە ریاڵ یا قران.

**تن** (ئام.) یەکێک لە نیشانەکانی چاوگ لە زمانی کوردیی دا. ⁂ کوشتن، بەستن، دیتن.

**تناز** (نا.)[عەر: طناز][باک] حەنەک، فشە، گاڵتە، تیز.

**تنۆک** (نا.)[پەهـ: تەنوک. باک: تنۆکە ـ ناو: تنۆک] بەشێکی چووک لە ئاو و ئاوەکی، دڵۆپ.

**تنۆکە** 1 (نا.)[لات: tunica] جۆرێک دەرپێی کورت کە ناگاتە سەر ئەژنۆ و لە ژێر شاڵوار یا پاتۆڵ دەبەری دەکەن.

**تنۆکە** 2 (نا.)[باک] بڕ: تنۆک

**تنووک** (نا.) دەگەڵ وشەی تاریک دێ و مانای زۆر تاریک و تاریکی خەست دەدا. ⁂ تاریک و تنووک.

**تنێ** (ئان.)[زا] بڕ: تەنیا

**تهن** (نا.)[باک] بڕ: تین1

**تهن** (ئان.)[باک] بڕ: تینوو

**تو** 1 (جنا.)[باک ـ زا] بڕ: تۆ1

**تو** 2 (نا.)[زا] بڕ: تف

**تو** 3 (ئام.)[باک ـ زا] هیچ، ئەسڵەن، تەو. ⁂ تو جار (هیچ جار)، تو کەس (هیچ کەس)

**تواشا** (نا. چا)[ئەر] بڕ: تەماشا

**تواشاخانە** (نا. ل)[تواشا + خانە] [ئەر] بڕ: تەماشاخانە

**توالێت** (نا.)[فەر: toilette] ١ـ ئارایش و رازاندنەوەی سەر و روو. ٢ـ ئاودەست، ئاودەستخانە، مستەراح.

**توان** (نا.)[پەهـ: تووان][لە: توانین] هێز و تاقەت، توانست، وزە. // ناتوان. ⁂ بێ هێز و توان و دەستەوئەژنۆ/ هەر مەم مەمی بوو بە داد و رۆڕۆ (مەم و زین ل ٣٢٦).

**توانا** (ئان. فا.)[لە: توانین] ١ـ بەهێز، بەتاقەت، بە وزە. ٢ـ لێهاتوو، کارزان. **~ بوون:** ١ـ بە تاقەت بوون، بەهێز بوون. ٢ـ لێزانین، کارزان و لێهاتوو بوون. **~ کردن:** بەهێز کردن، بەتاقەت کردن. **لە ~ دا هەبوون:** لوانی

ئیمکانات، قەوە بە مەسەلەیەکی ماددی یا مەعنەوی شکان و توانایی یارمەتی دان هەبوون، توانایی هەبوون. ⁂ لە توانام دا نیە هەر ئێستاکە ماڵێکی گەورە بکڕم.

**توانایی** (حم.)[توانا + ئیی] ١ـ هێز و تاقەت. ٢ـ ئیمکانات، لوان. **~ پێدان:** هێز و تاقەت و ورە دان بە کەسێک. **~ هەبوون:** ١ـ هێز و تاقەت هەبوون. ٢ـ هەبوونی ئیمکانات. **لە ~ دا هەبوون:** لوان، بۆ مومکین بوون، پێکران.

**توانج** (نا.)[؟] سەرکۆنە، تانە، تیر و تانە. **~ تێگرتن:** بڕ: توانج لێدان. **~ لێدان:** سەرکۆنە کردن، تانە لێدان، توانج تێگرتن.

**تواندنەوە** (چا. م)[بڕ: توانەوە][ناو: تاواندنەوە، تواندنەوە] ١ـ کردن بە ئاوی بەفر و سەهۆڵ و شتی لەم بابەتە. ٢ـ شل و ڕەوان کردنی شتی سەخت بە گەرما. ⁂ ئاسن تواندنەوە. ٣ـ شتی ڕەق دە نێو ئاوەکی دا حەل کردن. ⁂ خوێی دە نێو ئاو کە و بیتوێنەوە دەبێتە خوێواوک! ٤ـ (مجـ.) مەحو کردنی کەمایەتییەک دە نێو زۆربەیەک دا، قەوتانی بەرەبەرە. ⁂ سیاسەتی دەوڵەتە زۆردارەکان تواندنەوەی نەتەوە چووکەکانە.

**توانست** (نا.) بڕ: توان

**توانەوە** (چا. ل)[ئێک: تا، تاڤا ـ ئەو: تەپ ـ پەه: تاپیتەن. ناو: توانەوە، تاوانەوە، تاویانەوە، تاویان، تاوین] ١ـ بوون بە ئاوی سەهۆڵ، بەفر و ئاوەکی بەستراو. ٢ـ خاو بوونەوەی شتی بەستراو. ٣ـ تێکەڵاو بوونی شتی ڕەق دە نێو ئاوەکی دا. ⁂ شەکر دە نێو ئاوی گەرم دا زووتر دەتوێتەوە هەتا دە ئاوی سارد دا. ٤ـ فەوتان، مەحو بوون بە تەواوی. ⁂ زوو دە ماڵێکی تورک لە شار دا هەبوون کە ئێستا دە نێو کوردان دا تواونەوە. ٥ـ بوون بە ئاوەکی شتی ڕەق لە بەر تینی گەرما. ⁂ قورقوشمی تواوەیان دە گەروو کرد و کوشتیان. ٦ـ (کنـ.) زۆر شەرمەزار بوون، خەجاڵەتی کێشان.

**تێبینی:** وشەی توانەوە لە [توان + ئەوە] پێکهاتوە کە چاوگی توان بە تەنیا نەماوە و بەڵام بە شێوەی تاویان و تاوین ماوە.

هەروەها چاوگی تینا tina لە زمانی سویدیی دا بە مانای تواندنەوەی سەهۆڵ

و thaw له ئینگلیسی دا و تایات tay-at له زمانی رووسی دا به مانای توانەوه هاتوون که هەر لەم ریشەیەن.

**توانین** (چا. م)[هیک: تو ـ ئەو: تەڤ ـ پەه: تووانێنییتەن. فار: توانستن ـ گیل: توونەسەن، تانەستەن. باک: توانین ـ ناو: توانین] له دەست هاتنی ئەنجام دانی کـــــارێک، له وزه دا هەبوون، توانایی هەبوون، کارین.

**توت** (ئان.)[بڕ: تورگ][زا] منداڵ، ساوا.

**توتک** (گیانـ.)[بڕ: تورگ] بێچووی سەگ، توتکەسەگ، توڵه، تووتک.

**توتکەسەگ** (گیانـ.)[توتک + ئه + سەک] ١ـ بێچووی سەگ، توڵه. ٢ـ (جنێو) جنێوێکه بۆ کەسی چووکتر و زۆرتر هەڕەشەی تێدایه. ⁂ هەستە وەدەرکەوه هەتیوه توتکەسەگە. توتکەسەگی حەرامزاده برۆ لەبەر چاوم ون به. ٣ـ (سوکایەتی) منداڵ، عەولاد، توڵه. ⁂ ژنەتیوه وەره ئەو توتکەسەگانت لەبەر چاوم لابه!

**توج** (ئان.)[زا] بڕ: تیژ

**توجاڕ** (نا.)[عەر: تجار کۆی تاجر] بازرگان، سەوداگەر، تاجر.

**توجاڕپاشی** (نا. ل)[توجاڕ + باش2 + ئی] سەرۆک و گەورەی کاروان و قەتار، بازرگانباشی، سەربازرگان. ⁂ ئەمن هاتووم ئەو ڕێگایه گیراوه، ئەگه ڕێگا پکەمەوه بۆ کاروان و قەتار و توجاڕپاشییه (لاس و خەزاڵ ل ١١٧).

**توحفه** (نا.)[عەر: تحفة] ١ـ دیاریی، پێشکێشی. ٢ـ شتی گرانبایی و به نرخ. ٣ـ تازه، نوێ. ٤ـ دەست نەکەوتوو، نادر، عەنتیکه. ٥ـ (تەوس) کەسی هیچەکە و خوێنتاڵ. ⁂ ئەو توحفەیه چیه دەگەڵی دەگەڕێی؟ ٦ـ (تەوس) شتی بێنرخ. ⁂ ئەو ماشێنه توحفەیه چیه کڕیوته چی دیکەت دەست نەکەوت؟

**توحفەفرۆش** (نا. فا)[توحفه + فرۆش] کەسێک که شتی گرانبایی و عەنتیکه دەفرۆشێ. ⁂ عومرێکه به میزانی ئەدەب توحفەفرۆشم/ زۆرم وت و کەس تێینەگەیی، ئێسته خەمۆشم (نالی ل ٢٨٠).

**توخس** (ئان.)[فار: تخس (تۆخس)، تغس (تۆغس). ناو: توخس] ١ـ بەدفەڕ، شەیتان، بێعار (پتر بۆ منداڵ و لاو). ٢ـ حەیوان و گیانداری تۆڕ و چەمووش. ٣ـ [ئەر] زایه، فەوتاو. ~ **بوون:** ١ـ

بەدفەڕ بوون، بێعار بوون. ٢ـ تۆڕ بوون، چەمووش بوون. ~ **کردن:** زایە کردن، فەوتاندن، لە ناو بردن.

**توخم** (نا.) بڕ: تۆم. || **ترخمی حەرام:** منداڵی بیژوو، حەرامزادە. **ترخمی حەڵاڵ:** منداڵی حەڵاڵزادە. **ترخمی سەگ:** لە ڕەگەزی سەگ، بێچووی سەگ. ٢ـ (جنێو) وەک جنێو بە کار دێ بە مانای ناجسن، ڕەگەز چەپەڵ. & توخمەسەگ. **ترخمی نابیسمیللا:** منداڵێک کە لە کاتی گووران بیسمیللای لە سەر نەکوتراوە و کەسێکی بەدزات و ناجسنە، عەولادی نابیسمیللا.

**توخمەسەگ** (ئان. ل)[توخم + ئە + سەگ](جنێو) ڕەگەز خراپ، بەدزات، ڕەگەز چەپەڵ.

**توخن** (نا.) بڕ: تخوون. ~ **بوون:** بڕ: تخوون بوون. ~ **کەوتن:** بڕ: تخوون کەوتن.

**توخووب** (نا.)[باک] بڕ: تخووب

**تور** (نا.)[بڕ: تورگ][زا] لقی ناسک و تازەی دار، شووڵ، توول.

**توربەت** (نا.)[عەر: تربة] ١ـ خاک، خۆڵ. ٢ـ قەبر، گۆڕ، مەزار. ⁂ بلا مەعلووم ببێ کوژراوی کێم یاران وەسییەت بێ/ چراغی توربەتم هەر دەستەگوڵ بێ پاش وەفاتی من (وەفایی ل ٩١).

**توربێن** (نا. ل)[توور1 + بێن1] ١ـ کیسەیەک کە جووتێر تۆوی تێدەکا، لە لاتەنیشتی دەکا و تۆوی لێدەردێنێ و دەیپرژێنێ. ٢ـ بڕ: توور1

**تورت** (ئان.)[بیر: تۆرت ـ فار: ترد. باک: تورت ـ ناو: تورت] ١ـ حاڵی هەر شتێکی ناسک و تەنک کە زوو بشکێ. ٢ـ تەڕ و تازە، شلک و ناسک.

**توررەهات** (نا.)[عەر: ترهات (کۆی ترهە)] پڕوپووچ، قسەی قۆڕ و بێ مانا، تورەهات.

**تورش** (ئان.)[ئەر] بڕ: ترش

**تورشاندن** (چا. م)[ئەر] بڕ: ترشاندن

**تورشانن** (چا. م)[ئەر] بڕ: ترشاندن

**تورشیات** (نا. ل)[تورش + ئات][ئەر] بڕ: ترشیات

**تورشیان** (چا. ل)[ئەر] بڕ: ترشان

**تورگ** (گیان.)[ئەو: تەئورونە (بێچوو) ـ پەه: توورەک، تۆرەک. بەل: تۆلەگ ـ کرم: تورە. باک: تۆرک، تۆری، تۆریک، توورگ ـ ناو: تورگ] گیاندارێکی

گوانداره، کێویی و گۆشتخۆر و درِه، ملـۆزمی مەل و مریشکه، کەوڵەکەی نرخی زۆر نیه و وەک ئاستەڕ کەلکی لێوەردەگرن. Canis aureus ناوی لاتینی ئەم گیاندارەیە، چەقال، چەقەڵ. ⁂ تورگ تورگی شەمزینی/ قوونەبانان دەدڕینی/ گا و گۆلان دەفڕینی (فۆلکلۆر ل ١٢٣).

**تێبینی:** تەرئونە taruna لە هیندی کۆن دا بە مانای توڵە و تەئورونە -tau runa لە ئەوێستا دا بە مانای لاو و جەوان بۆ مرۆڤ و گیاندار هاتوە و توڵە، توتک، تووڵ و تووڵە و هەندێک وشەی دیکەش هەر لەم ریشەیەن.

**تورمە** (نا.)[فار: تیرمە، تێرمە ـ کرم: تەرمە. باک: تورمە ـ ناو: تورمە] جۆرێک پارچە و شاڵی بە بایەخ و نەرمە کە لە کورک و کووروو سازی دەکەن. ⁂ تورمە هەرچەند کۆنیش بێ، ناکرێ بە پێتاو (پەند ل ١٥٦).

**تورمەپۆش** (ئان. فا)[تورمە + پۆش1] کەسێک کە تورمەی دەبەر دایە. ⁂ هەشتا نۆکەری خەنجەریان دەسک پازارە ئەوبەر ئەوبەر راوەستاوە / هەمووی تورمەپۆشە، کەوڵی قاقومی غەزی بە سەر شانی داداوە (سەعید و میرسێوەدین ل ٢٣٧)

**تورمیز** (نا.)[روس: tormoz] ئامرازێک لە ماشین و ماتۆر و دووچرخە و مەکینەی دیکەی هاتوچۆ کە بە داگرتنی، مەکینەکە دەوەستێ. **~ بڕین:** ١ـ لە کار کەوتنی تورمیز و نەوەستانی ماشێن و مەکینە. ٢ـ (کنـ.) کەسێک کە نەتوانێ بەری قسەی بگرێ و پەیتاپەیتا قسە بکا. **~ گرتن:** ١ـ راگرتنی مەکینە بە داگرتنی تورمیز، تورمیز لێدان. ٢ـ (کنـ.) زۆر توند نەڕۆیشتن لە رەفتار و کردار دا. ⁂ تورمیزێکی بگرە هێندە گورەگوڕ و هات و هەرای ساز مەکە. ٣ـ (کنـ.) وەستان و نۆرە دان لە قسە دا. ⁂ کاکە تورمیزێکی بگرە نۆرە قسە ئێمەش بدە!. & تورمیز لێدان. **~ لە زمان دان:** (کنـ.) زمان راگرتن، قسە بڕینەوە، ئیدی قسە نەکردن. **~ لێدان:** بڕ: تورمیز گرتن.

**تورمیز دەستی** (نا. ل)[تورمیز + دەست + ئی] ئامرازێکە لە ماشێن دا کە جگە لە تورمیزی پێ، داندراوە و بریتییە لە میلەیەکی درێژ کە دەکێشرێ و بەری وە رێ کەوتنی ماشێن لە کاتی وەستان و شوێنی لێژ دەگرێ. **~کێشان:**

هێنانە سەری تورمێزدەستی دوای ڕاگرتنی ماشێن.

**تورنج** (گیا.)[؟] ١ـ درەختێکە وەک دارلیمۆ بەڵام گەلاکانی گەورەترە، بەرەکەی لە جسنی نارنجە، دریشت و قورس و توێکڵ ئەستوورە، بۆنی خۆشە و ڕەنگی زەردە و مرەبای لێ ساز دەکەن، Citrus medica cedrata ناوی عیلمی ئەم دارەیە، تورنج، ترنج، کەبات، باڵنگ. (عەر: ترنج ـ فار: ترنج).٢ـ بەری ئەم دارە. ٣ـ نەقشێکی فەرش و کەنارە و کاشی کە چوارگۆشەیەکی خوار و پێچدار و پتر لە نێوەڕاست دایدەنێن، ترنج.

**تورڕە** (نا.)[عەر: طرة] ١ـ بسک و مووی ڕازاوە و هۆنراوی سەر نێوچاوان. ⁂ توخودا دەمەکەت دەرخە لە نێو تورڕە بزانم/ تامی چیە شەو حوققەیی شیر و شەکەری تۆ (وەفایی ل ١١٢). ٢ـ زولف و بسکی لوول. ⁂ بە حەققی تاری کاکۆڵی سەراپا لوولی ئەو شۆخە/ ئەگەرچی پەشمە، ئەمما دڵ لە تورڕەی زوڵفی سەودایە (نالی ل ٥٧٠). ٣ـ شێوە خەتێکی نووسین یا ئیمزا کە کەوانی و تێکهالاو بێ، توغرا. ٤ـ مۆر و ئیمزای شا و سوڵتان. ⁂ شایستەیی شان لایقی مل تورڕەی تۆیە/ نەک تورڕەیی شاهەنشەهی و تەوقی وەزارەت (نالی ل ١٤٥) داغی سینە و پێچ و تابی دوودی ئاهم خۆ هەیە/ مۆر و تورڕەی ئینپەراتۆر و قەراڵم بۆ چیە (مەحوی ل ٢٩٣). ٥ـ میچێک کە لە بەر دەرگا و دەروازە سازی دەکەن هەتا باران نەیگرێتەوە، پاسار. ~ **شکاندن:** لێکدان و شکاندنەوەی زولف و ڕێکوپێک کردنی. ⁂ وەک تورڕەیی تۆ ساغ و شکستەم/ وەک نەرگسی نادیدەی تۆ خۆش و نەخۆشم (نالی ل ٢٨١).

**تورڕەنووس** (ئان. فا)[تورڕە/٣ + نووس] کەسێک کە شارەزای شێوە نووسینی تورڕەیە. ⁂ بۆ مەشقی عیشقی زولفی نیگار و نیگارشی/ نالی لە خامە دا بووەتە شاهی تورڕەنووس (نالی ل ٢٤٠).

**تورەهات** (نا.) بڕ: توررەهات.

**توژ** (ئان.)[زا] بڕ: تیژ

**توسک** (گیانـ.)[زا] بڕ: گیسک

**توشتیر** (گیانـ.)[باک] بڕ: چوشتیر

**توشک** (گیانـ.)[زا] بڕ: گیسک

**توغـرا** (نا.)[عەر: طغـرا لە تر:

طورغای] ١ـ شێوە خەتێکی نووسین کە کـــــەوانی و تێک هالاو بێ، تورِرە. ٢ـ مۆرێک کە بە خەتێکی کەوانی لە سەری دەنووسرا و حوکمی ئیمزای پادشا و سولْتانی هەبوو و لە سەرەوەی تۆمار و فەرمانەکان دەدرا. ∷ برۆت باڵی هوما سایەی سەری سولْتانی حوسنت بوو/ خەتت هات و وتی من ناسیخی توغرایی خـونکارم (نالی ل ٢٧٤). ٣ـ فـەرمــان، ئەمر. ٤ـ زولف، پرچی لوول. ∷ قەسەم بە توغرای زولْف چین چینت/ بەو خوردە خالان سیای موشکینت (وەلی دێوانە ل ٢٨) وەش وەش تای توغرای وێت بنمانە پێش/ با هەر ناســــۆر بۆ، زوو نەبۆ سارێش (مەولەوی ل ٥٤).

**توغـیــان** (نا. چا)[عـەر: طغـیـان] سەرکێشیی، نافەرمانیی. **〜 کردن:** ١ـ سەرکێشیی کردن، نافەرمانیی کردن. ٢ـ هەسـتـانی ئاوی رووبار و دەریا. ∷ وەرنە دەجلەی غەم توغیان کەردە بێ/ تا ئیســـە چەندجـار بەغـداش بەردەبێ (مەولەوی ل ١٥٦).

**توف** (نا.)[باک ـ زا] بڕ: تف

**تولح** (نا.)[عــەر: طلوع] ئەنگووتنی هەتاو، خـــۆرهەلات. || **تولحی بەیانی:** بەیانی زوو، ســـەرەتای رۆژ. ∷ تولحی بەیانی هەستاین و وەدەرکەوتین.

**تولانـدنـەوە** (چا. م)[لە: تـولانـەوە] هەلابەهەلا کـردنی مـاکەی نێـو چێـشت لەبەر زۆر کولاندن.

**تولانـەوە** (چا. ل)[هـس: تـوانـەوە] ١ـ هـەلابـەهـەلا بوونی و لەبەر یەک چوونی خـۆراک لەبەر کـولانی لە رادە بەدەر. ٢ـ (مــــجـ.) زۆر زانـین و تێکەلاو بـوون لە مەسەلەیەک، توانەوە. & تولێنەوە.

**تولْخ** (ئان.)[بڕ: تالْ] ١ـ رەنگی رەشی ئامالْ بۆر. ٢ـ رەنگی رەشی ئامالْ زەرد.

**تولْخی** (نا. ل)[تولْخ + ئی] جــۆرێک ترێی دەنک گەورە.

**تولْە** (نـا.)[بڕ: تـورگ][ئـەو: تـەئورونـە (بێچوو). فـار: توله ـ لۆر: تیله] ١ـ توتکە ســەگ، بێـچـــووی ســەگ. ٢ـ ســـەگی چکۆلْەی راو. ٣ـ منداڵ، عـــــەولاد (بۆ ســـووکـایـەتی و جنێــو). **وەک 〜 بە کونی خۆ وەڕین:** (کنـ.) سپلْەیی کردن، بێ ئەمەگی کردن.

**تولْەک** (نا.) بڕ: توولەک

**تومان** (نا.) بڕ: دوومان

**تون** (ئان.)[ئەر ـ زا] بڕ: توند

**تونج** (نا.)[؟] ئالیاژێکی ساز کراوه له هەندێک کانی وەک: مس، قەلایی و فافۆن، که هەندێک دەفری نێو ماڵێی لێ ساز دەکردرێ وەک ئاونگ، کەشەف، سەماوەر و...، زەرد، زەردە، برنجە، پرینگۆک، برۆنز، برنج2.

**توند** (ئان.)[ئەو: تڤەنت ـ پەھ: توند. لۆر: تۆن ـ فار: تند ـ تات: تۆند. باک: توند ـ ناو: توند، تون، تونگ ـ هەو: تن ـ زا: تون] ١ـ حاڵی شتی ئاوەکی کە مەییبێ. // شل ٢ـ سەخت، قایم، مەحکەم. ⁂ توند لێی دە! ٣ـ تامی تیژ. ٤ـ (ئاک.) زوو، خێرا. ⁂ توند برۆ! ٥ـ پڕڕەنگ، تۆخ. ٦ـ تووڕە، قەڵس. ٧ـ حاڵی تووتنی گەرووگر. // نەرم. ٨ـ گشت. ٩ـ تورت، شەق. ⁂ مەمکی خڕ و توند. ~ **بوون:** ١ـ مەیین، بەستنی ئاوەکی. ٢ـ قایم بون، مەحکەم بوون. ٣ـ تیژ بوون. ٤ـ قەڵس بوون، تووڕە بوون. ~ **بوونەوە:** ١ـ خەست بوونەوەی شتی شل و ئاوەکی. ٢ـ قایم و مەحکەم بوونەوەی شتی سست و شل بۆوە. ~ **کردن:** ١ـ قایم کردن. ٢ـ گشت کردنی هەوا و مۆسیقا و هەڵپەڕکێ. ~ **کردنەوە:** ١ـ قایم کردنەوە، مەحکەم کردنەوە.

**توند و تۆڵ** (ئان. ل)[توند + و + تۆڵ] کەسی کارامە و لێهاتوو کە کار بە توندیی دەکا، بە دەستوبرد، گورج و گۆڵ. ~ **بوون:** گورج و گۆڵ بوون، بە دەستوبرد بوون.

**توند و تۆڵیی** (حم.)[توند و تۆڵ + ئیی] بە دەست و برد بوون، توند و تۆڵ بوون، کارامەیی و لێهاتوویی لە کار دا.

**توند و تیژ** (ئان. ل)[توند + و + تیژ] ١ـ تووڕە و قەڵس. ٢ـ کەسێک کە کار و مەسەلە بە سانا ناگرێ، بە زیپک و زاکوون. ~ **بوون:** ١ـ تووڕە و قەڵس بوون. ٢ـ بە زیپک و زاکوون بوون.

**توند و تیژیی** (حم.)[توند و تیژ + ئیی] ١ـ قەڵس و تووڕە بوون. ٢ـ بە زیپک و زاکوون بوون.

**توندە** (نا. ل)[توند + ئە] ١ـ چێشت و خواردنێک کە شل نەبێ. // شلە. ٢ـ چێشتی قوبوولّی و پلاو.

**توندیی** (حم.)[توند + ئیی] ١ـ توند بوون، سەخت بوون. ٢ـ توند و تیژیی، تووڕەیی.

**تونگ**1 (نا.) بڕ: تونگە

**تونگ**2 (ئان.) بڕ: توند

**تونگه** [1] (نا.)[لۆر: تۆنگ ـ تات: تۆنگه ـ فار: تنگ ـ بیر: تۆنگ ـ پەش: توونگ ـ گیل: تونگی. ناو: تونگ، تونگه] دەفری گڵێنە یا شووشەیی مل باریک بۆ ئاوەکی وەک ئاو و شەراب تێکردن.

**تونگه** [2] (نا.)[باک: تونگە ـ ناو: تونگه] کلۆڵە و کەلافی بەن یا دەزوو.

**تونێل** (نا.)[ئین: tunnel] ڕێ و رەهندەیەک کە بە بن کێو دا لێدەدرێ بۆ هاتوچۆی ماشێن و قەتارو مەبەستی دیکە، چەپکەن.

**توەخۆرە** (گیان.)[تو (توو1) + ئە + خۆر + ئە] بڕ: تووخۆرە

**توەر** (نا.)[هەو] بڕ: تەور

**توەرداس** (نا. ل)[توەر + داس][هەو] بڕ: تەورداس

**توەرزین** (نا. ل)[توەر + زین][هەو ـ زا] بڕ: تەورزین

**توەرگە** (نا.)[زا] بڕ: تەرزە

**توی** (نا.)[زا] بڕ: توو1

**تویە** (نا.)[زا] بڕ: توو1

**توێ** (نا.)[پەه: تۆب، تۆپ، تۆک، تۆف. تات: تو ـ لۆر: تووژ. باک: تۆ، تووک ـ ناو: تۆ، توێ، تۆخ، توێخ، توێک، توێژ، توێژاڵ، تۆژاڵ، تۆژ، تووژ، تووژاڵ، تووژک هەو: تووە، تۆ] ١ـ توێژی ناسکی سەر ماست و شیر، سەرتوێ. ٢ـ پارچەیەکی ناسک لە هەرچی. ٣ـ چین، توێژ، لا. :: دووتوێ، هەزارتوێ. ~ **کردن:** پارچە پارچە کردنی ناسکی گۆشت بۆ برژاندن.

**توێتکە** (نا.) بڕ: تۆتکە.

**توێ توێ** [1] (نا. ل)[توێ + توێ] ١ـ پارچەپارچەی ناسکی پێست و توێکڵ، تۆتۆ. ٢ـ چین چین، توێ لە سەر توێ.

**توێ توێ** [2] (وشـد.) وشەیەکە مانگادۆش لە کاتی دۆشینی بە مانگای دەڵێ هەتا ڕاوەستێ.

**توێخ** (نا.) بڕ: توێ

**توێخڵ** (نا. ل)[توێخ + ڵ] بڕ: توێکڵ

**توێژ** (نا.)[بڕ: توێ] ١ـ بەشێکی کەم لە کۆمەڵ. ٢ـ پارچەیەکی تەنک و ناسک لە هەر شتێک، توێ/٢ .

**توێژاڵ** (نا. ل)[توێژ + ئاڵ4] بڕ: توێ

**توێژینەوە** (چا. م)[لە: توێژ] تەحقیق کردن و لێکۆڵینەوە لە مەسەلە و مەبەستێک بۆ زانیاریی پتر و ئاگادار

بوون.

**توێژێنەر** (نا. مــفـ.)[لە: توێژینـەوە] کەسێک کە کاری لێکۆڵینە و تەحقیق و زانیـاریی دەست خسـتـنە لە مـەسـەلە و مەبەستێک.

**توێسوو** (گیا.) بڕ: تێسوێ

**توێسی** (گیا.) بڕ: تێسوێ

**توێشـتـیـر** (گـیـاـ.)[بـاک: تشـتـیـر، توشـتـیـر ـ ناو: چوشـتـیـر، چوێشـتـیـر، توێشـتیر، تشتیر، کوێشـتیر، چوشـتر، چتوور، چتیر] بزنەمێ یا بزنەنێری دوو ساڵە.

**توێشوو** (نا.) بڕ: تێشوو. ~ **کردن:** بڕ: تێشوو کردن.

**توێشـووبەرە** (نا. ل)[توێشـوو + بەر7 + ئە] بڕ: تێشوودان

**توێشوودان** (نا. ل)[توێشوو + دان4] بڕ: تێشووبەرە.

**توێشـە** (نا.) بڕ: تێـشـوو. ~ **کردن:** بڕ: تێشوو کردن

**توێشـەبەرە** (نا. ل)[توێشـە + بەر7 + ئە] بڕ: تێشوودان

**توێشــەدان** (نا. ل)[توێشــە + دان4] بڕ: تێشووبەرە.

**توێک** (نا.) بڕ: توێ

**توێکڵ** (نا. ل)[توێک + ڵ][لۆر: توک. باک: تۆڤل، تیـڤل، تووڤل، تووکل، تقـال ـ ناو: تۆک، توێکڵ، توێخـڵ، توێلک، تێکوڵ، تــۆکــڵ ـ هـــەو: تـــۆک، تـــۆکـــڵ] ١ـ دەرەوەییـتـرین بەشـی دار و درەخت. ٢ـ دەرەوەییــتــرین بـەشی مـیــوە و بەر. ٣ـ بەشی دەرەوەیی هێلکە. & پۆست. ~ **شکاندن:** هاتنە دەری جووجکە لە هێلکە. ~ **لێکردنەوە:** جـوێ کـردنـەوە و پاک کـردنـی توێکڵـی مـیـوە و هـێلکە و شـتـی دیکەی لەم بابەتە.

**توێکمــە** (ئان.)[؟] ١ـ گــیــاندار یا مـرۆڤی خـڕیلە و تـێکسـڕماو. ៖ دەهاتنە خـواریَ حـەوت کـەڵی دە کـێـویی/.../ تێیدابوو کەڵێکی خڕە توێکمەی لەوی دە بچکۆلانـە ٩گـــەنج ل ٣٤٠). ٢ـ شــــتـی پتەوی نێوپڕی قایم. & تۆکمە

**توێلک** (نا. ل)[موک] بڕ: توێکڵ

**توێڵ** (ئا.) بڕ: تەوێڵ

**توێڵاش** (نا.) بڕ: تەڵاش

**توێڵــبــەن** (نا. ل)[توێڵ + بەن][ئەر] دەسـرۆکە و پارچەیەک کە لە نێوچاوانی

**تۆ**[1] (جنا.)[هیک: تڤەم، تەڤە ـ ئەو: توو، تووم، تڤام، تەڤە ـ هەخ: توڤەم ـ پەه: تۆ. تات: تە ـ فار: تو ـ بیر: تۆ. باک: تە، تو ـ ناو: تۆ، توو، ئەتوو، ئەتۆ ـ هەو: تۆ ـ زا: تو، تۆ، توو، توە] جێناوی نەلکاوی دووهەم کەسی تاک.

**تۆ**[2] (نا.) بڕ: تۆم

**تۆ**[3] (نا.) بڕ: تۆێ

**تۆبە** (نا. چا)[عەر: توبە] ١ـ پەشیمان بوونەوە لە گوناه و ئەنجام نەدانەوەی. ٢ـ (مجـ.) پەشیمان. ~ **دادان:** کەسێک هان دان بۆ تۆبە کردن و دەست لە کاری نالەبار هەڵگرتن. ~ **شکاندن:** لە ژێر پێ نانی تۆبە و دەست بە گوناه کردنەوە. ። ماچ کردن خۆشە نۆبە بە نۆبە/ حەفت جار سۆفی بم دەشکێنم تۆبە (فۆلکلۆر ل ١٦٢). ~ **کردن:** ١ـ دەست هەڵگرتن لە کاری گوناه و ئەنجام نەدانەوەی. ٢ـ پەشیمان بوون. ። تازە ئیدی من لە هەرچی کاسبی و دوکانداریی‌یە تۆبەم کردوە! ~ **کردن لە سەر دەستی کەسێک:** قەول و بەڵێنی دان بە کەسێک بۆ ئەنجام نەدانەوەی کار و کردەوەیەکی خراپ. ። لە سەر دەستی تۆ تۆبەی دەکەم تازە بە دوای قومار دا نەچمەوە. || **تۆبەی ڕاست:** تۆبەیەک کە دیسان تۆبە نەکرێتەوە، تۆبەیەک بۆ هەمیشە، تۆبەی نەسووح. **تۆبەی گورگ (ی):** (کنـ.) تۆبەی بە قەستی و بە درۆ، تۆبەیەک کە سەر نەگرترێ. ። تۆبەی گورگی مەرگە. **تۆبەی نەسووح:** تۆبەیەک بۆ هەمیشە بێ پاشگەز بوونەوە و تۆبە شکاندن، تۆبەی ڕاست. (گۆیا: نەسووح پیاوێک بوە کە ڕوخساری ژنانەی هەبوە و سی ساڵ دەلاک بوە لە حەمامی ژنان. ڕۆژێک کچی شا لە حەمام مرواریی‌یەکی لێ ون دەبێ و خەریکی پشکنین و گەڕانی لەشی کارکەران و دەستوپێوەند دەبن. نەسووح دەست دەکا بە پاڕانەوە لە خودا کە ئەگەر ئەمجارە ئەم بەڵایەی لە کۆڵ بێتەوە تازە ڕوو لەو کارە ناکاتەوە و تۆبەی دەکا. لە دوایین ساتەکان دا کە نۆرەی پشکنینی نەسووح دەبێ مرواری دەبیننەوە و نەسووح ڕزگاری دێ و ئیدی ڕوو لەم کارە ناکاتەوە.)

**تۆبەدار** (ئان. فا)[تۆبە + دار2] بڕ: تۆبەکار

**تۆبەداریی** (حم.)[تۆبەدار + ئیی] بڕ: تۆبەکاریی

**تۆبەکار** (ئان. فا)[تۆبە + کار] کەسێک کە پەشیمانە و دەستی لە گوناه هەڵگرتوە و تۆبەی کردوە، تۆبەدار. **~ بوون:** دەست لە گوناه هەڵگرتن و تۆبە کردن.

**تۆبەکاریی** (حم.)[تۆبەکار + ئیی] ئاکامی دەست لە گوناه هەڵگرتن و تۆبە کردن، تۆبەداریی.

**تۆبەشکێن** (ئان. فا)[تۆبە + شکێن] کەسی تۆبەکار کە بەڵێنی تۆبە دەشکێنێ و گوناه دەکاتەوە.

**تۆبەشکێنیی** (حم.)[تۆبەشکێن + ئیی] کاری تۆبەشکێن، ئاکامی تۆبە شکاندن.

**تۆپ** (نا.)[تور: top] ١ـ (نز.) چەکێکی گەورەی شەڕە کە گولەی گەورە دەخوا، دادەبەسترێ و لە سەر ماشێن و تانکیش دایدەنێن و شوێنی دووری پێ دەکوتن. ٢ـ کەرەسەیەکی یاری و کایە کردنە کە بۆ هەر یارییەک تۆپی تایبەتی هەیە (تۆپی والیباڵ، تۆپی پینگ پۆنگ، ...) ٣ـ بەستەیەک پارچە کە لە کارخانە رادەکەی دیاری دەکرێ و مۆری لە سەر دەدرێ. ٤ـ ئامرازێکی چێوی خڕی گەورەیە وەک چەرخ، نێوەکەی پەڕەی لێدراوە، لە سەر جۆگەی ساز کراو بۆ ئاش دایدەمەزرێنن و بە سووڕانی ئاش دەگەڕێ، تەمبوورە، تەموو. ٥ـ چەرخی عارەبە. ٦ـ هەر شتێکی خڕی ساز کراوە بە دەست، تۆپەڵ، تۆپەڵە. ⁘ تۆپەبەفر، تۆپەقوڕ. ٧ـ (مج.) تڕ. ٨ـ (کنـ.) ئەندامی خڕ و پڕ و رەق. ٩ـ دارێکی درێژ کە سەرەکەی پەڕۆی لێبەستراوە و بۆ خاوێن کردنەوەی لوولە و گونجی و تۆپکەشی کەلکی لێوەردەگرن، تۆپی گونج. ١٠ـ کۆمەڵ، جمهوور، تێگرایی، گشت. **وەبەر ~ دان:** شوێنێک تۆپ باران کردن. **~ ئاگر دان:** تەقاندنی تۆپ، هاویشتنی تۆپ. ‖ **تۆپی ئاش:** بڕ: تەمبوورە. **تۆپی بەربانگ:** تۆپێک کە لە کاتی بەربانگ لە رەمەزان دا دەیانتەقاند هەتا خەڵک لە رۆژوو شکاندن ئاگادار بکەنەوە. **تۆپی پارشێو:** تۆپێک کە بۆ هەستاندن و ئاگادار کردنەوەی خەڵک لە مانگی رەمەزان دا دەتەقێندرا هەتا خەڵک هەستن و پارشێو بکەن. **تۆپی تەیارەشکێن:** جۆرێک تۆپ کە بە فرۆکەیەوە دەنێن. **تۆپی جەنجەڕ:** دوو داری پتەوی لێک و لووس کراو کە هەرکام بە قەرا کاریتەیەک ئەستوورن و درێژاییان گەزێک یان هەندێک پتر دەبێ

و له پهڕه یا باڵتهکانی له سهر دادهکوتن. ئهم تۆپانه یهک له پاش و یهک له پێشهوهی جهنجهڕ دایدهمهزرێن.

**تۆپی گونج:** بڕ: تۆپ/٩

**تۆپاز** (نا.)[فهر: topaze] جۆرێک بهردی بهنرخ، زهبهرجهدی هیندیی، یاقووتی زهرد.

**تێبینی:** تۆپاز ناوی دوڕگهیهکه له دهریای سوور نزیک ئیتیۆپی.

**تۆپاڵ** (نا.) بڕه و وردهی مس و ئاسن که لهبهر کوتان دهپهڕن و دهکهون. ⁂ به غهمزهی نازهوه ئهو سهروی نازه کهی چوه گوڵشهن/ که نێرگس وا بوه چاوی سپی، سهروی بوه تۆپاڵ (مهحوی ل ٢٠٣).

**تێبینی:** له فهرههنگی موعین دا توپال (تووپال) ههر بهو مانایه هاتوه و به وشهیهکی فارسی داناوه و عهرهبی کراوهکهی به توبال داناوه.

**تۆپان** (نا. ل)[تۆپ/٢ + ئان][ئهر] بڕ: تۆپین

**تۆپاندن** (چا. م)[؟][باک: تۆپاندن - ناو: تۆپاندن، تۆپانن] سهقهت کردن و مراندنی ئهو گیاندارانهی گۆشتیان ناخورێ. ٢- (کنـ.) کوشتنی دوژمن. ٣- (کنـ.) لێدان و خستنی کهسێک. ٤- (کنـ.) خهواندن، نواندن. ⁂ دا ئافرهت ههستته ئهو منداڵانه بتۆپێنه شهو درهنگه!

**تۆپانن** (چا. م)[ئهر] بڕ: تۆپاندن

**تۆپانێ** (نا. ل)[تۆپ/٢ + ئانێ] بڕ: تۆپێن

**تۆپباران** (نا. ل)[تۆپ/١ + باران] هاتنه خواری به تێکرایی گولهی تۆپ بۆ سهر شوێنێک. **~ کردن:** وهبهر تۆپ دانی زۆری شوێنێک به تۆپی شهڕ.

**تۆپاوێژ** (ئان. فا)[تۆپ/١ + هاوێژ (هاویشتن)] کهسێک که ئهرکی هاویشتنی تۆپی له سهره، تۆپچی، تۆپهاوێژ.

**تۆپباران** (نا. ل)[تۆپ/١ + باران/٢] تۆپی زۆر بۆ سهر ناوچه یا شوێنێک. **~ کردن:** وهبهر تۆپ دان، تۆپی زۆر له شوێنێک دان.

**تۆپتاو** (نا. ل)[تۆپ/٢ + تاو4] جۆرێک داری گوێین که سهرهکهی وهک کهوچک وایه، گوێ له سهر دادهنێن و ههڵیدهدهن.

**تۆپ تۆپێن** (نا. ل)[تۆپ/٢ + تۆپ/٢

+ ئێن] بڕ: تۆپێن

**تـۆپـچـی** (ئـان. ل)[تـۆپ/١ + چـی] کـەسـێک کـە ئەرکی هاویشـتنی تۆپی لە سەرە، تۆپهاوێژ.

**تۆپخـانە** (نا. ل)[تۆپ/١ + خـانە] ١ـ شـوێنـی راگـەتنی تۆپـی شـەڕ. ٢ـ (نز.) بەشـێک لە قـۆشـەن کـە لە سـەر تۆپ کـار دەکەن.

**تۆپز** (نا.)[تور: topuz] ١ـ گـۆپاڵ و کوتەکی بزماررێژ کراو، گورز. ٢ـ (مجـ.) زۆر، جـەبر. **بە ~ بردن:** بە زۆر بردن. ⁑ پێمخۆش نەبوو بچمە مەدرەسـە بابم بە تۆپز بردمی.

**تۆپســاز** (ئان. فـا)[تۆپ/١ + سـاز] کـەسـێک کـە تـۆپـی شـەڕ دروست دەکـا، وەستای تۆپ ساز کردن. ⁑ بە فەرمانی خــانۆ بـانگـی تۆپســازیان کــرد، ناوی خاچۆ بوو، ... (دمدم ل ٢٢٩).

**تۆپسازیی** (حم.)[تۆپساز + ئیی] کار و پیشەی کەسی تۆپساز.

**تۆپکەشــیی** (حم.)[تۆپ + کـــەش (کـێـشــان) + ئیی] کــاری کــردنەوەی گـیـرایی و خـاوێن کـردنەوەی گـونجی و لوولە بە تۆپ/٩. **~ کردن:** کردنەوەی گــیــرایی و خــاوێن کــردنەوەی لـوولە و گونجی.

**تۆپ و تەشـــەر** (نا. ل)[تۆپ + و + تەشـەر] تیـر و تانە، توانج، تەشـەر. **~ لێـدان:** تەشـــەر لێـدان، تیــر و تانـە لە کـــەســـێک دان. **وەبەر ~ دان:** تیــر و تانەی زۆر لە کەسێک دان، هێرش بردنە سەر کەسێک بە تەشەر و توانج.

**تۆپۆق** (نا.)[فـار: تپـق] هەڵەی زمـان، هەڵەنگووتنی زمـان. **~ لێـدان:** هەڵە زمان یا بە خراپ دەربڕینی وشە لە کاتی خوێندنەوە نووسـراوەیەک یا قسـە کـردن لە رادیـۆ، تەلـەویـزیـۆن و شــــوێنـی لـەم بابەتە.

**تۆپهــاوێژ** (ئان. فــا)[تـۆپ + هاوێژ (هاویشتن)] بڕ: تۆپاوێژ

**تۆپەڵ** (نا. ل)[تۆپ/٦ + ئەڵ] ١ـ هـەر شـتـێکی کە بکرێ بە دەست خڕ کـرابێ وەک بـەفــر و قــوڕ و گـــێچ، تـۆپ. ⁑ تۆپەڵەبەفر، تۆپەڵەقوڕ. ٢ـ گردەکۆ، کۆ، خڕ. & تۆپەڵە. **~ کردن:** ١ـ خڕ کردن وەک تـۆپ. ٢ـ بـە ســــەر یـەک دا کــــۆ کردنەوە.

**تۆپەڵـە** (نـا. ل)[تـۆپ/٦ + ئـەڵە] بـڕ: تۆپەڵ.

**تۆپەڵەشەڕێ** (نا. ل)[تۆپەڵە + شەڕ +

ئێ] یاری و گـــەمـــە بە تۆپە بەفـــر، شەڕەبەفر.

**تۆپەوانە** (نا. ل)[تۆپ + ئە + وانە] پارچە و پەڕۆی زاراخنی کووپە و گۆزە و شتی لەم بابەتە.

**تۆپیگ** (نا. مف.)[لە: تۆپین][ئەر] بڕ: تۆپیو

**تۆپین** (چا. ل)[لۆر: توپێـسێ. باک: تۆپـین ـ ناو: تـۆپین، تۆپـان ـ هەو: تـۆپای] ١ـ مـردنی ئەو گـیاندارانەی گۆشـتیـان نـاخـــــورێ، تـۆپـان. ٢ـ (کنـ.) نـوسـتن، خــەوتن. :: کـچێ ئەوە بۆ نـاتۆپی شــەو درەنگە. ٣ـ (مـــجـ.) مـــردنی کـــەسی ناخۆشەویست.

**تێـــبـــینی:** تـۆپین بـۆ مـــردنی ئـەو گـیـاندارانە بەکـار دێ کـە گـۆشـتـیـان ناخورێ وەک سەگ، کەر، ئەسپ، پشیلە بەڵام ئەو گـیـاندارانەی کـە گـوشـتـیـان دەخـورێ وەک مریشک، مـەڕ، مـانگا و ... مندار یا مردار دەبنەوە و مرۆڤ دەمرێ.

**تۆپیو** (نا. مف.)[لە: تۆپین] گیانداری مردوو، مردار، تۆپیگ.

**تۆپێن** (نا. ل)[تـۆپ + ئێـن] ١ـ کــایە کـردن بە تۆپی یاری. ٢ـ بڕ: فـوتبـاڵ. & تۆپانێ، تۆپ تۆپێن.

**تۆتاک** (گــیـانـ.)[تۆت (دەنگی ئەم باڵندەیە) + ئاک][باک] بڕ: تاقتاقکەرە.

**تۆتـۆ** (نا. ل)[تـۆ3 + تـۆ3] بـڕ: تـوێ تویێ. :: چنگ پێکۆ نە جـەرگ نـەغـمـەی سازەکەت/ بەرارۆ تۆتۆ میقراز گازەکەت (مەولەوی ل ٤)

**تۆتکە** (نا.)[هس: تۆتە] ئۆقرە، ئارام، سـرەوت، توێتکە. **~ خواردن:** دانیشتن و ئۆقـرە گرتن، ئارام گـرتن، داسـەکنین، تۆتکە گـرتن، توێتکە خـواردن، توێتکە گـرتن. **~ گـرتن:** بڕ: تۆتکە خـواردن. **کـونگ ~ نەخـواردن:** ئارام نـەگـرتن، نائارام دانیشتن، بزووتن و نەسەکنین.

**تۆتە** (نا.)[باک: تات ـ ناو: تۆتە ـ زا: تاتی] ئەنجـامی دانیــشـتن بۆ منداڵی چووکە یا لە زمانی منداڵەوە. **~ کردن:** دانیشتن.

**تۆتیا** (نا.) بڕ: تووتیا1

**تۆچان** (نا. ل)[تۆ2 + چان (چاندن)] بەروانکە یا پارچەیەکی ئاسایی دیکە کە جــووتێــر تۆی تێــدەکــا و بە زەوی دا دەیپرژێنێ.

**تۆخ**[1] (نا.) بڕ: توێ

**تۆخ**[2] (ئان.)[؟] رەنگی تـوند و تاریک.

⁘ ســـــووری تۆخ. ٢ـ پڕڕەنگ. ⁘ چای تۆخ.

**تۆخم** (نا.)[باک] بڕ: تۆم

**تۆخماخ** (نا.) بڕ: تۆخماغ

**تۆخماغ** (نا.)[تور: توقمق tokmak] کوتکی چێویی، تۆخماخ. **~ کردن:** سەرکوت کردن، فەوتاندن. ⁘ وەک دەچێ بۆ بێچووی شێر، مار و هەژدیها/ گە شێر بزانێ تۆخماغی دەکا (سەعید و میرسێوەدین ل ٦١).

**تۆخوم** (نا.)[باک] بڕ: تۆم

**تۆر[1]** (نا.) بڕ: تۆرە

**تۆر[2]** (نا.)[هەو ـ زا] بڕ: تەور

**تۆر[3]** (نا.)[لە: تۆران] دڵێشاو، زیز، زویر. ⁘ ئاشتیی تۆ، تۆری من، بۆ بێ سەباتیی هەردوو یەک/ گەیوەتە حەددی یەقین. ئەم دوو یەقینەن هەردوو شەک (مەحوی ل ١٩). **~ کردن:** تۆران، زیز بوون.

**تۆراخ** (نا.) بڕ: تۆراغ

**تۆراخدان** (نا. ل)[تۆراخ + دان4] بڕ: تۆراغدان

**تۆراخە** (نا.)[هەو] بڕ: تۆراغ

**تۆراغ** (نا.)[ئەو: توورەی ـ باک: تۆراق ـ ناو: تۆراخ، تۆراغ ـ هەو: تۆراخە ـ زا: تۆراق، تووراق] ماست یا دۆ کە دە توورەکەی دەکەن و ئاوەکەی دەگرن و هەندێک جار کەمێکی گیای ویشک تێدەکەن و دەیخۆن.

**تێبینی:** توورەی لە ئەوێستا دا بە مانای جۆرە پەنیرێک هاتوە و لە زمانی رووسی دا وشەی tvorog شیرێژە، هەروەها دوراغ لە زمانی فارسی دا هەر بە مانایەیە و تۆراق لە زاراوەکانی باکووریی و زازایی دا بە مانای لۆرکە.

**تۆراغدان** (نا. ل)[تۆراغ + دان4] ١ـ دەفرێکی گڵێنەی وەک تەشت یا خیگەیەک کە تۆراغی تێدا رادەگرن، تۆراخدان. ٢ـ (کنـ.) مرۆڤی زگ زل

**تۆراق** (نا.)[بڕ: تۆراغ][باک ـ زا] لۆرک

**تۆران** (چا. ل)[بڕ: تووڕە][ناو: تۆران، تۆرین ـ هەو: تۆریای] دڵگیر بوون لە کەسێک و خۆ تێنەگەیاندن و نەدواندن، زیز بوون، زویر بوون.

**تۆراندن** (چا. م)[لە: تۆران] دڵ ئێشاندنی کەسێک و زیز بوونی، زویر بوون.

**تۆراو** (نا. مف.)[لە: تۆران] کەسی دڵ ئێشاو، زوێر، زیز.

**تۆریە** (نا.)[باک - زا] بڕ: توور1

**تۆرتان** (نا.)[؟][باک] بڕ: مقەست

**تۆرزین** (نا. ل)[تۆر + زین][زا] بڕ: تەورزین

**تۆرزێن** (نا. ل)[تۆر + زێن][زا] بڕ: تەورزین

**تۆرژلە** (نا.)[زا] بڕ: تەرزە

**تۆرژەن** (نا. ل)[تۆر + ژەن (زین)][زا] بڕ: تەورزین

**تۆرسەلە** (نا.)[زا] بڕ: تەرزە

**تۆرڤک** (نا.)[زا] بڕ: توور1

**تۆرک** (گیان.)[باک] بڕ: تورگ

**تۆرگە** (نا.)[زا] بڕ: تەرزە

**تۆرمتە** (گیان.)[مەغ: تۆرمتای] مەلێکی چووکی راوکەری چاورەشە، بە قەرا و هەروەک بایەقۆش بەڵام بڵندتر و سەری هەندێک چووکترە. ئەم مەلە گۆشتخۆر و تیژپەڕە و لە باشوو تیژتر و گورجترە. رەنگی پەڕەکانی زەردی تۆخی مەیلەو شینە و پەڵەی رەش و زەردی لە سەرە. پێیەکانی زەرد و دندووکی رەشی ئاچغ و لە سەر زگی پەڵەی سپی مەیلەو زەردی هەیە و رانەکانی خەنەیین. باڵای نزیک سی سانت دەبێ، لە شەهێن چووکتر بەڵام درێژترە. نێرەکەی لە مێیەکە سەری زلترە و بۆ راو مێیەکەی دەستەمۆترە و لە بەرزایی کێوەکان دە نێو رەوەزەکان و لە لێڕەواریش هێلانەی چێ دەکا راوی مەلی چووک وەک کۆتر و کەو و هەوێردەی پێدەکەن (فرهنگ پرندگان ل ٥٣). Falco Subbuteo ناوی لاتینی ئەم مەلەیە، تۆرنتە، ترۆمتە. || **تۆرمتەی سەر سوور:** سەر و پاشملی سووورە. پەڕ و باڵی رێ رێیە و خەتی پانی رەشی لە کۆتایی کلکی دا هەیە. پشتی بۆرە و لە سەر شان و باڵی خەتی قاوەیی هەیە. شاپەڕی باڵی قاوەیی مەیلەورەشە. بەر زگی سپییە و بە پانایی دا رێ رێی وردی رەشی تێدایە. باڵندان راو دەکا. لە شوێنی ئاوەڵا، دەشتی بەرین، شوێنی تەنکە دار دەژی. لە سەر دار هێلانەی دەکا. جارجار کۆنە هێلانەی قەلەڕەشان ئاوەدان دەکاتەوە (فەرهەنگی باڵندە ل ١٧٣). Falco chicqueru ناوی لاتینی ئەم باڵندەیە. **تۆرمتەی لاق سوور:** ٣٠ سانتیمێترە. باڵی ئەوەندە درێژە دەگاتە سەر کلکی.

دەوری چاو و نەرمەی دندووک و قاچی سووری نارنجین. نێرە لە مێیە زۆرترن. بۆری ئاماڵ رەشن و ژێر کلکیان شێ رەنگە. مێیە سەری خورمایی رەنگە و بەر زگی خۆڵینەیە و خەتی لاجانگی قوڵە و ئامالّ رەشە. پشت و کلکی خەتی بۆریان بە پانایی دا کشاوە. لە ئاسمان لەنگەر دەگرێ و لەو کاتە دا خۆی خوار رادەگرێ. تاوپەڕی ئێواران مێش و مەگەزان راو دەکا. گیانلەبەری وەک کوللە و مشکیش لە سەر عەرز دەگرێ. لە دەشتی خاوەن پنچک و داری کورت، لێواری لێڕەواران و دەورووبەری زەوییان دەژی (فەرهەنگی باڵندە ل ١٧٤). Fal-co vespertinus ناوی لاتینی ئەم باڵندەیە.

**تۆرن** (ئان.)[سان: تورە][بر: توورە][زا] دلێر، قارەمان، بەهێز، قەوی.

**تۆرنتە** (گیان.) بڕ: تۆرمتە

**تۆرە** (نا.)[؟][ناو: تۆر، تۆرە، تۆرەمە] رەچەڵەک، بنەچەکە، بەرە، نەسل. ❊ باوکم ... لە تۆرەی مەلا جامی چۆڕی بوو کە سێسەد ساڵ لەوەی پێش هاتۆتە سابلاخ (تاریک و روون ل ٣).

**تۆرەکە** (نا.)[هەو] بڕ: توور1

**تۆرەمە** (نا.) بڕ: تۆرە

**تۆری** (گیان)[باک] بڕ: تورگ

**تۆریای** (چا. ل)[هەو] بڕ: تۆران

**تۆریک** (گیان.)[باک] بڕ: تۆرک

**تۆرین** (چا. ل) بڕ: تۆران

**تۆرینۆک** (ئان. ل)[تۆر3 + ئینۆک] کەسێک کە زوو بتۆرێ و دڵی بێشێ.

**تۆڕ[1]** (نا.)[پەش: تۆر - فار: توور. باک: تۆڕ - ناو: تۆڕ - هەو: تۆڕ - زا: تۆڕ] ١- پارچە و قوماشی کون کون. ٢- ئامرازێکی دەست چنە، بۆ راو کەلکی لێوەردەگرن کە لەم پەیوەندییە دا کونەکانی ورد یا درشتە، پتر بۆ راوی ماسی و باڵندە کەلکی لێوەردەگرن و چەند جۆری هەیە. ٣- بڕ: چراتۆڕ. ٤- کوتە قوماشێکی سپی کون کونی تایبەتیە کە لە چراتۆڕ دا کەلکی لێوەردەگرن و ناسووتێ. ٥- تەونۆکەی جاڵجاڵۆکە. ٦- (مج.) پێوەندیی گشتی پێک بەستراوی کۆمەڵ و دەستەیەک بە یەکەوە.

**تۆڕ[2]** (ئان.)[بر: توورە][لۆر: تور - ناو: تۆڕ] ١- ئەسپ و ماینێک کە هێشتا بە تەواوی دەستەمۆ نەبووبێ و بە هەموو

کەس سواریی نەدا. ٢ـ کیژێک کە بە سانایی خۆ وەدەست نادا و لە پیاو بسڵەمێتەوە. ٣ـ سەرشێت.

**تۆڕک** (گیا.)[باک] بڕ: تۆڵکە

**تۆڕەوان** (نا. ل ـ ئان. ل) [تۆڕ1/٢ + ئە + وان] ١ـ کەسێکی ماسیگر کە لە چۆم یا دەریا بە تۆڕ ماسی راو بکا. ∷ تۆڕەوانێک لە سەر بەحرێ بوو، ئەحمەد چوو کنە وی بە نۆکەری. (مان ل ١٠). ٢ـ کەسێک کە بە تۆڕ باڵندان راو بکا. ∷ دوو قورینگی گەردن بە خار ... دانیشتن لە تەنکاوان/ تۆڕەوانەک پەیدا بوو ئەوانی گرت بە داوان (سێسەد هۆنراوە ل ١١٢)

**تۆز** (نا.)[تور: toz] ١ـ خاک و خۆڵی وردی بڵاو لە هەوا و دەوروبەر، گەرد، تەپ و تۆز، تۆز و خۆڵ. ٢ـ وردەی شتی دیکە کە شێوەی تۆز/١ بدا. ∷ تۆزی ئارد. ٣ـ دەرمان و کەرەسەی جوانی ژنان و شتی دیکەی زۆر ورد، پوودر. ٤ـ کەم، زۆر کەم، نەختێک، تۆزاڵ. ∷ تۆزێکم چا بدەیە با دێمی کەم! ٥ـ (ئاک.) ماوەیەکی کەم، زەمانێکی کورت. ∷ تۆزێک لە سەرم راوەستە ئەوە دێم! ~ **تەکاندن:** ١ـ خاوێن کردنەوە و پاک کردنەوەی خۆ، کەسێک یا شتێک لە تۆز. ٢ـ (کنـ.) بە قەستی لە کەسێک دان، تێهەڵدانی قەستی. ~ **شکاندن:** (کنـ.) زۆر کارامە و لێزان بوون لە کار و مەسەلەیەک وەها کە کەس نەگاتەوە سەری. ∷ لە پیاوەتی دا کەس تۆزی ناشکێنێ. ~ **کردن:** ١ـ خاک و خۆڵ و تۆز وە هەوا خستن. ٢ـ (کنـ.) ئاژاوە نانەوە. ~ **لە شتێک هەستاندن:** (کنـ.) زور توند لە شتێک دان. ∷ مستێکی لە پشتی دا تۆزی لێهەڵستاند. ~ **لێهەڵنەستان:** (کنـ.) زۆر رژد و چرووک و لەچەر بوون، هیچ لێهەڵنەوەران. ~ **وە حەوا خستن:** هەوا پیس کردن بە ماڵین و گەسک لێدانی و شتی لەم بابەتە، تەپ و تۆز وە حەوا خستن، تۆزوخۆڵ وە حەوا خستن. ‖ **تۆزی بانان:** (کنـ.) فەوتاو، نابووت. ∷ تا یەک دەکرێ بە خانی خانان/ زۆرکەس دەبێ ببنە تۆزی بانان (مەم و زین ل ٢٩٢). یا دەبمە خانی خانان/ یا دەبمە تۆزی بانان (پەند). **تۆزی بەر پێ:** (کنـ.) چووک و هیچ لە ئاست کەسێکی خۆشەویست، تۆزی داوێن، خاکی بەر پێ. **تۆزی داوێن:** (کنـ.) بڕ: تۆزی بەر پێ. ∷ کە بێخود تۆزی داوێنی ئەوان

بێ/ ئەشێ یارەب لە تەفسیری ببووری (بێخود ل ١١٦).

**تۆزاش** (نا. ل)[تۆز + ئاش1] تۆزی سپی ئاردی گەنم و دانەوێڵەی هاڕاوی ئاش کە لە سەر و لەشی ئاشەوان و خەڵکی دیکە دەنیشێ، پشتاش.

**تۆزاڵ** (نا. ل)[تۆز + ئاڵ4] زۆر زۆر کەم، تۆز، تۆزێک، تۆزقاڵ، تۆزکاڵ، تۆزوولکە، تۆزڵانە، تۆزڵقان، تۆسکاڵ، تۆسقاڵ.

**تێبینی:** وشەکانی تۆزقاڵ، تۆزکاڵ، تۆزڵانە، تۆزڵقان و ... گشتیان لە تۆزاڵ پەیدا بوون و بەرەبەرە ئەم حاڵەتانەیان بە سەر دا هاتوە.

**تۆزاویی**(ئان. مف.)[تۆز + ئاویی2] حاڵی کەسێک یا شتێک کە تۆزی لە سەر نیشتبێ، تۆز لێنیشتوو.

**تۆزتەکێن** (نا. ل)[تۆز + تەکێن (تەکاندن)] کوتە پارچەیەک کە لە چێوێکی دەبەستن و لە شت و شمەکی سەر رفە و تاقە و شوێنی دیکەی رادەکێشن هەتا تۆزەکەی لێ جیا بکەنەوە.

**تۆزقاڵ** (نا. ل)[تۆز + قاڵ (ئاڵ)] بڕ: تۆزاڵ

**تۆزکاڵ** (نا. ل)[تۆز + کاڵ (ئاڵ)] بڕ: تۆزاڵ

**تۆزڵانە** (نا. ل)[تۆز + ڵان (ئاڵ) + ئە] بڕ: تۆزاڵ

**تۆزڵقان** (نا. ل)[تۆز + ڵقان (ئاڵ)] بڕ: تۆزاڵ

**تۆز و خۆڵ** (نا. ل)[تۆز + و + خۆڵ] وردەی خاک و خۆڵ لە هەوا دا، تۆز، تەپ و تۆز.

**تۆزوولکە** (نا. ل)[تۆز + ئوولکە] بڕ: تۆزاڵ

**تۆژ**[1] (نا.) بڕ: توێ

**تۆژ**[2] (ئان.)[زا] بڕ: تیژ

**تۆژاڵ** (نا. ل)[تۆژ1 + ئاڵ4] بڕ: توێ

**تۆس** (نا.)[بڕ: تەز][هەو] تەز، سڕ.

**تۆسای** (چا. ل)[هەو] بڕ: تەزین

**تۆسقاڵ** (نا. ل)[تۆس(تۆز) + قاڵ (ئاڵ)] بڕ: تۆزاڵ

**تۆسکاڵ** (نا. ل)[تۆس(تۆز) + کاڵ (ئاڵ)] بڕ: تۆزاڵ

**تۆسلە** (نا.)[زا] بڕ: تەرزە

**تۆسنای** (چا. م)[هەو] بڕ: تەزاندن

**تۆسە** (نا.)[زا] بڕ: تاس1

**تۆسی** [1] (گیا.)[ئەر ـ هەو] بڕ: تێسوێ

**تۆسی** [2] (نا.)[هەو] بڕ: تەزوو

**تۆشە** (نا.) بڕ: تێشوو. **~ کردن:** بڕ: تێشوو کردن.

**تۆشەبەرە** (نا. ل)[تۆشە + بەر7 + ئە] بڕ: تێشوودان

**تۆشەدان** (نا. ل)[تۆشە + دان4] بڕ: تێشوودان

**تۆف** (نا.)[بڕ: تاف] ١ـ هەڕەت، جەنگە، تاف. ٢ـ بەفر و با پێکەوە، کڕێوە، بادەوە.

**تۆفان** (نا.)[عەر: طوفان لە یون: ty-phon] ١ـ شێوانی هەوا و بای توند کە وێرانیی پێکبێنێ. ٢ـ فەرتەنە و شێوانی دەریا. || **تۆفانی نووح:** بارانێکی زۆر کە خودا لە سەردەمی نووح دا باراندی و بوو بە هۆی چوونە ژێر ئاوی ویشکایی و تەنیا نووح و هاودەمەکانی رزگاریان هات.

**تۆفانە** (گیان.)[تۆفان + ئە][ئەر] بڕ: مێشوولە

**تۆفە** (نا.)[؟] دیوارێک کە بە قوڕ بێ خشت و بەرد ساز کرابێ، چینەی دیوار لە قوڕ، موور.

**تۆفیر** (نا.)[عەر: توفیر] تەفاوەت، فەرق، جیاوازیی، تەوفیر. **~ کردن:** تەفاوەت کردن، فەرق کردن. **~ هەبوون:** فەرق هەبوون، جیاوازیی هەبوون.

**تۆفیق** (نا. چا)[عەر: توفیق] کارسازیی و جێبەجێ کردنی کاروبار لە لایەن خوداوە بە پێی داوای بەندە، یارمەتی دانی بەخت. **~ دان:** سەرکەوتوو کردن، کار چوونە پێش لە لایەن خوداوە. ∷ هەرکەس راستگۆ بێ، خوداوەندی میری مەزن لە دونیایە دا تۆفیقی دەدا.

**تۆڤ** (نا.)[باک] بڕ: تۆم

**تۆڤڵ** (نا. ل)[باک] بڕ: توێکڵ

**تۆق** [1] (نا.)[عەر: طوق] ١ـ ملوانکەی زێڕی ژنان. ٢ـ هەر شتێک کە وەک ئاڵقە لە مل دابێ. ٣ـ خەتێکی وەک ئاڵقە لە ملی گیاندار دا. || **تۆقی سەر:** تەپڵە سەر. **تۆقی لەعنەت:** ١ـ لەعنەتی هەمیشەیی. ٢ـ (کن.) ژن و هاوسەر ـ کە هەتا سەر دەگەڵت بژی و بەتایبەت هی خراپ ، خێزان. ∷ بەڵام هێمن نیگەران بوو... نەیدەزانی تۆقی لەعنەتی بۆ دێن

یا فریشتەی رەحمەت (تاریک و روون ل ٢٥). ئەو تۆقی لەعنەتە باوکم بۆی دیتمەوە. *** تۆقی لەعنەت لە مل دابوون:** بە لەعنەت بوونی هەمیشەیی. ⁂ بە لەعنەت بێ وەک ئەزازیل، تۆقی لەعنەتی بێ لە ملانە/ جا هیچ فەرقی نیە، ئەویش هەر شوبرە و هەر شەیتانە. (؟) *** تۆقی لەعنەت دە ملی کەسێک کردن:** کەسێک بۆ هەمیشە بە لەعنەت کردن.

**تۆق**[2] (وشد.) دەنگی تەقەمەنی، تەقە، تەق. **~ کردن:** ماندوو بوونی منداڵ لە گریانی زۆر و بێدەنگ بوونی.

**تۆقــــان** (چا. ل)[لە: تۆق2] ١ـ بڕ: تەقین. ٢ـ ترسانی زۆر

**تۆقـاندن** (چا. م)[لە: تۆقان] ١ـ بڕ: تەقاندن. ٢ـ ترساندنی زۆر.

**تۆق تۆقــە** (نا. ل)[تۆق2 + تۆق2 + ئە] تەقەمەنیەکی منداڵانە کە لە رۆژی قوڵەچوارشەممە یا لە کاتی دیکە دەیتەقێننەوە.

**تۆق تۆقیلە** (گیا.)[تۆق2 + تۆق2 + ئیلە] گیایەکە بەرەکەی ناو بەتاڵە، بە دەست دەیگوشن تەقەی دێ (هەنبانە ب ١ ل ١٥٥).

**تۆقین** (چا. ل)[لە: تۆق2] ١ـ بڕ: تەقین. ٢ـ ترسانی زۆر. ⁂ کە چاوم بە سیمای کرێتی کەوت تۆقیم و وەختابوو شێت بم.

**تۆقێنەر** (نا. فا)[تۆق + هێنەر] شتێک یا کەسێک کە ترسێکی زۆر پێک دێنێ و جێگای مەترسییە، بەسام، ترسناک.

**تۆک** (نا.)[ئەر ـ هەو] بڕ: توێکڵ

**تۆکڵ** (نا. ل)[تۆک + ڵ] بڕ: توێکڵ

**تۆکمە** (ئان.) بڕ: توێکمە

**تۆل**[1] (ئان.)[زا] بڕ: تاڵ

**تۆل**[2] (ئان.)[باک] بڕ: تۆڵە

**تۆلا** (نا.)[باک] بڕ: تۆڵا

**تۆلک** (گیا.)[باک] بڕ: تۆڵکە

**تۆڵا** (نا.)[؟][باک: تۆلا ـ ناو: تۆڵا، تۆڵە] ئەندازەیەکی داگیراوی پەنیر و بە تایبەت گەزۆ دە توورەکە و مەشکاڵە دا.

**تۆڵاش** (نا.) بڕ: تەڵاش

**تۆڵاشە** (نا. ل)[تۆڵاش + ئە][ئەر] بڕ: تەڵاش

**تۆڵاگەزۆ** (نا. ل)[تۆڵا + گەزۆ] گەزۆی داگیراو، تۆڵەگەزۆ. ⁂ ئەم سەربهوردی ئەڤینە کە زۆر خۆشتر و شیرینتر لە تۆڵاگەزۆ و هەنگوینە ... (مەم و زین ل

سێ).

**تۆڵکە** (گیا.)[لۆر: تولە ـ فار: توولە. باک: تۆلک ـ ناو: تۆڵکە، تۆڵەکـە، تۆڵە، تۆڕک] ١ـ گیایەکی خۆڕسکە، گەڵاکانی پان و گرنی گرنییە، گولێکی سوور یا مۆری هەیە و نیو میترێک هەڵدەدا، جۆرێکی دیکە زۆر هەڵنادا و گوڵێکی سپی دەکا کە لە دوایی دەبێتە بەرێکی چووک و خـڕی شین و دەخورێ، Mauve ناوی عیلمی ئەم گیایەیە، نانی حاجی لەگ لەگی، نانی لەگ لەگی، نانە حاجیلە، نان چووچک، پەپکە مەلیچکانە، پەنیرە، پەنیرۆکە، توزک. ٢ـ (مـجـ.) شـتی زۆر و بێنرخ، زۆر هەرزان. ⁝⁝ ئەورۆ شووتی لە بازاڕ وەک تۆڵکەیە.

**تۆڵە** 1 (نا.)[؟][باک: تۆل ـ ناو: تۆڵە ـ هەو: تۆڵە] ١ـ ئەنجـامی قـەرەبووی کردەوە و کارێک کە هەستێکی بریندار و قـینی پێک هێناوە لە پێکهێنەری ئەم کـارە، حـەیف. ٢ـ قـەرەبوو و وڵامی چاکـەی کـەسـێک. ٣ـ وڵامی هەر کردەوەیەک. **~ بۆکردنەوە:** قەرەبووی چاکە و پیاوەتی کەسێک کردنەوە. ⁝⁝ ئەو پیاوەتییەتم لە بیر ناچێ نەمرم تۆڵەت بۆ دەکەمەوە. **~ خۆکـردنەوە:** ١ـ تۆڵە ئەستـاندنەوە لە کـەسـێک. ٢ـ وڵامی کـردەوەیەک دانەوە. **~ سـتـاندنەوە:** تۆڵە کـردنەوە، وڵامی تۆڵە دانەوە، تۆڵە ئەستاندنەوە. **~ کـردنەوە:** قەرەبووی کردەوەیەکی ناڕێک و ناڕەوا لە کەسێک کـردنەوە. **~ لێسـتـاندنەوە:** تۆڵە کـردنەوە لە کـەسـێک، تۆڵەی خـۆ کـردنەوە. **~ لێکردنەوە:** ١ـ تۆڵە کـردنەوە خـراپە لە کـەسـێک. ٢ـ وڵامی کـردەوەیەک دانەوە. ⁝⁝ لە مـاڵە مـە زۆرخـۆریی دەکـەی، منیش دێمە مـاڵتان تۆڵەت لێدەکەمەوە! **~ ئەستـاندنەوە:** بڕ: تۆڵە سـتـاندنەوە. ‖ **تۆڵە بە تۆڵە:** شێوە رستـەیەکە لە ئەنجامی تۆڵە و وڵام دانـەوەی دەکـوترێ، وەک یـەک بوون لـە تۆڵە دا. ⁝⁝ سـەرت شکاندم و منیش سەرم شکاندیەوە، تۆڵە بە تۆڵە. خوشکی منی هێنا و منیش خـوشکت دێنمـەوە، تۆڵە بە تۆڵە.

**تۆڵە** 2 (نا.) بڕ: تۆڵا

**تۆڵە** 3 (گیا.) بڕ: تۆڵکە

**تۆڵەسـتـێن** (ئان. فـا)[لە: تۆڵە سـتـاندنەوە] کـەسێک کـە بوغز و قـینی تـۆڵەی دە دەروون دایـە و لـە بـیـری ناچێتەوە و بە تەمای تۆڵە ستاندنەوەیە.

**تۆڵەکە** (گیا.) بڕ: تۆڵکە

**تۆڵەزرە** (گـیـا.)[تۆڵە3 + زڕ + ئە] گـیـایەکی خـۆڕسکە، هـەتا نیـو گـەز هـەڵدەدا، گـەڵای پانـە، گـوڵی چووک و سـپیـە و بەرێکی سـووری ورد و چووکی هێشـوویی وەک تەمـاتەی زۆر ورد دەدا. Solanum miniatum ناوی لاتینـی ئەم گـیـایـەیە، کـاڵەکـەمـارانـە، رەزەڵە، رێزەڵە.

**تۆڵەگەزۆ** (نا. ل)[تۆڵە2 + گەزۆ] بڕ: تۆڵاگـەزۆ. ‹› سـاز بە رەگـەڵم کـەوە هەڵتدەگرم و دەرۆم/ سینگت تۆڵەگەزۆیە شـەوێ لایەکی دەخـۆم (کـانی مـرادان ل ١١٣).

**تۆم** (نا.)[هـیک: تۆکـمـەن ـ ئەو: تۆم، تەئۆخـمـەن ـ هـەخ: تەئومـا ـ پاز: توخم ـ پـەه: تۆم، تۆهـم، توخـم. باک: تۆخـوم، تۆڤ، تۆخم، توخـم ـ ناو: تۆ، تۆو، توو، تۆم، توخم ـ هەو: تـۆم، تۆمـە] ١ـ دەنکی گیا کە گیایەکی دیکەی لێدەڕوێتەوە. ٢ـ دەنکی دانەوێڵـە و دەغڵ بۆ داچاندنەوە. ٣ـ دەنکی گوڵەبەرۆژە، شـووتی، کوولەکە و ... کـە بۆی دەدەن و دەیتـرووکێنن. ٤ـ ئاوی نێـرینە، تۆمـاو. ٥ـ تۆی مێـینە. ٦ـ رەگەز، رەچەڵەک.

**تۆماتیز** (گیا.) بڕ: تەماتە

**تۆمار** (نا.)[عەر: طومار] ١ـ یادداشت و نووسـینی نێـو دەفتـەر. ٢ـ کاغـەزی و نامـەی نووسـراو و لوول دراو کە لە کۆن دا باو بـوو و پتـر شـایان بۆ یەکتـریان دەنارد یا ئەمری شـا بـۆ خـەڵکی لە سـەر دەنووســـرا. ٣ـ نامـــەی نووســـراوی کۆمەڵێک کە هەموو بنیان ئیمزا کردبێ و بۆ شـوێنێک یا کەسێکی لێپرسـراوییان ناردبێ. ٥ـ زەبتی دەنگ لە سـەر شریت. ~ **کـردن:** ١ـ زەبت کـردن، تـەسـجـیل کردن. ٢ـ یادداشت کردن لە نێـو دەفتـەر دا. || **تۆماری ژین:** مـاوەی ژین، دەفتـەری ژین. * **تۆمـاری ژین پێـچـرانەوە:** (کنـ.) مــردن، دەفـتــەری ژین بەســتــران. ‹› تۆمـاری ژینـی کـورتی پێـچـراوە/ ئەو تەنیـاڕۆژە خـۆشـەی بۆ مـاوە (تاریک و روون ل ٢٠٣).

**تۆمارگە** (نا. ل)[تۆمار + گە] شوێن و دوکانی زەبت و تۆمار کردنی شریت.

**تۆمـــاو** (نا. ل)[تۆم/٤ + ئاو1/٩] ئاوی پشت، تۆوی پیاو، شاوەت.

**تۆمە** (نا.)[هەو] بڕ: تۆم

**تۆمـەز** (شـر.)[لە: تۆ مـەزانە] شـێـوە رســتـــەیەکــە کـــە دوای دەرکـــەوتنی مـەسـەلـەیەک کـە پێـشـتـر هۆیـەکـەی

نەدەزانرا دەردەبڕدرێ، تۆ مــەڵێ، تەمز. ⁚⁚ چوومـەوە مـاڵ دیتم کـەس لە مـاڵ نیـە تۆمــەز زەمــاوەندی ئامــۆزام بـوو و من لە یادم کردبوو.

**تۆن** 1 (نا.)[ئین: ton] ســـەنگێکی کـێـشـــان کــە بەرابـەرە دەگــەڵ هەزار کیلۆگرەم.

**تۆن** 2 (نا.)[فـــــەر: ton] ١ـ رادەی نزمـــیـی و بەرزیـی دەنگ دە مـــرۆڤ دا، تـۆنی دەنگ. ٢ـ دەنگێک کـــە حـــاڵەت و چۆنیـەتی هـەستێکی تایبەت بەیان دەکا. ⁚⁚ دەنگت تۆنێکی غـەمگینی تێـدایە! ‖ **تۆنی دەنگ:** نزمـــیـی و بـەرزیی دەنگ، تۆن.

**تۆن** 3 (گـــیـــانـ.)[یون: ton] جـــۆرە مـــاســـیـیـــەکی دەریـایی گـەورەیە کـە بۆ کونسێرو کەلکی لێوەردەگرن.

**تۆو** (نا.) بڕ: تۆم. **~ تکان:** (کنـ.) لە پیـاوەتی کـەوتن، نەمــانی ئـاوی پشت، تــۆو رژان. **~ رژان:** (کـنـــ.) بـڕ: تــۆو تـکان. **وەک ~ی هەرزن بـڵاو کـــــردن:** (کنـ.) پەخش و پەرێشـــان کــردن، لێک بـڵاو کـــردن، پـەرش و بڵاو کـــردن، وەک تۆوی هـەرزن لێکردن. ⁚⁚ خـــۆیان ســـاز بکەن بۆ هاوکاری من/ دوژمن بڵاو کەین وەک تـۆوی هــەرزن (هـێـــــدی ل ٣٠٣). **وەک ~ی هـەرزن لێـکردن:** (کنـ.) بڕ: وەک تۆوی هـەرزن بـڵاو کـردن. ⁚⁚ بە دوو تەقە دوژمنیان وەک تۆی هـەرزن لێکردن.

**تۆوتکاو** (ئان. مــفـ.)[لە: تۆو تکان] کـــەسـێک کـــە شـــاوەت و ئـاوی پشـــتی نەمابێ، لە پیاوەتی کەوتوو، تۆوڕژاو.

**تۆوڕژاو** (ئان. مفـ.)[لە: تۆو رژان] بڕ: تۆوتکاو.

**توو** 1 (گــیـــا.)[پـەه: تووت. لۆر: تی ـ فـار: تـوت ـ گـیل: تووت. بـاک: توو ـ ناو: تـوو ـ بـاش: تـووت ـ هـەو: تـفـی ـ زا: تـوو، تـوی، تویـە، توویـە] ١ـ دارێکی بەرز و بـە لک و پۆیە، گەڵاکانـی پان و لێوار گڕنی و زوورە و خـــۆراکی کـــرمـی ئـاوریشـــمــــە، گوڵەکانی هێشـوویەکی چووکە کـە دوایە دەبێتـە بەرەکەی، Morus alba ناوی لاتینی ئەم دارەیـە، دارەتوو. ٢ـ بەری ئەم دارە کە دوو جۆری سـوو و سپی هـەیە. ‖ **تووی رەش:** بـڕ: شـــاتـوو. **تووی ســـپی:** بەری داری توویە، رەنگی سپییە، ئاودار و شـیـــرینە، ســـەرەتای هـاوین پـێ دەگـا، لەکـوردسـتـان و بـە تایبـەت لە هـەورامـان ویشـک دەکــــــرێ و وەک بـەرهـەمـی ئـەو ناوچەیە دەفـرۆشـرێ. **تووی سوور:** بەری

دارەتوویەکـە، ڕەنگی سـووری ئامـاڵ ڕەشـە، ئاودار و شیرینە، ڕەنگ دەداتەوە و مـاوەیەک ڕەنگەکـەی لە سـەر دەست دەمێنێتەوە، بۆ خۆی دەخورێ و ئاوەکەی دەخـۆنەوە. دارەکـەی دەتوانێ هەتا دە میتر بەرز بێتەوە و گەڵاکانی گڕنی گڕنی و زوورن Morus nigra ناوی لاتینی ئەم دارەیە. **تووی فـەڕەنگی:** بڕ: تووی عەرزی. **تووی عەرزی:** میوەیەکە وەک توو بەڵام هەندێک گـەورەتر، ڕەنگی سـوورە و شکڵی قـووچە، تامی شـیرینی مـەیلەوە ترشـە، ویتـامین و کـانی زۆرە، هەروا دەخـورێ و مـرباشی لێ سـاز دەکـەن. گـیایەکـەی پنچکە و هەتا چەند سـاڵان بـەر دەدا، Fragaria ناوی لاتینی ئەم گیایەیە، تووی فەڕەنگی.

**توو**[2] (جنا.) بڕ: تۆ

**توو**[3] (نا.) بڕ: تۆم

**توو**[4] (نا.)[باک ـ زا] بڕ: تف

**تووبا** (نا.)[عەر: طوبی لە سور: تووبا (خێر، شادیی)] ١ـ بەهەشت، جەننەت. ٢ـ درەختێکە لە بەهەشت کە گۆیا لقێکی دەکەوێتە سەر هەر ماڵێک لە بەهەشت و میوەی جۆراوجۆر و خۆشبۆی هەیە. (عەر: شجرة الطوبی)

**توووت**[1] (گیا.)[باش] بڕ: توو1

**توووت**[2] (ئان.)[بڕ: تورگ][زا] منداڵ، ساوا.

**تووتاک** (گـیانـ.)[تووت (دەنگی ئەم باڵندەیە) + ئاک] بڕ: تاقتاقکەرە.

**تووتـرواسک** (گـیـانـ.)[باک: تووتـرواسک، تیـتـرواسک ـ ناو: تووترواسک، تیترواسک] باڵندەیەکەی لەش چووک و دندووک چووکە و سـەری قـەوییە. باڵەکـانی نووک تیژن. تەختی پەڕەکـانی لەشی بۆرە و لە ژێر گـەردن و لاجـانگ هـەندێک شـوێنی باڵی پەڵەی ڕەشـی تێـدایە و لە هەندێک شـوێنی دیکەی لەشی ڕەنگی سـوور و زەرد و خەنەیی دەبیندرێ، گۆشتی دەخورێ و لە دەوروبـەری ئـاو دەژی، charadrius ناوی لاتینی ئەم باڵندەیە، ڕاوڕاوییلکە، ڕەوڕەوە، تیتلەبیجاغ، تیتلەپیچاخ.

**تووتڕک** (گـیـا.)[توو + دڕک] بڕ: توودڕک

**تووتک**[1] (گیانـ.) بڕ: توتک

**تووتک**[2] (نا.)[هس: تووتەک][باک] دەنگ و هـەوایەک کـە بە دەم و لێـو دەریدێنن، فیتوو.

**توتم** (گیا.) بڕ: تەتەری

**توتن** (نا.)[تور: tütün] ١ـ گیایەکی گەڵا پان و گەورەیە، گوڵەکانی سوور یا کەسکە، ساقەتی هەتا گەزێک هەڵدەستێ، گەڵاکانی ویشک دەکردرێ و بۆ کێشان کەلکی لێ وەدەگرن، Nic-otiana tobacum ناوی لاتینی ئەم گیایە. ٢ـ ویشک کراو و ورد کراوی گەڵای ئەم گیایە.

**توتنانە** (نا. ل)[تووتن + ئانە2/٤] بەشێک لە توتن کە خاوەن مڵک یا ئاغا لە تووتنەوانی دەستێنێ.

**توتنەوان** (ئان. ل، نا. ل)[تووتن + ئە + وان] کەسێک کە تووتن دادەچێنێ.

**توتنەوانیی** (حم.)[تووتنەوان + ئیی] کار و پیشەی تووتنەوان.

**توتووم** (گیا.) بڕ: تەتەری

**تووتە 1** (نا.)[؟] ١ـ (ئا.) چووکترین قامکی دەست، پەنجەتووتە، پیت. ٢ـ گۆشتی زێدەی سەر پێڵووی چاو. ٣ـ خاڵ و نیشانی سەر لەش.

**تووتە 2** (گیان.)[بڕ: تورگ][هەو] بڕ: سەگ

**تووتەک 1** (مۆس.)[توو (دوو) + ت + ئەک] بڕ: تووزەلە

**تووتەک 2** (گیان.)[تووت (دەنگی ئەم باڵندەیە) + ئەک] بڕ: تاقتاقکەرە.

**تووتی** (گیان.)[پەش: تۆتی ـ فار: تووتی. باک: تووتی ـ ناو: تووتی ـ هەو: تووتی] ١ـ مەلێکە بە قەرا کۆتر، پەڕەکانی کەسک و سوور و زەردن، دندووکی خوار و سەری زلە، لە ناوچەکانی ئیستوایی دەژی و دەتوانێ هەندێک وشە دوو پات کاتەوە، Psil-latus ناوی لاتینی ئەم مەلەیە. ٢ـ (کنـ.) کەسێک کە قسە بەبێ تێگەیشتن لە مانا دووپات دەکاتەوە. ٣ـ [کلاسیک] شاعیر یا دڵدارێک کە قسەی خۆش و ئاشقانە دەکا. || **تووتیی کەلام:** شاعیر و دڵداری قسەخۆش. ⁞⁞ پێکەنینت جەزبی کردم بۆ سەر و زولفی سیا/ تووتیی شیرین کەلام پابەندی داوی شەککەرم (وەفایی ل ٦٠).

**تووتیا 1** (نا.)[عەر: توتیا لە ئال: tuthia] ١ـ دەرمانێکە کە لە ئۆکسیدی رووی (فافۆن) دەگرترێ و بۆ چاو ئێشە و شوشتنەوەی چاو کەلکی لێوەردەگرن. ٢ـ (مجـ.) هاڕاوی زۆر ورد. ⁞⁞ فیراقت فەرقم وە تووتیا کەرد/ جیاییت ئازام جە

هەم جیا کەرد (مەولەوی ل ١٠٨). & تۆتیا. **بوونە ~:** (کنـ.) زۆر ورد بوون. ⁂ ئاردەکە وا هاڕاوە بۆتە تووتیا. **کردنە ~:** (کنـ.) زۆر ورد کردن. ⁂ ئازای بەدەنت لە هەم جوودا کەم/ سەرتاپای تەنت بە تۆتیا کەم (بارام و گوڵندام ل ١٠٣).

**تووتیا** [2] (گیانـ.)[عەر: توتیاء] گیاندارێکی دەرياییە شێوەی ژووشک دەدا و لەشی خڕە و بە تیغ داپۆشراوە، بە بەرد و گیای بن ئاوەوە دەنووسێ و گیاخۆرە، ژووشکی دەریایی.

**تووخب** (نا.)[سۆر] بڕ: تخووب

**تووخورە** (گیانـ.)[توو1 + خور + ئە] [باک] بڕ: تووخۆرە

**تووخۆرە** (گیانـ.)[توو1 + خۆر + ئە] مەلێکە لە رەگەزی سێروو و بە قەرا سێروو، باڵ و مل و کلکی رەشە و پڕی شوێنەکانی دیکەی قاوەیی تۆخی تێکەڵ بە بۆرە، بن سینگی سووری ئاچغە و کورتە کاکۆڵێکی هەیە، لە کوردستان زۆرە و لە سەر دارەتوو دەنیشن و توو و گیانداری چووکی دیکە و بە تایبەت کوللە دەخۆن [لەو سالانەی کە کوللە زۆرن کەسێک کە دێخوونی بە حەرام نەکردبێتەوە و ئارەقی نەخواردبێتەوە لە کانیاوێک تایبەت کە خەزایی لێ زۆرە ئاو دێنێ و خەڵک لە سەر ئەم بڕوایەن کە خەزایی بە شوێن ئەم ئاوە دا دێ و کوللەی بنەبڕ دەکا (بڕ: ئاوی عەینەمەل)] Sturnus roseus ناوی لاتینی ئەم مەلەیە، کوللەخۆرە، ئاگرمەلووچ، ئاگرمەلیچ، ئایلەمەن، عەینەمەل، ئێرەمەل، تومەخۆرە، تووخورە، رەشیلەسۆر، ساربەڵەک، سێروویەڵەکە، سێرووخەزاڵە، خەزایی.

**توودڕک** (گیا.)[توو1 + دڕک] ١ـ پنچکێکی خۆڕسکە، لە جێی شێدار دەڕوێ، ساقەت و لقەکانی دڕوو و دڕکی پێوەیە، بەرەکەی دانارداناری پێوە لکاوە، لە توو چووکترە، بە کاڵی شینە لە دوایی سوور و رەش دەبێ، تامی شیرینی مەیلەو ترشە، هەروا دەخورێ و مرەباشی لێ ساز دەکەن. Rubus caesius ناوی لاتینی ئەم پنچکەیە. ٢ـ بەری ئەم پنچکە. & تووترک، دوودڕک، توورک، دڕی، تفەدڕەی.

**توور** [1] (نا.)[لۆر: تورە ـ تات: تورە ـ ماز: تورە ـ فار: تووبرە ـ گیل: تووربە. باک: توور، توورک، تۆربە ـ ناو: توور، توورەکە، توربێن ـ هەر: تۆرەکە ـ زا:

تۆربە، تووربە، تۆرڤک] ١ـ کیسەیەک کە کەرەسە یا تێشووی تێبنێن و بۆ سەفەر یا شوێنی دیکە دەگەڵ خۆیان بیبەن. ٢ـ کیسەی ئالیک و جۆی ئەسپ و ولاغ کە دە ملی دەکەن. ٣ـ بڕ: توربێن.

**توور**[2] (گیا.)[ تەب: تەرەب ـ گیل: تورب، تورف، تەرف ـ فار: تۆرب ـ کرم: تۆرپ ـ تات: تۆرپە ـ لۆر: ترپ. باک: تڤر، تەڤرک، ترپ ـ ناو: توور، ترب، ترپ ـ هەو: ترەوی] گیایەکی دەسچێنی یەکساڵەیە، گەڵای گەورەیە، گوڵەکەی سپی یا بەنەوشە، بنکێکی گەورەی خڕ یا درێژ دەکا، سپی یا رەشە، تامی توند و دەگەڵ چێشت بە رووتی دەخورێ، Raphanus ناوی لاتینی ئەم گیایەیە، تووری سپی. ‖ **تووری رەش:** جۆرێک توورە کە تۆکڵەکەی رەشە و دەرمانێکی باشە بۆ بەردی گورچیلە و ئەعساب، Raphhanus niger ناوی لاتینی ئەم توورەیە. **تووری سپی:** بڕ: توور2. **تووری سوور:** جۆرێک توورە، بەڵام بنکی زۆر چووکترە و رەنگی سوورە و بەشێکە لە سەوزی خواردن و گەڵاکەشی دەخورێ، Raphanus sativus ناوی عیلمی ئەم گیایە.

**توور**[3] (نا.)[فەر: tur] گەڕان و گەشت لە وڵاتی دیکە و هەندەران دەگەڵ تاقمێکی دیکە کە شەریکە یا کەسێک پێکی هێنابێ.

**تووراق** (نا.)[زا] بڕ: تۆراغ

**تووربە** (نا.)[زا] بڕ: توور1

**تووربین** (نا.)[فەر: turbine لە لات: turbo] جۆرێک مەکینەی پەڕەدار وەک تۆپی ئاشی ئاوێ کە بە هێزی ئاو یا هەڵم دەگەڕێ و بۆ وەڕێ خستنی دەزگای پێک هێنەری بەرق کەڵکی لێوەردەگرن.

**توورزی** (نا. ل)[توور (تەور) + زی (زین)][زا] بڕ: تەورزین

**توورسەلە** (نا.)[زا] بڕ: تەرزە

**توورک** (نا. ل)[توور1 + ک][باک] توورەکەی چووک

**توورگ** (گیانـ.)[باک] بڕ: تورگ

**توورەکانە** (نا. ل)[توورەکە + ئانە2/٤] باجێک کە گزیر لە سەر خەرمان لە جووتیاری دەستێنێ.

**توورەکە** (نا. ل)[توور1 + ئەکە]١ـ کیسەیەک کە کەرەسە یا تێشووی تێبنێن و بۆ سەفەر یا شوێنی دیکە دەگەڵ خۆیان بیبەن. ٢ـ کیسەی ئالیک و

جۆی ئەسپ و وڵاغ کە دە ملیان دەکەن. ٣ـ کیسەیەک کە جووتێر تۆوی تێدەکا، لە لاتەنیشتی دەکا و تۆوی لێدەردێنێ و دەیپــــڕژێنێ، توربێن. **خــــاک بە ~ کــێشــانن:** (کنـ.) وێران کـردن و تالان کردن. || **توورەکەی سواڵ:** توورەکەیەک کە ســــواڵکەر بە خـــۆیەوە هەڵداوەسێ و هەرچی کە سواڵی دەکا تێیداوێ.

**توورەکــەرێژ** (نا. ل)[توورەکـە + رێژ] تەپۆڵکەیەکی دەسکرد کـە بە بێگاری یا بە زۆر خـــەڵک بە توورەکـــە خـــۆڵی بۆ هێنابێ.

**تـووریـسـت** (نـا.)[فـــــەر: turiste] کـەسـێک کـە بۆ گـەڕان دەچێتـە وڵاتی دیکە، گەڕیدە.

**توور** (نا.)[؟] فڕێ. **~ دان:** ١ـ فڕێ دان. ٢ـ هـاویـشـتن. & تـوور هــەڵـدان. **~ هەڵدان:** بڕ: توور دان.

**تـووڕانـدن** (چا. م)[لـە: توورە2] بـڕ: تێتـووڕاندن. ؛؛ نە بلوێرژەن دەتووڕێنی لە بلوێر/ نە شۆڕەژن ورینگەی دێ لەبەر بێر (تاریک و روون ل ٢١١).

**توورک** (گـــیـــا.)[تـوو + ڕک (دڕک)] [ئەر] بڕ: توودڕک

**توورە**[1] (ئان.) رق هەسـتـاو، قـەڵس، ترۆ. **~ بوون:** رق هەسـتـان و قـەڵس بوون. **~ کردن:** قەڵس کردن.

**تێبینی:** توورە لە وشەی توورە tūra کـە ناوی هۆزێکە (ئیـمـرۆکـە تووران ـ ی پێـدەڵێن) و لە تـووئیـریە tūirya یانی توورانیی کەوتوە. توورانییەکان هۆزێکی کۆچەری ئێرانیی بوون و هەمیشە دە نێو ئەوان و هۆزەکانی دیکە دا کێشە بوە و هەر لەبەر ئەوەش ناوی ئەم هۆزە مـانای مـــەنفی بە خـــۆوە گــرتوە و لـە هەنـدێک وشــــەی دیکەش دا وەک تۆر و تۆران دا خۆ نیشان دەدا. بە گشتی توور بە دلێر و بەهـێز و قـارەمـان مـانا دەکـەنەوە و لەبەر دوژمنایەتی مانای مەنفی بەخۆوە گـرتوە، لە زمـانی سـانسکریت دا تورە tura بە مانای هێز و پتەوی هاتوە و لە زاراوەی زازایی دا تۆرن بە مانای بەهێز و دلێر ئەم مانایەی هێشتا پاراستوە.

هەروەتر لە زمـانی تاتی دا تور tur بە مــــانای شـــێت و لـە زمـــانەکـــانی ئـەورووپـایـیـش دا [ئـاڵ: Tor، روس: dûr-noy ـ بولغــــاریی: dûr] دا بە مـــانای پیـــاوی شـــێت و دین و گـــەوج هاتوون.

**توورە**[2] (وشـد.) دەنگی شـمـشـاڵ و

بلوێر. ∷ جــــۆبار دەبزوێ، خــــوڕەی ئاوهەڵدێر/ لە شاخان تووڕەی شمشاڵ و بلوێر (لالە بە دەستان ل ٢٠٤).

**تـووڕەیـی** (حـم.)[تـووڕە1 + ئـیـی] ئاكامی تووڕە بوون، رق، رک، قەڵسیی.

**تووز**[1] (ئان.)[؟] ١ـ بیـچم، قـەڵافـەت، تەور و تووز. ٢ـ خدە، ئاكار، رەوشت. ∷ دەیگوت: حـەوت رۆژان لە مـوسـڵێ بوو، وەڵڵاهـی زۆر پیـاوێكی مـەرد و رەشیـد و تووزپیـاوە (سـەعـیـد و میـرسـێـوەدین ل ٢٤٠).

**تووز**[2] (ئان.)[زا] بڕ: تیژ

**تووز**[3] (نا.)[؟] ١ـ لكـی تـازەی دار و گـیـا، چووزە. ٢ـ كـاری پێـوەلكانی پەلی درەخــتــێک لە درەخــتــێكی دیكە بـۆ ئیــســلاح كـردنی رەگـەز و بـەر هێنـانی باشـتـر، پەیوەند، موتربە. & چووز. ∼ **كردن:** پێوەلكانی لكی دار لە درەختێكی دیكە، مــوتربە كــردن، چووز كــردن، پەیوەند كردن.

**تووز**[4] (گیا.)[؟] درەختێكی گەورەیە، گــەڵاكــانـی درێژ و نـوک تیــژ و گــڕنی گڕنییـە، توێكڵی ساقـەتی رەنگ زێوینە و ماددەیەكی بە ناوی بێتولین هـەیە كە بۆ داو و دەرمــان كــەلكی لێــوەردەگــرن، هـەروەتر بە قــەڵەشــینی توێكڵــەكــەی شیـرەیەكی شیـرینی لێدەتكێ كە جۆرێک خـواردنەوەی ئەلكۆلی لێ ســاز دەكــەن، Betula alba نــاوی لاتــیــنــی ئــەم درەختەیە (فار: توس، غـان ـ عەر: شجرة البتولا)

**تـووزانــن** (چـا. م)[ئـەر] تـەزانـدن، كزاندنەوە، چووزاندنەوە.

**تووزک** (گیـا.)[تووز2 + ک][باک] ١ـ بڕ: تەڕەتیزە. ٢ـ بڕ: تۆڵكە

**تووزەلە** (مۆس)[توو (دوو1) + زەل/١ + ئە] ئامرازێكی مۆسیقـای كوردییە كە لە جـووتێک ئێسكی باڵی داڵ و هـەندێک مـەلی دیكە ســازی دەكـەن، سـەرەكـەی پیكی وێدەخـەن و فـووی تێدەكەن، دوزل، تووتەک، جووزەلە، دووزەلە.

**تـووزیــان** (چـا. ل)[ئـەر] تــەزیــن، كزانەوە، چووزانەوە.

**تووژ**[1] (نا.)[ئەر] بڕ: توێ

**تووژ**[2] (ئان.)[باک] بڕ: تیژ

**تووژاڵ** (نا. ل)[تووژ1 + ئاڵ4][ئەر] بڕ: توێ

**تووژک** (نا. ل)[تووژ1 + ک][ئەر] بڕ: توێ

**تووش** 1 (ئان.)[؟][باک: تووش ـ ناو: تووش] ١ـ هەوای سارد و ناخۆش. ٢ـ دژوار، سەخت، پڕ مەترسی. ٣ـ چوارویی بەدفەڕ و لەقەهاوێژ و گازگر. ٤ـ مرۆڤی بەدفەڕ و بێ ئاکار.

**تووش** 2 (نا.)[ناو: تووش، تووشیار، دوچار] ١ـ گرفتار، دوچار. ٢ـ ئالوودە، فێر. ٣ـ رووبەڕوو، بەرەوڕوو. & دوچار، تووشیار. **~ بوون:** ١ـ تووش هاتن، رووبەڕوو بوون دەگەڵ کەسێک. ⁘ هەروا کە دەڕۆیشتم تووشی مامم بووم. ٢ـ گرفتار بوون، پێوە بوون. ⁘ تووشی کارێکی ناخۆش بووم. & تووشیار بوون، دوچار بوون. **~ کردن:** ١ـ پێوە کردن، گرفتار کردن، دوچار کردن. ٢ـ بەرەوڕوو کردن، رووبەڕوو کردن. ⁘ تووشت بە تووشی ئەو کابرایە کردم. **~ هاتن:** بڕ: تووش بوون.

**تووشقە** (نا.)[؟][هەو] بڕ: تەقەفیرە

**تووشە** (نا.)[هەو] بڕ: تێشوو

**تووشیار** (نا. ل)[تووش + ی + ئار4 [ئەر] بڕ: تووش2

**تووڤ** (نا.)[باک] بڕ: تف

**تووڤل** (نا. ل)[باک] بڕ: توێکڵ

**تووک** 1 (نا.)[تور: tüy] ١ـ پەڕی سەر لەشی مەل و باڵندە. ٢ـ مووی لەشی مرۆڤ و گیاندار. || **تووکی بەر:** بەر، بەرگەدە، تووکەبەر. **تووکی سەر:** مووی سەری مرۆڤ، تووکە سەر.

**تووک** 2 (نا.) دوعا و نزای خراپ. **~ کردن:** دوعای خراپ کردن. **~ لێکردن:** دوعا و نزای خراپ لە کەسێک کردن.

**تێبینی:** تووک لە ریشەی یاتو ـ ی ئەوێستایی و یاتووک ـ ی پەهلەویی و جادوو ـ ی کوردیی کەوتوە. ماناکەشی دیارە جادوو لە کەسێک کردن بوە و لە دوایی بۆتە حاڵەتی دوعا کردن. (بڕ: جادوو)

**تووک** 3 (نا.)[باک] بڕ: توێ

**تووک** 4 (گیان.)[؟] مەلێکی چووکە، دوازدەونیو سانت دەبێ. سەر پشتی قاوەیی و خەتی سپی زەردی تێدایە. دندووکی درێژ و قایمە، لە لێرەوار و دارستان دەژی و بە دار و درەخت هەڵدەچێ، certhia familiaris ناوی لاتینی ئەم مەلەیە، دارەوان.

**تووک** 5 (نا.) تاک، تەنیا، کەم. ـ دەگەڵ وشەی تاک دێ و سەربەخۆ نیە.

:: تاک و تووک، تەک و تووک.

**تووکانن** (چا. م)[ئەر] بڕ: ترووکاندن

**تووکاویی** (ئان. مف.)[تووک1 + ئاویی2] حاڵی هەرشتێکی تووکی پێوەنووسابێ.

**تووکل** (نا. ل)[باک] بڕ: توێکڵ

**تووکن** (ئان. ل)[تووک1 + ن] حاڵی مرۆڤ و گیاندارێک کە مووی زۆر لە لەش روابێ، تووکنە، پڕموو. ~ **بوون:** پڕموو بوون، موو زۆر هەبوون.

**تووکنە** (ئان. ل)[تووکن + ئە] ١ـ بڕ: تووکن. ٢ـ بێچوو مەلێک کە تازە پەڕی دەرکردبێ، زەرنەقووتە. ~ **بوون:** ١ـ تووکن بوون. ٢ـ تووک و پەڕ دەر کردنی بێچوو مەل، گەیشتنە تەمەنی زەرنەقووتەیی.

**تووکە** (نا. ل)[تووک1 + ئە] پرووشە، بەفری کەم و ورد. ~ **کردن:** بارینی پرووشە، پرووشە کردن. || **تووکەی سمێڵ:** دڵخۆشیی و کەیفخۆشیی وەها کە سمێڵەکان جووڵەیەکی کەمیان بێ، بسکەی سمێڵ ***تووکەی سمێڵ هاتن:** دڵخۆش بوون و کەیف ساز بوون لە بەر هەر هۆیەک، بسکەی سمێڵ هاتن.

**تووکەبەر** (نا. ل)[تووک1 + ئە + بەر5] تووکی بەر، بەرگەدە، بەر.

**تووکەتووک** (نا. ل)[تووکە + تووک] وردورد هاتنە خواری بەفر لە ئاسمانەوە، پرووشە، پرووکەپرووک. ~ **کردن:** بارینی پرووشە، داکردنی پرووشە، پرووکەپرووک کردن.

**تووکەسەر** (نا. ل)[تووک1 + ئە + سەر] مووی سەری مرۆڤ. ~ **با بردن:** (کنـ.) تێداچوون و فەوتانی مادی و مەعنەوی بە تەواوی.

**توول 1** (نا.)[بڕ: تورگ] ١ـ (گیا.) لقی ناسک و باریکی دار و گیا، شووڵ، تووڵ، تووله. :: توول بە تەڕیی نەچەمێتەوە، ناچەمێتەوە (پەند) ٢ـ (ئان.) باریک و درێژ. ٣ـ (ئان.) باریک و شلک.

**توول 2** (نا. چا)[عەر: طول] ١ـ درێژایی. ٢ـ ماوە، مەودا.

**توولک** (ئان.)[باک][بڕ: تورگ] شووش، باریک.

**توولە** (نا.)[بڕ: تورگ] ١ـ بێچووی مار. :: توولەمار، توولەی رەشمار. ٣ـ بێچووی سەگ، توتک، توڵە. ٣ـ جۆرە سەگێکی چووکی راو، تووڵە، قەندی. ٤ـ

لکی ناسکی دار، تووڵ.

**توولەڕێ** (نا. ل)[تووڵ1 + ئە + ڕێ] ڕێگای باریک و درێژی چۆلایی، ڕێچکە.

**توولەڕێواس** (گیا.)[تووڵ1 + ئە + ڕێواس] ڕێواس شلک و ناسک کە تازە سەری دەرهێنابێ. ⁂ توولە ڕێواسی سەری هەڵدا درِی پەردەی حەیا/ ناسک و تورت و سپی وەک قۆڵی یاری نازەنین (هێدی ل ١٧٥).

**توولەزەر** (گیا.)[تووڵ1 + ئە + زەر][باک] بڕ: توولەزەڕە

**توولەزەڕە** (گیا.)[تووڵ1 + ئە + زەڕ + ئە] ١ـ گیایەکی خۆڕسکی دوو یا سێ ساڵەیە، بە کورک داپۆشراوە و نیو هەتا گەز و نیوێک هەڵدەدا، گوڵەکانی هێشوویی سپی و سوور و ئەرخەوانیی و پەڵەی قاوەیی لە سەرە، بەرەکەی گرمۆڵەیە و دەنکی چووکی وردی زۆری تێدایە. لە گەلاکەی بۆ دەرمان کەلک وەردەگرن، Digitalts purpurea ناوی لاتینی ئەم گیایەیە، مریسۆک، مژمژۆک (عەر: زهرة الکشتبان ـ فار: انگشتانە ـ ئین: Digitalis). ٢ـ گیایەکی خۆڕسکە، گەز هەتا گەز و نیوێک هەڵدەدا، ریشەکەی ئەستوور و گۆشتنە و وەک ریشەی گیائادەمە دەچێ، گوڵەکانی قاوەیی ئاماڵ مۆرن، بەرەکەی گەورەیە و بە قەرا گێلاسێک دەبێ کە ڕەنگی سوور یا ڕەش هەڵدەگەڕێ، لە گەلا و بەر و ریشەکەی بۆ دەرمان کەلکی لێوەردەگرن، Atro-pa belladona ناوی لاتینی ئەم گیایەیە، توولەزەر. (عەر: ست الحسن ـ فار: مهرگیاه). ٣ـ بڕ: تۆڵەزڕە

**توولەک** (نا.)[لۆڕ: تیلەک. فار: توولەک ـ پەش: توولەک. ناو: توولەک، تولَەک] ١ـ سەردەمی جووت بوون و هەڵوەرینی پەڕ و پۆی باڵندە. ٢ـ وەرینی مووی لەش. ٣ـ (مجـ.) مەیل و هەوەسی زۆر. ٤ـ (مجـ.) لاو و گەنجێک کە هێشتا تووکی نەهاتوە. **~ بوون:** ١ـ پەڕ و پۆ هەڵوەرینی باڵندە لە سەردەمی جووت بوون دا. ٢ـ موو هەڵوەرین. ٣ـ مەیل و هەوەسی زۆر بۆ جووت بوون دەگەڵ ژن. (هس: تیلاک)

**توولەمار** (گیان.)[توولە + مار] ١ـ بێچوومار. ٢ـ ماری باریک و درێژ.

**توولەنەمام** (نا. ل)[تووڵ1 + ئە + نەمام] ١ـ ریشەداری باریک و شلک و ناسک. ٢ـ (مجـ.) کچی شووش و

باریک، بەژن و باڵا شووش.

**تووڵ** (گـــیــــا.)[بڕ: تـوول1] ١ـ لکی ناسکی درەخت و گیا. ٢ـ نەمام.

**تووڵکێش** (نا. فــا)[تـووڵ + کـێش] کـاری راکـێشـانی تـووڵی مـێـو بۆ زیاد کــردن و ریشـــەی نوێ داکــوتان. **~ کردن**: راکـێشـانی تووڵی مێـو بە سـەر زەوی دا. (تووڵی مـێـو خـاکی بـە سـەر دادەکەن هەتا ریشەی دابکوتێ. لە دوایی بەینەکـەی دەبڕن و دەبێـتـە مـێـوێکی سەربەخۆ.)

**تووڵە** (گـیـانـ.)[بڕ: تورک] جـۆرێک سەگی چووکی راو، تووله، قەندیی.

**تــووڵــیــنــە** (نـا. ل)[تـووڵ + ئـیـنـە] قــەرتاڵەیەکی زۆر چووک کـە لـە تووڵ و شووڵی ناسک سازی دەکەن.

**توومان**[1] (نا.) بڕ: دوومان

**توومـان**[2] (نا.)[گـیل: تومـبـان ـ فـار: تنبـان. باک: توومان ـ زا: تمان، توومان] دەرپێ

**توومــان**[3] (نا.)[مــەغ: توومـــان (دە هەزار)]١ـ (ژ.) دەهەزار. ٢ـ پارەی ئێران کـە بـەرابەرە دەگـەڵ دە ریاڵ یا قــڕان، تمەن.

**توون** (نا.)[پەه: توون. فار: تون ـ لۆڕ: تین ـ کـرم: تون. ناو: تـوون ـ هەو: توون] ١ـ ژێرزەمین و شــوێنێک لە حـەمــام کـە کوورەکـەی لێهـەڵکەتبـوو بۆ گـەرم کردنی ئاوی حــەمـــام و گــەرمـــاو، توونخـــانە، دۆزەخە. ٢ـ (کنـ.) جەهەننەم.

**توونا** (نا.)[؟] فەوتاو، نەماو

**توونـاوتوون** (نـا. ل)[تـوون + ئـاو2 + توون] ١ـ بە یـەکجـاریـی فـەوتـاو، نابوود، توونای توون. ٢ـ بڕ: توون بە توون. **~ بوون:** فــەوتان، توونـاوتوون چـوون، توون بـە توون بـوون. **~ چوون:** تـوونا بـوون، تەفــرووتوونـا بوون. **~ کــردن:** نابوود کردن، فەوتاندن بە یەکجاریی.

**توونای توون** (نـا. ل)[توون + ئـای + توون][هەو] بڕ: تووناوتوون

**توون بـە توون** (نـا. ل)[تـوون + بـە + توون] ١ـ فـەوتـاو، نـابوود، تووناوتوون. ٢ـ جنێـــوێکە بۆ مــــردوو یـا کــەســـێکی ناخـۆشـەویست، مـردوویەک کـە بچـێـتـە جـــــەهـەنـنـەم. ؛؛ ئـەو تـوون بـە توونـە دەیـەویـست کـــڵاوم دە ســـەر نـێ. **~ بــوون:** تــوونــاتــوون بــوون، چـــوونــە جـەهـەننەم. ؛؛ شـوکر تون بە توون بوو و لە دەستی خلاسیمان هات.

**توونـچی** (ئان. فـــا)[توون + چی] کـەسـێک کە لـە توونخـانە ئەرکی خـۆش کــردنی ئاگــر و گــەرم داهێنانــی ئاوی گەرماوی بە ئەستۆوەیە، پەینچی.

**توونخـانە** (نا. ل)[توون + خـانە] ئەو شـوێنەی حەمـام کە ئاگری لێدەکەنەوە و ئاوی پێ گەرم دادێنن، دۆزەخ، توون.

**توونی** (ئان.) بڕ: تینوو

**توویە** (نا.)[زا] بڕ: توو1

**تە** (جنا.)[باک] بڕ: تۆ

**تەب** (نا.)[فـار: تب][کـلاسـیـک] بڕ: تا1

**تەبا** (ئان.)[؟] دوو یا چەند کـەس کـە پـەیوەنـدییـــان دەگـــەڵ یەک خـــۆشــــە، نێـوانخـۆش. **~ بوون:** نێـوان خـۆش بـوون و پێکەوە ســــازانـی دوو یا چـەند کەس دەگەڵ یەکتر.

**تەبابەت** (نا. چا)[عەر: طبابة] کار و پیشەی تەبیب، پزشکی.

**تەباخ** (نا.)[سور: تباخ] بڕ: ئاب2

**تەباخـچـە** (نا. ل)[تەباخ (تەبەق1) + چە][باک] کەشەفی چووکە، قاوەسینی.

**تەبارە** (نا.)[؟] ١ـ تەلان، زەوییـەکە لە شـاخ و کـەژ دا بە وێنەی پلەکـانە خـان خان دروست کرابێ، بۆ ئەوەی زەوییەکە راست بکرێتەوە تا بۆ ناشتنی درەخت و کـشـتـوکاڵ بـە کار بـێ و لێـژی نەمـێنێ (کشت و کاڵ ب ١ ل ٨٦) قطاع الحصاد (القـامـوس ل ٥٧٣). ٢ـ گـیشـە، گەلاوێژ، گەنم و جۆی دوراوە (کشت و کاڵ ب ١ ل ٨٦). ٣ـ دەغـڵـی گـەیشـتــووی نەدوراو (هـەنبـــــانە ب ١ ل ١٥٧). ٤ـ هـەرزاڵ، پێـــــرک (هەنبـــــانە ب ١ ل ١٥٧). ٥ـ کەڵەکێک یا نیشانەیە کە لە ناوەندی دوو شـــوێنا بکرێ بۆ جـــیـــا کـــرنەوەیان لە یەکتریی (خاڵ ب ١ ل ٣٠٠).

**تێـبـینی:** من خـۆم ئەو وشـــەیـەم نە بیـسـتـوە و نە لە شـوێنێک تـووشی بووم ئەوەی کە نووسراوە لەو فەرهـەنگانەی کە لـە بەردەســـتـم بوون دەرمکێـــشـــاون و نووسیومنەتەوە.

**تەبارەکەڵڵا** (شـر.)[عەر: تبارک الله] ١ـ پـاک و بێگەردە خـــودا! ٢ـ لە کـــاتـی ســـەرســـوڕمـــان و ئـەقڵ پـێ نەشـکان دا دەدەبڕدرێ. ☼ تەبارەکەڵڵا جەی شـۆڵەی شەمە/ جەی بەدر مـونیر چەرخ چوارەمە (وەلی دێوانە ل ٣٣).

**تەباشر** (نا.)[زا] بڕ: تەباشیر

**تەباشیر** (نا.)[لۆر: تەواشیر ـ فار: تباشیر ـ پەش: تەباشیر. باک: تەبەشیر، تەباشیر ـ ناو: تەباشیر، تەواشیر ـ زا: تەباشر] ١ـ مادەیەکی سپی کە لە نێوی حەیزەران دەیانگرت و بۆ دەرمان کەلکیان لێوەردەگرت. ٢ـ گێچێک کە لە فێرگەکان و شوێنی دیکە بۆ نووسین لە سەر تەختە کەلکی لێوەردەگرن، گێچی نووسین.

**تەباق** (نا.)[باک] بڕ: تەبەق2

**تەبانە** (نا.)[؟][باک] بڕ: باگردان

**تەبا و رەبا** (نا. ل)[تەبا + و + رەبا] نێوانخۆش، بێ کێشە و هەرا. **~ بوون:** نێوانخۆش بوون، جووت بوون و بێ کێشە و هەرا پێکەوە ژیان و کار کردن. ⁂ ئەوماڵەی دراوسێمان بنەماڵەیەکی زۆر تەبا و رەبان، کەس شەڕ و کێشەی پێوە نەدیون.

**تەبایی** (حم.)[تەبا + ئیی] ئاشتیی، نێوانخۆشیی.

**تەبخاڵ** (نا. ل)[فار: تبخال (تەب + خاڵ)][کلاسیک] تامیسک، تێمیسک. ⁂ دڵە، تەبخاڵەت وە لێو مەوینوون/ حاڵاتت یەکجار پەشێو مەوینوون (مەولەوی ل ٢٢٨).

**تەبع** (نا.)[عەر: طبع] ١ـ زات، تەبیعەتی دەروون. ٢ـ تەبیعەت، سروشت. ٣ـ مەزاج. ٤ـ مەیل، ئیشتیا، ئارەزوو، تەبیات. ٥ـ توانایی و ئیستعدادی شێعر و شاعیریی، تەبعی شێعر. ⁂ ئیستیتاعە و قووەتی تەبعم بە کوردیی و فارسی/ عارەبی، ئیزهاری چالاکی و چەسپانی دەکا (نالی ل ١٠٤). **~ بوون:** تێکچوونی باری دەروونی مرۆڤ لە بەر خواردنی چەور و چەوریی. **~ تێکچوون:** تێکچوونی مەزاج. **~ نەبردن:** ئیشتیا لێنەبوون، مەیل نەبردن، تەبیات نەبردن. ‖ **تەبعی شێعر:** ئیستعدادی شێعر و شاعیریی.

**تەبق** (نا.)[زا] بڕ: تەبەق2

**تەبلیغ** (نا. چا)[عەر: تبلیغ] راگەیاندە، بڵاوکراوە، پەیام، هەواڵ یا مەسەلەیەک بە خەڵک بۆ پەیدا کردنی لایەن و لایەنگر، پرۆپاگەندە. **~ کردن:** جاڕ دانی مەسەلە و بیر و باوەڕێک دە نێو خەڵک دا بۆ پەیدا کردنی پشتیوان و لایەنگر.

**تەبلیغات** (نا.)[کۆی: تەبلیغ] راگەیاندە و پرۆپاگەندە بۆ لایەنگری لە کەس و مەسەلەیەک. ⁂ رۆژنامەکانیش

تەبلیغاتیان بۆ ئاڵمان دەکرد و بە بەژن و باڵای پەهلەویان هەڵدەکوت (تاریک و روون ل ١٤).

**تەبوور** (نا.)[؟][باک] ئامرازێکە لە دار یا چێو کە سێ یا چوار چنگی هەیە و خۆیانی پێ بە با دەکەن یا باقەی گیای پێهەڵدەگرن، کادر، مەلێڤ، مەلهێب، مەلهەب، کارێج، شەن، شەنە.

**تەبوولە** (نا.)[عەر: تبولة] سالاد و مەزە و خواردنێکی سووکە کە لێکدراوێکە لە: وردە ساوار و پیواز و جەعفەریی و تەماتە. ئاوی لیمۆ و رۆن زەیتوون و هەندێک بەهارات و خوێ.

**تەبەتە** (نا.) بڕ: تەبەنە

**تەبەر** (ئاک.)[بڕ: دەر2][زا] دەر، دەرەوە، دەرێ، تەڤەر.

**تەبەرزە** (نا.)[پەه: تەپەرزەت] ١ـ نەبات، تەوەرزە، بلووری قەند. ٢ـ بلووری خوێ، تەوەرزە. ٢ـ جۆرێک ترێی دەنک تورت. ٣ـ جۆرێک خورما.

**تەبەسسوم** (نا.)[عەر: تبسم] [کلاسیک] بزە، زەردەخەنە. ؛؛ تا خەندەیی گوڵ کاشفی ئەسراری نیهانە/ زارت لە تەبەسسوم نەکەوێ قەت لە زەمانە (وەفایی ل ١٤٠).

**تەبەشیر** (نا.)[باک] بڕ: تەباشیر

**تەبەق**[1] (نا.)[بڕ: تەبەک] ١ـ مەجۆعمە، لەنگەریی. ٢ـ [باک] دەوریی.

**تەبەق**[2] (نا.)[عەر: طبقة] ١ـ تەبەقە. ٢ـ [پەش: تەبەق، تەبەک (نەخۆشیی). باک: تەباق، تەوەگ، تەبەک ـ ناو: تەبەق، تەبەقە، تەوەق، تەوەقە، تەبەک ـ زا: تەبەق، تەبق] نەخۆشییەکە وەکوو شەلکە ئەدات لە رەشە ئولاغ، ژێر سمی بریندار ئەکات ناتوانی بجوولێت، (کشت و کاڵ ب ١ ل ٨٦). (عەر: تعفن الظلف)

**تەبەق تەبەق** (نا. ل)[تەبەق2/١ + تەبەق2/١] کۆگای لە سەر یەک، چین چین.

**تەبەقە** (نا.)[عەر: طبقة] ١ـ نهۆم، قات لە خانووبەرە دا. ٢ـ کۆمەڵی جیاجیای خەڵک لە باری سامان و کار و شتی لەم بابەتە، چین. ٣ـ توێژ و چینی زەوی. ٤ـ نەخۆشی شەلیی رەشەولاغ، تەبەق.

**تەبەقەترانە** (نا. ل)[تەبەق1 + تر + ئانە] جەریمەیەک کە لە کەسی ترکەنی دەستێنن، تەشبی، تەشبی ترانە، تەشپی ترانە. (پێشتر ئەگەر کەسێک منداڵەکەی لە کۆڕ و مەجلسێک تریبا خەڵک بۆ

گاڵته و جهفهنگ باوکی منداڵهیان جریمه دهکرد و دهبا تهبهقێک چای بۆ ههموویان هێنابا و پێکهوه خـواردبایانهوه). ~ لێ (هه) ستاندن: جهریمهی تر وهرگرتن.

**تهبهک**[1] (نا.)[پهه: تهپهنگۆک (دهفر، سندوق). باک: تهبهق، تهیفک ـ ناو: تهبهق، تهبهک، تهوهق] ١ـ مهجۆعـمهی دارین بۆ دانهوێڵه ههڵتهکاندن، لهنگهری، یاڵتهبهق. ٢ـ مهجۆعمه، کهشـهفی گهوره. ٣ـ تهشتی دارین بۆ نان تێنان، ناندێنی دارین، تهسه. ⁂ تهبهکی پڕ هێمنایهتی ماڵێیه (امثال و حکم ل ٩٩).

**تهبهک**[2] (نا.) بڕ: تهبهق2

**تهبهنه** (نا.)[؟][ناو: تهبهنه، تهبهته] دهرزی درووماني دریشت بۆ لێفه دروون و کلاش چنین و ئیشی دیکه.

**تهبیات** (نا.)[عهر: طبیعت] ١ـ بڕ: تهبیعهت. ٢ـ مهیلی خواردن، تهبع. ~ **نهبردن:** بڕ: تهبع نهبردن.

**تهبیب** (نا.)[عهر: طبیب] کهسێک که چارهزی نهخۆشی دهکا، دوکتوور، پزیشک.

**تهبیعهت** (نا.)[عهر: طبیعت] ١ـ خوو و خدهی کهسێک، ئهخلاق. ٢ـ بڕ: سروشت. & تهبیات

**تهبیعهت سارد** (ئان. ل)[تهبیعهت/١ + سارد] پیاوێکی مهیلی جنسی دهگهڵ ژن کهمه و پتر له پشتهوه را گان دهکا، بهچهباز، نێرباز.

**تهبیعی** (ئان. ل)[عهر: طبیعی] ١ـ ههر شت و کار و کردهوهیهک که له بهر چاو سهیر نهبێ، ئاسایی، سروشتی. ٢ـ ههرچێک پهیوهندی به سروشت و تهبیعهتهوه ههبێ.

**تهپ**[1] (نا.)[باک: تهپ ـ ناو: تهپ] ١ـ گۆگای چووکی له سهر یهک. ٢ـ تۆپهڵهیهک گووی زۆری له سهر یهک کراو، تهپک. ⁂ تهپێک گوو. ٣ـ تۆز و خۆڵی زۆر، تهپ و تۆز. ٤ـ مژ، تهپ و مژ، تهم و مژ. ٥ـ گرد، تهپۆڵکه، تهپک. ٦ـ پێخوێ، پاخوا. ٧ـ تهپاڵه. ~ **دان:** ١ـ له سهر یهک کۆ کردنهوه. ٢ـ پهلامار دان، تهپ دانه سهر. ~ **دانه سهر:** ١ـ شالاو بردن، ههڵمهت بردنه سهر شتێک و داگیر کردن. ٢ـ [ئهر] گهیشتنهوه سهر. ~ **دانه سهر یهک:** لێک کۆ بوونهوه، کۆ بوونهوهی به تێگڕایی.

**تهپ**[2] (ئان.)[؟] تهوهزهل، لهشگران، تهنبهڵ و کهم جووڵه له کار و ڕۆیشتن دا. ~ **بوون:** بێحهوسهله و تهوهزهل

بوون، تاقەتی کار و جووڵە نەبوون.

**تەپ**3 (ئان.)[؟][باک] فێل، کەڵەک، گزیی.

**تەپ**4 (نا.)[؟][باک] فێ، نەخۆشیی فێداریی.

**تەپ**5 (وشد.) دەنگی تەپە

**تەپاڵدان** (نا. ل)[تەپاڵە + دان] شوێن و عەنباری تەپاڵە لێدانان.

**تەپاڵە** (نا. ل)[تەپ1 + ئاڵ + ئە][فار: تاپال، تپالە ـ کرم: تەپپالە ـ لۆر: تپالا ـ بیر: تەپپال. ناو: تەپاڵە ـ هەو: تەپاڵە] ریخ و شیاکەی وشکەوە بوو کە بۆ ئاوردوو و سووتاندن کەلکی لێوەردەگرن، تەپ، تەپکە، کەشکوور.

**تەپاڵەپێژ** (نا. فا)[تەپاڵە + پێژ] کەسێک کە بە ریخ و شیاکە تەپاڵەی ساز دەکا.

**تەپان** (نا. ل)[تەپ1 + ئان] ١ـ گرێژنەی دەرگا، ژێردەرانە. ٢ـ چەپەری پشتیوانەی دەرگا. ٣ـ دارێکی ئەستوور کە مووروەسەنگی ئاشی تێدەبڕن، خوانکەی ئاش. ٤ـ [باک] کوتک

**تەپانە** (نا. ل)[تەپان + ئە] شریتی گرێدراو بە جەمسەری رایەڵەکان (لە کاروباری جۆڵایی دا) لە سەری هاتوچۆ دەکا. شیکڵ و شێوەی تەپانە گرینگ نیە بەو مەرجەی کە بسووڕێ (گۆڤاری هاوار ژمارەی هەشت ل ٣١).

**تەپاندن** (چا. م)[لە: تەپ1 ][فار: تپاندن ـ گیل: فەتەمانێن ـ ناو: تەپاندن، تەپانن] ١ـ تێنان بە قەو، بە زۆر لێبردن، تێتەپاندن. ٢ـ شێلان و کوتانی شتی بۆش بۆ قایم بوون و پتەو بوونی.

**تەپانن** (چا. م)[ئەر] بڕ: تەپاندن

**تەپپە** (وشد.) بڕ: تەپە2

**تەپخ** (نا.)[؟] رووخاو، وێران، تەخت. **~ بوون:** وێران بوون، تەخت بوون. **~ کردن:** وێران کردن، تەخت و مەکان کردن.

**تەپسی** (نا.) بڕ: تەشپی

**تەپشوو** (نا.) بڕ: تەشوێ

**تەپک** (نا. ل)[تەپ1 + ک][پەش: تپە ـ فار: تپە ـ بیر: تەپپە ـ لۆر: تەپە. باک: تەپ ـ ناو: تەپ، تەپک، تەپە ـ هەو: تەپە ـ زا: تەپە] ١ـ بەرزایی لە چیا چووکتر، تەپۆڵکە، تەپۆکە، تەپۆڵە، گرد. ٢ـ کۆگایەک گڵ. ٣ـ سلەگووی لە سەر یەک. ∴ تەپکێک گوو. ٤ـ [باک] بڕ: تەپکە

**تەپکە** (نا. ل)[تەپک + ئە] ١ـ [باک: تەپک، تاپک ـ ناو: تەپکە] داو و تەڵەیەکە کە داوەکانی لە مووی کلکی ئەسپ و بارگین ساز دەکەن و لە سەر تەختەیەکی قایم دەکەن، دانی لە سەر ڕۆ دەکەن و مەل و باڵندەی پێدەگرن، پاداو، خەپک، دافک. ٢ـ قوڵکەیەک کە بۆ ڕاوی کەروێشک سازی دەکەن، تەڵەی کەروێشک. ٣ـ چاڵێکی بچووک کە ڕاوچی تەلەبەردێکی ئەخاتە سەر، بە ئاستەم چیلکەیەک ئەداتە بەر تەلەبەردەکە. تۆزێک گەنم ئەکەنە چاڵەکە. سوێسکە ئەچنە ناوی بۆ خواردنی دانەکە، خۆی ئەدات لە چیلکەکە ئەترازێ. تەلەبەردەکە سەر چاڵەکە دائەپۆشێ. ڕاوچی کە هات بە هێواشی لە ناو چاڵە دا دەری دێنێ بە زندوویی (کشت و کاڵ ب ١ ل ٨٧). ٤ـ شیاکەی بڕاو بۆ سووتاندن، کەمرە. ٥ـ تەپاڵە

**تەپل** (نا.)[؟] شوێنی سەر پەنجە و ئەنگوست ـ کە وەک ئیمزا و پێناسەی کەسیش کەلکی لێوەردەگرن ـ.

**تەپلۆس** (ئان. ل)[تەپ2 + لۆس] تەپ، لەشگران، تەمبەڵ، تەوەزەل.

**تەپلە** (نا.)[عەر: طبلە] ١ـ کڵاوێکی ڕەقی ساز کراو لە لباد و خورییە کە لە هەورامان و لە نێو لوڕ و هەندێک شوێنی دیکە دە سەری دەنێن، لاتیە، لاتێ. ⁂ دەستەی خزمەتکار، فیشەکدان لە مل/ بە چەفتە و مشکی سەر و تەپلە زل (گۆران ل ١٣٠). تەپلەیەکی لبادی لە سەر بوو، گۆچانێکی شینەبەڕوو بە دەستەوە. (بەیتی لاس و خەزاڵ ـ سروە ژ ٨٨). ٢ـ [ئەر] جۆرێک کڵاوی ژنان، تاسکڵاو، تەپە، تەپەکڵاو.

**تەپلەقوو** (گیا.) بڕ: تەپڵەقوو

**تەپڵ** (نا.)[عەر: طبل] ١ـ (مۆس) ئامێرێکی مۆسیقایە، لە دەفرێکی نێو بۆش، کە لایەکی پێستێکی خۆشکراوی ناسکی لێدەدەن و بە دەست یا دار تەپەی لێدێ. لە کوردەواریی دا پتر بۆ داوەت دەگەڵ تووزەلە و نای کەلکی لێوەردەگرن. ٢ـ بەشێک لە کەللە کە دەکەوێتە نێوان پێشەسەر و پاشەسەر، تەپڵەسەر. ~ **خستنە ژێر عەباوە:** (کنـ.) هەوڵ دان بۆ داپۆشینی عەیب و ئابڕوو چوون بە پلە و پایە و دەسەلات. ~ **کوتان:** بڕ: تەپڵ لێدان. ~ **لێدان:** دەنگ دەهێنان بە پێی هەوای مۆسیقا لە تەپڵ، تەپڵ کوتان. || **تەپڵی باز:** ١ـ تەپڵێک کە لە

راو دا دەیکوتن هەتا مەل و باڵندە پێی هەڵفڕن و لە دوایی بازی تێبەردەن. ٢ـ تەپڵێکی چووک کە لە پێشکۆی زینی دەبەستن لە کاتی وە ڕێ کەوتنی لەشکر و قۆشەن لێدەدرێ. ***تەپڵی باز لێدان:** کوتانی تەپڵ بۆ وە ڕێ کەوتنی سپا. ⁘ سوڵتان دەکاتن نازێ/ بدەن لە تەپڵی بازێ/ هات و گەییە سیوازێ (مان ل ٢٢) بۆ نەمانی مەزالیم، سوارانی جەنگی/ تەپڵی بازیان لێدا بە شۆخ و شەنگی (بێخود ل ١٣٧). **تەپڵی بێعاریی:** بێشەرمیی و بێحەیایی ئاشکرا. *** لە تەپڵی بێعاریی کوتان (دان):** بێشەرمی کردن بە ئاشکرایی، هیچ شتێک پێ گرینگ نەبوون. **تەپڵی دڕاو:** (کنـ.) کەسی بێڕێز، بێنرخ. **تەپڵی زڕاو:** (کنـ.) کەسێک کە نەنگ و خراپەکەی ئاشکرا بووبێ و بڵاو بووبێتەوە، ئابڕوو بڕاو. **تەپڵی سەر:** بڕ: تەپڵەسەر. **تەپڵی شادمانیی:** تەپڵی سەرکەوتن لە شەڕ دا، تەپڵی شادیی، تەپڵی شایە. ***تەپڵی شادمانیی لێدان:** بەرز کردنەوەی دەنگی تەپڵ لە شەڕ دا بە بۆنەی سەرکەوتن، تەپڵی شایە لێدان. ⁘ بە قۆچ عوسمانی گوت: قوربان ئەمن دەرەقەتیان نایەم، تەپڵی شادمانی لەم لا لێدەدرێ و تەپڵی شادمانی لەو لا لێدەردێ، بەڕاستی ئەمن هەڵدێم (بەیتی سەعید و میرسێوەدین. سروە ژ ٧٥ ل٣٣). **تەپڵی شادیی:** بڕ: تەپڵی شادمانی. ⁘ خاکەلێوە بێ بە تەپڵی شادی/ بەرێکی خەندان لوتفێکی زیادی (هێدی ل ٣٠٢). **تەپڵی شایە (شایی):** بڕ: تەپڵی شادمانی. ***تەپڵی شایە لێدان:** بڕ: تەپڵی شادمانی لێدان. ⁘ لێدەن لە تەپڵی شایە/ شوکر وەبەر خولایە/ مەکوژن سەید و مەلایە/ قورعانیان دە سینگی دایە (مان ل ٢٨٥). **تەپڵی گوڵێ:** (کنـ.) زۆر شیک و رازاوە. ***خۆ لە تەپڵی گوڵێ دان:** (کنـ.) زۆر جوان خۆ رازاندنەوە، جلی جوان دەبەر کردن و خۆ شیک کردن. **تەپڵی گوێ:** بڕ: پەردەی گوێ. **تەپڵی گۆش:** بڕ: پەردەی گوێ. **تەپڵی نابوودی:** تێداچوون لە باری مادی و ئابوورییەوە، تەپڵی نەمان. ***تەپڵی نابوودی لێدان:** راگەیاندنی تێداچوون لە باری مادی و ئابووریەوە، تەپڵی نەمان لێدان. **تەپڵی نەمان:** ١ـ مەرگ، مردن. ٢ـ بڕ: تەپڵی نابوودی. ***تەپڵی نەمان لێدان:** ١ـ مردن، فەوتان. ⁘ سۆزی کە مەرگ تەپڵی نەمانی لێدا/ ئەمن و تۆ دەگەڵ بابەدەمی

هاوســـەفـــەرین (خـــەیام ل ٢٦). ٢ـ بڕ: تەپڵی نـابوودی لێـدان. **تەپڵی ئەمـان:** تەسلیم، ئەمـان. ***تەپڵی ئەمـان لێـدان:** تـەسلیم بـوون و ئـەمـــان خـــواستن، ڕاگـەیاندنی تەسلیم و ئەمـان. ⁂ لە بەر تۆ چارەنووسی شـووم و بەدفەڕ/ ئەوەی قــەت لێـینەدەم تـەپڵی ئەمـانە (تاریک و روون ل ١٥٦) دوژمـــن لـــە ژێـــر ئـــەو پەنجـانەی مـە دا/ ناچارە تەپڵی ئەمـان لێدەدا (هێدی ل ٣٠٣).

**تەپڵــچی** (ئان. ل)[تـەپڵ + چی] بڕ: تەپڵژەن

**تەپڵـــژەن** (ئان. فـــا)[تەپڵ + ژەن] کەسێک کە تەپڵ لێدەدا، تەپڵچی.

**تەپڵــۆک** (نا. ل)[تەپ1 + ۆک] بڕ: تـەپڵـــەک/١. ⁂ لـەوێ هـەڵیـــاندەداوە خـێـــوەتێکی قـــەراغ بافـتـــە/ دەورە بە زنجـیـر، سـەر تەپڵـۆکی دە بیـچکۆڵانە (گەنج ٣٠٧).

**تـەپڵـــــــە** (نا. ل)[تـەپ1 + ڵە] ١ـ دەفرێکی قـووڵ و گەورەیە وەکـوو تەشت کە لە شـیـاکە سـازی دەکەن بۆ شـیـاکە چنینەوە، کەلارە. ٢ـ تەختەدارێکی خڕ کە دەدرێتە بەر کۆڵەکە یا ئەستووندەگ و تیـرەگ، تەپڵـەک، تەپڵـۆک. ⁂ خـۆزگـەم بەوێ ڕۆژێ کا ئەگە هەڵدەدا خێوەتێکی تەپڵە بە زێڕ (گەنج ٣٢٢).

**تەپڵەسەر** (نا. ل)[تەپڵ + ئە + سەر] بەشـێک لە کـەللە کـە دەکـەوێتـە نێـوان پێـشـەسـەر و پاشـەسـەر، تەوقـەسـەر، تەوقی سەر، تەپڵ/٢.

**تەپڵەقوو** (گیا.)[؟] ١ـ دارێکی کێویی یە لـە بـەلاڵـووک ئـەچـێ (خـــــاڵ ب ١ ل ٣٠٢)، تەپڵەقوو. ٢ـ چێـوێکی سـەخت و سوور کە تیرۆکی لێ ساز دەکەن. (عەر: طبرخون)

**تەپڵـەک** (نا. ل)[تەپڵـە + ک] ١ـ دەپ و تەختـەیەکی خڕی نێو کون کە دەدرێتە ســەر کــۆڵەکــە یا و تیـــرەگ و چادر و خێوەتی بە سـەر دا دەکێشن، کۆمـاجـە، تەپـەکـلاو، تەپڵـە، تەپڵـۆک. ⁂ ئامـۆزا خۆزگەم بەوێ ڕۆژێ کا/ ئەگەر هەڵتدەدا خێوەتێکی تـەپڵەک بە زێڕ (گەنج ٣١٦). ٢ـ پارچەیـەکی خـــڕ لە نێــوەڕاســـتی ئارەخـچن دا، تـەپەکـلاو. ٣ـ مـیـزێکی بچووک کە لە پێش میوانی سەر کورسی دادەنێن بۆ چایی و ژێرسـیـغـار لە سـەر دانـان. ٤ـ دەفــری ســـووتو تێکردن و جگەرە تێدا کووژاندنەوە، ژێرجگەرە، ژێر سـیـغـار، ژێرسـووتوو. ٥ـ بانی گڵـەبان

نەکراو.

**تەپڵــەگــوێنی** (نا. ل)[تەپڵ + ئە + گوێنی] ١- (گیا.) جۆرێک گوێنییـە کە بەرز نابێتـەوە و بـە زەوییـەوە دەنووسێ. ٢- (کنـ.) تووکە سەری فڕی ورد.

**تەپ و تۆز** (نا. ل)[تەپ1 + و + تۆز] تۆز و خۆڵی زۆر، تۆز و خۆڵ. **~ کردن:** ١- هەسـتـانـدنی تـۆزی زۆر بە کـەسـک یا هەر شـتێکی دیکە. ٢- (کنـ.) گڕ و گیف و هـات و هـەرا کـــردن و خـــۆ نـواندنـی کەسێک لە کـاتی دمـەقـاڵەی دوو کـەسـی دیکـە دا. ⁂ ئـەتـۆ هـێـنـدە تـەپ و تـۆزێ مـەکـە! & تەپ و تۆز وە حـەوا خـسـتن. **~ وە حـــەوا خـــستن:** بڕ: تـەپ و تۆز کردن.

**تەپ و توومـان** (نا. ل)[تەپ1 + و + توومان] بڕ: تەپ و مژ

**تەپ و دووکـەڵ** (نا. ل)[تەپ1 + و + دووکـــەڵ] دووکـــەڵی زۆر و خــــەست، چڕەدووکەڵ، تەپەدووکەڵ.

**تەپ و دوومـان** (نا. ل)[تەپ1 + و + دوومان] بڕ: تەپ و مژ

**تەپ و مـژ** (نا. ل)[تەپ1 + و + مـژ] مژی خەست و داوەستاو، تەم و مژ، تەپ و دوومان، تەپ و توومان.

**تـەپ و نم** (نـا. ل)[تـەپ1 + و + نم] خـونـاوەکە بارانێک کـە مژی دەگـەڵ بێ. ⁂ بگرمـــێنـێ، تـەپ و نم دابکـا، بیکاتـە شـــەست، هـەرگـیـز/ نەوەسـتـێ قـوڵپی گـــریـانی، نـەوەســتـێ هـەورەکـــەی پایـز (گۆران ل ١٦٦).

**تــەپ و هـوور** (نـا. ل)[تـەپ5 + و + هوور] تەپەتەپی زۆر و گران.

**تەپۆ** (نا)[؟] ١- (گـیـانـ.) جـۆرێک مـێـشـوولەیە، لە مـێـشـوولەی ئاسـایی هەندێک گەورەترە، درێشـووکەی درێژە و زۆر خراپ پێوە دەدا و خـورووی پترە. ٢- [باک] بڕ: پەشەبەند

**تەپۆکــە** (نا. ل)[تـەپ + ئۆکــە] بڕ: تەپۆڵکە

**تـەپۆلـک** (نـا. ل)[تـەپ + ئـۆلک] بڕ: تەپۆڵکە

**تـەپۆلـکە** (نـا. ل)[تـەپـۆلک + ئە] بڕ: تەپۆڵکە

**تەپۆڵکە** (نا. ل)[تەپ1 + ئۆڵک + ئە] تـەپکی چـووک، گـــردوولکـە، تـەپۆکــــە، تەپۆلکە، تەپۆڵە، تەپۆلک.

**تـەپـۆڵـە** (نـا. ل)[تـەپـۆلک + ئە] بـڕ: تەپۆڵکە

**تەپە**[1] (نا. ل)[تەپ1 + ئە] ١ـ بڕ: تەپک. ٢ـ دارێکی گردی لووسە بە بنمیچەوە رایەڵی تەونی ئەخرێتە سەر (خاڵ ب ١ ل ٣٠٣).

**تەپە**[2] (وشد.)[باک: تەپ ـ ناو: تەپە، تەپپە ـ هەو: تەپە ـ زا: تەپ] ١ـ دەنگی کەوتنی شتی قورسی نەرم. ٢ـ دەنگی پێ، ترپە. ٣ـ دەنگی دەفە. ٤ـ دەنگی وێکەوتنی باڵی مەل لە عەرز و زەوی.

**تەپە**[3] (نا.)[ئەر] بڕ: تەپلە

**تەپەترە** (نا. ل)[تەپ2 + ئە + تڕ + ئە] منداڵێک کە تازە پێی هەڵگرتوە و زوو زوو دەکەوێ.

**تەپەتەپ** (وشد.)[تەپە2 + تەپ] ١ـ دەنگی تەپەی یەک لە سەر یەک، تەپەی پەیتاپەیتا. ٢ـ دەنگی پێ لە هەڵاتن و توند رۆیشتن دا.

**تەپەدۆر** (نا.)[؟] جۆرێک چێوی تایبەتی و سووکە بە ئەندازەی سەرە شووشە دەری دێنن بۆ قایم کردن و بەستنی زارکی بوتریی، چێوپەمە.

**تەپەدووکەڵ** (نا. ل)[تەپ1 + ئە + دووکەڵ] چڕەدووکەڵ، تەپ و دووکەڵ.

**تەپەکڵاو** (نا. ل)[تەپە1 + کڵاو] ١ـ جۆرێک کڵاوی ژنانە، تاسکڵاو، تەپە. ٢ـ پارچەیەکی خڕی نێوەڕاستی کڵاو، تەپڵەک. ٣ـ دەپ و داری سەر کۆڵەکە و ئەستووندەک، تەپڵەک، تەپڵە.

**تەپەڵۆک** (نا. ل)[تەپەڵە (تەپاڵە) + ئۆک] تەپاڵەی پان کراوە بۆ سووتان و ئاوردوو، تەپاڵەی پێژراو.

**تەپیان** (چا. ل)[ئەر] بڕ: تەپین

**تەپین** (چا. ل)[لە: تەپ1][ناو: تەپین، تەپیان ـ هەو: تەپای] ١ـ بە سەر یەک دا رووخان. ٢ـ قووپان. ٣ـ رزان و نەرم بوونی کاڵەک و شووتی. ٤ـ (مجـ.) تێکچوونی لەش و بەدەنی مرۆڤ لە بەر زۆر پیر بوون.

**تەپیو** (ئان.)[لە: تەپین] ١ـ رووخاو، رماو. ٢ـ قووپاو. ٣ـ کاڵەک و شووتی رزیو. ٤ـ پیری تێکشکاو.

**تەت** (نا.)[باک ـ زا] دەست لە زمان منداڵەوە، چەچە.

**تەتڵەمیران** (گیانـ.)[تەت (تەتە2) + لە + میر + ئان] کرمێکی رەشکاری کوڵکنی بەهارییە، دوو ریز قاچی هەیە، بە کۆمەڵ لە بنە گیا جموجووڵیانە (کشت و کاڵ ب ١ ل ٨٨)، کرمێکی بازەڵەی بەهارییە، دوو ریز قاچی هەیە

(خاڵ ب ١ ل ٣٠٣)، تەتەڵەمیران. (ئین: caterpillar)

**تەتن** (نا.)[؟] خـۆڵی تێکەڵ بە ئاو، قوڕ، هەڕگ.

**تەتە** [1] (نا.)[بڕ: تەختە] ١ـ تەختە. ٢ـ ماڵە و تەختەیەکی چووک و ناسک کە گۆزە و دیزەی پێک لووس دەکەن.

**تەتە** [2] (نا.) بووکۆڵەی ساز کراو لە هەویر و قوڕ و گڵ بۆ خافڵاندنی منداڵ.

**تێبینی:** هاوڕیشە و هاومانای ئەم وشە لە فەرهەنگەکانی فارسی دا بە شێوەی تەتی (تتی) هاتوە.

**تەتە** [3] (نا.)[؟][ئەر] خوشکی باوک یا دایک، پوور، میمک.

**تەتە** [4] (نا.) شتی جوان و ژیکەڵە لە زمان منداڵەوە.

**تەتەر** (نا.)[مەغ: تەتەر] ١ـ هۆزێکی مەغوولەکان، تاتار. ٢ـ پیاوێکی پیادەی گورج و گۆڵ کە بە جلی تایبەتی لە پێشەوەی پادشا و ئەمیران دەڕۆیشت یا نامەی بۆ شوێنێک دەبرد، شاتر. ٢ـ کەسێک کە نامە دێنێ و دەبا، نامەبەر، پەیک، چەپەر، چاپار.

**تەتەرپێچ** (نا.)[تەتەر + پێچ] بڕ: تەتەرپێچ کردن. **~ کردن:** ١ـ بەستنی لاقی مەڕ و ماڵات. ٢ـ پێچانی دەستی شکاوە بە قامیش و موشەما (کشت و کاڵ ب ١ ل ٨٨).

**تەتەری** (گیا.) بڕ: سماق

**تێبینی:** هاوڕیشە و هاومانای (تەتەری، تووتم، تووتووم) لە فەرهەنگەکانی فارسی دا بە شێوەی تتری (تەتەری، تۆتری)، تتم (تۆتۆم، تۆتم) هاتوون.

**تەتەشۆر** (نا. ل)[تەتە1 + شۆر (شۆردن)][ئەر] بڕ: تاتەشوار

**تەتەڵە** [1] (نا. ل)[تەتە1 + ڵە] پارچە تەختەیەکی چووک کە منداڵانی مەکتەب هەیانبوو و سەرمەشقیان بۆ لە سەر دەنووسی.

**تەتەڵە** [2] (ئا.)[؟] ١ـ سمت، کلۆک. ٢ـ [ئەر] کوڵم، گۆنا.

**تەتەڵە** [3] (نا. ل)[؟] ١ـ کاری هەڵتەکانی دانەوێڵە و تووتن بە لەنگەریی و سینی. ٢ـ تێکەڵ بوونی زمان. **~ کردن:** ١ـ هەڵتەکاندنی دەغڵ و تووتن بە لەنگەریی بۆ جیا کردنەوەی چەت و بەرد و شتی زیادە. ٢ـ تێهەڵنگوتنی زمان لە قسە کردن دا، زمان تێکەڵ بوون. ٣ـ

نیشانە و ئامانج نەپێکان، بە هەڵە چوون لە ئەنگاوتن دا.

**تەتەڵەمیران** (گیانـ.)[تەتە2 + ڵە + میر + ئان] بڕ: تەتڵەمیران

**تەجرەبە** (نا. چا)[عەر: تجربة] ئاکامی تاقی کردنەوە، ئەزموون. **~ دەست کەوتن:** تاقی کردنەوە و بە ئاکامی کار و مەسەلەیەک گەیشتن، ئەزموون دەست کەوتن. **~ کردن:** تاقی کردنەوە کار و مەسەلەیەک و زانیاریی پەیدا کردن. **~ وە سەر یەک نان:** ئەزموون و تاقی کردنەوەی زۆر هەبوون، ئەزموون وە سەر یەک نان.

**تەجە** (گیانـ.) بڕ: تەگە

**تەجەنەڕ** (گیانـ.)[تەجە + نەڕ] بڕ: تەگە

**تەچە** (گیانـ.) بڕ: تەگە

**تەح** (ئام.) ئامرازی سەرسوڕمان، تەحا، تەححا، تیاح، حەح، تەک، تەکوو، دەک، تەو. ⁂ تەح لەو درۆیانە! تەح کە جوانە!

**تەحا** (ئام.) بڕ: تەح

**تەحتیل** (نا.)[عەر: تعطیل] ڕۆژی وچان (لە کار و دەرس و ...)، بەتاڵیی. **~ بوون:** بەتاڵ بوونی ڕۆژی کار و دەرس. **~ کردن:** دەست کێشان و بەتاڵ کردنی کار و دەرس و شتی لەم بابەتە.

**تەححا** (ئام.) بڕ: تەح

**تەحژی** (گیانـ.)[باک] بڕ: تاژی

**تەحقیق** (نا. چا)[عەر: تحقیق] کاری لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی مەسەلە و مەبەستێک. **~ کردن:** لێکۆڵینەوە لە مەسەلەیەک، توێژینەوە.

**تەحل** (ئان.)[باک] بڕ: تاڵ

**تەحلک** (گیا.)[تەحل + ک][باک] بڕ: تاڵکە

**تەحلی** (گیا.)[تەحل + ئی][باک] بڕ: تاڵیشکە

**تەحویل** (نا. چا)[عەر: تحویل] ١ـ لا بوونی ئامانەتی و سپاردە. ٢ـ تەسلیم. **~ دان:** ١ـ شتێک یا کەسێک بە شوێنێک یا کەسێک سپاردن، دانە دەست، دان. ⁂ منداڵەکەم تەحویلی فێرگە دا. پووڵەکانتان تەحویلی من بدەن. بارەکانیان تەحویلی ئەنبار دا.٢ـ دانە دەست دوژمن، تەسلیم کردن. ٣ـ (تەوس) بەیان کردن، نیشان دان،

دەربڕین. ؛؛ کوڵێکی درۆ و قسەی قۆڕ تەحویل داین. سەرێکی بۆ لەقاندم و بزەیەکی تاڵی تەحویل دام. ~ **دانەوە:** دانەوە دەست خاوەنی شتێکی ئامانەتی، سپاردە، کرێ و ...، تەسلیم کردنەوە. ؛؛ ژوورێکی کرێم هەبوو تەحویلم داوە و گەڕامەوە ماڵە خۆمان. ~ **وەرگرتن:** ١ـ وەرگرتنی سپاردە و ئامانەت. ؛؛ نامەکەتم لە پۆست تەحویل وەرگرت. ٢ـ قەبووڵ کردن، ڕێز لێگرتن، وە خۆ گرتن. ؛؛ لێی وە ژوور کەوتین و بە حورمەتەوە تەحویلی وەرگرتین. ~ **وەرگرتنەوە:** وەرگرتنەوە سپاردە و ئەمانەت. ؛؛ بارەکانمان تەحویل وەرگرتەوە. پووڵەکانم لە بانک تەحویل وەرگرتەوە. **لە ~ی کەسێک دابوون:** ئامانەت و سپاردە و شتێک لا بوون. ؛؛ ئەو دوکانە بۆ ماوەی دوو ساڵان لە تەحویلی من دایە.

**تەحویلدار** (ئان. فا)[تەحویل + دار] کەسێک کە نەغدینە و ماڵی پێدەسپێرن و لە دوایی لێیوەردەگرنەوە یا بۆ کەسێکی دیکەی حەواڵە دەکەن.

**تەحویلداریی** (حم.)[تەحویلدار + ئیی] کار و پیشەی تەحویلدار.

**تەخ** (وشـد.) دەنگی گەڕاندنەوەی گاجووت لە سەر خەت.

**تەخار** (نا.) بڕ: تەغار

**تەخاراو** (نا. ل)[تەخار + ئاو] بڕ: تەغاراو

**تەخت** (نا.)[پەه: تەخت. ناو: تەخت ـ هەو: تەخت ـ زا: تەخت] ١ـ گۆڕایی پان و بێ کون و کاژێر لە سەر زەوی. ٢ـ پانایی و نێوەڕاستی پشت و سینگ. ؛؛ تەختی پشت، تەختی سینگ ٣ـ ڕێکوپێکیی کار و مەسەلەیەک. ؛؛ هیچ نارەحەت مەبە هەموو کارەکانم بۆ تەخت کردووی. ٤ـ (ئان.) ڕێکوپێک، ڕاست، بێ خوار و خێچیی. ٥ـ ڕێک، ڕەبەق، تەواو. ؛؛ دوو ساڵی تەختە خەریکی قورەکارییم و هێشتا تەواو نەبوە. ٦ـ سەرایی، سەتح، ڕوو. ٧ـ کەرەسەیەک بە شێوەی جواروجۆر کە بۆ لە سەر خەوتن لە ژووری خەوی دادەنێن، تەختی خەو. ٨ـ ئەو کورسییەی کە پادشا لە سەری دادەنیشێ. ٩ـ تابووت، دارەمەیت. ؛؛ وەسیەت بێ کە مردم تەخت و تابووتم لە عەرعەڕ کەن/ هەتا عالەم بزانێ من شەهیدی قامەتی یارم (وەفایی ل ٥٩). ١٠ـ دڵنیا، ئەرخەیان. ~ **بوون:** ١ـ

رێکوپێک بوونی زەوی. ٢ـ رێکوپێک و راست بوون. ٣ـ (کنـ.) وێران بوون. ~ **پاڵ دانەوە:** بە دڵنیایی دانیشتن، دڵنیا بوون لە بەرێوەچوونی کار و مەسەلەیەک، ئەرخەیان بوون، تەخت دانیشتن. ~ **دانیشتن:** پاڵ دانەوە بە ئەرخەیانیی، بە دڵنیایی دانیشتن، تەخت پاڵ دانەوە. ~ **کردن:** ١ـ نەهێشتنی کەند و لەندی زەوی و رێک کردنی. ٢ـ رێکوپێک کردن. ٣ـ (کنـ.) وێران کردن. ~ **لێی کەوتن:** ١ـ درێژ بوون و خەوتن بێ هیچ ئاگاداریی و هەست و خوستێک. ٢ـ نەخۆش بوون و لە جێ دا کەوتن بە کوتوپڕیی. ~ **لێی نوستن (خەوتن):** خەوتن بە ئەرخەیانیی و دڵنیایی، خەوتن بێ هیچ هەست و خوستێک، تەخت لێی کەوتن. ~ **وەرگەڕان:** (کنـ.) لە دەستەڵات کەوتن، تێکڕووخان و بێدەستەڵات بوون. **چوونە سەر ~:** بە پادشایەتی گەیشتن، بوونە پادشا. ‖ **تەختی ئابنووس:** تەخت و کورسی پادشایەتی کە لە داری ئابنووس ساز کرابێ. ∷ بونیانی کیبر و سەرکەشییە تاقی کیسرەویی/ دانانی زوڵم و رووڕەشییە ئەختی ئابنووس (نالی ل ٢٣٨). **تەختی پشت:** نێوەڕاستی پشت. ∷ تەختی پشتی لە عەرزی دا. لە سەر تەختی پشتێ درێژ ببوو. **تەختی خەو:** کەرەسەیەک کە بۆ لە سەر خەوتن کەلکی لێوەردەگرن، تەخت. **تەختی رەوان:** جۆرێک کەژاوەیە کە گەورەپیاو و دەوڵەمەند تێیدا دادەنیشن و غوڵام و نۆکەر (دوو یا چوار کەس) بە دەست هەڵیدەگرن، تەختەڕەوان. **تەختی سینگ:** نێوەڕاستی سینگ. ∷ منداڵەکەی بە تەختی سینگیەوە نا. **تەختی گەردوون:** ئاسمان، فەلەک. **تەختی نێوچاوان:** تەختایی نێوچاوان، نێوچاوان. **تەختی ئەرز (عەرز):** زەوی، سەر زەوی. ∷ شووشەکەی بە تەختی ئەرزی دادا و شکاندی.

**تەختا** (نا. ل)[تەخت + ئا][زا] بڕ: تەختە

**تەختان** (نا. ل)[تەخت + ئان1] زەوی و شوێنی تەخت، گۆڕایی.

**تەختانی** (نا. ل)[تەخت/٤ + ئانی1/٢] زەوی و شوێنی تەخت و یەکدەست، جێگای تەخت، تەختایی.

**تەختایی** (نا. ل)[تەخت/٤ + ئایی] زەوی و شوێنی تەخت، تەختانی.

**تەخترمە** (نا.)[باک] هەندێک دەغڵ کە

لەبەر پێویستی ماڵ بەر لە دروێنە دەیدروون و سووری دەکەن، تەخدەمە، تەختەمە، بەرکوت.

**تێبینی:** هاوڕیشەی ئەم وشەیە لە زمانی فارسی دا تخرمە (تێخێرمێ) ـ یە بە مانای نەبرژاوە و فەتیر.

**تەخت و بەخت** (نا. ل)[تەخت + و + بەخت] دەستەڵات. **~ وەرگەڕان:** (کنـ.) لە دەستەڵات کەوتن، تووشی کزیی و بێدەستەڵاتیی بوون. **~ وەرگەڕاندن:** (کنـ.) لە دەستەڵات خستن، کز و بێدەستەڵات کردن، تەخت و مەکان تێکدان.

**تەخت و تاراج** (نا. ل)[تەخت + و + تاراج] تاڵان، تاراج. **~ کردن:** بە تالان بردن، بە تاراج بردن، تاڵان کردن. ⁂ دەڵێ: سبحەینێ جواب دە گەرمێنێ بگەڕێ، لە ئەستەمبووڵێ ببێ بڵاوە/ سوڵتان پێ بزانێ، پاکانمان دەخنکێنێ، تەخت و تاراجمان دەکا تەواوە (مان ل ١٣٨).

**تەخت و مەکان** (نا. ل)[تەخت + و + مەکان] ١ـ دەستەڵات، حکوومەت، تەخت و بەخت. ⁂ هیچکەس نازانێ یایەزین چەند جوانە/ بۆم بە جێ هێشتووە تەخت و مەکانە (مان ل ٦٤). ٢ـ (کنـ.) بە تەواوەتی وێران، خاپوور. **~ بوون:** وێران بوون بە تێکڕایی، خاپوور بوون، تێکڕووخان. **~ تێکچوون:** لە دەستەڵات کەوتن، تەخت و بەخت وەرگەڕان، تووشی کزیی بوون. **~ تێکدان:** لە دەستەڵات خستن، بێدەستەڵات کردن، تووشی کزیی کردن. ⁂ خوڵا لێت هەڵناگرێ لە پیاوی نەجیم تێک بدەی تەخت و مەکانە (مان ل ١٠٣). **~ کردن:** وێران کردن، تێکدان، تێکڕووخاندن، تێک و پێک دان.

**تەختە** (نا. ل)[تەخت + ئە][باک: تەختە ـ ناو: تەختە ـ هەو: تەختە ـ زا: تەختا] ١ـ ساقەتی دار کە لە درێژی را برابێ، چ چووک بێ چ گەورە، تەختەدار. ٢ـ بڕ: تەختە دامە. ٣ـ بڕ: تەختە نەرد. ٤ـ هەر شتێکی تەخت و یەکدەست. ⁂ تەختەبەرد، تەختەسەهۆڵ. ٥ـ تابڵۆیەکی رەش کە لە فێرگەکان بە گێچ دەرسی لە سەر دەنووسن، تابڵۆ، تەختەسیا. ٦ـ یەکە و بژارێک بۆ فەرش و پەتوو و هەندێک تەنراو. ⁂ دوو تەختە فەرشی باشم کڕی. ٧ـ بەستراو، داخراو (دوکان و بازاڕ و شوێنی کار). **پێ ~ کردن:** پێداخستن، بەستران بە زۆر. ⁂

دوکانەکەیان پێ تەختە کردم. **~ بوون:** داخـران، بەسـتـران. **~ کـردن:** ١ـ داخـستن، بەستن، تەحـتـیل کـردن. ؛؛ تەواوی شار دوکانەکەیان تەختە کرد و چوونە تەمەشا. چەکدارەکان بە زۆر کار و کاسبی و دوکانی خەڵکیان تەختە کرد. ٢ـ خـەریکی تەخـتـەنەرد بوون، تەختـە لێـدان. **~ یەک کـەم بوون:** (کنـ.) ناتەواو بوونی ئەقڵ، ئاقڵ پارەسـەنگ ویستن. ؛؛ هەر لە سـەروسـەکوتییـەوە دیار بوو کە تەختـەیەکی کـەمـە. **~ لێدان:** (کنـ.) تەختە نەرد کردن، خەریکی تەختە بوون. ؛؛ دەستێک تەختە لێدەین؟ **دەستی کەس (کەسانێک) لە ~ بەستن:** (کنـ.) لە سـەرووتر و یەکـەم بوون لە هەمووکەس لە هەموو بابەتێک چ باش و چ خراپ، دەستی هەمووکەس لە پشتەوە را بەستن. ؛؛ لە دەرس خـوێندن و زیرەکی دا دەستی من و تۆی لە تەختـە بەستوە. لە ناپیاوەتی و نامرۆڤایەتی دا دەستی هەمـوانی لە تەختـە بەسـتـوە. **لە ~ دان:** (کنـ.) بە قـامک تەقـە لە ئامێرێکی چێویی و تەختەیی هێنان بۆ دوور بوون لە بەڵا و چاوی پیس. ؛؛ کوتم « مـاشـەڵڵا زۆر چاک مـاوی تووکـێکی سپیت تێنەکەوتوە! » کوتی « لە تەختەی دە! »

**تەختەباز** (ئان. ل)[تەختە/٣ + باز4] کـەسـێک کـە تەخـتـەنەرد باش دەکـا، نەرڕاد.

**تەختـەبەرد** (نا. ل)[تەخـتـە + بەرد] پارچە بەردێکی یەکدەست و رێکوپێک و گەورە.

**تەخـتــەبەن** (نا. ل)[تەخـتــە/١ + بەن٣/1][ئەر] بڕ: تەختەبەند

**تەخـتــەبەند** (نا. ل)[تەخـتــە/١ + بەند/١٣] ١ـ جـۆرێک تەخت کـە لە سـووچی حـەوش و باغ یا ژوور و بان بە تەخـتـە هەڵیدەبەستن، بۆ دانیـشتن و لە سـەر خـەوتن، کـەت. ؛؛ سـەر بەردەبازی رێتە، تەن تەختەبەندی جێتە/ دڵ مەیلی خاکی پێتە، رۆح ماڵی خۆتە، بیبە (نالی ل ٣٩٥). ٢ـ هەرچی کـە بە تەخـتــە و شـریت یا بەند لێک بەسـترابێتـەوە. ٣ـ بەستنی دەستی شکاو بە تەختە و پارچە هەتا جووڵەی پێ نەدەن و خۆ بگرێتەوە. ٤ـ بەسـتنەوەی کـەسـێک دە نێـوان دوو تەختـە دا هەتا نەجووڵێتەوە و لە دوایی بە مـشـار دوو شـەقیـان دەکـرد. ٥ـ پێشگری چێویی بەر هەیوان، محەجەرە.

**تەختەبیت** (گیانـ.)[تەختە/١ + بیت]

[باک] بڕ: تەختەپووت

**تەختەبیتی** (گیانـ.)[تەختە/١ + بیت + ئی] بڕ: تەختەپووت

**تەختەپۆش** (ئان. فا)[تەخت + ئە + پۆش] ١ـ سەرپۆشی ئاوڕۆ، گۆڕیچە یا شوێنێک بە تەڵەبەرد. ٢ـ [ئەر] تەختە و پەردووی میچ. **~ کردن:** ١ـ داپۆشینی سەری ئاوڕۆ یا شوێنێک بە بەردی تەخت و پان. ٢ـ پەردوو و تەختە لە کاریتەی میچ دان.

**تەختەپووت** (گیانـ.)[تەختە/١ + پووت] حەشەرەیەکی چووکی بێ باڵە لە کێچ گەورەترە، رەنگی سووری ئاماڵ قاوەییە، رۆژانە دە نێو درزی کەرەسەی چێوی یان دۆشەگ و لێفە دا خۆی دەشارێتەوە و شەوانە وە دەر دەکەوێ و بە مرۆڤ یا گیاندارەوە دەدا و خوێنی دەمژێ، شوێنی پێوەدانەکەی هەڵدەمسێ و سوور هەڵدەگەڕێ و خوورویەکی زۆری هەیە و هەندێک جار نەخۆشیش رادەگوێزێ، Cimex lectularius ناوی لاتینی ئەم حەشەرەیە، تەختەبیتی، تەختەبیت. (فار: ساس)

**تێبینی:** پووت یا بیت لە زاراوەی ناوەندیی دا هەمان **بەی** زاراوەی باکووریی و **بەیە** ـ ی زاراوەی زازاییە بە مانای مۆرکە (بڕ: بەی2)

**تەختەتاش** (ئان. فا)[تەختە + تاش] کەسێک کە لە تەختە و چێو کەرەسەی ساز دەکا، نەجاڕ، دارتاش. ∷ خوا نەجاڕ نیە و تەختەتاشە/ قەحپە و گەواد بۆ یەک باشە (پەند ل ١٩٢).

**تەختەدار** (نا. ل)[تەختە/١ + دار1] بڕ: تەختە/١

**تەختەدامە** (نا. ل)[تەختە + دامە] یارییەکی دوو کەسی گەورەساڵانە، بریتیە لە تەختەیەکی پان کە بە ٦٤ خانووی چووک دابەش کراوە، هەر لایەی بە ١٦ دامە یا هەر شتێکی دیکە کایەی دەکا، دامەکان لە بەرابەر یەک دادەنێن وەها لە خانوویەک خوارتر دامەکان بە دوو ریز دادەکەن، هەر لایەی حول دەدا کە داشی پتر لە یەکتر بخۆن و ئاغای لە یەکتر بکەن، کەسێک کە زووتر داشەکان بخوا بردوویەتیەوە، تەختە، دامە.

**تەختەرەوان** (نا. ل)[تەخت + ئە + رەوان] کەژاوەیەک کە دەستەڵاتداران و دەوڵەمەندان تێدادادەنیشن و غوڵامەکان هەڵیدەگرن و دەیبەن، تەختی رەوان.

**تەختەزەنگ** (نا. ل)[تەخت + ئە +

زەنگ] کوتە ئاسنێکی پان و ئەستوور کە لە فێرگە و کارگە و شوێنی دیکە هەڵیداوسن و بە ئامرازێکی وەک چەکوچ لێی دەدەن بۆ راگەیاندنی زەمان یا کاتی پشوو دان، گەڕناڵ.

**تەختەسر** (نا. ل)[تەختە/ە + سر] هەوری، پارچە یا هەر شتێک کە ئەختەسیای پێ پاک بکەنەوە.

**تەختەسەهۆڵ** (نا. ل)[تەختە + سەهۆڵ] سەهۆڵێکی یەکدەست و گەورە و ئەستوور کە بەستبێ و بە سانایی نەشکێ.

**تەختەسیا** (نا. ل)[تەختە + سیا] تابلۆیەکی رەشی چێویی کە لە فێرگەکان بە گێچ لە سەر دەنووسن، تابلۆ، تەختە/ە.

**تەختەشۆ** (نا. ل)[تەختە + شۆ (شۆردن)][باک] بڕ: تاتەشوار

**تەختەقاپوو** (نا. ل)[تەختە + تر: قاپوو] نیشتەجێ بوونی عەشیرەت و رەوەندییەکان لە گوند یا لە شار، ئاوایی نشین، تەختەقاپی.

**تەختەقاپی** (نا. ل)[تەختە + تر: قاپی] بڕ: تەختەقاپوو

**تەختەکاوس** (گیانـ.)[تەختە + کاوس (ناو)][باک] گیاندارێکە وەک مێروو کە بە کۆمەڵ دە نێو دار و تەختە و چێوی نێو ماڵ دا دەژین و نێوەکەی دەخۆن و دەبنە هۆی زەرەر و زیان و رمان و رووخانی میچی ماڵ، مۆریانەی چێوخۆر.

**تەختەمە** (نا.)[باک] بڕ: تەخترمە

**تەختەنەرد** (نا. ل)[تەختە + نەرد] یاریەکی دوو کەسی گەورە سالانە، بریتیە لە تەختەیەک و ٣٠ مۆرە و دوو زار یا تاس. هەر لایەی ١٥ مۆرە (سپی یا رەش) بە شێوەی تایبەتی دادەکا و تاس هەڵداوێن و هەر لایەی حەول دەدا کە زووتر مۆرەکانی بگەیەنێتە لای خۆی و هەر کەس زووتر هەمووی خوارد بردوویەتیەوە، تەختە، نەرد.

**تەخدەمە** (نا.)[باک] بڕ: تەخترمە

**تەخسیر** (نا.)[عەر: تقصیر] ١ـ تاوان، گوناه. ٢ـ خەتا، هەڵە. ٣ـ سستیی، کۆتایی. **~ کردن:** ١ـ کۆتایی کردن، سستی کردن لە ئەنجام دانی کارێک. ٢ـ خەتا کردن، سەهوو کردن. ٣ـ تاوان کردن، گوناه کردن.

**تەخسیرکار** (ئان. ل)[تەخسیر + کار]

١ـ خەتاکار. ٢ـ تاوانکار، تاوانبار.

**تەخش** (نا.)[؟] چێوێکی باریک و درێژ کە سەرەکەی تیژە و بۆ راو و شەڕ کەلکیان لێوەردەگرت، تیر/١.

**تەخشان پەخشان** (نا. ل)[تەخشان + پەخشان] پرژ و بڵاو (بۆ ماڵ و سامان). ~ **کردن:** پرژ و بڵاو کردنی ماڵ و سامان. ⁂ ئەو هەموو پارە و ماڵەی بە ماوەیەکی کەم تەخشان پەخشان کرد.

**تەخشک** (نا. ل)[تەخ (تاقە) + شک (چک)][باک] تاقەی چووک، رفە.

**تەخمین** (نا. چا)[عەر: تخمین] ١ـ ئەندازە بە حەدس و گومان. ٢ـ بەراورد. ~ **لێدان:** ئەندازە کوتن بە حەدس و گومان.

**تەدارەک** (نا. چا)[عەر: تدارک] ساز کردن و پێک هێنان. ٢ـ پێک هێنانی خۆشی و شادی. ~ **بۆ گرتن:** ١ـ ساز کردنی شایی و خۆشی. ٢ـ ساز کردنی کەرەسە و ئەسباب بۆ کار و مەسەلەیەک. ~ **گرتن:** خۆ ئامادە کردن بۆ خۆشی و مەسەلەی لەم بابەتە، ساز کردنی شادیی و خۆشی. ٢ـ ئامادە کردنی کەرەسە و ئەسپابی مەسەلە و کارێک. **خۆ لە ~ دان:** خۆ جوان و ئامادە کردن بۆ مەبەستێکی خۆش.

**تەر** (پاشگ.)[هەو] بڕ: تر/١ و ٢. ⁂ جارێوتەر (جارێکی دی). سەختتەر (سەختتر)

**تەرات** (نا.)[؟] غار، تاو، چوارناڵ.

**تەراتێن** (نا. ل)[تەرات + ئێن] هاتووچۆی گیاندار بۆ پاش و بۆ پێش بە هات و هەراوە. ~ **کردن:** هاتووچۆ کردنی گیاندار بە نائارامییەوە.

**تەراخۆم** (نا.)[فەر: trachome] نەخۆشییەکە کە تووشی چاو دێ و دەبێتە هۆی پەیدا بوونی زیپکە و کێم لە سەر پێڵووی سەرەوە و ئەستوورتری دەکا و ئەگەر چارە نەکرێ مرۆڤ کوێر دەکا، تەراخۆمە، تەراخۆما، چاوێشە، وەردێنە.

**تەراخۆما** (نا.) بڕ: تەراخۆم

**تەراخۆمە** (نا.) بڕ: تەراخۆم

**تەراز** (نا.)[لۆر: تەراز ـ فار: تراز ـ ناو: تەراز] ١ـ ئامرازێکی بەننایییە کە بۆ رێکی و راستی دیوار کەلکی لێوەردەگرن و چەند جۆری هەیە، تەرازووی بەننایی، ترازوو. ٢ـ بەرابەر، هاوشان. ٣ـ رێک، راست، میزان. ~ **بوون:** ١ـ بەرابەر

بوون، هـاوشـــان بوون. ٢ـ ڕێک و ڕاست بوون. **~ کــــردن:** ١ـ دیاری کـــردنی بـەرزی و نزمـی جـــێگایـەک. ٢ـ بەرابـەر کردن. ٣ـ مـیزان کردن، ڕاست کردن. ‖ **تەرازی ئاویی:** لوولەیەکی کانزایە کە دوو ســـەرەکــەی لـە شــووشـــەیە و لـە نێــو شووشـەکان ئاوەکییەکی ڕەنگینی تێدایە و پـتــر لـە جـــادەســـازی دا کـــەلکی لێوەردەگرن. **تەرازی هەوایی:** لوولەیەکی شووشـەیی سەربەستراوە کە ئاوەکییەکی ڕەنگینی تێـدایە و لە کـاری بەننـایی دا کەلکی لێوەردەگرن.

**تەرازنامـــە** (نـا. ل)[تەراز + نامـــە] پێـرستێک کە یانەکـان لە ئاخـری سـاڵ دەینووسن و ڕادەی دارایی و قەرزی تێدا دەنووسن.

**تەرازوو** (نـا.)[پەھ: تـەرازووک. پـەش: تـەرازوو ـ فـــار: تەرازوو ـ لۆر: ترازی ـ تـات: تـەرازوو، تـەرازێن. بـاک: تـەرازوو، تەرازی ـ نـاو: تەرازوو، تـەرازی، ترازوو ـ هـەو: تەرازوو ـ زا: تـەرازوو] ١ـ ئامـرازی کێشـان کە چەند جۆری هەیە و باوترینی دوو قاپە دەگـەڵ دوو شەهێن کە لە لایەک شـمەک دادەندرێ و لە لای دیکە بەرد یا کیلۆ. ئیمـرۆکـە جۆری کامـپیـۆتێریی و ئـەلکتـــریکی پـەیدا بـوە و جـــێی بـە جـۆرەکـانی دیکە لەق کـردوە. ٢ـ ناوی یەکێک لە بورجەکانە، حەوتەمین بورج کە بەرابەرە دەگـەڵ مـانگی ڕەزبەر و چونکە شـەو و ڕۆژ لەم بورجـە دا بەرابـەرن بۆیە ئـەو نـاوەی لێنـراوە، بـورجـی تـەرازوو. ٣ـ سـووڕەتێکی فەلەکییە لە لای بـاکوور. ∷ ئەو خـاڵە چ شـیـرینە لە نێـو حـۆقـقـەی زولفت/ نەمـدیوە سـوهـەیلی یەمـەنی بێتـە تـەرازوو (وەفـــایی ل ١٠٩) پـیـــاوانە بـە نەزەر تەماشا کە مابەینی ئەو دوو چاو و بـرۆیە/ هـێندێک دەڵێن ئـەســـتـــێـــرەی سـوهـەیلـە، هێندێک دەڵێن خـێر تەرازووە و کـــۆیە (لاس و خـــوزاڵ ل ١٠٣). ٤ـ تەرازی بەننـایی. ٥ـ بەرابەر، هـاوسـەنگ. ٦ـ ڕێک، تەراز، تەخت، مـیـزان. **دە ~ نان:** ١ـ کـێشـان، وەزن کـردن. ٢ـ (کنـ.) هـەڵســـەنگاندن و بـەراورد کـــردنـی دوو کـەس دەگەڵ یـەکتر. ∷ ڕەببی خـولاگیـرم بـن ... ئەمـنوو دەگــــەڵ کـــەچەڵێکی دە تـەرازووی نـاوە (مـــــــان ل ١٦٤). ‖ **تــەرازووی بــەنــنــایــی:** بـڕ: تـەراز/١. **تەرازووی زێڕینگەریی (زێڕنگەریی):** بڕ: تەرازوو مسقاڵ.

**تـەرازووباز** (ئـان. فـــا)[تـەرازوو + باز4] کەسێک کە لە کێشانی شمەک بە تەرازوو فـێڵ لـە خـەڵک دەکـا و کـەمی

دەکێشێ، کەم فرۆش، ترازووباز. // تەرازوومەند.

**تەرازووبازیی** (حم.)[تەرازوو باز + ئیی] کار و کردەوەی کەسی تەرازووباز، کەمفرۆشیی، ترازووبازیی.

**تەرازوودار** (ئان. فـــا)[تەرازوو + دار2] کەسێک کە لە دوکان یا شوێنی دیکە جنسی مشتەری دەکێشێ و تەحویلیان دەدا.

**تەرازووداریی** (حم.)[تەرازوودار + ئیی] کار و پیشەی کەسی تەرازوودار.

**تەرازوو مسقاڵ** (نا. ل)[تەرازوو + مسقاڵ] تەرازوویەکی چووکە بۆ کێشانی شتی چووک و سووک (وەک زێڕ و زێو و دەرمان و ...)، تەرازووی زێڕینگەریی.

**تەرازوومەند** (ئان. فـا)[تەرازوو + مەند] کەسێک کە تەرازووکەی راستە و لە کێشان دا فێڵ لە خەڵک ناکا. // تەرازووباز.

**تەرازوومەندیی** (حم.)[تەرازوومەند + ئیی] راست و ئەمین بوون لە کێشان دا، کار و ئاکاری کەسی تەرازوومەند.

**تەرازی** (نا.)[سۆر ـ باک] بڕ: تەرازوو

**تەراش** (نا.)[لە: تەراشین] ١ـ بڕ: تەڵاش. ٢ـ ئاکامی تەراشین، تراش. **~ کردن:** تاشینی مووی روخسار، ردێن تاشین، تراش کردن. ⁂ دوو رۆژە تەراشم نەکردوە.

**تەراشە** (نا. ل)[تەراش + ئە] بڕ: تەڵاش

**تەراشین** (چا. م) بڕ: تاشین

**تەراویح** (نا.)[عەر: تراویح] نوێژێکی تایبەتیە، بیست و سێ رەکعەتە کە شەوانی رەمەزان دەخوێندرێ و لە نێوانی هەر دوو رەکعەتی دا دوعایەکی تایبەتی دەخوێندرێ.

**تەربی** (گیا.)[؟] دارێکی کوێستانی هەمیشە سەوزە، بەرێکی خڕی سوور ئەگرێ وەک بەڵاڵووک، بۆ رەوانی ئەخورێ (خاڵ ب ١ ل ٣٠٦) تێرویی، تەرو، تەروو، تەرەون، تەرەوەن.

**تەرت**[1] (نا.)[؟] ١ـ لێک بلاو، پرژ، ئاوارە، تونا. ٢ـ فەوتاو، لە بەین چوو.

**تەرت**[2] (نا.)[؟] دارستانی خۆڕسک، مێشە، بێشە.

**تەرت و توونا** (نا. ل)[تەرت1 + و + توونا] ١ـ پرژ و بڵاو، پەرێشان، توونا. ٢ـ فەوتاو، بنەبڕ. & تەفروتوونا. ~

**بوون:** ١ـ لێک بڵاو بوون، پەرژ و بڵاو بوون. ٢ـ فەوتان، بنەبڕ بوون. **~ کردن:** لێک بڵاو کردن، پەرژ و بڵاو کردن. ٢ـ بنەبڕ کردن، فەوتاندن.

**تەرتیب** (چا. م)[عەر: ترتیب] ١ـ نەزم، ڕێکوپێکیی. ٢ـ جێبەجێ، جۆر. ٣ـ بە ریز لە پشت سەری یەک. ٤ـ شێوە و چەشنێکی تایبەتی. **~ دان:** ١ـ نەزم دان، ڕێکوپێک کردن. ٢ـ جێبەجێ کردن، جۆر کردن. ٣ـ هەر چێک بە ریز لە پشت سەری یەک ڕەدیف کردن. ٤ـ پێک هێنان، ساز دان. ٥ـ (کنـ.) کەسێک سزا دان و تەنبێ کردن (کوشتن یا لێدان). ٦ـ (کنـ.) کاری جنسی دەگەڵ کەسێک کردن، گایین. **~ کردن:** ١ـ ڕێکوپێک کردن. ٢ـ بە تەرتیب و ڕەدیف چنین.

**تەرتیل** (چا. م)[عەر: ترتیل] خوێندنەوەی قورئان و دوعا بە دەنگی نەرم و خۆش.

**تەرجمان** (ئان.)[پەهـ: تەرگەمان، تەرگومان. عەر: ترجمان] کەسێک کە زمانێک بە قسە یا بە نووسراوە وەردەگێڕێتەوە سەر زمانێکی دیکە، دیلمانج، وەرگێڕ. ⁖ تۆ کە چاوت پێمبڵێ دەرسی زوبانی ئەجنەبی/ وەک موفەتتیش بەگ ئیتر من تەرجومانم بۆ چییە (بێخود ل ١٠١). **~ کردن:** وەرگێڕانی زمانێک بۆ سەر زمانێکی دیکە.

**تێبینی:** ئەم وشەیە هەروەکی نووسراوە هەم لە عەرەبی دا هەیە و هەم لە پەهلەویی دا. هەندێک لە فەرهەنگەکانی کوردیی و فارسی ریشەی ئەم وشەیان بردۆتەوە سەر تەڕزمان. مەردووخ لە ئاست تەرجمان نووسیویەتی: تەڕزمان، تەڕزوان، زوانزان، زوانوێژ و ... (بڕ: مردوخ ب ١ ل ٣٩٣). لە فەرهەنگی پەشتوو ـ رووسی دا تەرجمان بە وشەیەکی عەرەبی داندراوە (ل ٢٢٥) ژابا ـ ش ئاماژەی بە هەبوونی ئەم وشەیە لە عەرەبی و تورکی و فارسی دا کردوە (ل ٩٧).

**تەرجومە** (نا.) [عەر: ترجمة] کاری وەرگێڕ و دیلمانج، تەرجەمە. **~ بوون:** نووسراوە یا قسەیەک کە لە زمانێکی دیکەوە وەرگێڕدرابێتەوە سەر زمانێکی دیکە. **~ کردن:** وەرگێڕان، تەرجمان کردن.

**تەرجەمە** (نا.) بڕ: تەرجومە

**تەرح** (نا.)[عەر: طرح] ١ـ بیچم،

شـــێـــوە، تـەرح و دیدار. ∷ هـەرچـی مـەحـبووبان دەکـەن خـۆشـە، بەڵام داخـی رەقیب/ دەمکوژێ، تـەرحی مرێ هـەروەک کـەری بێگارییـە (نالی ل ٥٨٥). ٢ـ وەک، وەکوو، چەشن، وێنە. ∷ سینگی سپی بە تەرحی بەردی مـەرمـەڕێ/ ئەگـەر کافـر بدبینێ بـۆت لە دین وەردەگـەڕێ (شـێخ فـەرخ ل ٢٧). ٣ـ شـێـوەیەکی نەقـاشی و کـێـشـانەوە، نەقش. ٤ـ پلان، نـەقـشـە. ~ **داڕشن:** پلان دانان، نـەقـــشـــە و بـەرنـامـــە داڕشـتن بۆ مـــەســـەلە و کارێک. ~ **کردن:** مـەسـەلەیـەک هێنانە گـۆڕ و بـاس کـردن بۆ لـێـدوان، مـەترەح کردن.

**تـەرح و دیـدار** (نـا. ل)[تـەرح + و + دیدار] شکڵ و شەمایەل، بیچم، شێوە.

**تەرخ** (نا.) بڕ: تەرک

**تەرخـــان** (نـا.)[مـــەغ: ترخـــان] ١ـ نـازناوێک کـە سـەردەمی پاشـــایانی مــەغـوول دەدرا بە هـەندێک کـەس و ئەم کەسە باجی نەدەدا و هـەر کات ویستبای دەیتوانی بچێتە لای شا. ٢ـ ئازاد لە باج و بەهـرەی ئاغـا. ٣ـ ئازاد، رزگـار. ~ **بوون:** ئازاد بوون. ~ **کـــران:** ١ـ ئازاد کران، بێ قـەید و بەند کران. ٢ـ تـایبـەت دران. ~ **کـــردن:** ١ـ ئازاد کـــردن. ∷ دوگـــمـــەی ســـینگ و بـەرۆکـێت لەبۆ دەترازێنم/ تـەرخـانت دەکـەم لـە شـــەو راموسـانێ (کانی مرادان ل ١٨٩). ٢ـ تایبـەتی دان، هەڵبـژاردن. ∷ ئەو پارچە زەوییەم بۆ بێستان تەرخان کردوە.

**تەرخوون** (گیا.) بڕ: تەڵخوون

**تەرخێنە** (نا.)[باش] بڕ: ترخێنە.

**تەرز**[1] (گـیـا.)[؟] سـەرلقی مـێـو و کـاڵەک و شـــووتی و ترۆزی و خـــەیار (کشت و کاڵ ب ١ ل ٨٩).

**تەرز**[2] (نا.)[عـەر: طرز] ١ـ شـێـوە، چەشن، بیچم. ٢ـ شێواز، رێگا، قاعیدە.

**تەرزە** (نـا.)[پـەھ: تـەگـــــەرگ، تـات: تیـەرسـە ـ مـاز: تێـریگ. باک: تەیرۆک، تیری، تەرگ، تـەیرک، تەزرە ـ ناو: تەرزە، تـەوەرگ، تـەزرە، تگر ـ هـەو: تـەوەرگـی ـ زا: تۆرگە، تـوەرگە، تۆرسەلە، تـوورسەلە، تۆسلە، تۆرژلە، تـەیرکە] بارشـتـێکە وەک بـەفـــر بـەڵام رەق و پتـــەو کـــە زیان دەگـەیەنێـتـە بەر و حـاسـڵات، خـلۆریگ، گللێرە.

**تەرزەشکێن** (ئان. ل)[تەرزە + شکێن (شکاندن)] بڕ: تەرزەکوت.

**تەرزەکوت** (ئان. ل)[تەرزە + کوت] حاڵی دار و دەرخت یا زەراعەتێک کە تەرزەی لێیدابێ و بەر و گوڵی هەڵوەراندبێ یا لاسکی شکاندبێ، تەرزەشکێن. **~ داگرتن:** ١ـ دابارینی تەرزە بە توندی. ٢ـ (کنـ.) پەند و ئامۆژگاری دادانی کەسێک بە توندی و پەیتاپەیتا.

**تەرزەلووکە** (نا. ل)[تەرزە + لووکە] جۆرێک تەرزەی ورد.

**تەرس**[1] (نا.)[؟] گوو و پیسایی ئەسپ و ماین و ئێستر. **~ و گوو تێکەڵ کردن:** (کنـ.) زۆر ترسان.

**تەرس**[2] (نا.)[هەو ـ زا] بڕ: ترس

**تەرسا** (نا. ئان)[پەه: تەرساک] ١ـ فەلە، مەسیحی. ٢ـ (مجـ.) کچی و یارێک کە مرۆڤ لە دین وەرگێڕێ.

**تێبینی:** خودی وشەکە لە ترس کەوتوە و بە مانای لە خوداترسە.

**تەرسۆک** (ئان. ل)[تەرس2 + ئۆک][زا] بڕ: ترسەنۆک

**تەرسۆنەک** (ئان. ل)[تەرس2 + ئۆنەک][زا] بڕ: ترسەنۆک

**تەرسەزاڵ** (ئان. ل)[تەرس2 + ئە + زاڵ][هەو] بڕ: ترسەنۆک

**تەرسەقول** (نا. ل)[تەرس1 + ئە + قول] پیسایی کەر و گوێدرێژ، قەرسەقول.

**تەرک**[1] (نا.)[تور: terki] بەشی دواوەی زین، پشت سەری سوار، تەرکی، پاشتەرک، پاشکۆ. **~ کەوتن:** ١ـ لە جێ چوونی کلێنچکە. ٢ـ لە جێ چوونی جومگەی پەلی ماڵاتی بەرزە.

**تەرک**[2] (نا.)[عەر: ترک] واز لە عادەت، تەرخ. **~ دان:** بڕ: تەرک کردن. **~ کردن:** ١ـ واز لێهێنان، وەلانانی عادەت، تەرک دان. ٢ـ جێ هێشتن، بە جێ هێشتن و دوور کەوتنەوە. **~ی (شوێنێک) کردن:** واز لێهێنان لە چوونەوە و سەردانی شوێنێک. ؛؛ تەرکی ماڵ کردن، تەرکی مەدرەسە کردن. **~ی (شتێک) کردن:** واز هێنان لە عادەت و خوو. ؛؛ تەرکی ئارەق کردن، تەرکی سیگار کردن.

**تەرک**[3] (نا.)[باک ـ زا] بڕ: ترەک

**تەرک**[4] (نا.)[پەه: تەرگ] ١ـ کلاوێکی ئاسن کە لە شەڕ دا دە سەری دەکەن هەتا بەری شیر و تیر بگرێ و شەڕکەر چی لێنەیە، خوود، کڵاوخوود. ٢ـ هەرکام

له بەشـەکانی جۆرە کڵاوێکی دەروێشـانە کە تانجی دەروێشی پێدەڵێن و نیشانەی تـەرکی کـــردەوەیەکی خـــراپ و رەچاو کردنی کردەوەیەکی چاکە. ٣ـ کەرەسـەی شەڕ، چەک. ٤ـ [ئەر] خشڵ، تیتە.

**تەرکـــبــەن** (نا. ل)[تەرک1 + بەن1] [ئەر] بڕ: تەرکبەند

**تەرکبـەند** (نا. ل)[تەرک1 + بەند/٦] دوو رێسـراوی باریک لە پشت زین کـە خـــورج و هـەگـــبـــەی پێ لە پاشکۆ دەبەسـتـنەوە، بەن تەرگ، بەن سـامۆرتە، بەن سامۆتە.

**تەرکـە** (گـیـا.)[؟] ١ـ قـامـیـشـێکی باریکی پتـەوە کـە چیـغی لێ دروست دەکـەن. پیکە، نەیجـە، نەیجـەڵە. ٢ـ لقی ناسک کـە لە دار دەبـڕن، شـووڵ. [زا] دەغڵ

**تەرکـەدنیـا** (ئان. ل)[تەرک2 + ئە + دنیا] کەسێک کە وازی لە هەموو خۆشی و نێعمـەتی ئەم دنیایە هێناوە و خـەریکی تاعەت و خوداپەرستنە، دوورەپەرێز.

**تەرکـەش** (نا. ل)[تەر (تیـر) + کـەش (کێشان)] کیسە یا هەگبەیەک کە تیریان تێـدەنا و لە لاتـەنیـشـتـیـان دەبـەست، تیـرکـێش، تیـردان، کـێش. ‡ مــەتاڵ و کەمەند لەگەڵ تەرکەشی/ پاکی قایم کرد لە پشـتی رەخشی/ بارام دەچـتـە راو بۆ چیـا رەشـی (بارام و گـوڵندام ل ٣٠) لە جەرگم طرفة العینێ هەزار نەشـتەر چوو نەمزانی/ نە تیر و تەرکەشی تـوورکە، نە ئەو چاوانە هەڵدێنێ (وەفـایی ل ٢٠٤). ‖ **ئاخـــرین (دوایین) تیـــری تەرکـــەش:** ١ـ دوایـین تیـــر. ٢ـ (کنـ.) دوایـین هیـــوا و ئومـید بۆ چارەی کـار و مـەسـەلەیەک. ‡ رەزم ئـارا ئەفـــســـــەری بـە هێـــز و بـە دەستەڵاتی ئەرتەشـی ئێران وەک ئاخرین تیری تەرکەشی کۆنەپەرستی هاتە سـەر کار (تاریک و روون ل ٣٧).

**تەرکـــەنوێژ** (ئان. ل)[تەرک2 + ئە + نوێژ] کەسێک کـە نوێژی وەلاناوە و ئیدی نوێژ ناکا.

**تەرکـــەوڵات** (ئان. ل)[تەرک2 + ئە + وڵات][موک] کەسێک کە لە زێد و شوێنی ژیانی خۆی ئاوارە بووبێ.

**تەرکـــەوەتەن** (ئان. ل)[تەرک2 + ئە + وەتەن] کـەسـێک کە بـە ناچار لە وەتەن و نیـــشـــتـــمـــانی خـــۆی دوور کـــەوتـۆتەوە، تەرکەوڵات.

**تەرکی** (نا.)[تور: teki] بڕ: تەرک1

**تەرکـــیب** (نا. چا)[عـەر: تـرکـیب] ١ـ

تێکەڵاویی، ئاوێتە بوون. ٢ـ ساز بوون، پێکهاتن. ٣ـ (نا.) بەژن و باڵا، ئەندام، بەدەن. ‡ لەو رۆژەوە ئەگەر رووحی لاس و لاسەشۆڕی باڵەکان خوڵقاوە/ خودا ئەو تەرکیب و رووح و بەدەنەی بە من داوە (لاس و خەزاڵ ل ٧١).

**تەرگ** (نا.)[باک] بڕ: تەرزە.

**تەرلان** (گیانـ.) بڕ: تەڕلان

**تەرم**[1] (نا.)١ـ [لۆر: تەرم (دارەمەیت). باک: تەرم ـ ناو: تەرم ـ زا: تەرم] لەشی مردووی مرۆڤ، مەیت، جەنازە. ٢ـ [باک] مۆتە، کابووس. ٣ـ سووڕەتێکی فەلەکییە شێوەی ورچ دەدا، کە لە راستی دا لە سی و پێنج ئەستێرە پێکهاتوە بەڵام تەنیا حەوت ئەستێرەی بە گەشی دەبیندرێن کە چوار دانەیان لە لەشی ورچەکە دان و سێ دانەیان دە کلکی دا، حەوبرا، حەوبرالە، حەفتەوانان، هەفت برا، حەوتەوانە، چارەگا. (عەر: دب اکبر). || **تەرمی ئادەم:** حەوتەوانەی بچووک (دب اصغر)

**تەرم**[2] (گیا.)[؟][باک] مێو، دارەمێو.

**تەرماڵ** (نا.)[؟][باک] ١ـ (ئا.) کەفەڵ و سمتی حەیوان. ٢ـ هەوراز.

**تەرن** (ئان.)[بڕ: تەڕ][زا] تەڕ، تازە، تەمەن، لاو.

**تەرنە** (نا.)[زا] بڕ: ترخێنە

**تەرو** (گیا.) بڕ: تەربی

**تەرواڵ** (نا.)[؟] کەپرێکی نزمی بچووک لە نێو ماڵ دا بۆ شت لە سەر هەڵچنین، تەرواڵە، هەرزاڵ، هەرزاڵە.

**تەرواڵە** (نا.) بڕ: تەرواڵ

**تەرووەندە** (ئان. ل)[فار: ترونده] ١ـ میوە و بەری نۆبەر، نۆبەرە. ٢ـ شتی نایاب، کەم وێنە.

**تەرۆزی** (نا.) بڕ: ترێزوو

**تەروو** (گیا.) بڕ: تەربی

**تەرە** (نا.)[لە: تاران] ١ـ ئاوارە، هەڵوەدا، لانەواز، دەربەدەر. ٢ـ تاراو و دوورکەوتوو لە ماڵ و حاڵ. ‡ ئەی مەلی خۆشخوێنی ئاوارە و تەرە و بێ ئاشیان/ مژدە بێ زوو دێیەوە ناو میللەتی رزگاری کورد (تاریک و روون ل ١٢٦). **~ بوون:** ١ـ ئاوارە بوون، هەڵوەدا بوون. ٢ـ تاران. **~ کردن:** ١ـ ئاوارە کردن، دەربەدەر کردن. ٢ـ تاراندن.

**تەرەب** (نا. چا)[عەر: طرب] شادیی، خۆشیی، شادمانیی.

**تەرەس** (ئان.)[باک: تەرەس ـ ناو: تەرەس ـ هەو: تەرەس] ١ـ قورمساغ، گەواد، بێناموس. ٢ـ پیاویی خوێڕیی، ترۆ..

**تەرەقی** (نا. چا)[عەر: ترقی] پلە و پایەی بەرەو ژوور، پێشکەوت. **~ پێدان:** پلە و پایە بردنە سەر. ؛؛ کار جێگەی خۆی هەیە... هێندێک کەس تەرەقی پێدەدەم، هێندێک کەس جەرگی لە زگی دا دەردێنم (لاس و خەزاڵ ل ١٢٧). **~ کردن:** بەرەو پێش چوون، پێشکەوت کردن.

**تەرەون** (گیا.) بڕ: تەربی

**تەرەوەن** (گیا.) بڕ: تەربی

**تەریب** (نا.)[عەر: تضریب] تەقەڵی دریشتی قیچەلفاچ و زەربدەر. ؛؛ شاگردانی بۆ دێنم لەوێ قۆچە مووسڵێ/ ئەوە دەگەڵ هەموو تەقەڵ و تەریبێکی، ئازیزەکەم خۆش خۆش پێیەهەڵبلێ (گەنج ل ١٠٨). **~ دان:** تەقەڵی دریشت لێدان لەو جلانەی کە بە دەست دەیدروون بۆ قایمتر بوون.

**تەریدە** (ئان.)[عەر: طریدة] ١ـ دەرکراو. ٢ـ جەردە، چەتە، ڕێگر. ؛؛ فرسەت زانا بێ تەریدەی قاتڵ/ یەکسەر بەردەبێ کاڵای گیان و دڵ (مەولەوی ل ١٥٢). ٣ـ (نا.) قەتار، کاروانی وشتر. ؛؛ ئەی زولفی ڕەشت قافڵە کاروانی تەریدان/ بنوارە سەفی عاشقی غەمدیدە لە چی دان (وەفایی ل ٢٩).

**تەریدەباشی** (نا. ل)[تەریدە + باشی] سەرۆک و سەردەستەی تەریدە و ڕێگران. ؛؛ تەیمووری سەر تەریدەباشی بوو، ڕێگر بوو، ڕێگای دەگرت (لاس و خەزاڵ ل ١١).

**تەریق**[1] (نا.)[؟] شەرمەزار، خەجاڵەت. **~ بوونەوە:** شەرمەزار بوون، خەجاڵەت بوونەوە، بە خۆ دا شکانەوە. **~ کردنەوە:** شەرمەزار کردن، خەجاڵەت کردنەوە.

**تەریق**[2] (نا.)[عەر: طریق] ١ـ ڕێگا، ڕێ. ٢ـ شێوە، نەرێت. ٣ـ تەریقەت، مەزهەب.

**تەریقە** (نا.)[عەر: طریقە] ١ـ ڕێبازی مەزهەب، تەریق، تەریقەت. ٢ـ شێوە، جۆر، تەریق.

**تەریقەت** (نا.)[عەر: طریقة] ١ـ ڕێبازی مەزهەب، تەریق. ٢ـ ڕێگا، ڕێ.

**تەریقیی** (حم.)[تەریق1 + ئیی] تەریق بوونەوە، شەرمەزاریی.

**تەریک** (نا. فا)[عەر: تریک] ١ـ دوور. ٢ـ دوورەپەرێز، تەنیا، جیا. **~ بوون:** ١ـ دوور بوون. ∷ تا زوڵمەتی وجوودە، تەریکی لە نووری عیشق/ سێبەر نەما، هەتاوە. کە مەحوی نەما، خودا (مەحوی ل ٥). ٢ـ دوورەپەرێز بوون.

**تەریکیی** (حم.)[تەریک + ئیی] ١ـ دووریی. ٢ـ دوورەپەرێزیی.

**تەڕ** (ئان.)[هیک: تەرونە ـ ئەو: تەئورونە ـ پەه: تەر، تەڕ. باک: تەر ـ ناو: تەڕ ـ هەو: تەڕ ـ زا: تەرن] ١ـ حاڵی هەر شتێکی ئاو و نم و شێی دە نێو خۆی دا هەبێ. // ویشک. ٢ـ لاو، جەوان، جوان. ∷ دڵتەڕ، تەڕپۆش، تەڕپیر.٣ـ ناسک، شلک، فەریک. ∷ لە سەر سنگی ئەو کیژەی خڕ کردوە جووتێک لیمۆی تەڕە/ گە بێتوو بزانن میر و بەگلەران لە سەر ئەو لیمۆیەی شەڕە (مێر و وەفا ل٦٧). تەڕەپیواز، تەڕەماش. ٤ـ تازە، نوێ، تەڕ و تازە. ٥ـ (کنـ.) چاک، باش. ∷ تەڕت بەردام، تەڕت ئەو کارە جێبەجێ کرد. (ئەو کنایەیە بەو مانایە بۆ تەوس و لاتاو بە کاری دێنن). زللەیەکی تەڕم لێدا. **~ بوون:** ١ـ ئاو وێکەوتن، ئاو پێدا رژان. ٢ـ (کنـ.) پەند وەرگرتن لە هەڵە و کار وەمەسەلەیەک، تەمێ بوون. ∷ هێندە بێ چاوڕوویە هەزار پەندیشی بە سەر بێ بە هیچ تەڕ نابێ.٣ـ دڵتەڕ بوون، لاوانە جووڵانەوە. ∷ ئەمن میرسێوەدین بەگم .../ مەجلیسی من تەڕە، هەمیشە رەخس کێشان و ساز و دەیارە لێدانە (سەعید و میرسێوەدین ل ١١٤). **~ بوونەوە:** ١ـ حەیوان و ئاژەڵ کە لە کا خواردن و گیای ویشک خواردن رزگاری دێ و گیای تازە دەخوا. ٢ـ کەسێک کە بە پیری شوو دەکا یا ژن دەخوازێ. **~ کردن:** ئاو یا ئاوەکی بە کەسێک یا شتێک دا کردن یا پێداکران. ∷ باران تەڕی کردم تۆ ئیدی تەڕم مەکە! **~ کردنەوە:** لەوەڕاندنی ئاژەڵ و ماڵات لە سەرەبەهار بە گیای تازە و تەواو بوونی لە گیای وشک خواردن. **خۆ ~ کردن:** ١ـ تەڕ کردنی جل یا لەش بە ئاو. ٢ـ (کنـ.) میز بە خۆ داکردن بە تایبەت بۆ منداڵ یا پیر و ناتوان. || **تەڕتەڕ:** زۆر تەڕ.

**تێبینی:** tauruna تەئورونە ـ ی ئەوێستایی و tarunaتەرونە ـ ی هیندیی کۆن و تەرن ـ ی زازایی بە مانای دووهەم یانی لاو هاتوون و لە هەندێک وشەی کوردییش دا ئەم مانایەی هێشتا راگرتوە.

**تەڕاد** (ئا.)[لۆر: تەڕاف (بەرگــەدە). باک: تەڕاد ـ ناو: تەڕاد، تەڕاف] پێـست و گـۆشـتی تەنکی سـەر کـەلەکـە و بن پەراسووکان.

**تەڕازن** (نا. ل)[تەڕ + ئا + زن (زان)] بڕ: تەڕەزن

**تـەڕاش** (نـا. ل)[لـە: تـەراشـین] ١ـ پارچەیەکی ناسک لە دار و چێـو کـە لە کاتی رەندە کردنی لێیدەبێتەوە، تەلاش، تەراش، تلّیش. ٢ـ درز، قەلّش. ‌‌⁂ ئەگەر هەوا گـەرمـە، سـەردە/ جـێگەم تەڕاش و بن بەردە (بۆ کوردستان ل ٢٠٦).

**تەڕاف** (ئا.) ١ـ بڕ: تەڕاد. ٢ـ [ئەر] کەفەڵ.

**تەڕاڵ** (ئان.)[باک: تەڕال، تڕال ـ ناو: تەڕاڵ، تڕاڵ ـ زا: تڕال] تەنبەڵ، تەوەزەل، تەپ، ســـست. ~ **بوون:** تەمـــبـــەڵ بوون. ~ **کردن:** تەمبەڵ کردن، تەوەزەل کردن.

**تـەڕایـی** (نـا. ل)[تـەڕ + ئـایـی] ١ـ شوێنەوار و نیشانەی ئاو و شتی ئاوەکی لە شـوێنێک، نم، شێ. ٢ـ شـوێنی تەڕ، تـەڕیـی. ~ **دان:** پـەیدا بـوونی نمـی و تەڕایی لە سـەر دیوار و شـوێنێک. ~ **لێـبـران:** پێـوەنـەمـانی نم و تەڕایی بە شـــتـــێکەوە، زۆر ویشک بـوون. ~ **لێبڕین:** پێوە نەهێشتنی نم و تەڕایی بە شـتـێکەوە، زۆر ویشک کـردن. ‌⁂ لەو عاشقانە هەرکەس گوڵی خەزاڵ بە بۆن کـردن هەڵمـیـسێ و تـەڕایی لێـبـبـڕێ، خەزاڵ بۆ ئەو دەبێ (بەیتی لاس و خەزاڵ ـ سروە ژ ٨٨).

**تـەڕپـۆش** (ئـان. ل)[تـەڕ + پـۆش] کەسێک کە جلی جوان و رازاوە و شیک دەبەر دەکـا، کـەسـێک کـە وەک لاو جل دەبەر دەکا.

**تەڕپیـر** (ئان. ل)[تەڕ + پیـر] پیـری دڵتەڕ و دڵزیندوو، پیرێک مەیل و هەوای لاوانەی هەبێ.

**تەڕدەست** (ئان. ل)[تەڕ + دەست] ١ـ کارامە، لێهاتوو، لێوەشاوە. ٢ـ زیرەک، چوست. ٣ـ کـەسـێک کـە کـاری سـەیر و سەمەرە دەکا، چاوبەست، شۆعبەدەباز. ٤ـ زوو، گورج، دەستبەجێ. ⁂ من ئەوە دەچمـە سـەفـەری بێناریێ، ئیـشـەڵڵا تـەڕدەست و زوو دەگـەڕێمـەوە دواوە/ چاری من مـەرزینگانە، لێی دەبینم کام و کاوە (شۆڕمەحموود ل ٦٧). ~ **بوون:** ١ـ کارامـە و لێوەشاوە بوون لە ئەنجام دان و بەڕێوە بردنی کـارێک. ٢ـ زیرەک و

چـوسـت بـوون. ٣ـ چـاوبـەسـت بـوون، شۆعبەدەباز بوون.

**تەڕدەستیی** (حم.)[تەڕدەست + ئیی] ١ـ لێهاتوویی، لێوەشاوەیی. ٢ـ چالاکیی، زیرەکـیـی، گـورج و گـۆڵیی. ٣ـ کـاری تەڕدەست و شـۆعـبـەدەباز، چاوبەستن. ~ **کردن:** ئەنجام دانی کار و سەیر و سەمەرە کە کەسی ئاسایی پێی نەکرێ.

**تەڕدەم** (ئـان. ل)[تـەڕ + دەم] بـڕ: تەڕزمان. ~ **بوون:** بڕ: تەڕزمان بوون.

**تەڕدەماغ** (ئان. ل)[تەڕ + دەماغ] بە کەیف، کەیفساز، دڵخۆش و شاد. ~ **بوون:** کەیفساز بوون، بە کەیف بوون.

**تەڕدەماغیی** (حم.)[تەڕدەماغ + ئیی] کـەیفسـاز بوون، شـاد و دڵخۆش بوون، کەیفسازیی.

**تەڕدەمیی** (حم.)[تەڕدەم + ئی] بڕ: تەڕزمانیی.

**تەڕزمان** (ئان. ل)[تەڕ + زمان] کـەسی قـسـەزان و دەم و راوێژ خـۆش، زمـانتـەڕ، تەڕدەم، رەوانبـێـژ، تەڕزوان. ~ **بوون:** دەو و راوێژ خـۆش بـوون، قـسـەزان بوون، زمـانتـەڕ بوون، تەڕزوان بوون، تەڕدەم بوون.

**تەڕزمانیی** (حم.)[تەڕزمـان + ئیی] تەڕزمان بوون، زمانتـەڕ بوون، تەڕدەمی، رەوانبێژی، تەڕزوانی.

**تەڕزوان** (ئان. ل)[تـەڕ + زوان][ئـەر] بڕ: تەڕزمـان. ~ **بوون:** بڕ: تەڕزمـان بوون.

**تەڕزوانیی** (حم.)[تەڕزوان + ئـیی][ئەر] بڕ: تەڕزمانی.

**تەڕک** (نـا. ل)[تـەڕ + ک] ١ـ داردەسـتی ئەسـتوور، گـۆپاڵ. ٢ـ دار و ئێزنگی ئەسـتوور و تەڕ. ٣ـ (کنـ.) کیر، سیرەتی پیاو.

**تەڕلان** (گیانـ.)[؟] ١ـ مەلێکی راوکەرە لە رەگـەزی باز و لە جنسی چاو زەرد، چنگی بە هێزە و دندووکی خوارە. جۆری زەرد و رەش و سـپی هەیە. (فـەرهنگ پرنـدگـان ل ٥٣)، Accipiter gentilis ناوی لاتینی ئەم باڵندەیە، تەللان، تەرلان. ⁖ ئەگـەر بـەرامـبـەری یەکـتـری پخـوێنن باز و تەڕلانە/ پکەونە شـەڕ و جـەنگ و لێکدانە/ وێران دەبێ ئەو دەور و مـەکـانە (لاس و خـەزاڵ ل ٣٦). ٢ـ (مجـ.) شۆخ و شەنگ. ‖ **تەڕلانی رەش:** جۆرێک تەڕلان کە زۆر بە هێزە. **تەڕلانی زەرد:** جۆرێک تەڕلان کە کەم تاقەتە و بۆ

راوی باڵندەی گەورە نابێ. **تەڕلانی سپی:** جۆرێک تەڕلان کە رەنگی سپییە و زۆر بە هێز نیە و بۆ راوی مەلی گەورە دەست نادا.

**تەڕلە** (گیا.)[؟] گیایەکی بەهارییە لە ناو دار دەوەن دا ئەڕوێ وە بە سەوزی ئەخورێ (خاڵ ب ١ ل ٣٠٧)

**تەڕن** (نا.)[؟] ١ـ زیان، زەرەر، خەسارەت. ٢ـ فیرۆ، خەسار. ﷼ بە تەڕن ماڵەکەم لەکیس چوو. **بە ~ بردن:** بە فیرۆ بردن. **بە ~ چوون:** بە فیرۆ چوون **بە ~ دان:** بە فیرۆ دان **~ پێدان:** زیان پێگەیاندن و زەرەر لە کەسێک دان بەبێ ئەوەی کە پێبزانێ، تەڕن پێکردن. **~ پێکردن:** زەرەر لە کەسێک دان، تەڕن پێدان.

**تەڕنەبابیلە** (گیان.)[عەر: طیر ابابیل] بڕ: پاڵەوانە

**تەڕنەئەبابیلە** (گیان.)[عەر: طیر ابابیل] بڕ: پاڵەوانە

**تەڕوبڕ** (ئان. ل)[تەڕ + و + بڕ] ١ـ حاڵی زەوی، جل یا شتێک کە زۆر تەڕ بێ. ٢ـ خواردنێک کە ویشک نەبێ و چەوریی و ئاوی هەبێ.

**تەڕ و تازە** (ئان. ل)[تەڕ + و + تازە] ١ـ گژ و گیا و گوڵی شەق و تورت و تازە. ٢ـ (مجـ.) پێستی شەق و جوان و جەوان. ﷼ روخساری جوان و تەڕ و تازە بوو.

**تەڕ و تلیس** (نا. ل)[تەڕ + و + تلیس (تلیسان)] زۆر تەڕ، تەڕ و خووساو. **~ بوون:** بە تەواوەتی خووسان، زۆر تەڕ بوون. ﷼ هێندەی باران بە سەر داباریبوو، تەڕ و تلیس ببوو.

**تەڕوتووش** (ئان. ل)[تەڕ + و + تووش1/١] هەوای بارانی و هەور و نم. **~ بوون:** بارانی و نمدار بوونی هەوا.

**تەڕوتووشیی** (حم.)[تەڕوتووش + ئیی] چلۆنایەتی هەوای بارانی بە تایبەت لە بەهار دا، سەردەمی باران و قوڕ و چڵپاوی زۆر.

**تەڕ و ویشک** (نا. ل)[تەڕ + و + ویشک](کنـ.)١ـ خزمەت، ئاگاداریی لە منداڵ و نەخۆش. ٢ـ تێکڕایی چاک و خراپ یان گوناهکار و بێگوناه. **~ پێکەوە (دەگەڵ یەک) سووتان:** (کنـ.) تێداچوون و فەوتانی چاکە و خراپ یا تاوانکار و بێتاوان پێکەوە. **~کردنەوە:** (کنـ.) ئاگاداریی و پێڕاگەیشتن بەمنداڵ

و نەخـــۆش یا کــەســێکی کــە توانـایی پێراگەیشتن بە خۆی نیە.

**تەڕە** (نا.)[پەهـ: تەرەک. ناو: تەڕە ـ زا: تـار، تاڕ] ١ـ مــیـــوە و بەر و ســـەوزیی بێستان. ٢ـ بڕ: کەوەر. ٣ـ بڕ: تەڕەزن.

**تەڕەبار** (نا. ل)[تـەڕە + بار] هـەمـــوو میوە و بەر و سەوزی بێستان.

**تــەڕەبــەهــار** (ئــان. ل)[تـەڕ + ئـە + بەهار] بەهاری تەڕ و پڕ باران.

**تەڕەبیــرۆ** (نا. ل)[تەڕ + ئە + بیـرۆ] جۆری تەڕی بیرۆ. // ویشکەبیرۆ. (بڕ: بیرۆ)

**تەڕەپیاز** (گیا.)[تەڕ + ئە + پیاز] بڕ: تەڕەپیواز

**تەڕەپیــواز** (گیا.)[تەڕ + ئە + پیواز] گـیــای ناسکی پیـواز کـە بەشـێکە لە ســـەوزیی خـــواردن و بنکێکی چووکی هەیە، تەڕەپیاز.

**تەڕەتوو** (گیا.)[تەڕ + ئە + توو] تووی تەڕ و تازە.

**تەڕەتوورە** (گیا.)[تەڕە + تووڕ؟ + ئە] بڕ: تەڕەتیزە

**تەڕەتیزە** (گیا.)[تەڕە + تیز (تیژ) + ئە][پەش: تەرەتێزەک ـ فار: تەرەتیزەک ـ کـــرم: تەرتیـــزەک. باک: تووزک ـ ناو: تەڕەتیــزە، تەڕەتوورە] گــیــایەکی یەک ساڵەی دەسـچـێنە، زۆر بەرز نابێـتـەوە، گـەڵای شکڵی بەیزی هـەیە، تامی تیـژە و دەگـەڵ ســەوزی دیکـە دەخـورێ، ئاسن و فـۆســـفـۆر و یۆدی هـەیە، Lepidium sativum ناوی لاتینی ئەم گــیـــایەیە. (عەر: حب الرشاد)

**تەڕەزا** (ئان. ل)[تەڕ + ئە + زا(زان)] حەیوانی تازەزاو، تەڕەزەن، تەڕەژەن.

**تــەڕەزن** (نــا. ل)[تــەڕە + زن (زان)] مــێــرگ و زەوییــەک کــە ســـەرەبەهار دەژێتـــــــەوە و ئـاوی هـەیـە، تـەڕە، زنـە، تەڕازن.

**تــەڕەزەن** (ئــان. ل)[تـەڕ + ئـە + زەن (زان)] بڕ: تەڕەزا

**تــەڕەژەن** (ئــان. ل)[تـەڕ + ئـە + ژەن (زان)][ئەر] بڕ: تەڕەزا

**تەڕەســاز** (نا. ل)[تەڕ + ئە + ســاز] ورد کـــراوی شـــێلم و بڕوێش کـــە بـۆ ترخـێنەی ئامـادە دەکـەن بـەر لەوەی کـە ویشکی بکەن (بڕ: ترخێنە)

**تەڕەساڵ** (ئان. ل)[تەڕ + ئە + ساڵ] ساڵی تەڕ و تووش و پڕ باران.

**تەڕەف** (نا.)[عـــــەر: طرف] ١ـ لا، سووچ، دەورووبەر. ٢ـ لایەن، لا، جەهەت. ٣ـ غەنیم، حەریف. ٤ـ کەسی بەرامبەر لە قسـە و وتووێژ و شـتی لەم بابەتە. ⁂ وڵامی تەڕەفەکەی نەداوە و پشتی تێکرد. **~ بوون:** ١ـ بـە شــــــەڕ هـاتـن و بەربەرەکانی دەگەڵ غەنیم و حەریف. ٢ـ رووبەڕوو بوون، تووش بوون. **~ بوون دەگـــەڵ کــــەســـێک:** دوژمن بوون، دوژمنایەتی کردن، دەگەڵ بە شەڕ هاتن. ⁂ نازانم چم کردوە هەمـوو دەگـەڵ من تەڕەفن. **~ ی کــەســێک گــرتن:** لایەنگریی لە کەسێک کردن، لای کەسێک گرتن.

**تەڕەفـــدار** (ئان. فـا)[تەڕەف/٢ + دار2] لاگر، لایەنگر، هەوادار.

**تەڕەفداریی** (حم.)[تەڕەفدار + ئیی] لایەنگریی، لاگریی.

**تەڕەفـرۆش** (نا. فـا)[تەڕە + فـرۆش] کـەسـێک کـە سـەوزی و بەری بێسـتـان دەفرۆشێ، سەوزییفرۆش.

**تەڕەفـرۆشـیی** (حم.)[تەڕەفـرۆش + ئیی] ١ـ کـار و پیشـەی تـەڕەفـرۆش. ٢ـ (نا. ل) دوکـــان و شــــوێنی ســــەوزیی فرۆشتن.

**تەڕەکاریی** (حم.)[تەڕە + کار (کاڵ2) + ئیی] ١ـ داچاندنی سـەوزی و بەری بێستان. ٢ـ (نا. ل) کاری داچاندنی بەر و میوەی بێستان و سەوزیی.

**تەڕەکاڵ** (نا. ل)[تەڕ + ئە + کاڵ2] ١ـ کێڵان و شێوە کردنی زەوی بە تەڕیی. ٢ـ کشتوکاڵی بەراو، گەنمی بەراو.

**تەڕەمـــــاست** (نا. ل)[تەڕ + ئە + ماست] ١ـ ماستێکە کە دوای هەوێن کردن و مەیین، پیوی بە سەر دادەکەن و لە شـوێنێکی سـاردی وەک ئەشکەوت دایدەنێن و بۆ زسـتـان دەیخـۆن، ئەو ماستە مـاوەیەکی زۆر خۆی رادەگرێ و ناترشێ و تامـیـشی زۆر خـۆشـە. ٢ـ برێتییە لە کەرە یا سەرتوێژی ماست و شیر کە لە پایز دا چین چین دائەنرێت لە پێستە یا لە دیزە دا بۆ ئەوەی لە زستان دا بخورێت (کشت و کاڵ ب ١ ل ٩٠).

**تەڕەماش** (نا. ل)[تەڕ + ئە + ماش] ١ـ ماشی تەڕ و تازە کە هێشتا لە کەلوو دایە و ویشک نەبوە.، مـاشی فـەریک ٢ـ (کنـ.) شتی بێ نرخ و هیچ. & ترەماش.

**تەڕ یا ئیـشک** (نا. ل)[تەڕ + یا + ئیشک] ١ـ کایە و قـومارێکی دووکەسی منداڵانـە کـە لایەکی بەردێکی پان تـەڕ

دەکــەن و لایەکــەی دیکە بە ئیــشکی دەمێنێتەوە. یەک لەوان بەردەکە هەڵداوە و دەڵێ تەڕ یا ئیــشک و لایەکــەی دیکە دەبێ یەکێک لەوانە بڵێ. کاتێک بەردەکە کــەوت براوە ئەو کــەســەیە کــە راســتی کــوتبێ و پارە یا شــتــێکی دیکە کــە قــومــاریان لە ســەر کــردبێ دەدۆڕێ. ئەم کــایە و قــومــارە زۆرتر بە پارە دەکــردرێ پێی دەڵێن شــێــر یــا خــەت و لە کــاتی نــەبوونــی پــارە بە بــەرد دەیکــەن. ٢ـ لــە کــاتی یاری دوو کــەس یــا دوو دەســتــە بۆ ئەوەی کــە کــام لا لــە پێش دا دەست پێ بکــا تــەڕ یــا ئیــــشــکی دەکـــــەن. & تەڕیائیشکە.

**تەڕ یا ئیــشکە** (نا. ل)[تــەڕ + یا + ئیشک + ئە] بڕ: تەڕیا ئیشک

**تەڕیزە** (ئا.)[هس: تـڕیزە] ١ـ بۆشــایی کەلەکە، خاڵیگە. ٢ـ کەفەڵ، تەڕاف.

**تــەڕیــی** (حــم.)[تــەڕ + ئـیــی] ١ـ تــەڕ بوون. ٢ـ (نا.) شوێنی تەڕ و ئاودار، نم و تــەڕایی. ٣ـ تــازەیی، نــاسکیی، شــلکیی، جــوانیی. **لە ~ خــواردن و لە ویشکی نوستن:** (کنـ.) هەست بــە بەرپرســایــەتی نەکــردن، گــوێ نەبزووتن بە کــاروبار و هیچ نەکردن.

**تەز** (نا.)[لە: تــەزین][باک: تەڤـز ـ ناو: تــەز ـ هـەو: تـۆس] ١ـ ســــــڕ. ٢ـ تــەزوو، موچڕک. ٣ـ سارد، فێنک.

**تەزان** (چا. ل) بڕ: تەزین

**تــەزانــدن** (چـا. م)[لـە: تـەزیـن][بـاک: تەڤــزاندن ـ نـاو: تەزاندن، تەزانن ـ هەو: تۆسنــای] ١ـ ســــڕ کـــردن، بــێ هەست کردن. ٢ـ لێدانی توند وەها کە شــوێنــێ لێــدان ســــوور هــەڵگەڕێ و بتـــەزێ. ٣ـ (کنـ.) تەمــێ کــردن. ٤ـ ســڕ کـــردن بە ســـەرمــا و ســـاردی. ؛؛ ئەو ئاوە هـێندە سارد بوو کەللەی تەزاندم.

**تەزانن** (چا. م)[ئەر] بڕ: تەزاندن

**تەزبی** (نا.) بڕ: تەسبێح

**تەزبێح** (نا.) بڕ: تەسبێح

**تەزتەزۆک** (گیانـ.)[باک] بڕ: هەلەکە

**تەزروو** (گیانـ.) بڕ: تەزەرو

**تەزرە** (نا.) بڕ: تەرزە

**تەزکەرە** (نا.)[عەر: تذكرة] ١ـ بەڵگە و پێناسـی هـاتووچۆ لە وڵاتێک بۆ وڵاتـانی دیکە، پاسـاپۆرت، پەساپۆرت، پاسپۆرت، پــاس. ٢ـ شـــەرحـی حـــاڵ، کــتـــێب یا گـــــردەکـــۆیەک ســــەبارەت بە ژیـانی نووســـەران و شـاعـیـران و ناوداران. &

تەسکەرە. **~ خـــوێندنەوە:** بن و بنەچەکەی کەسێک لێکدانەوە.

**تەزوو** (نا. ل)[تەز + ئوو] ١ـ مچورک، تۆسی. ٢ـ کزەی سەرما. **~ پیاهاتن:** بڕ: تەزوو پێداهاتن. **~ پێداهاتن:** مچورک پێدا هاتن، راست بوونەوەی تووکی لەش، تەزوو پیاهاتن.

**تەزە** (ئان.)[باک ـ زا] بڕ: تازە

**تەزەرو** (گیانـ.)[پەھ: تیتەر ـ سان: تیتتیری] باڵندەیەکە بە قەرا مریشک، نێرەکەی هەر شێوەی کەڵەباب دەدا بەڵام لە جیات پۆپەی گۆشتن کاکۆڵی هەیە و کلکی درێژترە. مێیەکەی رەنگ و جوانی نێرەکەی نیە و رەنگی تڵخترە، خۆراکیان دان و بەر و حەشەرەیە، سەرەتای بەهار جووت دەبن. مێیەکە هێلانەی لە سەر زەوی دەکا و دە هێلکەی دەنێتەوە و ٢٤ رۆژ لە سەری دەخەوێ. گۆشتیان خۆش و بەتامە و هەر لەبەر ئەوە راو دەکرێ بەڵام ئێستاکە ژمارەیان زۆر زۆر کەم بۆتەوە و بەرەو فەوتانن، Phasianus ناوی لاتینی ئەم مەلەیە، تەزروو، کەڵەبابی کێویی (نێر)، مریشکی کێویی (مێ)، چوڕ، چوڕپۆڕ، چۆڕ، قرقاوڵ. ⁖ بوڵبوڵ گوڵشەن بێنام و نەنگی/ تەزەرو سەر سەر و باغچەی بێرەنگی (مەولەوی ل ٧٣). سیمین بەدەن و سەرو قەد و لەنجە تەزەرون/ کافر نیگەھ و رەشک لە بوتخانەیی چینن (نالی ل ٣٣٨).

**تەزین** (چا. ل)[باک: تەڤزین ـ ناو: تەزین، تەزان ـ هەو: تۆسای] ١ـ سڕ بوون و بێ هەست بوونی دەست و پێ یا شوێنێکی لەش لە بەر چاک خوێن پێ نەگەیشتن. ٢ـ سڕ بوون لە بەر سەرما. ٣ـ گێژ و کاس بوون لە بەر رووداوێک.

**تەزیگ** (نا. مفـ.)[ئەر] بڕ: تەزیو

**تەزیو** (نا. مفـ.))[لە: تەزین] ١ـ ئەندامێک یا شوێنێکی لەش کە لە بەر خوێن پێ نەگەیشتن سڕ بووبێ. ٢ـ سڕ بوو لە بەر سەرما. ٣ـ گێژ و کاس لە بەر رووداوێک. ٤ـ تەمێ کراو. & تەزیگ

**تەزێن** (ر.)[لە: تەزاندن] ١ـ ریشەی چاوگی تەزاندن. ٢ـ بە ناوەوە دەلکێ و ناوی فاعیل ساز دەکا و مانای تەزێنەر دەدا. ⁖ کەللەتەزێن، دڵتەزێن، گورچووتەزێن.

**تەژبی** (نا. چا.)[عەر: تشبیە] وێچوون، هاوێنە، وەک، تەژبیات. **~ کردن:** وێچواندن، شتێک بە شتێک وێچواندن.

**تەژبیات** (نا.)[عەر: تشبیهات] کۆی تەژبی کە لە کوردیی دا هەروەک تاک کەلکی لێوەردەگرن. ⁂ تەژبیات بە تۆ نەبێ کابرایەکی زۆر نەفام بوو.

**تەژدید** (نا. چا)[عەر: تجدید] ئاکامی کەوتن و دەرنەچوون لە دەرس و دەورێک کە لە ئیمتەحانی دوایی ساڵ. **~بوون:** کەوتن و دەرنەچوون لە دەرس یا دەرسگەلێک لە ئیمتەحانی دوایی ساڵ، نومرەی کەمتر لە رادەی دیاری کراو هێنانەوە ⁂ لە ریازی و شیمی تەژدید بووم.

**تەژدیدیی** (نا. ل)[تەژدید + ئیی] ئەو دەرسانەی کە خوێندکار و شاگرد لێی دەکەون و پێویستە سەرلەنوێ ئیمتەحانی لە سەر بدەنەوە. **~ هەبوون:** تەژدیدیی هێنانەوە، تەژدید بوون. **~ هێنانەوە:** تەژدید بوون و دەرنەچوون. ⁂ سێ تەژدیدییم هێناوەتەوە

**تەژنە** (ئان.)[هەو] بڕ: تینوو

**تەژە** 1 (گیانـ.) بڕ: تەگە.

**تەژە** 2 (نا.)[؟] ١ـ داری رایەڵی سەر دیوار، کاریتە، بالار، حەماڵ. ٢ـ (ئان.) مرۆڤی کەڵەگەت و درێژ و نالەبار، حۆل.

**تەژی** (ئان.)[باکـ] بڕ: تژی

**تەس** 1 (وشـد.) دەنگ دانی ئاژەڵ بۆ ئەوەی کە پاشەوپاش بگەڕێتەوە.

**تەس** 2 (نا.) بڕ: تەسە

**تەسادوف** (نا. چا)[عەر: تصادف] ١ـ پێشهات. ٢ـ هەڵکەوت. ٣ـ وێکەوتن. **~ کردن:** ١ـ وێکەوتنی دوو ماشێن یا کەرەسەی دیکەی لەم بابەتە. ٢ـ وەبەر کەوتن، تووشی تەسادوف بوون.

**تەسبێح** (نا.)[عەر: تسبیح] ١ـ جۆرێک لیزگە مووررووی دەستی پیاوانە کە بۆ خۆ خافڵاندن دەیگێڕن و لە سەر نوێژیش ژن و پیاو بۆ ناوی خودا هێنان و بژاردن کەلکی لێوەردەگرن و پتر سەد و یەک دەنکە، تەزبێح، تەزبی. ٢ـ (نا. چا) زیکری خودا، یادی خودا. **~ گێڕان:** دەنک دەنک هاویشتنی تەسبێح بۆ خۆ خافڵاندن و بژاردنی ناو خودا و شتی لەم بابەتە. **~ هەڵخڵاندن:** تەسبێح هەڵسووڕاندن و هەڵاویشتن بێ هیچ مەبەستێک. ‖ **تەسبێحی شامەقسوودیی:** جۆرێک تەسبێح کە لە بەردێکی تایبەتی سازی دەکەن و رەنگێکی زەردی ئاماڵ سەوزی هەیە. **تەسبێحی قەزوان:** تەسبێحێک کە لە

دەنکی قەزوان ساز کردبێ.

**تەسبێحات** (نا.)[عەر: تسبیحات کۆی: تەسبیح] سبحان الله کردن و ناوی خودا بردن. **~ کردن:** ناوی خودا بردن و سوبحان الله کوتن.

**تەسخیر** (نا. چا)[عەر: تسخیر] رام، دەستەمۆ. ؛؛ بە ئەفسوون و دوعا تەسخیری ئەو شۆخە چ ئیمکانە/ خەیاڵی خاوە عەنقا ناکەوێتە داوی ئەفسانە (مەحوی ل ٢٧٧). ٢ـ داگیر. **~ کوون:** ١ـ رام کردن، دەستەمۆ کردن. ٢ـ داگیر کردن، وە چنگ خستن، دەست بە سەر داگرتن.

**تەسدیق** (نا.)[عەر: تصدیق] ١ـ ئیزنی لێخورینی ماشێن و مەکینەی لێخورین. ٢ـ گەواهی تەواو کردنی پۆلی سەرەتایی یا ساڵی شەشەم لە کۆن دا (کوردستانی ئێران).

**تەسک** (ئان.)[باک: تەسک ـ ناو: تەسک] ١ـ چلۆنایەتی هەر شتێک کە بەرفرەوان نەبێ و پانایی کەم بێ، کەمبەر. ٢ـ تەنگ.

**تەسک و ترووسک** (ئان. ل)[تەسک + و + ترووسک] زۆر تەسک.

**تەسکەرە** (نا.)[عەر: تذکرة] بڕ:

**تەسکین** (نا. چا)[عەر: تسکین] ئارام بوون، سووکنایی. **~ هاتن:** سوکنایی هاتن، ئارام بوونەوە. **~ بە هیچ نەهاتن:** سوکنایی بە هیچ شتێک و کەسێک نەهاتن، زۆر نائارام بوون. ؛؛ لەباتی خوێنی خۆم وەک زولفی، تەسکینم بە هیچ نایە/ مەگەر دەستی شکستەی خۆم لە گەردنی زەردی وەربێنم (وەفایی ل ٦٧).

**تەسلیم** (نا. چا)[عەر: تسلیم] ١ـ مل دان بە حوکمی کەسێک، قەبووڵ کردن. ٢ـ خۆ بە دەستەوە دان. ٣ـ تەحویل. **~ بوون:** ١ـ مل دان بە حوکمی کەسێک، لە ئاکام قەبووڵ کردن. ٢ـ خۆ بە دەستەوە دان بە دوژمن. ٣ـ خۆ لە ئیختیار کەسێک نان. **~ بە خاک کردن:** دە قەبر نان، تەحویلی خاک دان، ناشتن. **~ کوون:** ١ـ شتێک دانە دەست کەسێک، تەحویل دان. ؛؛ نامە و ئامانەتەکەی باوکی تەسلیمی مامی کرد و گەڕاوە. ٢ـ دانە دەست دوژمن، کەسێک تەحویلی دوژمن دان. **~ کردنەوە:** تەحویل دانەوە، دانەوە دەست.

**تەسویر** (نا. چا)[عەر: تصویر] ١ـ

وێنە و نەقــشــی کــێــشــراوە. ٢ـ وێنە، عـەکس، ڕەسم. ⁞⁞ لە دڵما نـەقشی ناوی تۆ لە دیدەم بەژن و باڵاکەت/ کە دیم ئەم ڕەسم و تەسویرە چ ئیحتیاجم بە بینینە (ئەحمەد موختار ل ٧٠).

**تەســوو** (نا.)[عــەر: طسـوج لە پەھ: تەسـۆم، تەسـوم] ١ـ چارەگ، بـەشـێک لە چـوار بەش، چـوار یـەک. ٢ـ یـەکــەیەکـی کێشانە بەرابەر دەگەڵ چارەگە دانگێک.

**تـەســــە** (نا.)[بـڕ: تاس، تـەشـت] ١ـ تەبـەکی نان، تـەبەق، نانـدێن. ⁞⁞ تەســەی پڕ ئاشتیی ماڵە (پەند ل ١٥٩). ٢ـ [هەو] تەشتی هەویر شێلان، دۆڵە. & تەس

**تەسەڵ** (ئان.)[؟] تێر، تێر.نان. **~ بوون:** تێر بوون. **~ کوون:** تێر کردن.

**تەشــاوی** (نا. ل)[تـەشــە؟ + ئاوی؟] [ئەر] کــونـی دیوار و بـان بۆ ڕووناکی و دەرچوونی دووکـەڵ، کولانـە، کوناوەجـە، تەشە.

**تەشــبی** (نا.)[ئەر] ١ـ بـڕ: تەشـپی ٢ـ بڕ: تەبەقەتڕانە

**تەشــــبی تڕانە** (نا. ل)[تـەشــــبی (تـەشــــــپی) + تـڕ + ئانـە][ئـەر] بـڕ: تەبەقەتڕانە

**تەشپی** (نا.)[هس: تەشت] ١ـ دەوری پـەلی چێــویی. ٢ـ تـەبـەکی چێــویی یا کانزا.& تەشبی، تەپسی.

**تەشپی تڕانە** (نا. ل)[تەشپی + تڕ + ئانە] بڕ: تەبەقەتڕانە

**تەشپی تڕێن** (ئان. ل)[تەشپی + تڕێن (تڕاندن)](کنـ.) کەسێک کە زۆر دەخوا، زۆرخۆر

**تەشپیلۆکە** (نا. ل)[تەشپی + لۆکە] تەشپی بچووک، تەشپیلە.

**تەشپیلە** (نا. ل)[تەشپی + لە] تەشپی بچووک، تەشپیلۆکە.

**تەشت** (نا.)[ئەو: تـەشـــتـــە ـ پـەھ: تەشت، تیشت. باک: تەشت ـ ناو: تەشت ـ هـەو: تەشت، تـەشـــتـــە ـ زا: تەشت] دەفرێکی گەورە و خڕ و هەندێک قووڵی تەنەکە یا پلاستیکی کە پتر بۆ شت تێدا شووشتن کەلکی لێوەردەگرن.

**تەشتۆلکە** (نا. ل)[تەشت + ئۆلکە] تەشتی چکۆڵە، تەشتەلۆکە، تەشتوولکە.

**تەشتوولکە** (نا. ل)[تەشت + ئوولکە] تەشتی چکۆڵە، تەشتەلۆکە.

**تەشتارە** (نا.)[بڕ: چێشت][زا] نیوەڕۆ

**تەشتە** (نا.)[هەو] بڕ: تەشت

**تەشتـەلۆکـە** (نا. ل)[تەشت + ئە + لۆکە] تەشتی چکۆڵە، تەشتوولکە.

**تەشـــتی** (نا.)[بڕ: چێـــشت][زا] چێشتی نیوەڕۆ، نەهار.

**تەشخەڵە** (نا.) بڕ: تەشقەڵە

**تەشریف** (نا. چا)[عەر: تشریف] ١ـ ڕێز و شەڕەف دانان، گەورەیی کردن. ٢ـ وشـەی ڕێز بۆ هەرکـەسـێکی ڕێزدار و مەزن و دەستەڵاتدار. ፨ ئاغا تەشریفیان لە خەو هەستا. شێخ تەشریفی هەڵستا، ڕۆیشتەوە بۆ ماڵ. **~ بردن:** ڕۆیشتنی کەسێکی گەورە و بەڕێز. **~ هێنان:** هاتنی کەسێکی مەزن و بەڕێز.

**تـەشـق**[1] (نـا.)[بـڕ: تـەشـک] پەڕپەڕۆچکە، تەشک. ‖ **تەشقی ئاسمان:** بڕ: تەشکی ئاسمان.

**تەشق**[2] (نا.)[؟][ناو: تەشک، تەشق، تەوشق، تەوشک] تەوژم و هێزی سەرما، توندوتیـــژیی هـەوا. **~ شکان:** دابەزینی پلەی سەرما و بەرەو گەرمی چوون. **~ ی ئەرز (عەرز) و ئاسمان شکان:** دابەزینی تەوژمی سـەرمـای زسـتـان دوای چلەکـان و بەرە بەرە گەرمتر بوون.

**تەشـقـەڵە** (نا.)[؟] شـڵـتـاغ، دەبـبـە، گێچـەڵ، گەڕ و فێڵ، قەرقەشە. **~ پێکردن:** شڵتاغ بە کەسێک فرۆشتن، هات و هەرا ساز کردنی بە درۆ، گێچەڵ ساز کردن بۆ کەسێک. **~ساز کردن:** گێچەڵ ساز کردن، هات و هەرا پێک هێنان. **~ کـردن:** گـەڕ و فـێڵ دەرهێنان، شڵتاغ کردن.

**تەشقەڵەباز** (ئان. فا)[تەشقەڵە + باز4] کەسێک کە دەببە دەردێنێ و هات و هەرا ساز دەکا، گێچەڵ فرۆش، شڵتاغباز. **~بوون:** شڵتاغباز بوون.

**تەشقەڵەبازیی** (حم.)[تەشقڵەباز + ئیی] کاری تەشقەڵەباز، شڵتاغبازیی، تەشقەڵەباز بوون.

**تـەشـک**[1] (نـا.)[پـەھ: تەشکەنەک، تەشکووک] ١ـ داوێن، بەر داوێن. ٢ـ [باک] لاق، لەتەر. ٣ـ [ئەر] ریخت، قەلافەت، قەوارە. ፨ بەدتەشک. ٤ـ پەڕپەڕۆچکە، تەشق، تاق ‖ **تەشکی ئاسمان:** بنەبانی ئاسمان، پەڕپەڕۆچکەی ئاسمان، تەشقی ئاسمان، تاقی ئاسمان. ፨ ئەوجار هەستەوە بڕۆ بەرەو ژوور/ مەوێستە هەتا تەشکی ئاسمان (تاریک و ڕوون ل ١١٨).

**تەشک**[2] (نا.) بڕ: تەشق2

**تەشک و داوێن** (نا. ل)[تەشک + و + داوێن] داوێن، سەر و خواری داوێن. ⁙ ئاو چۆڕچۆڕ لە تەشک و داوێنیان دەتکێ (هاوارەبەرە ل ٥٩).

**تەشکبەرە** (نا. ل)[تەشک + ئە + بەرە] بەرەی درێژووکە.

**تەشکیلات** (نا.)[عەر: تشکیلات] یانە و سازمانی دامەزێنراو بۆ بەڕێوە بردنی ئەرک و کارێک کە کۆمەڵێکی بۆ تەرخان کراوە.

**تەشنە** (ئان.) ١- [هەو] بڕ: تینوو. ٢- [فار: تشنە][کلاسیک] تینوو، تونی. ⁙ خاڵی سەر چاهی زەنەخدانت چ شیرینە دەڵێی/ هیندوێکی تەشنەیی جۆیایی ئابی زەمزەمە (وەفایی ل ١٣٧).

**تەشوو** (نا.) بڕ: تەشوێ

**تەشووێ** (نا.)[هیک: تەکش ـ ئەو: تەشە ـ هەخ: تەشەنە ـ پەه: تیشەک، تێش. روس: teslo. باک: تەفشۆ، تەفشوو، تەڤشۆ ـ ناو: تەشوو، تەشوێ، تەپشوو، تەمشوو، تەمشوێ، تەوشوو، تەوشوێ، ترشتە، ترێشتە ـ هەو: تریشتە] ئامرازێکە وەکوو چەکووچ بەڵام دمی پان و تیژە و نەجار بۆ دارتاشین کەلکی لێوەردەگرن.

**تێبینی:** تەشوێ و هاوڕیشەکانی لە رەگی چاوگی تاشین کەوتوون.

**تەشە** [1] (نا.)[؟][ئەر] کوناوەجە، کولانە، تەشاوی.

**تەشە** [2] (نا.)[؟][باک] بیچم، شکڵ، شوبار، تەرح و دیدار.

**تەشەر** (نا.)[لوڕ: تەشەر. فار: تەشەر ـ بیر: تەشەر. ناو: تەشەر ـ هەو: تەشەرە] قسەی بە توێکڵ، تەوس، تانە، توانج. **~ لێدان:** قسەیەکی بە توێکل بە کەسێک کوتن بۆ وە بیر هێنانەوەی کار و کردەوەیەکی نابەجێ، تانە لێدان، تەشەر هاویشتن. **~ هاویشتن:** بڕ: تەشەر لێدان.

**تەشەرە** (نا.)[هەو] بڕ: تەشەر

**تەشەککور** (نا. چا.)[عەر: تشکر] سپاس، مەمنوون. **~ کردن:** سپاس کردن، مەمنوون بوون. **~ لێکردن:** سپاس لێکردن، لێ مەمنوون بوون.

**تەشەن** (ئان.) بڕ: تەشەنا. **~ کردن:** بڕ: تەشەنا کردن. ⁙ دڵی من کون کونی ئەو نەشتەرەیە/ تەشەنی کردوە جەرگم دێشێ (حەقیقی ل ١٨٠). **~ هێنانەوە:** سەر هەڵدانەوەی برین، تەشەنا بوونەوە.

:: قسە ناخۆشە وەکوو جێگای دەمی مار پاشی حەو ساڵان لە پیاوی دێنێتەوە تەشەنێ (لاس و خەزاڵ ل ٩٠) جێ دەمی مار پاش حەوت ساڵان تەشەنی هێناوە (مێر و وەفا ل ٧١). **لە ～ دابوون:** برین و ناسۆرێک کە چاک نەبووبێتە و تەشەنا بێنێتەوە. :: من بەبێ تۆ کە دەپرسی چۆنم/ لە تەشەن دایە برینی کۆنم (بۆ کوردستان ل ١١٨).

**تەشەندار** (ئان. فا)[تەشەن + دار2] حاڵی برینی کەسێک کە تەشەنا بکا. :: ئەوە تیرێکی لە گرێی پشتی من داوە/ .../ دەنا ئەو تیرە تەشەندارە، جەرگم پڕ دەکا لە خوێن و زووخاوە (شۆڕمەحموود ل ٦٧)

**تەشەنا** (ئان.)[باک: تەشەنە ـ ناو: تەشەنا، تەشەنە، تەشەن ـ هەو: تەشەنە] کێم و زووخاوی کۆنەبرین و ناسۆر و کوان. **～ بوونەوە:** ١ـ سەرهەڵدانەوەی برین و ناسۆر دوای چاک بوونەوە. :: تەشەنا بۆتەوە ناسۆری دەروونم دیسان/ زامی کۆنە و بە مەی کۆنی دەبێ مەڵهەم کەم (هێمن ؟) ٢ـ پەرە گرتن و زیاد بوون و سەرهەڵدانەوەی کوان و زیپکە. & تەشەنە بوونەوە، تەشەن هێنانەوە. **～ کردن:** ١ـ سەرهەڵدانەوەی برین و ناسۆر. ٢ـ سەرهەڵدانەوەی کوان و زیپکە. & تەشەنە کردن.

**تەشەنە** (ئان.) بڕ: تەشەنا. **～ بوونەوە:** بڕ: تەشەنا بوونەوە. **～ کردن:** بڕ: تەشەنا کردن.

**تەشی** (نا.)[باک: تەشی ـ ناو: تەشی] ئامرازێکی ساکاری بەن و ریس ساز کردنە لە خوری و شتی لەم بابەتە کە لە چێو ساز دەکردرێ. تەشی سەرێکی خڕ و کلکێکی باریکی هەیە کە کلکەکەی بە رانەوە دەنێن و بای دەدەن و بەمجۆرە هەوداکانی خوری دەڕێسرێن، لەتەرە. **～ رێستن (رستن):** رستنی خوری بە تەشی بۆ ساز کردنی رێس. **～ لە بەر کەسێک رێستن (رستن):** (کن.) خۆ نواندن و ماستاو کردن لە ئاست کەسێک، کلکەسووتە کردن، مەرایی کردن. :: راستە ئەویش وەک هەموو دەستوپێوەندی شایان ریاییباز و درۆزن بوە و زۆری تەشی لەبەر شاعەبباسی رستوە و بە بەژن و باڵای ئەو شا بەدفەڕ و خوێنڕێژەی هەڵگوتوە... (دمدم ل ٧).

**تێبینی:** تەشی لە چاوگی ئەوێستایی

تەش و تاشینی کوردیی کەوتوە.

**تەشیرێس** (ئان. فا)[تەشی + رێس لە: تەشی رێستن] ١ـ ژنێک کە تەشی دەڕێسێ. ٢ـ (کنـ.) ریاکار، زمانلووس، ماستاوکەر.

**تەشیرێسک** (گیانـ.)[تەشیرێس + ک][باک] بڕ: هەلەکە

**تەشیرێسیی** (حم.)[تەشیرێس + ئیی] ١ـ کاری تەشی رێستن. ٢ـ (کنـ.) ریایی، زمانلووسیی.

**تەشیلۆک** (گیانـ.)[باک] بڕ: هەلەکە

**تەشیلە** (نا. ل)[تەشی + لە] ١ـ غەرغەرە یا خولخولەیەکی دارینە کە ماشەری لە سەر هەڵدەکەن و دەیکەنە گلۆڵە. ٢ـ لۆکە یا خوری رێسراو کە لە دووخ داماڵرابێ.

**تەشیهەڵکەر** (نا. ل)[تەشی + هەڵکەر (هەڵکردن)] ئامێرێکە کە لە دار یا شتی دیکە سازی دەکەن و ریسی لە سەر هەڵدەکەن.

**تەعاروف** (نا. چا)[عەر: تعارف] ١ـ ناسیاوی، ناساندن. ٢ـ قسە و کرداری رێزدارانە. ٣ـ بەش دان و دانە دەست و پێشکەش بە رێزەوە. ٣ـ دەربڕینی ناچارانە لە بەر رێز و داب و نەریت. **پێ ~ کردن:** درێژ کردن و دانە دەستی شتێک بە کەسێک بە رێز و حورمەتەوە. **~ کردن:** ١ـ بە راست نەبوون و جیددی نەبوونی بابەت و مەسەلەیەک کە لەبەر رێز دەردەبردرێ. ⸬ ئەوەی کە دەڵێی وەرن و میوانم بن، تەعاروف دەکەی دەزانم ئیمکاناتت نیە!. تەعاروف ناکەم بە راستییمە. ٢ـ پێشکەش کردن، دانە دەست بە رێزەوە، پێ تەعاروف کردن. ⸬ سیگارێکی تەعاروف کرد. ٣ـ ناساندن، پێناساندن، یەکتر ناسین. **لە ~ دەرچوون:** تەعاروف نەکردن، شەرم نەکردن و راستیی دەربڕین، تەعاروف وەلانان. ⸬ لە تەعاروف دەرچێ دەتوانی خەرجی ئەم میوانییە بدەی یا من یارمەتیت بدەم.

**تەعاروفات** (نا.)[عەر: تعارفات کۆی: تعارف] کۆمەڵە کردار و قسەیەک کە زۆر جیددی نەبن و لەبەر رێز و داب و نەریت دەربڕدرێن. ⸬ ئەو تەعاروفاتە وەلا بنێ خۆ من بێگانە نیم.

**تەعاروفیی** (ئان. ل)[تەعاروف + ئیی] حاڵی کەسێک کە لە پێوەندی دا زۆر پابەندی تەعاروف کردنە. **~ بوون:** پابەندی تەعاروف بوون. ⸬ من

پیاوێکی تەعاروفی نیم ئەوەی دەیڵێم و دەمەوێ قسەی دڵمە.

**تەعام** (نا.)[عەر: طعام] چێشت، خۆراک، خواردەمەنی. ~ **کردن:** ١ـ خواردن. ٢ـ چێژتن، تام کردن.

**تەعریف** (نا. چا) بڕ: تاریف

**تەعزیم** (نا. چا)[عەر: تعظیم] ١ـ بە گەورە دانان، گەورە گرتن. ٢ـ کڕنۆش. ~ **کردن:** ١ـ بە گەورە دانان، ڕێزی گەورەیی گرتن. ٢ـ داهاتنەوە، کڕنۆش بردن بۆ گەورەپیاوان.

**تەعل** (ئان.)[باک] بڕ: تاڵ

**تەعلیم** (نا. چا)[عەر: تعلیم] پەروەردە، بار، تەربیەت. ~ **دان:** فێر کردن و ڕاهێنان، بار هێنان، تەربیەت کردن، عاملاندن.

**تەعنە** (نا.)[عەر: طعنة] بڕ: تانە1

**تەعویز** (نا.)[عەر: تعویذ] دوعای نووسراوە و پێچراوە کە دە ملی دەکەن یا لە باسکی دەبەستن، نوشتە، نیشتوو.

**تەعویزبەند** (نا. ل)[تەعویز + بەند/٦] بەنی بەستنی نوشتە. ⁂ تەعویزبەند ریشەی دڵەی سەد پارەم/ بەرگش پەڕەی جەرگ وە دەرد ئاوارەم (مەولەوی ل ٢٣٢).

**تەعەددا** (نا. چا)[عەر: تعدی] دەستدرێژیی، زوڵم و ناهەقیی. ~ **لێکردن:** زوڵم لێکردن، دەستدرێژیی لە کەسێک کردن.

**تەعەسسوب** (نا. چا)[عەر: تعصب] ١ـ لاینگریی و بڕوای توند و تیژی بەبێ لێکدانەوە سەبارەت بە باوەڕ و مەسەلەیەک. ٢ـ توند و تیژیی، سەختگیریی.

**تەغار** (نا.)[تور: طغار] یەکەیەکی کێشان یا پێوانی دەغڵ و دانە کە لە هەر ناوچەی ئەندازە و ڕادەکەی فەرقی هەیە (بە پێی یاسای غازان خانی مەغوول بەرابەری دە کیلۆ) لە موکریان بەرابەرە دەگەڵ چوار پووت یا چوار تەنەکە کە دەبێتە ٦٤ کیلۆ، و لە کوردستانی عێراق ٦٤ تەنەکەیە، تەخار.

**تێبینی:** فەرهەنگی خاڵ و فەرهەنگی کشت و کاڵ ئەم ڕادەیەیان بە سی ڕبە نووسیوە. کتێبی فۆلکلۆری هۆنراوەکانی کوردەواری بە چل ڕبەی نووسیوە، فەرهەنگی مەردووخ بە سی مەن ـ ی داناوە، لە فەرهەنگی وەهبی دا ئەم ڕادەیە بە دوو تۆن (٢٠٠٠ کیلۆ)

نووسراوه.

**تەغــاراو** (نا. ل)[تەغـار + ئاو1] ١ـ دەفرێکی گڵێنەی زلی سـەر ئاوەڵە بۆ ئاو تێکردن. ٢ـ دەفـرێکە کـە پینەچی ئاوی تێدەکەن و چەرمی تێدا دەخووسێنن. & تەخاراو.

**تەغــەلوب** (نا. چا)[عـەر: تقلب] ١ـ ناڕاسـتیی، دەغـەڵیی. ٢ـ نووسـراوەیەک کە خوێندکار لە کاتی ئیمتـەحان بە دزی سـەیری دەکـا و لە رووی دەنووسێـتەوە. ٣ـ هـەر چەشنە کەلک وەرگرتنێکی ناڕەوا و ئیـــزن پێنـەدراو لـە تاقی کــردنـەوە و مــەســـەلەی دیکە دا. **~ کـردن:** ١ـ لە رووی کـەسـێکی دیکە نووسـینـەوە یان کـەلک وەرگـرتن لە نووسـراوەی دیکە لە کـاتی ئیمـتـەحـان دا. ٢ـ لە رووی کـاری کــەســێکی دیکە کــاری خــۆ نـواندن و نیـشـان دان، ناڕاسـتی لە نیـشـاندنی کاری خۆ.

**تەغـەلوبیی** (حم.)[تەغـەلوب + ئیی] جنس و کـەرەسـەیەک کـە ئەسڵ نـەبێ، قەڵب.

**تەف** (نا.)[؟] لە ســـەر بـاری لـووس چەقینی جگ، شەگگە.

**تەفـاوەت** (نا. چا)[عـەر: تفـاوت] ١ـ فـەرق، جـیـاوازیی. ٢ـ لێک جـیـا و لێک دوور، جـیــاواز. **~ کــردن:** فـــەرق کـــردن. **~ هەبوون:** فـــەرق هەبـوون، جیاواز بوون.

**تەفت** (نـا.)[؟][ئـەر] ســـەوەتەیـەکی چێویی کە میوەی تێدەکەن.

**تەفتیش** (نا. چا)[عەر: تفتیش] کاری پشکنین و گەڕان. **~ کردن:** گەڕان، بە وردی پشکنین.

**تەفــتــیک** (نا.)[تور: tiftik][باک] مووی نەرمی بزنە مەرەز، تفتک.

**تەفـر و توونا** (نا. ل)[تـەفـر؟ + و + توونا] ١ـ نـابـوود، فـەوتـاو، فـەنـا. ٢ـ لێک بــڵاو، دەربـــەدەر و ئــاوارە. & تــەرت و توونـا. **~ بوون:** ١ـ فـــەوتـان، نابـوود بـوون. ٢ـ دەربـەدەر و ئـاوارە بـوون، لێک بڵاو بوون. **~ کردن:** ١ـ نابوود کـردن، فەوتاندن. ٢ـ دەربەدەر و ئاوارە کردن.

**تەفـره** (نا.)[عـەر: تفـرة] ١ـ فـریو. ٢ـ حـەواله بە گەواڵە. **~ پێخواردن:** فریو خواردن، هەڵخەڵەتان، تەفره خواردن. ⁂ گەر لە دنیـا چاکەیێ سادر بـوو تەفرەی پێ نەخـۆی/ رووسپی هـەر رووڕەشـە گەر بێ ســەد ئـازایی بکـا (مــەحـوی ل ١٧). **~ خـــــواردن:** فـــــریـو خـــــواردن،

هەڵخـەڵەتان. ~ **دان:** ١ـ فـریو دان، هـەڵخـەڵەتاندن. ٢ـ هـێنان و بردنـی کـەسـێک و حـەواڵە بە گـەواڵە کـردن بۆ ئـەنجـام نـەدانی کـارێک، بێنە و بـەرە پێکردن بە کەسێک. ~ **ڕۆیشتن:** لە ژێر باری پرسـیـار و ئەرکـێک خـۆ دەرباز کـردن، لە بن دەرچوون و وڵام نەدانەوەی سەرڕاست.

**تەفسیر** (نا.)[عەر: تفسیر] ١ـ بەیان، شـی. ٢ـ لێکدانەوە و شـی کـردنـەوەی قـورئان. ~ **کـردن:** شی کـردنـەوە، لێکدانەوە.

**تەفشۆ** (نا.)[باک] بڕ: تەشوێ

**تەفشوو** (نا.)[باک] بڕ: تەشوێ

**تەڤ** (ئاک.)[؟][باک] ١ـ گـشت، هەمـوو، تەواوەتی. ٢ـ دەگـەڵ، لەگـەڵ، تێکڕا.

**تەڤتی** (نا.)[؟][باک: تەڤتی، دەڤتی] بڕ: نشاستە

**تەڤر** (نا.)[باک] بڕ: تەور

**تەڤرداس** (نا. ل)[تەڤر + داس][باک] بڕ: تەورداس

**تەڤـرزین** (نا. ل)[تەڤـر + زین][باک] بڕ: تەورزین

**تەڤرک** (گیا.)[تەڤر (تڤر) + ک][باک] بڕ: توور2

**تەڤز** (نا.)[باک] بڕ: تەز

**تەڤزاندن** (چا. م)[باک] بڕ: تەزاندن

**تەڤزین** (چا. ل)[باک] بڕ: تەزین

**تەڤشۆ** (نا.)[باک] بڕ: تەشوێ

**تەڤن** (نا.)[باک] بڕ: تەون

**تەڤەر** (ئاک.)[زا] بڕ: تەبەر

**تەڤنک** (نا. ل)[تەڤن + ک][باک] بڕ: تەونۆکە

**تەق**1 (وشـد.) دەنگی تەقـە. ~ **کـردن:** دیق کـردن، تەقـین، شـەق بردن لە داخان.

**تەق**2 (ئان.) بڕ: تاک.

**تەقا** (ئام.) وتەیەکە بۆ دەربڕینی شک و دوودڵـیی و تـرس لـە مـەسـەلـە و مـەبەسـتێک، بەڵکە، بەشکەم، ئەوەهات، تەقـوو. :: ئەو هەمـوو پـارەی بۆ لە سـەر ئەم دوکانە دانێم تەقا سەری نەگرت.

**تەقـاعـود** (نا. چا)[عـەر: تقـاعـد] ١ـ کەسێک کە لە پیریی، نەخۆشیی یا هەر هۆی دیکە لە کار کردن ئازاد دەکرێ و پارەیـەکی دیـارییکـراوی بۆ دەبـڕنـەوە،

تەقاوییت، بازنیشـەستـە. **~ بوون:** لە کـــار ئازاد بـوون و پـارەی تەقـــاعـــود وەرگرتن، بازنیشەستە بوون.

**تەقـــاندن** (چا. م)[باک: پـەقـــاندن، تـەقـــاندن ـ نـاو: تەقـــاندن، تۆقـــاندن، ترەقـاندن ـ هەو: تەقنای] ١ـ تۆقـانـدنی تەقەمەنی. ٢ـ گوللە هاویشتن بە چەک.

**تەقاندنەوە** (چا. م)[تەقاندن + ئەوە] ١ـ تەقـاندنی بـۆمب و چەکـەمـەنی. ٢ـ لە کەو و بێـژینگ دانی دەغڵ و دانەوێڵـە بۆ جـیـا کـردنەوەی بـەرد و شـتـی زێدە. ٣ـ گـــەڕان و پشکنینـی زۆر. ✿ دونیـــام تـەقـــاندەوە بـەڵام ئـەوەی دەمـــەویست نەمدیتەوە.

**تەقاوی** (نا. چا)[عەر: تقاوی] دەست گرتن و پارە دان بە کرێکار و کارەکەر بەر لە حـەقـدەست ومـووچە وەرگـرتن، دەسوام.

**تەقاوییت** (نا. چا)[عەر: تقاعد] بڕ: تەقاعود

**تەقـتەقـە بەرد** (نا. ل)[تەق + تەقە + بەرد] کـۆمـــەڵە بـەردێکی لێک و لـووسی کێو کـە بە سـانایی لێک جـیـا دەبنەوە و دەوەرن.

**تەقتەقیلە** (نا. ل)[تەق + تەق + ئیلە] کەوشـی چێو یا پلاسـتیک کە تەنیا سـەر پەنجـەکـان دەگـرێ و لە کـاتی ڕۆیشتن تەقەی دێ، سەرپایی.

**تەقـتـیـر** (نا. چا)[عـەر: تقطیـر] بڕ: تەقـــتـیـــر کـــردن. **~ کـــردن:** جـــوێ کردنەوەی مادەیەکی شیاوی جیا بوونەوە لە مـادەیەکی دیکە بە شـێوەی کوڵاندن و تین دان وەک جوێ کردنەوەی ئاوەکییە لە ئاو بۆ خەستتر کردن.

**تەقـدیر** (نا.)[عـەر: تقـدیر] قـەدەری خـــودا، بـەش، چارەنووس. || **تەقـــدیری خـودا(ی):** قـەدەر و چارەنووسـێک کـە خودا دیاری کردوە. ✿ نەمزانی تەقدیری خـودای تەگـبـیـری عـەبدی بەتاڵ دەکـات (گەنج ل ٢٦٣).

**تەقرە** (وشد.)[سۆر] بڕ: تەقڵە

**تەقسیر** (نا.)[عەر: تقصیر] ١ـ خەتا، هەڵە. ٢ـ تاوان، سووچ ٣ـ کۆتایی، درێغ، سستی. **~ کردن:** ١ـ خەتا کردن، هەڵە کردن. ٢ـ تاوان کردن. ٣ـ کۆتایی کردن، سـسـتـی کـردن. ✿ با ڕەفـیـقـانم بکەن شـینم کـە وەقتی زارییـە/ قـەت مـەکـەن تەقسیر لە گریان، شیوەنم یەکجارییە (نالی ل ٥٨٣). **~ هەبوون:** ١ـ خـــەتا هەبوون. ٢ـ تاوانکار بوون.

**تەققە** (وشد.) بڕ: تەقە

**تەقلا** (نا.)[زا] بڕ: تەقڵە

**تەقلە** 1 (نا.) بڕ: تەقیلە

**تەقلە** 2 (نا.)[؟] بەری هەنجیر کە بە کاڵی هەڵدەوەرێ، باقۆ2.

**تەقلە** 3 (نا.)[باک] بڕ: تەقڵە

**تەقڵە** (نا.)[باک: تەقلە، تلقە ـ ناو: تەقڵە، تەقرە ـ هەو: تەقڵە ـ زا: تەقلا] ١ـ سەرمەقولات، دەکبووز، دەقەلووز، بالآنس. ٢ـ خۆ هەڵسووڕانەوەی کۆتر و باڵندەی دیکە لە ئاسمان دا. ⁂ قاسپەی کەو لە کێو، تەقڵەی باز لە دەشت/ تا کوردستان بێ لە کوێیە بەهەشت (بۆ کوردستان ل ٣٤). ٣ـ هەڵبەز هەڵبەزی بەردی پان لە سەر ئاو. ٤ـ هەڵبەز هەڵبەزی هەلووک و شتی لەم بابەتە لە سەر زەوی. ٥ـ دارێکی سووک کە سوارکار لە جلیتێن دا بە سواری دیکەی دادەدا، دارتەقڵە، دارجلیت، جلیت، جریت. ٦ـ هەلینگ، غار، تەقڵەکوت. ~ **لێدان:** ١ـ سەرمەقولات لێدان، بالآنس لێدان. ٢ـ پشت و روو بوونەوەی باڵندە لە ئاسمان. ٣ـ هەڵبەزینەوە.

**تەقڵەباز** (ئان. فا)[تەقڵە + باز4] ١ـ کەسێک کە باش سەمەقولاتی لێبدا. ٢ـ کۆتر یا باڵندەیەک کە لە ئاسمان تەقڵەی لێدەدا.

**تەقڵەکوت** (ئان. فا)[تەقڵە + باز4] بە پڕتاو و هەڵبەز هەڵبەز ڕێ بڕین، هەڵەدا. ⁂ بە تەقڵەکوت خۆی گەیاندە من هەتا مزگێنیم لێوەرگرێ!

**تەقنای** (چا. م)[هەو] بڕ: تەقاندن

**تەقویم** (نا.)[عەر: تقویم] دەفتەرێک کە حسێبی ساڵ و مانگ و رۆژ و حەوتەکانی تێدایە، رۆژئەژمێر، رۆژژمێر.

**تەقوپۆق** (وشد.)[تەق1 + و + پۆق] [ئەر] بڕ: تەقوتۆق

**تەقوتوق** (وشد.)[تەق1 + و + توق] [زا] بڕ: تەقوتۆق

**تەقوتۆق** (وشد.)[تەق1 + و + تۆق2] [باک: تەقوتەق ـ ناو: تەقوتۆق، تەقوپۆق ـ زا: تەقوتوق] ١ـ دەنگی زۆر و بەربڵاوی تەقەتەق و تەقەمەنی. ٢ـ دەنگی وێک کەوتنی کۆمەڵە کەرەسەیەک کە تەقەیان دێ.

**تەقوتەق** (وشد.)[تەق1 + و + تەق1] [باک] بڕ: تەقوتۆق

**تەقوڕەق** (ئان. ل)[تەق1 + و + رەق] شوێن و جێگەیەکی رەق، رەقوتەق. ~

**بوون:** نەرم و خۆش نەبوون، ڕەقوتەق بوون، ڕەق بوون.

**تەقودەو** (نا. ل)[تەق + و + دەو][ئەر] بڕ: تەقوڕەو

**تەقوڕەو** (نا. ل)[تەق + و + ڕەو] ڕەوین و ڕاکردنی بە کۆمەڵ لە ترسان، تەقودەو، تەکودەو

**تێبینی:** تەق لە (تەقوڕەو و تەقودەو) دا و هەروەها تەک لە (تەکودەو) دا دەچنەوە سەر [ئەو: تەکە ـ پەھ: تەگ] بە مانای ڕەو و ڕا لە ڕیشەی ئەوێستایی تەک و تەچ بە مانای ڕاکردن و ڕەوین و هەڵاتن.

**تەقولەق** (ئان. ل)[تەق + و + لەق] ١ـ حاڵی شتێک لە سەر جێی خۆی قایم نەبێ و لەرزۆک و لەق بێ. ٢ـ (مجـ.) شوێن و جێگەیەک کە هاتوچۆی تەواوی لەسەر نەبێ، نیوە تەحتیل. ~ **بوون:** ١ـ سست و لەرزۆک بوون، نیوەقایم بوون. ٢ـ لە سەر نەزمی پێشوو نەبوون، نیوەتەحتیل بوون. ∷ نازانم چ خەبەر بوو ئەمڕۆ مەدرەسە تەقولەق بوو بەشێکی زۆر نەهاتبوونەوە.

**تەقوهۆڕ** (وشد.)[تەق + و + هۆڕ] دەنگی بەرز و زۆری تەقەتەق.

**تەقوو** (ئام.) ١ـ بڕ: تەقا. ٢ـ پەکوو، حەیف، مخابن.

**تەقە** (وشد.)[لۆر: تەقە ـ بیر: تەق ـ فار: تق. باک: تەق ـ ناو: تەق، تەقە، تەقەقە ـ هەو: تەق، تەقە ـ زا: تەق] ١ـ دەنگی چەک و تەقەمەنی. ∷ تەقەی تفەنگ، تەقەی تۆقەتۆقە. ٢ـ دەنگ وێک کەوتنی شتی ڕەق و سەخت. ∷ تەقەی ددان، تەقەی قاپ و کەوچک. ٣ـ دەنگی کوتانی دەرگا. ٤ـ دەنگی دەهۆڵ. ∷ کچی کابرای جیرانی خواست. بە تەقەی دەهۆڵ و زوڕنای گوێستێوە (گەنج ل ٢٧٢). ٥ـ شەڕە تفەنگ. ٦ـ (مجـ.) هەواڵ، خەبەر، دەنگۆ. ٧ـ (مجـ.) تەواو، خەلاس. ~ **بوون:** شەڕ بوون بە چەک. ~ **تێکەوتن:** ١ـ ڕاکردن و ڕەوینەوەی بە کۆمەڵی حەیوان لە ترسان. ٢ـ (کنـ.) نەمان و بڕانی شیر لە گوانی حەیوان. ∷ مانگاکەمان تەقەی تێکەوتوە و چی دیکە شیر نادا. ~ **داکەوتن:** (کنـ.) خەبەر و دەنگۆ بڵاو بوونەوە ~ **کردن:** ١ـ گولە هاویشتن. ٢ـ تەقەتەق کردن. ~ **لە بن هێنان:** (کنـ.) بڕ: تەقە لێهێنان. ~ **لە دەرگا هێنان:** لە دەرکە دان، دەرگا کوتان. ~ **لێبڕین:** (کنـ.) تەواو کردن و خلاس کردنی شتێک، تەقە

لێهێنان. ~ **لێکردن:** گولله بە کەسێکەوە نان. ~ **لێهێنان:** (کنـ.) ١ـ تەواو کردن و خلاس کردنی خواردن و شتی لەم بابەتەی نێو دەفر. :: هەتا تەقەی لە قابلەمە نەهێنا لە سەری هەڵنەستا! ٢ـ تەواو کردن و بە ئاکام گەیاندنی کارێک. & تەقە لە بن هێنان. ~ **وەستان:** وەستانی شەڕ. ~ **وەستاندن:** وەستاندنی شەڕ. ~ **ی سەر هاتن:** (کنـ.) تێنەگەیشتن، حاڵی نەبوون. :: من هەر چەند باسی فیزیکت بۆ بکەم تۆ تەقەی سەرت دێ.

**تەقەتەق** (وشد.)[تەقە + تەق][باک: تەق تەق ـ ناو: تەقەتەق] تەقەی زۆر، تەقەی یەک لە سەر یەک. ~ **کردن:** زۆر تەقە کردن، تەقە لە شت هێنان.

**تەقەفیرە** (نا. ل)[تەقە + فیڕ (فیڕاندن) + ئە][ئەر ـ هەو] زگ چوونی زۆر توندی مرۆڤ، بەلەفیرە، بەلەفیرێ، تووشقە.

**تەقەلا** (نا. چا) بڕ: تەقەللا

**تەقەللا** (نا. چا)[عەر: تقلی] هەوڵ، حەول، خەبات، سەعی، تەقەلا. ~ **دان:** هەوڵ دان، ماندوو بوون بە کارێکەوە. ~ **کردن:** هەوڵ دان، تێکۆشین، سەعی کردن.

**تەقەڵ** (نا. ل)[تەق + ئەڵ] هەرکام لە مەودا و شوێنی دروومان کە دەرزی بە جارێک چوونە ژوور و هاتنە دەر پێکیدێنێ، تەقەڵە. ~ **بەربوون:** لێک کرانەوە و هەڵوەشانەوەی تەقەڵەکانی درووماان، تەقەڵ هەڵپچڕان، تەقەڵ هەڵوەشانەوە. ~ **تێهەلدان:** بڕ: تەقەڵ لێدان. ~ **لە سەر یەک نەبوون:** (کنـ.) هۆش و بیر لە سەر خۆ نەبوون، هاوسەنگی نەبوون لە باری ڕەوانی و مێشکەوە، خەرفان، تەقەڵ لە سەرەخۆ نەبوون. ~ **لە سەرەخۆ نەبوون:** (کنـ.) بڕ: تەقەڵ لە سەر یەک نەبوون. ~ **لێدان:** درووونی پارچە و قوماش بە تەقەڵ، تەقەڵ تێهەڵدان. ~ **هەڵپچڕان:** لێک بوونەوە و پسانی تەقەڵ. ~ **هەڵوەشاندنەوە:** دەرهێنانی تەقەڵەکانی پارچە و قوماشی دوراو. ~ **هەڵوەشانەوە:** لێک کرانەوەی تەقەڵەکانی درووماان، تەقەڵ هەڵپچڕان، تەقەڵ بەربوون.

**تەقەڵ هەڵپچڕاو** (ئان. فا)[لە: تەقەڵ هەڵپچڕان](کنـ.) کەسێک باری ڕەوانی و مێشکی هاوسەنگی نەبێ.

**تەقەڵە** (نا. ل)[تەق + ئەڵە][هەو] بڕ: تەقەڵ

**تەقەمەنی** (نا. ل)[تەقە + مەنی] کۆمەڵە کەرەسەیەک کە بۆ چەک و تەقاندنەوە کەلکی لێوەردەگرن وەک فیشەک و بارووت و ...

**تەقیلە** (نا.)[عەر: طاقیة] کڵاوێکی چووکی کوون کوونە لە بەن و دەزوو دەیچنن و تەپڵی سەر دادەپۆشێ، ئارەقچن، تەقلە1.

**تەقین** (چا. ل)[باک: پەقین، تەقین ـ ناو: تەقین، تۆقین ـ هەو: تەقای] ١ـ دەنگی تەقە لە چەکەمەنی هەستان، تەقینەوە. ⁑ مینەکە تەقی. ٢ـ ترەکینی شتی هەڵمساوی وەک پزدان. ٣ـ هەڵمسان لە بەر زۆر خواردن. ٤ـ لێک بڵاو بوون و شکانی شتی رەقی وەک بەرد و هێلکە و شەوشە دە نێو ئاگر دا. ٥ـ قەڵشین و درز بردنی دەفری شووشەییو چینی لەبەر سەرما و گەرما. ٦ـ دەنگی ترازانی جومگە. ٧ـ بووژانەوەی کوێرەکانی و ئاو لێدەرکەوتنیان لە بەهار دا. ٨ـ شەق بردن لە داخان، تەق کردن، دیق کردن.

**تەقینەوە** (چا. ل)[تەقین + ئەوە] ١ـ تەقینی بۆمب و چەکەمەنی دیکە. ٢ـ (مجـ.) دەنگ دانەوە و بڵاو بوونەوەی دەسبەجێی هەواڵ و خەبەر بە هەموو لایەک دا.

**تەقیە** (نا. چا)[عەر: تقیة] ١ـ خۆ پارێزیی، پارێزگاریی. ٢ـ خۆپارێزیی لە بیر و رای خۆ دەربڕین لە مەترسی دا، درۆی بە ناچار. **~ کردن:** ١ـ خۆ پاراستن، خۆ دوور خستنەوە. ⁑ من راوی مامزان ناکەم تەقیەی دەکەم (سێسەد هۆنراوە ل ١٢٦). ٢ـ خۆ پاراستن لە راست کوتن لە کاتی مەترسی گیانیی دا.

**تەک**[1] (ئان.)[بڕ: تاک1] ١ـ تەنیا، بەتەنێ، تەک و تەنیا. ٢ـ بێ هاوتا، تاک، تاقانە. **~ بوون:** ١ـ بێهاوتا بوون، بێوێنە بوون، هاوتا نەبوون. ٢ـ تەنیا بوون، بەتەنێ بوون. **~ کەوتن:** بە تەنیا مانەوە، لە کۆمەڵ و کەس دوور کەوتنەوە.

**تەک**[2] (ئام.)[گیل: تەک (تەنیشت، کەلەکە) ناو: تەک ـ زا: تەک] دەگەڵ، لە گەڵ، لە تەک. ⁑ تەک تۆمە!

**تەک**[3] (نا.)[لۆر: تەک. ناو: تەک، تەیکە، تەیجە ـ هەو: تەیجە][ئەر]

جۆرێک سەوەتەی دەسچنە کە لە شووڵی ناسک دەیچنن، پەلە و بە قەرا مەجۆعەمەیەک گەورەیە کە بۆ پاڵاوتنی برنجی پلاو، شت لە سەر وشک کردن و کاروباری دیکە کەلکی لێوەردەگرن، سەلە، نانەشان.

**تەک**[4] (نا.)[بڕ: تەکە] پاڵ، تەکان، فشار. ~ **پێوە دان:** پاڵ پێوەنان. ~ **دان:** ١ـ پاڵ دان بە یەکەوە. ٢ـ پاڵ پێوەنان. ⁘ تەک دا تاریکی ئەو لای تەریکی/ ئاڵەم چەنی نوور کەرد هام شەریکی (مەولەوی ل ٢٤٥). ٣ـ لا چوون و ڕێ کردنەوە. ~ **دانە دواوە:** بەرەو پاش کشانەوە. ~ **دانە لاوە:** بەرەو لایەک کشانەوە.

**تەکان** (نا.)[لە: تەکاندن][پەش: تەکان ـ فار: تکان ـ تات: تەکون، تەچون ـ لۆر: تەکۆ. ناو: تەکان ـ هەو: تەکانە، تەکانی] ١ـ جوولە. ٢ـ پاڵ، بۆق. ٣ـ تەوژم. ~ **پێدان:** جوولە پێدان، تەکان دان، جوولاندنەوە. ~ **تێکەوتن:** جوولە تێکەوتن، وە جوولە کەوتن. ⁘ دوای سەعاتێک راوەستان ئەو سەفە تەکانێکی چووکی تێکەوت. ~ **خواردن:** جوولە کردن لە سەر جێی خۆ، جوولە تێکەوتن، وە جوولە کەوتن. ⁘ منداڵ دە نێو زگی دایک دا جاروبار تەکان دەخوا. ~ **دان:** ١ـ جوولاندنەوە. ٢ـ پاڵ پێوەنان. ٣ـ راتڵەکاندن، راوەشاندن. ⁘ شانی گرت و بە توورەیی تەکانی دا. ~ **دانە خۆ:** وە هەوڵ کەوتن بۆ بەرێوە بردن و ئەنجام دانی کارێک. ⁘ رۆڵە چەندە دەست لە سەر دەست دادەنێی، هەستە تەکانێک بدە خۆت و کارێک بدۆزەوە. ~ **نەخواردن:** نەجوولانەوە، هیچ نەکردن، هەروا مانەوە. ⁘ دوو مانگ لە ماڵ دانیشتم و تەکانم نەخوارد.

**تەکاندن** (چا. م)[فار: تکاندن ـ لۆر: تەکەنێ ـ بیر: تەکۆندەن ـ گیل: فەتەکانێن. باک: تەکاندن ـ ناو: تەکاندن، تەکانن ـ هەو: تەکنای] ١ـ راوەشاندن و راتڵەکاندنی رایەخ و جل و شتی لەم بابەتە بۆ جیا کردنەوە تۆز و خۆڵ. ٢ـ بە دەست و پتە لێکردنەوەی پەڵە و شتی وردە لە لەش و جل. ⁘ سەرت هێندێکی ئارد پێوەیە بتەکێنە با لێبێتەوە ٣ـ تەکان دان و راوەشاندنی دار و درەخت بۆ هەڵوەراندنی بەر و میوە.

**تەکانن** (چا. م)[ئەر] بڕ: تەکاندن

**تەکانە**[1] (ئان. ل)[تەک1 + ئان1 + ئە] [باک] بڕ: تاکانە

**تەکانە**[2] (نا.)[هەو] بڕ: تەکان

**تەکانی** (نا.)[هەو] بڕ: تەکان

**تەکپەڕان** (ئان. ل)[تەک1 + پەڕان] ژنێک کە جاروبار لێر و لەوێ (نەک بە هەموو کەس) بدا.

**تەکخاڵ** (نا. ل)[تەک1 + خاڵ2] پەڕی قومار و یاریی کە یەک خاڵی لە سەر بێ، تەکە.

**تەککوو** (ئام.) بڕ: پەککوو

**تەککە** (نا. ل)[تەک1 + ک + ئە] بڕ: تەکە2. **لە شا ~ هێنان:** (کنـ.) بڕ: لە شای تەکە هێنان.

**تەکلیف** (نا.)[عەر: تکلیف] ١ـ ئەمر و واجبێک کە دەبێ ئەنجام بدرێ. ٢ـ مەشق و دەرسێک کە دەدرێ بە خوێندکار هەتا لە ماڵ یا لە دەرەوەی فێرگە ئەنجامی بدا. ٣ـ ئەمر و مەسەلەگەلێک کە خودا لە سەر بەندەی فەرز کردوە. ٤ـ چلۆنایەتی وەزع و حاڵی کەسێک لە داهاتوو دا. ٥ـ مەسەلە و کارێک کە دەبێ لە سەری تەما بگرترێ و روون بکرێتەوە. **~ روون کردنەوە:** تەما گرتن لە سەر کار و مەسەلەیەک و داهتوو و چارەنووسی دیاریی کردن. ⸬ ئەو ماڵەی دەفرۆشین یا نا، تەکلیفم روون کەوە بزانم چ بکەم. **~ لە سەر دانان:** ئەمر و کارێک بە کەسێک سپاردن بۆ ئەنجام دانی. ٢ـ مەشق و دەرس دان بە خوێندکار بۆ ئەنجام دان و کار لە سەر کردنی. **~ هەبوون:** مەشق و دەرس هەبوون بۆ کار لە سەر کردن و ئەنجام دانی. ⸬ ئەمڕۆ تەکلیفم زۆرە ناتوانم دەر کەوم. **~ ی (کەسێک یا مەسەلەیەک) دیاری کردن :** دیاریی کردنی وەزع و حاڵی داهاتووی کەسێک. ⸬ تکایە تەکلیفی ئەو کچەمان روون کەوە دەتەوێ یان نا؟ تەکلیفی ئەو میراتە بە من روون ناکرێتەوە! & تەکلیف روون کردنەوە. **لە سەر ~ کردن:** واجب کردنی کارێک بۆ ئەنجام دانی.

**تەکمە** (نا.)[هس: تەکیمە] لبادە و جلێکی بالاپۆشی قۆڵداری رازاوەیە لە سەر جلەکانی دیکە وەک کەوا دەبەر دەکرێ کە هەتا سەر ئەژنۆ دەگا.

**تەکنۆلۆژی** (نا.)[فەر: technologie] زانستی تەکنیک و فەن و چلۆنایەتی کار پێکردن و ئیستفادە لێکردنیان.

**تەکنیک** (نا.)[فەر: technique] ١ـ توانایی و لێوەشاوەیی، فووت و فەن. ٢ـ فەن و شێوە کاری هونەرمەند. ٣ـ فەن و

کار پێکردن بە کەرەسەی فەننی.

**تەک و تووک** (ئان. ل)[تەک1 + و + تووک5] هەندێکی کەم لێر و لەوێ، چەند کەسێک. ‌‌:: تەک و تووک منداڵ هاتبوونەوە مەدرەسە. تەک و تووک لەبەرم هەستان. ٢ـ (ئاک. ل) چەند دانەیەک، هەندێک. :: چەند دارێک تەک و تووک، لێر و لەوێ رسکابوون. & تاق و لۆق، تاک و تووک، تاک و تەرا

**تەک و تەنیا** (ئان. ل)[تەک1 + و + تەنیا] تاک و تەنیا، بەتەنێ، تەنیا. :: تەک و تەنیا بە ئارامی دەچم بۆ گردەکەی بەر دێ (تاریک و روون ل ١١٦).

**تەکودەو** (نا. ل)[تەک + و + دەو] بڕ: تەقوڕەو

**تەکووز** (نا.)[؟][باک] کامل، تەواو و بێ کەمایەسی.

**تەکە**[1] (گیان.) بڕ: تەگە. **~ گرتن:** بڕ: تەگە گرتن.

**تەکە**[2] (نا. ل)[تەک1 + ئە] ناوی چوار پەڕی یاریی و قومار کە یەک خاڵی دڵ، گشنیز، خشت یا خاچ بێ، تەکخاڵ، تەککە. **لە شا ~ هێنان:** (کن.) زۆر سەرکەوتوو و بە بەخت و شانس. :: کەریم نەتەنیا ژنێکی خانەوادەی وەگیر کەوتوە ماڵ و سامانێکی زۆریشی پێبڕاوە لە شای تەکەی هێناوە.

**تەکە**[3] (نا.)[ئەو: تەکە ـ پەه: تەک] ١ـ پاڵ و زەخت بۆ جێ کردنەوە. ٢ـ جووڵە، لەز، تەکان و لەرەی شتی هەڵواسراو. **~ دان:** هەڵکشان و پاڵ دانی چەن کەسێک بۆ جێ کردنەوەی کەسێکی دیکە، تەکە کردن. **~کردن:** ١ـ بڕ: تەکە دان. ٢ـ جووڵانەوە و لەرانەوەی شتی هەڵواسراو. **~ هاتن:** جووڵانەوە، لەرانەوە.

**تێبینی:** تەکە لە ئەوێستا دا بە مانای ڕا، توند و تیژ لە ریشەی تەک بە مانای ڕاکردن کەوتوە. هەروەتر هەڵتەک ـ یش لە کوردیی دا هەر لەم ریشەیە.

**تەکەتەک** (نا. ل)[تەکە3 + تەک] جووڵە و لەرەی پەیتا پەیتا.

**تەکەڵتوو** (نا.)[؟] چەند قەد لباد کە لە ژێر قەڵتاغی زین دادەدنرێ، نەرمەزین، ئارەقگیر. **~ نەحەسانەوە:** (کن.) هەمیشە دەرگیر بوون و بە حەسانەوە نەگەیشتن، نەحەسانەوە.

**تێبینی:** لە فەرهەنگەکانی فارسی دا

تەکەلتوو (تکلتو) هەر بەو مانایە هاتوە.

**تەکەنمە** (نا.) بڕ: تەکیمە

**تەکیمە** (نا.)[؟] رایەخێکی چووکی یەک کەسییە لە لباد، تەکینمە، تەکەنمە.

**تەکینمە** (نا.) بڕ: تەکیمە

**تەکیە** [1] (نا.)[عەر: تکیة] شوێنێک کە دەروێش بۆ بەڕیوە بردنی ئاهەنگی خۆیان لێی کۆ دەبنەوە، خانەقا.

**تەکیە** [2] (نا.)[؟] سەکۆیەکی باریک بۆ لە سەر دانیشتن، خواجانە.

**تەکێن** (ر.)[لە: تەکاندن] بە ناوەوە دەلکێ و ناوی فاعلی ساز دەکا. ‹‹ تۆزتەکێن.

**تەگبیر** (نا. چا)[عەر: تدبیر] ١ـ ئاکام و چارەی کار، ڕێی چارە. ٢ـ مشوور. ~ **بۆ کردن:** ڕێی چارە و عیلاجی مەسەلەیەک بۆ کەسێک دیتنەوە. ‹‹ قەرزێکی زۆرم لە سەرە ئەگەر تەگبیرێکم بۆ نەکەن سەر و ماڵم تێدا دەچێ! ~ **بەتاڵ بوون:** بێ ئاکام بوونی مشوور و چارە. ~ **بەتاڵ کردن:** بێ ئاکام کردنی تەکبیر و چارە. ‹‹ نەمزانی تەقدیری خودای تەگبیری عەبدی بەتاڵ دەکات (گەنج ل ٢٦٣). ~**کردن:** ١ـ بیر کردنەوە و ئاکامی کارێک لەبەر چاو گرتن، ڕێی چارە و عیلاج دیتنەوە. ٢ـ مشوور کردن، را خواستن. ~ **کەیشتن:** ڕێی چارەیەکی باشتر هەبوون. ‹‹ ئەری ئەو قسەم تەگبیری دەگاتێ؟ ~**ویستن:** پێویست بە تەگبیر هەبوون، ڕێی چارە دوزینەوە.

**تەگبیرکەر** (ئان. فا)[لە: تەگبیر کردن] کەسێک کە بۆ چارەی کارێک بیر دەکاتەوە، کەسێک کە بۆ عیلاجی کار و مەسەلەیەک مشووری لێدەخوازن. ‹‹ ژنێک بوو لە قەدیمەوە هەم تایەن، هەم سەرسپی، هەم تەگبیرکەری خەزاڵ بوو. (لاس و خەزاڵ ل ٦٠).

**تەگە** (گیانـ.)[پەه: تەکەل. پەش: تکە ـ فار: تکە ـ بیر: تەککە. باک: تەکە، تەگە ـ ناو: تەکە، تەگە، تگە، تەژە، تەچە، تەجە] بزنی نێر کە پێشەنگی رانە، نێری/١، سابرێن، ساورێن، تەجەنەڕ. ~ **گرتن:** جووت بوونی بزن و تەگە، تگە گرتن، تەکە گرتن.

**تەگەر** (نا.)[ئین: tyre] ١ـ چەرخی خڕی دەوری مەکینە و ماشین کە بۆ لێخورین کەلکی لێوەردەگرن. ٢ـ لاستیکی دەوری چەرخ، تایر، تایە.

**تەگەرە** (نا.)[؟][ناو: تەوەرە، تەگەرە، تەمەرە] ١ـ گیر، چەت، کۆسپ، لەمپەر، بەرهەڵستی چوونە پێشی کار و مەسەلەیەک، تەوەرە، تەمەرە. ٢ـ [ئەر] میلە و دارێکی کە دەخرێتە نێو کونی سەر بەرداشی خوارەوە، کەوەرە، تەوەرە. ~ **تێخستن:** گیروگرفت ساز کردن و چەت تێخستن بۆ برێوە نەچوونی کار و مەسەلەیەک، تەگەرە لێدان. ~ **تێکەوتن:** تێکچوونی کار و مەسەلەیەک لە بەر گیروگرفت و چەت تێکەوتن. ~ **لێدان:** بڕ: تەگەرە تێخستن.

**تەل**[1] (نا.)[تور: tel][بڕ: تێل] ١ـ سیم، تێل. ٢ـ ژێی ئامێری مۆسیقا. :: تەلی کەمان، تەلی عوود.

**تەل**[2] (نا.) کورتکراوەی تەلەگراف.

**تەل**[3] (نا.)[باک] بڕ: تەڵە

**تەلا** (نا.)[عەر: طلا] زێڕ، تەڵا. ‖ **تەلای دەستەوشار:** ١ـ زێڕێک بوە (دووسەد مسقاڵ) لە خەزێنەی خوسرەو پەرویز پادشای ساسانی دا کە گۆیا وەک مێو نەرم بوە. ٢ـ (مجـ.) شتی زۆر بەنرخ و بێهاوتا. :: خانی ئەو تەلای دەستەوشار و ئەو گەنجە بەنرخ و بێ ئەژمارەی لە دەریای بیری هەراو و بەرینی خۆی کۆ کردۆتەوە (مەم و زین ل ٢٢٥). باڵات ببینم چون داری هەنار/ گەنجی باداوەر، تەلای دەستەوشار/ با بحەسێتەوە فەقیر و هەژار (بارام و گوڵندام ل ٦٩).

**تەلار** (نا.) بڕ: تالار

**تەلاش** (نا.)[باک] بڕ: تەڵاش

**تەلاشە** (نا.)[زا] بڕ: تەڵاش

**تەلان** (نا.)[هس: تەڵان] ١ـ کێو، بەندەن، بەرزایی. ٢ـ بڕ: تەڵان

**تەلایە** (نا.)[عەر: طلایع](نز.) کۆمەڵێک سەرباز یا سوار لە پێشەوەی لەشکر کە بۆ چلۆنایەتی و هەڵسەنگاندنی هێزی دوژمن دەنێردرێن، پێشەنگ.

**تەلایەچی** (ئان. ل)[تەلایە + چی] ١ـ سەرۆکی تەلایە. ٢ـ ئەو کەسانەی کە لە تەلایە دان. :: تەلایەچی جاڕیان کێشا: ئەی کۆمەگی گەورە، ئەی موسڵمانان (بارام و گوڵندام ل ١٠٦). & تەلایەدار

**تەلایەدار** (ئان. فا)[تەلایە + دار2] بڕ: تەلایەچی

**تەلبەند** (نا. ل)[تەل1/١ + بەند] شوێنێک کە پەرژینی بە تەلی دڕکاویی

لێدرابێ.

**تەلچی** (ئان. ل)[تەل2 + چی] بڕ: تەلەگرافچی

**تەلخانە** (نا. ل)[تەل2 + خانە] بڕ: تەلەگرافخانە

**تەلسز** (نا. ل)[تەل1/١ + سز][تور: telsiz] بڕ: بێسیم.

**تەلسک** (نا.) بڕ: تلیسک

**تەلعەت** (نا.)[طلعت] ١ـ روو، روخسار، نێوچاوان. ⁂ لە خەوفی تەلعەتی، ڕۆژ هەروەکوو شێت/ بە رووزەردیی هەڵات و کەوتە کێوان (نالی ل ٣٢١). ٢ـ دەرکەوتن، هەڵاتن، ئەنگووتن. ٣ـ هەڵاتن و دەرکەوتنی ئەستێرە و خۆر. ⁂ تا فەلەک دەورەی نەدا، سەد کەوکەبی ئاوا نەبوو/ کەوکەبەی میهری موبارەک تەلعەتی پەیدا نەبوو (نالی ل ٣٧٠).

**تەللان** (گیانـ.) بڕ: تەڕلان

**تەلمسک** (نا.) بڕ: تلیسک

**تەلو** (گیا.)[زا] دڕک، دڕوو، تەڵووک، تەلی. (بڕ: تەڵووک)

**تەلهە** (نا.)[باک] بڕ: تەڵە

**تەلە**[1] (ئان.)[زا] بڕ: تاڵ

**تەلە**[2] (نا.)[باک] بڕ: تەڵە

**تەلەبەرد** (نا. ل)[تەل + ئە + بەرد] پارچە بەردێکی پان و تەخت.

**تەلەپاتی** (نا.)[فەر: telepathie] پەیوەندی فکری دوو کەس لە ڕێی دوورەوە دەگەڵ یەکتر.

**تەلەسکۆپ** (نا.)[فەر: telescope] دووربینێکی گەورە کە فەلەک و ئەستێرەکانی ئاسمانی پێ سەیر دەکەن.

**تەلەسم** (نا.) بڕ: تەلیسم.

**تەلەسمبەند** (نا. ل)[تەلەسم + بەند] بڕ: تەلیسمبەند. ⁂ تەلەسمبەندێکیان دەدایە، نە دیویەتی سکە و نە چۆتە کارخانە/ ئەوە ئاساری قەدیمە، نێوی مەرجانە (سەعید و میرسێوەدین ل ١٧٨).

**تەلەف** (نا. چا)[عەر: تلف] ١ـ زایە، فیڕۆ، خەسار. ٢ـ فەوتاو، نابوود. **~ بوون:** ١ـ خەسار بوون، زایە بوون. ٢ـ فەوتان، تێداچوون، نابوود بوون. **~ کردن:** ١ـ خەسار کردن، زایە کردن. ٢ـ فەوتاندن، نابوود کردن.

**تەلەفۆن** (نا.)[فەر: telephone]

دەزگایەک کە پێوەندی وتوێژی نیوان دوو یا چەند کەسی لێک دوور پێک دەهێنێ و ئیمرۆکە جۆری زۆرە(ساڵی ١٨٧٦ی زایینی گراهام بێل ـ ی ئامریکایی ئیختراعی کرد). **~ کردن:** بە تەلەفۆن پەیوەندیی دەگەڵ کەس یا کەسانێک گرتن، زەنگ لێدان. **~ لە سەر بەستن (داخستن):** هەڵگرتنی گووشی تەلەفۆن، وڵام نەدانەوە و دانانە یان لە نیوەی قسە کردن دا دانانەوەی تەلەسۆن لە بەر نارەزایەتی و توورەیی.

**تەلەفۆنچی** (ئان. ل)[تەلەفۆن + چی] کەسێک کە بە کاروباری تەلەفۆن رادەگا.

**تەلەفۆنخانە** (نا. ل)[تەلەفۆن + خانە] ١ـ یانە و شوێنێک کە خەتی تەلەفۆن دەفرۆشێ و بە کاروباری تەلەفۆن رادەگا. ٢ـ شوێن و ژوورێک کە چەند خەتی تەلەفۆنی هەبێ و خەڵک لەوێوە پێوەندی بە شوێنی دیکەوە دەگرن.

**تەلەفۆنی** (ئان. ل)[تەلەفۆن + ئی] ١ـ هەرچی کە پێوەندی بە تەلەفۆنەوە هەبێ. ⁝⁝ پەیامی تەلەفۆنی. ٢ـ (ئاک. ل) بە هۆی تەلەفۆنەوە. ⁝⁝ تەلەفۆنی کوتی کە سبەی دێم.

**تەلەگراف** (نا.)[فەر: telegraphe] دەزگایەک کە هەواڵ و نووسراوەی لە دوورە بۆ شوێنێکی دیکە بەرێ دەکەن (لە ساڵی ١٨٣٥ ـ زایینی مۆرس ئیختراعی کرد)، تەل.

**تەلەگرفچی** (ئان. ل)[تەلەگراف + چی] کەسێک کە لە تەلەگرامخانە ئیش دەکا و پەیوەندیی تەلەگراف پێکدێنێ، تەلچی.

**تەلەگرافخانە** (نا. ل)[تەلەگراف + خانە] یانە و شوێنێک کە لەوێوە تەلەگراف لێدەدرێ، تەلخانە.

**تەلەگرام** (نا.)[فەر: telegramme] نووسراوەیەک کە بە تەلەگراف ناردرابێ، برووسکە.

**تەلەویزیۆن** (نا.)[فەر: television] دەزگایەکە کە بیچم و دەنگ و رەنگ لە شوێنێکی دوورەوە بە هۆی شەپۆلی ئەلەکتریکی نیشان دەدا. || **تەلەویزیۆنی رەش و سپی:** تەلەویزیۆنێک کە وێنە و نەمایشەکانی رەش و سپی نیشان بدا، تەلەویزیۆنەکانی سەرەتایی کە رەنگی نەبوون. **تەلەویزیۆنی رنگی:** تەلەویزیۆنەکانی ئێستایی کە هەموو رەنگەکان نیشان دەدەن.

**تەلی** (گیا.)[زا] بڕ: تەلو

**تەلیس** (نا.)[گــیل: تیلیس. باک: تەلیس ـ ناو: تەلیس] ١ـ جەواڵێکی تەنک کە لە گووش دەیچنن و بۆ تێکردنی دەغڵ و دانەوێڵــــە و باری دیکە کـــەلکی لێـوەردەگـرن، گـونیـە، گـونی، گـوونی، گـوێنی2. ٢ـ (مـجـ.) پارچە، قـومـاش یا جلی خراپ.

**تەلیــسم** (نا.)[عــەر: طلسم لە یون: telesma] ١ـ شوێنی جادوو لێکراو. ٢ـ دوعـــا و نوشـــتـــەی جـــادووگـــەری. ٣ـ نووسراوەی جادوویی سەر زێڕ و زێو کە ژن دە ئەستۆی دەکەن، تەلیسمبەند. ⁙ لە سنگت داوە تەلەسم و گـــەوهـەر/ بێ دەستەڵاتم بەندەی خۆڵ بە سەر (سەعید و مـــیــرســـێـــوەدین ل ٢٦). ٤ـ شکڵ و شێوەی سەیر کە لە سەر خەزێنە و شتی شاردراوە دەیکێشنەوە، تەلیسمات. ⁙ گـەنجـینـە تەلیسـمـی هەیە بەو چاوە لە سـەر هـیچ/ وەجـهـی چیـە ئاشـوفـتـەیە زولفی لە کــەمـــەر دا (وەفــایی ل ٨). & تـەلـەسم. **~ بوون:** جــــــادوو بـوون، تووشـی تـەلیــــسم هـاتن. **~ شکان:** نەمانی حوکمی تەلیسم و کەوتنەوە سەر باری ئاسـایی شـوێنێک یا کەسـێک کـە تەلیسم کرابێ. **~ شکاندن:** جادوو و تەلیـسمی کەسـێک یا شـوێنێک لە بەین بردن و هـێنانەوە ســەر باری ئاســایی. **~ کردن:** ١ـ جادوو کـردنی شـوێنێک وەها کـە هەر کـەس لێی نزیک بێـتـەوە تەلیـسم تووشی بێ. ٢ـ جـادوو کـردنی کەسێک.

**تەلیســمـات** (نا.)[عـەر: طلسـمـات (کـــۆی طلسم)] ١ـ شکڵ و بیـــچـــمی ســـەیری ســـەر خـــەزێنە، تـەلیـــسم. ⁙ کـەوتـوومـە شکەنجی سـەری زولفت بە تەمای رووت / یاریم کە نەکەی چووم بە تەلیسماتی خەزێنە (وەفایی ل ١٤٦).

**تەلیسمبەند** (نا. ل)[تەلیسم + بەند] خـــشـــڵـی ملی ژنان کـــە نـووســـراوەی جادوویی لە سەر بێ، تەلەسمبەند.

**تەلیــشــەک** (نا. ل)[تـەلیش + ئەک] [باک] بڕ: تەڵاش

**تەلیە** (نا.) بڕ: تەڵە

**تەڵ** (نا.)[بـڕ: تاڵ2] ١ـ هـەودا، داو، تـار. ٢ـ دەنکێک مـــوو، تاڵ. ٣ـ چڵ. ⁙ گیانی من بۆ تەڵێ وەنەوشە پەرۆشە/ کە لە ژێر سـێـبـەری تووترکا خـامـۆشـە (گۆران ل ٤٥).

**تەڵا** (نا.)[ئەر] بڕ: تەلا

**تەڵاکـفت** (ئان. مـف.)[زێڕ + کـفت]

[ئەر] بڕ: زێڕکفت

**تەڵاش** (نا.)[فـار: تراشـه ـ گـیل: تەلاشـه. باک: تەلاش، تەلیـشـەک ـ ناو: تەڵاش، تۆڵاش، تۆڵاشە، تویڵاش، تڵیش، تەراش، تەراشـــــه ـ زا: تەلاشــــــه] پارچەیەکی ناسک لە چێو کە لە کاتی ڕەندە کردن لێی دەبێتەوە.

**تەڵاق** (نا. چا)[عەر: طلاق] جیایی ژن و مێرد لە یەکتر. **بە ~ دان دان:** ژنێک تووشی تەڵاق دان کردن. ⁝⁝ خەسووم هەتا بە تەڵاق دانی نەدام دەســـــتی لێهەڵنەگرتم. کچەتیوە وەڵڵا بە تەڵاق دانت دەدەم! **~ خـــواردن:** بە زمـــان هێنانی سێ تەڵاقـــــــه لە لایەن پیاوەوە.(تەڵاق خواردن هەم دەتوانێ بە شێوەیەکی جیددی بێ (تووڕەیی، شەڕ، نامووسیی یا مەسەلەی دیکە) و پیاو ئیدی نەیەوێ دەگەڵ ژنەکەی بژی یان بە شێوەیەکی سەرزارەکی و تەعارەف کە مەبەست لە ناچار کردنی تەرەفەکەی بێ.) ⁝⁝ تازە تەڵاقم خواردوە ئەم ژنە پێ دەم ماڵە نانێتەوە. تەڵاقم خواردوە هەر دەبێ مـــیـــوانم بی. **~ دان:** ١ـ دوایی هێنان بە ژن و مـــێـــردایەتی و جـــوێ بوونەوەی پیاو لە ژن. ٢ـ (مجـ.) وەلانان و تەرک کـــردنی کـــارێک و مـــەســـەلە و خوویەک کە پێشتر پێوەی خەریک بوون. ⁝⁝ دەڵێی کتێب و کتێب خوێندنەوەت تەڵاق داوە. سـیگار و مـەشـرووبم بۆ هەمیشە تەڵاق داون. **~ ستاندن:** بڕ: تەڵاق وەرگـرتن. **~ سەندن:** بڕ: تەڵاق وەرگـرتن. **~ کەوتن:** خـورادنی سێ تەڵاق و ناچار بە تەڵاق دان بوون. **~ لێستاندن:** بڕ: تەڵاق لێوەرگرتن. **~ لێوەرگرتن:** داوای تەڵاق کـردن و جیـا بوونەوەی ژن لە پیـــــــاو، تەڵاق لێستاندن. **~ وەرگرتن:** جیا بوونەوەی ژن لە مـــێـــرد، تەڵاق ســـەندن، تەڵاق ستاندن، تەڵاق ئەستاندن. **~ هاتنەوە:** دروست کـــردنی و ڕاست کـــردنەوەی ســــوێندی سێ تەڵاقـــــه و جـــــوێ نەبوونەوە. **~ هێنانەوە:** ڕاست کردنەوەی سوێندی تەڵاق بە دەست مەلا و لێک جوێ نەبوونەوە. **~ ئەستاندن:** بڕ: تەڵاق وەرگرتن. **سێ بە سێ ~ دان:** سێ جار تەڵاق دان و جیا بوونەوەیەک کە گەڕانەوە و پەشیمان بوونەوەی بۆ نیە و پیاو دەبێ حـــەتمەن ژن تەڵاق بدا.(بە پێی شەرع پیاو دەتوانێ هەتا سێ جار ژن تەڵاق بدا و بیهێنێتەوە و کاتێک لەبەر تووڕەیی یا حـــاڵەتێکی دیکە پیـــاو ڕابگەیەنێ کە هەرسێک تەڵاقی بکەوێ

ناچارە ژن تەڵاق بدا و لە وەها حاڵەتێک دا ژنەکەی تەڵاق دەدا و لە کەسێک کە بە پارە مارەی دەکا کە پێی دەڵێن جاش و ئەم کەسە بۆ ماوەیەکی دیارییکراو دەبێتە ژنی و لە دوایی تەڵاقی دەدا و مەلا تەڵاقی دێنێتەوە.)

**هەرسێک ~کەوتن:** سوێند خواردن بۆ جیا بوونەوەی یەکجاری لە ژن لەبەر تووڕەیی یان لە حاڵەتێکی سەرزارەکی و تەعاروف و شەرت کردن. (بڕ: تەڵاق خواردن). ﷼ هەرسێک تەڵاقم کەوێ تازە سیگار ناکێشمەوە. هەرسێک تەڵاقم کەوێ ئەو پارەیەم دەبێ لێوەرگری. هەرسێک تەڵاقم کەوێ ئەو پیاوە رەگێکی پیاوەتیی تێدانیە.

**تەڵاق دراو** (نا. مف.)[لە: تەڵاق دران] ژنێک کە مێردەکەی لێی جوێ بۆتەوە و تەڵاقی داوە.

**تەڵاقنامە** (نا. ل)[تەڵاق + نامە] بەڵگەیەک کە تەڵاقی ژنی تێدا نووسرابێ.

**تەڵاق و تەڵاقکاریی** (نا. ل)[تەڵاق + و + تەڵاقکاریی] کێشە و نێواننانخۆشیی ژن و مێرد کە بگاتە تەڵاق و جیایی. ﷼ مانگێک لەوە پێش کارمان گەیشتە تەڵاق و تەڵاقکاریی و ئێستا ئیدی جوێ بووینەوە!

**تەڵان** (نا.)[؟] ١ـ زەوییەکە لە شاخ و کەژ دا بە وێنەی پلەکانە خان خان دروست کرابێ، بۆ ئەوەی زەوییەکە راست بکرێتەوە تا بۆ ناشتنی درەخت و کشتوکاڵ بە کار بێ و لێژی نەمێنێ (کشت و کاڵ ب ١ ل ٨٦)، تەبارە، تالانە. ٢ـ پلە لە شاخ و کێو و هەرد (خاڵ ب ١ ل ٣٠٧)، تەلان. ٣ـ کۆڵانی درێژی نێوان دوو رێزە دار، کووچەباغ. ﷼ تەڵانی ناو باخی پڕ فەرشی گیای سەوز/ لێڵاوی باراناو کردوویە بە حەوز (گۆران ل ١٧٨). || **تەڵان تەڵان:** شوێنی پلەپلە لە قەدی شاخ و کێو دا.

**تەڵانترە** (گیا.)[تەلان + تڕ + ئە] گیایەکی بەهاریی قەف قەفە بە شوێنی سەختەوە سەوز ئەبێ (کشت و کاڵ ب ١ ل ٩٢). [لە هەنبانە بۆرینە دا بە شێوەی تەڵانتەرە هاتوە. (هەنبانە ب ١ ل ١٦٧).]

**تەڵانتەرە** (نا. ل)[تەڵان + تەرە] بڕ: تەڵانترە

**تەڵخ** (ئان.)[بڕ: تاڵ1] ١ـ رەنگی رەشی ئاماڵ زەرد، تاڵ، تڵخ. ٢ـ رووگرژ،

نێـوچاوانتـاڵ. ٣ـ ژیان و گـوزەرانی ناخۆش.

**تەڵخـوون** (گـیـا.)[پەش: تەرخـان، تەرخوون ـ فار: تەلخوون ـ کرم: تەلخون ـ لۆر: تـەرخــۆ. باک: تارخــوون ـ ناو: تەڵخوون، تەرخوون] گیایەکی دەسچێنە، هەتا میترێک بەرز دەبێتەوە، گەڵاکانی درێژ و چووکن، تامی توندە، بۆنی زۆر خۆشە، گوڵەکانی هێشووی و زەرد و چووکن و بەشێکە لە سەوزی خواردن، Artetmis dracunculus ناوی لاتینی ئەم گیایەیە.

**تەڵخ ئەحـــواڵ** (ئان. ل)[تەڵخ + ئەحواڵ] نارەحەت، حاڵ ناخۆش.

**تەڵخ ئەحواڵیی** (حم.)[تەڵخ ئەحواڵ + ئیی] حاڵ ناخۆشیی، نارەحەتی. ⁜ جا بۆ ئێمە بە نارەحەتی و تەڵخ ئەحواڵی بژین؟ (سەعید و میرسێوەدین ل ٢٥١).

**تەڵزم** (نا.) بڕ: تەڵەزم

**تەڵقین** (نا. چا)[عەر: تلقین] ١ـ بیر و رایەک دە مێشکی کەسێک نان. ٢ـ یاسا و بنەڕەتی مەزهەب بە مردوو لە کاتی ناشتنی دا. **پێ ~ بوون:** مەسەلە یا بیروڕایەک پێگەیشتن، هەست پێکردن. **پێ ~ کردن:** مەسەلە یا بیروڕایەک دە مێشکی کەسێک نان. **~ دادان:** یاسا و بنەڕەتی ئیسلام بە مردوو کوتن لە کاتی ناشتن دا. ⁜ مەلا لە سەرقەبران تەڵقینی مردوو دادەدا.

**تەڵمـــیت** (نا.)[لۆر: تەلمیت. ناو: تەڵمیت ـ هەو: تەڵمیت][هس: تەمبەڵیت] ١ـ بارگە و بنەی هەوار، تەمبەڵیت. ٢ـ ئەسپێک کە بۆ شین و شیوەن دەیرازێننەوە. ⁜ تەڵمیت سیاپۆش بێ تۆ، ڕۆڵەڕۆ/ خاتوونان بێهۆش بێ تۆ، ڕۆڵەڕۆ (مەولەوی ل ١٠١). ٣ـ ئەسپی زین کراو و رازاوە بۆ گەورەپیاو و ئاغاژن. ٤ـ جلکێکی وەک لێفە کە بە سەر شان و ملی ئەسپی دادەدەن.

**تەڵمیتبار** (نا. ل)[تەڵمیت + بار] شێوە کەژاوەیەک کە لە چیغ لە سەر پشتی وڵاغ سازی دەکەن و جێوبانی لە سەر رادەخەن و ژن و منداڵ لە سەری دادەنیشن. ⁜ ئاماوە دامان کۆچ تەڵمیت بار/ هەرچەند نیگام کەرد نەدیم کۆچ یار (وەلی دێوانە ل ٨٥) زیلەی تەڵمیتبار کۆچ نەوهاڵان/ تەئسیرەش نییەن ئیمساڵ چون ساڵان (مەولەوی ل ٢٧٤).

**تەڵووک** (گیا.) ١ـ دڕک، دڕوو، تەلی،

تەلوو. ٢ـ دڕکەزی، زی.

**تێــبــینی:** تەڵووک و تەلی و تەلوو دەگــــەڵ وشـــــەی دڕک و دڕوو یەکن و ئاڵوگۆڕیی بە سەر پیتەکانی **(د ـ ت)** و **(ر ـ ل)** دا هاتوون و لە چاوگی دڕین و ڕەگی دڕ کەوتوون.

**تەڵـە** (نا.)[پەه: تەلەک. لۆر: تەلە ـ فار: تله ـ پەش: تەلەکە ـ تات: تەلە. باک: تەل، تەلە، تەلهە ـ ناو: تەڵە، تەلیە ـ هەو: تەڵە] ١ـ ئامرازێکە جۆری زۆرە بۆ لە داو خستنی گیاندار و پەلەوەر، تەبکە، داو. ٢ـ حۆققە و فڕ و فێڵێک بۆ پێوە کردنی مرۆڤ. **~ بە قوون (کونگ) تەقاندن:** (کنـ.) زۆر زیرەک و فێڵەزان بوون. **~ تەقــاندن:** لە تەڵە دەرباز بوون و پێــوە نەبوون. **~ دانان:** داو نانەوە بۆ گرتنی گیاندار و پەلەوەر. **~ لێدانانەوە:** داو نانەوە بۆ گــــرتنی گـــیـــاندار، تەڵە نانەوە. **~ نانەوە:** ١ـ داو نانەوە، تەڵە دانان. ٢ـ فڕ و فێڵ کردن بۆ فریو دانی خــەڵک. **دە ~ خــستن:** ١ـ گـیـاندار و پەلەوەرێک بە تەڵە گـرتن. ٢ـ کـەسـێک فـــریو دان. **دە ~ کـــەوتن:** ١ـ دە داو کەوتنی گیاندار. ٢ـ هەڵفریوان و پێوە بوونی کەسێک. **وە سەر ~ پەڕاندن:** ١ـ دە داو خستنی گیاندار و پەلەوەر. ٢ـ (کنـ.) کـــەســـێک هـەڵفـــریواندن. **وە ســــەر ~ پەڕین:** ١ـ کـــەوتنە داوی گـیـاندار. ٢ـ (کنـ.) کـەوتنە داو و فـڕ و فێڵی کەسێک.

**تەڵەب** (نا.)[عـەر: طلب] ١ـ ویست، داوا. ٢ـ تکا، ڕجا، تەمەننا. ٣ـ سواڵ. ⁂ هەر ڕۆژە مـــردنێکە بژیێ بـە ڕۆحی وا/ دەسـتی کـەوێ بە گـرتنەوەی دەسـتی بۆ تەڵەب (مەحوی ل ٤٨). ٤ـ (ئان.) مەیلی نێــر کــردنی مێ (بڕ: بە تەڵەب). **~ کردن:** ١ـ داوا کردن، ویستن. ⁂ سوڵتان دەکا تەڵەبێ/ لە قۆشەن دەبدەبێ/ هات و گـەییـە حەڵەبێ (مـان ل ٢٢). ٢ـ تکا کردن، پاڕانەوە. ٣ـ سـواڵ کردن. **لە خودا ~ کردن:** لەبەر خـودا پاڕانەوە و داوا کردنی ویست و مەسەلەیەک. ⁂ لە خودا دەکــەم تەڵەبێ هـەرگـیـز نـەبی بـە چاوە (کانی مرادان ل ١٥٣).

**تەڵەبکار** (ئان. فـا)[تەڵەب + کـار] داواکار، خوازیار، داواکەر

**تەڵەبە** (نا.)[عـــــەر: طلبة] ١ـ خـوێندکـاری زانسـتگا. ٢ـ خـوێندکـاری کۆن کە دەرسی دینی و ئایینی دەخوێند.

**تەڵەتەقـــێن** (ئان. فـــا)[لە: تەڵە تەقـاندن] (کنـ.) کـەسـێک کـە بە داو و

تەڵەوە نەبێ. مرۆڤی زۆر فێڵەزان.

**تەڵەرێوی** (نا. ل)[تەڵە + رێوی] ١ـ جۆرێک تەڵەیەکی ئاسن کە راوچی بۆ دە داو خستنی رێوی و گورگ و گیانداری گەورە دایدەنێنەوە. ٢ـ جۆرە یارییەکە بە دووکەس ئەکرێ، یەکیکیان ئەبێ بە تەڵە و هەردوو دەست و قاچی ئەبەستن، ئەویتریان ئەبێ بە رێوی قاچێکی ئەکەن بە ناوەندی هەر دوو دەستی تەڵەکە و قاچەکەی تری ئەکەن بە ناوەندی هەر دوو قاچیا و سەری ئەکەن بە ژێر سکیا و پاڵێک ئەنێن بە تەڵەکەوە. (خاڵ ب ١ ل ٣١٨)، تەڵە و رێوی.

**تەڵەزم** (نا.)[؟] کوتێکی تەنکی پەڕاو لە دار و بەرد، تەڵزم.

**تەڵەکە** (نا.)[لۆر: تەلکە ـ فار: تلکە (تەلەکە) ـ کرم: تێلێکە. ناو: تەڵەکە] ١ـ فێڵ، فروفێڵ، گزیی. ٢ـ شڵتاغ، تەشقڵە.

**تێبینی:** مانای هاوڕیشەکانی ئەم وشەیە لە زمان و زاراوەکانی ئێرانی دا: پووڵ و ماڵێک کە بە فریو و گزیی لە خەڵکی وەردەگرن، هاتوە.

**تەڵەکەباز** (ئان. فا)[تەڵەکە + باز] هۆققەباز، فێڵەزان، گزیکار.

**تەڵەکەبازیی** (حم.)[تەڵەکەباز + ئیی] هۆققەبازیی، گزیکاریی.

**تەڵەمشک** (نا. ل)[تەڵە + مشک] جۆرێک تەڵەی چووک کە لە دوکان و ماڵان دایدەنێنەوە بۆ دە داو خستنی مشک.

**تەڵە و رێوی** (نا. ل)[تەڵە + و + رێوی] بڕ: تەڵەرێوی/٢

**تەم** (نا.)[هیک: تەمەس ـ ئەو: تێمەهـ ـ پەه: تەم، تۆم، تەمیک. باک: تەم ـ ناو: تەم ـ هەو: تەم] ١ـ تەپ، مژ، دوومان. ٢ـ تار، هەوای لێڵ. ٣ـ تاریکی بەر چاو، تەمی چاو. ٤ـ مژ، قومی جگەرە. ٥ـ (مجـ.) خەفەت، خەم و کەسەر. ٦ـ [ئەر] تۆز، غوبار، تەپ و تۆز. ٧ـ [باک] کۆمەڵە ئەستێرەیەکی زۆر کە شەوانە وەک هەورێکی سپی و رووناک دیاری دەکا، پێور. ~ **رەوین:** نەمان و بڵاو بوونەوەی تەپ و مژ. ~ **لە دڵ نیشتن:** (کنـ.) خەفەتبار بوون، دڵ تاریک بوون. ~ **هاتنە سەر چاو:** ١ـ بەر چاو تاریک بوون، باش نەدیتن. ⁂ جا رۆستەم ئەو وەختی تەمی دەهاتن بە سەر هەرتک چاوە/ دەیگوت: کەسێکم لە پێش بروا، نووری چاو و هێزی ئەژنۆم نەماوە (لاس و خەزاڵ ل ٥٥). ٢ـ چاو

نەدیتن و لە خەتەر نەترسان و ئاکام نەدیتن لەبەر تووڕەیی یەکجار زۆر. ⁙ ئیتر تەم هاتە سەر چاوان/ دەنگ نەکردن ببوە تاوان/ لە سەر ناموس خوێن هاتە کوڵ/ دەمی کێرد گەیشتە سەر دڵ (بۆ کوردستان ل ١٦٠). || **تەمی چاو:** نەخۆشییەکی چاو کە چاو جوان نابینێ (ئین: ؟)

**تەما** (نا.)[عەر: طمع] ١ـ ویست، خواست. ٢ـ هیوا، هومێد. ٣ـ ویستی تەواو و لێبڕاو. & تەوا. **بە ~ بوون:** ١ـ ویستن، پێوە بوون، تەما هەبوون. ⁙ بە تەما بووم هەر ئێستا بێم بۆ ماڵتان کەچی خۆت هاتی. ٢ـ چاوەڕوان بوون، داخواز بوون، تەما پێبوون. ⁙ لە مێژە بە تەمای ئەو کچەم بیهێنم. **~ بە کەسێک هەبوون:** بە تەمای کەسێک بوون، داواکاری کەسێک بوون. ⁙ لە دۆستی خۆم زیاتر من تەمام بە کەسی دیکە نیە! **~ پێبوون:** چاوەڕوان بوون، بە تەمای کەسێک بوون. ⁙ پیاوی خراپت ببنەوە بە قوربانی زنجیرەی دە کەزێیە/ مەترسە تا ڕۆژی قیامەت تەمام پێتە (مێر و وەفا ل ٧٢). **~ گرتن:** روون بوونەوە لە سەر مەبەستێک و رای تەواو دەربڕین. ⁙ تەما بگرە دێی یا نا؟

**~ هەبوون:** بە تەما بوون، ویستن. ⁙ کاکم تەمایەتی هەموو ئیختیارێکم لە دەست دەربێنێ!

**تەماتە** (گیا.)[ئین: tomato] بەری گیایەکی دەسچێنی یەکساڵەیە، رەنگی سوورە و ئاودارە، شکڵی پتر خڕە و هەرمێیشی هەیە، توێکڵی ناسکە و تومی وردی لە نێو دایە، تامی مزرە، بە رووتی دەخورێ، روبی لێدەگرترێ، ویشک دەکرێ و دەچێشتی دەکەن، بە برژاویش دەگەڵ کەباب دەیخۆن. بە کاڵی و بە سووری لە ترشیات دەکرێ، Solanum lycopersicum ناوی لاتینی ئەم گیایەیە، تەماتە، تۆماتێز، باینجانی سوور، باجان سۆر، شامک، بامجان فەرەنگی، بایجانی سوور، باینجان/٢.

**تەماح** (نا.)[عەر: طمع] ١ـ چاونەزێری ٢ـ داوای ناڕەوا. ٣ـ هیوادار، چاوڕوان. **بە ~ بوون:** تەماح کردن، هانا دران بۆ تەماحی پتر. ⁙ حاجی سەرەڕای ئەو هەموو ماڵ و سامانە هەر بە تەماحی ماڵی زیاترە. **~ بران:** تەواو بوونی تەماح، تەماح لە دڵ دەرکردن. **~ تێکردن:** هیوادار بوون بۆ وەدەست هێنانی شتێک

یا کەسێک. :: لەمێژە ئامۆژنم تەماحی دەو کچەی جیرانمان کردوە بۆم بخوازێ. تەماحم دە کراسێک کردوە هەر پارەم چەنگ کەوێ دەیکڕم. **~ دە گولیش (گولانیش) کردن:** (کنـ.) زۆر بە تەماح بوون. **~ ڕێنیشتن:** مەیلی تەماح کردن، تەماح هەڵگرتن. **~ کردن:** ئەنجام دانی تەماح بەهیوای سەرکەوتن. **~ گرتن:** مەیلی تەماح کردن هەبوون، فریوی تەماح خواردن، تەماح ڕێنیشتن. :: بۆماڵی دونیایە تەماح نەتگرێ ڕۆڵە، تەماح باش نیە! **~ هەڵگرتن:** مەیلی تەماح کردن. **وە ~ خستن:** کەسێک تووشی تەماح کردن. **وە ~ کەوتن:** تووشی تەماح بوون، داواکاری تەماح کردن بوون.

**تەماحکار** (ئان. فا)[تەماح + کار] کەسێک کە چاوی پڕ نەبێ و هەر بیەوێ تەماح بکا، بەتەماح.

**تەماحکاریی** (حم.)[تەماحکار + ئیی] کار و کردەوەی کەسی تەماحکار.

**تەمادار** (ئان. فا)[تەما + دار2] کەسێک کە بە هیوا و تەمای شتێکە، هیوادار، بەتەما، تەماکار.

**تەماداریی** (حم.)[تەمادار + ئیی] بە تەما بوون، تەماکاریی.

**تەمار** (ئا.)[باک] بڕ: دەمار

**تەمارتن** (چا. م)[باک] بڕ: تەمراندن

**تەماشا** (نا. چا)[عەر: تماشی] چاو لێکردن، سەیر، تواشا، تەواشا، تەمەشا. **بۆ ~ بوون:** شیاوی تەماشا بوون، سەیر بوون، ئاسایی نەبوون، تەماشایی. :: قیافەیەکەی هێند سەیرە بۆ تەماشا دەبێ. **~ کردن:** ١ـ ڕوانین، چاو لە شتێک کردن، سەیر کردن. ٢ـ چاو پێداخشاندن. :: تەماشایەکی دەرسەکانت بکە ڕۆڵە سبەی ئیمتەحانت هەیە؟

**تەماشاچی** (نا. ل، ئان. ل)[تەماشا + چی] کەسێک کە چاو لە نمایش یا شتێکی شایانی چاو لێکردن دەکا، تەماشاکەر، سەیرکەر.

**تەماشاخانە** (نا. ل)[تەماشا + خانە] بینا و شوێنێک کە دەورگێڕ و هونەرپیشە شانۆی لێدەگێڕن، تیاتر، شانۆ، تواشاخانە.

**تەماشاکەر** (نا. ل، ئان. ل)[تەماشا + کەر] بڕ: تەماشاچی

**تەماشایی** (حم.)[تەماشا + یی]

شیاوی تەماشا، سەیر بوون، بۆ تەماشا بوون.

**تەماکار** (ئان. فا)[تەما + کار] بڕ: تەمادار

**تەماکاریی** (حم.)[تەماکار + ئیی] بڕ: تەماداریی.

**تەماکۆ** (گیا.)[زمانی سوورپێستەکان: tubaco] ١ـ گیایەکەی یەکساڵەیە لە رەگەزی تووتن، هەتا دوو گەز بەرز دەبێتەوە و بە کورک داپۆشراوە، بۆنی ناخۆشە و تایبەتی ناوچەی سوورپێستەکانی ئامریکایە، گەڵاکانی ویشک دەکرێ بە چەشنی جۆراوجۆر دەپێچنەوە و دەیکێشن. ٢ـ جۆرێک تووتن کە دە سەرەقەنەی دەکەن و دەیکێشن.

**تەماڵ** (نا.)[؟] ١ـ کەروێشکی نێو لان، کەروێشکی مەلاسی نێو لان، دیاردە. ٢ـ (مجـ.) کەسێک کە لە ماڵ یا لە شوێنێک خۆی مەلاس داوە. ~ **دیتنەوە:** دۆزینەوەی کەروێشک لە لان دا. ~ **هەستاندن:** دەرپەڕاندنی کەروێشک لە لان و تاژی تێبەردان یا تەقە لێکردن.

**تەماڵانە** (نا. ل)[تەماڵ + ئانە] خەڵاتێک کە دەدرێ بە نۆکەر و رەعیەت بۆ دیتنەوەی تەماڵ.

**تەمام** (ئان.) بڕ: تەواو

**تەماویی** (ئان. ل)[تەم/١ + ئاویی2] ١ـ تێکەڵ بە تەم، بە تەم و مژ. ٢ـ سەر بە تەم، سەر بە مژ. ٣ـ حاڵی مەسەلە و کارێک کە ئاشکرا نەبێ و نهێنی و شاراوەیی تێدابێ.

**تەمبور** (نا.)[زا] بڕ: تەمبوور

**تەمبورە** (نا.)[زا] بڕ: تەمبوور

**تەمبۆری** (نا. ل)[تەمبۆر + ئی][باک] بڕ: تەمبووری.

**تەمبوو** (نا.) بڕ: تەمبوورە

**تەمبوور** (نا.)[پەه: تەنبوور، تەمبوور. باک: تەمبوور، تەنبوور ـ ناو: تەمبوور، تەموورە، تەنبوور، تەنبوورە ـ زا: تەمبور، تەمبورە] ئامێرێکی مۆسیقایە، دەسکێکی درێژی هەیە، کاسەکەی چووکە و چوار سیمی لە سەرە و بە دەست لێدەدرێ.

**تەمبوورژەن** (ئان. فا)[تەمبوور + ژەن] کەسێک کە تەمبوور لێدەدا، تەمبوورڤان.

**تەمبوورڤان** (ئان. فا)[تەمبوور + ڤان][باک] بڕ: تەمبوورژەن

**تەمــبــوورە** (نا. ل)[تـەمــبـوور + ئە] تۆپێکی خـڕی دارە کـە هەڵـیـدەکـۆڵن و پەڕەکــانی ئاشـی لە دەورە دەدەن، تـۆپی ئاشـی ئاویی، تەموو، تەمبوو، تەمبوورەی ئاش. || **تەمبوورەی ئاش:** بڕ: تەمبوورە

**تەمــبــووری** (نا. ل)[تەمــبـوور + ئی] [باک] کــاکـۆڵی پیــاوانە، تـەمــبــەری، تەمبۆری.

**تەمبەری** (نا. ل)[تەمبـەر + ئی][باک] بڕ: تەمبووری.

**تەمــبــەڵ** (ئان.)[فـار: تەمـبـول ـ گـیل: تنبـل ـ بیـر: تەمــبـەل ـ لۆر: تەمــەل. ناو: تەمـبـەڵ، تەنبـەڵ، تـەمـەڵ ـ هەو: تەمـەڵ، تەمبـەڵ ـ زا: تـەمـبـەل] ١ـ کـەسـێک کـە کـاری پـێ خـۆش نیــە، تەوەزەل، تەمــەڵ، تـەنبــەڵ، تـەڕاڵ. ٢ـ کـــەســـێک کــــە ئەندامـــەکـــانی لـەشـی وەکــار ناخـــا، لەشـقـورس. ٣ـ کەسێک کە مێـشکی بۆ بیر کردنەوە وەکار ناخا. ٤ـ کەسێک کە دەرسـەکـانی باش ناخـوێنێ. **~ بوون:** ١ـ کار پێ خۆش نەبوون، سست بوون لە کــــار دا. ٢ـ کــــارا نەبوون لـە دەرس خـوێندن دا، زیـرەک نەبوون. **~ کـردن:** کەسێک سست کردن لە کار دا و فێرە تەمـبــەڵی کـردن. || **تەمــبــەڵی بەغـدایە:** (کنـ.) کـەسی زۆر تەمـبـەڵ. ⁂ تەمبـەڵی بەغـدایە، رازی بوو بـە کـایە، کـاشـیــان نەدەدایە (امثال و حکم ل ١٠١).

**تەمبەڵ خان** (نا. ل)[تەمبەڵ + خان2] نازناوێک کـە بە کـەسی تەمبـەڵی دەڵێن. ⁂ هـەستە تەمبەڵ خان کارەکانت بکە!

**تەمبەڵخانە** (نا. ل)[تەمبەڵ + خـانە] ١ـ شـــوێن یا مـــاڵێک کــە فـــەقــیـــر و کـارنەکـەری تێـدا بە خـێـو دەکـەن. ٢ـ مـاڵێک کە خـاوەنەکەی یا دانیـشتـوانی تەمـبـەڵ بن و کـارەکانی نێو مـاڵ ئەنجـام نەدەن. & تەمەڵخانە، تەنبەڵخانە.

**تەمــبــەڵە** [1] (گـیـانـ.)[تەمـبــەڵ + ئە] کرمێکـی سپی و قـەڵەوە، لە ژێر خـاک دا دەژی و جـووڵەی زۆر کـەمـە و هـەر لە بەر ئەوە ئەو ناوەی لێنراوە. لە کوردەواری بۆ راوی مــاسـی کــەلکی لێــوەردەگــرن و دەیکەنە خـۆراک و چێشکەی سـەر قـولاپ و قاشـە زۆر باشی دەخوا.

**تەمــبــەڵە** [2] (نا.)[باک: تـەمـەل ـ ناو: تەمـەڵە، تەمـبـەڵە، تـەنبـەڵە ـ زا: تەمـەل] پایە و بناغـەی خـانوو، بەشی ژێر خـاکی مـاڵ و خانووبەرە.

**تەمـبـەڵیت** (نا.)[فـار: تنبلیت. باک: تەمـەلیت ـ ناو: تەمبـەڵیت، تەمـەڵیت] ١ـ

باری چووک کە لە سەر باری دادەنێن، سەربار. ٢ـ بارگە و بنەی هەوار، تەڵمیت. ⁘ بەکری شێخان لە شەرمی قەری گەڕاوە/ هەتتاوەکی لە نێو خێلی حەمەدی باشاغان تەمبەڵیتی خۆی بە ئەرزێ داداوە (مان ل ٢٦٩)

**تێبینی:** هاوڕیشەی ئەم وشەیە لە فارسی دا تنبلیت (تەنبەلیت)ە هەر بەو مانایە.

**تەمبەڵیی** (حم.)[تەمبەڵ + ئیی] کرداری تەمبەڵ، لەشگرانیی، تەوەزەلیی، تەمەڵیی. **~ لە خۆ بار کردن:** تەمبەڵ بوون، چوونە ژێر باری تەمبەڵیی. ⁘ ڕۆڵە هەستە هێندە تەمبەڵیی لە خۆت بارمەکە و بڕۆ کارێک بدۆزەوە بۆ خۆت. **~ کردن:** کار ئەنجام نەدان، تەوەزەلی کردن.

**تەمبێ** (نا. چا) بڕ: تەنبێ

**تەمبێیانە** (نا. ل)[تەمبێ + ئانە2] بڕ: تەنبێیانە

**تەمتومان** (نا. ل)[تەم + تومان] مژی خەست و بەربڵاو، تەپ و مژ.

**تەمتەراق** (نا.)[عەر: طمطراق] ١ـ نمایشی شکۆ و جەلال، خۆ نواندن. ٢ـ دەبدەبە، شکۆ.

**تەمتەم** (نا. ل)[تەم؟ + تەم؟] زەوی سەختی بەردەڵان کە بە کاری کشتوکاڵی نایە، تەمتەمان، ڕەقەن.

**تەمتەمان** (نا. ل)[تەمتەم + ئان] بڕ: تەمتەم

**تەمتەمە** (نا. ل)[تەم؟ + تەم؟ + ئە] بزمارێکی سەر خڕی نووک تیژە لە بنی مەزرەقی دەکوتن بۆ باشتر خولانەوەی، تمتمە.

**تەمر** 1 (نا.)[فەر: timbre] کوتە کاغەزێکی نەخشدار و بایەخدارە کە پۆست مافی چاپ کردنەکەی بە دەستەوەیە و لە جیات پارەی بەڕێ کردنی نامە و هێنان و بردنی پۆستی لە سەر پاکەت دەدرێ، پوول. **~ کردن:** ١ـ تەمر بە پاکەتەوە نان. ٢ـ (کنـ.) کەسێک لە سەر خۆ کردنەوە و بە شوێن کارێکی بێسوودەوە ناردن، دەست بە سەر کردن. & پوول پێوەنان.

**تەمر** 2 (نا.)[عەر: تمر] خورما. ‖ **تەمری هیندیی:** ١ـ دارێکی بە لک و پۆی گەورەی ناوچە گەرمەکانە لە دەستە ئەرخەوان کە هەتا ٢٥ گەز بەرز دەبێتەوە، گوڵەکانی زەرد و سپی، بەرێکی قاوەیی مەیلەوڕەشی هەیە لە بەر

و گوڵ و توێکڵـەکـەی بۆ دەرمـان کـەلک وەردەگـرن و چێـوەکـەشـی بە نرخــە، Tamarindus indica نـاوی لاتینـی ئەم دارەیـە. ٢ـ بەری ئـەم دارە کــە تـامی ترشـە و دەخـورێ. & خـەوجـە، خـورمـای هیندیی

**تەمــراندن** (چا. م)[هـس: دامـراندن] [بـاک] ١ـ دامـــراندن، دامـــرکـــاندن، کـــووژاندنـەوەی ئاگــر. ٢ـ لـە بن خـــاک شـاردنەوە، وە بن گڵ دان و داپۆشـاندن. & تەمارتن.

**تەمرین** (نا. چا)[عەر: تمرین] کاری خـۆ راهێنان و دووپات کـردنەوە بـۆ فێـر بوون و خوو پێگرتن، مەشق. **~ کردن:** دووپاتە کردنەوەی کار و مـەسـەلەیەک بۆ راهـاتن و فـێر بـوون، مەشق کـردن. ⁝⁝ بۆ خەت خۆش بوون دەبێ تەمرین بکەین.

**تەمــســیـل** (نا.)[عـــەر: تمثــیل] ١ـ نمایش، یـاریی چیـرۆک و بەسـەرهـاتێک. ٢ـ چیـــرۆک یا حـــەدیســـێک بـۆ وێنە هێنـانەوە و باس کـردن. ٣ـ شـوبهـاندن، وێچـواندن. ⁝⁝ هـەمیـشـە لالەزارە دەوری قـــەبرســتـــانی عــوشــشـــاقت/ ئەکـــەن تەمـسـیلی لێـوی لەعل و کـوڵمـی ئاڵ و رەنگینت (ئەحمەد موختار ل ٦٧).

**تەمشوێ** (نا.) بڕ: تەشوێ

**تەمشوو** (نا.) بڕ: تەشوێ

**تەم ومـژ** (نا. ل)[تەم + و + مـژ] مـژ، مژی خەست، تەپ و مژ، تەمتومان.

**تەمورە** (نا.) بڕ: تەمبوور

**تەمــۆخ** (نا.)[؟][باک: تەمــۆخ ـ ناو: تەمۆخ] بەردێکە سیلیسی کە لە نیشتن و پێکەوە نووسـانـی خـیز و رەڵم و سـیلیس پێک دێ و بەردێکی سەختە، پختۆک.

**تەمۆژ** (گیانـ.)[؟][باک] حەشـەرەیەکە زۆرتر لە سـەر درەخت دەژی و لە شـیرەی درەخت دەخــوا، چەندین جـۆر و رەنـگی هـەیە بەڵام بە گشـتی سـەریان گـەورەیە و چوار باڵی تەنک و روونیـان هـەیە. نێرەی ئەم حەشـەرەیە بە ئەندامی ژێر زگ و رێ خشـاندنی پێـیـەکـانی دەنگێکی تایبـەتی دەردێنێ بۆ بانگ کـردنی مێ، Cicada ناوی لاتیـنی ئەم جـانەوەرەیە، گـۆسـان. (فار: زنجره. عەر: زیز)

**تەموو** (نا.) بڕ: تەمبوورە

**تەمووز** (نا.)[عەر: تموز (لە: بابیلی)] ١ـ یەکـــەم مـــانگی هـاوین و دەهـەمین مـانگی رۆمی. (ئین: july) ٢ـ گـەرمـای بە تینی هـاوین.

**تێبینی:** تەمووز لە زمانی بابیلی دا خودای بەهار بوە و مێردی نەنا Nanâ خوداژنی زاوزێ.

**تەمەرە** (نا. ل)[ئەر] بڕ: تەگەرە

**تەمەشا** (نا. چا) بڕ: تەماشا

**تەمەع** (نا.)[عەر: طمع][کلاسیک] بڕ: تەماح

**تەمەل** (نا.)[باک ـ زا] بڕ: تەمبەڵە2

**تەمەلیت** (نا.)[باک] بڕ: تەمبەڵیت

**تەمەڵ** (ئان.) بڕ: تەمبەڵ

**تەمەڵخانە** (نا. ل)[تەمەڵ + خانە] بڕ: تەمبەڵخانە

**تەمەڵە** (نا.) بڕ: تەمبەڵە2

**تەمەڵیت** (نا.) بڕ: تەمبەڵیت

**تەمەڵیی** (حم.)[تەمەڵ + ئیی] بڕ: تەمبەڵیی

**تەمەن** (نا.)[؟] ماوەدایەک لە ژین، ئەندازەی ژیان، عومر. **~ی درێژ بۆ کەسێک بە جێ هێشتن:** (کن.) مردن، عومری درێژ بۆ کەسێک بە جێ هێشتن.

**تەمەننا** (نا.)[عەر: تمنی] ١ـ داوا، تەڵەب، تکا. ٢ـ ئاوات، ئارەزوو، خۆزگە. ‌‌‌‌‌‌:: سەری هەر مووی بەدەنم تەرزە تەمەننایێکە/ گەردشی تووکی سەرم دووکەڵی سەودایێکە (نالی ل ٤٦١). **بە ~ بوون:** داواکار بوون، ئاواتەخواز بوون، بە ئاواتەوە بوون. **~ کردن:** ١ـ داوا کردن، تەڵەب کردن، تکا کردن، پاڕانەوە. ٢ـ ئارەزوو کردن. **~ لێکردن:** لە بەر پاڕانەوە، تکا لە کەسێک کردن.

**تەمی** (گیانـ.)[؟][باک] بڕ: گەنە

**تەمیز** (ئان.)[عەر: تمییز] ١ـ پاک، خاوێن، تەمیس. ٢ـ (نا. چا) کاری هەڵسەنگاندن وهەڵبژاردن و جیا کردنەوەی شاز و چاک لە ناشاز و خراپ، تەشخیس.

**تەمیس** (ئان.) بڕ: تەمیز

**تەمێ** (نا. چا) بڕ: تەنبێ

**تەمێیانە** (نا. ل)[تەمێ + ئانە2] بڕ: تەنبێیانە

**تەن**[1] (نا.)[هیک: تەنوو ـ ئەو: تەنوو ـ پەه: تەن. باک: تەن ـ ناو: تەن ـ باش: تەن ـ هەو: تەن] ١ـ ئەندام، بەدەن، لەش. :: تا نەکوژرێم و تەنم نەبەنەوە بۆ گۆڕ و گۆڕخانە/ هیچکەس نابێ سواری بۆری ببێ و پێیببڕێ مەنزڵ و مەکانە (سەعید و میرسێوەدین ل ٢١٤). ٢ـ کەس،

نەفەر، تەنە. ⁂ یەک تەن، شەڕی تەن بە تەن.

**تەن**[2] (ر.) ڕەگی تەنین کە لە هەندێک وشەی لێکدراو دا دێ. ⁂ جۆڵاتەنە

**تەنا** (ئان.)[باک ـ زا] بڕ: تەنیا

**تەناب** (نا.)[عەر: طناب][کلاسیک] بڕ: تەناف. ⁂ مەڵێ ڕێگا کەشندە یا کوشندە ئەژدەرە یاخۆ/ کەمەندە یا تەنابی خێوەتی گەردوونی گەردانە (نالی ل ٤٩١).

**تەناف** (نا.)[عەر: طناب] ١ـ چەند لووی بەنی لێک بادراوی درێژ، گوریس، شریت، پەت. ٢ـ کەمەند. ⁂ ئەو کابرایە شێرە و بە تەنافی هیچکەس ناگیرێ و نەگیراوە (لاس و خەزاڵ ل ٦٣). **لە ~ دان:** لە دار دان، ئێعدام کردن بە تەناف. ⁂ مەمدە بەر حەلقەیی ئەو زولفە لە سەر ماچی دەمت/ لە تەنافم مەدە مەمکووژە لە سەر هیچ و نەبوو (وەفایی ل ١٠٧). ‖ **تەنافی شەیتان:** هەودایەکی ناسکی تەونۆکەی جاڵجاڵۆکە کە لە هەوا دایە، خەیاتەی جن.

**تەنافباز** (ئان. فا)[تەناف + باز] بڕ: پەتباز

**تەنافبازی** (حم.)[تەنافباز + ئیی] بڕ: پەتبازی

**تەناف تەنافێن** (نا. ل)[تەناف + تەناف + ئێن] ١ـ کایە یا وەرزش کردن بە تەناف. ٢ـ یاریەکی منداڵان بە تایبەت کچانەیە بە تەناف.

دوو کەس هەر کام لایەکی تەناف هەڵدەسووڕێن و یەکێک لە نێوەراست خۆ هەڵداوێ و تەنافەکە بە بنی دا تێدەپەڕێ و هەتا تەنافەکەی وێ نەکەوێ ناخیچێ.

**تەنانە** (ئام.) بڕ: تەنانەت

**تەنانەت** (ئام.)[؟] ١ـ تایبەت و زەق کردنەوە بۆ کەس و کارێک، حەتتا. ⁂ تەنانەت ئەگەر تۆش داوا بکەی، نایبوورم. ڕۆیشت و تەنانەت چایەکیشی دەگەڵ نەخواردمەوە.

**تەنبوو** (گیانـ.)[؟][باکـ] بڕ: گەنە.

**تەنبوور** (نا.) بڕ: تەمبوور

**تەنبوورە** (نا.) بڕ: تەمبوور. ⁂ سووتاوە دەروونم وەرن ئەی موتریب و ساقی/ تۆ لێدە لە تەنبوورە، ئەتۆ پڕ کە ئەیاغان (وەفایی ل ٨٧).

**تەنبەتەن** (نا. ل)[تەن1 + بە/ە + تەن1] کەسێک لە بەرابەر کەسێکی دیکە

دا بۆ شەڕ و بەربەرەکانی. ⁂ پاڵەوانێک بوو تەنبەتەن کەس پێینەدەوێرا.

**تەنبەڵ** (ئان.) بڕ: تەمبەڵ

**تەنبەڵخانە** (نا. ل)[تەنبەڵ + خانە] بڕ: تەمبەڵخانە

**تەنبەڵە** (نا.) بڕ: تەمبەڵە2

**تەنبێ** (نا. چا)[عەر: تنبیە] ١ـ دەرس و پەند لە ئاکامی کارێک. ٢ـ سزای سووچ و هەڵە. & تەمبێ، تەمێ. **~ بوون:** ١ـ دەرس و پەند وەرگرتن لە ئاکامی کار و مەسەلەیەک و ئەنجام نەدانەوەی، تەنبێ خواردن. ٢ـ سزا دران. **~ خواردن:** بڕ: تەنبێ بوون. **~ کردن:** ١ـ دەرس پێدان بە کەسێک بۆ ئەنجام نەدانەوەی کارێک، ئەدەب کردن. ٢ـ سزا دانی سووچ و هەڵە بە لێدان. **کەسێک بۆ کەسێک ~ کردن:** کەسێک ئەدەب کردن و تەنبێ کردن بۆ کەسێکی دیکە. ⁂ ئەو کوڕەم وا بۆ تەنبێ کردی ئیدی مەحاڵە ئەوکارە بکاتەوە. بۆ بابیم تەنبێ کرد.

**تەنبێیانە** (نا. ل)[تەنبێ + ئانە2] ١ـ پارە یا ماڵێک کە بۆ قەرەبوو کردنەوەی کارێکی ناڕەوا لە کەسێک دەستێندرێ، جەریمە. ٢ـ کار و کردەوەیەک لەبری سزا بە کەسێک دەسپێردرێ. ⁂ رۆژی لە دایک بوونمت لە بیر کرد، تەنبێیانە دەبێ بمبەیە سەفەرێکی خۆش! & تەمبێیانە، تەمێیانە.

**تەنپەروەر** (ئان. فا)[تەن1 + پەروەر] کەسێک کە هەر خەریکی پێڕاگەیشتن بە لەش و حەسانەوە و رابواردن بێ، کەسێک کە لەشی زەحمەت نادا و مەیلی کار کردنی نیە. **~ بوون:** خۆ خۆش ویستن و بە خۆ راگەیشتن لە باری خواردن و رابواردن و حەسانەوە، تەنبەڵ بوون بۆ کار و زەحمەت دانی لەش. **~ کردن:** راهێنان و بارهێنان منداڵ یا کەسێک بە تەنپەروەریی.

**تەنپەروەریی** (حم.)[تەنپەروەر + ئیی] کار و کردەوەی کەسی تەنپەروەر، تەنپەروەر بوون.

**تەنتوور** (نا.)[فەر: teinture] ئاوەکییەکی ئەلکۆلی کە لە هەندێک گیا و گیاندار سازی دەکەن. || **تەنتووری یۆد:** (فەر: teinture d iode) ئاوەکییەکی تێکەڵاو لە ئەلکۆل و یۆد کە بۆ خاوێن کردنەوە و چاک بوونەوەی برین کەلکی لێوەردەگرن، دەرمانی سوور.

**تەنتەنانی** (نا.)[؟] جۆرێک هەڵوای

زۆر خـۆش. ፡፡ هەڵوای تەنتـەنانی هـەتا نەیخۆی نایزانی (مەتەڵ)

**تەنتەنە** (نا.)[عەر: طنطنة] ١ـ دەنگ و هـەوای مـۆسـیـقـا. ٢ـ شکۆ، فـەڕ، سەنسەنە.

**تەنخـوا** (نا. ل)[تەن1 + خـوا4] ١ـ سـەرمـایە، دەسـمـایە، سـامـان و پارەی نەغد. ٢ـ مـاڵ و کـوتاڵی بـازرگـانیی. ٣ـ لەبری، لە جیاتی. ፡፡ شێعر وێم تەنخوای سـەمـتوور سـازێ/ لێدەر، سـا نەی چی هـەر تارێش گازێ (مەولەوی ل ٣).

**تـەنـدروسـت** (ئـان. ل)[تـەن1 + دروسـت][پـەھ: تـەندروسـت] سـاغ، سڵامەت، لـەشساغ. **~ بوون:** لەشساغ بوون، سڵامەت بوون.

**تەندروسـتـیی** (حم.)[تەندروست + ئیی] ساغیی و سڵامەتیی، لەشساغیی.

**تەندورە** (نا.)[زا] بڕ: تەندوور

**تـەنـدوور** (نـا.)[ئـەو: تـەنـورە ـ پـەھ: تەنوور. لۆڕ: تـەنیـر ـ فـار: تنور ـ تات: تـەنـە ـ گـیـل: تـەنوور، تەندوور. باک: تەندوور، تـەنوور ـ ناو: تەنوور، تەندوور ـ هـەو: تەنوورە ـ زا: تەندورە] قوڵکەی ساز کراو لە گڵی سـوور لە ماڵ یا نانەواخـانە بـۆ نان تێـدا کـردن **بە ~وە دان:** پێـوەدانی نان بـە تـەندوورەوە. **~ داخستن:** ١ـ ئاگر لە تـەندوور دا کردنەوە و ئامادە کردنی بۆ نان کردن. ٢ـ (کنـ.) باسی خراپە و زەمی کەسێیک کردن بە تێگڕایی. **وردە دە ~ کردن:** (کنـ.) زۆر بە پەلە نان و چێشت خواردن.

**تێبینی:** زمانەوانان ریشـەی وشـەی تەندوور و تەنوور نە بە وشـەیەکی هیندو ئەورووپایی و نـە بە وشـەیەکی سـامی دادەنێن و لـە سـەر ئەم بڕوایەن ئەم وشەیە دەگەڕێتەوە سەر خـەڵکێک کە بەر لە سـامـیـیـەکـان و ئـارییکان لـەم وڵاتە نیـشـتـەجێ بوون و ئەم وشـەیان لەوان وەرگرتوە. (بڕ: برهان ل ٥٢٤).

**تـەنـدووراو** (نـا. ل)[تـەنـدوور + ئاو1/١] بەشـێـک لە ئـاوی چۆم و رووباری مەند و قـووڵ کە بە دەوری خۆی دا خولان دەدا و ئەگەر بە هـێز بێ مرۆڤ دەباتە بن ئاوەوە، گێج، گێجاو، گێژاو.

**تـەندوورە** (نا. ل)[تەنـدوور + ئە] ١ـ قـوڵکە و حـەوزێک کـە ئاو لەوێوە دەرژێتە سـەر پەڕەی ئاش. ٢ـ خول و پێچی ئاوی رووبـار و تـەنـدووراو، تـەنـوورە. ٣ـ بـڕ: تەندوورەزەنە. ٤ـ گێژەڵووکە. & تەنوورە

**تـەندوورەزەنـە** (ئان. ل)[تـەندوورە +

زەن (ژەندن) + ئە] پێچ و خول بە تایبەت بـۆ دێـو، تـەنـدوورە، تـەنـوورە. ∷ دێـوی ڕەش بە تەندوورەزەنە چوە ئاسمان.

**تەنراو** (نا. مــفـ.)[لە: تەنین] جل و پارچەیەک کە تەنرابێ، بافتە.

**تەنز** (نا.)[عەر: طنز] جۆرە چیرۆک و داسـتـانێکی کـورتـە کـە بە شـێـوەیەکی پێکەنینی باسی مەسەلەکانی سیاسی و کۆمەڵایەتی دەکا.

**تەنزنووس** (ئان. فـا)[تەنز + نووس] نووســەری تـەنز، کــەســێک کــە تەنز دەنووسێ.

**تەنزنووســـیی** (حم.)[تەنزنووس + ئیی] کـار و پیـشــەی تەنزنووس، تـەنز نووسین.

**تەنزیل** (نا.)[فــار: تنزیب (تەنزیب)] پارچەیەکی سپی و تـەنک کە بۆ لەچکە و برین بـەسـتن و بابەتی دیکە کـــەلکی لێوەردەگرن.

**تێبینی:** تەنزیب ڕاستەوخۆ لە زمانی فارسییەوە هاتۆتە نێو زمانی کوردییەوە و خــودی وشـــەکـــەش لـە [تەن + زیب] پێکهاتوە. تەن بە مـانای لەشـە و زیب ـ یش لە چاوگی زیبیدن کەوتوە بە مـانای ڕازاوە، زیوەر کـە بە گـشـتـی دەبێـتـە ڕازاوەی لەش، زیوەی تەن. ئەم وشـەیە لە فـارسـی دا ئـیـمـڕۆکـە زۆرتر بە تـەنزیف دەردەبڕدرێ.

**تەنشت** (ئاک. ل)[تەن1 + شت][باک: تەنشت، ـ ناو: تەنیشت، تەنشت] ١ـ کن، لا، جەم، پاڵ، پەنا، نزیک. ٢ـ لا، سـووچ، تەڕەف. ∷ لە کام تەنشت هەڵکەوتوە؟ ٣ـ (ئا.) کەلەکە، قەبرغە، خاڵیگە. & تەنگال

**تەنشتـاوتەنشت** (ئاک. ل)[تەنشت + ئاو2 + تـەنشت] شـــێـــوە جـــووڵە و ڕۆیشـتنێکە بە لای شـان و لایەکی لەش بۆ تێـــوەچوون و تێــــپــــەڕین & تەنیشتاوتەنیشت

**تەنک** (ئان.)[هیک: تەنوکــە ـ پەه: تـەنووک، تـونـوک. بـەل: تەنـەک ـ پـەش: تەنکەی ـ فار: تۆنۆک ـ بیر: تەنێک ـ لۆر: تۆنک. ڕوس: tonki. باک: تەنک ـ نـاو: تەنک ـ زا: تەنک] ١ـ حـاڵی هەر شـتێکی پانی ناسـک. // ئەسـتـوور. ٢ـ شـوێنێک لە چەم و ڕووبار کـە قــووڵ نەبێ و بوار بدا، تەنکاو. // قـووڵ. ٣ـ حـاڵی دەغڵ و مــوو و هـەر شـتـێکی ڕواو کـە پڕ نـەبێ، شــاش. ~ **بوون:** ١ـ تەسک و ناسک بوونی هەر شـتێک. ٢ـ پڕ و چڕ نەبوونی هەر شتێکی ڕواو و داچاندراو.ە∷ سەرم

تەنک بوە. ~ **کـردن:** ١ـ پان و ناسک کردنەوەی شتێک ٢ـ هەڵکێشان و تەنک کردنەوەی چاندراوی پڕ، تەنکە کردن.

**تـەنـکـاو** (نا. ل)[تـەنک + ئـاو] ئـاوی چەم و رووبار کە قووڵ نەبێ.

**تەنکوتیـــواڵ** (ئان. ل)[تـەنک + و + تیواڵ] حاڵی هەر شتێکی زۆر تەنک بێ، لە رادەبەدەر تـەنک. ꞉꞉ ئەم قـومـاشـــە تەنکوتیواڵە سـەرما ناگـێـرێتـەوە، یەکی هەندێک ئەستوورترمان بدەیە!

**تـەنـکـە** (نا. ل)[تـەنک + ئـە] تـەنـک، تەسک. ~ **کردن:** هەڵکێشان و تەنک کـــردنـەوەی چانـدراوی پڕ. || **تەنـکـەی گیرفان:** بەر و نێوی گیرفان. ***خستنە تەنکەی گـیـرفـان:** دە گـیـرفـان نان، دە باغەڵ نان، دە تەنکەی گیرفان نان. ***دە (لە) تەنکەی گیرفان نان:** دە باغەڵ نان، خـســتنە تەنکەی گـیـرفـان. ꞉꞉ هەر دەمـەنـادەمـێک بەیاننامـەکـەم دەردێنا و دەمـخـوێندەوە و سـەرلەنوێ لە تەنکەی گیرفانم دەناوە (تاریک و روون ل ١٨).

**تەنکەبوار** (نا. ل)[تەنک + ئە + بوار] شوێنێکی تەنک لە چەم و رووبارێکی کە زۆر قـووڵ نـەبێ و بە ســانـایی پێـیــدا دەپەڕنەوە، بواری تەنک.

**تەنگ** (ئان.)[پەه: تەنگ. فار: تەنگ ـ بیـر: تـەنگ ـ پەش: تەنگ، تەنگە. باک: تەنگ، تنگ ـ ناو: تەنگ ـ هەو: تەنگ ـ زا: تەنگ] ١ـ حاڵی شوێن یا جێگە یا کونێک کە پانایی کەم بێ. // فرەوان، گوشاد. ٢ـ حـــاڵی جل و بەرگ و پۆشـــاک کـــە ئەندازەی لەش نەبن و لەش بکوشن. ٣ـ زۆر، زەخت. ٤ـ (نا.) تـەنـگـەی ولاغ. **بە ~ی کەسێکەوە بوون:** یارمەتی دان و هەوڵی زۆر دان بۆ کـەسـێک. ~ **بوون:** ١ـ گــوشـــاد نەبوونی جێ و شـــوێن. ٢ـ پۆشـــاکی چووکـتـر لە ئەندازەی لەش بوون. ꞉꞉ کەوشـەکانم تەنگە پێم دەگرێ. ~ **بوونەوە:** لە دەست دانی حـــاڵەتی فـرەوانیی. ~ **پێـهـەڵچنران:** زۆر بۆ هاتن، وە تەنگ هاتن. ~ **پێـهـەڵچنین:** زۆر بۆ هـێنـان، دەرەتان لێـبـــڕین، تـەنگ هـەڵچـنـین، وە تـەنگ هـێنـان. ~ **دان:** بڕ: تەنگە دان. ~ **کـــردنەوە:** کـــەم کردنەوەی فرەوانیی. ~ **هەڵچنین:** بڕ: تەنگ پێهـەڵچنین. **وە ~ هاتن:** جاڕز بـوون لـە زەخـت و زۆر، وەرەز بـوون. **وە ~ هێنان:** بڕ: تەنگ پێ هەڵچنین.

**تەنگاڵ** (ئاک. ل)[باک] بڕ: تەنشت

**تەنگان** (چا. ل)[لە: تەنگ] ١ـ تووشی سـەخـتی و سـەخـڵـەتی هاتن، زۆر بۆ

هاتن. ٢ـ زۆر بۆ هاتنی زگ و پێویستی بە ئاودەست هەبوون.

**تەنگانە** (نا. ل)[تەنگ + ئانە] کاتی سەختی و لێقەومان، تەنگژە. ؛؛ تەنگانە بەریان کورتە (پەند). **کەوتنە ~وە:** تووشی لێقەومان و سەختیی هاتن. **لە ~ دەرهێنان:** لە تەنگانە و تەنگژە رزگار کردن. **لە ~ رزگار بوون:** تەواو بوونی تەنگانە و سەختی. **لە ~ رزگار کردن:** لە لێقەومان و تەنگژە خەلاس کردنی کەسێک.

**تەنگاو** (ئاک. ل)[لە: تەنگان] ١ـ لە تەنگانە دا، زۆر بۆ هاتوو. ٢ـ (ئان. ل) کەسێک کە کاری ئاوێی هەیە و دەبێ دەستبەجێ بچێتە ئاودەست. & تەنگەتاو. **~ بوون:** ١ـ لە سەختی و سەخڵەتی دا بوون. ؛؛ بە مەڕەکەوە هێندە هەراسان و سەخڵەت بوون، هێندە تەنگاو بوون، کوتیان با ئەستی بدەینێ (شێخ فەرخ ل ٦٠). ٢ـ پێویست بە ئاودەست هەبوون، تەنگان، تەنگەتاو بوون.

**تەنگدەس** (ئان. ل)[تەنگ + دەس] بڕ: تەنگدەست

**تەنگدەست** (ئان. ل)[تەنگ + دەست] دەستکورت، هەژار، دەست تەنگ، تەنگدەس.

**تەنگدەستیی** (حم.)[تەنگدەست + ئیی] دەسکورتیی، دەستەنگیی، نەداری، تەنگدەسیی.

**تەنگدەسیی** (حم.)[تەنگدەس + ئیی] بڕ: تەنگدەستیی.

**تەنگز** (گیا.)[؟] درەختێکی باڵا بچووکی دڕکاوییە، بەرێکی هەیە وەک چواڵە بەڵام ئەم تاڵە بە خۆشکراوی ئەخورێ (خاڵ ب ١ ل ٣٢١)، Amyg-dalus ناوی لاتینیی ئەم دارەیە، چاڵووک.

**تەنگژە** (نا. ل)[تەنگ + ژە] ١ـ دۆڵی تەنگ و هەڵدێر. ٢ـ تەنگانە.

**تەنگ و چەڵەمە** (نا. ل)[تەنگ + و + چەڵەمە] تەنگانە، تەنگژە، دژواریی و ناخۆشیی.

**تەنگە** (نا. ل)[تەنگ + ئە] ١ـ دەوری کەمەر و گەد و گیپاڵ. ٢ـ [لۆر: تەنگ ـ فار: تەنگ ـ باک: تەنگە ـ ناو: تەنگ، تەنگە] قایشێکی پانە کە بە بن زگی وڵاغ دا دێ و زین و کورتانی پێ قایم دەکەن، تەنگ. ٢ـ بەشێک لە دەریا کە لە نێوان دوو ویشکایی هەڵکەوتوە و دوو دەریا

پێک دەلکێنێ. ~ **دان:** بەستنی تەنگەی ولاغ، تەنگە کێشان، تەنگ دان. ~ **شەتاندن:** بەستن و کێشانی تەنگە. ∷ زینی لە سەر نێ تەنگەی بشەتێنێ/ تۆزەک وا دیارە لە بنی رەشکێنێ (سێسەد هۆنراوە ل ٣٠). ~ **کێشان:** توند کردنی تەنگەی ولاغ، تەنگە شەتاندن. ~ **گرتن:** ١ـ بریندار بوون و ئەزیەت بوونی ولاغ بە تەنگە. ٢ـ (کنـ.) بریندار بوون و دڵگیر بوون لە قسە و کردەوەی کەسێک.

**تەنگەبەر** (ئان. ل)[تەنگ + ئە + بەر] ١ـ حاڵی هەر شوێنێکی بەرینایی کەم بێ. ∷ کۆڵانی تەنگەبەر. ٢ـ هەرچی کە سنوور و مەرزی بۆ دیاری کرابێ، دەوروبەر گیراو، بەر بەستراو. (عەر: محدود). ∷ بیری تەنگەبەر، ژیانی تەنگەبەر. ~ **بوون:** مەودای پەرە سەندن و ئازادیی نەبوون، حەد بۆ دیاری کران، بەر پێ گیران. ~ **کردن:** مەودای پەرە سەندن و ئازادیی پێنەدان، بەر پێ گرتن، سنوور بۆ دیاری کردن.

**تەنگەبەریی** (حم.)[تەنگەبەر + ئیی] تەنگەبەر بوون، بەربەستراویی، ئازاد نەبوون.

**تەنگەتاو** (ئاک. ل)[تەنگ + ئە + تاو4] بڕ: تەنگاو. ~ **بوون:** ١ـ زۆر بۆ هاتن. ٢ـ تەنگاو بوون، تەنگان. ~ **کردن:** زۆر و زەخت بۆ کەسێک هێنان.

**تەنگەستوور** (ئان. ل)[تەنگە/١ + ئەستوور] کەسێک کە دەوری کەمەری زل و ئەستوور بێ، مرۆڤی زگ زل.

**تەنگەنەفەس** (نا. ل)[تەنگ + ئە + نەفەس] ١ـ کەسێک کە تووشی نەخۆشی تەنگەنەفەسیی بوە، هەناسەسوار، بەرهەنگدار. ٢ـ (کنـ.) بێسەبر و کەم تاقەت. ~**بوون:** ١ـ هەناسەسوار بوون. ٢ـ کەم تاقەت و بێسەبر بوون.

**تەنگەنەفەسیی** (نا. ل)[تەنگەنەفەس + ئیی] نەخۆشییەکە کە پتر تووشی مرۆڤی پیر دەبێ و نیشانەکەی تەنگەنەفەس بوونی پەیتاپەیتایە، هەناسەسواریی، بەرهەنگ. (ئین: asthma)

**تەنگە هەڵکێش** (نا. ل)[تەنگە + هەڵکێش (هەڵکێشان)] قایشێکی باریکە بە زینەوە تەنگەی پێ قایم ئەکرێ بۆ ئەوەی زینەکە نەکەوێ (کشت و کاڵ ب ١ ل ٩٣).

**تەنگیی** (حم.)[تەنگ + ئیی] ١ـ تەنگ

بوون. // گـوشـادیی، فـرەوانیی. ٢ـ تەنگانە، تەنگژە.

**تەنناز** (ئان.)[عـەر: طناز] ١ـ شـۆخ، بەناز. ٢ـ کـەسـێک کـە کـەشم و نـەشم دەکا.

**تەننازیی** (حـم.)[تـەنناز + ئـیی] چلۆنایەتی و حاڵەتی کەسی تەنناز. ∷ گوڵەندامێ، دلارامێ، سەمەنبەر، دیده شەهلایێ/ بە دوو زولفان رەسەنبازیی، بە دوو ئەگریجە تەننازیی (وەفایی ل ١٤٦).

**تەنوین** (نا.)[عەر: تنوین] دوو سەر یا دوو ژێر یا دوو بۆرە لە وشەکانی عەرەبی دا کە بە ئاخری وشەوە دەلکێ و تایبەتی زمانی عەرەبییە.

**تەنوور** (نا.) بڕ: تەندوور

**تەنوورشێوێن** (نا. ل)[تەنوور + شێوێن (شێواندن)] دارێکی درێژی هەندێک ئەستوورە کە بنی تەندووری پێ تێک وەردەدەن هەتا ئاگرەکە خۆشتر بێ، کۆڵەوەژ.

**تەنوورە**$^{1}$ (نا. ل)[تەنوور + ئە] ١ـ بڕ: تەندوورە. ٢ـ (نا.)[هەو] بڕ: تەندوور

**تەنوورە**$^{2}$ (نا.)[عـەر: تنورة لە سـور: تنورە] ١ـ داوێنی کـراسی ژنان. ٢ـ جلێکی ژنانە، لە کەمەر بۆ خـواریان دادەپۆشێنێ، داوێنەکەی ئاوەڵایە و نێو دەلینگ ناگـرێ و هەتا نزیک ئەژنۆ و خوارتر دەبێ، دامەن.

**تەنها** (ئان.) بڕ: تەنیا

**تەنهایی** (حم.)[تەنها + یی] بڕ: تەنیایی

**تەنە** (نا. ل)[تەن + ئە] ١ـ کەس، تەن. ∷ یەک تەنە. ٢ـ لایەکی لەشی سەرەوەی بەدەن. ~ **لێدان:** خۆ لێدان لە کەسێک، لایەکی لەش لە کەسێک کوتان.

**تەنەکە** (نا.)[تور: teneke] ١ـ وەرەقەیەکی ئاسن کە بە قەلایی داپۆشرابێ هەتا ژەنگ هەڵنەهێنێ. ٢ـ دەفرێکی موکەعەبی موستەتیلە کە تەنەکەساز یا کارخانە لە تەنەکەی/١ سازی دەکا بۆ نەفت و رۆن و کەل و پەلی دیکە تێکردن کە بیست لیتر دەبێ. ٣ـ پێوانەیەکەی شازدە کیلۆییە کە لە تەنەکەی سەرەوە کەلک وەردەگرن. & حەڵەبی. ~ **دە کلک خستن:** (کنـ.) ئابڕوو و حەیای کەسێک بردن، بێ ئابڕوو کردن. ~ **دە گەروو گیران:** (کنـ.) هەست بە گەرمای خواردنەوەی

داغ نەکـردن. ⁂ ئەو چا داغـەت چ زوو خــوردەوە دەڵێی تەنەکــەت دە گــەرووی گیراوە. || **تەنەکەی خۆڵ (زبڵ):** تەنکە یا دەفـرێکی دیکە کە بۆ زبڵ و زاڵ کـەلکی لێوەردەگرن، سەتڵی زبڵ.

**تەنەکـەچی** (ئان. ل)[تەنەکـە + چی] بڕ: تەنەکەساز

**تەنەکەساز** (ئان. فا)[تەنەکە + ساز] کەسێک کە لە تەنـەکە دەفر و کەل و پەلی لەم بـابەتـە ســاز دەکــا و دەیفــرۆشــێ، تەنەکەچی.

**تەنەکـەســازی** (حم.)[تەنکەسـاز + ئیی] ١ـ کـار و پیـشـەی تـەنەکەسـاز. ٢ـ (نا. ل) دوکان و جێ ئیشی تەنەکەساز.

**تەنی** 1 (نا.)[باک] مـادەیەکی رەش و نەرم کـە لە دووکـەڵ و شـتی نـەوتی پەیدا دەبێ، قــورم، دوورنج، دۆرنج، دووژنگ، دویە.

**تێــبــینی:** تەنـی بە مـانـای قـورم و دووژەنگ لە چاوگی تەنین کەوتوە.

**تەنی** 2 (ئان.)[زا] بڕ: تەنیا

**تەنیا** (ئان.)[لۆر: تەنیا ـ تات: تەنیا ـ فـار: تنهـا. باک: تـەنێ، تەنا ـ نـا: تەنێ، تەنیـا، تەنهـا ـ هـەو: تەنیـا، تـەنهـا ـ زا: تەنا، تەنی، تەنیا، تنێ] ١ـ کـەسـێک کە هـاودەم و دۆسـتی نەبێ. ٢ـ (ئاک.) تاک، تاکـانە. ٣ـ فـەقـەت، بەس، هـەر، تەنیـا و تەنیــا. ⁂ تەنیــا من و تۆ مــاوین نان بخـۆین. & تەنێ، تەنها، بـەتەنێ، بە تاقی تەنێ. ~ **بوون:** ١ـ بێ هـاودەم و دۆست بـوون. ٢ـ کــەس لە دوروبـەر نەبـوون. ⁂ کـەس لە مـاڵ نـەبوو، تەنیـا بـووم و بیـرم دەکردەوە.

**تەنیــابـاڵ** (ئان. ل)[تەنیــا + بـاڵ] کەسێک کـە هیچ یاریدەدەر و هـاوکارێکی نەبێ، یـەکـتـەنە. ~ **بوون:** یەکـتـەنە و تـەنیــا بوون لـە بـەڕێوە بـردنـی کـــار و مەسەلەیەک.

**تەنیا و تەنیا** (ئاک. ل)[تەنیا + و + تەنیـا] فـەقـەت، بـەس، هـەر. ⁂ داهـاتی کــۆمــەڵە تـەنیــا و تـەنیــا مــانگانـەی ئەندامـەکان و فرۆشی چاپەمـەنیـەکان و داهـاتی تیـئـاتر و نومـایشـەکـانی بوو (تاریک و روون ل ٢١).

**تەنیایی** (حم.)[تەنیا + ئیی] ١ـ تەنیا بوون، بەتەنێ بوون، بێ هـاودەم و بێکەس بوون. ٢ـ خەڵوە. & تەنهایی

**تەنیشت** (ئاک. ل)[تەن1 + یشت] بڕ: تەنشت

**تەنیشتاوتەنیشت** (ئاک. ل)[تەنیشت + ئاو2 + تەنیشت] بڕ: تەنشتاوتەنشت

**تەنین** (چا. م)[هـیک: تەن ـ ئەو: تەن ـ پەھ: تـەنیـیـتـەن. فـار: تنیـدن ـ پەش: تـەنێــدل ـ لۆر: تەنـێ ـ گـیل: تێن. ناو: تەنین ـ هەو: تەنیـەی] ١ـ چنینی رایەخ و تەون بـە دەزگـا، تـەون کـردن. ٢ـ ســاز کردنی تەونـۆکە لە لایەن جاڵجـاڵۆکەوە. ٣ـ دەورە گرتن، گەمارۆ دان. ⁂ خەیابان و شەقام و رێگەیان گرت/ هەمـوو جێیان تەنـی، گـشت جـێگەیان گـرت (ناڵەی جودایی ل ٧٠).

**تەنینەوە** (چا. م)[تەنین + ئەوە] ١ـ لە ســــەرڕا تـەنـین. ٢ـ پەرە گـــرتن، بڵاو بوونەوە، هەمـوو جێ داگرتن. ⁂ دەنگ و باسـی شــەڕ هـەمــوو شــار و دێهــاتی تەنیوەتەوە.

**تەنێ** (ئان.) بڕ: تەنیا

**تەو [1]** (ئان.)[؟] مــەرێکە دەم و چاو و لەشـی بۆرەڵووک بێ (خـاڵ ب ١ ل ٣٢٣) بە جۆرە مـەرێک ئەڵێن بن گوێچکەکانی قاوەیی بێ (کشت و کاڵ ب ١ ل ٩٣)

**تەو [2]** (وشــد.) دەنگی بانگ کــردنی مێگەل بۆ ئاوخواردنەوە.

**تەو [3]** (نا.)[باش] بڕ: تا1

**تەو [4]** (ئام.)[باک] بڕ: تەح

**تەو [5]** (ئام.)[باک] بڕ: تو3

**تەوا** (نا.)[ئەر] بڕ: تەما

**تەوادار** (ئان. فـا)[تەوا + دار2][ئەر] بڕ: تەمادار

**تەوار [1]** (نا.)[باک: تەوار ـ ناو: تەوار ـ هەو: تەوار] مـێینەی باز، بازی مێ. // جورە.

**تەوار [2]** (ئـان.)[؟] رەگــەز، رەچەڵەک، رەسەن.

**تەواســان** (چا. ل)[هـس: تاســان] ١ـ گـێـژ بوون، تاسـان. ٢ـ ناهومـێد بوون، دڵسارد بوونەوە، تەواسیان.

**تەواسیان** (چا. ل)[ئەر] بڕ: تەواسان

**تەواشا** (نا. چا) بڕ: تەماشا

**تەواشیر** (نا.)[ئەر] بڕ: تەباشیر

**تەواف** (نا.)[عــەر: طواف] ١ـ خــوڵ، گەڕان، دەور. ٢ـ بەشێک لە رێ و شوێنی حــەج کــە بە دەوری مــاڵی خــودا دا دەگــەڕێن. **~ کــردن:** ١ـ بە دەوری شـتێک دا گـەڕان. ٢ـ بە دەوری کـابە دا گەڕان.

**تەواو** (ئان.)[عەر: تمام] ١ـ بێ عەیب،

ڕێکوپێک. ::: قسەیەکی زۆر تەواو و ڕێکوپێکی کرد. ٢ـ پڕ، دروست. ::: مانگی ئەمشەو تەواوە. ٣ـ خلاس، نەماو. ٤ـ کۆتایی، دوایی. ٥ـ پێگەیشتوو، ساز. ٦ـ گشت، هەموو. ::: تەواوی لەشم دێشێ! تەواوی عالەم دەزانێ. ٧ـ (ئاک) بە گشتی، تێکڕا. ٨ـ (نا.) ئاکام، ئەنجام. & تەمام. ~ **بوون:** ١ـ بەجێ گەیشتن، کۆتایی پێهاتن. ٢ـ خلاس بوون ::: تەواوی پوڵەکانم تەواو بوون. ٣ـ مردن و گیان دان. ٤ـ ئاو هاتنەوە، ڕەحەت بوون. ٥ـ بڕانەوەی مەسەلەیەک و بە ئاکام گەیشتن. ~ **کردن:** ١ـ بە جێ گەیاندن، کۆتایی پێهێنان. ::: کارەکانم تەواو کرد. ٢ـ خلاس کردن، نەهێشتن ::: دەرسەکانم هەموو تەواو کرد. ٣ـ مردن و گیان دان. ٤ـ بڕینەوەی مەسەلەیەک و بە ئاکام گەیاندن.

**تەواوکەر** (ئان. فا)[لە: تەواو کردن] ١ـ کۆتایی پێهێنەری کار و مەسەلەیەک. ٢ـ کەسێک یا شتێک کە تەواوی و گشت بوون پێک بێنێ، کامل کەر. (عەر: مکمل) ::: پیاو بێ ژن تەواو نیە، ژن تەواوکەری پیاوە.

**تەواوەتی** (ئاک. ل)[تەواو + ئەتی] گشت، هەموو، تەواو. ::: تەواوەتی کارەکانم بەتەنێ تەواو کرد.

**تەواوی** (ئان. ل)[تەواو + ئی] تەواو، گشت کەس، هەموو. ::: تەواوی خەڵکی شار چوو بوونە تەمەشای پاڵەوانبازیی. ٢ـ (ئاک. ل) تەواوەتی، گشت.

**تەوخ** (نا.)[؟] هۆڵ و ژێرخانێک لە کوێستان کە بە زستان ئاژەڵی تێدەکەن، کوول، زاخە.

**تەور**[1] (نا.)[پەه: تەبرەک ـ تەب: تور. ماز: تۆر ـ گیل: تەئۆر ـ فار: تبر ـ پەش: تەبەر ـ لۆر: تەوەر ـ بەل: تەپەر، تەڤەر ـ تات: تۆوەر ـ ئەرم: تەپەر ـ ڕوس: top-or. باک: تەڤر ـ ناو: تەور، تەوەر ـ هەو: تۆر، توەر ـ زا: تۆر] ئامرازی دار بڕین کە پێکهاتوە لە سەرێکی ئاسن یا پۆڵای تیژ و دەسکێکی چێوی کە بە نێوی دا هاتوە، بڤر، بیور، بالتە.

**تەور**[2] (نا.)[عەر: طور] شێوە، تەرز، جۆر، چەشن.

**تەورداس** (نا. ل)[تەور1 + داس] [باک: تەڤرداس ـ ناو: تەوەرداس، تەورداس ـ هەو: توەرداس] جۆرێک تەوری شێوە داس کە بۆ کاری چووکە وەک لک بڕین کەلکی لێوەردەگرن.

**تەورزین** (نا. ل)[تەور1 + زین][لۆر:

تـەوەرزیـن ـ فـــار: تـبـــرزیـن ـ پەش: تەبەرزین. باک: تـەڤـرزین ـ ناو: تەورزین، تـەوەرزیـن ـ تـۆرزیـن، تـۆرزێـن، تـۆرژەن ـ هـەو: تـوەرزیـن ـ زا: تـوورزی، تـوەرزیـن] چەشنێک تـەوری بچووک کە شـەڕکـەران لـە شـــەڕ دا پێـی بـە شـــەڕ دەهـاتـن و دەروێشەکانیش بە دەستیانەوە دەگرت.

**تێبینی:** زین لەم وشەیە دا لە زەئێنە ـ ی zaena ئەوێسـتـایی و زێن ـ ی zen پەهـلـەویـی بـە مـــانـای چەک و ئـامـــرازی شـەڕ کـەوتوە و بە گـشـتـی یـانی تەوری شـەڕ.

**تەور و تـووز** (ئـان. ل)[تـەور2 + و + تووز1] بیچم و قەڵافەت، شێوە و شوبار. ‌:: تـەور و تـووزی ئـەو کـــــابرایە وەک پاڵەوانان دەچێ.

**تەورێزیی** (ئان. ل)[تەورێز (شـارێکە لە ئێـران) + ئیی] ١ـ خـەڵکی تەورێز. ٢ـ جۆرێک ترێ. ٣ـ سەنگێکە بریتییە لە دوو حـوقـە و چواریەکی حـوقـەی ئەسـتـەمـوڵ (دوو کیلۆ و ٥٣٢ گرام) (کشت و کاڵ ب ١ ل ٩٣).

**تەوز** (نا.)[باک] بڕ: تەوزە

**تەوزە** (نا.)[؟] گـاڵتـە، فـشـە، حـەنەک، تەوز. **~ پێکردن:** گـاڵتە پێکردن، فشـە پێکردن.

**تەوزیم** (نا.)[؟] ئـەرکی ســـەر شـــان، پێوستی واجب، وەزیفە.

**تەوژم** (نا.)[؟] فـشـار، نهـێم، هێـزی تێـگڕایـی لە جـــوڵە و ڕژان دا. :: ئـاوی حـەمـــام تەوژمی کـەمـــە. لەبەر تـەوژمی خـەڵک پۆلیس پاشـەکشـەی کـرد. **~ هێنان:** فـشـار هێنـان، زۆر هێنان، هورژم هێنان. :: خـــەڵک تەوژمـــیـــان هـێنا و دوکانیان بە دوکانداران داخست.

**تەوس** (نـا.)[؟] قـــســـەی بە تـوێکڵ، تەشــەر، پللار، تەوس و پـلار، تیـز، تـانە. **بە ~ەوە قسـە کردن (دواندن):** تیـز و تانە لـە کـەسـێـک دان، تەوس پێـدادان بە کـەسـێک. **~ پێـدادان:** قـسـەیـەکی بە توێکڵ بە کەسێک کوتن، تانە لێدان، تیـز تێگرتن، تـەوس تێگرتن. **~ تێگرتن:** تەوس پێدادان، تانە لێدان.

**تەوسکە** (گــیـــا.)[هس: بـاتسکە] هەنجیرەکێویلکە

**تـەوس و پـلار** (نا. ل)[تـەوس + و + پلار] تـەوسـی پەیتـا پەیتـا و زۆر، تیـز و تـانە، تـەو و پـلار. **~ تێگرتن:** تەوس لێـــــدان، وە بـەر تـەوس و پـلار دان. **وە بەر ~ دان:** تیـز و تانە تێگرتنی زۆر لە

کەسێک.

**تەوس و پللار** (نا. ل)[تەوس + و + پللار] بڕ: تەوس و پلار.

**تەوشق** (نا.) بڕ: تەشق2

**تەوشک** (نا.) بڕ: تەشق2

**تەوشوێ** (نا.) بڕ: تەشوێ

**تەوشوو** (نا.) بڕ: تەشوێ

**تەوفیر** (نا.)[عەر: توفیر] بڕ: تۆفیر

**تەوق** (نا.)[عەر: طوق] ١ـ زیوەرێک کە دە ملی دەکەن، تۆق. ٢ـ گەمارە، دەورە، ئابلۆقە. ٣ـ ئاڵقەی کانزای دەوری مل. ٤ـ خەتێک وەک ئاڵقە لە دەوری ملی مەل و بە تایبەت کۆتر. **خستنە ~:** گەمارۆ دان، دەورە گرتن، ئابلۆقە دان. ⁖ دزیان خستە تەوق و گرتیان. ‖ **تەوقی سەر:** بڕ: تەپڵەسەر.

**تەوقە** (نا.)[عەر: طوقە] ١ـ ئامرازێکی چووکە بە فۆرم و شێوەی جۆراوجۆر کە ژنان لە پرچیان دەدەن هەتا پەرێشان نەبێ. ٢ـ کاری دەست لە دەست یەک نانی دووکەس، یاڵڵا. **~ کردن:** دەست لە دەستی یەک نانی دووکەس بۆ سەلام و هەر مەبەستێکی دیکە، یاڵڵا لێدانەوە.

**تەوقەسەر** (نا. ل)[تەوق + ئە + سەر] بڕ: تەپڵەسەر

**تەون** (نا.) ١ـ [باک: تەڤن ـ ناو: تەون ـ هەو: تەون] رایەخی تەنراو لە خوری و موو. ٢ـ تۆڕی تەنراوی جاڵجاڵۆکە، تەونۆکە. **~ کردن:** تەنینی رایەخ، تەون هەڵبەستن. **~ هەڵبەستن:** ١ـ تەنینی فەرش و رایەخ، تەون کردن. ٢ـ (کنـ.) کەسێک کە تەمەنێکی لێ تێپەڕیوە و هێشتا هەر خەریکی بەرنامە دارشتن و ماڵ پەیدا کردنە.

**تێبینی:** تەون لە چاوگی ئەوێستایی تەن tan و تەنین ـ ی کوردیی کەوتوە.

**تەونکەر** (ئان. ل)[تەون + کەر] کەسێک کە فەرش و بەڕە و رایەخ ساز دەکا، تەونگەر.

**تەونکەریی** (حم.)[تەونکەر + ئیی] کار و پیشەی کەسی تەونگەر.

**تەونگەر** (ئان. ل)[تەون + گەر] بڕ: تەونکەر.

**تەونگەریی** (حم.)[تەونگەر + ئیی] بڕ: تەونکەریی

**تەون و بەست** (نا. ل)[ تەون + و + بەست] قەرار و سازانی دوو یا چەند

کــەس دەگــەڵ یــەکــتــر بۆ ئـەنجــام دانـی کــارێکی نـاڕەوا، بەند و بـەست، کـەین و بەین. ~ **کردن:** پێکەوە سازان بە دژی کەس و کەسانێک، بەند و بەست کردن.

**تەونۆکـە** (نا. ل)[تەون + ئۆکـە] تۆڕی تەنراوی جاڵجاڵۆکە، تەڤنک، تەون.

**تەوە** (نا.)[باک] بڕ: تاوە1

**تەوەر** (نا.) بڕ: تەور

**تەوەرداس** (نا. ل)[تـەوەر + داس] بڕ: تەورداس

**تەوەرزە** (نا.)[پەهـ: تەپەرزەت][ئەر] ١ـ نەبات، بلووری قـەند. ٢ـ بلووری خـۆی & تەبەرزە

**تەوەرزیـن** (نـا. ل)[تـەوەر + زیـن] بـڕ: تەورزین

**تەوەرگ** (نا.)[جاف] بڕ: تەرزە

**تەوەرگی** (نا.)[هەو] بڕ: تەرزە

**تەوەرە** (نا. ل)[تەوەر + ئە] ١ـ مـیلە و دارێکی کـە دەخـرێتـە نێـو کـونـی سـەر بەرداشی خـوارەوە، تەگەرە، کـەوەرە. ٢ـ هـەر میلە یا خـەتێک کە شـتێکی دیکە بە دەوری دا بخـولێتـەوە. ٣ـ [ئەر] تەگـەرە، کـــــــۆسپ، چـۆرتم. || **تـەوەرەی زەوی:** خــەتێکی خــەیاڵی ســەرێکی لە قــوتبی باکوور و ئەوی دیکە لە قوتبی باشوورە و زەوی بە دەوری ئەم خەتە دا دەخولێتەوە.

**تەوەزەل** (ئان.)[؟] تەنبـەڵ، لـەشگران، تراڵ. :: کابرای هێند تـەوەزەل و تەنبەڵم لە ژیانم دا نەدیوە. ~ **بوون:** تـەنبــەڵ بوون.

**تەوەق** [1] (نا.) بڕ: تەبەک1

**تەوەق** [2] (نا.) بڕ: تەبەق2

**تەوەقە** (نا.)[ئەر] بڕ: تەبەق2

**تەوەگ** (نا.)[باک] بڕ: تەبەق2

**تەوەن** (نا.)[؟][هـەو] بڕ: بەرد

**تەوەنە** (نا.)[؟][ئەر] کۆمەڵە، ئاپوورە، کــۆگــا. ~ **دان:** لێک کــۆ بوونـەوە بە کۆمەڵ، ئاپوورە دان.

**تەویلە** (نـا.)[عـــەر: طویلة] هـۆڵـی ســازکراو بۆ داکـردنی چوارویێ ، گـەوڕ، سـتـەول، تـەوێڵـە. دە(لە) ~ **دا گـەورە بوون:** (کنـ.) بێ ئەدەب بوون، بێتـەربیـەت بوون، داب و نەرێتی کۆمەڵ تێنەگەیشتن. :: نە ســڵاوێک نە عـەلـەیکێک، ســەری دادەخـــــا و دەڕوا دەڵێـی دە تـەویلـە دا گەورە بوە.

**تەوێر** (ئا.)[باک] بڕ: تەوێڵ

**تەوێڵ** (ئا.)[باک: تەوێر ـ ناو: تـەوێڵ، توێڵ] بەشێک لە روو کە تەختاییەکە لە سـەرووی برۆکـان، چارە، نێـوچاوان، نێـــــوچەوان، نـاوچاوان، نـاوچەوان، ناوچاو، میاچەمان، ئەنی، هەنی، هەنیە.

**تەوێڵە** (نا.)[ئەر ـ هەو] بڕ: تەویلە

**تەئسیر** (نا. چا.)[عەر: تاثیر] کاریی، کاریگەر، شوێنەوار. ⁂ ناتوانم شەرحی تەئسیری ئەو خەبەرە لە سەر هەستی خـۆم بدەم (تاریک و روون ل ٤٣). **~ داخستن:** شوێن داخستن، کاریگەر بوون، کار لێکردن.

**تەی** (نا. چا)[عـەر: طی] مـەودای رێ برین. **~ بوون:** رابوردن، تێپەڕین. ⁂ ئەتۆش ئەی تارزەن سـا دەی سروودێکی بە نـەغـمـەی نـەی/ بلا تەی بێ غـەم و نۆبەی سرووری جامی مینا بێ (وەفایی ل ١٧٢). **~ کـردن:** ١ـ تێـپـەڕاندن، تێـپـەڕ کـردن. ٢ـ رێ برین، پێـوان. ⁂ دووردەستـە نـایگەمی چبکەم فریشتـەی ئاشتی/ چەندی من لەو رێگە دا هەوراز و لێژی تەی دەکەم (هێدی ل ٣٦٧).

**تەیاخ** (نا.)[ئەر] بڕ: تێـــلا (هس: پەیاغ)

**تەیار** (ئان.) ئامادە، ساز. **~ بوون:** ئامـادە بوون، سـاز بوون. **~ کـردن:** ئامادە کردن، ساز کردن.

**تێبینی:** موعین سەبارەت بە ریشەی ئەم وشـەیە دەنووسێ کە تەیار لە طیار ـ ی عـەرەبی کـەوتوە و زاراوەی بازەوان و راوچییـانە و کـاتێک باز دە نێـچـیـر بەردەدەن و ئامـادەیە پێی دەڵێن تـەیار و لـە دوایی ئەو وشـــەیە بـە مـــانای هـەر شتێکی ئامادە کەوتۆتە سەر زاران (بڕ: موعین ب ٢ ل ٢٢٤٣). (هس: تەیارە/٢)

**تەیارۆک** (گـیـانـ.)[تەیارە + ئۆک] [باک] بڕ: پشکەبەقوونە

**تەیارۆکـە** (نا. ل)[تەیارە + ئۆکـە] ١ـ تەیارە، فـڕۆکـە. ٢ـ (گـیـانـ.)[سـۆر] بڕ: پشکەبەقوونە

**تەیارە** (نا.)[عــەر: طیـــارة] ١ـ مـەکینەیەکی دەسکردە کە بە ئاسمـان دا دەفڕێ و بۆ راگـوێزتنی بار و مسـافر و کاروبـاری نیزامی کـەلکی لێوەردەگرن، فـڕۆکـە، تەیارۆکـە، بالافـر. ٢ـ دوو داری درێژ کە دارێکی چووکی لە سەر دەدەن و لە زەوی دەچەقێن هەتا مـەلی وەک کۆتر و باز لە سەری بنێشێن، لیس، وەتراخ.

**تەیان** (نا.) بڕ: تیان

**تەیجە** (نا. ل)[بڕ: تەک3][تەیج + ئە]

[هەو ـ ئەر] بڕ: تەیکە.

**تەیر** (نا.)[عەر: طیر] ١ـ مەل، باڵندە. ٢ـ (گیانـ.) تەیرەن ئەبابیل، پاڵەوانە.

**تەیرک** (نا. ل)[تەیر (تیر) + ک][باک] بڕ: تەرزە.

**تەیرکە** (نا. ل)[تەیر (تیر) + کە][زا] بڕ: تەرزە.

**تەیر و توور** (نا. ل)[تەیر(طیر) + و + توور (طیور)] ١ـ مەل و باڵندە بە گشتی و تێکڕایی. ٢ـ (کنـ.) تێکڕایی و حەشامەتی خەڵک. ⁂ وەک تەیر و توور خەڵک پێوەربوون و چیان نەهێشت.

**تەیرۆک**[1] (نا. ل)[تەیر + ئۆک] ١ـ مەلی چووک، باڵندەی چووک. ⁂ لە تەیران وەز تەیرۆکم/ لە باغان گوڵی کۆکم/ وەز عاشقی ناو عەیشۆکم (فۆلکلۆر ل ٥٢). ٢ـ [باک] بادەوە، کۆلارە، پەڕەچیغ.

**تەیرۆک**[2] (نا. ل)[تەیر (تیر) + ئۆک] [باک] بڕ: تەرزە.

**تەیرەن ئەبابیلە** (گیانـ.)[عەر: طیر ابابیل] بڕ: پاڵەوانە

**تەیش** (ئان.)[زا] بڕ: تینوو

**تەیشان** (ئان.)[زا] بڕ: تینوو

**تەیفک** (نا.)[بڕ: تەبەق][باک] دەوریی چێشت تێدا خواردن.

**تەیکە** (نا. ل)[بڕ: تەک3][تەیک + ئە] سەلەی ساز کراو لە شووڵ، تەک، تەیجە.

**تەیلەسان** (نا.)[عەر: طیلسان] جلێکی فش و گەورە کە بە شانی دادەدەن، جۆرێک فۆتە کە عەرەب و قازی و مەسیحی بە شانی دادەدەن. ⁂ چیایە شێخ و کەوای سەوزە، مێزەری بەفرە/ سیواکی چووزەرە ڕێواسە، تەیلەسانی گەڵا (حاجی قادر ل ٣٣).

**تەیان** (نا.) بڕ: تامان

**تەیەموم** (نا. چا)[عەر: تیمم] دەسنوێژ بە خاک لە کاتی نەخۆشی یا دەست نەکەوتنی ئاو. **~ کردن:** دەسنوێژ هەڵگرتن بە خاک، دەست و ڕوو لە خاک هەڵسوون لەبری دەسنوێژ لە شوێنی بێ ئاو یا لە کاتی نەخۆشی دا.

**تی**[1] (ئان.)[باک] بڕ: تینوو

**تی**[2] (نا.)[؟][باک] بڕ: هێوەر

**تیا** (پێشـ.) بڕ: تێدا

**تیابردن** (چا. م)[تیا + بردن] فەوتاندن، لە نێو بردن.

**تیــابوون** (چا. ل)[تیــا + بــوون] بڕ: تێدا بوون

**تیـــــاتر** (نا.)[فـــەر: théatre] ١ـ شـــوێنێک کـــە نەمـــایشـی لێـــدەدەن، تەماشاخانە. ٢ـ یەکێک لە هونەرەکان کە بریتــیـیــە لە نمایش دان و هێنانـە سـەر شـانۆی بـەسـەرهـات و چیـرۆکـێک. & تیاترۆ

**تیاترۆ** (نا.) ١ـ بڕ: تیـاتر/١ و ٢. ⁂ دنیا تیـاترۆیە، مـەوەسـتـە تیـا، بڕۆ/ کێ مایەوە تیا کە نەبـووبێ تیا، ترۆ (مەحوی ل ٢٥٣). ٢ـ ژنێکی نیـوەڕووت کە دە نێو پیاوان دا سەما دەکا و گۆرانی دەڵێ.

**تیــاترۆخــانە** (نا. ل)[تیــاترۆ/٢ + خـانە] شـوێنێک کە ئـافرەتی نیـوەڕووت سەمای لێدەکا.

**تیــاچوون** (چا. ل)[تیــا + چوون] بڕ: تێداچون

**تیاح** (ئام.) بڕ: تەح

**تیــارامــان** (چا. ل)[تیــا + رامـان] سەرسوڕمان و حەیران مانەوە لە ئەنجام دانی کارێک، تێرامان، رامان.

**تیامان** (چا. ل)[تیا + مـان] تێرامان، گیــر کـردن لە رەها کـردنی مـەسـەلە و کارێک، تێمانەوە.

**تیــان** (نا.)[تـەبەری: تێــهــەن (تاوە) ـ گیل: تیـان ـ لۆڕ: تیۆ. ناو: تیـان، تیانە، تـەیان ـ بـاش: تیــان ـ هـەو: تیـــانـە] مەنجەڵی گەورەی مس کە لە بن خەزنەی حـەمـــام دایدەمـــەزرێـنن و ئاگـری لـە بن دەکەنـەوە هەتا ئـاو گـەرم بکا، مـەنجـەڵی حەمام.

**تیــانچکە** (نا. ل)[تیـان + چکە] بڕ: تیانچە

**تیانچە** (نا. ل)[تیـان + چە] مەنجـەڵ، مەنجەڵی بچووک، تیانچکە.

**تیانە** (نا.) بڕ: تیان

**تیپ**[1] (نا.)[پـەهـ: تیپ ـ فـــار: تیپ. بـاک: تـیـپ ـ نـاو: تیـپ ـ هـەو: تـیـپ] ١ـ کۆمەڵ، دەسـتـە. ⁂ تێپێک سوار بێرە دا تێپەڕین! ٢ـ (نز.) بەشێک لە لەشکر. ٣ـ پیت، حــەرف. ‖ **تیپ تیپ:** دەســتـــە دەستە.

**تیپ**[2] (نا.)[فەر: type] ١ـ هـاووێنە، نموونـە، هـاوجنس. ٢ـ شـێـوەی رواڵەت، فـــۆرم، شکڵ. **~ بوون:** هـاوجنس و هـاووێنـە بـوون. ⁂ دە نێـــو ئـاواڵان دا کـەریم تیپی ئێمـە نیـە. **~ لێدان:** خۆ جـوان کـردن، جلی شـیـک دە بەر کـردن،

خۆ رازاندنەوە.

**تیت**[1] (نا.)[؟][هەو] بڕ: کەزی

**تیت**[2] (نا.)[؟][باک] چەلەنگ، جوان

**تیـــتـــاڵ** (نا.) ١ـ فـــریو، دهـۆ. ☼ فیردەوسی ئەڵێ هەزار و یەک ساڵ/ ئەو شـــایە ژیا بـە زوڵم و تیـتــاڵ (هێــدی ل ٢٨٦). ٢ـ بوخـتــان. ٣ـ مـــەکـر، ئاین و ئۆین. ٤ـ [ئەر] تیز، گاڵتە، شۆخی.

**تێبینی:** ئەم وشەیە لە فەرهەنگەکانی فـارسی دا بە شـێوەی تیتـال بە مـانای فریو، مەکر، ماستاوکەریی و کلکەسووتە هـاتوە. هەروەتر لە فــەرهــەنگی لۆریی دا تیتالی بە مانای شۆخی و گاڵتە هاتوە.

**تیتاڵباز** (ئان. فا)[تیتاڵ + باز4] ١ـ گـاڵتـەچی، جـەفـەنگبـاز. ٢ـ فـێڵـەزان، مەکرباز.

**تیـــتـــاڵیی** (حم.)[تیـــتـــاڵ + ئیی] جەفەنگ لێدان، جەفەنگبازیی.

**تیــــتـــــان** (نا.)[فــــەر: Titane] کـانزایـەکی زێویین کـە وەک پۆڵا قــایمە بەڵام ســووکـتـرە و لـە ١٨٠٠ دەرەجـە دا دەتوێتەوە، تیتانیوم.

**تیتانیوم** (نا.)[فەر: Titanium] بڕ: تیتان

**تیترواسک** (گیانـ.) بڕ: تووترواسک

**تیــتک**[1] (نا. ل)[تیت (هـس: تاتە) + ک] خوشکی باوک، پوور.

**تیتک**[2] (نا. ل)[تیت1 + ک] هەندێک مـووی سـەی ئافـرەت کـە بە لاجـانگی دا شۆڕ دەبێتەوە، ئەگریجە.

**تیــــتک**[3] (نا. ل)[؟][زا] شــــوێنی هەرەبەرز و سەر، دووند، پۆپە، لووتکە.

**تیـــــتکزا** (نا. ل)[تیـــتک1 + زا] منداڵەکانی خوشکی باوک، پوورزا.

**تیتلەبیجاغ** (گیانـ.) بڕ: تووترواسک

**تیتلەپیجاخ** (گیانـ.) بڕ: تووترواسک

**تیـتـۆڵ** (نا. ل)[تیت + ئۆڵ] کوتێکی دادڕاو لە پارچە. ~ **لێبران:** (کنـ.) زۆڕ شڕ و کۆن بوون. ☼ ئەو پاتۆڵەت تیتۆڵی لێبرا هەتا کەنگێ دەبەری دەکەی. ~ **لە کـەسـێک دادڕین:** (کنــ.) فـێـر بوون، وەک کـــەســێک بوونی بـە باری چاکـــە و ســـەرکـــەوتن دا، بزگـــوڕ لە کـــەســێک دادڕین. ☼ تیــتــۆڵێک لەو برایەت دادڕە بزانـە چەنـدە کـــوڕێکی لـە ســـەرەخـــۆ و بـێـــــــــــدەنـگـە و تـۆش هــەر هــەرا و شەڕتە. ~ **لێدادڕین:** دادڕینی کوتێک پارچە. || **تیتۆڵ تیتۆڵ:** لەت لەت، دڕبەدڕ

بۆ پارچە. * **تیتۆڵ تیتۆڵ بوون:** دڕبەدڕ بوون، شڕ بوونی پارچە.

**تیتە** (نا. ل)[تیت2 + ئە][باک: تیتە ـ ناو: تیتە] ١ـ [ئەر] خشڵ. ٢ـ [باک] رازاوە، جوانکراوە بە زێڕ و زەمبەر.

**تیتی**[1] (وشد.) ١ـ وشەی بانگ کردنی بزن. ٢ـ دەنگی بانگ کردنی مریشک. ٣ـ (نا.) کولێرەیەک کە بە شکڵی باڵندە بۆ منداڵانی ساز دەکەن.

**تیتی**[2] (گیانـ.)[باک] بڕ: دارکونکەرە

**تیج** (نا.)[زا] بڕ: تیشک

**تیخ** (نا.) بڕ: تیغ

**تیخەڵە** (نا. ل)[تیخ + ئەڵە] بڕ: تیغەڵە

**تیر** (نا.)[ئەو: تیغری، تیغرە ـ هەخ: تیگرا ـ پەه: تیگر، تییر. باک: تیر ـ ناو: تیر ـ هەو: تیر ـ زا: تیرە، تیری] ١ـ چێوێکی راست و باریک و درێژە، سەرەکەی تیژ کراوە یا شتێکی تیژی لێدراوە، بە کەوان دەهاویشترێ، بۆ راو یا شەڕ کەلکیان لێوەردەگرت، تەخش. ٢ـ گوللەی تفەنگ، فیشەک. ٣ـ دارێکی باریک و درێژ و لێک و لووس کراو، بۆ پان کردنەوەی ئەنگوتک، تیرۆک. ٤ـ (ئان) تیژ، توند، زۆر بە پەلە. ∷ وەک تیر بێرە دا تێپەڕی. **بە ~ێک دوو نیشان پێکان (شکاندن، لێدان):** (کنـ.) بە جارێک دوو ئامانج و مەبەست جێبەجێ کردن. **~ ئاویتن:** بڕ: تیر ئاویشتن. **~ ئاویشتن:** تیر دەر کردن بە کەوان یا تفەنگ، تیر هاویشتن، تیر ئاویتن. **~ پێوەنان:** گولە یا تیر بەرەو ئامان دەر کردن. **~ تێنەچوون:** (کنـ.) زۆر پڕ و چڕ بوون، موو نەبواردن. ∷ مێشەیەکی هێند چڕە تیری تێناچێ. **~ لە تیردان دا نەمان:** (کنـ.) هێز و گوڕ و تینی پێشوو نەمان، پەک کەوتن لە ئەنجام دانی کارێک کە پێشتر بە سانایی ئەنجامی دەدا. **~ لە دڵ دان:** (کنـ.) ئەویندار کردن، گیرۆدە کردن، ئاشق کردن. ∷ فەقێ چاوی بە کچی پادشا کەوت. کچەکە تیرێکی وای لە دڵی دا ئەوی هۆش مەعنا بێ فەقێ نەیما (شێخ فەرخ ل ٥٤). **~ و شیر لێک (لە یەک) سوون:** (کنـ.) دوژمنایەتی یەکتر کردن. **~ هاویشتن:** بڕ: تیر ئاویشتن. **~ هاویشتن و کەمان شاردنەوە:** (کنـ.) قسەیەک پەڕاندن و بێدەنگ بوون، لاتاو بە کەسێک دادان، لە بنەوە دوژمنایەتی کردن. **~ وە دڵ**

**کەوتن:** (کنـ.) ئەویندار بوون، گیـرۆدە بوون، ئاشق بوون. || **تیـری ئاه:** (کنـ.) ئـاه و نـزوولـە، تـووک، نـزا. ⁂ دڵـدۆزە تیری ئاهی فەقیرانی رووت و قووت/ بۆ کوشتنە هەمیشە کە ئامادە شیری رووت (مـەحـوی ل ٨٢). **تیـری بەڵا:** بەڵای لە نەکـاو، بـەدبەخـتـیی. ⁂ هەمـوو تیـری بەڵای ئەو رۆژگارە/ دەکا بۆ سـینگی پڕ زامم کـەمـانە (تاریک و روون ل ١٥٥). **تیـری چلـّکن:** تیـری ژاردار، تیـرێک کـە سـەرەکـەیان ژار تێـهـەڵسـووبێ. ⁂ ... خـودا مـوقـەددەری لە سـەر چییـە/ بۆ برینی تیـری چلـّکن نەیکرا عـیـلاج پەزێرییە (لاس و خـەزاڵ ل ١٧٦). **تیـری خـەدەنگ:** تیـرێک کـە لە داری خـەدەنگ ساز کرابێ. **تیری سەر بە پەیکان:** تێرێک کە سەرەکەی پەیکان یا ئاسنێکی تیژی پێوە بێ. ⁂ هەشتـاکـەس بە تیری سـەر بە پـەیکان لە لەشکری ئەحـمـەدخـانی سـورچی و زوراری کوژرا (لاس و خـەزاڵ ل ١٥٨). **تیری غـەیبی:** بڕ: تیری نەبەدی. ⁂ رەبی بە دوور بێ لـە دەرد و لە بـەڵایە، لە تیـری غـەیبـییـە/ رەبی لەو سـەفـەرە بێـتـەوە بە سـاغی و سـڵامـەتیـیـە (شـۆڕەمەحموود ل ٧٧). دەیگوت جا رۆڵە لە کنە منە خەبەری بە ئەسەحییە/ ئەمن دەرمـان دەکـەم جـێگای تیـری غـەیبـییـە (مێر و وەفا ل ٩٠). **تیری قودرەتێ:** بەڵا، بەڵای لابەلا، غـەزەبی خـودا، تیری قـەهر. **تیری قەزا (قەاز و قەدەر):** قـەزا و قـەدر و بەڵا، تیـری ئەجـەل. ⁂ مـەڵێن کـەڵکی نەبوو، رۆیی جـەهەننەم/ سـەرم قـەڵغـانە بۆ تیـری قـەزاتـان (نالی ل ٣١٨). **تیـری قەهر:** بڕ: تیری قودرەتێ. ⁂ دەک فەلەک دەسـتت شکێ، بەر تیـری قـەهری حـەق کەوی/ هـەروەکوو شووشـەی منت وا دایە بەر بەردی گـونـاح (بێخـود ل ٢٢). **تیری کوێری:** ١ـ تیری بێ ئامـانج و نیشانە. ٢ـ (مجـ.) کار و ئیشێکی لە سەر شانس و بەخت ئەنجام دان. ⁂ تیری کوێرییە یا دەیگرێ یا نـایگرێ. & پلـلاری کـوێری. **تیـری موژگـان:** [کلاسیک](کنـ.) مژۆڵ و برژانگـی یار و گـراوی. ⁂ غـەریبی تۆم، نەخۆشی تۆ بە گۆشـەی چاوی بیمـارت/ ئەسـیـری تۆم، شـەهیـدی تۆ بە نـووکی تیری مـوژگـانت (وەفـایـی ل ٢٧) سـەراپا هـەروەکـوو حـەڵقـەی زرێ پـەروێزەیـی خوێنم/ بە یەک یەک تیری موژگانی زرێ دۆزت برینـدارم ( نالـی ل ٢٧٥). **تیـری نەبەدی:** (کنـ.) بەڵای لە نـەکـاو، تووک و نفـرین، تیـری غـەیبی، تیـری نەدیدە. ⁂ رەبـی بـە دوور بـی لـە دەرد و بـەڵایـە و لـە

تیری نەبەدییە (شۆڕ مەحموود ل ٥٩). تیری نەبەدیان لە جەرگم داوە/ دایمە دەروونم خوێن و زووخاوە (بارام و گوڵندام ل ٤١). **تیری نەدیدە:** بڕ: تیری نەبەدی. ⁂ با لە دڵی خانزادەخانی حەریری نەبێتەوە بە تیری نەدیدە و مارانگازییە (لاس و خەزاڵ ل ١٧٤). **تیری ئەجەل:** تیری غەیبی، تیری مەرگ. ⁂ عەمربەرێک دەڵێ: کیژێ دڵت گەرد نەگرێ، تیری ئەجەل کەس بۆ عەمرت ناوێ (لاس و خەزاڵ ل ٥٢). **تیرێک و دوو نیشان:** (کنـ.) دوو مەبەست و ئامانجی بە یەک جار پێکراو.

**تیراژ** (نا.)[فەر: tirage] رادە و ئەندازەی چاپەمەنی (کتێب، گۆڤار، رۆژنامە، ...) لە جار و نۆرەیەک دا.

**تیراهەن** (نا. ل)[تیر + ئاهەن][فار: تیر آهن] پارچە ئاسنێکی درێژی گەورە و ئەستوور و قایم کە لە بری کاریتە یا کۆڵەکە لەخانووبەرە ساز کردن دا کەلکی لێوەردەگرن.

**تیراوێ** (نا. ل)[؟] ١ـ نەخۆشییەک کە لە مرۆڤ دا بە برینێکی ئەستەم خۆ دەردەخا و هۆیەکەی باسیلێکە کە کە مرۆڤ ئەم نەخۆشیە لە مەڕ دەگرێتەوە، برینا رەش. ٢ـ برینێک کە چاک نەبێتەوە و تەشەنا بکا، ناسۆر.

**تێبینی:** لە هەندێک لە فەرهەنگەکانی کوردیی دا تیراوێ بە قانقاریا داندراوە.

**تیراوێدار** (ئان. فا)[تیراوێ + دار2] کەسێک کە تووشی تیراوێ بووبێ. ⁂ پیر محمد چاکێکە لە گوندی بوغدەداغی لە موکریان؛ نەخۆشی تیراوێدار دەچنە سەری. مریشک سەر ئەبڕن و خوێنەکەی دەگەڵ گڵی ئەو چاکە لێکدەدەن و دەیکەنە شەڵتەی برینان (بۆ کوردستان ل ١٤٢).

**تیراوێژ** (ئان. فا)[تیر/١ + ئاوێژ] ١ـ کەسێک کە تیر داوێژێ. ٢ـ (نا. ل) مەودایەک کە تیر توانای بڕینی هەیە. ⁂ تیراوێژێک لێرەوە دوورە.

**تیرباران** (نا. ل)[تیر/١و٢ + باران/٢] بڕ: تیرەباران

**تیردان** (نا. ل)[تیر/١ + دان4] هەگبەی تیر، کیسەی تیر تێنان، تەرکەش، تیرکێش. **تیر لە ~ دا نەمان:** (کنـ.) هێز و گوڕ و تینی پێشوو نەمان، پەک کەوتن لە ئەنجام دانی کارێک کە پێشتر بە سانایی ئەنجامی دەدا.

**تیرز** (نا. ل)[تیر + ز (رۆز)][زا] بڕ: تیرۆژ

**تیرژ** (نا. ل)[تیر + ژ (رۆژ)][زا] بڕ: تیرۆژ

**تیرک** (نا. ل)[تیر + ک][ئەر] کۆڵەکە و دیرەکێک کە بۆ بەرگری لە رووخانی دیواری شکست وەبەری دەدەن، پشتیوانە، شەمعەک.

**تیرکێش** (نا. ل)[تیر/١ + کێش] بڕ: تەرکەش

**تیرمار** (گیانـ.)[تیر + مار][باک ـ زا] بڕ: تیرەمار

**تیرنج** (نا.)[فار: تیریز، تێریز، تێریچ ـ بیر: تیرێز. ناو: تیرنج، تیریژ، تیرێژ، تیرۆژوو، تیرێژوو ـ هەو: تیرنج] ١ـ چین و پەڕاوێزی جل و بەرگ و کەوا. ٢ـ سێ سووچی بن هەنگڵ و داوێنی کەوا و چۆغە و پەستەک و کراس، گرۆڵ، گرۆڵە.

**تێبینی:** خاڵ لە مانای ئەم وشەیە دا (تیرۆژوو) نووسیویەتی: پارچەیەکە لە کراس، سەرێکی پان و سەرێکی باریکە لە کاتی لەبەر کردنا ئەکەوێتە لای قەبرغە (بڕ: خاڵ ب ١ ل ٣٣٦).

**تیر وکەوان** (نا. ل)[تیر/١ + کەوان/١] چەکێکی سارد پێکهاتوو لەم دوو ئامرازە (بڕ: تیر. بڕ: کەوان) کە پێشتر بۆ راو و شەڕ کەلکیان لێوەردەگرت.

**تیروێ** (گیا.)[؟] تەربی؟ یا تێروو؟

**تیرۆژ** (نا. ل)[تیر + رۆژ] تیشکی خۆر، گزینگ، تیرێژ، تیرز، تیرژ.

**تیرۆژوو** (نا.) بڕ: تیرنج

**تیرۆک** (نا. ل)[تیر/٣ + ئۆک] دارێکی باریک و درێژ و لێک و لووسە کە بۆ پان کردنەوەی ئەنگوتک کەلکی لێوەردەگرن، تیر، تیرەنان، تیرۆکە.

**تیرۆکە** (نا. ل)[تیر/٣ + ئۆکە][هەو] بڕ: تیرۆک

**تیروو** (گیا.)[؟] جۆرە دارێکی دێمییە وەک تەروو، بە شاخەوە ئەڕوێ و هەرگیز زۆر زل نابێ (خاڵ ب ١ ل ٣٣٦)

**تیرە** (نا. ل)[تیر + ئە] ١ـ کۆمەڵێک خەڵکی یەک هۆز کە بچنەوە سەر عێڵێک. ٢ـ بەشێک لە تایفە. ٣ـ کۆمەڵێک خەڵکی یەک رەگەز. ٤ـ کۆمەڵێک گیاوگۆڵ یا گیاندار کە بچنەوە سەر رەگەزێک. ‌:: هەرچی کە دیار و نادیارە/ بۆ تیرەیی ئادەمی لە کارە (مەم و زین ل

٢٣٩). ٥ـ نیشانەیەکی چووک لە نووسین دا کـە خـەتێکی چووکی باریکە (ـ). ٦ـ سیرمە چەرمی باریک بۆ بن کەڵاش. ٧ـ (نا.)[زا] بڕ: تیر

**تیـرەباران** (نا. ل)[تیـر/١و٢ + ئە + باران/٢] ١ـ دارژانی گـولە و تیـری زۆر لە هەمـوو لایەکەوە بەرەو کەسێکەوە. ٢ـ ئێعدام بە گولە. & تیرباران. **~ بوون:** ١ـ وەبەر تیـر و گـوللەی زۆر کـەوتن. ٢ـ ئێعدام بوون بە گوللە و تیر. **~ کردن:** ١ـ کـەسـێک وەبەر تیـری زۆر دان. ٢ـ ئێعدام کردن بە گوللە و تیر.

**تیرەشان** (نا. ل)[تیر + ئە + شان] ١ـ بڕ: تیـرەگـەشـان. ٢ـ شـانەهەنگوینی لە سـەر لا هەڵبەسـتـراو و درێژاودرێژ. // گردەشان

**تیـرەغـە** (ئا.)[تیـرەغ (تیـرەگ) + ئە] مۆرەکانی پشت، بڕبڕە، تیغەرەی پشت، مۆغەرە. || **تیرەغەی پشت:** مۆرەی پشت، مۆغەرە، تیغەرە.

**تیـــرەگ** (نا.)[ئەو: تـەئێــرە ـ پەهـ: تیـیـرەک ـ ناو: تیـرەگ، تیـرەگە، تیلەگ، تیلەک، تیلـە] درێژایی لە بەرزایی دا، درێژایی کـێـو، تیـرەگی کـوێسـتـان. || **تیرەگی کوێستان (ئێ):** درێژایی بەرزایی کوێستان و کێو، تیرەگ.

**تیرەگە** (نا.) بڕ: تیرەگ

**تیـرەگـەشـان** (نا. ل)[تیـرەگ + ئە + شـان] ملەی کـێـو و بەرزایی، لاباسکی کێو، تیرەشان، تیغەشان.

**تیـرەمـار** (گـیـانـ.)[تیـر + ئە + مـار] جـۆرە مـارێکی زەردی باریکی چوست و چالاکە بە قـەد تیرۆکێ ئەبێ. مل باریک، سـەر بادامی، چاوکەژاڵ و جوان (کشت و کـاڵ ب ١ ل ٩٦). Zamenis gam-onensis ناوی لاتینی ئەم گیـاندارەیە، تیرمار.

**تیـرەنداز** (ئان. فـا)[فـار: تیـرانداز] کەسێک کە تیر داوی، تیژاوێژ.

**تیـرەندازی** (حم.)[تیـرەنداز + ئیی] کاری تیر هاویشتن

**تیرەنان** (نا. ل)[تیر/٣ + ئە + نان] ١ـ بڕ: تیــرۆک. ٢ـ نـانی تیــریی، لەواش، تیریی.

**تیری** 1 (نا.)[باک] بڕ: تەرزە

**تیری** 2 (نا.)[زا] بڕ: تیر

**تیریژ** (نا.) بڕ: تیرنج

**تیــریی** (نا. ل)[تیـر/٣ + ئیی] نـانی

تەنک، نانی تیریی، لەواش.

**تیرێژ**1 (نا. ل)[تیر + ڕێژ (ڕۆژ)][باک - زا] تیشکی خۆر، گزینگ، تیرۆژ.

**تیرێژ**2 (نا.) بڕ: تیرنج

**تیرێژوو** (نا.) بڕ: تیرنج

**تیـز** (نا.)[لۆر: تیـز. باک: تیـز - ناو: تیـز] فـشـە، گەمـە، گاڵتـە، گـەپ، تناز. ~ **پێکردن:** فـشـە پێکردن، گـاڵتـە بە کەسێک کردن، تیز پێوە کردن. ~ **پێوە کردن:** تیز پێکردن، فشە پێکردن.

**تیزانک** (ئا.)[؟][ئەر] کیسـەیەکە لە نێو لەش دا کـە میـز لە گـورچیلەوە وردە وردە دەرژێتە نێوی و تێیدا کۆ دەبێتەوە، مـسـوڵدان، مـیـزڵدان، مـسـوڵدانە، موسڵدان، گمێزدان، میزدانک، تیزانگی.

**تیزانگی** (ئا.)[هەو] بڕ: تیزانگ

**تیزماڵک** (نا. ل)[تیز + ماڵ + ک] ١- توێژە بەفرێکی کەم کە زەوی بە تەواوەتی دانەپۆشی. ⁂ سەرەتای پاییز تیزماڵەکە بەفرێک باری و ئیدی نەباریەوە. ٢- کوتە پارچەیەکی دادڕاوی درێژ و بارێک. ٣- کوتێکی تەسک و باریک لە هەر شـتێک. & تیلمە، تیلماسک، تیسماڵک.

**تیزی** (نا.)[زا] بڕ: تیشک

**تیـژ** (ئان.)[هیک: تێج - ئەو: تەئێـژە - پاز: تێژ - پەهـ: تێج، تێژ، تێز. تات: تیج - فار: تیـز - پەش: تێز - بیر: تێز - گیل: تیج. باک: تووژ، تیـژ - ناو: تیـژ، تێـژ- هەو: تێژ - زا: تێژ، توژ، تۆژ، توج، تێج، تووز] ١- تامی توندی وەک بیـبـار، تون، توند. ٢- (ئاک.) توند، گورج، خێرا. // سەبر. ⁂ تیژ بە لام دا تێپەڕی. ٣- لای ساو لێدراوی تیغ. // کول. ٤- بە بڕشت، کاریی. ⁂ زمان تیژ، چاو تیژ. ٥- زیرەک، وریا، تیـژبین. ٦- پێـداگـر، سوور، شێلگیر. ~ **بوون:** ١- ئامرازی بڕین کە ساو لێدرابێ و باش ببڕێ، کول نەبوون. ٢- زیرەک بوون، وریا بوون. ٣- سوور بوون لە سەر ئەنجام دانی کارێک، پێداگر بوون. ~ **تێپەڕین:** زۆر خێرا و توند ڕۆیشتن و تێـپـەڕ بوون. ~ **کردن:** ١- بڕشت دان بە ئامرازی بڕین. ٢- خۆش کـردنی ئاگـر. ٣- (کنـ.) هان دان و دنە دانی کەسێک بۆ ئەنجام دانی کارێک. ~ **کردنەوە:** ئامرازی بڕین کە کول بووبێ و پێویستی بە ساو لێدان هەبێ. **ددان لێ ~ کردن:** (کنـ.) تەماح تێکردن.

**تیـژاو** (نا. ل)[تیـژ/١ + ئاو1] ١- ئاوەکییەک کە دوای کوڵاندنی دۆ بۆ ساز

کردنی کەشک و شیریژ دەمێنێتەوە. ٢ـ ئاوکییەک کە تێکەڵاوێکە لە ئاو و خۆڵەمێش و سابوون و کالا و کەرەسەی پێدەشۆن. ٣ـ ئاوی قلیە کە سابوونی پێ ساز دەکەن. ٤ـ ئاوکییەکی بێڕەنگ و بۆن تیژە کە زۆربەی کانزاکان دە خۆی دا دەتوێنێتەوە. (ئەسید ئەزۆتیک، ئەسید نیتریک). ⁂ تیژاوی سریشکم وەکوو ئیکسیری سوهەیلە/ روخسارەیی زەردم وەکوو ئەوراقی خەزانە (نالی ل ٤٧٩). & تێزاب، تێزاو. || **تیژاوی سولتانی:** ئاوێتەیەک لە تیژاو و ئەسید کلۆریک کە هەموو کانزایەک و تەنانەت زێڕیش دە خۆی دا دەتوێنێتەوە.

**تیژایی** (حم.)[تیژ + ئایی] چلۆنایەتی تیژ بوون، تیژیی.

**تیژباڵ** (ئان. ل)[تیژ/٢ + باڵ1/١] مەل و باڵندەیەک کە توند دەفڕێ. ⁂ کوڕە ئەورۆ سەفەرت زۆر گرانە، مەچۆوە شەڕێ/ ڕەببی رووحم وەکوو تەیری تیژباڵ دایمە لە سەرت بگەڕێ (لاس و خەزاڵ ل ١٦٣).

**تیژبین** (ئان. فا)[تیژ/٥ + بین2] کەسێک کە بە وردیی و بە سرنجەوە بڕوانێ و نهێنی و رازی کردەوە و کارێکی بۆ دەرکەوێ.

**تیژبینیی** (حم.)[تیژبین + ئیی] تیژبین بوون و سەرنج دان لە کار و مەسەلەیەک.

**تیژڕەو** (ئان. فا)[تیژ/٢ + ڕەو] ئەسپ و ئاسک و ئەو گیاندارانەی کە توند و خێرا رادەکەن، خۆشڕەو.

**تیژک** (نا.) بڕ: تیشک

**تیژگ** (نا.) بڕ: تیشک

**تیژە** (نا.)[زا] بڕ: تیشک

**تیژەپەڕ** (نا. ل)[تیژ + ئە + پەڕ] شاپەڕ، شاباڵ. ⁂ ئەبرۆت کەمەندی لە من کێشاوە وەکوو تیژەپەڕی رەشەداڵی (لاس و خەزاڵ ل ١٢٢).

**تیژیی** (حم.)[تیژ + ئیی] ١ـ چلۆنایەتی تامی تیژ و توند. ٢ـ بە بڕشت بوونی ئامرازی بڕین. // کولیی. ٣ـ ڕەفتار و کرداری توند، توندیی، توند و تیژیی.

**تیسک** (نا.)[لۆڕ: تیسک. ناو: تیسک] ١ـ مووی درێژی لەشی گیاندار. ⁂ شێرێکی زەلامی رەش بوو، تیسکی بستێک درێژ بوو (لاس و خەزاڵ ل ١٣). ٢ـ [ئەر] بەشێکی چووک لە هێشوو

ترێ، زەنگەتە.

**تیـــسکن** (ئان. ل)[تیــسک + ن2] حاڵی گیـانداریک کە مـووی دریژی زۆر بێ، گیانداری تووکن.

**تیسماڵک** (نا. ل)[تیس + ماڵ + ک] بڕ: تیزماڵک

**تیسوێ** (گیا.) بڕ: تێسوێ

**تـیـش** (نـا.)[هـس: تیـــــــژ][بـاک] تیشەشاخ

**تیــشـک** (نا.)[پـەه: تێغ، تێخ. فــار: تیـغ. ناو: تیـشک، تیـژگ، تیـژک ـ هەو: تیشک ـ زا: تیج، تیژە، تیزی] ١ـ شۆق و رووناکی هەتـاو، تیریژ، تیرۆژ. ٢ـ بـریقـە و ترووسکەی شتـێک کـە شـۆقـی هـەبێ.

〜 **دانەوە:** ١ـ درەوشـــانـەوە و شـــۆق دانەوەی هـەتاو. ٢ـ درەوشـــانـەوە. 〜 **خـــستنە سـەر ...:** (کنـ.) مـەســەلـە یا قـسـەیەک بـە وردیی روون کـردنـەوە و لە ســەر دوان، رۆشـنـایی خــســتنە ســـەر مەسەلەیەک.

**تیـشـە** (نا. ل)[تیش + ئە] سـاقـەت و لاسکی تازە شین بووی گیا. ⁂ رەپستـە کـۆڵەپنـج بوون، نەوەندە تیـشـەیـان چەند پەلکە بوو (چەپکێ گوڵ ل ٦٥).

**تیشەبەرد** (نا. ل)[تیش + ئە + بەرد] رەوەز و بەردی زل و بەرز و ئەســتـەم بە چیاوە، تیش، تیشەشاخ.

**تیشەشاخ** (نا. ل)[تیش + ئە + شاخ] بڕ: تیشەبەرد.

**تیــشــەلان** (نا. ل)[تیش + ئە + لان] شوێنی بەرەلانی سەخت و ئەستەم.

**تیغ** (نا.)[ئەو: تەئێغە ـ پەه: تێغ. فار: تیغ ـ تـات: تیغ. ناو: تیغ، تێغ، تیخ، تێخ ـ هەو: تێخ] ١ـ شـەمشیر. ⁂ تیغی چاک دە کالانی دا راناوەستێ (امثـال و حکم ل ١٠٥). ٢ـ هـەر چەشنـە ئـامـــرازێکی بڕین. ٣ـ ئامـرازێکی تیـژ و چووک کـە مـــووی ســـەر و ردێنی پـێ دەتاشـن. ٤ـ گـوێزان. ٥ـ لای تیـژایی ئامـرازی بڕینی وەک کـێـرد و خـەنجـەر و شـەمـشـیـر، تیغەڵە، تیخەڵە.

**تیـغـە** (نا. ل)[تیغ + ئە][فـار: تیـغـە ـ کرم: تیـغـە. ناو: تیـغـە، تێغـە] دیوارێکی تەنک کـە لـە دیوێک یـا ژوورێک بۆ جـیـا کردنەوە لە یەک هەڵیدەچنن.

**تیـغـەرە** (ئا.)[تیـغـە + رە] ئێـسکی پشت، تیرەغە، بڕبڕە. || **تێغـەرەی پشت:** بڕبڕە، تیغەرە، تیرەغە.

**تێبینی:** من پێمـوایە تیغـەرە لە ئەسڵ

دا تیرەغە (تیرەگە) بوە و پیتەکانی شێواوە.

**تیغەشان** (نا. ل)[تیغ + ئە + شان] ١ـ بڕ: تیرەگەشان. ٢ـ تیغەی دیوار

**تیغەڵە** (نا. ل)[تیغ + ئەڵە] لای تیژی ئامرازی بڕین، دەمی کێرد و خەنجەر و شەمشیر، تیغ، تیخەڵە.

**تیف تیفە** (نا. ل)[تیف + تیف + ئە] ١ـ لووس. ٢ـ مشتومال. ٣ـ جوان، رازاوە. & تیوتیوە **~ دان:** ١ـ لووس کردن و تاشین وەها کە بریقەی بێ. ٢ـ مشتومال دان و ژەنگ و چڵک لێکردنەوە، تیوتیوە دان. **خۆ لە ~ دان:** خۆ رازاندنەوە و خۆ جوان کردن.

**تیڤڵ** (نا. ل)[باک] بڕ: توێکڵ

**تیک** (نا.)[؟] تەقەڵ، باقیە. ⁘ کڵاوی هەمزە پاڵەوان/ نە تیکی هەیە نە دوورمان « جام » (فۆلکلۆر ل ١٤).

**تیکان** (نا.)[ئازەریی: تیکان][موک] ١ـ دڕوو، دڕک. ٢ـ گیایەکی دڕە کە بۆ ماڵینی دەوری خەرمان و هەندێکجار بۆ رنەک و قەشەو کەلکی لێوەردەگرن.

**تێبینی:** وای بۆ دەچم کە تیکان لە وشەی تیغ کەوتبێ.

**تیکلە** (نا.)[؟][ئەر] ١ـ دەفرێکی چووکە بۆ کۆمەڵێک کاری چووکە دەست دەدا وەک چێشت تێدا ساز کردن و ماست تێدا مەیاندن و ...، دیزە، تیلکە. ٢ـ جەڕەی ئاو.& تیکلێ

**تیکلێ** (نا.)[هەو] بڕ: تیکلە

**تیکمە** (ئان.)[ئەر][هس: توێکمە] پڕ

**تیکە** (نا.) ١ـ [هەو ـ ئەر] بڕ: پاروو. ٢ـ [باک] کەبابی پلەگۆشت، تککە، قۆژباشی. ٣ـ لەت، کوت، پارە. ٤ـ بەش، پار. **~ گرتن:** پاروو ساز کردن، پاروو گرتن.

**تێبینی:** ئەم وشەیە لە زمانەکانی ئێرانیی دا بە مانای لەت، کوت و هەروەها پاروو هاتوە. [فار: تکە ـ گیل: تیکە ـ لۆڕ: تیکە]

**تیکە تیکە** (ئان. ل)[تیکە + تیکە] لەت و کوت، لەت لەت. **~ بوون:** لەت و کوت بوون. **~ کردن:** لەت و کوت کردن.

**تیل**[1] (نا.) ١ـ هەڵمات، مەڕمەڕ. ٢ـ هاویشتنی هەڵمات بە پەنجە. **~ کردن:** هاویشتنی هەڵمات.

**تێبینی:** تیل دەگەڵ وشەی تیر

هەریەکە و ئاڵوگۆڕ بە سەر دوو پیتی ل و ر دا هاتوە و مانایەکی دیکەی بە خۆوە گرتوە. هەروەتر لە زمانی فارسیش دا تیلە یا تیرە بە مانای هەڵمات و مەرمەرە.

**تیل**[2] (ئان.)[هس: خێل] کەسێک کە چاوەکانی چەپە، چاوخێل.

**تیلاک**[1] (نا.) بڕ: تیرەگ. ❊ ئەگەر شۆقی خۆی دەدا لە ئاروونی لە بێروونی لە کلاوفەرەنگیان/ لێم دەنگێوی تیلاکی دە کوێستانێ (گەنج ل ٨٥).

**تیلاک**[2] (ئان.) کەسێک کە تووکی پێش سەری وەریبێ. (هس: تووڵەک)

**تیلاگ** (نا.)[؟] لاسەر. **بە ~ی سەرەوە نان:** جەمەدانی، کڵاو یا هەر شتێکی دیکە هێنانە سەر لایەکی سەر. ❊ جەمەدانی بە تیلاگی سەریەوە نابوو و لە سەر کوێسوانە راوەستابوو.

**تیلاوتیل** (ئاک. ل)[تیل2 + ئاو2 + تیل2] خوارەوخوار، چەپاوچەپ، لە سەر لا.

**تیلایی** (نا. ل)[تیل2 + ئایی] گۆشەی چاو، تیلە. || **تیلایی چاو:** تیلەی چاو. ***بە تیلایی چاو روانین:** بە گۆشەی چاو سەیر کردن و روانین.

**تیلکە** (نا.) بڕ: تیکلە

**تیلماسک** (نا. ل)[؟] بڕ: تیزماڵک

**تیلمە** (نا. ل)[؟] بڕ: تیزماڵک

**تیلە**[1] (نا.) بڕ: تیرەگ. ❊ ئەمن دەچوومە تیلەی دە کوێستانێ/ دەستم دەبرد لەبۆ پنجی سوێسنێ (گەنج ل ١٢٥).

**تیلە**[2] (نا. ل)[تیل2 + ئە] گۆشەی چاو. || **تیلەی چاو:** تیلایی چاو، گۆشەی چاو.

**تیلە**[3] (نا.)[بڕ: تۆرک] ١ـ بێچووی مار، تووڵە. ٢ـ توڵە، بێچووی سەگ.

**تیلەک** (نا.) بڕ: تیرەگ. ❊ هەروەکی کەوی کەوباڕی لە تیلەکی کوێستانێ/ بەسۆز و بەجووت دەناڵی (گەنج ل ١٢٢).

**تیلەگ** (نا.) بڕ: تیرەگ. ❊ هەچ کەسانێکی نازدارێ من ناس ناکا، قورینگی دە گەرمێنی بوو/ لە هەوەڵی دە بەهارێ دەهاتە تیلەگی دە کوێستانێ (گەنج ل ١٥٥).

**تیلەمار**[1] (گیان.)[تیلە3 + مار1] بێچووی مار، تووڵەمار.

**تیلەمار**[2] (گیان.)[تیل1 (تیر) + ئە + مار1] ماری باریک و درێژ.

**تیلیسان** (نا.)[عەر: طیلسان] کوتە مقەوا یا لاستیکی بڕاو بە شکڵی لەتکە مانگ کە دوو لای کون دەکەن و بە کێش یا بەنێک لە پشت سەریان دەیبەستن و جووتێر و دروێنەوان یا ئەو کەسەی لە لادێ لە بەر تاو کار دەکا دەیهێنێتە نێو چاوانی هەتا ئارەقە نەڕژێتە نێو چاوی و هەتاو لە چاوی نەدا، تێلیسان، بەرچاوە، ئافتاوگەردان.

**تیلێن** (نا. ل)[تیل1 + ئێن] یاریی بە مەرمەڕ، مێشێن، هەڵماتێن.

**تیماج** (نا.)[ئەر] بڕ: تیمانج

**تیمار** (نا.)[پەه: تییمار. باک: تیمار ـ ناو: تیـــمـــار] ١ـ چارەی نەخـــۆش و بریندار. ٢ـ خزمەتی و پێڕاگەیشتنی یەکسم. **~ کردن:** ١ـ خزمەت کردن و پێڕاگەیشتن بە نەخۆش و بریندار. ٢ـ رنەک و قاشاوی یەکسم. ٣ـ دەرمان کردنی برین. ؛؛ هەسپان زین و لغاو کەن، تاژییان بەردەنە کاران/ برینانم تیمار کەن بە دەستی کۆنەیاران (فۆلکلۆر ل ١٣٢).

**تیمارخانە** (نا. ل)[تیمار + خانە] شوێنی چاوەدێریی و پێڕاگەیشتن بە شێت و نەخۆشی رەوانی، شێتخانە.

**تیمارکەر** (ئان. فا)[تیمار + کەر1] ١ـ کەسێک کە خزمەتی نەخۆش دەکا. ٢ـ کەسێک کە خزمەتی یەکسم دەکا و پێیڕادەگا. ٣ـ کەسێک کە برین دەرمان دەکا و دەیپێچێتەوە، برینپێچ.

**تیمانج** (نا.)[فار: تیماج ـ گیل: تیماج. باک: تیمانج ـ ناو: تیماج، تیمانج] ١ـ چەرمی بزن و مەڕ و ماڵات کە خۆش کرابێ و دەباغی و رەنگ کرابێ. ٢ـ کوت و بڕشتێک لە چەرم. ٣ـ [باک] پینە

**تیمچە** (نا. ل)[تیم (کاروانسەرا) + چە][فار: تیمچە] بازاڕۆکەیەک پێکهاتوو لە چەند دوکان و حوجرە بۆ بازرگانی و کڕین و فرۆش.

**تیمساح** (گیان.)[عەر: تمساح] گیانداریکی زلە کە دە ئاو دا دەژی و درێژایی هەتا شەش میتر دەگا. پێستی ئەستوور و دەست و قاچی کورتە و زارێکی زل و ددانی بە قەوەتی هەیە، نەهەنگ، کرۆکۆدیل.

**تیمسار** (نز.)[فار: تیمسار] دەرەجەیەکی باڵایە لە ئەرتەش دا (کوردستانی ئێران)، دەرەجەی دوای سەرتیپ.

**تیمسال** (نا.)[عەر: تمثال] ١ـ وێنە و رەسمی نەقشکراوی کەسێک لە سەر تابڵۆ و کاغەز. ٢ـ وێنە و رەسمی پیرۆز و ئایینی لە سەر کاغەز یا چێو. ⁂ تیمسالّی مەسیح.

**تین**[1] (ئان.)[باک: تین، تهن، تێهن ـ ناو: تین ـ هەو: تین] ١ـ هێزی گەرما. ٢ـ هێز، تاقەت، برشت، هێز و تین. ⁓ **دان:** ١ـ خۆش کردن و زیاد کردنی گەرمای ئاگر. ٢ـ (کنـ.) هان دان و هارووژاندنی کەسێک یا کۆمەڵێک بۆ ئەنجام دانی کارێک بە باری مەنفی دا.

**تین**[2] (ئان.)[باک] بڕ: تینوو

**تینتینۆکە** (نا.)[تین + تین + ۆکە] سەرەتای گەروو لە ژوورەوە، ئەوک، قورگ.

**تینگ** (ئان.)[ئەر] بڕ: تینوو

**تینواتی** (حم.)[تینوو + ئاتی] بڕ: تینوایەتی.

**تینوایەتی** (حم.)[تینوو + ئایەتی] پێویست بە ئاو خواردنەوە هەبوون، توونیەتی، تینویەتی، تینواتی، تینوەتی، تینوێتی. ⁓ **پێ شکان:** ئاوەکییەک کە ببێتە هۆی تینوایەتی نەمان. ⁂ تەنیا بە ئاو تێنوایەتیم دەشکێ! ئەوەندە دۆیە کوا تینوایەتیم پێی دەشکێ. ⁓ **شکان:** تێراو بوون و پێویستی پتر بە ئاوەکی خواردنەوە نەبوون. ⁂ هەتا پێنج چای لە سەر یەک نەخۆمەوە تینوایەتیم ناشکێ. ⁓ **شکاندن:** ئاوەکی یا هەر چی کە ببێتە هۆی تێراو بوون. ⁂ ئاو تینوایەتیم دەشکێنێ بەڵام دۆ نا.

**تینوەتی** (حم.)[تینوو + ئەتی] بڕ: تینوایەتی

**تینویەتی** (حم.)[تینوو + یەتی] بڕ: تینوایەتی

**تینوێتی** (حم.)[تینوو + ئێتی] بڕ: تینوایەتی

**تینوو** (ئان.)[هیک: ترشنا ـ ئەو: تەرشنە ـ سان: ترشنە ـ پەه: تیشنەک، تیشن. بیر: تۆشنە ـ فار: تشنە ـ لۆر: تێشنە ـ باک: تی، تیهن، تین، تهن ـ ناو: تینوو، توونی، تینگ ـ هەو: تەشنە، تەژنە ـ زا: تەیش، تەیشان، تێشان] ١ـ مرۆڤ، گیاندار و گیا کە پێویستیان بە ئاو هەبێ. ٢ـ (مجـ.) ویستی زۆر بۆ شتێک. ⁂ تینووی زانست، تینووی فێر بوون. ⁓ **بوون:** ١ـ مەیلی ئاوەکی خواردنەوە کردن. ٢ـ تامەزرۆیی و داخوازێکی زۆر بۆ شتێک هەبوون. ⁓ **راگرتن:** ئاو و

ئاوەکی نەدان بە گیاندار و ئەوانەی پێویستیان بە خواردنەوە هەیە.

**تێبینی:** لە زاراوەی ناوەندی دا تینوو (توونی، تینگ) لە دوو بەشی تین + ئوو (ئی، گ) پێکهاتوە و ئوو و ئی و گ پاشگرن.

هەروەها ئەم وشەیە لە هەندێک زمانی ئەوروپاییش دا هاوڕیشەی هەیە [سوید: törstig، ئاڵ: durstig، ئین: thirsty]

**تینەت** (نا.)[عەر: طینة] ١ـ زات، سروشتی دەروون. ∷ ئەمن لەو شارە کوژراوی خەدەنگی نازەنینێکم/ فەڕەنگی تینەتە، کافر دڵە، زاهیر موسڵمانە (وەفایی ل ١٤٣). ٢ـ خوو، عادەت.

**تیوب** (نا.)[؟] لاستێکی نێو تەگەر و چەرخی ترۆمبێل و دووچەرخە و کەرەسەی لەم بابەتە کە بای تێدەکرێ.

**تیوتیوە** (نا. ل)[تیو + تیو + ە] بڕ: تیف تیفە. **~ دان:** بڕ: تیف تیفە دان.

**تیهن** (ئان.)[باک] بڕ: تینوو

**تیهوو** (گیان.)[بڕ: تێهوو] بڕ: سوێسکە

**تێ**[1] (پێشـ.)[باک: تێ ـ ناو: تێ ـ زا: تێ] ١ـ پێشگرێکی کارە کە مانای بەرەو نێو و ژوور چوون دەدا بە کردار، ئەنە. // لێ. ∷ تێنان، تێکردن، تێبڕین، تێخستن. ٢ـ مانای زۆر و زەخت بە کار و کردەوەیەک دەدا. ∷ تێتەپاندن، تێخزاندن، تێهەڵپێچان، تێتووڕاندن. ٣ـ دەکەوێتە بەر پێشگری دیکە و پێشگرێکی تێکەڵاو ساز دەکا. ∷ تێهەڵ، تێوەر

**تێ**[2] (نا.) بڕ: تا1

**تێ**[3] (نا.) ناوی چوارەم پیتی کوردیی

**تێ ئاخنین** (چا. م)[تێ1 + ئاخنین] ١ـ بە زۆر شتێک دە نێو دەفرێکی پڕ نان. ٢ـ بە زۆر خۆ خزاندنە نێو شوێنێکی پڕ، تێپەستاوتن. ∷ سینەما هێند پڕ بوو کەسی دیکەیا نەدەهێشت بە زۆر خۆم تێ ئاخنی. ٣ـ خواردن بە گووپی پڕ و تێر و تەسەلی. ∷ دایکم چێشتێکی خۆشی ساز کردبوو، چاکمان تێ ئاخنی.

**تێ ئاڵان** (چا. ل)[تێ1 + ئاڵان] بڕ: تێهاڵان.

**تێ ئاڵاندن** (چا. م)[تێ1 + ئاڵاندن] بڕ: تێهاڵاندن

**تێ ئاڵقان** (چا. ل)[تێ1 + ئاڵقان] گیر کردنی شتێک دە نێو شتێکی دیکەوە، پێوە گیر کردن.

**تێبردن** (چا. م)[تێ + بردن] تێنان، دە نێو نان.

**تێبڕین** (چا. م)[تێ1 + بڕین] شتێک بە زۆر دە کون یا شوێنێک نان، تێنان. ⁘ دارێکی تێبڕی.

**تێبەربوون** (چا. م)[تێ1 + بەربوون] ١ـ شالاو بردنی تێگرایی و دەورە دان بۆ خواردن یا ئەنجامی کارێک. ٢ـ ئاگر گرتن. ٣ـ پەلاماری سەگ و دڕندە بۆ گرتن. ٤ـ شالاوی بێچوو بۆ شیر مژین.

**تێبەردان** (چا. م)[تێ1 + بەردان] ١ـ هاندان و دنە دانی سەگ بۆ گرتنی کەسێک. ٢ـ بەردانی سەگ و تاجی راو بۆ گرتنی نێچیر. ٣ـ گراندنی ئاگر، سووتاندن. ٤ـ بەرەڵڵا کردنی زا بۆ ماک، بەردانی کار و بەرخ و گوێلک و ... بۆ شیر خواردن و مژینی گوانی دایکیان. ٥ـ بەردانی بە تێگرایی و پەراندنی گیانداری نێر بۆ سەر مێ.

**تێبین** (ئان. فا)[تێ1 + بین2] کەسێک کە ئاکامی کار و مەسەلەیەک بە وردی لەبەر چاو دەرگرێ. ~ **بوون:** ورد بوون لە ئاکامی کار و مەسەلەیەک، دووربین بوون. ⁘ باشە چاوم تێبینە دەیرێژێتە داوێنم دەنا/ گەنجی فرمێسکم هەموو تێدادەچوو لێرولەوێ (هێدی ل ٣٢٥).

**تێبینی** (حم.)[تێبین + ئی] روانگە و بۆ چوون لە سەر مەسەلەیەک. ~ **هەبوون:** را و بۆچوون سەبارەت بە مەسەلەیەک هەبوون.

**تێپەڕ** (نا. چا)[لە: تێپەڕین] ١ـ گوزەر. ٢ـ رەد. ٣ـ دوایی، کۆتایی. ~ **بوون:** ١ـ گوزەران. ٢ـ رۆیشتن. ٣ـ تەواو بوون، کۆتایی پێهاتن، تێپەڕین. ⁘ سەردەمی شەڕ تێپەڕ بوو! ~ **کردن:** ١ـ تێپەڕاندن، گوزەراندن. ٢ـ تەواو کردن، دوایی پێهێنان.

**تێپەڕاندن** (چا. م)[تێ1 + پەڕاندن] ١ـ گوزەراندن، تێپەڕ کردن. ٢ـ رەد کردن، بردن. ٣ـ بە جێ هێشتن. ⁘ ئەوە چیە نووسیوتەوە نیوەت تێپەڕاندوە.٤ـ دوایی پێهێنان، تەواو کردن. ⁘ دوو ساڵ زیندانمان بە سەختی تێپەڕاند.

**تێپەڕین** (چا. ل)[تێ1 + پەڕین] ١ـ رۆیشتن، رابواردن. ٢ـ گوزەرانی کات و زەمان. ٣ـ دوایی پێهاتن، تەواو بوون

**تێپەستان** (چا. م)[تیّ1 + پەستان] بە زۆر جیّ کردنەوەی شتێک دە نێو شتێکی پڕ و ئاخنراو. ٢- بە زۆر جیّ کردنەوەی کەسێک دە نێو حەشامەتێکی زۆر. & تێپەستاوتن.

**تێپەستاوتن** (چا. م)[تیّ1 + پەستاوتن] بڕ: تێپەستان

**تێپێچان** (چا. م)[تیّ1 + پێچان] ١- تێوەپێچان، لێهالاّن. ٢- تێهەڵپێچان

**تێپێچاندن** (چا. ل)[تیّ1 + پێچاندن] لێهالاّندن، تێوەپێچان.

**تێترنجان** (چا. ل)[تیّ1 + ترنجان] گیر کردن و حاسیە بوونی کەس یا شتێک لە شوێنێکی تەنگەبەر وەها کە بە زەحمەت دەربێ، تێترینجان.

**تێترنجاندن** (چا. م)[تیّ1 + ترنجاندن] تێپەستاوتن و تیّ ئاخنینی کەس یا شتێک بە زەختەوە دە شوێنێکی تەنگەبەر، تێترینجاندن.

**تێترینجان** (چا. ل)[تیّ1 + ترینجان] بڕ: تێترنجان

**تێترینجاندن** (چا. م)[تیّ1 + ترینجاندن] بڕ: تێترنجاندن

**تێترین** (چا. ل)[تیّ1 + ترین] ١- ترین بە سەر کەسێک دا. ⁂ دە زارت ترم! تێتترم چ پیاوێکی! (جنێو) ٢- (مجـ.) وەلانانی شتێک یا تەنانەت کەسێک کە بەلاّوە گرینگ نەبێ، بایخ بۆ دانەنان بۆ شتێک یا کەسێک. ⁂ تۆ پێت وایە ماشێنێکی چاکت کڕیوە، تێیترم چا ئەوە چیە.

**تێتکان** (چا. ل)[تیّ1 + تکان] ڕژان و تێکران بە تنۆک و دڵۆپ.

**تێتکاندن** (چا. م)[تیّ1 + تکاندن] بە تنۆک ئاوەکی تکاندنە نێو شتێک، تێکردن بە دڵۆپ دڵۆپ.

**تێتلێسک** (گیا.)[؟] گیایەکی ئاوییە، هەمیشە سەوزە، گەڵای وەک کەوەر وایە، ئەدرێ بە ئاژەڵ (خاڵ ب ١ ل ٣٢٧) تێتیلێسک.

**تێتووڕاندن** (چا. م)[تیّ1 + تووڕاندن] بە قەو فوو لە شەیپوور و شمشاڵ و ئامیری مووسیقای دیکە لەم بابەتە کردن، تێخوڕین.

**تێتەپاندن** (چا. م)[تیّ1 + تەپاندن] تێنان بە قەو، بە زۆر کەسێک یا شتێک دە پاڵ کەسێک یا شوێنێک دا جیّ کردنەوە، بە زۆر لێبردن.

**تێتەقاندن** (چا. م)[تیّ1 + تەقاندن]

ڕاکردن، هەڵاتن، تێقووڵاندن.

**تێتیلێسک** (گیا.) بڕ: تێتلێسک

**تێچ** (ئان.)[زا] بڕ: تیژ

**تێچاندن** (چا. م)[تێ1 + چاندن] ١- شتی وردە، ئارام ئارام پژاندن و کەم کەمە تێکردن. ⁘ بۆ ساز کردنی ئاردەوا دەبێ ئاردەکەی تێچێنی. بۆ ئەوەی کە ئاگرەکە دانەمرکێ ئەو پووش و پەڵاشەی تێچێنە! ٢- پیلان گێڕان و خراپ کردنی کەسێک بە قسە و درۆ هەڵبەستن. & تێچەندن

**تێچریکاندن** (چا. ل)[تێ1 + چریکاندن] دەنگ هەڵبڕینی بە قەو و ناسکی گۆرانیبێژ، گۆرانی کوتن بە دەنگی بەرز و ناسک.

**تێچڕان** (چا. ل)[تێ1 + چڕژان] بڕ: تێچڕژان

**تێچڕاندن** (چا. ل)[تێ1 + چڕژاندن] بڕ: تێچڕژاندن.

**تێچڕژان** (چا. ل)[تێ1 + چڕژان] کۆمەڵ و حەشامەتێکی زۆری گیاندار دەباڵ یەک دا، تێچڕان.

**تێچڕژاندن** (چا. ل)[تێ1 + چڕژاندن] کۆمەڵ و حەشامەتێکی زۆری گیاندار دەباڵ یەک کردن و خزاندن وەها کە جموجۆڵیان بە سەر یەکتر دابێ، تێچڕاندن.

**تێچوون** (چا. ل)[تێ1 + چوون] ١- خەرج هەڵگرتن، پارە بردن. ⁘ ماڵەکەم دوو میلیۆنی تێچووە!

**تێچەقان** (چا. ل)[تێ1 + چەقان] چوونە نێوی شتێکی تیژ، چەقانی شتێکی تیژ، تێچەقین. ⁘ دڕوویەکم تێچەقی. دەرزیلەکم دە پێ چەقیوە.

**تێچەقاندن** (چا. ل)[تێ1 + چەقاندن] تێڕاکردنی شتێکی تیژ بە درێژایی دا. ⁘ دارێکی تێچەقاند.

**تێچەقین** (چا. ل)[تێ1 + چەقین] بڕ: تێچەقان.

**تێچەندن** (چا. م)[تێ1 + چەندن] بڕ: تێچاندن

**تێچێن** (ئان. فا)[لە: تێچاندن] کەسێک کە درۆ و قسەی خراپ بۆ خەڵک هەڵدەبەستێ هەتا تووشی کێشە و گرفتی بکا.

**تێخ** (نا.) بڕ: تیغ

**تێخزان** (چا. ل)[تێ1 + خزان] ١- چوونە نێو جێ و بان و درێژ بوون. ٢- بە

زۆر جێی خۆ کردنەوە لە شوێنێک. ٣ـ ڕەخنە کردن و چوونە ناو کۆمەڵێک بۆ شۆفاریی و سیخوڕیی. & تێخزین

**تێخزاندن** (چا. ل)[لە: تێخزان] ١ـ کەسێک دە پاڵ کەسێک خزاندن. ٢ـ کەسێک بە زۆر و بە قەو دە شوێنێک کوتان. ٣ـ تێنان بە قەو، تێتەپاندن.

**تێخزین** (چا. ل)[تێ1 + خزین] بڕ: تێخزان

**تێخستن** (چا. م)[تێ1 + خستن] ١ـ شتێک دە نێو دەفرێکی قووڵ هاویشتن، تێهاویشتن. ٢ـ شتێک دە نێو کون یان بۆشاییەک نان، تێنان. ٣ـ دەنگ بە کەسی کاندید و هەڵبژاردە دان، دەنگ دان. ⁂ سبەی هەڵبژاردنە تۆ بۆ کێی تێدەخەی. ٤ـ پێوە نانی ئەو ئامرازانەی کە بە دار یا ڕەژی کار دەکەن وەک سەماوەر و سۆبە، تێهاویشتن، هەڵکردن، پێکردن. ⁂ دا ڕۆڵە ئەو سەماوەرەی تێخە با چایەکی بخۆینەوە. ٥ـ گان بۆ مەبەستی سووکایەتی یا جنێو، تێنان.

**تێخوڕین** (چا. م)[تێ1 + خوڕین] ١ـ بە تووڕەی و بە زەبر دەگەڵ کەسێک قسە کردن، گوڕاندن بە سەر کەسێک دا، بە قەو دواندن، داخوڕین. ٢ـ دەنگ دانی حەیوان و گیاندار بە تووڕەیی بۆ توندتر ڕۆیشتن. ٣ـ تێتووڕاندن. ⁂ هۆ شوانی بەختیار تێخوڕە درەنگە/ بێ شمشاڵ لە دەشتیش وەکوو ماڵ دڵ تەنگە (گۆران ل ٥٢).

**تێخونجان** (چا. ل)[تێ1 + خونجان] لەبار بوون و گونجانی شتێک لە شوێنێک دا، گونجان، تێگونجان.

**تێدا** (پێشـ.)[تێ1 + دا2] پێشگری کارە بە مانای دە نێو دا، تیا.

**تێدابوون** (چا. ل)[تێدا + بوون] ١ـ دە نێو دا هەبوون، هەبوون، تیابوون. ⁂ گیرفانت چی تێدایە! پارەیەکی زۆرم دە بانک دایە. ٢ـ بەشدار بوون لە کار و مەسەلەیەک دا. ⁂ هەر بەرنامەیەکتان بۆ ئەمڕۆ هەبێ، منیش تێدام.

**تێداچوون** (چا. ل)[تێدا + چوون] فەوتان، نەمان، لە بەین چوون، تیاچوون.

**تێدار** (ئان. فا)[تێ2 + دار2] کەسێک کە نۆبەتێ و یاوی هەیە، تادار. ⁂ بۆ تێدار چاکە سایەی داری بی/ ئەمما ئەویندار سایەی یاری بی (حەقیقی ل ٦٠).

**تێدان** (چا. م)[تێ1 + دان3] ١ـ پەیدا بوون و سەر هەڵدانی گیانداری ورد دە

نێو شتتێک دا. ‎:: کرم تێدان، ئەسپێ تێدان. ٢ـ لێنان و لێ زیاد کردنی پارچە لە سەر جل و پارچەی دیکە، دە سەر کردنەوە، تێدانەوە. ‎:: لێفەکەم کورتە بستکی تێدە. ٣ـ تێهەڵسوون. ‎:: کرێم تێدان، گێچ تێدان.

**تێدانەوە** (چا. م)[تێ1 + دانەوە] ١ـ دە سەر کردنەوە، لێنانی پارچە، تێدان. ٢ـ دەست پێکردنەوەی عادەت و شتێک کە تەرک کرابێ. ‎:: سیگارم وەلانابوو بەڵام دیسان تێمداوە.

**تێداهێشتنەوە** (چا. م)[تیدا + هێشتنەوە] ١ـ هەندێک شت لە بن یا لە نێوی شتێک دا راگرتن و دەست لێنەدان. ٢ـ (مجـ.) مایە دانان.

**تێر** (ئان.)[پەهـ: سێر. باک: تێر ـ ناو: تێر ـ هەو: سێر] ١ـ کەسێک کە گەدەی لە خوردن پڕە و مەیلی خواردنی نەماوە، تەسەل. // برسی. ٢ـ پڕ. ٣ـ بێزار، وەڕەز. ٤ـ پڕ بەدڵ، بە کەیفی خۆ. ‎:: دانیشە تێر چاوی لێکە. ٥ـ هەر رەنگێکی تۆخ (جگە لە سپی). ٦ـ دەوڵەمەند، تەسەل. ‎:: سووری تێر، شینی تێر. **پێ ~ بوون:** خۆراک و خواردنێک کە گیاندار یا مرۆڤ تێر بکا. ‎:: گۆشت مرۆڤ پێ تێر دەبێ بەڵام ئاش مرۆڤ پێی تێر نابێ. **~ بوون:** ١ـ پڕ بوونی گەدە و دەست لە خواردن هەڵگرتن، تێر خواردن. ٢ـ لێ تێر بوون، بێمەیل بوون، بێزار بوون. **~ خواردن:** ١ـ تێر بوون لە خواردەمەنی. ٢ـ (کنـ.) ئاکام و ئەنجامی کارێک کە بە دڵ نەبێ. ‎:: ئەگەر ببیە دوکتور تێر دەخوین (تەوس). **~ خەوتن:** بە رادە و ئەندازە نوستن، تێر نوستن. منداڵ ئەگەر تێر بخەوێ تێرەخەو دەبێ. **~ کردن:** نان دان بە کەسێک یا گیاندارێک هەتا ئەو رادەیەی مەیلی خواردنی نەمێنێ. **~ نوستن:** بڕ: تێر خەوتن. **لێ (لە شتێک یا کەسێک) ~ بوون:** لەبەر چاو کەوتن، کەس یا شتێک کە ئیدی مەیل رانەکێشێ. ‎:: سیگار لێی تێر بووم. لە گەڕان و خولانەوە تێر بووم. ‖ **تێرتێر:** ١ـ زۆر تێر، مرِ. ‎:: تێرتێرم دۆڵمە خوارد. ٢ـ پڕ بە دڵ، بە کەیفی خۆ. ‎:: تێرتێرمان باسی کۆن کرد، تێرتێر پێکەنین و تێرتێر گریاین.

**تێراو** (ئان. ل)[تێر + ئاو] حاڵی شیناوەرد و دەغڵ و دانێک کە باش ئاو درابێ. ٢ـ کەسێک کە هەتا رادەی تێنوایەتی شکان ئاو بخواتەوە. ~

**بوون:** ١ـ دەغڵ و شـــیناوەردێک کـــە بە رادەی پێـــــویست ئاو داربێن. ٢ـ ئاو خواردنەوە هەتا رادەی تینوایەتی شکان، پێـوسـیـتـی بە ئاوی زێدە نـەبوون. **~ کردن:** ئاو دان بە رادەی پێویست.

**تێـراویی** (حم.)[تێراو + ئیی] تێراو بوون، پێویستی بە ئاوی زێدە نەبوون.

**تێرخوێ** (ئان. ل)[تێر + خوێ] حاڵی چێـشـتـێکی بە ئەندازە خـوێی هـەبێ و پێوێستی بە خوێ پێداکردن نەبێ.

**تێرنەخۆرە** (ئان. فا)[تێر + نە + خۆر + ئە] حاڵی کەسێک کە هەرچەندی بخوا دیسان هەر تێر نەبێ.

**تێـر و پڕ** (ئان. ل)[تێـر + و + پڕ] ١ـ پتر لە رادە تێر، مڕ. ٢ـ یەکجار زۆر، پڕ بە دڵ. ⁘ تێـر و پڕم مـاچ کـرد و تێـر و پڕم دە باوەش گــــرت. ٣ـ دەوڵەمــــەند، ساماندار. **~ بوون:** ١ـ پتر لە رادە تێر بوون. ٢ـ دەوڵەمەند بـوون و پتر لە رادەی پێـویست هـەبوون. **~ خواردن:** زۆر تێر خواردن. **~ کردن:** مڕ کردن، زۆر تێر کردنی کەسێک.

**تێـر و پڕیی** (حم.)[تێـر و پڕ + ئیی] تێروپڕ بوون.

**تێـر و تـەسـەل** (ئان. ل)[تێـر + و + تەسەل] ١ـ بە قەرا پێویست تێر. ⁘ تێر و تەسـەل قـسـە کـردن. ٢ـ کـەسـێک کـە ئاتـاج و مــوحـــتـــاج نەبێ و لە قـــەدەر پێـویست هەشـیبێ، پۆشـتـە، بە ئـیـروو. **~ بوون:** ١ـ بە قــەرا پێــویست تێــر بـوون. ٢ـ دەوڵەمـــــەند بوون و کـــۆک و پۆشتە بوون.

**تێر و تەسەلیی** (حم.)[تێر و تەسەل + ئیی] تێر و تەسەل بوون.

**تێروێ** (گیا.) بڕ: تەربی

**تێــــــرۆر** (نا.)[لات: terror (ترس، خـۆف)] کـاری کـوشـتنی نـەیار. **~ کـردن:** کـوشـتن و فـەوتاندنی دژ و نـەیار لەپڕ و ناغافڵ.

**تێـرۆریست** (نا.)[فـەر: terroriste] کەسێک کە کاری کوشتنی نەیار و دژە، پیاوکوژ.

**تێـرۆریزم** (نا.)[فـەر: terrorisme] بیـــر و بڕوایەک کـــە بـۆ گـــەیشتن بە ئامانجی لە تێرۆر کەلک وەربگرێ.

**تێروو** 1 (گیـا.)[هس: تیـروو] دارێکە بەرێکی وەک تووڵە زەڕە ئـەگـرێ، گـەڵای وەک چواڵەتاڵە وایە (خـاڵ ب ١ ل ٣٢٩) vitex agnus castus, chaste tree (تۆفیق وەهبی ل ١٤٧).

**تێروو** [2] (گیانـ.)[؟] گیانداری دڕندەی وەک گورگ، ورچ، شێر و بەبر.

**تێرەخۆرە** (ئان. فا)[تێر + ئە + خۆر + ئە] رادە و ئەندازەیەک لە چێشت کە مرۆڤ بە تەواوی تێر بکا.

**تێریەتی** (حم.)[تێر + یەتی] بڕ: تێریی

**تێریی** (حم.)[تێر + ئیی] ١ـ تێر بوون، تێرێتی، تێریەتی. ٢ـ تێر و تەسەلیی، تێروپڕیی.

**تێرێتی** (حم.)[تێر + ئێتی] بڕ: تێریی

**تێڕ** (نا.)[باک: تێڕ ـ ناو: تێڕ، تێڕک] ١ـ خورجی گەورەی دووتایی کە بە سەر پشتی بارەبەری دادەدەن بۆ بار تێنان، تێڕک. ٢ـ ئەندازەیەک کە تێڕ دەیبا. ٣ـ (مجـ.) زۆر و فرە بۆ هەندێک شت. ؛؛ تێڕێک نان دەخوا و تێڕێک دەڕی.

**تێڕا** (پێشگـ.) پێشگری تێکەڵاوی کارە کە لە تێ + ڕا پێکهاتوە.

**تێڕاچوون** (چا. ل)[تێڕا + چوون] شتێکی تیژ و باریک چوونە نێو لەش یا شتێکی دیکەوە. ؛؛ درووم دە دەست ڕاچوو.

**تێڕاخوڕین** (چا. م)[تێڕا + خوڕین] ١ـ بە سەر کەسێک دا گوڕاندن، بە گژ کەسێک دا چوون. ٢ـ هان دان و دنە دانی کەسێک بۆ ئەنجام دانی کارێک.

**تێڕادان** (چا. م)[تێڕا + دان] ئاو تێوەردان لە دەفر بۆ خاوێن کردنەوە.

**تێڕادیتن** (چا. م)[تێڕا + دیتن] دڵنیا بوون و متمانە پێکردن بە کەسێک بۆ ئەنجام دانی کارێک. ؛؛ تێتڕا دەبینم بۆیە داوی قەرزت لێدەکەم.

**تێڕاکردن** (چا. م)[تێڕا + کردن] شتێک بە درێژایی تێنان و بردنە نێو شتێکی دیکەوە، تێڕۆ کردن. ؛؛ دەستی تێڕا کرد و دوو بێچوو چۆلەکەی لە کون دەرکێشا.

**تێڕامان** (چا. م)[تێ1 + رامان] سەرسوڕمان و حەیران مانەوە لە ئەنجام دانی کارێک، تیاڕامان، ڕامان.

**تێڕتێڕە** (گیانـ.)[؟] بڕ: بزنمژ

**تێڕتێڕەملە** (گیانـ.)[تێڕتێڕە + مل + ئە][هەو] بڕ: بزنمژ

**تێڕژان** (چا. ل)[تێ1 + ڕژان] هوروژم و لێشاوی حەشیمەت بە تێگڕایی و زۆر.

**تێڕژاندن** (چا. م)[تێ1 + ڕژاندن] تێکردن و پڕ کردنی شوێن و جێگەیەک

لە حەشیمەت بە تێگڕایی و زۆریی. ۞ خەڵکێکی زۆریان تێڕژاندبوو نێو سالۆن.

**تێڕک** (نا. ل)[تێڕ + ک] بڕ: تێڕ

**تێڕکە** (نا. ل)[تێڕک + ئە] تێڕی گەورە، خورجی گەورە.

**تێڕوانین** (چا. م)[تێ1 + روانین] سەیر کردن و تەماشا کردن بە وردیی و بە سرنجەوە، تێنواڕین.

**تێڕۆ کردن** (چا. م)[تێ1 + ڕۆ + کردن] شتێک بە درێژاییەوە دە نێو شوێنێک نان. ۞ دەستی دە کووپەکەی ڕۆکرد. دارت تێڕۆ دەکەن.

**تێڕیان** (چا. ل)[تێ + ریان] ١ـ گوو دە نێو شتێک کردن. ۞ دە دمی بابت ریم (جنێو). ٢ـ (کنـ.) شتێک خراپ کردن و لە کەلک خستن. ۞ هێندت دەست لەو رادیۆیە وەردا هەتا بە تەواوەتی تێیڕیای! ٣ـ (کنـ.) کارێک خراپ کردن و بە ئاکام نەگەیشتن. ٤ـ (کنـ.) پێ گرینگ نەبوونی شتێک یا کەسێک و بە سووک دانانی.

**تێز**[1] (نا.)[بڕ: تێزە] ١ـ کونێکە لای پێی هێندێ تفەنگ و دەمانچەوە باڕووتی ئەخرێتە سەر و ئاگری پێوە ئەنرێ (خاڵ ب ١ ل ٣٢٩). ٢ـ [باک] باڕووت

**تێز**[2] (نا.)[فەر: these] ١ـ باس و مەسەلەیەک کە کەسێک بۆ روون کردنەوە و شی کردنی هەوڵ بدا. ٢ـ لێکۆڵینەوە و بابەتێک کە خوێندکاری زانکۆ دوای تەواو کردنی دەرسەکانی کاری لە سەر دەکا و دوکتوراکەی پێوەردەگرێ.

**تێز**[3] (ئاک.)[تور: tez لە فار: تیز] پەلە، لەز، خێرا، زوو.

**تێزاب** (نا. ل)[فار: تیزاب] بڕ: تیژاو

**تێزاو** (نا. ل)[تێز (فار: تیز) + ئاو1] بڕ: تیزاب و تیژاو

**تێزان** (چا. ل)[تێ + زان] پەیدا بوون، سەر هەڵدان. ۞ چاوم فرمێسکی تێزا. ئەو لێوە ... بۆ ئێستا زەردەخەنەی تێنازێ (گۆران ل ٩٤).

**تێزتیزە** (ئاک. ل)[تێز3+ تێز3+ ئە] پەلەپەل. ~ **دان:** هان دان بۆ پەلە کردن، پەلەپەل لێکردن، وەپەلە خستن. ۞ دە لێمگەڕێ بەس تێزتێزەم بدە! ~ **لێکردن:** پەلە لێکردن، وەپەلە خستن، تێزتێزە دان.

**تێزکە** (نا. ل)[تێز1 + کە] بڕ: تێزە. **دە ~ نان:** (کنـ.) فریو دان، کڵاو لە سەر نان، هەڵخراندن. ۞ وای دە تێزکە نام بۆ خۆم پێمنەزانی. **وەک ~ی**

**تفەنگ:** (کنـ.) توند، تیژ، بە هەشتاو. ⁂ وەک تێزکەی تفەنگێ بێرە دا تێپەڕی.

**تێزە** (نا. ل)[تێز1 + ئە][باک: تێزکە، تێزەک ـ ناو: تێز، تێزە، تێزکە، تێسکە، تێسکۆڵ] پڵێتەی سەر چەکەمەنی کۆنی وەک تفەنگ و دەمانچەی ڕەشۆکی و تۆپ و دینامیت. ⁂ چەتارم لێدەچەقاند، تێزەم داوێشتە سەرێ/ دەستم لە شینکەی دەبزافت بزرم کرد لە دووکەرێ (سێسەد هۆنراوە ل ٢١).

**تێزەک** (نا. ل)[تێز1 + ئەک][باک] بڕ: تێزە

**تێژ** (ئان.)[ئەر ـ هەو ـ زا] بڕ: تیژ

**تێساوین** (چا. ل)[تێ1 + ساوین] بڕ: تێهەڵسوون

**تێسرەواندن** (چا. ل)[تێ1 + سرەواندن] تێکوتان و لێبادانی کتوپڕ و ناخافڵ لە کەسێکی پەنا دەست.

**تێسکۆڵ** (نا. ل)[تێسکە + ئۆڵ] بڕ: تێزە. ⁂ مەسڵەتێم بۆ پکەن بە زەبری دە پووڵێ/ بە حوکمی دە لیرێ، بە تیسکۆڵێ دە تفەنگێ (گەنج ل ١٥٨).

**تێسکە** (نا. ل)[تێس (تێز1) + کە][ئەر] بڕ: تێزە

**تێسمریاگ** (ئان. فا)[لە: تێکسمڕان][ئەر] بڕ: تێکسڕماو

**تێسمریان** (چا. ل)[تێک + سمڕان][ئەر] بڕ: تێکسڕمان

**تێسوێ** (گیا.)[باک: تێسوو ـ ناو: تێسوێ، تیسوێ، تۆسی، تسوێ، توێسی، توێسوو، تێسوو ـ هەو: تۆسی] ١ـ گیایەکی خۆڕسکی دڕکنە. لاقەدەکەی بریندار دەکەن هەتا جەوی دەربدا کە بۆ مەرەکەب کەلکی لێوەردەگرن و بنەکەشی کەف دەکا. (عەر: عکوب). ٢ـ (کنـ.) کەسی زۆر کز و ڕەقەڵە

**تێسوو** (گیا.) بڕ: تێسوێ

**تێسوون** (چا. م)[تێ1 + سوون] بڕ: تێهەڵسوون

**تێشان** (ئان.)[زا] بڕ: تینوو

**تێشت** (نا.)[بڕ: چێشت] ١ـ چێشت. ٢ـ [باک] نان و چای بەیانی، چاشت، بەرچایی.

**تێشکان** (چا. ل)[تێ + شکان] ١ـ بەزین لە شەڕ و جەنگ دا. ٢ـ بەزین لە سەودا و کایە و کێبەرکێ دا. ٣ـ ڕووخان، وێران بوون. & تێکشکان.

**تێشکاندن** (چا. م)[تێک + شکاندن]

١ـ بەزاندنی دوژمن، سەرکەوتن لە شەڕ دا. ٢ـ بەزاندنی غەنیم لە یاری و کایە دا. ٣ـ رووخاندن، وێران کردن. & تێک شکاندن.

**تێشکاو** (ئان. فا)[لە: تێشکان] ١ـ بەزیو لە شەڕ دا. ٢ـ بەزیو لە کێبەرکێ و یاریی و سەودا دا. ٢ـ رووخاو، وێران، نوغرۆ. & تێکشکاو

**تێشوو** (نا.)[پەھ: تووشەک. لۆر: تووشە ـ فار: توشە. ناو: تێشوو، توێشوو، توێشە، تۆشە ـ هەو: تۆشە، تووشە] ١ـ هەندێک خواردەمەنی کە لە سەفەر دا دەگەڵ خۆ دەیبەن. ٢ـ پاشەکەوتی خواردەمەنی لە ماڵ، ئازووقە. **~ کردن:** ساز کردن و ئامادە کردنی تێشوو بۆ سەفەر، توێشوو کردن، توێشە کردن، تۆشە کردن. ‖ **تێشووی قیامەت:** (کن.) کردەوە و کرداری چاک و بە کەلک بۆ دونیای دیکە.

**تێشووبەرە** (نا. ل)[تێشوو + بەر7 + ئە] ١ـ بڕ: تێشوودان. ٢ـ کەسێک کە نان و خۆراک بۆ جوتیاران دەبا.

**تێشوودان** (نا. ل)[تێشوو + دان4] توربێن و کیسەیەک کە تێشووی تێدەنێن، نانەبەرە، تێشووبەرە، تۆشەدان، تۆشەبەرە، تۆشەبەرە، توێشەبەرە، توێشەدان، توشووبەرە، توێشوودان.

**تێغ** (نا.) بڕ: تیغ

**تێغە** (نا. ل)[تێغ + ئە][ئەر] ١ـ دیوارێکی تەنک بۆ جیا کردنەوە ژوور، تیغە. ٢ـ دەمی تیژی ئامرازی بڕین. ٣ـ لێوار و قەراغ.

**تێفکرین** (چا. ل)[تێ + فکرین (لە: فکر)] فکر لێکردنەوە و ورد بوونەوە لە کەسێک، شتێک یا مەسەلەیەک، سەرنج دان و بیر کردنەوە.

**تێقمان** (چا. م)[تێ + قمان][موک] بڕ: تێقوومان

**تێقماندن** (چا. م)[تێ + قماندن][موک] بڕ: تێقووماندن

**تێقمین** (چا. ل)[تێ + قمین][موک] بڕ: تێقوومان

**تێقڵپاندن** (چا. م)[تێ + قڵپاندن] قڵپ کردنەوەی تێگڕایی ئاوەکییەک دە نێو دەفر، تێقوڵپاندن.

**تێقوڵپاندن** (چا. م)[تێ + قوڵپاندن] بڕ: تێقڵپاندن

**تێـقــووپان** (چا. ل)[تـێ + قــووپان] قــووپانی شــتـێکی رەق خــۆبەخـۆ یا بە دەست کـــەســـێکی نادیار، قـــووپـان، تێـقــووپین. ⁝⁝ ئەو چەلەنگە تێـقــووپاوە ئیدی بە کەلک نایە!

**تێقووپاندن** (چا. م)[تێ + قووپاندن] قووپاندنی شتێک، تێقپاندن. ⁝⁝ کێ ئەو کارتۆنەی تێقووپاندوە.

**تێـقــووپاو** (ئان. فـا)[لە: تێـقــووپان] حاڵی شتێکی رەق کە قووپابێتەوە..

**تێقــووپین** (چا. ل)[تێ + قــووپین] بڕ: تێقووپان

**تێـقــوولان** (چا. ل)[تێ + قــوولاندن] هەڵاتنی بە پەلە و توند و لەپڕ.

**تێقوولاندن** (چا. م)[تێ + قوولاندن] راکردنی بە پرتاو، هەڵاتنی زۆر بە پەلە و توند. ⁝⁝ لە ترسی لێـــدانی بابی وای تێقوولاند دەتکوت جندۆکەی دیوە.

**تێـقــومــان** (چا. م)[تێ + قــومـان] قووم بوون، نوقم بوون لە ئاو دا. تێقمین، تێقوومین، تێقمان.

**تێقوومانـدن** (چا. م)[تێ + قوومانـدن] قووم کردن، نوقم کردن، تێقماندن.

**تێـقــومین** (چا. ل)[تێ + قـمـان] بڕ: تێقوومان

**تێک** (پێـشگـ.) پێـشگری تێکەڵاوی کارە کـە لە [تێ1 + یەک] پێکهاتوە، دە یەک، دەباڵ یەک.

**تێک ئاڵقان** (چا. ل)[تێک + ئالقـان] لێک گیـر بوونی دوو شت دەگەل یەکـتـر، تێکگیران، تێکترنجان.

**تێکبــردن** (چا. ل)[تێک + بردن] دوو یا چەند شت دە نێو یەک نان.

**تێکبەربوون** (چا. ل)[تێک + بەربوون] ١ـ دوو یا چـەند کــەس دەگــەڵ یـەکــتــر بەشـــەڕ هاتن. ٢ـ دوو یا چەند گـیـاندار دەگـەڵ یەکـتـر بەشـــەڕ هاتن. ٣ـ تێکەڵ بوونی نێر و مێ بۆ جووت بوون.

**تێکبــەردان** (چا. م)[تێک + بەردان] ١ـ دوو کەس یا چەند کەس دەگەڵ یەکتر بە شـــەڕ دان. ٢ـ دوو یا چەند گـیـاندار دەگەڵ یەک بە شـەڕ دان. ٣ـ دوو یا چەند گیانداری نێر و مێ دەباڵ یەکتر کردن بۆ جووت بوون و پەڕینە سەر یەک.

**تێکبـــــەزن** (چا. ل)[تێک + بەزین] چوون نـێـــو یەکی دوو شت، دە پاڵ یەک راچوون، تێکپەڕین.

**تێکپەڕاندن** (چا. م)[تێک + پەڕاندن]

دە پاڵ یەکتــر نانی دوو یا چەند شت، تێکبردن و تێکخستنەوە.

**تێکپــەڕین** (چا. ل)[تێک + پەڕین] چوونە نێو یەکی دوو شت.

**تێکترنجان** (چا. ل)[تێک + ترنجان] گیـر کردن و چوونە نێـو یەکی دوو شت، تێک ئاڵقان.

**تێکتـــرنجـــاندن** (چا. م)[تێک + ترنجاندن] لێک گیر کردن و ترنجاندنی دوو یا چەند شت لە یەکتر.

**تێکچــڕژان** (چا. ل)[تێک + چڕژان] تێکەڵ بوون بە چڕ و پڕیی، لێکدران، دە باڵ یـەک دابـوون بە چـڕیی. :: ســـــەری هەلاڵە و بەیبوون و گوڵەجووت تێکهالاوە و تێکچڕژاوە (لاس و خەزاڵ ل ١١٥).

**تـێکچـــــــڕژانـدن** (چا. ل)[تێک + چڕژندن] تێکەڵ کردن و لێکدان بە پڕ و چڕیی، دەباڵ یەک نان.

**تێکچوون** (چا. ل)[تێک + چوون] ١ـ مێشک تێکچوون، شێت بوون. :: حەمە وەک جـاران نەمـاوە بە تەواوی تێکچـوە. ٢ـ لە دڵ گـران هـاتن و نارەحــەت بوون. :: بـە قـــســـــەیەکی چووک تێکدەچێ و نێوچاوانی تێکدەنێ. ٣ـ شـێـوان، خراپ بوون، لە ســەر باری پێشــوو نەمـان. :: مــــاڵ و حـــــاڵەکـــــەم تێکـچــــوە. دۆستایەتییەکەمان لە سەر هیچ تێکچوو. ٤ـ گــــۆڕان بـەرەو خــــراپـی. :: هەوا تێکچـوون، مـێـشک تێکچـوون، حـاڵ تێکچوون.

**تێکخـــســـــتنەوە** (چا. م)[تێک + خســتنەوە] ١ـ دە سـەر یەک کـردنەوەی پـارچە. ٢ـ لێک بەســـتنی دوو ســـەری ڕێسراو و شریت. & تێککردنەوە.

**تـێـکـدان** (چـا. م)[تـێک + دان] ١ـ خراپ کردن، وێران کردن، رووخاندن. ٢ـ شێواندن، پەرێشان کردن.

**تێکردن** (چا. ل)[تێ1 + کردن] ١ـ دە نێـو کـردن، رژاندنە نێـو شـتێک. :: ئاو تێکردنە نێـو قـابلـەمـە. تۆو دە گـیرفـان کـردن. ٢ـ دەسـپــەڕ لێـدان، کـەپلەمـە کێـشـان. ٣ـ کـێـشـان. :: قـەننـەیەکی تێکرد. ئەمن جگەرەی خـۆم تێکردوە. ٤ـ تێکبـەردانی کـار و بەرخ لە دایکیـان بۆ مژینی.

**تێکڕا** (ئاک.)[؟] پێکەوە، هـەمـــوو، تێگڕا، وێگڕا، پێکڕا. :: منداڵەکـــان تێکڕا پیـــرۆزبایـی ســـاڵی تازەیان لە باوکیان کرد و تێکڕا یەکتریان ماچ کرد.

**تێکڕابوون** (چا. ل)[تێک + رابوون] لە نەکاو رابوون و هەستان لە خەو، راست بوونەوە لە خەو.

**تێکڕایی** (ئاک. ل)[تێکڕا + ئیی] بە تێکڕا، بە گشتی، سەرپاک، تەواوەتی، تێگڕایی. ⁂ تێکڕایی قسەکانی، قسەیەکی راستی تێدانەبوو.

**تێکڕژان** (چا. ل)[تێک + رژان] تێکبەزین، تێکەڵ یەک بوون. ⁂ دەڵێی نەفخی سوور لێدراوە/ زولف وەها تێکڕژاوە (سەعید و میرسێوەدین ل ٢٧٣).

**تێکڕمان** (چا. ل)[تێک + رمان] رمان بە تێگڕایی، تێکڕووخان، تێکقرمان.

**تێکڕماندن** (چا. م)[تێک + رماندن] رووخاندن بە تێگڕایی، خراپ کردن، تێکڕووخاندن.

**تێکڕووخان** (چا. ل)[تێک + رووخان] رمان و خراپ بوونی خانووبەرە یا شوێنێک بە تێگڕایی، تێکقرمان، تێکڕمان.

**تێکڕووخاندن** (چا. م)[تێک + رووخاندن] رووخاندن، وێران کردن، تێکڕماندن. ⁂ پێلاقەیەکی بە کەڵەکە بەردەکە دادا و تێکیڕووخاند.

**تێکسڕمان** (چا. ل)[تێک + سڕمان] زل و کەتە و پڕ گۆشت بوون، ئەستوور و پتەو بوون. & تێکسمڕان، تێسمڕیان.

**تێکسڕماو** (ئان. فا)[لە: تێکسڕمان] حاڵی مرۆڤ یا گیاندارێکی پڕگۆشتی ئەستوور و پتەو، توێکمە. & تێکسمڕاو، تێسمڕیاگ.

**تێکسمڕان** (چا. ل)[تێک + سمڕان] بڕ: تێکسڕمان

**تێکسمڕاو** (ئان. فا)[لە: تێکسمڕان] بڕ: تێکسڕماو

**تێکشکان** (چا. م)[تێک + شکان] ١ـ لەت و پەت بوون، ورد و خاش بوون. ٢ـ شکان، تێشکان، بەزین، شکست خواردن بە تەواویی. ٣ـ تێکچوونی لەش و باری لەشساغی لەبەر خەم و خەفەت و باری مادیی و شتی لەم بابەتە.

**تێکشکاندن** (چا. م)[تێک + شکاندن] ١ـ لەت و پەت کردن، ورد و خاش کردن. ٢ـ شکست دانی دوژمن بە تەواویی، تێشکاندن. ٣ـ فەوتاندن، نابوود کردن، کوشتن. ⁂ کوتی دەچم با شێری رەش تێکم بشکێنێ (لاس و خەزاڵ ل ١٤). ٤ـ تێکدانی لەشساغی کەسێک، بەر لە وادە پیر کردن و لە

کەلک خستنی کەسێک.

**تێکشکاو** (ئان. فا)[لە: تێکشکان] ١ـ حاڵی دەفر و هەر شتێکی لەت و پەت. ٢ـ بەزیو، تێشکاو. ٣ـ حاڵی مرۆڤێک کە لەشساغی تێکچووبێ.

**تێکقرمان** (چا. ل)[تێک + قرمان] بڕ: تێکڕووخان

**تێککردنەوە** (چا. م)[تێک + کردنەوە] وەسڵ کردن و پێکەوە لکانی دوو هەودا و ریس و شتی لەم بابەتە، تێکخستنەوە.

**تێکل** (نا.)[باک ـ زا] بڕ: تێکەڵ

**تێکوپێک** (نا. ل)[تێک + و + پێک] وێران، خراپ، نوغرۆ. **~ دان:** خراپ کردن، وێران کردن. ؛؛ ماڵەکەی تێکوپێک دا و سەرلەنوێ سازی کردەوە.

**تێکوتان** (چا. م)[تێ1 + کوتان] ١ـ لێدانی مست، نەقورچ و کاری لەم بابەتە لە کەسێک یا شتێک. ٢ـ تێنان و تێکردن بە زۆریی.

**تێکوشین** (چا. م)[تێ1 + کوشین] ١ـ نان دە شۆربا دا ورد کردن و نەرم کردن. ٢ـ (نا.) پێخۆرێکە لە دۆ یا ماستاو و سەوزی و هارۆ و سێو و کشمیش کە وێکڕا دەباڵ یەکی دەکەن و دەیخۆن. ؛؛ تێکوشین بە هەویای جیرانی ویشکە (پەند) & تێگوشین، تێوشین، تێوڵین.

**تێکوڵ** (نا. ل) بڕ: توێکڵ

**تێکوەردان** (چا. م)[تێک + وەردان] تێکەڵ کردن، لێکدان.

**تێکۆشان** (چا. ل)[تێ1 + کۆشان] بڕ: تێکۆشین.

**تێکۆشین** (چا. ل)[پەه: توخشییتەن][تێ1 + کۆشین] حەول دان بۆ پێگەیاندنی مەبەست و کار و مەسەلەیەک، خەبات کردن، تێکۆشان.

**تێکهالان** (چا. ل)[تێک + هالان] ١ـ چوونە نێوی یەکی دوو یا چەند شتی درێژ. ؛؛ کەمێک دێتن شوویای زریان/ دەسرە و دەسماڵیان تێکهالان (سەعید و میرسێوەدین ل ٢٧٢). ٢ـ یەکتر دە باوەش گرتن، ئامێز بە یەکتر داگرتن، لە یەک هالان، لێکهالان.

**تێکهەڵچوون** (چا. ل)[تێک + هەڵ + چوون] پێک هەڵپڕژان و شەڕ کردن دەگەڵ یەکتر.

**تێکهەڵدان** (چا. م)[تێک + هەڵ +

دان] ١ـ شەڕ دەگەڵ یەک کردن و لە یەکتر دان بە شەپ و شەق. ٢ـ شەڕی گیاندار دەگەڵ یەکتر بە شاخ.

**تێکهەڵشێلان** (چا. م)[تێک + هەڵ + شێلان] تێکەڵ کردن و شێلانی دوو شت بە یەکەوە.

**تێکەل** (نا.)[باک] بڕ: تێکەڵ

**تێکەڵ** (نا.)[باک: تێکەل، تێکل ـ ناو: تێکەڵ ـ هەو: تێکەڵ ـ زا: تێکل] ئاوێتە، لێکدراو، قاتی، تەڤ ل هەڤ. ~ **بوون:** ١ـ ئاوێتە بوونی شتێک دە نێو شتێکی دیکە دا. ٢ـ لێکدران شتەکان دە نێو یەک دا. ٣ـ تێکهالان، جووت بوونی نێر و مێ دەگەڵ یەکتر. ~ **دان:** ١ـ لێکدانی ئاوەکی بۆ توانەوەی شتێک. ؛؛ چایەکەت تێکەڵ دە با شەکرەکە بتوێتەوە. ٢ـ لێکدانی چێشتی ئاوەکی بۆ هەڵنەگەڕان و هەڵنەچوون. ؛؛ شیر تێکەڵ دان، دۆکڵیو تێکەڵ دان. ~ **کردن:** ١ـ لێکدان و دەباڵ یەک کردنی دوو یا چەند شت دەگەڵ یەک. ٢ـ سەر لێشێوان و دروست بیر نەکردنەوە، خەرفان، مێشک تێکەڵ کردن.

**تێکەڵاو** (ئان. ل)[تێکەڵ + ئاو] حاڵی هەر شتێکی تێکەڵ و ئاوێتە. ~ **بوون:** ١ـ ئاوێتە بوون. ٢ـ گەرم بوونی بەین و دۆستایەتی و ئاموشۆی چڕ و پڕ. ~ **کردن:** تێکەڵ کردن.

**تێکەڵاویی** (حم.)[تێکەڵاو + ئیی] ١ـ پێوەندیی نزیک و هاموشۆ دەگەڵ کەس و کۆمەڵێک. ٢ـ ئۆگریی، ئالوودەیی. & تێکەڵیی

**تێکەڵ پێکەڵ** (ئان. ل)[تێکەڵ + پێکەڵ] زۆر شێواو و بێ سەر و بەرە، نائاشکرا، ناڕێکوپێک، تێکەڵ و پێکەڵ. ؛؛ قسەی تێکەڵ پێکەڵ. چێشتی تێکەڵ پێکەڵ. ~ **بوون:** شێوان و بێ سەر و بەرە بوون، ناڕێکوپێک بوون. ~ **کردن:** زۆر تێکەڵ کردن، شێواندن، تێکدان.

**تێکەڵ و پێکەڵ** (ئان. ل)[تێکەڵ + و + پێکەڵ] بڕ: تێکەڵ پێکەڵ

**تێکەڵیی** (حم.)[تێکەڵ + ئیی] بڕ: تێکەڵاویی

**تێکەوتن** (چا. ل)[تێ1 + کەوتن] ١ـ دە نێو قوڵکە یا شوێنێک کەوتن. ٢ـ تێکەڵ بە کار و مەسەلەیەک بوون بە بێ ویست. ٣ـ سەرنەکەوتن لە سەرەتای هەندێک کایە و یاری دوو کەسە یا دوو دەستە دابە تەڕناویشکە یا تاقمانە جووت.

**تێکە و لێکە** (نا. ل)[تێکە + و + لێکە] تێکەڵ و پێکەڵ، بێ سەروبەرە، بشێویی. **~ بوون:** کەس بە کەس نەبوون، بێ سەر و بەرە بوون.

**تێگرتن** (چا. م)[تێ1 + گرتن] ١ـ تیر، بەرد یا هەر شتێک بەرەو کەسێک یا نیشانە هاویشتن. ⁂ لە پاداشی قسەی سەردا، هەمە ئاه و هەناسەی گەرم/ کەسێ شێتانە بەردم تێگرێ، من بەرقی تێدەگرم (مەحوی ل ٢١٩). ٢ـ قەرار دانی شتێک دە نێو شتێکی دیکە دا. ⁂ دەرک و پەنجەرە دە ماڵ گرتن. وێنە دە تابلۆ گرتن. ٣ـ داپۆشین و گرتنی دەوروبەری شتێک. ⁂ بەرگ دە کتێب گرتن. دەستی شکاو دە گێچ گرتن.

**تێگڕا** (ئاک.) بڕ: تێکڕا.

**تێگڕایی** (ئاک. ل)[تێگڕا + ئیی] بڕ: تێکڕایی

**تێگرماندن** (چا. م)[تێ1 + گرماندن] لە کەسێک توورە بوون و تێخوڕین، بە سەر کەسێک دا گرماندن.

**تێگوشین** (چا. م)[تێ1 + گوشین] بڕ: تێکوشین

**تێگونجان** (چا. ل)[تێ1 + گونجان] لوان، گونجان، تێخونجان.

**تێگهاشتن** (چا. ل)[تێ1 + گهاشتن] [باک] بڕ: تێگەیشتن

**تێگهاندن** (چا. م)[تێ1 + گهاندن] [باک] بڕ: تێگەیاندن

**تێگهیشتن** (چا. ل)[تێ1 + گهیشتن] [باک] بڕ: تێگەیشتن

**تێگهین** (چا. ل)[تێ1 + گهین][باک] بڕ: تێگەیشتن

**تێگەیاندن** (چا. م)[تێ1 + گەیاندن] [باک: تێگهاندن ـ ناو: تێگەیاندن]١ـ حاڵی کردنی کەسێک لە مەسەلە و مەبەستێک. ⁂ مامۆستاکەم ئەمڕۆ زۆر جوان دەرسەکەی تێگەیاندم. ٢ـ حاڵی کردنی کەسێک لە ئیشارە و شتێکی شاراوەی نێوان ئەو کەسانە. ⁂ لە میوانی خێزانم سەرێکی لێهەتەکاندم و تێیگەیاندم کە وەختی ڕۆیشتنەوەیە. ٣ـ حاڵی کردن لە مەسەلەیەک نەزاندراو. ⁂ هەراهەرای خێزانم جیرانەکانی تێگەیاند کە شەڕ و کێشەیەکی قورس دە نێوانی ئێمە دا هەیە.

**تێگەیشتن** (چا. ل)[تێ1 + گەیشتن] [باک: تێگهاشتن، تێگهیشتن، تێگهین ـ ناو: تێگەیشتن، تێگەیین] ١ـ حاڵی بوون

له مەبەست و مەسەلەیەک، فامین. ⁂ تێگەیشتن له پلاو خواردنێ خۆشتره! (پەند) ٢ـ پەی پێبردن، زانین.

**تێگەیشتوو** (نا. فا)[له: تێگەیشتن] ١ـ مرۆڤی زانا و زیرەک و ئاقڵ. ٣ـ ئاگادار له مەسەلەکانی رۆژ و ژیان و ... & تێگەییو

**تێگەیشتوویی** (حم.)[تێگەیشتوو + یی] ئاکامی تێگەیشتن، حاڵی بوون.

**تێگەیین** (چا. ل)[تێ1 + گەیین] بڕ: تێگەیشتن

**تێگەییو** (نا. فا)[له: تێگەیین] بڕ: تێگەیشتوو

**تێگیران** (چا. ل)[تێ1 + گیران] ١ـ گیر کردن ده نێو شوێن و جێگەیەک دا. ٢ـ مەسەلەیەک بۆ حەل نەکران، وڵام دەست نەکەوتن.

**تێگیراویی** (نا. ل)[له: تێگیران] مەسەله و کارێکی سەخت و چەتوون، چەت، گرفت، گیر و گرفت.

**تێل** (نا.)[تور: tel] ١ـ سیمی کانزایی که بۆ بەستنی بار و کاروباری دیکه کەلکی لێوەردەگرن، تەل. ٢ـ زیوەرێکی ژنانەیه له زێڕ یا زێو یا شتی دیکه که له شەدەی دەدەن. ٣ـ ئامرازێکی کەوانییه که کچ و ژن له پرچیان دەدەن هەتا پەرێشان نەبێ.

**تێل به سەر** (ئان. ل)[تێل + به + سەر] ١ـ ژن یا کچێک که تێل/٢ ـ ی له سەر دابێ. ٢ـ (مجـ.) جوان، چەلەنگ. ⁂ گه رازی نەبێ کیژی تێل به سەر/ جوابم چاک نەدا و بم دەربەدەر (سەعید و میرسێوەدین ل ٥٠).

**تێلەکه** (نا.)[؟] باری سووک و قەباره گەورەی سەر پشت، کۆڵەپشت، کۆڵبەند، تێلەگه.

**تێلەگه** (نا.) بڕ: تێلەکه. ⁂ هەروا دەڕوا رێ و رێیه/ تێلەگەی سۆر له پشتێیه/ ئەمه چارین چاومان لێیه/ خوا دەزانی یاری کێیه (فۆلکلۆر ل ٤٢).

**تێلیسان** (نا.) بڕ: تیلیسان

**تێلا** (نا.)[لۆڕ: تێلا. ناو: تێلا ـ هەو: تێلا] دارێکی درێژی ئەستووره، نزیک میتر و نیوێک دەبێ که، سەرێکی دادەتاشن و بۆ قایم کردنی چیغ و کاروباری دیکه کەلکی لێوەردەگرن، تەیاخ. **تێلاترێن کردن:** تێهەڵدانی زۆر به تێلا و داردەست.

**تێمان** (چا. ل)[تێ1 + مان] بڕ:

**تێـمـانەوە** (چا. ل)[تێ1 + مـانەوە] تێدا مانەوە، گیر کردن لە مەسەلەیەک یا شتێک دا، دامان، تێمان.

**تێماو** (ئان. مف)[لە: تێمان] کەسێک کە لە حەلی مەسەلەیەک دا گیری کردوە، داماو.

**تێمرووکان** (چا. ل)[تێ1 + مرووکان] بڕ: تێورووکان

**تێـمـیزک** (نا. ل)[تێ2 + میـز + ک] بڕ: تێمیسک

**تێمیسک** (نا. ل)[تێ2 + میس (میز) + ک][باک: تامـیـسک، تامـیـسکە، تامـێسک، تامووسک ـ ناو: تێـمـیـسک، تێمیزک، تامیسک، تامێسک، تامێزک] جـۆرێک بلۆقـە کـە لە بەر تینی نـۆبەتێ و یاو لـە دەرووبەری لێـو سـەر هەڵدەدا، لە کـوردەواری دا بەیانی زوو تێـمـیـسک بە شـتـێکی ئاسنـی ساردەوە دەنێن و بەم جــــۆرە چارە دەکـــەن، هـەڵتـــۆقـین، هەڵپرمیان.

**تـێـنـان** (چـا. م)[تـێ1 + نـان2] تێخستن، خستنە نێو، دە نێو نان، بردنە ژوور. ⁂ دەسـتـم دە گـیـرفـانم نـابوو! قامکی دە زاری نا.

**تێنوارین** (چا. م)[تێ1 + نواڕین] بڕ: تێڕوانین

**تێـنـەوین** (چا. م)[تـێ1 + نـەوین] داهـاتنـەوە و قـــەوەت دان بۆ هـەڵگرتنـی شتێکی قورس یا هەڵکەندن.

**تێنووسان** (چا. م)[تێ1 + نووسـان] بە قـەو شـتـێکی قـایم و چەقـیو گـرتن و راکێشـان. ⁂ عـاشـقـان تێـیـدەنووسـان، ئەبەدا رمبیان بۆ وەدەرنەدەکەوت (بارام و گوڵندام ل ١٠٧).

**تێورووکان** (چا. ل)[تێ1 + ورووکان] بە کۆمەڵ رژانە سـەر شـتێک و لە دەوری کۆ بوونەوە، تێمرووکان.

**تێـوشین** (چا. م)[تێ1 + وشین] بڕ: تێکوشین

**تێــــوڵین** (چا. م)[تـێ1 + وڵین] بـڕ: تێکوشین

**تێـــــوە** (پێـــــشگـ.)[[تێ1 + وە] پێـشـگرێکی لێکدراوە مـانـای دە نێـو و دەروون دەدا بە چاوگ و کردار.

**تێوەپێچان** (چا. م)[تێوە + پێچـان] پێچانەوەی شتێک، لێهاڵان.

**تێوەچوون** (چا. ل)[تێوە + چوون] ١ـ جـێ بـوونـەوە و ئـەنـدازە بـوون لـە چـوونـە

ژوور دا. ⁂ دەستم دەو کونەوە ناچێ، دەستەوانەکە ئەندازەیە دەستم تێوەی دەچێ. ٢ـ تێکەوتن و نوقم بوون لە شتی شلەی وەک قوڕ و زەلکاو.

**تێوەدان** (چا. ل)[تێوە + دان] تێدان

**تێوەردان** (چا. م)[تێ1 + وەردان] ١ـ تێکەڵ دان، لێک دان و شێواندنی ئاوەکی. ٢ـ خول دانی ئاو یا ئاوەکی بۆ خاوێن کردنەوە. ⁂ ئاوێک دە زارت وەردە و وەرە بخەوە!

**تێوەژاندن** (چا. م)[تێ1 + وەژاندن] بە نەقیزە یا شتێکی تیژ لە شتێک یا کەسێک یا حەیوانێک کوتان، تێوەژەندن.

**تێوەژەندن** (چا. م)[تێ1 + وەژەندن] بڕ: تێوەژاندن

**تێوەشاندن** (چا. م)[تێ1 + وەشاندن] راوەشاندنی جل و بەرگ لە نێو تەندوور و سەر ئاگر بۆ کوشتنی مۆریانە و کێچ و ئەسپێ.

**تێوەگلان** (چا. م)[تێوە + گلان] تووشی کار و مەسەلەیەک بوون بە بێ ویست و حەز، تووش بوون، دوچار بوون بە کارێکەوە. :: حەوسەلەی دوکانداریم نیە هەروا تێوەگلام.

**تێوەگلاندن** (چا. م)[تێوە + گلاندن] کەسێک تووشی کارێک کردن کە مەیلی لێنەبێ.

**تێهاڵان** (چا. ل)[تێ1 + هاڵان] ١ـ کۆ بوونەوەی کۆمەڵێک لە دەوروبەری شتێک یا کەسێک، تێورووکان. ⁂ منداڵەورکە هەر شتێک ببین تێیدەهاڵێن و ئەزیەتی دەکەن. ٢ـ ئاڵان و لێهاڵانی شتێکی درێژ لە دەوری شتێکی دیکەوە، لێهاڵان. & تێ ئاڵان

**تێهاڵاندن** (چا. ل)[تێ1 + هاڵاندن] شتێکی درێژ لە دەوری شتێکی دیکە پێچانەوە، لێهاڵاندن. & تێ ئاڵاندن

**تێهاویشتن** (چا. م)[تێ1 + هاویشتن] ١ـ کەسێک یا شتێک لە ئاو یا قوڵکە و نێو شتێک هاویشتن، تێخستن. ٢ـ هەڵکردنی سۆبە و سەماوەری رەژی، تێخستن.

**تێهن** (نا.)[باک] بڕ: تین1

**تێهوو** (گیانـ.)[پەه: تیهووک. لۆر: تی ـ فار: تیهو. هەو: تێهوو، تیهوو] بڕ: سوێسکە

**تێهەڵاتن** (چا. ل)[تێ1 + هەڵاتن] چونە نێو ئاو و خۆ تەڕ کردن.

**تێهەڵبوون** (چا. ل)[تێ1 + هەڵبوون] هەڵگەڕان، بەرەو بەرزایی ڕۆیشتن.

**تێهەڵپێچان** (چا. م)[تێ1 + هەڵپێچان] بەربینگی کەسێک گرتن و لە کۆڵ نەبوونەوەی، تێپێچان.

**تێهەڵچوونەوە** (چا. ل)[تێ1 + هەڵچوونەوە] بە سەر گرتنەوەوە، سەر لە نوێ کردنەوە. ⁂ بە کوردی دیسان زیندوو دەبمەوە/ لەو دنیاش بۆ کورد تێهەڵدەچمەوە (بۆ کوردستان ل ١٨).

**تێهەڵچەقان** (چا. م)[تێ1 + هەڵچەقان] بڕ: تێهەڵچەقین.

**تێهەڵچەقین** (چا. م)[تێ1 + هەڵچەقین] گیر کردن و چوونە ناوی شتێکی نووک تیژ دە شوێنێکی لەش یا شتێکی دیکەوە، تێهەڵچەقان.

**تێهەڵدان** (چا. م)[تێ1 + هەڵدان] ١- لێدان بە شەق لە شتێک یا کەسێک. ٢- دەفر پڕ کردن لە ئاوی زۆری وەک حەوز و کانی.

**تێهەڵساوین** (چا. م)[تێ1 + هەڵساوین] بڕ: تێهەڵسوون

**تێهەڵسوون** (چا. م)[تێ1 + هەڵسوون] پێدا ماڵینی ڕۆن و دەرمان و سواغ و شتی لەم بابەتە لە ماکەیەکی دیکە، تێهەڵساوین، تێساوین، تێسوون.

**تێهەڵکردن** (چا. م)[تێ1 + هەڵکردن] ١- دەنگ بەرز کردنەوە، گۆرانی کوتن. ٢- بەرد و تیر و هەڵمات وشتی لەم بابەتە هاویشتن بۆ پێکان. ⁂ بەردێکی تێهەڵکردمێ بەڵام نەیگرت.

**تێهەڵکێشان** (چا. م)[تێ1 + هەڵکێشان] ١- هەودا و داو بە نێو شوێنی درواو یا دیاری کراو دا بردن. ⁂ دۆخینی لە پاتۆڵەکەت هەڵکێشە! ٢- شتێک دە نێو ئاوەکی نان و دەرهێنانەوە. ⁂ کراسەکەت دە ئاوی هەڵکێشە و بە تەنافی دادە!

**تێهەڵەنگوتن** (چا. ل)[تێ1 + هەڵەنگوتن] ١- لاق وەبەر بەرهەڵستێک هاتن و سەرەنگەری دان، ساتمە بردن. ٢- وەیەک کەوتن. ٣- تووشی کەسێک بوون بە هەڵکەوت.

**تێهەڵێنانەوە** (چا. م)[تێ1 + هەڵێنانەوە] قەرەبوو کردنەوەی زەرەر و زیانی وێکەوتوو. ⁂ لە کار و کاسبی ئەگەر زەرەریشم کردبا بابم بۆی تێهەڵدەهێنامەوە و دەستی دەگرتم.